# مسوڵمانی کامڵ

## بەشی دووەم
## خواپەرستیی مسوڵمان

بەرگی یەکەم

**عەلی باپیر**



چاپی یەکەم

١٤٢١ ک

٢٠٠٠ز

پێشکەشە بە هاوسەری بەڕێز و خۆشەویستم
شکریە خان،
دانەر
٢٠٠٠/٦/١٦

# مسوڵمانی کامڵ

## بەشی دووەم

## خواپەرستیی مسوڵمان

### بەرگی یەکەم


عەلی باپیر





چاپی یەکەم

٢٠٠٠ز ١٤٢١ ک

بسم الله الرحمن الرحيم

وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون

## ئاگاداری :

ئەم بەشی دووەمەی کتێبی : ( مسوڵمانی کامڵ ) ، کە (خواپەرستیی مسوڵمان)ە ، بە هەردووك بەرگی یەکەم و دووەمی‌یەوە جگە لە چەند باس و مەسەلەی گەورە و گرنگ دەربارەی خوا پەرستیی سەرجەم ئەو باس و مەسەلانە کە لە کتێبە شەرعی‌یەکان دا لە ژێر ناوونیشانی فیقهی خواپەرستیی‌یەکان (فقه العبادات) دا نووسراون هەر لە پاك و خاوێنی (طهارة)ەوە هەتا کۆتایی حەج و زیکر بە لێکۆڵینەوەی وورد و قوڵەوەخراونەتە روو.

# پێشکەش بێ

بە بەندە ڕاست و ڕەسەنەکانی خوای تاك و بێ وێنە و هاوەڵ و پاك کە بە مانای ڕاستەقینە و فراوانی پەرستن ، خوا دەپەرستن و ، لە پەرستنیدا گیرۆدەی شیرك و لە شێوەی پەرستنیدا دووچاری بیدعەت نابن ، واتە تەنها ئەو دەپەرستن و تەنیا بەو شێوەیەش کە خۆی دیاری کردووە دەی پەرستن.

# چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

**یەکــەم** / کتێبی ( مسـوڵمانی کـامل) بەهەرسێك بەشی : (( بـیر و بـاوەڕی مسـوڵمان)) و ((خواپەرستیی مسوڵمان )) و (( خوو و ڕەوشتی مسوڵمان ))ەوە نزیکەی دوازدە (١٢) ساڵێك لەمەوبەر نووسراوە، بەڵام لە بەر چەند هۆیەك چاپ کرانی دواکـەوت، ئێسـتاش خـوا پشـتیوان بێ بەتەماین بەشـی دووەـم و سـێهەم کە مـاون چـاپ بکـەین، هەرچـەندە ئەسـڵ و بناغـەی ئەوەی کەکاتی خۆی نوسراوە هێڵراوەتەوە، بـەڵام چـاوێکی ورد و قـوڵ و نەفـەس درێژانـەمان بەزۆربەی هەرە زۆریدا گێڕاوەتەوە، ڕەنگە حیکمەتی درەنگ دەرفەتی چاپ بـۆ ڕەخسانیشـی هـەر ئـەوە بووبـێ و، بێگومـان ئـەو گۆڕانکـاری و گەشـە پێدانـەی ئێسـتاش لەگـەڵ نـاوی (مسوڵمانی کامل) دا گونجاوترە.

**دووەم**/ ئەم بەشی دووەمەی مسوڵمانی کامل ( خواپەرستیی مسوڵمان) کە لە چوار بابـەتان پێك دێت ، بابـەتی چوارەمی کـە درووشمـەکانی خواپەرستیی تێدا خراونـە ڕوو، چ لـە ڕووی چۆنیەتی و چ لە ڕووی چەندێتییەوە بە کـاکڵ و جەوهـەری ئـەم بەشـە دادەنـرێ، وە شـایانی باسیشە کە هەروەك چۆن لـە بابـەتی چـوارەم ( پێنـج درووشمـەکانی خواپەرستیی) دا چـوار پایەی ئیسلام (( نوێژ ، زەکات ، ڕۆژوو ، حەج )) توێژراونەوە، لە بابەتی یەکەم (خواپەرستیی بە گشتی ) یشدا پایەکەی‌تر کە پایەی یەکەمی ئیسـلامەتی‌یە واتـە: شـایەتمان خراوەتـە ڕوو ، چونکە بە تێر و تەسەلی باسی خوا بە یەکگرتن ( توحید) کراوە، هـەروەها کـەم و زۆر باسـی پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم و سلم) و ئـەرکی سـەر شـانیان و پـەیام و ڕێبازەکـەیان کـراوە، کەواتە ئـەم بەشـی دووەمـە وێڕای ئـەوە کـە خواپەرسـتیی مسـوڵمان ڕوون دەکاتـەوە، پێنـج پایەکانی ئیسلامیش دەتوێژێتەوە.

**سێیەم** / وەك دەبینرێت لەنێو پێنج درووشمەکانی خواپەرستییدا ( بەرپا کردنـی نوێـژ و (ماڵ بەخشین) لە هەموویان زیاتر گرنگی و بایەخ بە توێژینـەوەیان دراوە و ووردتـر و فراوانـتر لە بارەیانەوە نوسراوە، دیارە ئەوەش جـێی خۆیـەتی، چونکـە خـوای پـەروەردگار و دادگـەر نوێژ بەرپاکردن و زەکات دان کـــەگەورەترین و گرنگترین جۆری ماڵ بەخشینە[بە دوونیشـانە و مەرجی سـەرەکی بـە مسوڵمان دانران و تۆبـە لێ وەرگـیرانی ئـەو کـافر و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکان]دیاری کردوون، وەك فەرمویەتی:

﴿ فأن تابوا و أقاموا الصلاة و آتوا الزّكاة فإخوانكُم في الدِّينْ﴾ التوبة —١١-.

کەواتە هەرکەسێك و هەر کۆمەڵێك هەرچەندە لافی مسوڵمانەتی لێ بدەن، مادام هەرکام لە نوێژ و زەکاتیان تێدا نەبینرێن، دەعواکەیان لێ وەرناگیرێ و مسـوڵمانەتی‌یەکەیان لێ ناسـەلمێنرێ، ئاشکراشـە کـە ئەگـەر ئـەندازە و ڕێـژەی گرنگـی و بایـەخ پـێ دانـی قورئـان بـۆ هـەر بابـەت و مەسەلەیەك بکەینە تەرازوو و پێوەری گرنگی و ئەمیەت پێدانمان، لە پێکـانی ئامـانج نزیکـتر و لە بەهەڵەدا چوون دوورتر و پارێزراوتر دەبین.

# پێشەکی

الحمدلله كما ينبغي لجلال وجهه و عظيم سلطانه، والصلاة والسلام على محمد أحسن عبادِهِ و أكرم أنبيائه و أعظم برهانه، و آلـه أجمعين من الصَّحبِ و الأزواج و القرابة و التابعين لهم بأحسان الى يوم الدين -

ئەم بوون (وجود)ە بە بینراو و نەبینراوو دوورو نزیكو ووردو درشتو تاریكو ڕوناكو گیاندارو بێ گیانو.. هتدەوە هەر لە گەردیلەیەكەوە تا كەهكەشانێك و هەر لە پەرە مریشكێكەوە تا ئاسمانێكو هەر لە دەنكە تۆوێكەوە تا ئینسانێك، تێكڕا و وێكڕا چار و ناچار ، مل كەچ وفەرمانبەری خوان و توانای لادان و سەرپێچییان نییە، وەك خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی: (أَفَغَيْرَ دينِ اللهِ يَبْغُـونَ! وَ لَـهُ أَسْـلَمَ مَـنْ في السَّموات و الأرضِ طَوعاً وَ كَرْهاً واليه يرجعون؟!) (آل عمران - ٨٣-)

واتە: جا ئایا ئەوانە جگە لە بەرنامەی خوابەرنامەیەكی دیكە دەخوازن لە حاڵێكدا هەركەسێك كە لە ئاسمانەكانو زەویدا هەیە چارو ناچار مل كەچی وییە، وە هەر بۆلای ویش دەگێڕرێنەوە؟.

بەڵێ هەموو دروستكراوەكان گەردن كەچو پابەندی ئەو سیستەم (نظام)ەن كە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاریان بۆی داناون، بەڵام لەنێو هەموو دروستكراوەكاندا خوای كاربەجێ ئینسانو جندی هەڵبژاردوون كە بە مەبەستی تاقیكردنەوەیان یەكی تا ئەندازەیەك ویستی ئازادیان پێ ببەخشێ، كە بایی چاكەكاریو خراپەكاریو ڕاست ڕۆیشتنو چەوت ڕۆیشتن یان بكات، تاكو بۆ تاقیكرانەوە بشێن، بەڵام بێگومان ئەوانیش وەك باقی كائینات لە لایەنەكانی دیكەی ژیانو گوزەرانیاندا هەر مل كەچو فەرمانبەری ئەو سیستەمە گشتییەن كە خوای باڵادەست بۆ سەرلەبەری بوون (وجود)ی داناوەو ئەگەر لە لایەنە جوزئییەكەی ژیانو گوزەرانیان دا - كە ئیمان و كوفر و چاكەكاریو خراپەكارییە - توانای لادانو سەرەڕۆیییان هەیەو، دەتوانن لەجیاتی ئیمان كوفرو لە باتی چاكە خراپە هەڵبژێرن، ئەوە لە لایەنە گشتیو فراوانەكەی ژیانیان دا توانای سەرپێچیو لاملییان نیەو چارناچار، پێیان خۆش بێ یان ترش، دەبێ خوا چۆنی بۆ دیاری كردوون هەروا بكەنو هەر بەو جۆرە بەڕێوە بچن.

ئینجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئینسان بۆخۆی بە تەنیا بەریە نازانیو ناتوانی بەرەو خوا لەخۆڕازیکردن بەهۆی ئەنجامدانی ئەرکی بەندایەتییەوە بەبێ دەلیلو ڕێ نیشاندەر سەر دەربکات، چونکە لەلایەکەوە ئەو تواناو وزەیەی کە پێیدراوە بەشی ئەوە ناکاتو لەلایەکی دیکەشەوە شەیتانو دارو دەستەکەی هەر لە ڕۆژی بەرێوە دوژمنایەتییەکی سامناکو جەنگێکی بێ ئامانیان لەگەڵیدا بەرپاکردووەو بەردەوام سەرگەرمی فێڵو پیلانو نەخشە داڕشتنن، بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە خوای بە بەزەییو کاربەجێ پەیتاپەیتا بە بەندە هەڵبژاردە و دانسقەکانی خۆیدا – کە پێغەمبەرانن صلى الله عليهم وسلم ئاینو بەرنامەی خۆی بۆ هیدایەتی ئینسانو ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی، ڕەوانە کردوە تاکو ئینسانو جندیش وەك سەرتاپای بوونەوەر لەو بەشە جوزئییە ئیختیارییەی ژیانیشیان کە تێیدا ئازاد کراون، هەر مل کەچو پابەندو فەرمانبەری خوا بنو، ریزپەڕ (شاذ) نەبنو نەبنە دەنگێکی بۆڕ و نەگونجاو لەنێو کۆڕسی یەك صەدای بووندا! وەك خوای پەروەردگار فەرمووویەتی: (تُسَبِّحُ لَهُ السَّموات السَّبْعُ و الأرض و مَنْ فيهِنَّ و إنْ من شيءٍ الاّ يُسَبِّح بِحَمْدِهِ ولكن لا تفقهون تَسْبِيحَهُمْ انه كان حليماً غفوراً) الاسراء –٤٤–، واتە: هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەرکەس کە تێیاندا هەیەپاكو بێ گەردی بۆ خوا ڕادەگەیەنن، وە هیچ شتێك نیە کە خوا بە پاك نەگرێو ستاییشی نەکات، بەڵام ئێوە لە پاکگرتنەکەیان حاڵی نابن، بێگومان خوا هێدیو لێبوردەیە.

هەر بۆیە ئەو ئاینو بەرنامەیە کە خوای زاناو توانا بە پێغەمبەرانی خۆیدا (عليهم الصلاة و السلام) ناردوویەتی، کاڵایەکی پڕ بە باڵای ئینسانەو، پەیڕەو (منهج)ی سەرتاپای ژیانو گوزەرانە، بۆ ئەوەی ئینسان تاكو کۆمەڵی بتوانێ لەگەڵ بوونەوەرو دەوروبەریدا بە هەموو کیانو بوونی بە دەرو دەروون (ظاهر و باطن)و ڕووحو جەستەوە، خۆی یەکدەنگو یەکڕەنگ بکات:(صِبغة الله و من أحسنُ من الله صِبغَةً) البقرة ١٣٨–.

جا بێگومان ئاینو بەرنامەیەك کە بەهەموو پێغەمبەران دا (صلى الله عليهم وسلم) نێرراوە کاکڵو نێوەڕۆکەکەی ئەوە بوو کە گوتمان: (خەڵك کردنە بەندەی خوای تاك لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەرانی تاکیو کۆمەڵایەتییان دا) وەك فەرموویەتی:(و ما أَرْسَلنا من قَبْلِكَ من رسول إلاّ نوحي اليه أنّه لا اله إلاّ أنا فاعبدون)الانبياء–٢٥–

واتە: وە لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر پێمان ڕاگەیاندووە کەوا بێجگە لە من هیچ پەرستراو نین، دەجا بەس من بپەرستن.

ئینجا بە درێژایی مێژووش پێغەمبەران لە ئادەمەوە هەتا خاتەم کێشەی بنەڕەتی یان لەگەڵ خەڵکیدا ئەوە نەبووە کە خەڵك خوا نەپەرستن! بەڵکو ئەوە بووە کە لە پەرستنیدا هاوبەش و هاوەڵیان بۆ پەیدا کردوون و، تەنیا بەشێکی بەندایەتی یان بۆ خوا داناوەو بەشەکانی دیکەییان پێشکەش ئەو بت و صەنەم و طاغووت و فیرعەون و پەرستراوە ساختانە کردوون کە کردوویانن بە هاوبەشی خوای بێ هاوەڵ و بێ وێنە.

کاری مەزن و سەختی پێغەمبەرانیش (علیهم من الله افضل الصلواة و اتم التسلیمات) ئەوە بووە کە لە سەرەتاوە دڵ و مێشکی خەڵك لە ژەنگ و ژاری بت پەرستی و شیرك خاوێن بکەنەوەو خوا بەیەکگرتن (توحید)ی تێدا بچەسپێنن و درەختی ئیمانی تێدا بڕوێنن، پاشان واقیع و بارودۆخی هەمەلایەنەی کۆمەڵگاکەشیان لە حوکمی طاغووت و ڕژێمی نەفامی ڕزگارو بژار بکەن و بیخەنە ژێر سێبەری حوکمی ئایین و بەرنامەی خواوە.

ئنجا ئەو پرۆسەی گۆڕین و پاککردنەوەی عەقڵ و دڵی خەڵك و پاکسازی و چاکسازی کۆمەڵگایەش کە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (صلی الله علیهم و سلم ) سەرقافڵەی بوون بە گشتی لەگەڵ دوو ئاستەنگدا ڕوو بەڕوو بۆتەوە:

<u>یەکەم:</u> ستەم و زۆرو چەواشەکاری طاغووتەکان، کە زۆر باش لە ڕاستی یەتی پەیام و بەرنامەی پێغەمبەران دڵنیا بوون، بەڵام بۆ بەرژەوەندی لێ تێك نەچوون و کورسی و تەخت لێ سەرنگووم نەبوون، خەڵکیان چەواشە کردووەو وایان پێشان داوە کە بڕوایان بە بانگەوازی پێغەمبەران نیەو لێی دوو دڵ و بە گومانن:(و جحدوا بها و ٱسْتَيْقَنَتْهَا أنفسهم ظُلْماً و عُلوّاً)النمل – ١٤–،وە(و إنّا لَفي شَكٍ مِمّا تَدْعونَنا اليه مُريبٍ)هود –٦٢–.

<u>دووەم:</u> نەزانی و هەڵخەڵەتاوی و چاوبەست کراوی و لاساکردنەوەی کوێرانەی پێشینانی خەڵك و جەماوەر:(بَلْ قالوا إِنّا وَجَدْنا آباءنا علىٰ أُمَّةٍ و انّا علىٰ آثارِهِمْ مهتدون) الزخرف – ٢٢–.

ئنجا طاغووتەکان بە زۆری چاوپێچکی سەرچاوی خەڵك و جەماوەرە هەڵخەڵەتاو و چەواشەکراوەکەیان لەو بیروبۆچوونە هەڵەیەوە هێناوە کە:

خوا چ هەقی بەسەر ژیان و گوزەرانی خەڵکیەوە هەیە!

پێغەمبەران علیهم الصلاة و السلام چۆن دەبێ ئینسان بنو بخۆنو بخۆنەوەو بە بازاڕدا بڕۆنو ... هتد!

وەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەوانە فەرموویەتی: (قالوا يا شُعَيْبُ أصَلاتُكَ تأمرك أن نترك ما يعبد اباؤنا أو أن نَفْعَلَ في أموالنا ما نشاء انكَ لانت الحليمُ الرَشيد) هود – ٨٧- وە: (و قالوا مالهذا الرَسولِ يأكل الطعام و يمشي في الاسْواق لولا أُنْزِلَ اليه ملك فَيَكُون معه نذيراً) الفرقان -٧-.

بەڵێ خوێنەری سەنگینو شیرین:

تەسك کرانەوەی چەمك و واتای پەرستنو بەندایەتیکردن بۆ خوای تاكو بێ وێنە، دەردو نەخۆشی‌یەك نی‌یە تەنیا خەڵکی ئەم ڕۆژگارەی ئێمەی پێوە گیرۆدە کرابێو، بانگەشەیەکی بەد نی‌یە کە تەنیا خەڵکی ئەم ڕۆژگارەی پێ چەواشەکرابێ لە لایەن طاغووت و دیکتاتۆرەکانەوە، بەڵکو ئەویش یەکێکە لە فێڵو پیلانە لەمێژینەکانی فیرعەونو نەمروود و ئەبووجەهلەکان.

ئنجا لە ڕاستی‌دا هەرکاتێك ئەو فێڵو پیلانە نەگریسەی طاغوتەکان سەری گرتو بەری گرت، کوێخایەتی بەسەر خەڵکدا کردنو مۆری کۆیلایەتی بەنێو چاوانیانەوە نانو بار خستنە سەر شانیان زۆرسێنا دەبێ، چونکە کاتێك خەڵك وا حاڵی کران کە خواپەرستی‌و دینداری لە هەندێك جموجۆڵو چالاکی ڕووحی‌و شەخسی بەولاوە هیچی دیکە نیەو، خواپەرستی‌و موسڵمانەتی چ کاری بەسەر سیاسەتو ئابووری‌و جەنگو ئاشتی‌و...هتدەوە نیەو ئەو مەسەلانە لە دەرەوەی بازنەو جوغزی ئایین دان، ڕێگا بۆ بابای طاغوت ئاچووغ دەبێ کە بڵێ: دەجا خەڵکینە مادام ئایین سیاسەتی تێدا نەبێ داخوا چی دەکەنو چۆن دەکەن! وەرن با من ڕێتان پیشان بدەمو تێتان بگەیەنم کە دەبێ چی بکەنو چی نەکەن. وەك فیرعەون گوتوویەتی:
(ما أريكم الاّ ما أرى وما أهديكم الاّ سبيل الرَّشاد) غافر -٢٩-.

وە لە ڕاستی‌دا هەمان دەردی کە گەلانی پێشوو پێیەوە گیرۆدە بوو بوونو سەرەنجام ڕێگا بۆ فیرعەونو نەمروودەکان تەخت بوو بوو کە بەگەلە فریو خواردوو و چەواشە کراوو ژێر دەستەکانیان بڵێن: (أنا أحيِ و أُميتُ!) البقرة- ٢٥٨-، وە پێیان بڵێن (أنا رَبُكُم الأعلى!) النازعات-٢٤-، ئوممەتی ئیسلامیش کەمو زۆر دووچاری هەمان دەردی بێ ڕەزاو کوشندە بووەو، لە سۆنگەی ئەوەوە کە چەمكو واتای دینداری‌و

موسـوڵمانەتیو خواپەرستی (عبـادة)یـان لـە دڵو مێشـکدا هێنـدە تەسـکو گچکـە بۆتەوە، کە بەزەحمەت جێگای دروشمەکانی خواپەرستیشی تێدا دەبێتەوە! بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە زۆر لە خەڵکو جەماوەری سادەو ناحاڵی زۆر لەلای ئاسایی بووەو، طاغوتە جۆراو جۆرەکانیش ڕێیان بۆ هەموار بووە کە بڵێن:

ئیسلامەتیو دینداری تەنیا پەیوەندی نێوان خواو بەندەیەو هیچ هـەقی بەسـەر خەڵكو کۆمەڵگاو ژیانو گوزەرانیانەوە نیە! نەك هەر ئەوە بگرە هەر کەسێك بەناوی ئیسلامیشەوە باسی سیاسەتو حەڵاڵو حەرامو چیو چی بکات، ئـەوە سنووری بەزاندوەو بوختانی بە ئایینی خواوە کردوەو لەسەر خەڵكو جـەماوەری مسـوڵمان پێویستە کە هەستنو دەستی ئەو جۆرە کەسانە بگرنو ڕێیان نەدەن ئەو جۆرە قسانە بکەنو ئایینەکەیان لێ بشێوێننو تێك بدەن[1]

جا خوێنەری بەڕێز

لەبەر ئەوەی طاغوتەکان بەهۆی خەڵکی چەواشەکراو و بە سەهو براوەوە ئاشیان دەگەڕێو مەداریان ساز دەبێو، هەر ئەوانن کە بەدەستیانەوە دەبنە گورزو کوتكو بۆیان دەبنە چەپەرو پەرژین، ئێمەش وەك شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا (صلی الله علیهم و سلم) پێویستە کردو کۆشی زۆر بکەین بۆ لابردنی چاوپێچکی سەرچاوی خەڵکی لە خشتە براو و فریو دراو و ئیشك کردنی ئاوی سەرئاشی ئەو طاغوتانە، بەشکم لـە ئـەنجامی هۆشیاری خـەڵکیو بێدار بوونـەوەیان دا پیلان و نەخشـەکانیان هەڵبوەشـێنەوەو ببنە بلقی سـەرئاو و ئاشـی ئـاو لێبڕاو و تەڵـەی تەقێنراو.

ئاشکراشە کە ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای وشە و زاراوەکانی ئیسلام کاریگەرترین دەوری هەیە لە بێداریو هۆشیاری خەڵکی دا، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

(أَفَمَنْ يَعْلَمُ أنّما أُنْزِلَ اليك مِنْ رَبِّكَ الحق كَمَنْ هو أعْمى انّما يتذكّرُ اولو الالباب) الرعد -١٩-.

واتە: ئایا ئەو کەسـەی کـە دەزانـێ ئـەوەی بـۆ تـۆ نێردراوەتـە خـوارێ لـە لایـەن پەروەردگارتەوە هەق و ڕاستە، وەك ئەو کەسە وایە کە کوێرە! بێگومان بەس خاوەن

---

[1] وەك فیرعەون دەربارەی موسا (علیه السلام) گووتویەتی: (إنِي أخاف أنْ يُبَدِّل دينكـم أو أنْ يُظـهِرَ في الأرض الفساد) غافر-٢٦-.

عەقڵان پەند وەردەگرن و بێدار دەبنەوە.

بەڵێ ئەو کەسە کە پێی وایە دینداری و خواپەرستی لە نوێژو ڕۆژوو و زەکاتو حەجدا کورت هەڵاتوە و هەر هێندە لە بەرانبەر ئیسلام دا خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ هەتا ئەو شتانە جێبەجێ دەکات. موسڵمانەتی یەکەی زۆر جیاوازە لە کەسێك کە دەزانێ و دڵنیایە کە هەروەك چۆن بەرپرسیارە بەرانبەر بە جێبەجێکردنی:

أ-( فَأقيموا الصَّلاةَ و آتوا الزَّكاةَ) الحج - ٧٨-.

ب-(كُتِبَ عليكم الصِّيامُ) البقرة -١٨٣-.

ج- (و أتِمُّوا الحجَّ و العُمْرَةَ لله) البقرة - ١٩٦-.

د- (اذكروا الله ذكراً كثيراً ) الاحزاب -٤١-.

بەهەمان شێوە بەرپرسیارە بەرانبەر بە جێبەجێکردنی:

ا- ( فانتشروا في الارض و آبتغوا من فضل الله ) الجمعة -١٠- , ( فامْشوا في مناكبها و كلوا من رزقه ) الملك -١٥-.

ب-( و اَعِدُّوا لهم ما استطعتم من قُوَّة ) الانفال -٦٠- , ( كُتِبَ عَلَيْكُمْ القتالُ) البقرة -٢١٦-.

ج-( **طَلَبُ العِلْمِ فريضَةٌ** ) رواه ابن ماجة ( و قُلْ ربِّ زِدْني عِلْماً ) طه -١١٤-.

د- ( تأمرون بالمعروف و تَنْهون عن المنكر ) ال عمران -١١٠-.

ه- ( اَنْ أقيموا الدِّينَ و لا تَتَفَرَّقوا فيه ) الشورى -١٣-.

و- ( فاحكم بينهم بما انزل الله و لا تَتَّبِعْ أهْواءَهم ) المائدة -٤٨-.

ز- ( و أنكِحوا الايامى منكم و الصالحين من عبادكُمْ و إماءِكُمْ ) النور -٣٢-.

ح- ( **مَنْ بدَّل دينَهُ فاقتلوهُ** ) رواه البخاري.

ط- ( كتب عليكم القصاص ) البقرة -١٧٨-.

ي- ( الزانية و الزاني فاجلدوا كلَّ واحدٍ منهما مأة جَلْدة ) النور -٢-.

ك- ( و السارق و السارقة فَاقْطَعوا أيْدِيَهما جزاءَ بما كسب نكالاً من الله ) المائدة -٣٨-.

چونکە دەزانێ کە:

أ- بە زەوی خوادا گەڕان و سوڕان بۆ پەیدا کردنی ڕۆزی حەڵاڵ و بەهرە وەرگرتن لە خێرو بێرەکانی سەر زەوی و نێو زەوی.

ب- ئامادە کردن و ساز کردنی هێزو توانای جەنگی و جەنگ کردن بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرش و پەلاماری دوژمنان و بەرەنگاری کردنیان.

ج- داواكردنی هەموو جۆرەكانی زانیاریو هەوڵدان بۆ زیادكردنو گەشەپێدانی زانست.

د- فەرمان كردن بە سەرجەم چاكەكان لە هەموو بوارەكانی ژیانی كۆمەڵگاداو ، ڕێگری كردن لە تێكڕای خراپەكان.

هـ- بەرپاكردنی ئایینو بەرنامەی خوا وەك خۆیو تێدا پەرتەوازە نەبوونی.

و- دادوەری كردن لە نێوان خەڵكیدا بەپێی حوكمو بەرنامەی خوا.

ز- ژن بۆ هێنانی سەرجەم كوڕو بێوە پیاوانی كۆمەڵگاو بەشوو دانی سەرجەم ئافرەتانی بێ مێرد بە كچو بێوەژنەوە.

ح- جێبەجێ كردنی سزای لە ئایین هەڵگەڕانەوە.

ط- كوشتنەوەی بابای كوژەر.

ی- جێبەجێ كردنی سزای داوێن پیسی لەسەر ئافرەتو پیاوانی داوێن پیس.

ك- بڕینی دەستی پیاو و ئافرەتی دز.

بەڵێ دەزانیێ كە ئەم ئەركانە – كە مستێكن لە خەروارێك- زۆر لەوە گەورەترو قورسترن كە بەتەنیا بۆی بەڕێوە بچنو حەتمەن دەبێ بۆ جێبەجێ كردنیان نەك هەر سەرجەم ئەندامانو توێژەكانی كۆمەڵگا هاوكاری یەكتر بكەنو دەستبار بۆ یەكتر بگرن! بەڵكو وێڕای ئەوە دەبێ دەسەڵاتێكی باڵاو چەندان دامو دەزگای جۆراو جۆریش هەبن بۆ ڕاپەڕاندنیان.

ئینجا سەرەنجام كە تێگەیشتنی لەبارەی ئیسلامەوە ڕاست بۆوە، كەمو زۆر شێوەو ئەندازەی پابەندیو كردو كۆشو ڕەنجدانیشی لە مەیدانی بەندایەتی بۆ خواكردن و دینداریشدا دەگۆڕێ و، ئەگەر پێشتر پێی وابووبێ دەتوانێ بەندایەتی‌یەكی ڕاستو دروست و مسوڵمانەتی‌یەكی تێرو تەواو بەس لە جوغزی خودی خۆی‌داو بەهۆی ئەنجامدانی ئەركە شەخسی‌یەكانەوە بێنێتە دی! لەمەودوا دڵنیا دەبێ كە نەخێر وانیە، بەڵكو ئەركە شەخسی‌یەكان بە پێنج درووشمەكانیشەوە ڕووبەر (مساحة)ێكی زۆر كەم لە ژیانو گوزەرانی ئینسان دادەگرنو، زۆربەی هەرە زۆری دەستوورو یاساكانی ئیسلام كە سەرجەم لایەنەكانی ژیانو گوزەرانی كۆمەڵگا دادەپۆشن ڕوویان لە كۆمەڵو كۆمەڵگای مسوڵمانە و جێبەجێ كردنیان لە وزەی تاكە كەسدا نیە!

ئایا تاکە کەس دەتوانێ ئایینی خوا بەرپا بکاتو بیکاتە پەیڕەوی ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگا؟! (ان اقیموا الدّین)الشوری- ١٣-.

وە ئایا تاکە کەس دەتوانێ دادگەری لەنێو خەڵکیدا بچەسپێنێ لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانیاندا؟! (لَقَدْ ارْسَلنا رُسُلنا بالبَیّنات و أنْزَلنا مَعَهُمْ الكِتاب و المیزانْ لِیَقومَ الناس بالقسطْ ... ) الحدید -٢٥-.

وە ئایا تاکە کەس دەتوانێ هەرچی چاکەیە لە ژیانی کۆمەڵگادا بیچەسپێنێو ڕەگو ریشەی هەرچی خراپەیە دەربێنێ؟! (لَتـأمُرُنَّ بـالمعروف وَ لَتَنْهونَّ عـن المنكـر ) رواه ابو داود الترمزي .

وە ئایا تاکە کەس توانای ئەوەی هەیە کە کێشەو گیروگرفتەکانی خەڵکی بەپێی شەرعی خوا دادوەری بکاتو هەق بچەسپێنێو ناهەقو ستەم لاببات؟! (فاحكم بينـهم بما انزل الله و لا تَتَّبعْ أهواءهم عّما جاءَكَ من الحق ) المائدة -٤٨.

وە ئایا پارێزگاری کردن لە دینو ژینو وەچەو ئابروو و عەقڵو سامان (الدين و الحياة و النسل و العِرْضُ و العقل و المال)ی خەڵکی بە تاکە کەس دەکرێ؟! کە ئیسلام بۆ پارێزگاری لێ کردنی ئەم شەشانە - کە بە شەش شتە پێویستەکان (الضروريات السّت) ی داناون- شەش جۆرە سزای سەختی دیاری کردوون کە بەکۆمەڵگاو حکوومەت نەبێ جێبەجێ ناکرێن، کە بریتین لە سزایەکانی:

١- لە ئایین هەڵگەڕانەوە، کە (کوشتن)ە.

٢- کوشتن، کە (کوشتنەوە)یە ئەگەر کەسوکاری کوژراوەکە بە (خوێن) ڕازی نەبوونو ئامادەیی (لێبوردن)یشیان نەبوو.

٣- داوێن پیسی، کە ئەگەر کچو کوڕ بن سەد قامچییە، ئەگەر نا کوشتنە بە بەرد باران کردن.

٤- بوختان کردن[1] ، کە هەشتا قامچییە.

٥- مەیخۆری یان هەر جۆرە خۆ سەرخۆشکردنێکی دیکە، کە چل یان هەشتا قامچییە.

---

[1] وشەی (بوختان) لە زمانی کوردیدا مانای وشەی (قَذْف)ە لە عەرەبیدا، کە بریتییە لە تۆمەتی داوێن پیسی پاڵدانە لای کەسێکی مسوڵمانی عاقڵو باڵغو ڕەوشت پاک، نەك وشەی (بهتان) کە ماناکەی گشتییەو هەر جۆرە تۆمەتێك دەگرێتەوە.

٦- دزیو ڕێگریو جەردەیی، کە بۆ (دزی) دەست بڕینو بۆ ڕێگریو جەردەییش یەکێکە لەم چوارانە بەگوێرەی سەختیو سووکی ڕێگریو جەردەیی‌یەکە:

کوشتن، هەڵواسین، دەستی ڕاستو پێی چەپ بڕین، دوور خستنەوە (نفي).

ئنجا نەك تەنیا ئەم یاساو دەستوورانە بەبێ هەبوونی کۆمەڵگایەکی تۆکمەو توندو تۆڵو دەستەڵاتو قەوارەیەکی شەرعی بەڕێوە نابرێنو جێبەجێ ناکرێن، بگرە تەنانەت جێبەجێ کردنی ئەرکە شەخسیو تایبەتی‌یەکانیش، بەبێ هەبوونی کۆمەڵگاو قەوارەیەکی شەرعی، وەك پێویست جێبەجێ ناکرێن!ئایا نوێژ بە کۆمەڵ- کە زۆربەی زانایان بە فەرزی دەزانن پێنج نوێژەکان بە کۆمەڵ بکرێن- بەبێ هەبوونی کۆمەڵو کۆمەڵگاو مزگەوت ئەنجام دەدرێ؟!

وە ئایا زەکات - کە ئەرکێکی مالیو کۆمەڵایەتیو سیاسی‌یەو دەبێ میری وەری بگرێ - بەبێ هەبوونی قەوارەی شەرعی وەك شەرع دیاری کردووە وەردەگیرێو دابەش دەکرێ؟!

وە ئایا ڕۆژووی ڕەمەزانو زەکاتی (فطر) و نوێژی جەژن لەگەڵ مسوڵمانان دا نەبێ وەك خۆیان جێبەجێ دەکرێن؟!

وە ئایا حەجو عومرە دەگونجێ بەتەنیا بکرێنو ئەو نهێنیو حیکمەتانەی تێیاندا دانراونو ڕەچاوکراون بێنە دی؟!

وە ئایا ئینسانی مسوڵمان، چ نێر چ مێ چ پیر چ گەنج، بەبێ هاوکاریو هەلو مەرج ڕەخساندنی کۆمەڵگا، دەتوانێ وەك پێویست ئەو ڕەوشتە بەرزو خوو و خدە پەسەندانە لە خۆیدا بهێنێتە دی کە شەرع پێویست یان لانی کەم پەسەندی کردوون؟! وە خۆی لە خوو و خدە پیسو بەدەکان بپارێزێو توخنیان نەکەوێو سەلامەت دەر بچێ؟!

گەواتە: خواپەرستیو دینداریو مسوڵمانەتی بریتیە لە فەرمانبەری بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پابەندی بەئاینو بەرنامەکەیەوە، ئەو فەرمانبەریو پابەندی‌یەش مەحاڵە بەتەنیاو بە شەخسی بکرێو ئەنجام بدرێ، چونکە تەنیا کەمێکی پەیوەستە بە تاکە کەسەوەو زۆربەی هەرە زۆری ڕووی لە کۆمەڵگای مسوڵمانە و بەبێ هەبوونی کۆمەڵگاو قەوارەیەکی ئیسلامی جێبەجێ ناکرێ، مادام وابێ هەر مسوڵمانێك بیەوێ

بەهۆی بەندایەتی کردنی‌یەوە بۆ خوا، خوا لە خۆی ڕازی بکات‌و بە مانای پڕ بە پێستی وشەی پەرستن (عبادە) خوا بپەرستیٚ، پێویستە هەم لە زاتی خۆی‌دا و هەم وەك ئەندامێك لە كۆمەڵ‌و كۆمەڵگای ئیسلامی‌دا سەرگەرمی جێبەجێ کردنی یاساو دەستوورەکانی بەرنامەی خوا بێت‌و هەوڵی چەسپاندنیان بدات لە ژیان‌و گوزەرانی شەخسی خۆی‌و گشتی كۆمەڵگاو دەوروبەرەکەی‌دا.

جا خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەر دەستت هەوڵ‌و هەنگاوێکە لەو ڕێیەدا و خوا پشتیوان بێ ئەگەر بە وردی بیخوێنیەوەو چاك تێی بگەی، بەرچاوت ڕوون دەکاتەوەو شارەزات دەکات کە چۆن چۆنی بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار بکەی‌و بیپەرستی، تاکو بەهۆی باش پەرستنی خواوە، دووەمین پێکهێنەری بنەڕەتی مسوڵمانەتی لە خۆتدا بهێنیەدی و، سەرەنجام ببیە ئەو مسوڵمانە تێرو تەواو و کامڵەی کە شایستەی ڕەحمەت‌و ڕەزامەندی‌و پاداشت‌و بەخششی خوای بەخشەرو دادگەرە، خواش پشت‌و پەناو یاریدەدەرو ڕێ نیشاندەرمان بێت‌و دەرووی خێرو خۆشی دنیاو قیامەتمان لێ بکاتەوە.

١٦ی ڕەجەبی ١٤٢٠
١٩٩٩/١٠/٢٥
شارەزوور / هەڵەبجە

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

وەك چۆن بەشی یەکەمی کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) مان بۆ ڕوونکردنەوەی : (بیرو باوەڕی مسوڵمان) تەرخان کردبوو بە هەرسێك لایەنی: (بنچینەکانی بڕوا، بیرو بۆ چوون، هەڵوێست)ەوە، ئەم بەشی دووەمەشمان بۆ ڕوونکردنەوە و توێژینەوەی دووەمین لایەنی پێکهێنەری کەسایەتی ئینسانی مسوڵمان کە خواپەرستی (العبادة)یە تەرخان کردوە، ئاشکراشە کە خواپەرست (عابد) بوونی ئینسانی مسوڵمان زادەو بەرهەمی بڕوادار (مؤمن) بوونیەتی، هەروەك چۆن ڕەوشت بەرزو جوان بوونی بەرهەمی خوا پەرست بوونیەتی.

بابەتەکانی ئەم بەشی دووەمەش بەم جۆرەی خوارێ ڕیز کراون:

**بابەتی یەکەم**: خواپەرستی بە گشتی.

**کە لەم چوار کورتە باسە پێك هاتووە:**

١- چەمکو واتای وشەی خواپەرستیی.

٢- گرنگیو پلەو پایەی خواپەرستی لە ئیسلامدا.

٣- شوێنەوارو بەرهەمە گرنگەکانی خواپەرستیی.

٤- دابەش بوونی خوا پەرستی بەسەر هەموو ئەندامەکانی جەستەدا.

**بابەتی دووەم**: بنچینە گرنگەکانی هەڵسو کەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکان دا.

کە چەند بنچینەیەکی گەورەو گرنگی شێوازو چۆنیەتی هەڵسو کەوت (تعامل)ی شەرعیانەو ژیرانەی لەگەڵ ئەو مەسەلە فیقهییە مشتو مڕ هەڵگرانەدا تێدا ڕوون کراونەوە کە خوای کاربەجێ لە ڕووی حیکمەتو بەرژەوەندی زۆرو زەوەندەوە وای هەڵخستوون کە ڕوو و چۆنیەتی جیا جیاو جۆراو جۆر هەڵبگرن، بێ ئەوەی بابای مسوڵمان لە بازنەی فراوانی سوننەت بچێتە دەرێ.

**بابەتی سێیەم**: پاك و خاوێنی ( الطهارة ).

كە ئەمیش لەم حەوت (بەند) ە پێكهاتووە :

١- ئاو و جۆرەكانی .

٢-پیسی و جۆرەكانی و چۆنیەتی لابردنی .

٣-لەش پیسی گەورە و گچكە ( الحدث الاكبر و الاصغر ).

٤-تارەت گرتن .

٥-خۆشۆردن .

٦-دەستنوێژ گرتن .

٧- تەیەممووم.

**بابەتی چوارەم** : پێنج درووشمەكانی خوا پەرستی.

كە ئەمانەن:

١- نوێژ بەرپاكردن.

٢- ماڵ بەخشین.

٣- ڕۆژوو گرتن.

٤- حەج و عومرە كردن.

٥- زیكری خوا كردن.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەم بەشە ئەگەر هەمووی لە بەرگێكدا بووایە قەبارەكەی زۆر زل دەردەچوو، بە پەسەندم زانی كە لە دوو بەرگ دا چاپی بكەین، كە بەرگی یەكەم جگە لە بابەتی یەكەم و دووەم و سێیەم دروشمی ، یەكەمی خواپەرستیی (نوێژكردن)یشی گرتۆتە خۆی و، بەرگی دووەمیش چوار دروشمەكەی دیكەی خواپەرستیی:

(ماڵ بەخشین، ڕۆژوو گرتن، حەج و عومرە كردن، زیكری خوا) دەگرێتە نێو خۆی.

خوای بەخشەریش بە كەرەمی خۆی هێزو پێز بخاتە ئەم بەرهەمەوەو بیكاتە مایەی هیدایەت و بەرچاو ڕوونی زیاتر بۆ براو خوشكانی مسوڵمانو چاكتر پێگەیشتن و كامڵ بوونیان.

# بابەتی یەکەم
# خواپەرستیی بە گشتی

١- چەمك و واتای وشەی خواپەرستیی.

٢- گرنگیی و پلەو پایەی خواپەرستیی لە ئیسلام دا.

٣- شوێنەوارو بەرهەمە گرنگەکانی خواپەرستیی.

٤- دابەش بوونی خواپەرستیی بەسەر هەموو ئەندامەکانی جەستەدا.

## چەمك و واتای وشەی خواپەرستی (العبادة):

وشەی (العبادة) كە بە هەموو شێوە بەكارهێنانەكانی‌یەوە (٢٧٥)جار لە قورئانیْدا هاتوە وشەیەكی عەرەبی‌یەو، پێویستە بۆ زانینی چەمك (مفهوم)و واتاكەشی سەر بە فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبی دابگرین و، گوێ بۆ زاناو پێشەوایانی عارەبی‌زان بگرین:

**یەكەم**: خاوەنی (مختار الصحاح) ئاوا مانای وشەی (عبودیة) و (عبادة)ی كردوە:

(... و أصل العبودیة: الخضوع والذُّلّ، و التَّعبید: التذلیل، یُقال: طریق مُعَبَّد، و التَّعبیدُ ایضاً الأستعباد و هو اتخاذ الشخص عَبْداً... و التعبُّدُ ایضاً یقال: تَعَبَّدَهُ اي اتخذه عبداً، و العبادة الطاعة و التعبُّدُ و التَنَسُّكُ...)[1].

واتە: (عبودیة) لە بنەڕەتدا ژێر دەستەیی و مل كەچی‌یە، وە (تعبید) یانی گەردن پێ كەچ كردن، دەگوترێ: (طریق مُعَبَّد- ڕێیەكی تەخت و هەموار كراو)، وە دیسان (تعبید) بە مانای (استعباد)یش دێ، ئەویش بریتی‌یە لە كردنە كۆیلەی كەسێك... دیسان (تَعَبُّد)یش هەمان مەبەست دەگەیەنێ، دەگوترێ. (تعَبَّده) واتە: كردیە كۆیلە، وە (عبادة) یانی: فەرمانبەری و پەرستن و قوربانی سەربڕین...

**دووەم**: (راغب الأصفهاني)یش – توێژەرەوەی زەبر دەستی ماناو مەبەستی وشەو زاراوەكانی قورئانی بەرێز- لەو بارەوە گوتوویەتی:

(العبودیة: إظهار التذلُّل و العبادة أبْلَغُ منها لأنَّها غایة التذلُّل و لا یستَحِقُّها الاّ مَنْ له غایة الافضال و هو الله تعالى و لهذا قال: (الاّ تعبدوا الا إیاهُ) ، و العبادة ضربان: عبادةٌ بالتَّسْخیر... و العبادة بالأختیار وهي لذوي النطق وهی المأمور بها في نحو قوله: (أعبدوا ربكم) و (أعبدوا الله)...)[2]

واتە: (عبودیە) پێشاندانی مل كەچی‌یەو (عبادة) لەوی خەست ترە، چونكە (عبادة) ئەوپەڕی مل كەچی‌یە وە شایستەی كەسیش نیە مەگەر كەسێك كە خاوەنی ئەوپەڕی چاكەو بەخششە كە خوای بەرزە. هەربۆیەش فەرموویەتی: (كە جگە لەوی نەپەرستن)، وە (عبادة)یش دوو جۆرە: - جۆرێكیان (عبادة)ە بەهۆی گەردن پێ كەچ

---

[1] بروانە (مختار الصحاح) ص ١١٩، ١٢٠.

[2] بروانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ص ٣١٩.

کردنەوە.. جۆرێکیشیان (عبادة)ە بە ویستو هەڵبژاردنەوە کە بۆ خاوەن عەقڵانە، کە لـەم جـۆرە ئایەتانـەدا فـەرمانی پـێ کـراوە: (پـەروەردگارتان بپەرسـتن) وە (خـوا بپەرستن).

پاشان (راغب الاصفهانی) لەسەر پێناسەکردنی (عبودیة)و (عبادة) بەردەوام دەبێو دەڵێ: (و العبدُ يقال على اربعة أضربٍ:

١- عبد بحكم الشرع و هو الأنسان الذي يَصِحُ بَيعُهُ و ابتياعُهُ، نحو (العبد بالعبد)، (عَبْداً مملوكاً).

٢- عبد بالأيجاد و ذلك ليس الاّ لله و ايّـاهُ قُصِـدَ بقولـه (ان كـل مَـنْ في السـموات و الأرضِ الاّ آتي الرحمن عَبْداً).

*( و عبد بالعبادة و الخدمة و الناس في هذا ضربان )

٣- عَبدٌ لله مُخلِصـاً وهـو المقصـودُ بقولـهِ: (وآذكـر عَبْدنـا أيُّـوبَ)، (انـه كـان عبـداً شكوراً)، ( نَزلَ الفرقان على عَبْدهِ)... الخ.

٤-و عبد للدنيا و اعراضها وهو المعتكف على خدمتها و مراعاتها و إياهُ قَصَدَ النَبيُّ عليه الصلاة والسلام بقوله: (تَعِسَ عَبْدُ الدّرهم، تَعِسَ عبد الدينار).

٥-وعلى هذا النحو يَصِحُ أن يقال: ليس كل الانسان عبداً لله.. و يقال طريـق معبَّد، اي مُذَلَّلٌ بالوطأ و بَعيرٌ مُعَبَّدٌ أي مُذَلَلٌ بالقطرانِ. وَ عَبَّدْتُ فُلاناً إذا ذلَلْتـهُ و إذا اتخذتهُ عبداً، قال تعالى: (ان عَبَّدْتَ بني إسرائيل). )[١]

واتە: وە وشەی (عبد) بە چوار مەبەستان بەکار دێ:

١-(عبد)ێك کە بە حوکمی شـەرع پـەیدا بووە[٢]، ئـەویش ئـەو مرۆڤـەیە کـە دروستە بفرۆشرێو بکڕێ، وەك (کۆیلە بە کۆیلە)، (کۆیلەیەکی خاوەندار).

---

[١] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) ص ٣١٩و ٣٢٠.

[٢] دیارە ئیسلام ڕژێمی سەیدو کۆیلایەتی دانەهێناوە بەڵکو بەر لە ئیسلام هەبووەو پایەیەکی گرنگی سیستەمی سیاسیو ئابووری بووە لە سەرتاسەری دنیاداو، ئیسلامیش بە جددی هەوڵی نەهێشتنو بن بڕکردنی ئەو دیاردە دواکەوتوویی‌یەی داوە وەك لە چەندان دەقی قورئانو سوننەتدا دەردەکەوێو لە ڕاستی‌دا نەمانی ئەو دیاردە دزێوە یەکێکە لە دیاری‌یەکانی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی.

٢-(عبد)ێك كە بەهۆی وەدیهێنانەوە بۆتە (عبد)، ئەوەش- واتە ئەو جۆرە بەندایەتی بۆ کرانە- بەس مافی خوایە وە بە فەرموودەی خوا: (هیچ کەس لە ئاسمانەکانو زەویدا نیە کە بە بەندایەتی نەیەتە لای خوای بە بەزەیی) ئەوە مەبەست بووە.

وە بەندەیەك کە لە بواری پەرستنو خزمەتدا دەردەکەوێ لەو بارەشەوە خەڵك دوو جۆرن:

٣-بەندەیەك کە ساغ هی خوایە، بەم ئایەتانەش ئەو جۆرە بەندەیە مەبەست بووە: (وە یادی بەندەی ئێمە ئەییوب بکەرەوە). (بێگومان ئەو - واتە نووح علیە السلام- بەندەیەکی سوپاسگوزار بوو)، (جیاکەرەوەی - هەق و باطل-ی ناردۆتە سەر بەندەکەی) ... هتد.

٤-وە (عبد)ێك کە کۆیلەی دنیاو شتەکانێتی، ئەویش کەسێکە کە لەسەر خزمەتکردنی دنیا چاوچڕدادەگرێ. پێغەمبەریش ﷺ ئەو جۆرە کەسەی مەبەست بووە کە فەرموویەتی: (بەندەی درەم (زیو) لە بەین بچێ. بەندەی دینار (زێڕ) لەنێو بچێ).

وە بەگوێرەی ئەم چەمكو واتایە ڕاستە بگوترێ: هەموو ئینسانێك بەندەی خوا نیە... وە دەگوترێ ڕێیەکی (مُعَبَّد) واتە بەهۆی پێدا ڕۆیشتنەوە گەردنی پێ کەچ کراوەو تەختو هەموار بووە، وە حوشترێکی (مُعَبَّد) یانی بە قەترانێ مل کەچو دەستەمۆ کراوە، وە (عَبَّدتُ فُلاناً) ئەگەر ملت پێ کەچ کردبێ، وە ئەگەر کردبێتت بە کۆیلە، خوای بەرز فەرموویەتی: (أن عَبَّدتَ بني إسرائيل) لە سۆنگەی ئەوەوە کە وەچەی ئیسرائیلت کردبوو بە ژێردەستەو کۆیلە- ئەی فیرعەون من بە ناچاری هاتبوومە ماڵی تۆو خزمەت دەکرام، کەواتە لە پیاوەتیو چاکەی تۆوە نەبووەو بۆت نیە بیکەیە منەت لەسەرم کە بەمنداڵی بەخێوت کردووم- [1]

**سێیەم**: (فیروز آبادی) یش لەبارەی چەمكو واتای وشەی ناوبراوەوە گوتوویەتی:

---

[1] ئەم ڕستەیە (ان عبدت بنی اسرائیل) بەشێکە لە وەڵامی (مووسا) علیە السلام لە بەرانبەر قسەی فیرعەون دا کە پێی گوتووە: (أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَ لَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِين ؟ ) الشعراء -١٨- . کە بەڕاستی وەڵامێکی ژیرانەی پڕ بە پێستو دەم کوتکەرە بۆ قسەو منەت کردنی فیرعەون!

(العَبْدِيَّةُ و العُبودية و العبادة: الطاعة). [٢]

واته: (عَبدِيَّةُ) و (عُبودية)و (عبادة) یانی: فەرمانبەری‌و گەردن کەچی.

**چوارەم**: (إبن سيده)ش گوتوویەتی:

(يُقال تَعَبَّد فلان لِفُلانٍ إذا تذلَّل له، و كُل خضوع ليس فوقه خضوع فهو عبادة، طاعة كان للمعبود او غير طاعة، وكل طاعةٍ لله على جهة الخضوع و التذلُّلِ فهو عبادة) [٣].

واته: دەگوترێ: (تَعَبَّد فلان لِفُلانٍ) ئەگەر گەردنی بۆ کەچ بکات، وە هەموو گەردن کەچی‌یەك کە هیچ گەردن کەچی‌یەکی نەگاتێ ئەوە پەرستنە، جا فەرمانبەری بێ بۆ پەرستراو یان فەرمانبەری نەبێ (ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ بە ویست و هەڵبژاردن و ڕەغبەتەوە بێت یان بە پێچەوانەوە). وە هەر فەرمانبەری‌یەك کە بۆ خودا ئەنجام دەدرێ لەسەر شێوەی مل کەچی‌و خۆ زەبوون کردن ئەوە پەرستنە.

**پێنجەم**: (إبن منظور)یش لە کتێبی ناوداری خۆی (لسان العرب)دا، دەربارەی وشەی ناوبراو گوتوویەتی:

(و أصل العبودية الخضوع و التذلُّل) [٤] واته: وە بنەڕەتی (عبودية) گەردن کەچی و سەر نەوی کردنە، هەروەها دەڵێ: (و التَعَبُّدُ التَنَسُّكُ، و العبادة: الطاعة) [٥]واته: وە (تَعَبُّد) پەرستن‌و قوربانی سەربڕینە، وە (عبادة) فەرمانبەری‌یە.

پاشان لە تەفسیری (...وَ عَبَدَ الطاغوت)دا گوتوویەتی: (قال الزَجَّاج و تأويلُ (عبدالطاغوت) اي اطاعهُ يعنى الشيطان فيما سَوَّلَ له و اغواهُ...)[٦]واته: زەججاج گوتوویەتی: وە تەفسیری (عبدالطاغوت) یانی: فەرمانبەری طاغوتی کردوە واته بەقسەی شەیطانی کردوە لەشوێن کەوتنی ئەوەدا کە بۆی جوان کردوەو سەری لێ شێواندوە. ئینجا گوتوویەتی: ( (و قومهما لنا عابدون) اي دائنون و كل من دانَ لِمَلِكٍ فهو عابِدٌ له و قال إبن الأنباري:(فُلانٌ عابِدٌ) و هو الخاضع لربِّه المُستَسْلِمُ المُنْقادُ لأمرِهِ و قوله تعالى (أعبدوا ربكم) اي :أطيعوا ربكم) [٧]

---

[٢] بروانە: (القاموس المحيط)

[٣] بروانە: (المُخَصَّص) لإبن سيدة ج ١٣ ص٩٦

[٤] (لسان العرب) ج٢ ص٢٧١

[٥] سەرچاوەی پێشوو ج٢ ص ٢٧٢

[٧] هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٢٧٣،٢٧٤

واتـه: (و قومـهما لنـا عـابدون) گەلەكـەیان (عـابد)ی ئێمـەن یـانی مـل كـەچمانن ﴿ئەمە قسەی فیرعەونە دەربارەی مووساو هاروونی برای علیهما السلام و گەلەكەیان ﴾.
وە هەركەسێك مل بۆ پادشـایەك كـەچ بكـات ﴿ دیـارە مەبەسـت سـەرۆك‌و پادشـای كـافرە﴾ ئـەوە پەرسـتاریەتی، وە (ابـن الانبـاري) گوتوویـەتی: فلانكەسـە عـابیدە، كەسێكە گـەردن كـەچی پەروەردگاریـەتی‌و جێبەجێكـەری فەرمانیـەتی، وە قسـەی خوای بەرز: (پەروەردگارتان بپەرستن) یانی: فەرمانبەری پەروەردگارتان بكەن.
**شەشەم**: (إبن تیمیة) ئاوا پێناسەی (عبادة) دەكات:
(العبادة اسم جامع لكل ما يُحبُهُ و يرضاه من الأقوال الظاهرة و الباطنة و جُمَاع العبادة: كمال الحُبِّ مع كمال الذُلِّ. فالظاهرة كالصلاة و الزكاة و الصّيام و الحج و صدق الحديث و أداء الأمانة و بِرِّ الوالدين و صلة الارحام و الوفاء بالعهود و الامر بالمعروف و النهي عن المنكر و الجهاد للكفار و المنافقين و الاحسان الى الجار و اليتيم و المسكين و إبن السبيل و البهائم و الدُعاء و الذِكر والقراءة و الباطنة كحب الله و رسوله و خشيته و الأنابة إليهِ و إخلاص الدين له و الصَّبر لَحُكمَهِ و الشكر لَنِعَمِهِ و الرِّضا بِقضائهِ و التوكل عليه و الرجاء لِرَحمتهِ و الخوف من عذابِه) [1]
واتە: عبادة ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەموو ئەو قسەو كردەوە ئاشكراو پەنهانانەی كە خوای بەرز خۆشی دەوێن‌و پەسەندیان دەكات، وە پوختەی مانای (عبادة) بریتی‌یە لە:خۆشویستنی تـەواو وێڕای گـەردن كـەچی تـەواو، دیوی ئاشكرای خوا پەرستی وەك: نوێـژو زەكـات‌و ڕۆژوو گرتـن‌و حـەج، ڕاسـت بێـژی و جێبـەجێ كردنـی ڕاسـپاردەو، چاكـە لەگـەڵ بـاب‌و دایـك‌و پاراسـتنی پـەیوەندی خزمایـەتی، و بەجێهێنانی بەڵێن‌و پەیمان‌و، فەرمان بە چاكەكردن‌و ڕێ لـە خراپەگرتن‌و جیهاد كردن دژی كافرو دەغەڵان‌و، چاكەكاری لەگەڵ دراوسێ‌و هەتیو و هەژارو ڕێبوارو ئاژەڵ، وە پاڕانەوەو زیكرو قورئان خوێندن، دیوی پەنهانیشی وەك: خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەكەی‌و ترسان لە خواو گەڕانەوە بۆلای‌و، سـاغ كردنـەوەی گـەردن كـەچی بـۆی‌و، ئـارام گـری بـۆ حوكـم‌و بڕیـاری‌و سوپاسـكردنی لەسـەر نـازو نیعمەتـەكانی‌و، ڕازی بـوون بـە قـەزاو قـەدەری‌و، پشـت پـێ بەستنی‌و، ئومێـد بـە بەزەیی‌و بەخشندەیی بوونی‌و، ترس‌و سام لە ئازارو ئەشكەنجەی..

[1] كتێبی (العبودية) لإبن التيمية.

**حەوتەم**: (إبن قيِّم الجوزية)ش دەربارەی وشەی (عبادة) گوتوویەتی:

(و بُنيَ (أياك نَعبد) على أربع قواعد: التحقق بما يحبه الله و رسوله و يرضاه من قول اللسانِ و القلب و عمل القلب و الجوارح.. فقول القلب: هو آعتقادُ ما أخبر الله سبحانه به عن نفسه و عن أسماءهِ و صفاته و أفعالهِ و ملائكتهِ و لقائهِ على لسان رسلهِ، و قول اللّسان: الأخبار عنه بذلك و الدعوة اليه و الذب عنه و تبيين بطلان البدع المخالفة له و القيام بذكره و تبليغ أوامره، و عمل القلب، كالمحبة له و التوكل عليه و الأنابة اليه و الخوف منه و الرجاء له و إخلاص الدين له و الصبر على أوامره و عن نواهيه و على أقداره و الرضى به و عنه، و الموالاة فيه و المعاداة فيه و الذل له و الخضوع و الاخبات اليه و الطمأنينة به و غير ذلك من أعمال القلوب التي فَرْضُها أفْرَضُ من عمل الجوارح و مُسْتَحبُّها أحب الى الله من مُسْتَحبِّها، و عمل الجوارح بدونها اما عديمُ المنفعة او قليل المنفعة و عمل الجوارح كالصلاة و الجهاد و نقل الأقدام الى الجمعة و الجماعات و مساعدة العاجز و الأحسان الى الخلق و نحو ذلك..)[٢].

واتە: وە (بەس تۆ دەپەرستین- أياك نعبد-) لەسەر چوار پایان بنیات نراوە کە بریتین لە جێبەجێکردنو لە خۆدا هێنانەدی هەرچی خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێو پەسندی دەکەن لە قسەی زمانو دڵو کردەوەی دڵو ئەندامەکان.

١- قسەی دڵ: کە بریتی‌یە لە قەناعەت هەبوونو بڕوا پێ بوونی هەرچی خوای پاکو بێ وێنە دەربارەی خۆیو ناوەکانیو سیفەتەکانیو کردەوەکانیو فریشتەکانیو بە دیدار گەیشتنی لەسەر زمانی پێغەمبەرانی هەواڵی پێ داوە.

٢- قسەی زمانیش بریتی‌یە لە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستیانەی گوترانو بانگەوازی خەڵك بۆ کردنیان و بەرگری لێ کردنیان و ڕوونکردنەوەی پووچی ئەو شتە داهێنراوانەی کە پێچەوانەیانن، وە یادی خوا کردنو ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی.

٣- کردەوەی دڵیش وەك خۆشویستنی خواو پشت پێ بەستنیو گەڕانەوە و بۆلا ژیوان (پەشیمان) بوونەوەیو لێ ترسانیو هیوا پێ بوونیو، گەردن کەچی بۆ ساغ کردنەوەیو خۆڕاگری لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو نەکردنی قەدەغەکراوەکانیو، ئارامگرتن لە بەرامبەر قەزاو قەدەرو بەڵاو گرفتەکان دا و پێڕازی بوونیانو لێ ڕازی بوونیو، دۆستایەتیو دوژمنایەتی لە پێناودا

---

[٢] بڕوانە: (مدارج السالكين) ج١ ص ١٠٠، ١٠١

کردنی و، خۆ بۆ زەبوون کردنی و گەردن کەچی و تەسلیم بوونی و ئارام پێ گرتنی و، غەیری ئەوانەش لە کردەوەکانی دڵان کە فەرزەکانیان لە کردەوەی ئەندامەکان پێویست ترن و سوننەتەکانیشیان لەلای خوا لە سوننەتەکانی ئەندامەکان خۆشەویستترن، وە لە ڕاستی‌دا کردەوەی ئەندامەکان بەبێ ئەوان یان هەر بێ سوودن یان کەم سوودن.

٤- کردەوەی ئەندامەکانیش وەك: نوێژو جیهاد کردن و هەنگاو نان بەرەو ئەنجامدانی نوێژی جومعەو نوێژەکانی بەکۆمەڵ و، هاوکاری کردنی خەڵکی دەستەوستان و چاکەکاری لەگەڵ خەڵکی‌داو شێوەی ئەوانە.

ئێستاش دوای ئەوەی چەمك و مەبەستی وشەی (عبادة)مان لە فەرهەنگەکانی زمان دا و لە لای زانایانی شەرعزانیش بۆ ڕوون بۆوە، با سەرنج بدەین داخوا خوای کاربەجێ و زانا لە قورئانی بەهێزو پیرۆزدا وشەی ناوبراوی بۆ چ واتاو مەبەستێك بەکار هێناوە:

دوای سەرنج دان و تێوەڕامانی وردو قووڵ لە سەرجەم ئایەتە بەرێزەکانی قورئانی بەرێز، بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی ناوبراو بۆ سێ مەبەستی سەرەکی و مەزن بەکار هێنراوە بە هەموو ڕێژگە (صیغة)کانی بەکارهێنانی‌یەوە کە ئەمانەن:[1]

١-مل کەچی و بەندایەتی و ژێردەستەیی (الذل و العبودية و الخضوع):بۆ وێنە:

أ- (إن كل مَنْ في السَموات و الارضِ إلاّ آتِ الرحمن عبداً ) مريم -٩٣-.

واتە: هیچ کەس لە ئاسمانەکان و زەوی دا نیە مەگەر بە بەندایەتی دێتە لای خوای بەزەیی.

ب- (و تِلكَ نعمَةَ تَمُنُّها عليَّ أنْ عَبَّدت بني إسرائيل) الشعراء -٢٢-.

واتە: ئەوەش چاکەیەکە کە منەتی پێ لەسەر من دەکەی و لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە وەچەی ئیسرائیلت کردبوو بە کۆیلەو ژێردەستە.

ج- (ثم ارسَلنا موسى و أخاه هارونَ بآياتِنا و سُلطان مبين , الى فرعونَ و مَلَئِهِ فَآسْتَكبروا و كانوا قَوماً عالين, فقالوا أنؤمِنُ لِبَشَرين مثلنا و قومهما لنا عابِدونْ) المؤمنون -٤٥-٤٦-٤٧-.

---

[1] بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە کتێبی (المصطلحات الأربعة فى القرآن)ی (ابو الأعلى المودودي) وەرگرتوە.

واتە: پاشان مووساو هاروونی برایمان بە چەندان نیشانەو بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە ڕەوانە کرد بۆلای فیرعەون و دارو دەستەکەی بەڵام ئەوان خۆیان بە زل گرت و پێشتریش گەلێکی خۆ بە بەرزگر بوون، گوتیان: ئایا بڕوا بە دوو ئینسانان بهێنین کە وەك خۆمانن و گەلەکەشیان بەندایەتیمان ئەکەن!!

٢- فەرمانبەری و پابەندی بە حوکم و بەرنامەوە (الطاعة والالتزام بالحكم و الشريعة): بۆ وێنە:

أ-(يأيها الذينَ امنوا كلوا من طَيبات ما رزقناكُمْ و اشكُروا لله إنْ كُنْتُمْ اياهُ تَعبُدونْ )البقرة -١٧٢-.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو ڕۆزیە چاك و پاكانە بخۆن كە پێمان داون، وە سوپاسی خوا بكەن ئەگەر ئەو دەپەرستن. (واتە بەندایەتی و پەرستنتان بۆ خوا بریتییە لە پابەندیتان بە حەڵاڵ و حەرامێكەوە كە بۆی دیاری كردوون).

ب- ( قلْ هَلْ أُنَبئكُمْ بشَرٌ من ذلك مثوبة عندالله ! مَنْ لَعنَهُ الله و غضَبَ عليه و جعــل منـــهم القردة و الخنازير و عَبَدَ الطاغوت ) المائدة -٦٠-.

واتە ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە پاداشتی خراپتر لەوە لەلای خوا! - سزای کەسێکە کە خوا نەفرینی لێ کردوە و لێی تووڕە بووە و گێڕاونی بە مەیموون و بەراز وە طاغووتیان پەرستوە، (دیارە مەبەستیش لە پەرستنی طاغووت لێرەدا فەرمانبەری کردنی جوولەکەکانە بۆ پیاوە ئایینی و دەسەڵاتدارەکانیان، چونکە (طاغوت) بریتییە لە هەر شتێك كە لەگەڵ خوا یا لەجیاتی خوا بپەرسترێت).

ج-(و لقد بعثنا في كلِ امةٍ رسولاً أن اُعْبدوا الله و اُجتنبوا الطاغوت .. ) النحل -٣٦-.

واتە: وە بێگومان لە نێو هەر کۆمەڵێك دا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە کە خوا بپەرستن و لە طاغووت خۆ دوور بگرن!..

٣- ئەنجامدانی درووشمەكان (أداء الشعائر): بۆ وێنە:

ا- (قُلْ اني نُهيتُ أنْ أعبدَ الذين تَدْعون من دون الله لما جاءنِيَ البَينات من ربّي ...) غافر - ٦٦-.

واتە: بڵێ من لێم قەدەغە کراوە کە ئەوانە بپەرستم کە ئێوە لەجیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، دوای ئەوەی لە پەروەردگارمەوە بەڵگە گەلی ئاشکرام بۆ هاتوون..

ب- (و الذين اُتخذوا من دونهِ أولياءَ مانعبدهُمْ الاّ لِيُقَرِّبونا الى الله زُلفىٰ ....) الزمر -٣-.

واتە: وە ئەوانەی لەجیاتی خوا چەند دۆستێکی دیکەیان گرتوون - دەڵێن - تەنیا بۆیە ئەوان دەپەرستین کە لە خوامان نزیك بخەنەوە..

ج- (قُلْ إنَّ صلاتِي و نُسُكي و محياي و مماتِي لله ربِّ العالمين , لا شريك له و بذلك اُمِرتُ و أنــا أوّلُ المسلمين )الانعام -١٦٢-١٦٣.

واته: بلێ بێگومان نوێژم‌و قوربانی سەربڕینم‌و ژیانم‌و مردنم بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانەکانە، هیچ هاوبەشی نین وە هەر بەوەش فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمینی موسوڵمانانم.

بەڵێ مسوڵمانی بەرێزو خۆشەویست!

وەك لەبەر تیشکی ئەو سێ کۆمەڵە ئایەتەدا- کە وەك چەند نموونەیەك هێنامانەوە- دەردەکەوێ، دەبینین کەوشەی (عبودیة)و (عبادة) لە فەرهەنگ‌و زاراوەی قورئانی قسە لەجێ‌و پڕ پیت‌و پێزو بەرێزدا سێ واتای گرنگ‌و گەورەو سەرەکی هەن:

١- مل کەچی‌و بەندایـەتی‌و ژێـر دەسـتەیی، کـە بێگومـان بـەم واتایـە سـەرلەبەری بوونەوەرو تێکڕای خەڵکی بە مسوڵمان‌و کافرەوە بەندەی خوای پەروەردگارن‌و مل کەچ‌و ژێردەستەنی، زانایانیش بەم جۆرە بەندایەتی‌یە ناچاری‌یەی کائینات دەڵێن: (العبودیة التکوینیة)، کە بێگومان نابێتە مایەی مەدح‌و زەم‌و پاداشت‌و سزا.

٢-فەرمانبەری‌و پابەندی بە حوکم‌و بەرنامەوە، کە ئەم جۆرە بەندایەتی‌یەش تایبەتە بەوانەوە کە بەویست‌و هەڵبژاردنی ئازادی خۆیان خوا دەپەرستن‌و بەندایەتی بۆ دەکەن، کە ئەم جۆرە بەندایەتی‌یەش پـێ‌ی دەگوترێ (العبودیـة التشریعیة) کە مایەی مەدح‌و زەم‌و پاداشت‌و سزای دنیاو دوارۆژە.

٣-ئەنجامدانی درووشمەکانی پەرستن (الشعائر التعبدیـة)، کە لـە ڕاستی‌دا ئـەمیش هەر بەشێکە لە جۆری دووەمی بەندایەتی بۆ خوا کردن‌و پەرستنی، چونکە هـەر کاتێك ئینسان خۆی تەسلیمی حوکم‌و بەرنامەی خوا کردو ڕایگەیاند کە خوای پـەروەردگار بە تاقە پەروەردگارو پەرستراو و فەرمانڕەوا(الرب والألـه و الحـاکم الوحید) دەزانێ، دیارە ڕێ‌ی لە خۆی گرتوە کە جگە لە خوای دادگەرو میهرەبان یاساکانی زیندەگی (شرائع الحیاة)و درووشمەکانی بەندایەتی (شعائر التعبد) لە سەرچاوەیەکی دیکە وەربگرێ، شتێکی ئاشکراشە کە دروشمەکانی بەندایەتیش بەشێکی کەم بـەڵام زۆر گرنگـی ئـەو حوکم‌و بەرنامـە گشـتی‌و گشـتگیر (عـام و

شامل)و هەمەلایەنەن کە ئیسلامە، لەچاو ئەو هەموو یاساو دەستوورانەی دیکە کە پەیوەندی‌یان بە لایەنە زۆرو جۆراوجۆرەکانی ژیانی تاک‌و کۆمەڵەوە هەیە.

ئێستاش بۆ چاکتر تێگەیشتن لەوەی ڕابرد و لە چەند خاڵێك دا کورت‌و پوختی بکەینەوەو تیشکی زیاتریش بخەینە سەر چەند مەسەلەیەك:

<u>یەکەم:</u> وشەی (عبودیة)و( عبادة) لە ئەسڵی زمانی عەرەبی‌دا بە مانای مل کەچی‌و فەرمانبەری‌و ژێردەستەیی دێت‌و، شەرعیش هەر لەسەر واتا ئەسڵی‌یەکەی خۆی بەکاری هێناوە، ئەوەندە هەیە مەرج (شرط)ی (بەس بۆ خوا بوون)ی خستۆتە سەر کەواتە وشەی ناوبراو لە زاراوی شەرع دا بریتیە لە (بەس پەرستنی خوا)و (تەنیا بەندایەتی کردن بۆ خوا). یەکێك لە زانایانیش ئاوای پێناسە کردوە کە من زۆرم پێ پەسەندە (العبادة: هي التّذلُّل لله مَحبةً و تَعظيماً بفعل اوامره و اجتناب نواهيه على الوجه الذي جاءت به شرائعه)[1] واتە: (عبادة) بریتیە لە مل بۆ خوا کەچ کردن لە ڕووی خۆشویستن‌و بە مەزن گرتنی‌یەوە، کە ئەمیش لە جێ‌بەجێ کردنی فەرمانەکانی‌و خۆ دوورگرتن لە قەدەغەکراوەکانی‌دا بەو پێ‌یەی کە بەرنامەکەی ڕوونی کردۆتەوە، خۆی دەنوێنێ.

ئینجا شایانی باسیشە کە لە زمانی کوردی‌دا وشەی (خواپەرستی) لەجیاتی (عبادة) دانراوە کە پێم وایە زۆر بەجێ‌و پڕ بە پێستە.

<u>*دووەم:*</u> وشەی خواپەرستی (عبادة) یش لە بەکارهێنانی شەرع- واتە قورئان‌و سوننەت- دا تێکڕای جموجوڵ‌و چالاکی‌یەکان‌و دەرو دەروون (ظاهر و باطن)ی ئینسان‌و سەرلەبەری ژیان‌و گوزەران دەگرێتەوەو، هەروەك چۆن دروشمەکانی بەندایەتی (الشعائر التعبدية) دیاری دەکات وەك: نوێژو ڕۆژوو و زەکات‌و حەج‌و زیکرو دووعاو سەربڕین‌و ئیعتیکاف‌و تەواف و...هتد، بەرنامەکانی زیندەگی (الشرائع الحياتية)ش لە هەموو بوارەکانی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و خێزانی‌و جەنگ‌و ئاشتی‌و .. هتددا بەدەست تاك‌و کۆمەڵەوە دەدات‌و لەغەیری خواو بەرنامەو ئایینەکەی بێ نیازیان دەکات.

---

[1] بروانە: (فتاوى العقيدة) ص ١٢٩ (إبن عثيمين).

سێیەم: ئنجا کە دەبینین لە عورفی گشتیو باوی مسوڵمانان دا وشەی عیبادەت زیاتر بۆ درووشمەکانی بەندایەتیو لایەنی شەخسیو مەعنەوی ئینسان بەکاردێو زانا و شەرعزانان (فقهاء)یش لەنێو خۆیان دا یاساو دەستوورەکانی ئیسلامیان بۆ دوو بەش: (العبادات)و (المعاملات) واتە: پەرستنەکانو هەڵس وکەوتەکان، دابەش کردوون، لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا کە ئێمە دەربارەی چەمكو واتای ڕاستەقینەی وشەی ناوبراو خستمانە ڕوو تێك ناگیرێ، چونکە ، یەکەم: چەمكو واتا عورفیو باوەکانی وشەو زاراوەکان مەگەر لەلای خەڵکی سادە وعەوام ئەگەر نا نابنە هۆی گۆڕانو لاچوونی واتاو چەمکە ئەسڵیو حەقیقییەکان، دووەم: زانایانو شەعزانانیش زیاتر بە مەبەستی ئاسانکاری تێگەیاندنی خەڵکی یاساو دەستوورەکانی ئیسلامیان بەو جۆرە دابەش کردوە و، هەمیشەش داکۆکییان لەسەر ئەو ڕاستییە مەزنە کردووە کە عیبادەت هەموو جم وجۆڵو کردەوەو قسە پەنهانو ئاشکراکانی ئینسانو سەرجەم بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەرانی تاكو کۆمەڵ دەگرێتەوەو، هێندەی نووکی دەرزی لێ نابوێرێ !

چوارەم: شتێکی ئاشکراشە کە تەسك کرانەوەی چەمكو واتای وشەی عیبادەتو کورت هەڵهێنانی لە ئەنجامدانی درووشمەکانی بەندایەتیداو، دارنینی واتاو چەمکی بەرنامەدانانو فەرمانڕەوایەتی (التشریع و الحاکمیة) لە وشەی ناوبراو کاریگەرییەکی یەکجار خراپوشوومی لەسەر بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی مسوڵمانان هەبووە، چونکە مەیدانو گۆڕەپانی دینداری و خواپەرستییان یەکجار لێ کەمبەرو تەسكو تەنگ بۆتەوەو، بەزۆری تەنیا لەبەردەم درووشمەکانی بەندایەتی خۆیان بە بەرپرسیار زانیوە!

بەڵام بێگومان هەرکەس سەرنجی ئەم دەقانە بدات کە لۆچێکن لە تەغارێك دڵنیا دەبێ کە عیبادەت کاكڵو جەوهەرەکەیو بڕبڕەی پشتیء خوا بە تاقە بەرنامەدانەرو فەرمانڕەوای خۆزانینەو پەرستراوێتی خوا (أُلُوهِیَّةُ الله) زیاتر لە بەرنامەدانانو فەرمانڕەوا بوونیدا دەدرەوشێتەوە:

أ- (ان الحکمُ إلا لِلّه أَمَرَ ألاّ تعبدوا إلا إیّاهُ ذلك الدین القَیِّمُ و لکن اکثر الناس لایعلمون ) یوسف- ٤٠-.

واتە : فەرمانڕەوایەتی تەنیا بۆ خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەو نەپەرستن، ئەوە دینداری ڕاستو تەواوە، بەڵام زۆرینەی خەڵکی نازانن.

(لەم ئایەتەدا وەك ڕۆژی ڕوون دیارە کە تەنیا کاتێك خوا بە تەنها دەپەرسترێ کە هەر ئەو بە حاکمو فەرمانڕەوا دابنرێو هەر ئەوەش بە دینداریو مسوڵمانەتی ڕاستەقینە حیساب دەکرێ).

ب- (و الذين آجتنبوا الطاغوت أن يَعبُدوها و أنابوا الى الله لهم البشرىٰ ...) الزمر -١٧-.

واتە: وە ئەوانەی کە لە پەرستنی طاغووت خۆیان دوور گرتووەو گەڕانەوە لای خوا موژدەیان - لە لایەن خواوە- هەیە..

(ئاشکراشە کە پەرستنی طاغووت- کە هەر پەرستراوو فەرمانبەری بۆ کراوێکە جگە لە خوا- بریتیە لە بەقسەکردنو فەرمانبەری کردنیو بە فەرمانڕەوا لەقەڵەم دانی، ئەگەر نا هیچکەس نوێژو ڕۆژوو و حەجو ..هتد بۆ غەیری خوا ئەنجام نادات!).

ج- (أَلَمْ أَعْهَدْ إليكُمْ يا بني آدم أن لا تعبدوا الشيطان إنهُ لكم عَدوٌ مبين , و أن أعْبدون هـــذا صراط مُستقيم ) يس -٦٠-٦١-.

واتە: ئەدی ئەی وەچەی ئادەم پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن، بێگومان ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە! وە - ئایا پێم ڕانەگەیاندن- کە تەنیا من بپەرستن ئەوەیە ڕێی ڕاست!!

(دیارە پەرستنی شەیتانیش دیسان بریتی نیە لە سوجدەو ڕکووع بۆ بردنیو نوێژ بۆکردنیو ڕۆژوو بۆ گرتنی، بەڵکو بریتی‌یە لە شوێنکەوتنیو فەرمانبەری کردنی).

د-(اتخذوا أحبارهم و رهبانهم أرباباً من دون الله و المسيح بن مريم و ما أُمِروا إلاّ لِيَعبدوا إلهـــاً واحداً , لا إله إلا هو سُبحانَهُ عما يُشرِكون ) التوبة -٣١-.

واتە: -جوولەکەو دیانەکان-حەبرو ڕاهیبەکانی خۆیانیان کردنە فەرمانڕەوا لەجیاتی خوا هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەم، وە فەرمانیشیان پێ نەکرابوو مەگەر بەوە کە یەك پەرستراو بپەرستن، جگە لەوی هیچ پەرستراو نین، پاکی بۆی لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی - لە پەرستن دا-.(احمد و ترمذی)[1] گێڕاویانەتەوە کە (عدي بن حاتم الطائي) لە کاتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خاچ (صليب)ێکی زیوی لە مل

[1] بڕوانە تەفسیری (إبن كثير) ج٢ ص ٣٤٩

دا بوو، پێغەمبەریش ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێند (إتخذوا أحبارهم و رُهْبانهم أرباباً من دون الله) –عَدِي– دەڵێ گوتم: (إنَّهم لم يَعْبدوهُمْ) ئەوان نەیاندەپەرستن! – پێغەمبەر فەرمووی: (بَلىٰ إنهم حَرَّموا عليهم الحلال و أحَلّوا لهم الحرامَ فَاتّبَعوهم فذلك عبادتهم إيّاهم) با ئەوان – حەبرو ڕاهیبەکان– حەڵاڵیان لێ حەرام دەکردن و حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکرن و ئەوانیش – واتە جوولەکەو دیانەکان– شوێنیان کەوتن، جا ئەوە پەرستنیان بوو بۆیان.

جا لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کەسانە چەند سادەو نا تێگەیشتوون کە دەڵێن: ئیسلام حوکم و سیاسەتی تێدا نیەو مسوڵمانی صالح و باش ئەو کەسەیە کە ئەوەندەی بۆی بلوێ لە سیاسەت و حزبایەتی و کاروباری دنیاوە دووربێ و، هەر سەرگەرمی زیکرو فیکرو نوێژو ڕۆژوو و مسوڵمانەتی خۆی بێت و، هەقی بەسەر هیچ کەس و هیچ شتێکەوە نەبێ!!

پێنجەم: وەك پێشتریش گووتمان درووشمەکانی پەرستن بەشێکن لە حوکم و بەرنامەی خوای پەروەردگارو دادگەر، چونکە بەرنامە و ئاینی خوا سبحانه و تعالىٰ بە گشتی دوو بەشە، بەشێکی کە گچکەترە پەیوەندی بە شەخصی مرۆڤەوە هەیە وەك تاك، وە بەشەکەی دیکەش کە زیاترو فراوانترە پەیوەستە بە کۆمەڵگاوە، جا هەرچی درووشمەکانی پەرستن (شعائر التعبد)ن بەزۆری لە جۆری یەکەمن و، بەرنامەکانی زیندەگی (شرائع الحياة)یش بەزۆری لە جۆری دووەمن، دیسان درووشمەکان زیاتر لایەنی ڕووحی و مەعنەوی دەگرنەوەو، بەرنامەکانیش پتر لایەنی سیاسی و ماددی، هەرچەندە لە نێوانیشیان دا پەیوەندی و تێکهەڵکێشیش هەر هەیەو، لەیەکتر دابڕاو نین، هەروەك چۆن ڕووح و جەستە لەگەڵ جیاوازی زۆری نێوانیان پێکەوە پەیوەست و تێهەڵکێشن، هەروەها تاك و کۆمەڵیش بەهەمان شێوە وێڕای جیاوازی نێوانیان پەیوەندی و کارلێکردنی دوو سەرەشیان هەر هەیە.

شایانی باسیشە کە هەندێك لە زانایان زاراوی خواپەرستییە ڕووتەکان (العبادات المحضة)یان بۆ ئەو جۆرە خواپەرستییانە داناوە کە بە درووشمەکانی پەرستن (شعائر التعبد) تەعبیریان لێ دەکرێت، بۆ ئەوەی جیایان بکەنەوە لە باقی جۆرەکانی دینداری و خواپەرستی کە هەموو چالاکی و جموجۆڵەکانی ئینسان بە تاك و کۆمەڵەوە، تێکڕای بوارەکانی ژیان و گوزەران دەگرنەوە بەبێ هەڵاواردن (إستثناء)ی هیچ شتێك چ ورد بێ چ درشت.

## جا مسوڵمانی بەرێزو خۆشەویست:

ئێستا کە زانیت خواپەرستی (عبادة) یانی چی‌و چی و چی دەگەیەنێ، لە کاتێك دا کە دەڵێی (اياكَ نَعْبُدُ)، دەزانی ئەو قسەیەت چ دەگەیەنێ‌و چ پەیمانێك لەگەڵ خوادا دەبەستی‌و چ گفت‌و بەڵێنێك بە خوای پەروەردگارت دەدەی؟! تۆ لەکاتی گوتنی ڕستەی ناوبراودا بەڵێن‌و پەیمانێك لەگەڵ خوای پەروەردگارو تەنیا پەرستراوی خۆت دا دەبەستی کە لەم برگانەی خوارێ پێك هاتوە و بە زمانی حاڵت دەڵێی:

١-* ئەی خوای پەروەردگار! بە دەرو دەروون (ظاهر و باطن)ەوە بەس خۆم تەسلیمی تۆ دەکەم‌و، هەست‌و نەست‌و دڵ‌و دەروون‌و مۆخ‌و ئێسقان‌و ڕەگ‌و ڕیشەو ڕووح‌و جەستەم مل کەچ‌و ژێردەست‌و بەرفەرمانی تۆیە!

٢-* خوای بەرزو مەزن! تۆم لە هەموو کەس‌و هەموو شتێك تەنانەت لە خۆشم خۆشتر دەوێ‌و هەر کەس‌و شتێکی دیکەشم خۆش بوێ هەر لەبەر تۆو لە پێناوی تۆداو، بەپێی حوکم‌و بەرنامەی تۆ خۆشم دەوێ.

٣-* خوای باڵادەست‌و زاڵ! تەنیا لە تۆو ئازارو ئەشکەنجەی تۆ ترس‌و بیمم هەیەو، ئەو سام‌و هەیبەتەی کە بەرامبەر بە تۆ هەمە بەرامبەر بە هیچ کەسێك‌و هیچ شتێکی تر نیمە.

٤-* خوای بێ نیازو جێی نیاز! ئومێدو هیوام تەنها بە بەزەیی‌و بەخشندەیی‌و کەرەم‌و لوتفی تۆ هەیە بۆ دنیاو قیامەت‌و، هەرچی چاکەو نیعمەت‌و خێرو خۆشی‌یە بەس لەتۆی دەزانم‌و هەر لە تۆی چاوەڕێ دەکەم.

٥-* خوای بە دەنگەوەهاتوو و دەرووکەرەوە! پشتم هەر بە تۆ دەبەستم‌و دڵم بەس بە تۆ پەیوەستەو، دڵنیام کە هیچ خۆشی‌و نیعمەتێك بەبێ لوتف‌و بەخششی تۆو هیچ ناخۆشی‌و بەڵایەك بەبێ ئیزن‌و مۆڵەت دانی تۆ ڕوو لە هیچ کەس ناکات.

٦-* ئەی تاقە پەرستراوی ڕاستەقینە! بێجگە لە تۆ هیچ کەس بە شایستەی ئەوە نازانم کە ڕووی نیازو مەبەستەکانمی تێ بکەم‌و داوای لێ بکەم‌و لێی بپاڕێمەوە، چونکە بەس تۆ خوای‌و غەیری تۆ هەموو دروستکراوو بەندەو چاو لەدەستی تۆن هەرچی بن‌و هەرکەسێك بن.

٧-* ئەی فەرمانڕەوای دادگەرو کاربەجێ! هەر تۆ بە پەروەردگارو پشتیوان‌و بەرنامەڕێژ و فەرمانڕەوای خۆم‌و خەڵکی دەزانم‌و، بە گوناح‌و تاوان‌و بگرە بە شیرك‌و

کوفری دەزانم کە بۆ ڕێکخستنی ژیان‌و گوزەرانی تاکی‌و کۆمەڵیم‌و ڕووحی‌و ماددیم بێجگە لە تۆ ڕوو لە هیچ کەس‌و لایەن‌و سەرچاوەیەك بکەم‌و، هیچ حوکم‌و یاسایەکیان لێ وەربگرم.

٨-* ئەی خوای بێ وێنەو بێ هاوەڵ! دڵنیاو مسوّگەریشم کە هەروەك چۆن ڕکوع‌و سوجدە بۆ غەیری تۆ بردن‌و قوربانی بۆ غەیری تۆ سەربڕین‌و پاڕانەوە لە غەیری تۆو، بەرزکردن و نزم کردن و قازانج و زیان گەیاندن و نەخۆش کەوتن‌و چاکبوونەوەو سەرکەوتن و ژێرکەوتن لە غەیری تۆ زانین، هاوبەش پەیداکردنی گەورە (الشرك الاكبر)ن‌و، ئینسانیان پێ لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەچێتەدەرێ، بەهەمان شێوەش ڕەدکردنەوەو بە ڕاست‌و تەواو نەزانینی یەك تاکە حوکم‌و یاسای ئایین‌و بەرنامەی تۆ، یان پەسندکردن و وەرگرتنی یەك حوکم‌و یاسای پێچەوانەی ئایین‌و بەرنامەی تۆ لە هەر بوارو لایەنێکی ژیان‌و گوزەرانی تاکی‌و کۆمەڵی‌و ڕووحی‌و سیاسی‌دا، کوفرو شیرکی گەورەیەو، ئەو سەرچاوەو کەس‌و لایەنە کە ئەو جۆرە حوکم‌و یاسایانەشی لێ وەردەگیرێن بە (طاغوت) دادەنرێ‌و، کراوەتە هاوبەشی خوا، لە بەرنامە دانان و فەرمانڕەوایەتی‌دا کە گەورەترین و سەرەکی‌ترین بەشی پەرستراوێتی (ألوهية)ی خوای تاك‌و بێ هاوەڵە.

٩-* سا خوایە بە لوتفی خۆت یارمەتیم بدە کە بەندەی ساغ‌و یەکلابووەوەی تۆ بم‌و بەشی کەسی دیکەم پێوە نەبێ‌و، هەروەك چۆن جگە لە تۆ هیچ کەس دروستکەر (خالق)و پەروەردگار (رب)و ڕۆزیدەر (رازق)و ژێنەر (مُحی)و مرێنەر (مُميت)و زیندووکەرەوە (باعث)م نیە، جگە لە تۆ هیچ کەس‌و هیچ شتێك نەکەمە پەرستراو (معبود)ی خۆم‌و، سەرەنجام لە ژیانم دا هەردووك حوکمی (ولايُشْرِكُ في حُكْمِهِ أحداً) [1] و (لا يُشرِكُ بِعبادةِ رَبِّهُ أحداً) [2] جێبەجێ بکەم‌و، نە هیچ کەس لە فەرمانڕەوایەتیت دا بکەمە هاوبەشت و، نە لە پەرستنیشت دا هاوبەشت بۆ پەیدا بکەم !

---

[1] ئایەتی ژمارو (٢٦) لە سورەتی (الكهف)، واتە: خوا - هیچ کەس لە حوکمڕانی‌و فەرمانڕەوایەتی خۆی‌دا ناکاتە هاوبەش.

[2] ئایەتی ژمارە (١١٠) لە سورەتی (الكهف)، واتە: وە با هیچ کەس لە پەرستنی پەروەردگاری‌دا نەکاتە هاوبەش.

١٠-* وه خـوای بەخشـەرو میـهرەبان چەپاڵـەم بـدەی و بمپـارێزی لـە هاوبـەش پەیداکردن (الشرك)، چ گـەورە بێت چ گچكەو چ ئاشكراو چ پەنـهان، چونكـە خـۆت فەرمووتـە كە هـەموو گونـاح و هەڵەیـەك ڕێی تـیَ دەچـیَ بیبەخشـی و چاوپۆشـی لیَ بكەی، جگە لە شرك: (إِنَّ اللّه لا يغفر أنْ يُشركَ به و يغفر ما دون ذلك لمن يشاء..) (النسـاء-٤٨-)، دیارە تۆش دادگەرو كاربەجیَ و زانای و شیرك كە بەشداركردنی غەیری تۆیە لە پەرستراوێتی و پـەروەردگارێتی و نـاو و سـیفەتە بـەرزو بـیَ وێنـەكانت دا، هێنـدە تاوانێكی زل و دزێو و ستەمێكی مەزنە، لەو هەموو ڕەحمەت و بەخشندەیی و كەرەمە بیَ سنوورەی تۆش دا جێگای لێبووردن و چاوپۆشی لیَكرانی چنگ نەكەوتووە (.. ان الشرك لظلم عظيم) لقمان-١٣-، جا خوایە دووبارە دەپاڕێمەوە كە بە لوتف و كەرەمی بیَ پایانی خۆت لە هـەموو جـۆرو شـێوەكانی شیرك پـاكم بكەیتـەوەو بمپـارێزیو لەوەش كە لە ڕابردوودا بە نەزانی و بیَ ئاگایی كردوومە پەشیمانم و بمبوورە.

١١-* وە خـوای بیَ وێنـەو هـاوەڵ و تاك و پاك بەڕەحمەت و چاكەی خـۆت یارمـەتیم بدەو بمخە سەر خەت و ڕێبازی ئیبراهیمی خەلیل و خوا بە- یەكگر (الموَحِّدُ) عليه الصلاة و السلام كە ئاوا سەركۆنەو سەرزەنشتی بـابی و گـەلی بـت پەرست و هاوبـەش پەیداكەر (مشرك)ی خـۆی كـردوە و ڕاسـتە شـەقامی خـوا بەیـەكگرتن (التوحيـد)ی پێشان داون و فەرموویەتی:

(... أفرأيتم ماكنتم تعبدون . أنتم و آباؤكم الأقدمون ! فأنهُمْ عدوٌ لي الاّ ربَّ العالمين, الـــذي خلَقني فهو يهدين . و الذي هو يُطعمني و يَسقين, و اذا مَرِضْتُ فهو يشفين , و الذي يميتـــني ثم يحيين , و الذي أطمع أن يغفرَلي خطيئتي يوم الدين ...) الشعراء (٧٥-٨٢).

واتە: ئەوانە دەبینن كە دەیانپەرستن. خۆتان و باب و باپیرانی لە مێژینەتان ! بێگومان ئەو -بت-انە دوژمنن بۆ من بێجگە لە پـەروەردگاری جیهانـەكان. ئـەو زاتـەی كـە دروستی كردووم و هەر خۆشی ڕیَ ڕوونیم دەكات، وە ئەوەی كە بەس خۆی خۆراك و خواردنەوەم دەداتیَ. وە هـەركاتێك نەخۆش كـەوتم هـەر خـۆی چـاكم دەكاتـەوە. وە ئەوەی كە دەم مرێنیَ پاشـان زینـدووم دەكاتـەوە. وە ئـەو -خوامیـهرەبان- ەی كـە بەتەمام ڕۆژی سزاو پاداشت لە هەڵەم ببوریَ.

١٢-* وە ئەی خوای خاوەن هەموو ناوێكی هەرە پەسەند و چاك و هەموو سیفەتێكی ئەوپەڕی بەرزو پاك! هیدایەتم بدە كە وەك دوایین و گەورەترین پێغەمبەرت محمد ﷺ

به زمانی وتارو کردار (بلسان المقال والحال) بڵێم: (إنَّنِي هَدانِيَ رَبِّي الى صراطٍ مُسْتَقِيم دِيناً قِيَماً[1] مِلَّة إبراهيم حنيفاً و ما أنا من المشركين . (قل) إن صلاتِيَ و نسكي[2] ومحياي و مماتِيَ لله ربِّ العالمين , لا شريك له و بذلكَ أمرت و أنا أوَّلُ المسلمين ) الانعام (١٦١-١٦٢-١٦٣).

واتـه: بێگومـان مـن پـەروەردگارم بـەرەو رێبـازێکی ڕاسـت ڕێڕوونـی کـردووم، بەرنامەیەکی نەگۆڕو ڕاگیرکەر – ی ژیان و گوزەران – ە، ڕێو شوێنی ئیبراهیمە – علیه الصلاة والسلام – بێ پەڵەیە، وە من لە هاوبەشی – بۆ خوا – دانەران نیم. (بڵێ) بێگومان نوێژو خواپەرستیی و ژیان و مەرگم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە. هیچ هاوبەش نین، منیش بەوە فەرمانم پێکراوە، وە من یەکەمی مسوڵمانانم.

آمـــــــــــــــین.



(١) (قِيَمْ) کە بە (قَيِّمْ) یش خوێندراوەتەوە ، یانی ڕاگیرکەر و هەڵسوڕێنەری کارو باری ژیان (مقوِّم امور المعاش )، وە دامەزراو و نەگۆڕ (ثابت ) بڕوانە : (معجم مفردات الفاظ القرآن) راغب الاصفهاني ص ٤٣٢ ، وە ( تفسير مفردات ألفاظ القرآن الكريم ) سميح عاطف الزين ص ٧٢٤.

(٢) (نُسُك) خواپەرستیی بە گشتی و بە تایبەت سەربڕین (ذبح) دەگەیەنێ .

# گرنگی و پله و پایەی خوا پەرستیی لە ئیسلام دا

دوای ئەوەی لە باسی یەکەم دا پەردەمان لەسەر حەقیقەتو جەوهەری خواپەرستی (عبادة) لاداو، زانیمان چ چەمكو واتایەکی فراوانو مەزنی هەیە، کە وردو درشتی ژیانو گوزەرانی تاكو کۆمەڵ دەگرێتەوەو هیچ شتێکی لێ هەڵناوێرێ، بە پێچەوانەی حاڵی بوونی زۆر کەسەوە کە پێیان وایە تەنیا لایەنی مەعنەوی‌و ئەنجامدانی پێنج درووشمەکانی خواپەرستیی دەگرێتەوە !

خوا پشتیوان بێ لەم باسەش دا تیشك دەخەینە سەر گرنگیی‌و بایەخ‌و پلەوپایەی خوا پەرستیی لە ئایین‌و بەرنامەی تێرو تەواو و بێ هەڵەو پەڵەی خوای پەروەردگاردا.

**خاڵی یەکەم: خواپەرستیی (عبادة) تاقە ئامانجی دروستکرانی مرۆڤە**

خوای دادگەرو میهرەبان تبارك و تعالی فەرموویەتی: ( و ما خَلَقْتُ الجنَّ و الأنسَ الا لِيَعْبدون ) الزاريات -٥٦-.

واتە : وە جند و مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە خوڵقاندوون کە بم پەرستن.

(واتە: بۆیە دروستم کردوون کە ئەم ژیانو گوزەرانەی سەرزەوی‌یان بە شێوەیەك بەرێ بکەن کە لە هەموو کاروبارو جموجوڵ‌و چالاکی‌یەکانیان دا بەندەو مل کەچ‌و فەرمانبەری من بن‌و پابەندی بەرنامەکەم بن).

وەك دەبینین خوای کاربەجێ و زانا،حکمەت‌و ئامانجی دروستکرانی ئینسان‌و جند لە خواپەرستی (عبادة)دا کورت هەڵدێنێ! چونکە بە ڕاشکاوی فەرموویەتی: جندو ئینسانم جگە لە پەرستنی خۆم بۆ هیچی دیکە درووست نەکردوون، کەواتە دەبێ خواپەرستی ئینسان‌و جند بە شێوەیەك بێت کە دەروون‌و دەریان‌و هەموو لایەنەکانی ژیانیان‌و سەرجەم سات‌و کاتەکانی تەمەنیان بە تاك‌و کۆمەڵەوە بگرێتەوەو، هێندەی نووکی دەرزی کەلێن‌و بۆشایی لە ژیان‌و تەمەنیان دا نەهێڵێتەوەو، بە هەرچی وزە و توانایانە سەرگەرمی چالاکی‌و کردو کۆشیان بکات، چونکە، مادام بەس بۆ بەندایەتی‌کردنی خواو پەرستنی دروستکراین، دیارە خەریکی هەرشتێکی دیکە بن غەیری خواپەرستیی، مانای وایە ڕەنج بە خەسار دەبن! ئینجا هەر لێرەش دا دەگەینە ئەو ڕاستی‌یە کە بەپێچەوانەی حاڵی بوونی زۆرێك لە مسوڵمانان،خەریك

بوونی مسوڵمان بە چاککردنو ڕێکخستنو بەرەوپێش بردنی ژیانو گوزەرانی ماددی خۆیو کۆمەڵگاکەی لە هەموو ڕووەکانی عیلمیو ئیداریو ئابووریو سیاسیو جەنگییەوە نەك هەر لەگەڵ خواپەرستییو دینداریدا دژ نیەو تێك ناگیرێ، بگرە هەموو ئەو جۆرە چالاکییانە -لە سنووری شەرع دا- مادام ژیانو گوزەرانی تاکیو کۆمەڵی مسوڵمانان پێویستی پێیان هەبێو یەکێ لەسەریان بکەوێ بە فەرزی عەین یان کیفایە دادەنرێنو بە ئەنجام نەدانو دابین نەکردنی ئەو پێداویستییانە تێکڕای مسوڵمانان گوناحبار دەبنو دووچاری سزاو تۆڵەی خوای دادگەر دەبن!

هەربۆیەش دەبینین خوای زاناو پەنهان بین چاکەی دنیای پێش چاکەی دواڕۆژ خستوە:

(.. رَبَنا آتنا في الدنيا حَسَنَةً و في الآخِرةِ حسنة وقِنا عذابَ النار ) البقرة -٢٠١-

واتە: پەروەردگارمان لە دنیادا چاکەمان پێ ببەخشەو لە دواڕۆژیش دا چاکە، وە لە ئازاری ئاگری - دۆزەخ- بمانپارێزە! ﴿دیارە چاکە (حسنة) ش لە دنیادا هەموو شتێکی باش کە ژیانی ئینسان پێویستی پێیەتی دەگرێتەوە وەك (ابو جعفر الطبري) فەرموویەتی: وە چاکەی دواڕۆژیش ڕەزامەندی خواو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیە﴾.

هەروەها بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش چاکبوونی دینداری داوای چاکبوونی ژیان و گوزەرانی دنیای لە خوای بەخشەر کردوە: **(أللهمَّ أصْلِحْ لي ديني الذي هو عِصمَةُ أمري، و أصْلِحْ لي دنيايَ التي فيها معاشي، و أصْلِحْ لي آخرتي التي فيها مَعادي..)** رواه مسلم،

واتە: ئەی خوایە ئەو دینداریەمم[1] بۆ چاك بکەی کە مایەی ڕاوەستانی کاروبارمە، وە ئەو دنیایەم بۆ چاك بکە کە ژیانو گوزەرانمی تێدایە، وە ئەو دواڕۆژەمم بۆ چاك بکە کە بۆی دەگەڕێمەوە... .

جێی سەرنجیشە کە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ پاش چاکبوونی دنیا ئەوجار داوای چاکبوونی دواڕۆژی لە خوا کردوە! چونکە هەرچەندە ژیانی دنیا لەچاو دواڕۆژ هیچ نیە و شتێکی زۆر گچکەو نابووتە، بەڵام بەو ئیعتیبارە کە دەروازەی

---

[1] (دین) لێرەدا مەبەست پێی (تدیّن) و طاعەتە نەك خودی (دین)، کەخوا ڕایگەیاندوە کە کامڵو تەواوە (.. اليوم أكملت لكم دينكم..) بەڵام دەبێ داوای دینداری کردنی چاك لەخوا بکرێ.

دواڕۆژەو کێڵگەیەتی و چی لێرە بچێنرێ هەر ئەوەش لەوێ دەدورێتەوە، مانای وایە ئەوەی لێرە شتێکی دەست نەکەوێ و ڕەنجێك نەدات، لەوێش دەست بەتاڵ دەبێ و گەنجێك نابات، ئنجا بێگومان بەبێ چاکبوونی ژیان و گوزەرانی دنیاش کە پاش ئیمان و دینداری لە: لەشی ساغ و سەلامەت و هاوسەرو خێزانی صالح دا خۆی دەنوێنێ ئینسان ناتوانێ دینداریەکی چاك ئەنجام بدات.

بەڵام لێرەدا دەبێ وریا بین و لە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ دا بەهەڵەدا نەچین، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە دەڵێین: تاقە ئامانجی دروستکرانی ئینسان بەندایەتیکردنیەتی بۆ خوا – هەروەها جندیش مانای ئەوە نیە کە– خوای بێنیاز پێویستی بەوە هەبووە ئینسان بیپەرستێ بۆیە دروستی کردووە!– پاکی بۆ خوا کە پێویستی بە یەکێك لە درووستکراوەکانی بێت!– بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوای کاربەجێ ئینسانی خوڵقاندوەو بەندایەتی کردن و پەرستنی خۆی لەسەر پێویست کردوە و کردوویەتی بە حیکمەت و ئامانجی خوڵقێنرانی، واتە حیکمەت و ئامانجێك کە ئینسان دەبێ وەدەستی بێنێ، چونکە بەبێ هێنانە دی ئەو ئامانجە ئینسان لەسەر ئەم ژیانە دنیایی یەی قەرزدار دەبێتەوەو ژیان و گوزەرانەکەی دەبێتە گەمەو یاری یەکی منداڵانە وەك خوای پەروەردگار لەبارەی ژیان و گوزەرانی ئەو جۆرە ئینسانانەوە فەرموویەتی:

(إعْلَموا أنّما الحياة الدنيا لِعِبٌ و لَهوٌ..) الحديد-٢٠-، کە بێگومان مەبەست لە ژیانی دنیا لێرەدا ژیانی دنیای کەسانێکە کە وەك ئاژەڵ ژیان دەبەنەسەرو نازانن لەکوێوە هاتوون و بۆچی هاتوون و دەبێ چی بکەن و بۆ کوێ دەچن؟!

گەواتە: بەڵێ خواپەرستی ئامانج و مەبەستی خوڵقێنرانی ئینسانە، بەڵام ئامانج و مەبەستی خوودی ئینسانە نەك هی خوای بێ وێنەو بێ نیاز، ئینجا ئەگەر یەکێك بپرسێ:

ئەی بۆچی خوا پەرسترانی خۆی لەسەر ئینسان پێویست کردوە و بە مافی خۆی لەسەر بەندەکانی ناوی بردووە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(.. يا مُعاذُ أتَدْري ما حقَّ الله على العباد؟! قلتُ الله و رسولُهُ أعْلَمُ، قالَ: حق الله على العباد أن يعبدوه ولا يشركوا بِهِ شيئاً) متفق علية، واتە: – پێغەمبەر ﷺ فەرمووی– ئەی موعاذ دەزانی مافی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە چی یە؟! گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن،

فەرمووی: هەقی خوا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی - لە پەرستن دا- ؟! لە وەڵامدا دەڵێین:

خوای پەروەردگارو کاربەجێ لەبەر ئەوە خواپەرستیی لەسەر بەندەکانی پێویست نەکردووە کە خۆی پێویستی پێ بێ! بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە:

یەکەم: مادام خوا بەدیهێنەرو بەخێوکەرو پەروەردگاریانەو خاوەنی نازو نیعمەت و چاکەی بێ ئەژمارە بەسەریانەوە، وەك فەرموویەتی: (وإنْ تَعُدُّوا نعمة الله لا تحصوهــا إن الله لغفور رحيم) النحل - ١٨-، بەڵێ لەبەر ئەوە خوای تاك و بێ وێنە شایستەی پەرستنەو هەقی خۆیەتی کە بەندەکانی بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن و، سوپاسگوزاری بن و سپڵە دەرنەچن و، هەمیشە یادی بکەن و فەرامۆشی نەکەن،

دووەم: خوای بە بەزەیی لەبەر زێدە بەزەیی و میهرەبانی لەگەڵ بەندەکانی دا پەرستنی خۆی لەسەر پێویست کردوون چونکە دەزانێ کە بەبێ ئەو بەندایەتی و پەرستنەیان بۆ خوا لە ئینسان دەشۆڕێن و دەچنەوە ڕیزی ئاژەڵ و بگرە خراپتریش، جا بۆ ئەوەی بەندەکان ئەو ئامانجە بەرزەی ژیانیان و ئەو ئەرکە مەزنەی سەر شانیان و ئەو مافە ڕەوایەی خوای میهرەبان نەفەوتێنن، لەسەری پێویست کردوون، هەروەك چۆن باوکێکی داناو بەڕەحم و دڵسۆزو بەپەرۆش خوێندن و کۆشش کردن و خۆپاك و خاوێن ڕاگرتن و خۆ لە ڕەوشتی بەدو ناشیرین پاراستن، لەسەر ڕۆڵەکانی پێویست دەکات، چونکە دەزانێ بەبێ ئەو شتانە دووچاری پەڵەو هەڵەو پەشێمانی و ماڵوێرانی دەبن. - ولله المثل الأعلى-.

## پوختەی قسان:

*خوای زاناو کاربەجێ بۆیە بەندایەتی و پەرستنی خۆی لەسەر بەندەکانی فەرز کردووە، چونکە مادام خواو پەروەردگاریانە هەق و مافی پەرستران و بەندایەتی بۆ کرانی بەسەریانەوە هەیەو، بەبێ ئەو بەندایەتی یەش ئەو حیکمەت و ئامانجەی کە بۆی خوڵقێنراون نایەتەدی و سەرەنجام گیرۆدەی دۆڕان و پەشێمانی دەبن و لە دنیاو دوارۆژدا سەرشۆڕو شەرمەزار دەبن.*

## خاڵی دووەم: بەبێ بەندایەتیو خواپەرستیی ئینسان لە ئینسانەتی دەشۆرێ

خوای زاناو تواناو کاربەجێ لە چەندان ئایەتی قورئانی بەهێزو پیرۆزدا ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو کە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە بە گاڵتەو گۆترەو هەوەنتەو بێ حیکمەت نەخوڵقاندوون، بەڵکو لەسەر بناغەی هەقو بۆ چەسپاندنی هەق دروستی کردوون، وەك فەرموویەتی: (و ما خَلَقْنا السماءَ و الأَرض و ما بَيْنَهما لاعبِينْ) الانبیاء -١٦-، واتە: وە ئاسمانو زەویو وە ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە نەخوڵقاندوون..، هەروەها فەرموویەتی: (و ما خَلَقْنا السماءَ و الارض و ما بَيْنَهما باطلاً ذلك ظَنُّ الذين كفروا ...) ص -٢٧- ،

واتە: وە ئاسمانو زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە هەوەنتە نەخوڵقاندوون ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بڕوایان نەهێناوە..

بەڵێ بوونەوەر- ئەو ئەندازەیەی کە هەتا ئێستا ئینسان لە ئاسمانەکانو زەویدا پەی پێ بردووە- و ئەوەش کە هەتا ئێستا ئینسان پەی پێ نەبردوە لە ئاسمانەکانو زەوی بە گشتی بە هەقو حیکمەت دروست کراوەو، تاك تاکی دروستکراوەکانی نێو بوونەوەریش هەرکامێکیان ئەرك (وظیفە)ێکی بۆ دیاری کراوەو ڕێگای بەرێوەچوونیشی پێشان دراوە، وەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی (موسا) علیه الصلاة والسلام لە وەڵامی فیرعەون دا فەرموویەتی:(.. رَبُّنا الَّذي أَعْطَىٰ كلَ شيءٍ خَلقَهُ ثم هدىٰ )طه -٥٠-. واتە: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو پاشان ڕێگای - بەرێوەچوونیشی- پێشان داوە.

ئاشکراشە کە هەر کام لە دروستکراوەکانی بوونو کەسایەتی خۆی لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکو کارەدا دەنوێنێو دەسەلمێنێ کە بۆی دیاری کراوەو پێی سپێرراوە و، بەبێ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکو کارە تایبەتییەی خۆی جەوهەری بوونو حەقیقەتی کەسایەتی خۆی لە دەست دەدات، بۆ وێنە: (خۆر) کە لە کاتێکی دیاریکراودا هەڵدێو ئاوا دەبێو بە خێراییەکی تایبەت لەگەڵ کۆمەڵەکەی سەرگەرمی خولانەوەو سوڕانەوەیەو، ئەندازەیەکی دیاریکراو تیشكو گەرمیمان بۆ دابین دەکاتو... هتد ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان بەم شێوەیەو چۆنێتییەی ئێستای نەماو ئەو ئەرکو کارانەی خۆی ئەنجام نەدا، بێگومان هەقیقەتو ماهیەتو پاشان ناو و

ناوونیشانی خۆشی لەدەست دەدات و، (خۆر) نامێنێ و ناوێکیشی لێ دەنرێ کە لەگەڵ حەقیقەت و وەزعی ئەو سای‌دا بگونجێ.

ئنجا (ئینسان)یش کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە شاگوڵی باغی کائینات و جێنشینی خوای پەروەردگارە[1] ،خوای کاربەجێ بۆیە ئەو ڕێزو حورمەتەی لێ ناوە کە سپاردە (أمانة)ی ئەو هەڵبگرێ[2] و بەرنامەکەی لە ژیانی‌دا بەرپا[3] بکات و سەرزەمین ئاوەدان[4] بکاتەوەو، بەهۆی پابەندی بەرنامەی خواوە لە تاقی‌کردنەوەی ژیانی سەرزەوی دەربچێ و سەربەرزو سەرفرازی ئێرەو ئەولابێ و، بەکورتی بەندەی سوپاسگوزارو بە ئەمەك و مل کەچی خوای تبارك و تعالیٰ بێ، جا دیارە هەرکاتێك ئینسانی ڕێز لێ گیراوو بە جێنشین ڕۆنراو سپاردەی خوای نەپاراست و ئەو ئەرك و کارانەی خۆی جێبەجێ نەکرد، واتە خوای پەروەردگاری نەپەرست و بەندایەتی بۆ نەکرد، مانای وایە ڕێزو حورمەت و پایەو مەقامی خۆی لەدەست داوەو بگرە لە ئینسانەتیش شۆڕاوەو چۆتەوە ڕیزی ئاژەڵ و بگرە نزمتریش، ئەمەش چەند دەقێکی قورئانی بەرێز لەو بارەوە:

- (لَقَدْ خلقنا الأنسانَ في أحْسَنِ تقويم . ثُمَّ رَدَدْناهُ أسْفَلَ سافلين. الا الذين آمنوا و عملوا الصالحاتِ فلهم اجرٌ غير ممنونْ ) التين -٤ ،٥ ، ٦ - .

---

[1] (قرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی‌دا لە لێکدانەوەی ئایەتی (و اذ قال ربك للملائكة اني جاعلٌ في الارض خليفة ...)دا گوتوویەتی: (و المعنى بالخليفة هنا في قول ابن مسعود و ابن عباس و جميع أهل التأويل (آدم) عليه السلام وهو خليفة الله في إمضاء أحكامِهِ و أوامره..) بڕوانە ج١ ص ٢٦٣، واتە: وە مەبەست لە (خەلیفە) لێرەدا لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و تێکرای توێژەروان (ئادەم)ە سەلامی خوای لێ بێ، چونکە ئادەم جێنشینی خوا بووە لە جێبەجێ کردنی یاساو فەرمانەکانی‌دا...

[2] خوای مەزن فەرموویەتی: (إنا عَرَضنا الأمانة على السمواتِ و الارض و الجبال فأبينَ أن يحملْنَها و أشْفَقْنَ منها و حَمَلَها الأنسان...) الاحزاب -٧٢-.

[3] وەك خوای بێ وێنە فەرموویەتی: (... أنْ أقيموا الدِّين و لا تتفرقوا فيه ...) الشورى -١٣-.

[4] وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (هو أنشأكم من ألارض و آستعمركُم فيها ..) هود -٦١-، واتە: ئەو - خوا- ئێوەی لە زەوی‌دا پێگەیاندوەو ئاوەدانکردنەوەشی عایدی ئێوە کردوە.

واتـه: بەڕاستی مرۆڤمـان لـه چاکـترین شـێوه پێکـهاتن دا، دروسـت کـرد. پاشـان گێڕامانـەوه بۆ - پلـه- ی نزمتر لـه هـەموو نزمـان، بێجگه لەوانەی بڕوایـان هێنـاوەو کردەوه باشەکانیان ئەنجام داوه بێگومان ئەوان پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیه.

● (إنَّ شرَّ الدوابِّ عند الله الذين كفروا فهم لا يؤمنون ) الانفال -٥٠-.

واتـه: بەڕاسـتی خراپـترین گیـاندار - مـاڵات- لـەلای خـوا ئەوانـەن کـه کـافر بـوو ون چونکه بڕوا ناهێنن.

*(و لقد ذرأنا لجهَنَم كثيراً من الجنِ و الأنسِ لَهُمْ قلوبٌ لا يفقهون بها و لَـهُمْ اعـينٌ لا يُبصـرون بها ، و لهم آذان لا يَسْمعون بها أولئك كالأنعام بل هم أضلُّ أولئك هم الغافلون) الاعراف -١٧٩.

واته: وه بێگومان زۆرێـك لـه جندو ئینسـانمان بـۆ دۆزەخ خوڵقاندوه، کـه دڵیـان هـەن پێیان تێناگەن، وه چاویان هەن پێیان نابینن، وه گوێیان هـەن پێیـان نابیستن ئەوانه وەك ئاژەڵن بەڵکو گومڕاتریشن، ئەوانەن بێ ئاگایان.

بەڵێ ئینسـان ئەگـەر لـه خـۆی تێـك نـەدات•بەدیهێنـەرو پـەروەردگاری بـه بـەزەیی و بەخشەری ڕێزو حورمەتێکیزۆری لێناوەو، لەنێو دروستکراوەکانیدا پلەو پایەییکی پێ داوه که وەك له قورئانی پڕ پیتو پێزدا دەبینرێ، ئەو پلەو پایەیه به هیچ کام لـه دروستکراوەکانی دیکەی خوا ڕەوا نەبینراوه، مەگەر خوای بەرزو مەزن بێ پێچو پەنا نەیفەرمووه؟!:

(و لَقَدْ كَرَمْنا بني آدم و حَمَلْـنا هُمْ في البرِّ و البَحْرِ و رَزَقْناهُمْ من الطَيباتِ و فَضَّلْناهُمْ على كثير مِمَّنْ خَلَقْنا تفضيلاً ) الاسراء -٧٠-.

واته: وه بەڕاستی ڕێزمان له وەچەی ئادەم گرتوه و لـه ئیشـکانیو دەریـادا- بـەهۆی چەند ئامرازێکەوه- هـەڵمان گرتـوونو لـه خـواردنو خۆراکـی چـاكو پـاك بژێومـان داونێ، وه بەسـەر زۆر لەوانەدا کـه دروستمان کـردوون پایـەمان بـەرز کردوونەتـەوه.

(زۆر له توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست له (کثیر- زۆر) لەم ئایەتەدا (کُل- هـەموو)یـەو لـه زمانی عەرەبیش دا (کثیر) بـه مانـای (کُل) بەکاردێ، هـەروەك چـۆن (ظـن-گومـان) بـه مانای (علم- زانیاری)و (یقین) بەکاردێ).

وه مەگەر خوای پەنهان بین فەرمانی به تێکڕای فریشته پاكو بێ هەڵەکانی نەکرد که کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ (ئادەم) عليه السلام ببەن؟!

وەك فەرموويەتی: (و اذ قال ربك للملائكة اني خالقٌ بشراً من صَلْصالٍ من حمأٍ مَسْنون . فاذا سويته و نفخت فيه من روحي فَقَعُوا لَهُ ساجدينْ . فَسَجَدَ الملائكة كُلُّهُمْ أجمعون ) الحجر -٢٨-٢٩-٣٠-.

واتە: وە كاتێك پەروەردگارت بە فریشتەكانی فەرموو: من ئینسانێك لە قوڕێكی وشك هەلاتووی ڕەش هەڵگەڕاوی گۆڕاو دروست دەكەم. جا كاتێك ڕێكم خست و لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا كرد یەكسەر كڕنووشی بۆ بەرن، فریشتەكانیش تێكڕا و هەموویان یەكسەر كڕنووشیان برد.

جا دەبێ ڕێزو حورمەتو پلەو پایە لەوە مەزنترو بەرزتر چی بێت لە نێو كائینات دا، كە خوای زاناو كاربەجێو پەنهان بین یەكێك لە دروست كراوەكانی بكاتە جێنشینی خۆیو ، سپاردەیەكی پێ بسپێرێ كە ئاسمانەكان و زەوی و چیایەكان نەیانتوانیوە وەئەستۆی بگرنو هەڵی بگرن[1] ، وە زانیاری‌یەكی فێر بكات كە فریشتەكانی نەیانزانیوە، [2] ، هەموو ئەو شتانەی كە لە ئاسمانەكان و زەوی‌دا هەن بۆی مەیسەرو دەستەمۆ بكاتو[3] ئیرادەیەكی ئازادی وای بداتێ كە بتوانێ هەرچی دەیەوێ لە خێرو شەڕ پێی هەڵبژێرێو ئەنجامی بداتو[4] ... هتد!! بەڵام بێگومان مەرجی پارێزرانی ئەو ڕێزو حورمەتو پلەو پایەو كەسایەتی‌یە تایبەتی و [5] ناوازەیەی ئینسان ، بریتیە لە سوپاسگوزاری و وەفاداری بەرانبەر بە خوا و خاوەنی

---

(١)وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : (إنا عَرَضنا الامانة على السَّموات و الارضِ و الجبالِ فأبَيْنَ أنْ يَحمِلْنَها و أشْفَقْنَ منها و حملها الأنسان ...) الاحزاب -٧٢-.

(٢) وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی: (و عَلَّمَ آدمَ الاسماء كُلَّها ثُمّ عرضها على المَلائكةِ فقالَ أنبِئُوني بأسماء هؤلاء ان كنتمْ صادقينْ, قالوا سبحانَكَ لا عِلْمَ لنا الا ما علمتنا ... ) البقرة -٣١ , ٣٢ - .

(٣) وەك خوای بەخشەر فەرموویەتی: (و سَخَّرَ لَكُمْ ما في السَّموات و ما في الارض جميعاً منه ...) الجاثية -١٣ - .

(٤) وەك خوای بالا دەست فەرموویەتی: (فمن شاء فَلْيُؤمِنْ وَمَنْ شاء فليَكْفُرْ ...) الكهف -٢٩-

### (٥) لاباسێك دەربارەی خەلیفەی خوا بوونی ئینسان لە سەر زەوی

بە پێویستی دەزانم لێرەدا تیشكێك بخەمە سەر مەسەلەی خەلیفەو جێنشین بوونی ئینسان بۆ خوای بەرزو مەزنو بێ وێنە چونكە هەندێك كەس بەبێ لێكۆڵینەوەو وردبوونەوە ئەو جۆرە تەفسیرو لێكدانەوەیە لەو ئایەتی: (اني جاعلٌ في الارضِ خَليفة ) ڕەد دەكەنەوە، تەنانەت زانای بەرێز (شیخ عبدالرحمن حسن حنبكة الميداني) نامیلكەیەكی تایبەتی لەو بارەوە نووسیوە بەناونیشانی : (لا يصح انْ يُقَالَ: الانسان خليفة عن الله في ارضه، فهي مقولةٌ باطلةٌ)!! جا ئەوە بەندە بە كورتی‌و

گوشراوی وەڵامی نووسەری ئەو نامیلکەیەو ئەو جۆرە کەسانەش کە ڕایان وایە لە چەند خاڵێك دا دەدەمەوە:

١- نووسەری نامیلکەی ناوبراو و ئەوانەش کە لەگەڵی هاوڕان کە یەکێکیان زانای ناودار (إبن تیمیة) یە بە حسابی خۆیان لەبەر دوو ئیشکال دەڵێن: مەبەست لە خەلیفە بوونی ئادەمو وەچەکەی لە ئایەتی ژمارە (٣٠)ی (البقرة)و هەرشوێنێکی دیکەی قورئانیش دا، خەلیفە بوونیان نیە بۆ خوای پەروەردگار:

أ-چونکە ئەگەر بڵێین ئادەمو وەچەکەی خەلیفەی خوان لەسەر زەوی ڕێ بۆ خەڵکی بێ دینی وەك قادیانی‌یەکان خۆش دەبێ کە بڵێن وڵاتە زلهێزو ئیمپریالیستەکان پێویستە خاوەن دەسەڵات بن‌و گوێڕایەڵیان بۆ بکرێ چونکە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی‌و پەرەپێدانی شارستانیەتن ﴿ بڕوانە: (لا یصح ان یقالَ: الأنسان خلیفة عن الله في ارضە) ص٢٨.﴾ هەروەها ئەو (متصوف)ە لادەرانەی بڕوایان بە (وحدة الوجود) هەیە، ئەو مەسەلەیە دەکەنە بیانوو بۆ بیروبۆ چوونی هەڵەو کافرانەیان ﴿ بڕوانە: (منهاج السنة) إبن تیمیة، ج٤ ص٩٤،٩٥.﴾.

ب- خەلیفە کەسێکە کە لە جێی کەسێکی نادیارو نا ئامادە دانیشتبێ، بەڵام خوا هەمیشە ئامادەیەو مشووری کاروباری بوونەوەر دەخوات‌و سەرپەرشتی دەکات.

٢- ئێمەش لە وەڵامی ئیشکالی یەکەم دا دەڵێین: مادام دەقی قورئان بەڕاشکاوی بفەرمووێ خوا ئینسان- ئادەم و وەچەکەی- کردووە بە خەلیفەی خۆی لەسەر زەوی، لەبەر ئەوەی کە قادیانی‌یەکان یان (متصوف)ە بوون بە یەکزانەکان (موحدي الوجود)، کەڵکی خراپی لێ وەردەگرن ناکرێ لەبەر ئەوە دەستبەرداری ئەو ڕاستی‌یە بین، چونکە هیچ ڕاستی‌یەك نیە کە لەلایەن خەڵکێکی خراپەوە هەوڵی سوودی خراپ لێ وەرگرتن (سوء الأستغلال)ی لەگەڵ نەدرێ‌و ئەوەش نابێتە پاساوی دەست لێ هەڵگرتنیان. ئیشکالی دووەمیش لە خاڵی چوارەمدا وەڵام دەدەینەوە.

٣- وە ئەوە کە دەڵێن: ناکرێ کافرو خراپەکاران جێنشینی خوا بن، توێژەرەوانی قورئان وەك (طبري) و (قورطبي) وەڵامیان داوەتەوە کە پێشتر قسەکەی (قورطبي)مان هێناو (طبري)ش گوتوویەتی: (فکانَ تأویل الآیة علی هذا: إني جاعلٌ في الأرضَ خلیفةً مني یخلفني في الحکم بالعدل بین خَلْقِي و إن ذلك الخلیفة هو آدم و من قام مقامە في طاعة الله و الحکم بالعدل بین خلقە، و أما الإفساد و سفك الدماء بغیر حقها فَمِن غیر خلفائە) بڕوانە: (مختصر تفسیر الطبري) ج١ ص١٨، وە بڕوانە: (تفسیر القرطبي) ج١ ص٢٦٣، وە بڕوانە: (الأساس في التفسیر) ج١ ص١١٥، ١١٦.

٤- ئینجا ئەگەر ئینسان خەلیفەی خوا نەبێت، ئەی دەبێ مەبەست لە (خلیفة) لە ئایەتی ناوبراودا خەلیفەی کێ بێ ئەگەر بڵێین هی (جن)ە نابێ، چونکە جندەکان سەرزەوی‌یان بەجێ نەهێشتوە تاکو بگونجێ ئینسانەکان لە جێیان دانیشن، ئینجا ئەوە کە ئەوان وەك ئیشکالێك دەڵێن:

ئەگەر بگوترێ ئینسان خەلیفەی خوایە، ئەوە ناگونجێ چونکە خوا هەمیشە ئامادەیەو مشورگێڕی بوونەوەرە، دەڵێین: ئەوە بۆ (جن) ڕەوایە بگوترێ، چونکە لەسەر زەوی بوونی هەردووکیان بۆ تەکلیف وئەمرو نەهیو تاقیکردنەوەیە بۆیە ئەگەر ئینسان خەلیفەی (جن) بێت، دەبوایە (جن) سەرزەویان چۆڵ بکردایە کە بێگومان وانیە، بەڵام خاوەن بوونی خوا بۆ سەرزەوی‌و سەرجەم بوون (وجود)یش لەگەڵ ئەوەدا تێکناگیرێ‌و دژ ناوەستێ کە ئاوەدانکردنەوەی زەوی‌و بەڕێوەبردنی حەواڵەی ئینسان بکات، وەك فەرموویەتی: (هو أنشأكم من الارض و استعمركم فيها ...) هود -٦١-. هەروەك چۆن ئەوە کە خوای باڵا دەست زۆر لە کاروبارەکانی بوونەوەرانی بە فریشتەکان سپاردوە، ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە خوا بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری ڕاستەقینەی ئەو کاروبارانە نەبێ، بۆ وێنە: جوبرائیل وەحی‌و پەیامی خوا بۆ پێغەمبەران عليهم الصلاة و السلام دێنێ‌و ( وەك خوای مەزن فەرمویەتی : نزل به الروح الامين على قلبك .. الشعراء -١٩٣-، مَنْ كان عدواً لجبريل فانه نزله على قلبك باذن الله .. البقرة -٩٧ ، عیزرائیل (ملك الموت) گیان کێشانی پێ سپێرراوەو﴾ وەك خوای باڵا دەست فەرموویەتی: قُلْ يتوفاكم مَلَكُ الموتْ .. السجدة -١١-، (میکائیل) باران‌و ڕۆزی پێ سپێردراوە،﴿ وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: عن إبن عباس رضي الله عنه ان رسول الله ﷺ قال لجبريل: ((على أيّ شيءُ ميكائيلُ؟! قال: على النّباتِ والقَطْرِ)) رواه الطبراني، بڕوانە (معارج القبول) ج٢ ص٦٥٩، تاليف الشيخ الحافظ احمد الحَكَمي ﴾ چونکە ئەو کارو چالاکیانەش کە فریشتەکان ئەنجامیان دەدەن هەر بەپێی نەخشەو بەرنامەڕێژی خواو لەژێر چاودێری خۆیدایە.

ئنجا شتێکی ڕوون‌و ئاشکراشە کە خوای کاربەجێ بە کردەوەو واقیع ئینسانی کردۆتە هەمەکارەو باڵادەست لەسەر زەوی، جا چ خێروبێرەکانی لێ دەربهێنێ‌و ئاوەدانی بکاتەوە، چ بە پێچەوانەوە خراپەو پەشێوی‌و ئاشووبی تێدا پەیدا بکات، گرنگ ئەوەیە تێیدا تاقی دەکرێتەوە، جا ئەگەر بەهۆی بەندایەتی‌کردنی‌یەوە بۆ خوا بە چاکەکاری‌و دادگەری زەوی ئاوەدان بکاتەوە، ئەوە دیارە خەلیفەی خوا بووەو چی ئەو پێی ڕازی بووە وای کردووە، ئەگەرنا – واتە ئەگەر خراپەو خراپەکاری و ستەم بکاتە پیشە- ئەوە جێنشینایەتی ئیبلیسی کردوەو لەجیاتی وی خەریکی خراپەو تاوان‌و ئاشوب بووەو، زۆریش لەوە نزمترە پێی بگوترێ خەلیفەی خوا، هەرچەندە لە ئەسڵ دا بۆ ئەوە لەسەر زەوی دانراوە، وەك چۆن هەرکەسێك بەهۆی دینداری‌یەوە بەندایەتی بۆ خوا نەکات، شایستەی ئەوە نیە پێی بگوترێ بەندەی خوا، هەرچەندە لە ئەسڵیش دا سەرجەم ئینسانەکان بۆ بەندایەتی کردن بۆ خوا دروست کراون،(و ما خلقت الجن و الانس إلا ليعبدون)الذاريات -٥٦-.

٥- مادام فریشتەكانیش حەزیان كردوە خۆیان ئەو پلەو پایەیە وەربگرن و بەڵگەشیان لەسەر ئەو داواكردنە هێناوەتەوە: (و نحن نسبحُ بِحَمْدِكَ و نُقَدِسُ لَك ) البقرة -٣٠- ، دەبێ ئەو ئەرك و پلەو پایەیە لە بوونە خەلیفەی (جن) بەرزتربێ، كە ئاشكرایە (جن) لەخوار مرۆڤەوەن.

٦- ئنجا ئەوە كە ئینسان ببێتە خەلیفەی (جن) شتێكی نەگونجاوە، چونكە دەستوور وایە كە خەلیفە نزمتر بێت لەوەی لە جێی دادەنیشێ، بەڵام بێگومان ئینسان لەسەرووی (جن)ەوەن بەگەلێك بەڵگە كە لێرەدا دەرفەتی خستنە ڕوویان نیە، وە ئەوە كە لە هەندێك فەرموودەدا هاتوە كە خوا خەلیفەی ئینسانی مسوڵمانە لە ماڵ و خێزانیدا: (**اللهمَّ أنت الصاحِبُ في السَّفَرِ و الخليفة في الأهل**) رواه مسلم، ئەوە بێگومان وەك چۆن كە ئینسان دەبێتە خەلیفەی خوا، ماناكەی جیایە لەوەی كە ببێتە خەلیفەی دروستكراوێك، بەهەمان شێوەش خەلیفە بوونی خواش بۆ ئینسانی مسوڵمان ماناكەی جیایە، دیارە خوای پەروەردگاریش كە زاتی وەك زاتی هیچ شتێك و هیچ كەسێك نیە، سیفەتەكانیشی هەروان: (ليس كمثله شيءٌ) الشورى - ١١-.

٧- بێجگە لە ئایەتی ژمارە (٣٠) سورەتی (البقرة) لە چەندان دەقی دیكەی قورئان و سوننەتیش دا خەلیفە بوونی ئینسان بۆ خوای پاك و تاك باس كراوە بۆ وێنە:

أ- ( يا داود إنا جعلناك خليفةً في الارض فاحكم بين الناس بالحقِّ و لا تتبع الهوى... ) ص -٢٦-.

واتە: ئەی داوود ئێمە تۆمان لە زەویدا كردوە بە جێنشین جا بە شێوەیەكی هەق دادوەری لەنێو خەڵكیدا بكە، وە بەدوای ئارەزوو و عاتیفە مەكەوە.

ب- آمِنوا بالله و رَسُولِهِ و أنفِقوا مما جعلكم مستَخلِفينَ فيه .. ) الحديد -٧-.

واتە: بڕوا بە خواو پێغەمبەرەكەی بێنن وە لەو - ماڵ و سامان- ەدا كە ئێوەی تێدا كردۆتە جێنشین خەرج بكەن - لەڕێی خوادا-.

ج- ( هو الذي جعلَكُمْ خلائِفَ الارض و رفعَ بَعْضَكُمْ فوقَ بعْضٍ دَرَجاتٍ لِيبْلُوَكُمْ فيما آتاكُمْ إنَّ رَبَّكُم سَـريعُ العِقابِ و إنَهُ لغفور رَحيمٌ ) الانعام - ١٦٥ - .

واتە: -خوا- ئەو زاتەیە كە ئێوەی كردۆتە جێنشینی زەوی، وە هەندێكتانی - لەڕووی ڕۆزی و ژیان و گوزەرانەوە- چەندان پلە بەسەر هەندێكتان دا بەرز كردۆتەوە، بۆ ئەوەی لەوەدا كە پێی بەخشیون تاقیتان بكاتەوە، بێگومان پەروەردگارتان سزادانەكەی خێرایەو بە تەئكید ئەو لێبوردەو میهرەبانیشە.

د- (**الدنيا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ و إنَّ الله مُسْتَخْلِفُكُمْ فيها فينظُر كيف تعملون** ) رواه مسلم

واتە: ژیانی دنیا شیرین و سەوزە، وە بێگومان خوا ئێوەی تێدا كردۆتە خەلیفە، جا تەماشاتان دەكات، داخوا چۆن ڕەفتار دەكەن!

پێشم وایە كە هیچ پاساوێك نیە بۆ تەئویل كردن و لە مانای ڕواڵەتی وئاشكرا لادانی ئەو هەموو دەقانە كە زۆر بە ڕاشكاوی ئەو ڕاستیە دەخەنە ڕوو كە خوا ئینسانەكانی كردۆتە خەلیفەی خۆی لە سەر زەوی ، ئنجا ئەم ڕاستیەش وەك نووسەری نامیلكەی ناوبراو گوتوویەتی قسەو ڕایەكی

بــێ وێنــه و تــاك و پــاك و خــاوەن هــەموو ســیفەتێكی بــەرزو چــاك كــه ئــەو سوپاسگوزاری‌یەش له بەندایەتی و خواپەرستی ( العبودیة و العبادة )ی دا بۆ خوای پەروەردگار خۆی دەنوێنێ ، وەك فەرموویەتی ( هَلْ أَتَىٰ على الإنسان حينٌ مِنَ الدَّهْرِ لم يَكُنْ شيئاً مذكوراً . إنّاَ خَلَقْنا الانسانَ من نطفةٍ أمْشاجٍ نَبْتَلِيْهِ فَجَعَلْناهُ سميعاً بصيراً . إنا هَدَيْناهُ السَّبِيْلَ إما شاكراً و إما كفوراً ) الدهر - ١ ، ٢، ٣- .



---

ڕیز پەڕ نیه ، بەڵكو وەك ( قرطبی ) گوتوویەتی : ( و المعنى بالخليفة هنا في قول ابن مسعود و ابن عباس و جميع اهل التأويل ، آدم عليه السلام ، و هو خليفة الله في امضاء احكامه و اوامره .... ) ج١ ص ٢٦٣ ، قسەو ڕای سەرجەم توێژەرەوانی قوڕئانە ! .

پێشم وایه كه ئەوەی ئەو زانایانەی وادار كردوە كه خەلیفەی خوا بوونی ئینسان ڕەد بكەنەوە دوو شته :

**یەكەم** : سوودی خراپ لێ وەرگرتن ( سؤ الاستفادة) ی خەڵكی لادەر و نیاز خراپ لەو مەسەلەیه ، كه پێشتر گوتمان ئەوە پاسا و ( مُبرِّر ) ێكی بەجێ و ماقوڵ نیه .

**دووەم** : قیاس كردنە سەریەك و لێ تێكەڵ بوونی سیفەتەكانی خواو ئینسان ، چونكه پێیان وا بووە هەمان ئەو ئیشكالانەی كه له جێنشینایەتی كردنی دروستكراوەكان بۆ یەكتر پەیدا دەبن له جێنشینایەتی كردنی ئینسانیش بۆ خوا سەرهەڵدەدەن ، بەڵام وەك ڕوونمان كردەوە وانیه و چاوگی ئەو بیرو بۆچوونەش قیاس كردنی خوایه له ئیسنان ، لەگەڵ ڕێزی زۆریشم دا بۆ ئەو زانایانەی كه ئەو ڕایەیان هەڵبژاردووە ، به تایبەت ( ابن تيمية) كه له چەندان كتێب و فەتواش دا داكۆكی كردوە له سەر تێكەڵ نەكردن و قیاس نەكردنە سەریەكی سیفەتەكانی خوای پەروەردگار و ئینسان ، بەڵام وەك گوتراوە : ( لكل جَوادٍ كَبْوَةٌ و لكل حُسامٍ نَبْوَةٌ ) .

## خاڵی سێیەم: تێکڕای پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم و سلم) بۆ ئەوە نێرراون خەڵکی فێری بەندایەتی و خواپەرستیی بکەن

پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا علیهم افضل الصلوات و اتم التسلیمات هەموویان بە بێ جیاوازی بە مەبەستی ئەوە بە پەیام و بەرنامەی خواوە ڕەوانەکراون ، کە بە زمانی وتارو کردار خەڵکی فێری بەندایەتی بۆ خواکردن و خواپەرستیی بکەن ، وە هەمووشیان بە چاکترین شێوە بەو ئەرك و کارە بەرزو مەزنەیان هەڵساون و درێغی‌یان نەکردوە ، بۆ وێنە خوای خاوەن عەرشی مەزن لەو بارەوە فەرموویەتی : ( و لَقَد بَعثنا في كُلِ أمةٍ رسولاً أنِ آعبدوا الله و آجتنبوا الطاغوت ... ) النمل -٣٦-.

واتە : وە بێگومان لە نێو هەر کۆمەڵێك دا پێغەمبەرێکمان ناردوە کە پێیان بڵێ خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغوت دوور بگرن ..

هەروەها فەرموویەتی : ( و ما أَرْسلنا مِنْ قبلِكَ مِنْ رَسولٍ إلاّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إلـٰـهَ إلاّ أَنـا فَــاعْبدون ) الأنبيــاء -٢٥- ، واتە : وە لە پێش تۆدا ، ئەی -موحەممەد- هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە کە پێمان ڕانەگەیاندبێ - بە بەندەکانم بڵێ - کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە بم پەرستن . ( واتە پەرستراو ( معبود, الـه ) ی ڕاستەقینە بەس خوای پەروەردگارە ، ئەگەر نا پەرستراوان « معبودات, آلهة »ی ساختە و نا ڕاست هەن و زۆریشن ) .

دیسان خوای پەروەردگار لە کاتی گێڕانەوەی بە سەر هاتی هەرکام لە ( نووح ، هود ، صالح ، شوعەیب ) صەلات و سەلامی خوایان لێ بێ ، ئەو ڕاستی‌یە لە سەر زمانی هەموویان بە یەك جۆرە تەعبیر و دەربڕین ڕادەگەیەنێ:(لقد ارسلنا نوحاً الی قومه فقال یا قوم أعبـدوا الله مالکم من اله غیره ....) الاعراف -٥٩- ( و الی عاد أخاهم هوداً قال یا قومِ أعبدوا الله مـالکم من اله غیره ..) الاعراف -٦٥-.(و الی ثمودَ أخاهُمْ صالحاً قالَ یا قَومِ اعْبُدوا الله مـالکمْ مـن الـه غیره..)الاعراف ٧٣-,(و الی مَدینَ أخاهم شعیباً قال یا قَوْمِ اعبدوا الله مالکم من اله غیره .) الاعراف ٨٥- .

*بەڵێ خوێنەری بەڕێز : (ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە )*

ئەمە پەیام و بانگەواز و ویردی سەرزمانی سەرجەم پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خوای دادگەر و بەخشەر بووە لەگەڵ گەل و کۆمەڵگایەکانیان دا، هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم ( علیهم الصلوات و التسلیمات من الله تعالیٰ ).

ئنجا هەر لێرەش دا ئەو ڕاستییە مەزنەمان بۆ ڕوونتر و مسۆگەرتر دەبێ،کەلەباسی یەکەم دا خستمانە ڕوو دەربارەی چەمك و واتای وشەی (عبادة)،کەگوتمان مەبەست لە(عبادة) تەنیا ئەنجام دانی درووشم و نیشانەکانی خواپەرستی نیە وەك نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و زیکرو دووعاو .. هتد ، چونکە (عبادة) ێك هێندە گرنگ و گەورە بێت جندو مرۆڤی بۆ دروست کرابن و مەرجی ئینسانەتی ئینسان و بناغەی پەیام و بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەران بێ ، ناگونجێ و ماقووڵ نیە لەجێبەجێ کردنی چەند دروشمێك دا کورت هەڵبێ!!

هەرچەندە وەك دواتر – خوا پشتیوان بێ – لەکاتی توێژینەوەی پێنج دروشمە سەرەکییەکانی خواپەرستی (عبادة) دا دەیخەینە ڕوو ئەو دروشمانەش یەکجار گرنگ و مەزنن و هەر کەسێك بەڕاستی ئەو دروشمانە ئەنجام بدات ناچاری دەکەن و واداری دەکەن کەبێجگەلە خوا هیچ پەرستراوێك نەپەرستێ و بێجگەلە ئیسلام هیچ شتێکی تر بەبەرنامەی ژیان و گوزەرانیان نەزانێو بێجگەلە موحەممەد و جێنشینانی ڕاستەقینەی هیچ کەسی دیکە بەڕابەرو سەر مەشق و سەرکردە قبووڵ نەکات .

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا – واتە لەگەڵ گرنگی ومەزنی دروشمەکان دا – بەندایەتی بۆکردن و پەرستنی خوا تبارك وتعالیٰ زۆر لەوە مەزنترو فراوانترە کەلەئەنجام دانی دروشمەکان دا کورت بێتەوە ، وە لەڕاستیدا دژایەتی کردنی سەرجەم طاغووتەکانی مێژوو بۆ پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم و سلم) بەرلەوەی لەسەر نوێژو ڕۆژوو و زیکرو دووعا بووبێ ،لەسەر فەرمانڕەوایەتی و فەرمان کردن و نەهێشتن (الحاکمیة والأمر والنهي) و یاسادانان و حەڵاڵ و حەڕام و چاکەو خراپەو ڕاست و چەوت دیاری کردن بووە ،بگرە ئەگەر بە وردی سەرنج لەژیانی پێغەمبەران بدەین و لە ڕەگ و ڕیشەی کێشەی نێوان ئەوان و طاغووتەکانی وەك : نەمروود و فیرعەون و ئەبووجەهل بکۆڵینەوە ،زۆر چاك دڵنیا دەبین کەڕیشەو بنەمای ئەو تێك گیران و دووبەرەکییە بریتیە لەوەی ئایا کێ یاسادانان و حوکمڕانی (التشریع والحاکمیة) ی بەدەستە ،ئایا خوای پەروەردگار یان غەیری ئەو ؟ !

وە لەڕاستیدا ئەگەر طاغووتە خۆبەزلگرو یاخییەکان زانیبایان پێغەمبەران (صلی الله علیهم وسلم) هەر بەوەندە وازدێنن کەبەندەکان نوێژو ڕۆژوو و باقی دروشمەکان جێ بەجێ بکەن و هەقیان بەسەر لایەنەکانی دیکەی ژیان و گوزەرانی

خەڵکەوە نیەو گوێ نادەنە ئەوە داخوا کێ حوکمڕانی دەکات و ئەمر و نەهی بەدەستە! ئەوە بێگومان ئەوانیش هەقیان بەسەر پێغەمبەرانەوە نەدەبوو ،بگرە ڕەنگە هاوکاریشیان کردبان و پارەو پوولیشیان خەرج کردبایە بۆ دروست کردنی پەرستگاو ئەو شوێنانەی کە درووشمەکانی تێدا ئەنجام دەدەن ،هەروەك چۆن ئێستاش لەڕۆژگاری خۆمان دا دەبینین کەهیچ طاغووت و دیکتاتۆرێك -ئەگەر دڵنیا بێ خەڵکی مسوڵمان هەر نوێژو ڕۆژوو و زیکرو فیکرێکی ڕووت و دوور لەحوکم وسیاسەتیان هەیە – بەو جۆرە چالاکی‌یانە سەغڵەت نابێ و خۆی مشەوەش ناکات بگرە زۆر جاران خۆشیان مزگەوت و تەکیەو خانەقایانیش دروست دەکەن و هامووشۆیان دەکەن و خەڵکیشیان بۆ هان دەدەن !!چونکە بەدەردی کابرا گوتی : (مادام زیانی بۆ پەزەکان نەبێ قەیدێ ناکات )[1] ! ئێستاش باسەرنجی چەند دەقێکی قورئان بدەین تاکو دڵنیا بین کەبنك و بنەمای کێشەو مشت ومڕی نێوان پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و ناحەزانیان مەسەلەی حوکمڕانی و یاسادانانە بەر لەهەر شتێکی دیکە ،دیارە یاسادانان و حوکمڕانی‌ئەمر و نەهی بەدەست بوونیش تایبەتی‌ترین و سەرەکی‌ترین تایبەتمەندی‌یەکانی پەرستراوێتی خوای پەروەردگارﷻ و ،درووشمەکانیش هەر بەشێکن لەو یاسایانەی کەخوای یاسادانەر و فەرمانڕەوا دیاری کردوون بۆ هیدایەتی بەندەکان و ڕێکخستنی ژیانیان :

١- *( وَلَقد أرسلنا نوحاً إلى قومه فقال يا قوم اعْبُدوا الله ما لكم مِن اِله غَيره أفلا تَتَّقون.فقال الملأ الذينَ كفروا مِن قومِهِ ما هذا الاّ بَشَرٌ مثلكم يُريد اَن يَتَفَضَّل عليكم و لو شاء الله لأنْزَلَ ملائكةً ... ) المؤمنون – ٢٣-٢٤.واتە : وە بێگومان نووحمان بۆلای گەلەکەی ڕەوانەکرد پی‌ی گوتن : ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بێجگەلەوی پەرستراوی ترتان نیە ، بۆچی پارێز ناکەن ! زلەزلانی بێبڕوا لەگەلەکەی گوتیان : ئەمە – واتە نووح – بەس مرۆڤێکی وەك خۆتانە ، دەیەوێ خۆیتان بەسەرەوە بکاتە گەورە ، ئەگەر خوا ویستبای – پێغەمبەرێك بنێرێ – فریشتەیەکی دەناردە خوار ..

---

[1] دەگێڕنەوە جارێکیان ناوچەیەك کە پێشتر مەلایان نەبوو ، مەلایەك دەچێتە نێویان و لە دەمی بیستنی بانگ دا یەکێك لە ڕیش سپیەکانیان بانگی ئەویتر دەکات : ئەو دەنگە دەنگە چی‌یە ؟ئەویش دەڵێ: مەلایە بانگ دەدات ، دەڵێ زەرەری بۆ پەزەکان نیە ؟! دەڵێ : نەخێر ، دەڵێ : دەڵێ گەڕێ با بیڵێ .

(وەك دەبینین ئەوەی زلەزلانی بێ بڕوای گەلی نووح لێی ترساون و کردوویانە بەبیانووی بەرپەرچ دانەوەی پەیامەکەی و دژایەتی کردنی ئەوە بووە کەگوتوویانە : نووح دەیەوێ گەورایەتی و سەرۆکایەتیتان بەسەردا بکات ! چونکە زانیویانە کە پەیام و بەرنامەی نووح بەکەمتر لە حاکمیەت و بالا دەستی و ئەمر و نەهی بەدەست بوون ڕازی نابێ ) .

٢- *(الم تر الى الذی حاجَّ ابراهیم في رَبِّه أَنْ آتاهُ الله الْمُلْكَ اذ قال ابراهیم رَبِّيَ الذی يُحْيِ ويُمِيتُ ،قال أنـــا أُحْيِ وأُمِيْتُ ،قال فان الله يأتِي بالشَّمْسِ من المشرقِ فَأْتِ بِها مِنَ المَغْـرِبِ فَبُـهِتَ الَّذي كَفَرَ والله لايَهْدِي القَوْمَ الظَّالِمين ) البقرة -٢٥٨-.

واتە : سەرنجی ئەو کەسە نادەی کە دەربارەی پەروەردگاری ئیبراهیم مشت ومڕی لەگەڵ ئیبراهیم دا کرد، کە خوا دەسەڵاتی پێ دابوو، کاتێك ئیبراهیم گوتی : پەروەردگار - و پەرستراوو سەروەر - ی من ئەو زاتەیە کە دەژێنێ و دەمرێنێ ، (نەمروودیش ) گوتی : منیش دەژێنم و دەمرێنم ، - مەبەستی کوشتن و ئازادکردنی خەڵکی بوو ئیبراهیم گوتی : بێگومان خوا خۆر لەڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێ ، - ئەگەر ڕاستە تۆش مافی پەرستنت هەیە - دەتۆش لەڕۆژئاواوە بیهێنە ! جا ئەوی کافر بوو سەرسام - و دەستەوستان - بوو .وەخوا ڕێرووني کۆمەڵی ستەمکاران ناکات .

(وەك دەبینین کێشەی نێوان ئیبراهیم علیە الصلاة والسلام و نەمروودیش هەر لەسەر ئەوەیە ، داخوا کێ مافی پەروەردگارێتی و مشوورخۆرێتی و سەروەرێتی بەسەر خەڵکەوە هەیە ، جا لەسەرەتاوە ئیبراهیم علیە الصلاة والسلام مەسەلەی ژیان ومردن بەدەست خوای پەروەردگار بوون دەکاتە بەڵگەی ئەوە کەدەبێ ئەوەی ژیان و مردنی خەڵکی بەدەستە هەر ئەویش ئەمرو نەهی و هەڵسووڕاندنی ژیان و گوزەرانی خەڵکی بەدەست بێ ،بەڵام لەبەرئەوەی نەمروود بەسەفسەطە و چەواشە کاری ویستوویەتی ئەو بەڵگەیەی ئیبراهیم هەڵبوەشێنێتەوە ئەویش لافی ژیان و مەرگی خەڵك بەدەست بوون لێ دەدات و بۆ ئیسپاتی قسەکەش کەسێکی دیل ڕزگار دەکات و یەکێکی بێ خەتاش دەکوژێ ! جا هەرچەندە ئەو ڕەفتارەی نەمروود بەڵگەی ئیبراهیمی پێ هەڵناوەشێتەوە ،بەڵام ئیبراهیم بۆ ڕێگا کورت کردنەوەی دەمکوت کردنی نەمروود ،یەکسەر بەڵگەیەکی دیکەی بۆ دێنێتەوە کە هەڵهێنان و ئاواکردنی خۆرەو لەبەردەم ئەو بەڵگەیەش دا نەمروود قسەی پێ نامێنێ و دەمکوت دەبێ ،چونکە وەك بەڵگەی پێشوو ئەمیان ڕێی ملەجیرە و سەفسەطەی تێدا نییە ).

٣-*(مووسا)ش علیه الصلاة والسلام كە بەپەیام و بانگەوازی خوابەیەكگرتن (التوحید) ەوە لەگەڵ فیرعەون دا بەرەنگار بۆتەوە دیسان ڕیشەی كێشەو مل ملانێی نێوانیان هەرئەوە بووە كەخوای پەروەردگار یاسادانەرو فەرمانڕەوا بێت یان فیرعەون !جا دیارە مووسا علیه الصلاه والسلام دەیگوت : خوا ، فیرعەونیش دەیگوت : من ، باسەرنجی ئەم چەند دەقە بدەین :

أ-( ... فقال أنا ربكم الأعلى ) النازعات -٢٤- ،واته : - فیرعەون -گوتی : من پەروەردگاری هەرەبەرزتانم .

ب-(... قال لَئِنْ اتَّخَذْتَ إلَهاً غَيْري لأَجْعَلَنَّكَ مِنَ المَسْجونين ) الشعراء -٢٩-

-واته: فیرعەون لەوەڵامی مووسادا: گوتی: ئەگەر جگە لەمن پەرستراوێكی تر بگری ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم. ج- (وقال فرعونُ ذَرُوني أَقْتُلْ موسىٰ ولْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخافُ أَنْ يُبَدِّلَ دينكم أَو أَنْ يُظْهِرَ في الأَرْضِ الفَسادَ) غافر -٢٦-، واته: وە فیرعەون گوتی: لێم گەڕێن با مووسا بكوژم و با ئەویش هاواری پەروەردگاری بكات، من دەترسم بەرنامەكەتانتان لێ بگۆڕێ، یان خراپە لەزەوی - وڵات- دا ئاشكرا بكات.

ئاشكرایە كەمەبەستی فیرعەون لە وشەی (ربكم الأعلى) لەئایەتی بڕگە (أ)و وشەی (إلها غيري) لەئایەتی بڕگە (ب) پەروەردگارو پەرستراوێك نیە كە نوێژو ڕۆژووی بۆ بكرێو سوجدەو ڕكووعی بۆ ببردرێ، بەڵكو مەبەستی پێ ئەوەیە كە دەبێ هەر خۆی فەرمانبەری بۆ بكرێو ئەمرو نەهی بەدەست بێت و فەرمانڕەوای خەڵكی بێت، هەروەها لەئایەتی بڕگە (ج)یش دا مەبەستی لە (دِيْنَكُمْ) ئاینێكی خوایی نیە، بەڵكو ئەو بەرنامەو پەیڕەوەی مەبەستە كە خۆی بۆی داناون و پێوەی پابەندی كردوون[1].

٤- (عیسای كوڕی مەریەم) یش علیه الصلاة والسلام ئەگەر ئەوەی نەصرانییە سەرگەردانەكان بەدەمیەوە هەڵیان بەستوە ڕاست بووایە كە گوایە گوتوویەتی: (دَعْ مالِقَيْصَرَ لِقَيْصَرَ ومالِلهِ لِلهِ) واته: ((ئەوەی ئی قەیسەرە بۆ قەیسەری لێ گەڕێن و ئەوەی ئی خواشە بۆ خوا لێی گەڕێن)) بەڵێ ئەگەر ئەم بوختانە ڕاست بووایەو (عیسا) علیه السلام ڕازی بووایە بەوەی كە كاروباری حوكم و سیاسەت و دنیاداری بۆ قەیسەری ڕۆم و داروودەستەكەی لێ گەڕێو ئاییني پان و پۆڕو هەمەلایەنەی خوا

---

[1] بۆ چاك تێگەیشتن لە چەمك و واتای هەركام لە وشەی ( الأله) و ( الرب ) و ( العبادة) و ( الدين ) سەرنجی نامیلكەی بە پێزی (المصطلحات الاربعة في القرآن الكريم ) ی ابو الاعلى المودودي بدە.

لەلایەنی ڕووحیو ئەخلاقی شەخسیدا کورت هەڵێنێ. بێگومان قەیسەری طاغووت و دام و دەزگایەکەی وەك چۆن دەستی قەشەو پاپایە لادەرو ساختەچیەکانی کڵێسایان ماچ کرد، حەوجار حەوجار دەستی ئەویشیان ماچ دەکردو، دووچاری ئەو هەموو گرفتاری و نارەحەتیو خۆحەشاردانە نەدەبوو، کەسەرەنجام خوای بەبەزەییو باڵادەست قوتاریکردو بەکڵاو ڕۆژنەی ئەو ژوورەدا کە خۆی تێدا حەشاردابوو هەڵی کێشاو بەرزی کردەوە، هەرچەندە نەصرانیەکان بەهەڵەو هەڵخەڵەتان بەقسەو پڕو پاگەندەی جوولەکەکان وادەزانن گیراوەو لەسێدارە دراوە !![1]

ئێستاش با گوێ لە (عیسی) علیه السلام بگرین داخوا چۆن چۆنی خۆیو پەیام و بەرنامەکە دەناسێنێ. أن الله ربي وربكم فأعبدوه هذا صراط مستقيم، فلما أحسَّ عيسى منهم الكفر قال من أَنْصَاري الى الله؟ قال الحواريّون نحن أنصارُ الله آمَنَّا بالله وَاشْهَدْ بأنَّا مسلمون. رَبَّنا آمَنَّا بما انزلت وَاتَّبَعْنَا الرَّسولَ فَاكْتُبْنَا مع الشّاهدين. وَمَكَروا وَمَكَر الله والله خَيْرُ الماكرين . إذ قال الله ياعيْسىُ إني مُتَوفِّيك ورافِعُكَ إِليَّ وَمُطَهِّرُكَ من الذين كَفَروا...) آل عمران – ٥١، ٥٢، ٥٤، ٥٤، ٥٥.

*واتە:* عیسای کوڕی مەریەم بەگەلەکەی خۆی گوت: بێگومان خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەشە دەجا بیپەرستن، ئەوەیە ڕێگای ڕاست، جا کاتێك عیسا کوفری لێ بەدی کردن گوتی: کێ پشتیوانمە بەرەو ڕەزامەندی خوا؟ حەواریەکان گوتیان: ئێمە پشتیوانی – پێغەمبەرو ڕێبازی-خواین، بڕوامان بەخوا هێناو تۆ شایەدبە کەئێمە موسڵمانین. پەروەردگارمان بڕوامان بەوە هێناوە کە ناردووتەتە خوارو شوێن پێغەمبەرەکەت کەوتووین جا لەگەڵ شایەدان دا بماننووسە، وە جوولەکەکان و دەستەڵاتدارانی ڕۆم پیلانیان گێڕاو خواش تەگبیری کرد. خواش باشترین تەگبیرکەرە.

---

[1] خوای پەنهان بین بە ڕاشکاوی ئەو قسەیە بەدرۆ دەخاتەوە کە فەرموویەتی ( و ما قَتَلوهُ و ما صَلَبُوهُ و لكن شُبِّهَ لَهُمْ و ان الذين اختَلَفوا فيه لفي شكٍ منهُ و مالَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إلا اتّبَاعَ الظَّنِّ و ما قَتَلوهُ يَقيناً بَلْ رَفَعَهُ اللهُ اليْهِ و كان الله عزيزاً حكيماً ) النساء ١٥٧, ١٥٨ واتە : وە – جوولەکەکان نە عیسایان کوشتوە نە لە سێدارەیان داوە بەڵکو وێنەی ئەویان لێ براوە سەر یەکێکیتر و – ئەویان کوشت و هەڵواسی – وە ئەوانەی کە لە بارەیەوە ڕای جیاجیان هەیە تێیدا لە گوماندان و جگە لە گومان هیچ زانیاریەکیان لە بارەیەوە نیە وە بە تەئکید نەیان کوشتوە بەڵکو خوا بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە ، وە خوا باڵا دەست و کار بەجێیە.

کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا من وەرت دەگرم بەڕووح و جەستەوە و بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوەو پاکت دەکەمەوە و قوتارت دەکەم لەوانەی بێ بڕوان.

(بەڵێ عیساش سەلامی خوای لێ بێ وەك هەموو پێغەمبەرانی دیکەی خوا گەلەکەی خۆی بۆ بەندایەتیو پەرستنی خوای تاك و پاك بانگ کردوە، پێشی گوتوون کە هەرئەوە ڕاستە شەقامی ژیان و گوزەرانەو ئایینی خواشی وەك خۆی بەبێ کەم و زیادو دەستکاری خستۆتەڕوو، وە عیسای کوڕی مەریەم کە یەکێکە لەپێنج پێغەمبەرە بە (أولوا العزم) ناسراوەکانە زۆر لەوە بەرزترو نەلەخشاوتر بووە کە بۆ ڕازی کردنی ڕۆمەکان و لەترسی ئازارو جەزرەبەیان ئایین و بەرنامەی هەمەلایەنی خوایان بۆ کەچ و کرووچ بکات!)

٥-پێغەمبەری کۆتایی و سەروەری پێغەمبەرانیش (محمد) ﷺ وتێك گیرانی لەگەڵ سەرانی شیرك لەمەککەو نیمچە دوورگەی عارەبیو سەرانی نیفاق لەمەدینەو سەرانی کوفری جیهانی ئەوسا (کیسرا)و (هیرەقل)و باقی حوکمڕان و دەستەڵاتدارانی ئەو ڕۆژگارە زۆر ئاشکرایە کەبەپلەی یەکەم دژایەتیو دوژمنایەتییەکەیان بۆ خۆیو هاوەڵ و جێنشینە ڕاشیدەکان - خوا لێیان ڕازی بێ - لەو ڕووەوە بووە کە دڵنیا بوو ون بە چەسپان و سەقامگیربوونی ئەو پەیام و بانگەوازەی کە پێیانە لەدڵ و دەروون و پاشان ژیان و گوزەران و دنیای واقیع دا، ئەوان گلۆڵەیان دەکەوێتە لێژیو لەمەودوا هیچ کەس دەستیان بۆ ناخاتە سەرسینگ و بەڵێ قوربانیان بۆ نابێژێ!

جا دیارە قورئانی بەڕێز پڕە لەبەڵگەو نموونە بۆ ئیسپاتی ئەوەی گوتمان بەڵام ئێمە یەکێکیان لێ بەنموونە دێنینەوە:

(...وعَجِبُوا أَنْ جاءَهُمْ مُنْذِرٌ منهم وقال الكافرونَ هذا ساحِرٌ كَذَّاب. أَجَعَلَ الآلهةَ إلهاً واحــداً إن هذا لَشَيء عُجابٌ. وانْطلق الملأُ منهم أن امشوا واصـــبروا علـــى آلهتكـــم إن هـــذا لَشَـــيءٌ يُرادُ)ص،٤،٥،٦.

واتە: وە - هاوبەش دانەران بۆ خوا - پێیان سەیر بوو وریاکەرەوەیەکیان لەخۆیان بۆهـات، وە کافرەکـان گوتیـان: ئەمـە جادووگـەرێکی دڕۆزنـە [1] . ئایـا هـەموو پەرستراوەکانی کردنە یەك پەرستراو! بێگومان ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!.

---

[1] (کاذب ) درۆکەرە بەڵام ( کذاب ) دڕۆزنە چونکە کورد وشەی (دڕۆزن ) بۆ کەسێك بەکار دێنن کە درۆکەرێکی کارامە بێت و زۆر درۆ بکات.

وە زلەزلەكانیان بەخێرایی دەست بەكاربوون - بۆ دژایەتی پێغەمبەر و پەیامەكەیو فەرمانیان كرد و گوتیان كە بەردەوام بن لەسەر ڕێو شوێنی خۆتان و لەسەر پەرستراوەكانتان خۆڕاگر بن، بێگومان ئەمە - ئەم ئایین و بەرنامەیەی موحەممەد هێناویەتی - شتێكە مەبەست پێی نەخشەو پیلانە - دژی ئێمەو ڕێو شوێن و پەرستراوەكانمان - .

(وەك دەبینین ئەوەی كە بۆ هاوبەش دانەران و كافرەكان لەپێغەمبەر ﷺ و پەیام و ئایینەكەی دا جێی تێبینی بوە ئەوە بووە كە مەترسی تێدایە بۆ بەرژەوەندیەكانیان و گۆڕینی حاڵ و وەزعی كۆمەڵگاكەیان لەڕووی سیاسیو ئابووریو كۆمەڵایەتیەوە، (قرطبي) لەتەفسیرەكەی خۆیدا لەلێكدانەوەی ڕستەی (إِنَّ هَـٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ)دا، گوتوویەتی: (كلمة تحذير اي إنما يريد محمدٌ بما يقولُ الأُنقيادَ لَهُ لِيَعْلُوَ عَلَيْنا، ونكون له أتْباعاً فَيَتَحكَّمُ فِيْنا بِما يُرِيْدُ فَاحْذَروا أَنْ تُطيْعوهُ)[2] واتە: ئەم قسەیە بۆ ئاگاداركردنەوەیە یانی موحەممەد بەوەی كە دەیڵێ تەنیا مەبەستی ئەوەیە كە مل كەچی بین بۆ ئەوەی بەسەرمانەوە دەستەڵاتدار بێ، وە ئێمە شوێن كەوتووی بین و بەكەیفی خۆی حوكمڕانیمان بەسەردا بكات جا ئاگاداربن كەبەقسەی بكەن!.

جا ئێستا خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست پاش سەرنج دان لەچەند دەقێكی قورئانی بەپێز سەبارەت بەهەركام لەپێنج پێغەمبەرە مەزنەكان (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، مُحَمَّدٌ) علیهم الصلاة والسلام كە لەنێو زانایانی ئیسلام دا بە (اولو العزم) ناسراون، وەك ڕۆژی ڕوون بۆمان دەركەوت كە هۆی مل ملانێ و تێك گیرانی پێغەمبەرانی خواو (طاغوتە) خۆ بەزلگرو سەركەش و یاخیەكان چی بووەو چۆن بووە، ڕوون بۆوە كە هۆكاری بنەڕەتی دروست بوونی ئەو ناكۆكیو دووبەرەكیە ئەوەبووە كە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوای تاك و پاك بانگی خەڵكیان كردوە بۆ بەندایەتی كردن و پەرستنی خوا بەمەعنای ڕاستەقینەو فراوانی بەندایەتیو پەرستن كەوەك پێشتر خستمانەڕوو وردو درشتی ژیان و دەرو دەروونی ئینسان و هەموو جم وجۆڵ و چالاكیەكان و تێكڕای بواروەمەیدانەكان بەمزگەوت و بازاڕو كێڵگەو كارگەو دوانگە و فەرمانگە (المنبر والدائرة)و... هتدەوە دەگرێتەوە، وە لەڕاستیدا وەك لەپێش دا گوتمان ئەگەر طاغووت و زلەزلەكان زانیبایان كە پەیام و بانگەوازی

---

[2] بڕوانە: ( الجامع الأحكام القران) ج ١٥ ص ١٥٢.

پێغەمبەرانی خوا صلی الله علیهم و سلم تەنیا بریتییە لەجێ بەجێ کردنی هەندێك درووشم وچالاکی شەخسیو ڕووحی و، هەقیان بەسەر حوکم و سیاسەت و ژیان و گوزەران و بەڕێوەچوونی خەڵکی‌یەوە نیە- وەك زۆربەی موسڵمانان لەم ڕۆژگارەدا واگومان دەبەن - ئەوە هیچ خۆیان سەغڵەت نەدەکردو ئەو دوژمنایەتیو بەربەرەکانی سەخت و دژوارو بێ ئامانەیان لەدژی پێغەمبەران بەرپا نەدەکرد!

بەڵی بەندایەتی و پەرستنی خوای پەروەردگار بەبێ قبوول کردنی حاکمیەتی خواو سەروەریو باڵادەستی بەرنامەو حوکمەکەی لەژیانی تاك و کۆمەڵ دا نایەتەدی، هەر بۆیەش هەمیشەو بەدرێژایی مێژوو ئەوانەی دوژمن و ناحەزی سەرسەختی پێغەمبەران و بانگەوازەکەیان بوون ئەوانە بوون کە خاوەنی کورسیو دەسەڵات و موڵك و سامان بوون و سەرگەرمی عەیش و نۆش و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بوون، لەسەر حیسابی خەڵکی چەوساوەو ستەمدیدە، وە بە زۆری شوێن کەوتووانیشیان خەڵکی سادەو ڕەش و ڕووت و ماندوو ڕەنج دەر بوون، بۆ وێنە خوای باڵا دەست و میهرەبان لەو بارەوە فەرموویەتی:

*( وماأَرْسَلْنَا في قَرْيَةٍ مِنْ نَذيْرٍ إلاّ قال مُتْرَفُوها إنّا بِما أُرْسِلْتُمْ بِهِ كافِرونَ) السبأ -٣٤-.

واتە: وە هیچ ورياكەرەوەيەكمان لەهیچ ئاوەدانی‌یەك دا ڕەوانە نەکردووە کە دەستەڵاتدارە خۆشگوزەرانەکانی نەیانگوتبێ: ئێمە بەوەی کە ئێوەی پێ ڕەوانە کراون کافرین.

* ( وقال الذين كفروا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنا أَوْ لَتَعُودُنَّ في مِلَّتِنا فَأَوْحىٰ إلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظّالمين) ابراهيم -١٣-.

واتە: وە ئەوانەی بێ بڕوا بوون بەپێغەمبەرانی خۆیانیان گوت بێگومان لەسەرزەمینی خۆمان وەدەرتان دەنێین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەرئایین و بەرنامەکەمان، ئنجا پەروەردگاریان وەحی بۆناردن کە بەتەئکید -دەستەڵاتدارە کافرو- ستەمکارەکان دەفەوتێنین.

*( ولقد أرسلنا نوحاً الىٰ قومِهِ: إني لكم نذيرٌ مبينٌ.أَنْ لاّتعبدوا إلاّ الله إنِّي أَخافُ عَليكُمْ عَذابَ يَوْمٍ أليم.فقال الملأُ الذين كَفَرُوا من قومِهِ مانَراكَ الا بَشراً مثلنا ومانراكَ اتَّبعَكَ الاّ الَّذينَ هُم أَراذِلُنا باديَ الرَّأْيِ..) هود - ٢٥،٢٦،٢٧-.

واتە: وە بێگومان نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوانەکرد - پێی گوتن:- من بۆ ئێوە

ئاگادار کەرەوەیەکی ئاشکرام. کەجگە لەخوا نەپەرستن، بەڕاستی مـن مەترسـی ڕۆژێکی بەئێش و ژانتان لێ دەکەم. زلەزلانی بێ بڕوای گەلەکەشی گوتیان: تۆ بەس مرۆڤێکی وەك ئێمەی‌و ناشبینین جگە لەوانەمان کەهەرچی‌و پەرچی و نەفامن هیچ کەسی دیکە شوێنت کەوتبێ.

دیارە هۆی ئەمەش ئاشکرایە کە بۆچی دوژمن و ناحەزانی سەرسەختی پێغەمبەران و پەیام و بەرنامەکەیان دەستەڵاتدارانی بـەزەبرو زۆر و خۆشگوزەران و، هەموویان زۆرینەی شوێن کەوتووانیشیان خەڵکی سادەو کەم دەست و ڕەش و ڕووت بوون، ئەویش ئەوەیە کەهەر چی خاوەن کورسی‌و دەستەڵات و موڵك و سامانەکانی وەك نەمروود و فیرعەون و قارِوون و هامان و قەیصەرو کیسراو ئەبووجەهل و ئەبوو سفیان[1] و هاووێنایـنـان بـوون،زانیویانە کەپەیام و بانگەوازی ڕەببانی‌یانەی دژی کوفرو نەفامی‌و ستەم و چینایەتی پێغەمبەران مایەی سەرنگووم بوونی کورسی حوکم و دەستەڵاتی ناشەرعی‌یانە و طاغووتی‌یانەیان و نەمانی کۆشك و تەلاری نەخشین و سفرەو خوانـی ڕازاوەو ڕەنگینیانـە، بـەڵام خەڵکـە زەلیـل و دیـل و چەوسـاوەو مافخوراوەکـە زانیویانـە کـە ئـەو پـەیام و بانگـەوازە خوایی‌یـە زەنـگ و جـاڕی بەسەرچوونی چاخی چەوساندنەوەو بێدادی‌و هاتنی قۆناغی بەختەوەری‌و ئـازادی ڕاستەقینە بـەگوێی خـەڵکی‌دا دەدات و، وێـڕای هـەق و ڕاستی و چـاکی‌و پـاکی لەسەرکردنەوەو ڕزگـاری‌و سەرفرازیشـیان لـەو پـەیام و بانگـەوازەدا بینیـوە، بۆیـە ئامادەبوون سەروماڵی لەڕێ‌دا بەخت بکەن و بەخوێن و ئارەق شەونخوونی‌و ئاوارەیی ڕێی بۆ خۆش و تەخت بکەن و، مەردانەو جوامێرانە هەستن و پشتیان بەخوا ببەستن و گورج و گۆڵ و چالاك بن و لە طاغووتان بێ باك بن و تەنیا بەندەو پەرستاری خوای بەرزو بێ نیازو تاك بن.

---

[1] دیارە پاشان (ابو سفیان) مسوڵمان بووە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە کاتی پێش مسوڵمان بوونیەتی.

## خاڵی چوارەم : بەبێ خوا پەرستیی و بەندایەتی بۆ خوا، شەیتان زەفەرمان پێ دەبات و پێی ناوێرین.

- *خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست :*

شتێکی ئاشکرایە کە ئیبلیسی نەگریس لە عنەتی خوای لێ بێ سەرسەختترین و بێڕەزاترین دوژمن و ناحەزی ئینسانە و بە خوێنی سەری تینوویە و دایم و دەرەم بۆی لە بۆسەدایە و خۆی بۆ مەلاس داوە کە دەرفەتی لێ ببینێ و لە کەلێن دا گورزی گرچوو بری تێ بسرەوێنێ و دەستی ڕەشی لێ بوەشێنێ و خەڵتانی خوێنی بکات و لە خۆڵێ دا بیگەوزێنێ ، جا مەترسی ئەو دوژمنە سەرسەخت و بەد بەختەش زیاتر لەوەدایە کە شارراوە و پەنهانە و هیچ شوێنێکیشی لە بەر عاسێ نابێ ، چونکە دەتوانێ بە نێو ڕەگ و خوێنی مرۆڤ دا بگەڕێ و بسووڕێ ![1]

جا بۆ ئەوەی زۆر باش لە ماهیەت و ڕیشە و سەرگوزشتەی ئەو دوژمنایەتی و دووبەرەکێیەی نێوان شەیتان و ئینسان حاڵی بین و ، بزانین چۆن و بۆچی ئیبلیس جاری ئەو دوژمنکاریە بێ ئامان و خوێناوی‌یەی لە دژی ئینسانەکان داوە با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بە هێزو پێزەی قورئانی قسە لەجێ بدەین :

( و لَقَدْ خَلَقْنا الانسانَ مِنْ صَلْصالٍ مِنْ حَمإٍ مَسْنُون . و الجانَّ خَلَقناهُ مِنْ قبل من نار السَّموم , و اذ قال رَبُّكَ لِلْمَلائِكةِ انِي خالقٌ بشراً مِنْ صَلْصالٍ مِنْ حَماءٍ مَسْنُون , فاذا سَوَّيْتُه و نَفَخْتُ فيه مـن روحي فَقَعوا لَهُ ساجدين , فَسَجَد الملائكة كُلُهُم أجمعون , الا ابليس أَبَى ان يكون مع الساجدين , قال يا ابليس مالَكَ الا تكون مع الساجدين , قال لم اكُنْ لاِسجدَ لِبَشرٍ خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصالٍ مِنْ حَماءٍ مَسْنون , قال فَاْخْرُجْ منها فانَكَ رجيم , و إنَ عليك اللعنة الى يوم الدين , قال رَبِّ فـأنظرنِي الى يوم يبعثونَ قالَ فانكَ مِنْ المُنظَرين , الى يوم الوقت المعلوم , قال ربِّ بما أُغويتني لأُزَيِّنَنَّ لَـهُمْ في الأَرض و لأُغوينَهُمْ أَجْمَعين الا عِبادكَ مِنهُم المُخْلَصِين , قال هذا صراط عليَّ مُسْتَقيم , ان عبادي ليس لكَ عَلَيهِمْ سُلطان الا مَن اتبَعكَ مِنْ الغاوين , و إنَّ جَهَنَّم لموعدهم اجمعين , لها سبعة أَبْـوابٍ لكل باب منهم جزء مقسوم, ان المتقين في جنات و عيون اُدْخُلوها بِسَلامٍ آمنين ) الحجر -٢٦- تا٤٦-

---

[1] وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( ان الشيطان يجري من ابن ادم مجرى الدم ...) متفق عليه ، واتە بێگومان شەیتان لە جەستەی ئادەمیزاد دا بە جێگای خوێن دا دەڕوات.

*واتـه* وه بێگومـان ئینسـانمان لـه قوڕێکـی ڕەش داگـەڕا و و گـۆڕا و و ڕەق هەڵگـەڕاو دروست کردوه ، وه لە پێش ئەوەش دا - بابی - جندمان لە گڕ و کڵپەی ئاگر دروست کرد بوو، وه یادی ئەو کاتە بکەوە کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی گووت من مرۆڤێك لە قوڕێکی ڕەش داگەڕاوی گۆڕاوی ڕەق هەڵاتوو دەخولقێنم ، جا هەر کـاتێك ڕێکـم خست و لە ڕووحی خۆم فووم پێدا کرد یەکسەر کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن، هەموو فریشتەکانیش تێکڕا بە زوویی کڕنووشیان برد ، جگە لە ئیبلیس ڕازی نـەبوو کـە لەگەڵ کڕنووش بردوان دا بێت - خوا- فەرمووی : ئەوە چی - پێشگیر - تە ئـەی ئیبلیس کە لەگەڵ کڕنووش بردوان دا بی؟!

ئیبلیس- گوتی: نالویَ کڕنوش بۆ مرۆڤێك بەرم کە لە قوڕێکی ڕەش هەڵگـەڕاوی گۆڕاوی ئیشك بوو دروستت کردووە! - خـوا-فـەرمووی: دەمادام وایە لێی بچۆدەریَ چونکە بێگومان تۆ نەفرین لیَ کراوی ، وە هەتا ڕۆژی سزاو پاداشت نـەفرینت لیَ بیَ.

-ئیبلیس - گوتی: پەروەردگارم هەتا ڕۆژی تێیدا زیندوو دەکرێنـەوە مۆڵـەتم بـدە :

- خوا - فەرمووی: بە تەئکید تۆ لە مۆڵەت دراوانی، تاکو ڕۆژی کاتی دیاری کراو -ی قیامەت- ( ئیبلیـس ) گوتـی: پـەروەردگارم چونکـە گومـڕات کـردم - هـەرچی خراپەیە- لە زەوی‌دا بۆیان دەڕازێنمەوە ، وە هەموویان سەرگەردان دەکەم . بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت لە نێویان دا. - خوا- فەرمووی: ئەمە ڕیَ یەکی ڕاستە بۆ من - کە بە گوێرەی ئەوە ڕەفتار لەگەڵ بەندەکان دا دەکەم ، ئەویش ئەوەیەکە : بێگومان بەندە - ڕاستەقینە- کانی من تۆ دەستەڵاتت بە سەردا ناشکێن مەگەر ئەوانەیان کە شـوێنت دەکـەون لـە سـەر لێشـێواوان، وە بێگومـان - ئـەوانیش - تێکـڕا دۆزەخ بەڵێنگەیانە. کە حەوت دەروازەی هەن هەر دەروازەیەك ئەندازەیەکی بەش کراوی لەو - کافر- انە بۆ تەرخان کراوە ، بێگومان پارێزکاران لە نێو چەندان باغ و سەرچاوەدان - پێیان دەگوتریَ- : بچنە نێویان بە سەلامەتی و دڵنیایی‌یەوە.

جا ئێستا با سەرنج بدەین : بێگومان بەلای کەمەوە ئەم (٧) ڕاستی‌یە لەم چەند ئایەتـە بـە پـێزە کـە چۆنیـەتی دروسـت بوونـی شـەیتان و ئـادەم و سـەرهەڵدانی دوژمنایـەتی و نـاکۆکی نێوانیـان و سروشـت و ماهیـەتی ئـەو نـاکۆکی و کێشـەیە و سەرەنجامەکەی باس دەکەن دەفامرێنەوە:

١- * ئينسان - مەبەست ئادەمە کە بابی ئینسانەکانە - لە قوڕی ڕەشی گۆڕاوی[1] پەیکەر ئاسای ئیشك هەڵاتوو دروست بووە و ، جند- مەبەست ئیبلیسە کە بابی جندانە - ئەویش لەوە پێش لە گڕو بڵێسەی ئاگر دروست کراوە، کەواتە ( جند) پێش مرۆڤ دروست بوون و ئەو ماددە و توخمەی لێشی دروست بوون لە ماددە و توخمی مرۆڤ جیایە، ئایەتی ( ٢٦ و ٢٧).

٢-* خوای پەروەردگار و کاربەجێ لە بەر چەند حیکمەتێك بەر لەوەی ئادەم علیه السلام بخوڵقێنێ فریشتەکانی ئاگادار کردۆتەوە و پێش وەختیش پێی ڕاگەیاندوون کە هەر کاتێك خوڵقێنرانی ئادەم لە ڕووی ڕواڵەت و نێوەڕۆك واتە جەستە و گیانەوە تەواو بوو دەبێ هەموویان بەبێ هەڵاواردن ( استثناء) کڕنووشی سڵاو لێ کردن و ڕێز لێ گرتنی بۆ ببەن. دیارە مەبەستیش لەو کڕنوش بردنەی فریشتە پاك و چاکەکان دەرخستنی پلە و پایە و ڕێز و حورمەتی ئادەم و وەچەکەی بووە، ئایەتی ( ٢٨ و ٢٩).

٣-* فریشتە پاك و بێ هەڵەوپەڵەکان دەست و برد و بەبێ هەڵاواردن تێکڕا کڕنووشیان بۆ ئادەم علیه السلام بردووە و فەرمانی خوای کار بەجێ یان بەجێ هێناوە، بەڵام ئیبلیسی پیس و نەگریس لە بەر نەزانی و خۆبەزلگری فەرمانی خوای باڵادەستی شکاندوە و ئامادە نەبووە کڕنووشی ڕێز لێنان بۆ ئادەم ببات، کاتێکیش خوای پاك و تاك - هەرچەندە هیچ شتێکیشی لێ پەنهان و ون نیە- لێی پرسیوە کە هۆی سەرپێچییەکەی و کڕنووش نەبردنی چییە؟! زۆر بێ ئەدەبانە و خۆ پەسندانە و بە سووك سەیر کەرانە بۆ ئادەم گوتوویەتی : ناکرێ و ناگونجێ من کڕنووش بۆ مرۆڤێکی لە قوڕی ڕەشی گۆڕاوی ئیشك هەڵاتوو ببەم ، واتە هەم فەرمانی خوای شکاندوە و هەم خۆی بە زل گرتوە و هەم بە سووکیش سەیری ئادەمی کردوە !! ئایەتی (٣٠ و ٣١ و ٣٢ و ٣٣).

٤-* خوای کار بەجێ و دادگەریش لە سەر ئەوە نەفرینی لە ئیبلیس کردو لە بەهەشتیش وەدەری نا ، کە چی ئیبلیسی یاخی و سەرگەردان لە جیاتی پەشیمانی و عوزر هێنانەوە و گەڕانەوە لای خوا بێ شەرمانە و بێباکانە داوا لە خوای پەروەردگار

---

[1] چونکە وشەی (مسنون) وێڕای واتای ( گۆڕاو- متغیر) مانای (پەیکەر -مُصَوَّر) یش دەگەیەنێ ، بڕوانە تەفسیری ( قرطبي) ج ١٠ ص ٢٢، ٢٣.

دەكات كە هەتا ڕۆژی زیندوو بوونەوەی ئینسانەكان مۆڵەتی بدات و بیهێڵێتەوە تاكو چی لە دەستی دێ لەگەڵ ئادەم و وەچەكەی بیكات ! دیارە خوای كار بەجێش ئەو داواكاری‌یەی ئیبلیس جێبەجێ دەكات ، تاكو هەم خۆی ڕیسواتر و ماڵ وێرانتربێ و هەم پاك و پیس ئادەمی و ئیبلیسی‌یەكانیشی پێ لەیەك هەڵباوێرێ و جیایان وەكات ئایەتی ( ٣٤ و ٣٥ و ٣٦ و ٣٧ و ٣٨ ).

٥-* پاشان ئیبلیسی نەفرین لێ كراو و تووڕدراو و دۆڕا و دیسان بەو پەڕی بێ ئەدەبی یەوە گلەیی لە خوای پەروەردگاری داد گەر دەكات و گومڕا بوون و دۆڕانەكەی خۆی لە خوا دەزانێ و بیانوو بە قەزا و قەدەری خوا دەگرێ و ، ئینجا زیاتریش شووڵی لێ هەڵدەكێشێ شیرو تیر لە ئادەم وەچەكەی دەسوێ و تیغی ڕێگری و جەردەیی و سەرلێشێواندن لە بەندەكانی خوا هەڵدەكێشێ و ، دەست دەكات بە هەڕەشە و گوڕەشە و خۆڕاپسكاندن كە هەموو بەندەكانی خوای بەبەزەیی سەرگەردان بكات و بە مەرەد خۆی ببات، بە هۆی ڕازاندنەوە و جوان كردن و شیرین كردنی گوناح و خراپە و سەرپێچی بۆیان ، بەڵام بۆ ئەوەی بە درۆ نەكەوێتەوە و هەر زوو هەڕەشەكانی بە درۆ و فیشاڵ لە سەر ساغ نەبنەوە بەندە چاك و چاكەكار و پاك و وەفادارە هەڵبژاردەكانی خوا هەڵداوێرێ و لە جوغز و بازنەی هەڕەشەو گوڕەشەكانی دەریان داوێ ! ، ئایەتی (٣٩ و ٤٠).

٦-* ئەوجارخوای زانا و بەخشەر وەك بنچینەیەكی گشتی ڕای دەگەیەنێ و بە ئیبلیس دەفەرموێ،كە ئەنكید بەندە ڕەسەن و ڕاستەقینەكانی من،تۆ توانات بەسەردا ناشكێن و لە ژێر كاریگەری و ڕكێفی تۆدانین و خوتخوتە و دنەدانی شەیطانانەی تۆ ئەو هێزە كێشندەیەی نیە كە بتوانێ بەرەو خراپەو تاوان پەلكێش و كەمەندكێشیان بكات ، جا چۆن دەگونجێ كە سانێك لەگەڵ خوابن و خوا لە پشتیان بێ و ڕێسمانی خوا لە مشتیان بێ، ئیبلیسی سیس و پیس زەفەریان پێ بەرێ و پێیان بوێرێ !! بەڵێ شەیطان تەنیا دەتوانێ ئەوانە بە تەڵە و داوی خۆیەوە بكات و لە ( تەپكە) ی فێڵبازانەی خۆی بخات كە ڕێی بەندایەتی كردن بۆ خوا و ڕێ خوا پەرستی بزر دەكەن و لە ئاكامی ئەوەشدا ئیبلیس سەریان لێ تێك دەدات و بەرە و هەڵدێر تاویان دەدات.

چونکە فێڵ و پیلانی ئیبلیس چەندە زل بێ ، پشتیوانی خوا بۆ دۆستانی مەزنتر و بەرزترە و مەحاڵە دوژمنانی خواش بە دۆستانی بوێرن . ئەگەر بە ڕاستی دۆستی خواو بەندەی ڕەسەن و بەوەفا بن ( فَقاتِلوا أَولياءَ الشَّيْطان إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطانَ كـانَ ضَعيفـاً) النساء- ٧٦- واتە : جا جەنگ بکەن دژی دۆستانی شەیطان بێگومان فێڵـی شەیطان -لـــە بەرانبەر تەگبیری خواو ئیمانی ئیمانداران دا = لاوازە . ئایەتی _ ٤١ و ٤٢ ).

٧- * وە لە کۆتایی‌دا خوای دادگەر و بەخشەر سەرەنجام و ئاکامی هەرکام لە پێڕی شەیطان و شوێن کەوتووانی و، کۆمەڵی خواو بەندە وەفادرا و پارێزکارەکانی ڕادەگەیەنێ و دەیخاتە ڕوو گە دۆزەخی نێڵدراوو بەتین ئەو شوێن و بەڵێنەیە کە سەرجەم یاخی بووانی سەر بە ئیبلیسی تێدا خڕ دەکرێنەوە و ، دۆزەخیش حەوت دەروازەی هەن و لە هەر دەروازەیەکیانەوە ژمارەیەکی دیاری کراوی پێڕ و تاقمەکانی شەیطانی لێوە دەچنە ژوورێ ، پاشان سەرەنجامی بەندە چاك و پاکەکانی کە بە پارێزکاران ناویان دەبات لە چەندان باغ و باغات و کانی و سەرچاوە لە بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوە و پان و بەرین دا دەخاتە ڕوو کە تێیان دا نیشتەجێ دەبن و موژدەی ساغ و سەلامەتی و بێ دەرد و بەڵایی و هێمنی و ئاسایش و ئارامی و دڵنیایی یان پێ دەدرێ ، ئایەتی ( ٤٥ و ٤٦ ).

*بەڵێ خوێنەری خۆشەویستم :*

ئەوە بوو بە کورتی ماهیەت و چۆنیەتی و سەرگوزشتەی دوژمنایەتی و کێشەی نێوان ئادەم و وە چەکەی و ئیبلیس و داروودەستەکەی ، ئێستاش لە بەر تیشکی چەند ئایەتێکی دیکەی قورئانی پڕپیت و پیرۆزدا سەرنج بدەین داخوا شەیطان چۆن چۆنی و لە چ ڕێیەکەوە بۆ ئینسان دێ و پەلاماری دەدات و ئینسانیش چۆن دەتوانێ بەرهەڵستی ئەو هێرش و پەلامارانەی ئیبلیس بکات و بە چ شێوازێك دەتوانێ بەرگری لە خۆی بکات :

خوای زانا و کار بەجێ لە و بارەوە لە سوورەتی ( الأعراف ) دا دەفەرموێ :

(قال فبِما أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِراطكَ المستقيم , ثُمَّ لآتِيَنهُم مِنْ بين أَيْدِيهِم و مِنْ خَلْفِهِم و عــن أَيمانهم و عن شَمائِلِهِم و لاتَجدُ أَكْثَرَهمْ شاكرين, قال آخْرُجْ مِنها مَذْءوماً مَدْحوراً لَمَنْ تبعَكَ مِنْهُمْ لأَمْلأنَّ جَهَنَمَّ مِنكم أَجمعين , و يا آدَمَ آسْكُنْ انتَ وَ زَوْجُكَ الجنَّة فكُلا مِنْ حَيثُ شِئْتُما وَ لاتَقرَبـا هٰذِهِ الشَّجرة فتكونا من الظّالِمين , فوسوس لَهُما الشَّيْطان لِيُبْدِيَ لَهُما ماوُورِيَ عنهما من سَوْءاتِهِما

و قال ما نهاكما ربُّكما عن هٰذِهِ الشَّجَرةِ الاّ أَنْ تكونا مَلَكَيْنِ أَو تكونا مِنَ الخالدين , و قاسَـمَهُما إِنّي لَكما لَمِنَ النّاصِحين فَدَلّٰهُما بغُرور فَلَماّ ذاقا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُما سَوْاٰتُهُما و طَفِقا يَخصِفان علَيْهما من وَرَقِ الجنةِ و ناداهُما رَبُّهُما أَلَمْ أَنْهَكُما عن تِلْكُماالشجرة و أَقُلْ لكما ان الشيطان لَكُما عَـدوٌّ مبين ,قالا رَبّنا ظَلَمْنا أَنْفُسَنا و انْ لم تغْفِر لَنا و تَرْحَمْنا لَنَكُونَنَ من الخاسرين) الاعراف – ١٦ – تا ٢٣ –

*واته :* ئیبلیس – گوتی : چونكه ڕێت لێ هەڵەكردم منیش – بـه مەبەسـتی لـه ڕێگا لادانی بەندەكانت – لە سەر ڕاستەشەقامی تۆ بۆیان دادەنیشم پاشان لە پێشیانەوە و لە پشتیانەوە ، وە لەلای ڕاستیانەوە و لە لای چەپیانەوە بۆیان دەچم ، وە زۆربەیان نابینی سوپاسگوزار بـن . – خـوا – فـەرمووی : بـه زەبوونـی و دەركـراوی لێی بچـۆ دەرێ، بـه تـەئكید هـەر كەسێك لـەوان شوێنت بكـەوێ ئەوە دۆزەختـان لێ پـڕ دەكـەم، وە –خوا – فەرمووی : ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەكەت لە بەهەشتیَ نیشـتەجیَ بن وە لـه هـەر شوێنێك حـەز دەكـەن بخـۆن ، بەڵام نزیكـی ئـەم درەختـه مەكـەون ئەگـەر نـا لـه ستەمكاران دەبن ، ئینجا شەیطان خوتخوتەی بۆ كردن بۆ ئەوەی ئەو عەورەتەی كه لێیان شێرراوەتەوە بۆیان دەربخات وە گوتـی: پـەروەردگارتان تـەنیا لـه بەر ئەوە ئەم درەختـەی لێ قەدەغـه كـردوون كـه هـەردووكتان نەبنـه فریشـته یـان هـەرماو بـن – لـه بەهەشتیَ دا – وە شـەیتان– سوێندی بۆ خـواردن كـه مـن ئامۆژگـارێكی دڵسـۆزتانم، سـەرەنجام بـه فـرت و فێڵ هێنانیه خوار ، كاتێك لـه درەختەكـەیان چێشـت عـەورەت (پاش و پێش ) ەكانیان لێ دەركەوتن ، وە دەستیان كرد بـه بـه خـۆوە چەسـپاندنی گـەڵای – درەختـه كـانی – بەهەشـت، وە پـەروەدگاریان بـانگی كـردن ، ئـەدی ئـەو درەختـەم لێتـان قەدەغـه نـەكرد بـوو، وە پێـم نـەگوتن كـه شـەیطان بـۆ ئێـوە دوژمنێكـی ئاشكرایه!! – ئادەم و حەووا– گوتیان : پەروەردگارمان ستەممان لـه خۆمـان كـرد وە ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەیت پێمان دا نەیەتەوە بێگومان لە زیانباران دەبین.

وە لە سورەتی ( طه) دا فەرموویەتی:

(و لَقَدْ عَهِدْنا الى آدَمَ مِنْ قَبْل فَنَسِيَ و لَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً , و إِذْ قُلْنـا لِلْمَلائِكَـةِ آسْـجُدوا لآدَم فَسَجَدوا الاّ ابْليسَ أَبىٰ , فَقُلنا يا آدَم انَ هذا عَدوٌ لَكَ و لِزَوجِكَ فلا يُخرِجَنَّكُما من الجنة فَتَشقى , ان لكَ انْ لا تَجُوعَ فيها و لا تَعْرىٰ , و أَنَّكَ لاتَظْمَأُ فيها و لا تَضْحىٰ , فَوَسْوَسَ اليه الشَـيطانُ قال يا آدَم هَلْ أَدُلُك على شَجَرَةِ الخُلْدِ و مُلْكٍ لا يُبلىٰ , فأَكلا منها فَبَدَت لَهُما سَوْاٰتُهما و طَفِقـا يَخْصِفانِ عليهما من وَرَقِ الجنة و عصىٰ آدمُ رَبَّهُ فَغَوىٰ , ثم اجْتَباهُ رَبُّه فَتابَ عَلَيْهِ و هَدىٰ , قـال

آهبطا منها جميعاً بعضكُمْ لبعضٍ عَدّو فأمّا يأتيَنّكُمْ منّي هُدىً فَمَن اتّبع هُدايَ فلا يُضِلُّ و لا يَشقىٰ , ومَنْ أعْرَض عن ذِكْري فانّ له مَعيشةً ضَنكاً و نَحْشُرُهُ يومَ القيامة أعْمىٰ ... ) طه - ١١٥-١٢٥

*واته:* وه بێگومان لەوەبەر ئادەممان ڕاسپارد بوو - کە بە قسەی شەیطان فریو نەخوات- بەڵام لە بیری چووەوە،دڵقاییمان پێوە نەبینی ، وە - یادی ئەو کاتەبکەوە - کە بە فریشتەکانمان گووت کڕنووش بۆ ئادەم ببەن و جگە لە ئیبلیس هەموویان کڕنووشی - ڕێزگرتن- یان برد ، ئەو سەرپێچی کرد ، بۆیە گوتمان ئەی ئادەم بێگومان ئەم - شەیطان - ە دوژمنی خۆت و هاوسەرەکەتە، وریابە لە بەهەشتیٚ وەدەرتان نەنیٚ دەنا گرفتار دەبی: - لەم بەهەشتەدا- بۆت هەیە کە نە تێیدا برسیبی و نەڕووت، وە نەتێیدا تینوو دەبی و نەگەرمات دەبیٚ . جا شەیطان خوتخوتەی بۆلا کرد و گوتی: ئەی ئادەم ئایا درەختی هەرمان و موڵکێکیٚ بیٚ فەوتانت پیٚشان بدەم: سەرەنجام هەردووکیان لێیان خوارد و عەورەتەکانیانیان لیٚ دەرکەوتن و دەستیان کرد بە خۆداپۆشین بەگەڵای بەهەشت ، وە ئادەم سەرپێچی پەروەردگاری کرد و ڕیٚی لیٚ هەڵە بوو، پاشان پەروەردگاری هەڵی بژاردو لێی خۆش بوو و ڕێرووونی کرد . - خوا- فەرمووی : - هەردووکتان وێکڕا بچنەخوار هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن ، جا هەر کاتێك لە منەوە ڕێرووونیتان بۆ هات ئەوە هەرکەسێك شوێنی هێدایەتی من بکەویٚ سەرگەردان و گرفتار نابیٚ ، وە هەرکەسێك ڕوو لە یادی من وەربگێڕیٚ ئەوە بێگومان ژیان و گوزەرانێکی تەنگ و تاڵی دەبیٚ وە ڕۆژی دواییش بە کوێری حەشری دەکەین.

ئێستاش با لە چەند خاڵێك دا کە لە بە ڕتیشکی ئەو دوو کۆمەڵە ئایەتەی هەردووك سوورەتی ( الأعراف ) و (طـه) وەریان دەگرین هەم چۆنیەتی و ڕێگای پەلاماردان و زەفەر بردنی شەیطان بە ئادەم و وەچەکەی و هەم چۆنیەتی و ڕیٚی بەرهەڵستی و بەرەنگار بوونەوە بۆ هێرش و پەلامارەکانی شەیتان و وەچەکەی بخەینەڕوو:

ا- چۆنیەتی و شێوازی هێرش و پەلاماری شەیطان بۆ لەڕیٚ لادان و سەرگەردان کردنی ئادەم و وەچەکەی:

١- شەیطان لە سەر چەقی ڕێبازی خوا بۆ ئینسان دانیشتووە و خۆی مەڵاس داوە بۆ ڕێگا گرتن و بەستن لە هەر ڕێبوارێك کە دەیەویٚ بەهۆی ئەنجام دانی چالاکییەکی بەندایەتی و کارێکی خێر و باش لە خوا نزیك بکەوێتەوە ، ئایەتی ( ١٦) ی (الاعراف).

پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (ان الشيطان قعد لابن آدم بطرقِهِ ، فَقَعَدَ لَهُ بطريق الأسلام فقال : أتسْلمُ و تذرُ دِينَكَ و دِيْنَ آباءِكَ؟ قال : فَعَصَاهُ وأَسْلَمَ ، قال : و قَعَدَ لَهُ بطريق الهجْرَة فقال : أتهاجِرُ و تدعُ أرْضَكَ و سماءَكَ و إنَّما مِثْلُ المُهاجِر كالفَرَسِ في الطِّوَل؟! فعَصاهُ و هاجَرَ ، ثم قَعَدَ لَهُ بطريق الجهاد و هو جهادُ النفسِ و المالِ ، فقال : تقاتِلُ فتُقْتَلُ فتُنْكَحُ المرأةُ و يُقْسَمُ المالُ؟ قال فَعَصَاهُ و جاهَدَ ... ) رواه الامام احمد عن سبرة بن ابي الفاكه.

٢- وە شەیتان لە هەر چوار لاوە ئینسانی ئابلۆقە داوە و پەلاماری دەدات لە پێشەوە و لە دواوە ، وە لەلای ڕاستەوە و لە لای چەپەوە ، جا هەندێك لە زانایان فەرموویانە: مەبەست لە لای پێشەوە واتە لە لایەنی دنیاو بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی‌یەوە ، وە مەبەست لە پشتیانەوە ، واتە لە لایەن دوا ڕۆژەوە کە بیانخاتە گومان و دوودڵی‌یەوە یان سست و تەنبەڵیان بکات لە مەڕ خۆ ئامادەکردن بۆ سەفەری بەرزەخ و قیامەت، وە مەبەست لە لای ڕاستیان، واتە لەلای کردەوە چاکەکانیانەوە کە هەر نەیانکەن یان بە ناتەواوی و نیوە چڵی بیانکەن ، وە مەبەست لە لای چەپیان واتە لە لایەنی کردەوە خراپەکانیانەوە کە بۆیان برازێنێتەوە و لە بەر چاویان شیرینی بکات هەتا تووشیان دەکات ، ئایەتی ( ١٧ ) ی(الأعراف).

٣- وە شەیتان تەنیا بە شێوازی ( وەسوەسە) خەریکی لە خشتە بردن و فریودانی ئینسان دەبێ ، ئەویش بریتیە لە خوتخوتە و دنەدان و هاندان و دڵ جووڵاندنی ئینسان و پەلکێش کردنی بەرەو خراپە و سەرپێچی ، ئایەتی (٢٠) ی ( الأعراف) ، کەواتە شەیتان بێجگە لە بیر و خولیا و خەیاڵ و نیاز و مەبەستی خراپ خستنە دڵی ئینسانەوە و هاندان و جووڵاندنی بۆ خراپە توانا و دەستەڵاتێکی دیکەی بە سەر ئینسان دا نیە و هیچی دیکەی لە دەست نایەت ! بۆیەش خوای زانا و پەنهان بین فەرموویەتی: ( إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً ) النساء-٧٦- واتە: ( بێگومان فێڵ و پیلانی شەیطان بێ هێزە).

٤- وە شەیطان کە لە فێڵ و فەرەج و خراپە کاری دا یەکجار زەبردەست و زۆرزانە و هەموو هەوڵ و توانای خۆی بۆ ئەو کارە بەدە تەرخان کردوە و بێگومان پسپۆڕی و شارەزایی‌یەکی تەواوی تێدا پەیدا کردوە و ئەزموونەکانی تەمەنی دوور و درێژ و بێ فەڕی خۆی لەو بوارەدا خڕ کردۆتەوە و کەڵەکە کردوە ، مەرج نیە هەموو جارێ ڕاستەو ڕاست بۆ ئینسان بێت ، بەڵکو لە لاڕا بۆی دێ و هەوڵ دەدات لە کەلێن و خاڵە

لاوازەكانیەوە زەفەربێنێ ، ئەوەتا كە لەگەڵ یەكەمین ئینسان و هاوسەرەكەی علیهما السلام كە ئادەم و حەووان ڕووبەڕوو بۆتەوە ، لە قاڵبی ئامۆژگارێكی دڵسۆز و بە پەرۆش و شارەزادا دواندوونی و پاساوی وەدەست هێنانی ژیان و گوزەرانێكی هەمیشەیی و موڵك و داراییەكی لە بن نەهاتووی خستۆتە بەرچاو یان، چونكە زانیویەتی هەردووك غەریزە و هەستی مانەوە و موڵكی بێ كۆتایی ( الخلود و الملك الباقی) دوو داخوازی ڕیشەداری سروشت و فیطرەتی ئینسانن! ئایەتی ( ٢٠ و ٢١ ) ی(الأعراف)و ئایەتی ( ١٢٠ ) ی سوورەتی ( طه).

٥- دیارە ئامانجی شەیطانیش لەو خوتخوتەیەی كە خستیە دڵی ئادەم و حەوواوە كە لەو درەختە قەدەغەكراوە بخۆن كە خوای كاربەجێ بۆی دیاری كردبوون، ئەوە بوو كە لە ئاكامی خواردنیان لەو درەختە قەدەغە كراوە و سەرپێچی كردنەیان دا دوو چاری بەرگ و پۆشاك لێ داڕنران و عەیب و عەورەت دەركەوتن و پاشانیش لە بەهەشت وە دەرێ نران و بەرەو سەرزەوی دابەزێنران بن ، كەوا دیارە ئەو بەرگ و پۆشاكەی كە لە بەر ئادەم و حەووای هاوسەری دا بووە بەرگ و پۆشاكێكی تایبەتی بووە و بە گوناح و لادان و سەرپێچی لە بەریان داڕنراوە و عەورەت و عەیبیان كەوتۆتە گۆڕێ ، بۆیە لەو كاتەدا كە ئادەم و حەووا عەورەت - پاش و پێش -یان دەركەوتوە ناچار بوون بە گەڵای درەختەكانی بەهەشت خۆیان داپۆشن ، ئایەتی (٢٢) ی ( الأعراف) و ئایەتی (١٢١) ی طه.

بەڵی لە ئەنجامی كەوتنە ژێر ڕكێفی خوتخوتەی شەیطان و كەوتنە تەڵە و داویەوە ئینسان هەم جەستەی و هەم ڕووحیشی لە بەرگ و پۆشاك ڕووت دەبێتەوە و عەیب و عەورەتەكانی دەكەونە گۆڕێ سەرەنجامیش دەبێ لە دنیا و قیامەت دا ئارەقی شەرمەزاری لێ بچۆڕێ!

ئێستاش با بچینە سەر برگەی دووەم و بزانین ڕێگا و شێواز و چۆنیەتی بەرهەڵستی ئینسان لە بەرانبەر شەیطان دا و بەرگری لە خۆ كردنی و خۆ پاراستنی چۆنە.

ب - ڕێگا و چۆنیەتی بەرهەڵستی كردنی ئینسان بۆ شەیطان و خوتخوتە و فێڵ و پیلانەكانی و شێوازی خۆپاراستن و بەرگری لە خۆ كردنی:-

(١) دەرك كردنی ئەو ڕاستیە مەزنە كە ئیبلیس دوژمنی سەرسەخت و بە خوێن تینوومانە و لە سۆنگەی ئەوە وە كە لە بەر كڕنووش نەبردنی بۆ ئادەم و ڕێز و حورمەت نەگرتنی و شكاندنی فەرمانەكانی خوا نەفرینی لێ كراوە و لە ئاسمان

دەرکراوە، ڕق و قین و بوغز و غەرەزێکی گەورە و بێ ڕەزای لەدڵ دایە لە بەرانبەر ئینسان دا و هەوڵی ڕۆژو شەوی نەپساوەی بۆ ئەوەیە کە هەرچی زیاتر ئینسانەکان لە بەندایەتی خوا لابدات و بە مەرەدی خۆییان ببات و گیرۆدەی دۆزەخیان بکات ، ئایەتی ( ١١ و ١٢) ی ( الأعراف) و ئایەتی ١١٧ (طه) وە ئایەتی ( ٥ و ٦ ) ی ( فاطر)

(٢) دڵنیا بوون لەوە کە خوای بەخشەر و کاربەجێ هەرچی کە ژیان و گوزەرانی ئینسان لە سەر زەوی پێویستی پێ‌یەتی بۆی حەلاڵ و مووباح کردووە و پەکی لە سەر شتی حەرام و پیس نەکەوتوە.

وە شەیطانی خاوەن فێڵ و پیلان هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە کە ئینسان بە هۆی شوێن کەوتنی هەنگاوەکانیەوە دووچاری چوونە نێو بازنەی قەدەغە کراوەکان بکات و تووشی سەرپێچی و بێ فەرمانی خوای پەروەردگاری بکات ، ئایەتی (١٩) (الأعراف) ئایەتی ( ٣٥ ) ی ( البقره) ، وە خوای دادگەر و بەخشەر دەربارەی شوێن پێ هەڵنەگرتنی شەیطان فەرموویەتی : ( يا أيها الناسُ كُلُوا مِمّا في الأرض حلالاً طيّباً و لاتتّبِعوا خُطُواتِ الشّيْطانِ إنّه لَكُمْ عدوٌّ مُبِين , إنّما يَأمركُمْ بالسُّوءِ و الفَحْشاءِ و أنْ تَقولوا علىٰ الله ما لا تَعْلَمون ) البقرة -١٦٨, ١٦٩.

*واتە :* ئەی خەڵکینە لە هەرچی حەلاڵ و پاك و چاکە لە زەوی‌دا بخۆن بەلاَم بە دوای هەنگاوەکانی شەیطان مەکەون چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە، بێگومان ئەو تەنیا فەرمانتان بە خراپە و شتی ناشرین پێ دەکات ، وە بەوە کەشتێك بە ناوی خواوە بڵێن کە زانیاریتان دەربارەی نیە.

(٣) هەروەك چۆن ئەوانەی دەیانەوێ دزی لە خەڵکی بکەن و ماڵیان ببرن لە تاریکی‌شەو و بێ ئاگایی خاوەن ماڵ دەرفەت وەردەگردن ، شەیطانی بەدفەڕ و ترسنۆکیش بێ ئاگایی ئینسان لە یاد(ذکر) ی خواو تاریکی دڵ‌و دەروونی بە هۆی کز بوون یان خامۆش بوونی چرای ئیمان بە هەل‌و دەرفەت دەزانێ بۆ پارێز بۆ هێنان‌و زەفەر پێ بردنی، کەواتەکاریگەرترین چەکی بەرهەڵستی شەیطان و وبەرەنگاربوونەوەی‌فێڵ‌و پیلانەکانی کەلە خوتخوتەو دنەدانی خراپەکارانەدا کورت دەبنەوەبریتیە لە هۆشیاری و دڵ بێداری بە هۆی پەیوەندی پتەوی بەندایەتی لەگەڵ خوادا و زۆر یادکردنی و لێ خافڵ نەبوونی،هەر بۆیەش خوای زاناو پەنهان بین لە کاتێکدا باسی چۆنیەتی کارتێ‌کردن‌و زەفەر پێ بردنی شەیطان دەکات

بۆ ئادەم علیه السلام دەفەرموێ: (..فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمـاً) واتە: ..ئادەم _ ئەوەی پێمان گوتبوو _لە بیری چوو وە دڵقایمی و پتەویمان پێوە نەدی! بەڵێ چاری وەسوەسەی شەیطان بریتیە لە وریایی و هۆشیاری بەردەوام بەهۆی یادی خواوە، وەئیرادەی مەحکەمو دڵو دەروونی قایمو پتەوو نەلەخشاو، وەبێگومان بە ئەندازەی هۆشیاری و دڵ بێداری ئینسان توانای بەرهەڵستی و بەرگری لە خۆ کردنی لە بەرانبەر شەیطان دا زۆر دەبێ،خوای پەنهان بێن لەو بارەوە فەرمووییەتی: (إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَـائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَاهُمْ مُبْصِـرُونَ) الاعـراف_٢٠١_، واتە:بێگومان ئەوانەی پارێز_لە خوا_دەکەن هەرکات لە شەیطانەوە خوتخوتەیەکیان پێ گەیشت یادی خوا دەکەنەوەو یەکسەر بەرچاویان ڕۆشن دەبێو_پیلانو فێڵی شەیطان_دەبینن. پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:(ان الشيطان واضِعٌ خَطْمَـهُ علـىٰ قَلْبِ ابْنِ آدم فـإنْ ذَكَـرَ اللهَ خَنَسَ، وانْ نَسِيَ إلْتَقَمَ قَلْبَهُ فذٰلِكَ الوَسْوَاسُ الخَنّاسُ) رواه الحافظ ابو علي الموصلي، واتە بێگومان شەیطان لووتی خستۆتە سەر دڵی ئادەمیزاد، جا ئەگەر یادی خوای کرد خۆی پەنهان دەکات وە ئەگەر – خوای – لە بیر چوو قەپ بە دڵی دا دەکات . ئەوەیە خوتخوتەکەری خۆ پەنهان کەر. هەروەها فەرموویەتی، ((ان الشيطان يجري من إبْنِ آدم مَجْرىٰ الدَّم) متفق علیه. واتە بێگومان شەیطان بەنێو ڕەگو خوێنی ئادەمیزاددا دەڕوات.[1]

بەڵێ ئەگەر فێڵو پیلانەکانی شەیطان لە خوتخوتەو دنەدان دا بەرەو خراپە کورت دەبنەوە،شێوازو چۆنیەتی بەرهەڵستی کردنو بەرەنگار بوونەوەیشی لە پارێزگاریو بێداریو هەمیشە خوا لەیادبوون دا کورت دەبێتەوەو مەحاڵە شەیطان زەفەر بەدڵێك ببات کەبە چرای ئیمانو خوا پەرستی ڕۆشنو بە یادی خوا ئاوەدانە!.

(٤) شەیطانی دۆڕاوو نەفرین لێ کراو :وەك لە خاڵی دووەمی بڕگەی ( أ ) دا باسمان کرد_ لەچوار لاوە پەلاماری ئینسان دەدات کە پێشەوەو دواوەو ڕاستو چەپن، کەواتە ئینسان دوولای سەرێو خوارێ و بە دەستەوە ماونو لێی نەگیراون، کەواتە ئەگەر ئیبلیسی نەگریسو پیس سەنگەرەکانی هێرشو پەلاماری خۆی لەو چوار لایەدا لێ دەدات، ئینسانیش بۆ بەرگریو دژە هێرش لای سەرێو خوارێی بەدەستەوە هەن، هەر بۆیەش دەبینین پاڕانەوەو کڕنوش(الدعاء و السجدة)

---

[1] بڕوانە : ( تفسير القاسمي المسمى : محاسن التأويل ) محمد جمال الدين القاسمي ) ج١٧ ص ٢٠٧ - ٢١٢ باسێکی دەربارەی ( وەسوەسە ) و چۆنیەتی چارەسەری کردوە .

لەدینداری‌و خواپەرستیی دا پلەو پایەیەکی هێندە گرنگ‌و تایبەتی‌یان هەیە کەلەچەندان دەقی قورئان‌و سوننەت دا باس کراون، چونکە لە ڕاستی‌دا پاڕانەوەو داوا کردن لە خوا _جَلّ و عَلا_ بەرزی‌و مەزنی‌و بەخشندەیی خوا دەگەیەنێ، وەکڕنووش بۆ خوا بردن‌و سەر خستنە سەر خاکیش بۆ خوا بەندایەتی‌و مل کەچی‌و فەرمانبەری ئینسان دەگەیەنێ، جا بێگومان باشترین‌و کاریگەرترین چەك بۆ بەرهەڵستی شەیطان و بەرپەرچ دانەوەی فێڵ‌و پیلانەکانی‌ی ئەوەیە کەئینسان هەمیشە ئاگای لە پەروەردگاریێتی‌و پەرستراوێتی خواو بەندایەتی‌و گچکەیی‌و مل کەچی خۆی بێت، ئێستاش با چەند دەقێك بە نموونە بێنینەوە لەسەر گرنگی‌و پلەو پایەی پاڕانەوەو کڕنووش:

**یەك/** دەربارەی پاڕانەوە: (وَإذا سَأَلَكَ عِبادي عَنِّي فَإنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدّاعِ إذا دَعانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ) البقرة_١٨٦_. واتە: وەهەرکاتێك بەندەکانم دەربارەی من _ ئەی موحەممەد_ پرسیاریان لێ کردی ئەوە_با بزانن_ کە من نزیکم، وەڵامی داوای داواکەر دەدەمەوە هەرکاتێك لێم بپاڕێتەوە، دەبا ئەوانیش بەدەنگمەوە بێن‌و با ئیمانم پێ بێنن بۆ ئەوەی سەر ڕاست بن‌و ڕێی ڕاست بگرن.

**دوو/** پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:**(الدعاء هو العبادة)** رواه اصحاب السنن.کەلێرەدا مەبەست ئەوەیە بەشێکی گرنگ و مەزنی خوا پەرستی پاڕانەوەیە. هەروەها فەرمویەتی: **(الدعاء مخ العبادة)** رواه الترمذي. واتە: پاڕانەوە کرۆکی خواپەرستی‌یە.

دەربارەی کڕنووش بردن:

<u>یەك:</u> (كَلّا لا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ) العلق_١٩_. واتە: نەخێر_ ئەی موحەممەد_ بەقسەی ئەوکافرە مەکە،وە کڕنووش بەرەو لەخوا نزیك ببەوە.

بەڵێ کەسێك بیەوێ بەرهەڵستی شەیطان و طاغووتەکان بکات و نەکەوێتە ژێر ڕکێفیانەوە پێویستە پەیوەندی بەندایەتی خۆی لەگەڵ خوادا پتەو بکات‌و لێی نزیك بکەوێتەوە. کە بێگومان چاکترین هۆکاری ئەوەش سوجدە بۆ خوا بردن‌و سەرخستنە سەر خاکە بۆی.

<u>دوو:</u> پێغەمبەری پێشەواشمان لەو بارەوەفەرموویەتی: **(أَقْرَبُ ما يكونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ ساجِدٌ فأَكْثِرُوا الدُّعاءَ )** رواه مسلم وابو داود والنسائي.

واتە: بەندە لەکاتی سوجدە بردن دا لە هەموو حاڵان لەپەروەردگاری نزیکترە. جائێوە_لەکاتی سوجدە بردن دا_زۆر بپاڕێنەوە.

*بەڵێ مسوڵمانی سەنگین و شیرین!*

بەهۆی خوا پەرستی و بەندایەتی‌یەوەبە شەیطان دەوێرین و شەیطان خۆی دانی پێدا هێناوەکە دەستەلاتی بەندە هەڵبژاردەکانی خوای نیە ، دەجا بێگومان ئەوەندەی پاڕانەوەو سوجدە بردن بەندایەتی و پەرستن و مل کەچی و فەرمانبەری ئینسانیان تێدا دەردەکەوێ لە هیچ شتێکی دیکەدا ئەو بەندایەتی و مل کەچی‌یە نابینرێ.

(٥) شەیطانی بەد ئامانجی لە پێ خواردنی ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێ بێ لە درەختە قەدەغە کراوەکەی نێو بەهەشت وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی (لِيُبْدِيَ لَهُمَا ما وُورِيَ عَنْهُمَا مِنْ سَوْآتِهِما ... ) ئەوە بووە کە لە ئەنجامی قەدەغە شکاندنی خوای پەروەردگاریان دا بەرگ و پۆشاکی ڕێزو حورمەتیان لێ دابڕنێ و عەیب و عەورەتیان دەربکەوێ و ئاشکرا بێ، جا مادام ئیبلیس ودارو دەستەکەی داکۆکی لەسەر ڕووت کردنەوەی ئینسان و لێ دا ڕنینی بەرگ و پۆشاکی بکەن بۆ ئەوەی شەرم و شکۆی لەلا نەمێنێ وعەورەتی دەربکەوێ، ئەوە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە شەیطان تەنیا کاتێك زەفەر بە ئینسان دەبات کە بەرگ و پۆشاکی لێ دابڕنێ و حەیا و حورمەتی بشکێنێ و قەدەغەو سنوورەکانی خوای پێ پێشێل بکات و ببەزێنێ، کە پێشتر لە دەروونەوە دەرفەتی لێ هێنابێ و بەرگ و پۆشاکی پارێزکاری (لباس التقوی)ی لێ دراند بێ ! کەوابێ بۆ ڕاوەستان و نەچەمان لەبەرانبەر شەیطان دا بەڵکو بەزاندنی و ڕەتاندنی دەبێ ئینسانیش داکۆکی لەسەر خۆ داپۆشین و خۆ پۆشتەو پەرداخ کردن بکات، جەستەی بەرگ و پۆشاکی ڕواڵەتی شەرعی‌یانەو رووحیشی بە پۆشاك و زری و قەڵغانی پارێزکاری. وەك خوای زانا و دەستەلاتدار دەربارەی هەردووك جۆرەکانی پۆشاك فەرموویەتی: ( يا بني آدَم قَدْ أَنْزَلْنا عَلَيكُمْ لباساً يُواري سَوءاتِكُمْ و رِيْشاً , و لِباسُ التَّقْوىٰ ذٰلِكَ خَيرٌ ذٰلِكَ مِنْ آيات الله لعلّهم يَذَّكَّرون ) الاعراف _٢٦_ ,واتە:ئەی وەچەی ئادەم ئەوەپۆشاکمان بۆ ڕەخساندوون کە عەورەتەکانتان دادەپۆشێ، هەروەها چەند شتێك بۆ جوانی و ڕازاندنەوە، وەپۆشاکی پارێزکاری ئەوە چاکترە بۆ پاراستن و داپۆشینی عەیب و عارتان ئەو بەرگ و پۆشاك دابین کردنەش لەنیشانەکانی خوایە بۆ ئەوەی پەند وەربگرن .

ئنجا ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا سەرنجێکی ورد لەو کارخانەو دام و دەزگایانە بدەین کە لەپشت مۆدێلاتی جۆراو جۆری جل و بەرگەوەن بەتایبەتی بەرگ و پۆشاك و کەل و پەلی

ئافرەتانە کەهەموو هەوڵو کۆششیان ئەوەیە هەرچی زیاتر مێ بینایەتی ئافرەتو جوانی جەستەیی دەربخەن بۆ وروژاندنی غەریزەی جینسی پیاوان، بۆمان دەردەکەوێ کە حەیاو حورمەتو پاریزکاری دەروونی ( لباس التقوى ) وە شەرموشکۆوبەرگو پۆشاکی ڕواڵەتی، چەند پەرژینێکی باشو زریو قەڵغانێکی مەحکەمن لە بەرانبەر هەوڵو تەقەللاو کردو کۆشی شەیطانو پێڕو تاقمەکەی دا!

(٦) لە خاڵی چوارەمی برگەی (أ) دا گوتمان: شەیطان بەجووڵاندنی دوو هەست و غەریزەی هەر مانەوە(الخلود) و موڵکی لەبن نەهاتوو( الملك الباقي) دنەی ئادەمو حەووای هاوسەری دا، جا دیارە ئێمەش هەروەچەی ئەو بابو دایکەین و ڕوومان لەوان وەرنەگێڕاوەو ئەو هەستو نەستو غەریزانەی لەوان دا هەبوون لە ئێمەشدا هەر هەن بێکەمو زیاد، کەواتە ئەگەر ئێمەش وریا نەبینو لە بەرامبەر ئەوهەستو غەریزەیەماندا بێدار نەبین، ئەوە بێگومان شەیطانی تووڕدراو و دۆڕاو لەو دوو کەلێنو دەروازەیەوە لێمان دێتە ژوور بە ژیانی زووتێپەڕی دنیاو ڕابواردنی کەمو کورتی فریومان دەدات و بێئاگامان دەکات. هەر بۆیەش خوای خاوەن لوتفو بەزەیی لە چەندان ئایەت دا لەو بارەوە ئاگاداری کردووینەوە. وەك فەرموویەتی: (يا أَيُّهَا النّاسُ انَّ وَعْدَ الله حَقٌ فلا تَغُرَّنَّكُمْ الحياةُ الدُّنيا و لا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللهِ الغَرُورُ) فاطر_٥_ واتە: ئەی خەڵکینە: بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە_و ڕۆژی سزاو پاداشت دێ _ جا وریا بن ژیانی دنیافریوتان نەداتو شەیطانی فریودەر نەتان خەڵەتێنێ!ئینجا گومانیشی تێدا نیە کە چاکترین دەرمانو چارەسەریهەستو غەریزەی هەر مانەوە( الخلود) یادی مەرگو گۆڕو ژیانی بەرزەخو قیامەت کردنەو، بە ئومێد بوونو دڵخۆش کردنو دڵ پەیوەست کردنە بە ژیانی دوا ڕۆژەوە، کە لە ڕاستیدا هەر ئەوێ ژیانی ڕاستەقینەیەو هەر بەهەشتیش جێگای تێدا تێر بوونی هەستو نەستو غەریزەی هەر مانەوەیە، وەك خوای کار بەجێ فەرموویەتی: (و ما هٰذِهِ الحَياةُ الدُّنْيا اِلّا لَهْوٌ و لَعِبٌ و اِنَّ الدّارَ الآخِرةَ لَهِيَ الحَيَوانُ لَوْ كانُوا يَعْلَمُون)العنكبوت_٦٤_ واتە: وە ئەم ژیانە دنیاییە _ لە لایەنە مادییەکەیەوە_ تەنیا خۆ خافڵاندنو یاریو گاڵتەیە، وە بێگومان ژیانی دواڕۆژ ژیانو گوزەرانی ڕاستەقینەیە ئەگەر زانیبایان. وەباشترین چارەسەری دەردی تەماعو گوریس لەبن باری دنیا ڕاخستنو زیاد لە ئەندازەی پێویست گرنگیو بایەخ دان بە

موڵكو سامانو شت هەبوون بریتیه له دنیا بەكەم گرتن (الزهد فی الدنیا)[1] دیاره هەر كاتێكیش ئینسان لەبەر تیشكی ئایەتەكانی قورئانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خودا ﷺ تەماشای ژیانو گوزەرانو ڕابواردنی دنیای كردو لەگەڵ ژیانی بەهەشت دا بەراوردی پێ كرد، ئەگەر لەگەڵ خۆیدا ڕاست بكاتو فێڵ لە خۆی نەكاتو بەڕاستیش بڕوای بە ئایەتەكانی خواوفەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ، ئەوە بێ سێ و دوو هەر كام له دنیاو دواڕۆژ وەك خۆیان تەماشا دەكاتو سەرەنجام دنیا بەكەم دەگرێو دوا ڕۆژی بەسەردا هەڵدەبژێرێ.

***بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!***

یادی مردنو ژیانی بەرزەخو قیامەت و دڵخۆشكردن بە ژیانی نەبڕاوەی بەهەشتو، دنیا بەكەم گرتنو دواڕۆژ هەڵبژاردن، كە پێچەوانەی (طُوْلُ الأَمَلْ) و (حِرْصْ و طَمَعْ)ن چاكترین دەرمان و چارەسەرن بۆ ئەو دوو هەستو غەریزەیەی كە شەیطانی زۆر زانو فێڵباز دەیانكاتە بیانوو و پاساوی هەڵخەڵەتاندنو فریو دانی ئینسان.

(٧) دوای ئەوەی شەیتان توانی ئادەمو حەووا علیهما السلام بە درۆو دەلەسەو فڕو فێڵ فریو بداتو گرفتاری سەرپێچی فەرمانی خوایان بكات، ئادەمو حەووا بە پێچەوانەی عادەتی ئیبلیسەوە لە جیاتی ئەوەی دان بە هەڵەو سەرپێچی یەكەیان دا نەهێننو پاساوی بۆ بهێننەوەو لێی پەشیمان نەبنەوەو داوای لێ بووردن نەكەنو خەتای خوا_سبحانەو تعالی_بگرنو بێ هیوا بن، كەئەمانە هەر شەشیان خەسڵەتی شەیطان بوون لە كاتی تاوانو لادانەكەی دا، بەڵێ لە جیاتی ئەوە:

***یەك:*** دانیان بەهەڵەكەیان دا هێنا: (قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا) الاعراف_٢٣_.

***دوو:*** پاساو(مُبَرِّر)یان بۆ نەهێنایەوە، وەك شەیطان كە گووتی: (أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَ خَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ) الاعراف_١٢_، یان: (أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً!!)الاسراء ٦١.

***واتە:*** ئایا كڕنووش بۆ كەسێك بەرم كە لە قوڕێ دروستت كردوە!!

---

[1] (الزهد)كەمن بە (دنیا بە كەم گرتن ) مەعنام كردوە كە پێم وایە مانای واقیعیو پڕ بە پێستیەتی نەك (دنیا نەویستی) كەلە ڕووی شەرعیشو زمانەوانیشەوە هەڵەیە، هەندێك لە زانایان ئاوایان پێناسە كردوە كەمن بە چاكترین پێناسەی دەزانم: (لَيْسَ الزُّهْدُ أَنْ لا تَمْلِكَ شَيْئاً، بَلْ هُوَ أَنْ لا يَمْلِكَكَ شَيْءٌ) واتە:زوهد ئەوە نیە كە هیچ شتێكت نەبێ بە ڵكو ئەوەیە كە هیچ شتێك تۆی نەبێ، واتە تۆ نەبی بە موڵكی هیچ شتێكو كۆیلەی، نەك هیچ شتێك نەبێتە موڵكی تۆ! كەوابێ زوهد لەگەڵ دەوڵەمەندیو دەسەڵاتدارێتیدا دژ نیە!!

**سێ:** له هه‌ڵه‌كه‌یان په‌شیمان بوونه‌وه: (و إِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنا و تَرْحَمْنا لَنَكونَنَّ مِـــنَ الخاســرِيْنَ) الاعراف_٢٣_، دیاره هه‌موو كه‌سێكیش له زیانباری‌و زه‌ره‌ر كردن په‌شیمانه.

**چوار:** داوای لێ بووردن‌و به‌زه‌یی یان له خوا كرد : (و إِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنا و تَرْحَمْنا ) یان: (فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِماتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ اِنَّهُ هو التَّوَّابُ الرَّحِيْمُ ) البقـــرة_٣٧_، واته: ئنجا ئاده‌م چه‌ند وشه‌یه‌كی له په‌روه‌ردگاری‌یه‌وه وه‌رگرت واته چه‌ند وشه‌یه‌ك كه پێیان له خوا پاڕایه‌وه بۆ داوای لێ بوردن كردن_وه_خواش_لێی خۆش بوو بێگومان هه‌ر ئه‌و تاوان پۆش‌و به‌به‌زه‌یی یه.

**پێنج:** خه‌تاو هه‌ڵه‌كه‌یان پاڵ دایه لای خۆیان (ظَلَمْنا أَنفُسَـنا) نـه‌ك وه‌ك شـه‌یطانی پیس‌و بێ ئه‌ده‌ب كـه ویستی تـاوان‌و خراپه‌كـه‌ی بـه‌وه پینه بكـات كـه خـوا پێـی كردوه_سُبْحانَهُ وتعالىٰ عَمَّا يقولُ الظّالمون عُلُوّاً كبيراً_كـه گوتـی: (فَبِمـا أَغْوَيْتَـنِي) الأعراف١٦ واته: له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕێت لێ هه‌ڵه كردم !!كه بێگومـان ئه‌مه بێ ئه‌ده‌بییه‌كی گه‌وره‌یه له‌گه‌ڵ خوادا، چونكه به‌ڵێ هه‌موو شتێك به ویستی موتڵه‌قی خوایه، به‌ڵام ئینسان‌و جندیش ویست‌و ئیراده‌یه‌كی جوزئی‌یان هه‌یه كه بایی ئه‌وه ده‌كات چاكه یـان خراپـه‌ی پـێ ئـه‌نجام بـده‌ن‌و سـه‌ره‌نجامیش پاداشـت یـان سـزای له‌سـه‌ر وه‌ربگرنه‌وه.ئنجا شایانی باسه كه هه‌ندێك له‌وانه‌ی له مه‌سه‌له‌ی قه‌زاو قه‌ده‌ردا به لای (جه‌بر) دا ده‌شكێنه‌وه گوتوویانه: ئه‌م قسه‌یه‌ی شه‌یطان ڕاسته‌و خوا شه‌یطانی له ڕێ لاداوه!!به‌ڵام بێ‌گومان كردنی ئه‌م قسه‌یه ئاوا به موتله‌قی هه‌ڵه‌یه چونكه شه‌یطان ئه‌و قسه‌یه‌ی ده‌كاته بیانووی هه‌ڵه‌و لادان و سه‌رپێچی‌یه‌كه‌ی و بێ‌گومان بیانوو گرتنیش به ئیراده‌ی موتڵه‌قی خوا و قه‌زاو قه‌ده‌ری خوا له بواری گوناح و سه‌رپێچی و لادان دا هه‌ڵه‌یه‌و عاده‌تی شه‌یطان و هاوبه‌ش دانه‌ران (مشركین) یشه و خوا له سه‌ر ئه‌و جۆره بیر و ڕا و هه‌ڵوێسته‌ش به توندی به‌رپه‌رچی موشریكه‌كانی داوه‌ته‌وه، دیاره ئه‌گـه‌ر قسـه‌كه‌یان ڕاسـت بوایـه لـه جیاتی به‌رپـه‌رچ دانـه‌وه و بـه‌درۆ خسـتنه‌وه پشـتگیری ده‌كردن وه‌ك خوای دادگه‌ر ده‌فه‌رموێ: (و قالَ الذينَ أشرَكوا : لَو شاءَ اللهُ ما عَبَدْنا مِنْ دُونِهِ من شيءٍ نَحْنُ و لا آباؤنا و لا حَرَّمْنا مِنْ دونِهِ من شَيءٍ كَذلكَ فَعَلَ الذين من قَبْلِهم , فَهَلْ علـى الرُّسلِ الاّ البَلاغُ المُبِيْن) النحل – ٣٥، واته: ئه‌وانه‌ی هاوبه‌شیان – بۆ خوا – داناوه گوتیان : ئه‌گـه‌ر خـوا ویستبای جگـه لـه‌و هیـچ شـتێكمان نه‌ده‌په‌رسـت نـه ئێمـه و نـه بـاب و باپیرانمان ، وه به‌بێ ئیزنی ئه‌و هیچ شتێكمان حه‌ڕام نه‌ده‌كرد : – خوا ده‌فه‌رموێ – ئه‌وانه‌ی به‌ر له‌وانیش هه‌روایان كرد ، ئایا پێغه‌مبـه‌ران – علیهم الصلاة و السلام – بێجگه

لە ڕاگەیاندنی ئاشکرا چی دیکەیان لە سەرە !! وە لە سوورەتی ( الأَنْعام )یشدا هەر لەو بارەوە فەرموویەتی : ( سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شاءَ اللهُ ما أَشْرَكْنا و لا آباؤنا و لا حَرَّمْنا مِنْ شيء , كَذلكَ كَذَّبَ الذينَ مِنْ قَبْلِهم حتى ذاقوا بَأْسَنا, قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ عِلم فَتُخْرِجوهُ لَنا , ان تَتَّبِعُونَ الا الظَّنَّ و إنْ أَنْتُمْ الاّ تَخْرُصُون , قُلْ فَلِلّهِ الحُجَّةُ البالِغَةُ فَلَوْ شاءَ لَهَداكُمْ أَجْمَعين ) الانعام ١٤٨- ١٤٩ ، واتە: ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە دەڵێن : ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمە و نە باو و باپیرانمان هاویەشمان - بۆ خوا- دانەدەنا ، وە هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد! هەرئاوا ئەوانەش کە لە پێش ئەوان بوون ئاینی خوایان بە درۆ زانی هەتا - ئازاری- تۆڵەی ئێمەیان چێژت: بڵێ: ئایا -لەو بارەوە - هیچ زانیاریتان هەیە بۆمان دەربخەن! بێگومان ئێوە بەس شوێن گومان دەکەون وە ئێوە بەس درۆ دەکەن . بڵێ خوا بەڵگەی تەواوی- لەسەرتان- هەیە ئەگەر ویستبای هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست .

وەك دەبینین خوای کار بەجێ و دادگەر ئەو جۆرە قسانەی شەیطان و شوێن کەوتووەکانی لە هاوبەش دانەر و بێ دینەکان بە ( بەدرۆزانین ) و ( شایستەی تۆڵە) و ( قسەی بێ بەڵگە و ناعیلمی) و ( شوێن کەوتنی گومان) و (درۆکردن) لە قەڵەم دەدات!!

***شەش:*** وە لە کۆتایی‌دا ئادەم و حەووای باب و دایکمان صەلاْت و سەلامی خوایان لێ بێ بە شەرمەزاری و گریە و زاری بەڵام بە دڵی پڕ هیوا و ئومێدەوە بە ڕەحمەت و لێبوردن و بەخشش و کەرەمی خوای بەخشەر و دادگەرەوە دەستیان کردوە بە پاڕانەوە و تکا و ڕەجا کە لێیان ببووری و لێیان خۆش بێ و بەزەیی پێیان دا بێتەوە : (قالا رَبَّنا ظَلَمْنا أَنْفُسَنا و إنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنا و تَرْحَمْنا لَنَكُونَنَّ مِنَ الخاسرين ) ، جا دیارە هەرکاتێکیش بەندە ژیوان بۆوە و گەڕایەوە لای خوا ئەوە هەرچەندە خەتاو گوناحی گەورەی کردبێ لە چاو ڕەحمەت و لێبوردنی بێ سنووری خوا هیچ نیە و بە ئاوی ڕەحمەت و بەخششی خۆی چڵك و چەپەری ئەو گوناح و خراپەیەی لێ دەشوات و لای دەبات ، وەك فەرموویەتی : ( ... إنَّ اللهَ يُحِبُّ التوّابِينَ و يُحِبُّ المُتَطَهِّرين ) البقرة -٢٢٢-

***واتە:*** بە ڕاستی خوا تۆبەکەرانی خۆش دەوێ ، وە خۆ پاککەرەوانی خۆش دەوێ ، وەك دەبینین ( المتطهرين ) ی لە دوای ( التوابين) ەوە باس کردوە تاکو بزانین کە بەهۆی تۆبە و پەشێمانی و گەڕانەوە لای خواوە لە چڵك و ژەنگی گوناح و تاوان پاك دەبینەوە و خاوێن دەبینەوە .

*وە لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم:*

ئەگەر دەتەوێ ڕێگا و چۆنیەتی و شێوازیبەرهەڵستی کردنی شەیطان و بەرەنگار بوونەوەی فێڵ و پیلانەکانی لە یەك وشەدا بزانی ئەوە بریتیە لە شوێن کەوتنی هیدایەتی خواو پەیڕەوی کردن و پیادەکردنی حوکم و بەرنامەکەی لە ژیان و گوزەران دا ، وەك خوای دادگەر و میهرەبان فەرموویەتی : ( ... فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ و لا يَشْقَىٰ ) طـه -١٢٣- ، واتە : جا هەر کەسێك شوێن ڕێڕوونی من بکەوێ ئەوە نەسەرگەردان دەبێ نە ژینتاڵ ، دیارە ڕێڕوونی خواش ئەو ئایین و بەرنامەیەیەتی کە بە پێغەمبەرانی دا صلى الله عليهم و سلم ناردوویەتی کە دیارە بۆ ئێمەی ئۆمەتی موحەممەد ﷺ بریتیە لە قوڕئان و سوننەت . شایانی باسە کە لە سوورەتی ( البقرة) شدا لە کۆتایی بەسەر هاتی ئادەم سەلامی خوای لێبێ و شەیطان لەعنەتی خوای لێبێ دا هەمان مەبەست بە تەعبیرێکی تۆزێك جیاواز هاتووە: (... فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ و لاهُمْ يَحْزَنُونَ) البقرة – ٣٨- واتە جا هەر کەسێك شوێن ڕێڕوونی من بکەوێ ئەوە نەترسیان لە سەر دەبێ – لە داهاتوودا – و نەغەم و پەژارەیان دەبێ – دەربارەی ڕابردوو– .

ئیدی خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەوانەمان بگێڕێ کە بە هۆی بەندایەتی بۆ خوا کردن و خوا پەرستی‌یەکی ڕاستەقینەوە شایستەی ئەوەیان دەبێ کە هێندە لە خوا نزیك و بۆ خوا سوڵحاو بن کە شەیطان نەك هەر پێیان نەوێرێ بەڵکو زات نەکات هەر توخنیشیان بکەوێ.

# شوێنەوار و بەرهەمە گرنگەکانی خوا پەرستی

پاش ئەوەی لە باسی یەکەم و دووەم دا زانیمان خوا پەرستی ( عبادة ) یانی چی و گرنگی و پلە و پایەی لە ئیسلام دا چۆنە و چەندە ، خوا پشتیوان بێ لەم باسەش دا لە چەند خاڵێك دا بەرهەم و شوێنەوارە گرنگەکانی لە ژیانی تاك و کۆمەڵ دا دەخەینەوە:

## * خاڵی یەکەم : خوا پەرستی خۆراك و بژێوی دڵ و گیانە.

بێگومان ئینسان ئەگەر تەنیا لەم جەستە بەرهەست و ڕواڵەتی‌یە پێکهاتبایە، ئەوە بۆ تێرکردن و بەڕێوە چوونی خواردن و خواردنەوە بەس بوو ، بەڵام یەکێك لەشتە ئاشکراو بەڵگە نەویستەکانی ئیسلام – هەروەها ئایینە ئاسمانی‌یەکانی دیکە و زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی سەرزەوی بە هەموو ڕێچکە و بیردۆزەکانیانەوە – ئەوەیە کە ئینسان لە جەستەیەکی ماددی و رووحێکی مەعنەوی و نابەرهەست ( غیر محسوس ) پێکهاتوە ، جا هەرچی جەستە (بدن) یە ئەوە هەر لە توخم و ڕەگەزەکانی (خاك) پێکهاتوە ، کە زانا و پسپۆڕانی توێکاری ( التشريح) و کار ئەندام زانی (فسیۆلۆژیا) زۆر وردەکارانە توانیویانە سەر لە بەری جەستە لە تاقیگا ( مختبر ) کانیاندا شی بکەنەوە و هەموو پێکهێنەرەکانی بەبێ هەڵاواردن بگێڕنەوە بۆ توخم و ڕەگەزەکانی خاکی زەوی ، کەواتە شتێکی ئاسایی و سروشتی‌یە کە ئەو خۆراك و بژێوەی کە جەستەش پێی دەژی و پێی بە ڕێوە دەچێ ! هەر بگەڕێتەوە بۆ زەوی و لەوێوە پەیدا بێت ، وەك خوای زانا و شارەزا فەرموویەتی : ( مِنْها خَلَقْناكُم و فِيها نُعيدُكُمْ و مِنْها نُخْرِجُكُمْ تارةً أُخْرى ) طـه -٥٥- . کە بێگومان لێرەدا مەبەست جەستەی ئینسانە کە لە خاك دروست بووە و دوای مردنیش دەبێتەوە بە خاك و ڕۆژی قیامەتیش هەر لەو خاك و زەوی‌یەوە دروست دەکرێتەوە و سەرهەڵدەداتەوە بەجۆرێك کە هەر خوای پەروەردگار پێی زانایە. بەڵام گیان (روح) کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەخاك و زەوی‌یەوە نیە و دیاردەیەکی ناماددی ( ظاهرة غير مادية) یە و پەیوەندی‌یەکی تایبەتی تر لە ماددەی بە خواوە هەیە [1] و بێجگە لە خواش هیچ کەس

---

[1] دیارە دروست کراوەکان ( مخلوقات ) لەوەدا کە دروست کراوی خوان و بەس خوا دروست کەر وەدیهێنەریانە یەکسان و وەك یەکن، بەڵام لە ڕووی جەوهەر و ماهیەت و چۆنیەتی دروست بوونەوە، ڕووح جیایە.

پەی بە ماهیەت و چۆنیەتی ( الماهية و الكيفية ) ی نەبردوە و نابات و هیچ کەس سەرەدەری تەواوی لێ ناکات وەك خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی ( و يسألونك عن الرّوح قُل الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي و ما أُوتِيتُمْ مِنَ العِلْمِ الاّ قَلِيلاً ) الاسراء -٨٥- واتە ، وە دەربارەی گیان - ئەی موحەممەد - پرسیارت لێ دەکەن ، بڵێ : گیان لە کاری - تایبەتی - پەروەردگارمە، وە کەمێکیش نەبێ زانیاریتان پێنەدراوە- بە گشتی و دەربارەی گیانیش بە تایبەت- .

جا دیارە بەو زانیارییە کەمەش ماهیەتی گیان دەرك ناکرێ و پەی پێ نابردرێ ، وە لەو بارەوە کە هەم ئادەم و هەم وەچەکەیشی جەستەکەیان لە خاك و ئاوی زەوی دروست بووە و گیانەکەشیان دروست کراوێکی تایبەتی و نا بەرهەستی خوایی یە ، خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار تبارك و تعالیٰ فەرموویەتی : ( اذْ قال رَبُّكَ لِلْمَلائِكَـةِ انِي خالقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ , فاذا سَوَّيْتُهُ و نَفَخْتُ فيه مِنْ رُوحي فَقَعوا لَـهُ ساجدين) ص -٧١-٧٢- .

*واتە :* - یادی ئەو کاتە بکەوە - کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو : من ئینسانێك لە قوڕێ دروست دەکەم ، جا کاتێك جەستەکەیم ڕێکخست، وە لە گیانی خۆم فووم بەبەردا کرد کڕنووشی - سڵاو و ڕێزی - بۆ ببەن. ئەوە دەربارەی ئادەم سەلامی خوای لێ بێ ، دەربارەی وەچەکەیشی فەرموویەتی : ( الذي أَحْسَنَ كُلَ شَـيءٍ خَلَقَهُ و بَدأَ خَلْقَ الأنسانَ مِنْ طين , ثُمَ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ ماءٍ مَهين , ثُمَ سَوّاهُ و نَفَخَ فيـهِ مِنْ رُوحِهِ و جَعَلَ لَكُمْ السَمْعَ و الأبْصار و الأفْئِدَةَ قَليلاً ما تَشْـكُرون ) السجدة -٧ , ٨ , ٩ - ،

*واتە :* - خوا- ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی زۆر بە چاکی - و وردەکاری یانە - دروست کردوە، وە دروست کردنی ئینسان -ی یەکەم- ی لە قوڕەوە دەست پێ کرد ، پاشان وە چەکەیشی لە پوختە ئاوێکی قێزەون - کە تۆو ( منی ) ی پیاووژنە - دروست کرد . ئینجا - لە نێو منداڵان دا - جەستەکەی ڕێکخست- و ئەندامەکانی بۆ خوڵقاندن - وە لە گیانی خۆی فووی بەبەرداکرد . وە - ئەی وەچەی ئادەم ! خوای میهرەبان - بیستن و بینایی یەکان و دڵەکانی بۆ ڕەخساندوون - بەڵام - کەمتر سوپاسگوزاری دەکەن .

کەواتە، هەم ئادەم و هەم ڕۆڵەکانیشی هەرکامێکیان لە جەستەیەکی خاکی ڕێك و پێك خراو و گیانێکی مەعنەوی بە فووی خوا بە بەرداکراو دروست بوون ، بەبێ جیاوازی لە نێوان باب و ڕۆڵەکانی دا ، جگە لەوە کە جەستەی ئادەم ڕاستەوخۆ لە خاك و ئاوی تێك هەڵشێلراو ( قوڕ) ی ئیشك و ڕەق هەڵاتوو دروست بووە، بەڵام جەستەی ڕۆڵەکانی بە شێوەیەکی دیکە کە پەروەردە بوونێکی پلەپلەیی‌یە لە نێو منداڵانی دایکیان دا ، بەڵێ جا وەك پێشتر گوتمان شتێکی ئاسایی و سروشتی‌یە کە خۆراك و بژێوی جەستەیی مرۆڤ لە خاك و ئاوی زەوی پەیدا بێ و بڕەخسێ ، چونکە هەر لە ئەسڵ دا لە خاکەوە هاتوە و سەری هەڵداوە و تاروپۆ ( ڕایەڵ و تێوەدان) بە گەرد و گەردیلەکانی وی چنراون ، بەڵام ( گیان ) کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە زەوی‌یەوە نیە و لە چەندان دەقی ئاشکرای قورئان دا بە دروستکراوێکی دانسقە و تایبەتی خواو نهێنی‌یەکی نەزانراو پێناسە کراوە ، دیارە خۆراك بژێوەکەیشی دەبێ هەر لە توخم و ڕەگەزی خۆی بێ و لە خواوە دیاری کرابێ!

بەڵێ جەستەخۆی لە خاك و ئاوی زەوی پەیدا بووە و خۆراك و بژێوەکەیشی هەر لە ڕەگەزی خۆیەتی و لە سەرچاوەی پەیدا بوونی خۆیەوەیەتی ، گیان ( ڕوح ) یش کە دروستکراوێکی تایبەتی خوایە و یەکسەر لە خواوە بەبەرجەستەی مرۆڤ دا کراوە (و نَفَخَ فيْهِ مِنْ رُوحِهِ ) دیارە دەبێ بژێوەکەیشی وەك خۆی بێ و لەو سەرچاوەیەوە بێت کە خۆی لێیەوە هاتوە! جا بێگومان ئەو بژێو و خۆراکەی گیانیش بریتیە لە بەندایەتی کردن و پەرستنی خوای خاوەن و پەروەردگاری‌ەوە هەموو ئینسانێکیش بە مەرجێك خاوەنی فیطرەت و سروشتێکی ساغ و سەلامەت بێ و بە هۆی تاوان و خراپە و لادانەوە میزاجی دڵ و دەروونی تێك نەچووبێ، لە ناخ و قووڵایی دڵەوە هەست بە تینوێتی و عەودالی‌ی دەکات بۆ لای خوا و یاد کردنی و پەرستنی و ، بەبێ پەرستنی و یادکردنی دڵ و دەروونی دانامرکێ و هەست بە ئارامی و ئۆخژن و ئاسوودەیی ناکات ، وەك خوای بەخشەر و پەرستراوی ڕاستەقینە فەرموویەتی :
( الذين آمنوا و تَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللهِ أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ القُلُوبُ ) الرعد -٢٨-.

*واتە* : ئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵیان بە یادی خوا ئارام دەگرێ ، بزانن کە تەنیا بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن.

( راغب الاصفهاني) دەربارەی وشەی( الطمأنينة) دا گوتوویەتی:

(الطمأنينة و الأطمئنان:السكون بعد الأنزعاج ، ( و لتطمئن به قلوبكم ) الانفال -١٠- (و لكن ليطمئن قلبي ) البقرة -٢٦٠-(يا أيتها النفس المطمئنة) الفجر -١٣-، و هي أن لا تصير أمّارة بالسوء ، و قال تعالى :( ألا بذكر الله تطمئن القلوب ) الرعد -٢٨- تنبيهاً أنّ بمعرفته تعالى و الأكثار من عبادته يكتسب اطمئنان النفس )[1]

واتە : ( الطمأنينة) و ( الاطمئنان ) یانی : ئارامی و ئۆخژن پاش هەڵپە و ناڕەحەتی ، - وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی : ( وە بۆ ئەوەی دڵتان ئارام بگریَ ) - وە - (بەڵكو بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگریَ و دڵنیا بم )- وە - (ئەی نەفسی ئارام گرتوو) ئەمیش- واتە ئارام گرتنی نەفس - ئەوەیە كە نەفس نەبێتە فەرمان كەر بە خراپەكاری ، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ( بزانن كە بەس بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن ) - ئەمەش - ئاگادر كردنەوەیە بۆ ئەوە كە بە ناسینی خوای بەرز و پەرستنیی ئارام گرتنی نەفس وەدەست دیَ.

بەڵیَ دڵ و دەروونی ئینسان بێجگە لە یادی خوا بە هیچ شتێكی دیكە تینوایەتی ناشكیَ و ئارام و ئاسوودە نابیَ ، وە ئینسان جگە لە خوا پەرستی و بەندایەتی كردن بۆ خوا هیچ شتێكی دیكە تەسەللای نادات و ئۆخژنی بۆ ناهێنیَ ، هۆی ئەمەش ئەوەیە كە ئینسان وا دروست كراوە لە ناخی فیطرەت و كەسایەتی‌یەوە خواو خاوەنی خۆی دەناسیَ و پیَی ئاشنایە ، جا لە كاتێك دا هەست بكات كە بە هۆی بەندایەتی و فەرمانبەری و پەرستنی‌یەوە خوا لەگەڵی دۆستە و لیَی ڕازی‌یە وپەیوەندیەكی ڕاست و دروستی لەگەڵ ئەو تاقە پەروەردگار و پەرستراوەی خۆی دا هەیە ، ئەوە لە بێزاری و ڕاڕایی و هەڵپە هەڵپ قوتاری دەبیَ و، دەبێتە خاوەنی دڵێكی ئارام و دەرونێكی ئاسوودە و كەسایەتی‌یەكی سەقامگیر و دامەزراوو نە لەخشاو ، وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی : ( ياأيتها النَفسُ المُطْمَئِنة اْرْجعي الى رَبك راضيةً مَرْضيةً , فَادْخُلي في عبادي و ادْخلي جَنَّتي) الفجر -٢٧تا ٣٠-. واتە : ئەی نەفسی ئارامگرتوو: بگەڕێوە لای پەروەردگارت تۆش لەو ڕازی و ئەویش لە تۆ ڕازی‌یە ، وە بچۆ نێو بەندە

[1] (معجم مفردات الفاظ القران ) ص ٣١٧ .

– چاکەکار و وەفادارە – کانم ، وە بچۆ نێو بەهشتەکەمەوە. هەروەها فەرموویەتی :
( أَلَا انَّ أَوْلياءَ الله لا خَوْفٌ عَلَيهمْ و لا هُمْ يَحْزَنون , الذين آمنوا و كانوا يَتقون,لَهُمْ البُشْرىٰ في الحياة الدنيا و في الآخِرَة,...) يونس -٦٢-٦٣-٦٤-

واتە : ئاگادار بن ! بێگومان دۆستەکانی خوا نەترسیان لە سەرە – بۆ داهاتوو– وە نەخەمبار دەبن – بۆ ڕابردوو– . – دۆستانی خواش – ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە و پارێزکاریشیان دەکرد . ئەو– بەندە ڕەسەن و وەفادار – انە لە ژیانی دنیا و لە دوا ڕۆژدا موژدەیان پێ دەدرێ – بەوە کە لە سەر ڕێی ڕاست و دروستن و خوا لێیان ڕازی یە– .

پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی نوێژ کە بەرزترین و مەزنترین جۆر و شێوەکانی بەندایەتی و خواپەرستی‌یە و ئەوپەڕی مل کەچی و زەلیلی بۆ خوا تێدایە فەرموویەتی : ( ... و جُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْني في الصَّلاةِ ) رواه أحمد و النسائي الحاكم و البيهي .

*واتە :* ... وە ڕۆشنایی چاو و فێنکی هەناوم لە نوێژی دایە!

هەروەها کاتێك کە وەختی بانگ و نوێژ دەهات فەرمانی بە ( بلال ) ی حەبەشەیی خوالێ ڕازی بێ دەکرد و دەیفەرموو : ( أَرِحْنا بِها يا بِلالُ ) رواه ابو داود.

*واتە :* ئەی بیلال – بانگەکەت بلێ و – بەهۆی نوێژەوە ئاسوودەمان بکە و بمانحەسێنەوە ! ئنجا ئاشکرایە کە لە نێوان ( بەنوێژ ئاسوودە بوون و حەسانەوە ) کە عادەتی پێغەمبەری خواو مسوڵمانە کامڵە شوێن کەوتووەکانیەتی و ، (لە نوێژ قوتار بوون و حەسانەوە) ش کە عادەتی موسڵمانانی کرچ و کاڵە،جیاوازی هێندەی ئاسمان و ڕێسمان هەیە ! ئێستاش با سەرنجی قسە و بیروڕای هەندێك لە زانایانی هۆشیار و دڵ بێدارمان بدەین داخوا لەو بارەوە چی دەڵێن:

( ابن تميمة) خوالێی خۆش بێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (دڵ ( القلب) لە دوولاوە پێویستی بە خوایە ، لە لایەنی بەندایەتی و پەرستنەوە ، وە لە لایەنی یارمەتی لێ وەرگرتن و پشت پێ‌بەستنەوە، چونکە ( دڵ ) بەس بە پەرستن و خۆشویستن و ڕوو کردنە پەروەردگاری چاك و سەرفراز و شاد و بەختەوەر دەبێ و هەست بە تام و چێژ و خۆشی دەکات و ئۆخژنی بۆدێ و دادەمرکێ ، وە بە پێچەوانەوە ئەگەر هەرچی شتی هەیە وە دەستی بێنێ، بەبێ خودا ناگاتە پلەی ئارامی و ئۆخژن بوون ، چونکە ئاتاج بوونی ئینسان بە خوا ، شتێکی بنەڕەتی و سروشتی‌یە لە سۆنگەی ئەوەوە کە تەنیا خوا پەرستراو و خۆشەویست و مەبەستیەتی ... ئنجا ئەوەش بۆ مرۆڤ مەیسەر نابێ

مەگەر خوا یارمەتی بدات ، جا بۆیە ئینسان هەمیشە پێویستی بەو ڕاستی‌یە یە کە لە ( ایاك نعبد و ایاك نستعین) دا شێرراوەتەوە )[1]

(ابن قیم الجوزیة ) ش خوالێی خۆش بیّ لەو بارەوە گوتوویەتی :

(بێگومان هیچ شتێك لەلای دڵان ( قلوب) لە بەدیهێنەر و پەروەردگاریان خۆشەویست تر نیە، چونکە هەر ئەو خوا و پەرستراویانە، وە دۆست و پشتیوانیانە، وە پەروەردگار و مشوورگێڕیانە ، وە ڕۆژی دەرو مرینەرو ژیێنەریانە، بۆیە خۆشویستنی وی ناز و نیعمەتی هەناوان و زیندەگی گیانان و شادی دەروونان و بژێوی دڵان و ڕووناکی بیر و هۆشان و ڕۆشنایی چاوان و ئاوەدانی نێوەوەی ئینسانە!

جا لە لای دڵە ساغەکان و ڕووحە پاکەکان و عەقڵە تەواوەکان هیچ شتێك شیرین تر و بە تامتر و خۆشتر و دڵخۆشکەر تر و چاکتر نیە لە خۆشویستنی‌ی و هۆگربوونی‌ی و شەیدا بوونی‌ی وە ئەو شیرینایەتی‌یەی کە ئیماندار لەو بارەوە لە دڵ و دەروونی خۆی‌دا هەستی پیّ دەکات ، لە سەرووی هەموو جۆرە شیرینایەتی‌یەکی دیکەوەیە و، ئەو ناز و نیعمەتەی کە لەو ڕێیەوە وەدەستی دێنیّ لە هەموو نیعمەتێك تەواو ترە و ، ئەو خۆشی‌یەی کە بەو هۆیەوە پی‌ی دەبریّ لە هەموو خۆشی‌یەك بەرزترە ، وەك یەکێك لەو خاوەن دڵانە دەربارەی حاڵ و باڵی خۆی گوتوویەتی : ( هەندێك حاڵم بەسەر دڵ دا دێن لە بارەیانەوە دەڵێم : ئەگەر خەڵکی بەهەشتیش هەموویان لەم جۆرە حاڵانەدا بن بێگومان لە ژیانێکی خۆشدان ) !! .. هەروەها یەکی دیکە لەو جۆرە کەسانە گوتوویەتی : ( لە خوا بیّ خەبەران بەستەزمانن ! لە دنیا دەردەچن بەر لەوەی لە خۆشترین شتی بتامێنن) پی‌ی گوترا: ئەوشتە چی‌بوو؟! گوتی : خۆشویستنی خواو هۆگر بوونیەتی ) ، یەکی دیکەیان گوتوویەتی : ( خۆشترین شتی دنیا ناسین و خۆشویستنیەتی ، وە خۆشترین شتی دوارۆژیش دیتنیەتی و بیستنی فەرموودەیەتی بەبیّ پەردە و هۆ)!، وەیەکی‌تر لە خواناس و خواپەرستان گوتوویەتی : ( لَوْ عَلِمَ الملوكُ و أَبناءُ الملُوكِ مانَحْنُ فيْهِ لَجالَدُونا عَلَيْهِ با لسُّيوفِ ) واتە : ئەگەر پادشا و پادشازادەکان بەو حاڵەی ئێمەیان زانیبایە کە تێیداین بۆ ئەستاندنی ئەو حاڵە شەڕە شیریان لەگەڵ دەکردین. )[2]

---

[1] بروانە کتێبی ( العبودیة ) ص ١٠٨-١٠٩ ، وە ( العبادة فی‌ي الاسلام ) د. یوسف القرضاوي ص ٩٨

[2] بروانە : ( اغاثة اللهفان ) ج ٢ ص ١٩٧ ، ابن قیم الجوزیة ، وە ( العبادة في الاسلام ) ص ٩٨ ، ٩٩.

## * خاڵی دووەم : خوا پەرستی تاقە ڕێگای ئازادیی ڕاستەقینە و پچڕاندنی کۆت و زنجیری دیلی و کۆیلایەتی‌یە

*بەڵێ خوێنەری مسوڵمان :*

خواپەرستی ( عبادة ) ی ڕاست و ساغ تاقە ڕێیەکە کە ئینسان بتوانێ ئازادیی ڕاستەقینەی پێ وەدەست بهێنێ و کۆت و زنجیری هەموو جۆرە دیلی و کۆیلایەتی‌یەکی پێ لە دەست و پێ و گەردنی خۆی بپسێنێ و تیری هەر طاغووت و ستەمکارێکی پێ لە سەر شانی خۆی لابدات و خۆی لە خەم و پەژارەی دنیا و قیامەتان برەخسێنێ.

چونکە ئینسان لە سۆنگەی ئەوە کە لە زاتی خۆیدا حەوجێ و پەککەوتەیە و ئەگەر بە هۆی خۆڵ گۆڕان و لە خۆبایی بوونەوە پەردەی ڕەشی بە سەر دڵ و مێشکان هەڵنەکشابێ ، زۆر بە ڕوونی و لە قووڵایی دڵ و ناخی دەروونی‌یەوە هەست بەو بێ هێزی و کلۆڵی و ئاتاجی‌یەی دەکات و ، دەزانێ کە حەتمەن دەبێ پشتیوانێکی هەبێ پشتی بگرێ و پەنایەکی هەبێ سەری پێ بێنێ و لە چاڵی ئاتاجی و بێ دەرەتانی و بێ پەنایی دەری بێنێ و دەستی بگرێ و بەرەو سێبەری دڵ ئارامی و ئۆخژن و دڵنیایی بیهێنێ.

جا ئاشکرایە - بۆ هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێکی ساغ - کە جگە لە خوای پەروەردگار و بێ وێنە هیچ کەس و هیچ شتێك لەوە ناوەشێتەوە کە مرۆڤ بیپەرستێ و پشتی پێ ببەستێ ، وە ئەگەر گریمان هەندێك کەس بە هەڵە غەیری خوایان کردە پەرستراوو پشت و پەنای خۆیان ، ئەوە لە ئەنجامی بزرکردنی پەرستراوی ڕاستەقینەدا ، سەرەڕای ئەوەی کە بەمەرەدی ئەو کەسە دەچن کە تراویلکە ( سراب ) ی بە ئاو حیساب کردوە و دوایی نەزانی و بە هەڵە داچوونی خۆی بۆ دەرکەوتوە! گیرۆدەی چەندان دەردو نەخۆشی سامناکیش دەبن کە پیسترینیان دڵ بلاو بوون و کەسایەتی لەت بوون ( انفصام الشخصية) ە ، وەك خوای زانا و شارەزا بە نهێنی‌یەکان فەرموویەتی :

(ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُلاً فيه شُرَكاءُ مُتَشاكِسُون و رَجُلاً سلماً لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيان مَثَلاً الحمد لله بَلْ أكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمون) الزمر -٢٩- ، واتە خوا وێنەی هێناوەتەوە - بۆ جیاوازی نێوان خوا بە یەکگرتن و هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن - بە پیاوێك - ی کۆیلە - کە چەند

شەریکێکی پێکەوە ناکۆك تێیدا بەشدارن – و دەبێ خزمەتی هەموویان بکات ! وە بە پیاوێك –ی کۆیلە –ی دیکە کە بۆ –خزمەتی – پیاوێك یەکلا بۆتەوە ، ئایا حاڵیان وەك یەکە ؟ : سوپاس بۆ خوا – لە سەر دەرکەوتنی هەق کە خوا بە یەکگرتنە و پووچانەوەی باطل کە هاوبەشی بۆ خوا دانانە– بەلاّم زۆربەیان نازانن – و نافامن کە شیرك چەندە حاڵێکی ناڕەحەت و دەردێکی گرانە – .

بەڵێ مرۆڤ وا دروست کراوە و هەڵخراوە کە نەتوانێ بە بێ خواو پەرستراو بێت ، جا ئەگەر خواو پەرستراو ی ڕاستەقینەی پەرست ئەوە بە مراد گەیشتووە و لە خەم ڕەخسیوە، ئەگەر نا وە نەبێ بە هۆی پشت لە خوا کردن لە پەرستن و بە ندایەتی ڕزگار بووبێ ، بەڵکو حەتمەن دەبێ شتێك هەر بپەرستێ لە جیاتی خوا جا ئەو شتە هەرچی هەیە بابێ ، شەیطان ، طاغووت ، خۆرو مانگ و ئەستێرە ، فریشتە ، شێخ و پیاو چاك ، داروبەرد ، هەوا و ئارەزوو پارەو سامان ،.... هتد ، بەلاّم بێگومان ئینسان بە پەرستنی غەیری خوا نەك هەر هەست بە ئارامی و دڵنیایی و ئاسوودەیی ناکات بەڵکو دووچاری حاڵەتێکی یەکجار سەخت و دژوار دەبێ ، کە تێیدا دەبێتە نێچیری چەندان دەردو نەخۆشی کوشندە و بێڕەزا!

ئایا ئەو کەسەی تینوایەتی تینی بۆ دێنێ و شپرزەی دەکات و لە جیاتی ئاوی شیرین و سازگار ئاوی تاڵ و سوێری دەریا دەخواتەوە، لە جیاتی تینوایەتی شکان و تەسەللا هاتن و فێنکایەتی لە دڵ گەڕان ، بە پێچەوانەوە پتر لە تینوان شپرزە نابێ و دڵ و هەناوی و سەرتاپای جەستەی بە ئاگری تینوێتی هەڵناقرچێ ؟!

خوای دادگەر و بەخشەر لەو بارەوە کە بە هۆی ئیمان و پارێزکاری و بەندایەتی کردن بۆ خوای بەدیهێنەر و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری پێشەوا و سەرورەر ﷺ ئینسان دەبێتە ئەهلی کردەوەی چاك و ڕۆزی پاك و بە شمشێری خوا بە یەکگرتن (التوحید ) سەری طاغووت دەپەڕێنێ و کۆت و زنجیری کۆیلایەتی و دیلی لە دەست و پێ و گەردنی خۆی دەپسێنێ و ئازادی و سەرفرازی ڕاستەقینەی دنیا و دوارۆژ وەدەست دێنێ فەرموویەتی : (... و رَحْمَتِي وسِعَتْ كُلَّ شيء فَسَأكْتُبُها لِلَّذِينَ يَتَّقُونْ و يؤتونَ الزَّكاةَ و الذين هُمْ بآياتنا يؤمنون , الذين يَتَّبِعُونَ الرَسول النبيَّ الأمِّيَّ الذي يَجِدُونَه مَكتُوباً عِنْدَهُمْ في التوراة و الأنجيل , يأمرهم بالمعروف و ينهاهم عن المنكر و يُحِلُّ لَهُمْ الطَيِّبَاتِ و يُحَرِّمُ عَلَيهم الخبائث و يَضَعُ عَنْهُمْ إصْرَهُمْ و الأغْلالَ التي كانت عَلَيهِمْ فالذين آمنوا بِهِ و عَزَّروه و نَصَروُهُ و اتَّبعوا النور الذي أُنزِلَ مَعَهُ أولئك هُمْ المُفلِحُون)الاعراف –١٥٦-١٥٧-

***واتـە:*** -خوا فەرمووی - وە بەزەیی مـن هـەموو شتێكی گرتۆتـەوە ، بـەڵام بـەس بـۆ ئەوانەی تۆمار دەكەم كە پارێزكاری دەكەن و خۆیان تەزكیە دەكەن[1]، وە ئەوانەی كە بڕوا بە ئایەتەكانمان دێنن . ئەوانەی كە شوێن ڕەوانەكراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار دەكەون، كە لە تەورات و ئینجیلی لای خۆیان دا دەیبینن - ناووشۆرەتی - نووسراوە ، فەرمانیان پێ دەكات بە هەرچی چاكەیە و هەرچی خراپەیە لێیان قەدەغە دەكات ، وە هـەرچی ڕۆزی و شتی پـاك و چاكەیـبـۆیـان حـەڵاڵ دەكـات و ، هـەرچی پیسـی وزیانبەخشە لێیان حەرام دەكات ، وە ئەو قورساییەی[2]كە لـە سـەر شانیان بووە و ئەو كۆت و زنجیرانەی كە پێیانەوە گرفتار بوون لێـیان لادەبات، جا ئەوانەی بڕوایان پێی هێناوە و ڕێزو حورمەتیان گرتوە و پشتیوانییان كردوە و شوێن ئەو ڕووناكییە كەوتوون كەلەگەڵی نێرراوەتە خوارێ ئائەوانەن سەركەوتووان و بە مراد گەیشتووان.[3]

---

[1] دیارە بە كردەوە خۆ تەزكیە كردن شتێكی فەڕزە و خەسڵەتێكی زۆر بەرز و پەسندە، بەڵام بە پێچەوانەوە بە قسە و زمان تەزكیەی خۆكردن حەرامە و سیفەتێكی زۆر نزم و پەستە.

(٢) وشەی ( إِصْر) لە ئەسڵی زمان دا بە مانای بەڵێن و پەیمانی پتەو ، وە بە مانای گرێ دان و بەستنەوەی شت دێ ، لێرەش دا مەبەست ئەو شتانەن كە لە جوولەكەكان حەرام یان لە سەریان پێویست كرابوو لە بەر سەرەخەری و بەد فەڕی خۆیان كە بۆیان وەك كۆڵێكی قوورس وابوو. بڕوانە : ( تفسیر مفردات الفاظ القران الكریم ) ص ٧٨ /سمیح عاطف الزین.

(٣) راغب الاصفهانی دەربارەی چەمك و واتای ( فلاح) گوتوویەتی : ( الفَلْحُ: الشَقُّ ، و قیل الحدید بالحدید یُفْلَحُ اي یُشَقُّ ، و الفلاّح : الأكّار لِذٰلِكَ ، و الفلاح : الظفر و ادراك بغیة و ذلك ضربان دنیوي و اخروي ، فالدنیوي : الظفر بالسعادات التي تطیب بها حیاة الدنیا و هو البقاء و الغنی و العز ... و فلاح اخروي و ذلك اربعة اشیاء : بقاء بلا فناء ، و غنی بلا فقر ، و علو بلا ذل و علم بلا جهل ...) بڕوانە ( معجم مفردات الفاظ القران ) ص ٣٩٩.واتە : ( فلح : دڕین و لەت كردنە ، وە گوتراوە : ئاسن بە ئاسن شەق دەكرێ ، فَلاّح - جوتیار ) یش ئەو كەسەیە كە ئەو كارە ئەنجام دەدات ، ( فلاح) یش سەركەوتن و بە مراد گەیشتنە ، ئەویش دوو جۆرە دنیایی و دوا ڕۆژیی ، دنیاییەكە بریتیە لە دەستگیر كردنی ئەو بەختەوەری یانەی كە ژیانی دنیایان پێ خۆش دەبێ كە بریتین لە : مانەوە و دەوڵەمەندی و دەسەڵات .. وە سەرفرازی دوا ڕۆژ كە ئەویش بە چوار شتان دەبێ :

١-مانەوەی بەبێ لە بەین چوون.

٢-دەوڵەمەندی و بێ نیازی بە بێ هەژاری و نەداری.

٣-دەسەڵاتێك كە ژێر دەستەیی و زەبوونی ڕەگەڵ نەكەوێ و بە دوای دا نەیەت.

٤- زانیاری یەك كە نەزانی و نەفامی تێكەڵ نەبێ.

بەڵێ بەندایەتی کردن بۆ خوا ڕزگاری و سەرفرازی دنیا و دواڕۆژ بۆ مرۆڤ مسۆگەر دەکات و ، هەموو جۆرە تۆق و کۆت و زنجیرەکانی دڵ و مێشك و گەردن و دەست و پێیان دەپسێنێ و لە زیندانی دیلی و کۆیلایەتی دروست کراوەکان دەری دێنێ ، پێغەمبەری پێشەواشمان ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی:

( مَنْ جَعَلَ الهُمُومَ هَمّاً واحداً ، هَمَّ المَعادِ ، كَفاهُ الله هَمَّ دُنْيَاهُ ، و مَنْ تَشَعَّبَ بـهِ الهُمُومُ في أَحْوالِ الدُّنْيا ، لَمْ يُبالِ الله في أَيِّ أَوْدِيةٍ هَلَكَ) رواه ابن ماجة و الحاكم .[٤]

واتە هەر کەسێك مەبەست و خەمەکانی بکاتە یەك ، کە مەبەست و خەمی دوا ڕۆژە – واتە گەیشتن بە ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین – خوا خەمی دنیای لە کۆڵ دەخات و کارو باری ژیانی بۆ سێنا دەکات ، بەڵام هەرکەسێك خەم و خولیایەکانی بە شیوو دۆڵەکانی حاڵ و باڵی دنیادا لێ پرژ و بڵاو بن ، ئەوە خوا بایەخی پێ نادات داخوا لە چ دۆڵ و شیوێك دا دەفەوتێ .



---

(٤) بڕوانە : ( جدد حياتك ) محمد الغزالی ص ٣٦ ، وە ( تاريخ التصوف الاسلامي ) عبدالرحمن بدوي ص ١١٣ . ط ٢ .

## * خاڵی سێیەم : خوا پەرستی دەروونی مرۆڤ دەشوات و چڵك چەپەری گوناح و خراپە لادەبات

یەکی دیکـە لـە بەرهـەم و شـوێنەوارە گرنـگ و مەزنـەکانی خـوا پەرسـتی لـە ژیـانی ئینساندا - واتە ئینسانی خوا پەرست - بریتیە لە شۆران وخاوێن بوونەوەی دڵ و دەروونی و لاچوونی ئەو ژەنگ و ژار و چڵك و چەپەرەی کە لە ئەنجامی خونخوتەی شەیطان و تاوان و سەرپێچی‌یەکانەوە لە سەری پەیدا دەبێت و جاری وایە رەش دادەگیرێ و بگرە کەمرەشی لە سەر دەبەستێ!

خوای پەروەردگار دەربارەی چۆنیەتی ژەنگ هێنانی دڵ و دەروونی ئینسان و رەش داگەڕانی بە هۆی گوناح و تاوان و خراپەوە فەرموویەتی:

( وَيلٌ يَومَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِين , الذين يُكَذِّبونَ بيوم الدين , و ما يُكَذِّبُ بِهِ إلا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيْم , إذا تُتلى عَليه آيَاتُنا قال أَساطير الأَولين , كلا بَلْ رانَ على قُلُوبِهِمْ ماكانوا يَكْسِبون , كلا إنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَومَئِذ لمحجوبون ثُمَ إنَهُمْ لصالوا الجحيم...) المطففين- ١٠ تا ١٦ .

**واتە : سزای سەخت لە و ڕۆژەدا بۆ بە درۆزانـان ، ئەوانەی ڕۆژی سزا و پاداشت بە درۆ دەزانن. جگە لە هەر لادەرێکی گوناحباریش کەس بە درۆی نازانێ - ئەو لادەرە گوناح بارەی- کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بە سەردا بخوێنرێنەوە دەڵێ : ئەفسانەکانی پێشینانن! نەخێر بەڵکو ئەو- کردەوە خراپان - ەی دەیانکـەن دڵیـان داپۆشـیون ، نەخێر - ڕاست ناکـەن - بێگومـان ئەوانـە ڕۆژی دوایـی لـە دیـداری پـەروەردگاریان پەنهان و پەردە پۆش دەکرێن ، پاشان ئەوانە دەچنە نێو کڵپەی دۆزەخەوە .**

وە ك دەبینـین گوناحبـاری و خراپـەکاری دەبێتـە هـۆی ڕەش دا گـەڕان و ژەنـگ هەڵێنانی دڵ و دەروون و لە ئەنجامی ئەو ژەنگ و ژار و کەمرە بەستن و گوناح و تاوان کەڵەکە بوونەش دا، ئەوانە شایستەیی ئەوە لـە دەست دەدەن کە لە ڕۆژی دوایی دا بچنە بەهەشت و بـە دیـداری بـەرزی خـوای پـەروەردگاریان شـاد بـبن وە سـەرەنجام گیرۆدەی دۆزەخی بێ ئامان دەبن و لەگەڵ مەرگ دا دەستەوداماو دەبن؟

بەڵێ جگە لە پاکان و چاکان هیچ کەس لە وە ناوەشێتەوە کە بچێتە بەهەشتەکانی خوای دادگەر و بەخشەرەوە ، چونکە خوا کار بەجێ‌یە و هەرکەس لە جێگا و ڕێگا و شوێنی شیاوی خۆی‌دا دادەنێ ، وەك خـوای پـەروەردگار لـەو بـارەوە فەرموویـەتی:

( و سِيْقَ الَّذين اتقوا رَبَّهُمْ الىٰ الجنة زُمَراً حتىٰ إذا جاؤها و فُتِحَتْ أبوابُها وقال لَهُمْ خَزَنَتُها : سَلامٌ عليكم طِبْتُمْ فادْخـلوها خالدين ) الزمر -٧٣ -.

*واته :* ( وه ئەوانەی پارێزکاری‌یان لە بەرانبەر پەروەردگاریان دەکرد کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو بەهەشتیْ بەڕێ کران ، هەتا کاتێك هاتنە لای - بەهەشتیْ - وە دەرگاکانی کرانەوە ، دەرگاوانەکانی - بەهەشتیْ - پێیان گوتن : سەلامتان لیْ بی پاك و چاکن مادام وایە بچنە نێویەوە بە هەمیشەیی - تێیدا نیشتەجیْ بن- .

*کەواتە :* جگە لەوانەی پاك و چاکن هیچ کەس شایستەی چوونە بەهەشت نیە وە تەنیا ڕێگای چاکبوون و پاکبوونەوەش خوا پەرستی و چاکەکاری‌یە ، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ( و أقِمْ الصلاة طَرَفَيْ النَّهارِ و زُلَفاً من اللَّيْلِ إنَّ الحَسَناتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئاتِ ذلك ذِكْرىٰ لِلذّاكريـــنْ) هـود- ١١٤-. واتە: وە ئەملاو لای ڕۆژگار و چەند بەشێك لە شەوگار نوێژیْ بەرپا بکە ، بێگومان - کردەوە - باشەکان خراپەکان لادەبەن ، ئەوە پەند و ئامۆژگاری‌یە بۆ پەند وەرگران.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرموودەی زۆرن بۆ وێنە:

**(إتَّقِ الله حَيْثُما كُنْتَ و أتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُها و خالِقِ النّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ)** رواه الترمذي و حسنه

*واته :* پارێزکاری لە خوابکە لە هەموو حاڵێکت دا ، وە بە دوای خراپە دا چاکە بکە دەیسڕێتەوە ، وە بە ڕەوشتی جوان لەگەڵ خەڵکی دا ڕەفتار بکە.

هەروەها فەرموویەتی : **(الصَّلواتُ الخَمْسُ و الجُمُعَةُ الىٰ الجُمُعَةِ و رَمَضانُ الىٰ رَمَضانَ مُكَفِّراتٌ لِما بَيْنَهُنَّ ما اُجْتُنِبَتِ الكَبائِرُ)** رواه مسلم ، واتە : پێنج نوێژە - فەرزەکان - و نوێژی جومعە هەتا جومعەی دوای و - ڕۆژووی مانگی - ڕەمەزان هەتا ڕەمەزانی دوای، ئەو خراپە و گوناحانەی دەکەونە نێوانیانەوە دەیانسڕنەوە بە مەرجێك دووری لە گوناحە زلەکان کرابیْ .

هەروەها فەرموویەتی : **( ما مِنْ مُسْلِمٍ يُذْنِبُ ذَنْباً فيَتوَضَّأُ و يُصَلّـي رَكْعَتَيْنِ الاّ غُفِـرَ لَـهُ )** رواه احمد عن ابي بكر الصديق ( رضي الله عنه ) واتـە هـەر موسڵمانێك گوناحێك بكات پاشان دەستنوێژ بگریْ و - بە مەبەستی پەشێمان بوونەوە - دووڕکات نوێژ بکات حەتمەن گوناحەکەی دەپۆشریْ.

دیسان فەرموویەتی : **( أرَأَيْتُمْ لو أنَّ نَهراً بباب أحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ منهُ كلَّ يوم خَمْسَ مرّاتٍ هَـلْ يَبْقىٰ مِنْ دَرَنِهِ شيءٌ ؟! قالوا لا يَبْقىٰ مِنْ دَرَنِهِ شيءٌ ، قال : فذلِكَ مِثْلُ الصلوات الخَمْسِ يَمْحـو الله بِهِنَّ الخَطايا )** متفق عليه .

*واتـه :* ئايا ئەگەر بێت و رووبـارێك بـه بـەردەرگای – مـاڵی – یـەكێكتان دا بـڕوات و هەموو ڕۆژێ پێنج کەڕەتان خۆی لێ بشوات ، ئایا هیچ چڵکی پێوه دەمێنێ هاوەڵە بەڕێزەکانی ( خوا لێیان ڕازی بێت) گوتیان : هیچ چڵکی پێوه نامێنێ فەرمووی : ده ئەوه وەك پێنج نوێژه – فەرزە – كان وایه خوا هەڵەكانیـان پێ دەسڕێتەوه .

وه دەربـارەی چۆنیـەتی ڕەش داگـەڕان و كـەمڕه هەڵـهێنانی دڵ بـەهۆی خراپـه و سەرپێچی یەكانەوه و پاشان سپی و ساف بوونەوه و پاكبوونەوەی به هۆی گەڕانەوه لای خـواو داوای لێبوردن كردنەوه كـه یەكـەمین هـەنگاوی دینـداری و خواپەرسـتیی ئینسانی خواپەرسته فەرموویەتی :

( ان العَبْدَ اذا أَذْنَبَ ذَنْباً كانت نُكْتَهُ سوداءُ في قَلْبِهِ ، فَإنْ تاب مِنْهَا صَقَلَ قَلْبُهُ ، فان عـادَ زِيْـدَ فيها حتى تَعْلُوَ قَلْبَهُ فهو الرّانُ الّذي قال الله تعالى : كلا بل ران على قلوبهم ما كانوا يكسبون) رواه الترمذي باسناد حسن عن ابي هريرة.

*واته :* بێگومان هـەركاتێك بـەنده گوناحێكی كرد دەبێتـه خـاڵێكی ڕەش لـه دڵی‌دا،جا ئەگەر لێی پەشێمان بۆوه دڵی سپی و ڕوون دەبێتـەوه ، بەڵام ئەگەر گەڕایەوه سەری ئەوه ڕەشی یەكەی دڵی زیاد دەبێ هەتا دەكەوێتە سەر هەموو دڵی – و دایده پۆشێ- وه ئەوه ئەو ژەنگەیه[1] كه خـوای بەرز باسـی كـردووه :( نـەخێر – وانیـه وەك ئـەوان گومان دەبەن بەڵكو ئەو كردەوه – خراپانه – ی دەیكەن ژەنگی له سەر دڵەكانیان پەیدا كردوه) .

ئنجا پێویسته ئەوەش بگوترێ كه ئـەو چاكه و طاعەت و جۆره خوا پەرستی‌یانه هـەر كامێكیان بـەس لـه قـەدەر خۆی و بەئـەندازەی خـۆی دەتوانـێ چڵـك و چەپـەر و ژەنگ و ژاری گوناح و خراپەكان لابەرێ و بسڕێتەوه نەك به موتڵەقی ، هـەروەك چۆن له شتی ماددی‌دا جاری وایه بۆ پاككردنەوەی شتی پیس و چڵكن تەنیا ئاوی ئاسایی كافی‌یه، بەڵام جاری وایه پێویسته ئاوەكەی گـەرم بكرێـت ئەگەر نا پەڵەو چڵكەكـه لانابات ، وه جاری واش هەیه وێڕای ئاوی گـەرم ماددەیەكی دیكـەی وەك صابوون و تایت و فاس و .. هتد یش پێویسته جاری واش دەبێ ئەو چڵك و چەوری و پەڵەیه

---

[1] ( راغب الاصفهانی ) (رین ) ، ی به ( صدأ) لێكداوەتەوه كه به كوردی ( ژەنگ ) ه ، بڕوانه ( معجم مفردات الفاظ القران ) ص ٢١٤.

ئەسڵەن بە ئاو هەر لاناچێ و خاوێن نابێتەوە و دەبێ پاککەرەوەیەکی بە هێز تر کە توانای بە سەر ئەو چڵك و پیسی‌یەدا بشکێ - وەك بە نزین - بەکار بهێنرێ.

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری سەردارمان ﷺ دێنین کە بە هێزترین و کاریگەر ترین جۆرە خواپەرستی پاککەرەوەی ئینسان و لابەر و سڕەرەوەی هەڵەو پەڵەو سەرپێچی‌یەکان پێشانی ئۆمەتەکەی دەدات و دەفەرموێ (الْقَتْلُ في سبيل الله يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ الاَّ الدَّيْنَ ) رواه مسلم .

واتە ، لە پێناوی خوادا کوژران - شەهید بوون - بێجگە لە قەرز هەموو شتێك دەسڕێتەوە .

جا خوایە بە لوتف و کەرەمی خۆت پلە و پایەی[1] شەهیدییمان پێ ببەخشی و لە قەرز و قۆڵی خەڵکیش بمانپارێزی.



---

[1] بە قیسمەت بوونی پلەی شەهیدی مەرج نیە تەنیا لە ڕێی کوژرانەوە بێ ، بەڵکو زیاتر پەیوەستە بە نیاز و مەبەست و دڵ و دەروونی ئینسانەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (مَنْ سَأَلَ اللهَ تعالىٰ الشهادةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللهُ منازلَ الشُّهَدَاءِ و اِنْ ماتَ علىٰ فِراشِهِ) راوه مسلم .

واتە : هەرکەسێك بە ڕاستی پلەی شەهیدی ی لە خوای بەرز داوا بکات ، خوا دەیگەیەنێتە پلە و پایەی شەهیدان ئەگەر لە سەر جێگای خۆیشی بمرێ ، هەروەها فەرموویەتی : ( مَنْ طَلَبَ الشَّهادة صادِقاً اُعْطِيَها و لـو لَمْ تُصِبْهُ) ڕاستگۆیانە پلەی شەهیدی ی - لە خوا - بخوازێ ، ئەگەر شەهید بوونیشی تووش نەبێ پێی دەبەخشرێ ، ئەم ڕوونکردنەوەیەشم بۆ ئەوە بوو کە بزانرێ چۆن دووعای گشتی بۆ مسوڵمان دەکرێ لە بارەی شەهیدی‌یەوە ؛ چونکە جارێکیان گوێم لە برایەك بوو لە دووعایەکانی دا دەیگوت : خوایە هەموومان لە ڕێی تودا شەهید بین ! منیش پێم گوت : کاکە گیان ئەو دووعایە بە قڕ چوونی مسوڵمانان دەگەیەنێ ، وا مەڵێ ، بەڵکو بڵێ : خوایە پلە و پایەی شەهیدییمان پێ ببەخشە !

*** خاڵی چوارەم : خواپەرستی سەرچاوەی هەموو ڕەوشتێکی بەرز و پەسندە**

خوای بەرز و مەزن و تاك و پاك (تبارك و تعالى) خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرز و هەموو ناوێکی هەرە چاکە وە لە هەموو لەکە و ناتەواوی‌یەك دوور و پاکە ، وەك پێشتریش لە پێناسەی (عبادة) دا باسمان کرد خوا پەرستیش بریتیە لە ( ئەوپەڕی گەردن کەچی و بەگەورە گرتنی خوا وێڕای ئەو پەڕی خۆشویستنی)، کەواتە ئینسان هەتا بۆ خوا پەرستار ( عابد) تر بێت، دیارە چاکتر و زیاتر گەردنی بۆ کەچ دەکات و بە مەزنی دەگرێ و پتریش خۆشی دەوێ ، ئینجا ئاشکرایە کە لە ئەنجامی ئەو مل کەچی و بەگەورە گرتن و خۆشویستنەدا لێی نزیك دەبێت ، وەك فەرموویەتی : ( و اَسْجُدْ و اَقْتَرِبْ ) العلق -١٩- ، ئنجا لە ئەنجامی نزیکی بەندەدا لە خوای بە بەزەیی و بەخشندەش دەکەوێتە ژێر کاریگەری ناوە هەرە چاکەکانی و سیفەتە هەرە بەرز و پەسەندەکانی چونکە وەك گوتراوە بە ئەزموونیش سەلمێنراوە ( المُجاوَرَةُ مؤَثّـِرَةٌ ) - هەڵبەتە مەبەست لە نزیکی لە خوا جَلَّ جَلالُهُ نزیکی مەعنەوی‌یە - ، ئنجا زانایانیش لە لێکدانەوەی واتای فەرموودەی:

**(ان لله تِسْعَةً و تِسْعونَ إسْماً مَنْ أحْصاها دَخَلَ الجَنَّةَ و هو وَتْرٌ يُحِبُّ الوَتْرَ )** متفق عليه .

***واتە*** : ( بێگومان خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە هەرکەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت، وە ئەو تاکە و تاکی خۆش دەوێ ) ، بەڵێ زانایان لە لێکدانەوەی ( مَنْ أحْصاها ) دا زۆر قسەیان فەرمووە، بەڵام قسەی بەهێز تر و ڕاست تریان ئەوەیە کە مەبەست لە ژماردنیان لە بەر کردن و زانینی مەعنا و مەبەستیان و کارکردنە بە پێی داخوازی ئەو ناوە هەرە چاك و پەسەندانە ، بۆ وێنە:

هەرکام لە : زانا ( عليم ) ، بە بەزەیی ( رحيم )، کاری‌بەجێ ( حكيم ) ، بەخشەر (كريم) توانا ( قدير ) ، زاڵ (عزيز ) بەهێز( قوي )، هێمن ( حليم ) ، ... هتد ئینسان هەم بێژە ( لفظ) کانیان و هەم مەعنا و مەبەستەکانیان لە بەر بکا و بزانێ ، وە لە قەدەر خۆی هەوڵ بدات زانیاری و بەزەیی و حیکمەت و بەخشندەیی و توانا و دەستەڵات و هێز و ئارامی و ... هتد لە خۆیدا بهێنێتە دی ، ئەوە لە لایەکەوە و لەلایەکی دیکەشەوە هەمیشە و دایم هەست بە زانیاری و بەزەیی و حیکمەت و کەرەم و توانا و دەستەڵات و هێز و هێمنی و ... هتدی ، بێ سنووری خوای پەروەردگار بکات و هیچ کاتێك لەو ناوە چاك و سیفەتە پەسەند و موتڵەقانەی بێ ئاگا نەبێت.

بەڵام دەبێ لە دوو مەسەلەی گرنگ وریا بین :

یەكەم : ئەو ناو و سیفەتانەی ئینسان هەر لە قەدەر خۆینی و بەشدار بوونی ئینسان لە هەندێك لە ناو و سیفەتەكانی خوای بێ وێنە دا ، ئەوە ناگەیەنێ كە یەكسان و وەك یەكن ! بەڵكو هەركامێكیان بە ئەندازەی خۆی ، ئینسان بە ئەندازەی بەندایەتی و خواش (تبارك و تعالیٰ) لە قەدەر خوایەتی ، كە بێگومان پێكەوە باس و پێوانە و كێشانە ناكرێن.

دووەم : بەشێك لە ناوو سیفەتەكانی خوا بە هیچ جۆرێك لە بەندە ( عبد ) ناوەشێنەوە و ، كەم و زۆریان تایبەتە بە خوای بەدیهێنەر و پەروەردگارەوە و بۆ ئینسان ناگونجێن وەك: ( دروستكەر ( الخالق ) ، پەروەردگار ( الرب ) ، پەرستراو (الالـه) ، ناچاركەر ( الجَبّار ) ، خۆبە گەورە زان ( المتَكَبّر ) ، گەردن پێ كەچكەر ( القَهّار) ، ڕۆزی دەر ( الرزّاق ) ، بێ نیاز و جێی نیاز ( الصَّمَدُ ) ... هتد .

*بەڵێ خوێنەر و بەڕێز. و خۆشەویست :*

لە ئەنجامی چاك پەرستنی خوای پەروەردگار و بەندایەتی بۆ كردنی دا بێگومان بەندە لە خوا نزیكتر و پێ ئاشنا تر دەبێت ، ئنجا لە ئاكامی ئەو نزیكی و شارەزایی و ئاشنایی‌یەش بەندەی پەرستار ( عابد ) لە سیفەتە جوان و ڕەندەكان و ناوە بەرز و پەسندەكانی خوای پەروەردگار بەهرەمەند دەبێت ، ئایا ئەگەر دۆستایەتی و نزیكی بابای عەتر فرۆش – كە بۆ هاوەڵی باش بە نموونە هێنراوەتەوە – ببێتە هۆی بۆنخۆش بوون یان لانی‌كەم بۆنی خۆش بۆ هاتنی ئینسان ، پەرستن و بەندایەتی و نزیكی لە خوای پەروەردگاری سەرچاوەی هەموو بەرزی و چاكی‌یەك نابێتە هۆی ( بەرزبوونەوە) و (چاكبوون) ی بەندە؟! ئایا ئەگەر دروستكراوەكان ( المخلوقات ) بە هۆی نزیكی‌یانەوە لە یەكتر كارتێكران و كارتێكردن ( التأثر و التأثیر) یان لە نێوان دا ڕووبدات دروست كرا و و دروستكەر ( المخلوق و الخالق) حەوجار حەوجار لە نێوانیان دا ڕوونادات ؟!

بێگومان ( با) ، هەر بۆیەشە كە دەبینین بەندە ڕەسەن و ڕاستەقینەكانی خوای بەرزو پاك و تاك بە ئەندازەی ئیمان و تەقوا، واتە بەندایەتی‌یەكەیان،بە سیفەت و ڕەوشتە بەرز و پەسەندەكان دەڕازێنەوە و ، نەك هەر ئەوەندە بەڵكو دەبنە هۆی پەروەردە بوون و ڕازاندنەوەی خەڵكی بن دەست و دەور و بەریشیان ، ئەوە لە لایەك وە لە لایەكی دیكەشەوە بەندە پەرستار و چاكەكارەكانی خوا نەك هەر لە خراپە و خوو و خدەی

نزم و پەست دوورن و سەرچاوەی پیسی و بەدکاری کە شەیطانی نەگبەت و بیٚ خێرە زەفەریان پیٚ نابات ! بەڵکو شەیطان بە شەیطانی خۆی ناوێریٚ توخنیان بکەویٚ و لە ترسانیان ڕادەکات و خۆی حەشار دەدات ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووبە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لیٚی ڕازی بیٚ دەفەرمویٚ : ( إيْهاً يا ابْنَ الخَطّاب ! و الّذي نَفْسي بِيَدِهِ ما لَقِيَكَ الشيطانُ سالِكاً فَجّاً الاّ سَلَكَ فجّاً غيْرَ فَجِّكَ ) رواه البخاري و مسلم و احمد .
واتە: ئەها ئەی کوڕی خەتتاب ! سوێند بەو زاتەی گیانمی بە دەستە ، هیچ کاتێك شەیطان لە ڕیٚیەك دا تووشت نەبووە مەگەر ڕیٚیەکی تری جیا لە ڕیٚی تۆی گرتۆتەبەر –واتە خۆی لێت لاداوە – کەواتە بە ئەندازەی ئەوە کە بەندە لە خوانزیك دەبیٚ و بەندایەتی بۆ دەکات ، شەیطان لیٚی دوور دەکەوێتەوە و توخنی ناکەوێت !!
*کۆتایی ئەم باسەش بەم ئایەتە بە پێزە دێنم :*
( يا أيُّها الّذين آمنوا اْركعوا و اسْجدوا و اعْبدوا رَبّكُمْ و افْعلوا الخَيْرَ لعلّكُمْ تُفْلِحون) الحج ٧٧.
*واتە :* ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ڕکووع – بۆ خوا – بەرن و کڕنووش بەرن ، وە پەروەردگارتان بپەرستن وە هەرچی چاکەیە بیکەن بۆ ئەوەی بە مراد بگەن و سەرفرازبن .

وەك دەبینین : خوای کار بەجیٚ دوای ئەوەی فەرمان بە ئیمانداران دەکات بەئەنجامدانی بەرزترین و تایبەتیترین جۆری خواپەرستی کە نوێژە – چونکە ڕکووع بردن و کڕنووش بردن وێکڕا بەس لە نوێژدا دەبن – ئەوجار بە گشتی فەرمانیان پیٚ دەکات بە خواپەرستی ، ئینجا دوای ئەوە فەرمانیان پیٚ دەکات بە چاکەکاری ، کە دیارە چاکە کاری ( فعل الخير ) تێکڕای ڕەوشت و خەسڵەتە بەرز و پەسندەکان دەگرێتەوە کە ئینسان هەڵس و کەوت و ڕەفتاریان پیٚ لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگا دەکات ، کە بێگومان ئەمانیش هەر بەشێك و جۆرێکن لە خوا پەرستی و بەندایەتی کردن بۆ خوا ، بەڵام بە ئیعتبارێکی تر و لە ڕوویەکی دیکەوە زادە و بەرهەم و شوێنەواری خوا پەرستیی ( عبادة) ن ، چونکە زیاتر پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە سا خوایە بە لوتف و کەرەمی بیٚ سنووری خۆت بمانکەیە خواپەرستێك کە هێندە بەتۆ ئاشنا و لە تۆ نزیك و بۆ تۆ دۆست بین ، کە لە سایەی بەندایەتیمان بۆ تۆ ببینە جێگای تێدا درەوشانەوە و تێدا ڕەنگدانەوەی سیفەتە پەسەندەکان و ڕەوشتە ڕەندەکان ، وە شەیطانی پیس و نەگریسیش کە ماك و سەرچاوەی هەرچی سیفەتی نزم و خوو خدەی پیس و پەستە، بە هۆی نزیکیمانەوە لە تۆ عومەر ئاسا لێمان دوور بیٚ و ڕیٚی لە ڕێمان نەکەویٚ و هەر توخنمان نەکەویٚ.

## خاڵی پێنجەم : تاقە ڕێی لە دۆزەخ قوتار بوون و چوونە بەهەشت خواپەرستییـــە

*بەڵێ خوێنەری بەڕێز !*

یەكێك لە شتە ئاشكراو ڕوونەكانی ئیسلام ئەوەیە كە ئەگەر خوای كار بەجێ لە دنیادا بەزەیی و چاكە و ناز و نیعمەتەكانی خۆی كردوە بە سایەو سێبەری هەموو بەندەكانی بە كافر و مسوڵمان و بەدكار و چاكەكارەوە و وەك سفرە و خوانێكی ڕازاوە بۆ هەموو لایەكی بەبێ جیاوازی ڕاخستوە و والآ كردوە، بۆ ئەوەی هەموویان وەك یەك و بێ جیاوازی هەل و دەرفەتی تاقی كردنەوەیان بۆ بڕەخسێ و زەمینەی ( ابتلاء) یان بۆ هەموار بێ و هیچ كەس بواری بیانوو گرتن و پرتە و بۆڵەی بە جێ و بەڵگەداری نەبێ و، دەستی پیسی خۆی بە خەڵكی نەسڕێ ، بەڵێ ئەگەر لە دنیادا حاڵ و باڵ ئاوایەئەوە لە دوارۆژدا زۆر جیایە ، چونكە ئەوێ جێگای ئەنجام وەرگرتنەوە و پاك و پیس لێك هەڵاواردن و چاكە و خراپە كێشان و ژماردنە و بەزەیی و بەخشش و چاكە و ناز و نیعمەتە بێ سنوورەكانی خوا كە لە بەهەشت دا تەجەللا دەكەن تایبەت و تەرخان كراوی دۆستە بڕوادار و پەرستار و چاكە كار و وەفادار و پارێزكارەكانن و ، تورەیی و خەشم و تۆڵە و ئازار و ئەشكەنجە و جەزرەبەی بێ ئامانیشی ملۆزم و تاپۆی دوژمن و ناحەزە بێ بڕوا و لاڕێ و خراپەكار و سپڵەو تاوانبارە كانن،بەڵێ ئەگەر لەدەمی تاقی كردنەوەدا دادگەری ئەوەبێ كە ئینسانەكان بە چاك و خراپەوە بە یەك چاو سەیر بكرێن و لە بارو دۆخ و كەش و هەوایەكی یەكسان دا دابنرێن بۆ ئەوەی بێجگە لە ماهیەتی خۆیان و لە كردار و ڕەفتاریان بەو لاوە هیچ شتێكی تر كاریگەری نەبێ لە سەر ئەنجام و پەرێزی تاقی كرانەوەكەیان، ئەوە بێگومان لە كاتی بڕوانامە ( شهادة) پێ درانەوە و ئەنجام و بەرهەم وەرگرتنەوەدا دادگەری و حیكمەت ئەوە دەخوازێ ، كە هەر كەسە وەك لێی دەوەشێتەوە ڕەفتاری لەگەڵ بكرێ و ، (( مەڕ بە پێی خۆی و بزن بە پێی خۆی هەڵبواسرێ )) و هەركەسە لە بڕوادارانی چاكەكار و وەفادار و بێ بڕوایانی بەد كار و سپڵەولار لە شوێنی شایستەی خۆیان دا دابنرێن و نیشتەجێ بكرێن.

ئێستاش با سەرنجی چەند دەقێکی قورئانی بەڕێز بدەین بزانین چۆن ئەو ڕاستییانەی لە سەرێ خستماننە ڕوو باس دەکەن:

## یەکەم : دەربارەی دنیا و ئەهلی دنیا بە گشتی:

أ - (الله الذي خَلَقَ السَّموات وَ الأرضَ و أنْزَلَ مِنَ السَّماء ماءً فأخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرات رِزْقاً لَكُمْ و سَخَرَ لَكُمْ الفلكَ لِتجري في البَحرِ بأمرِهِ و سَخَّرَ لَكُمْ الأنهارَ ,وَ سَخَّرَ لَكُمْ الشَّمْسَ و القَمَـرَ دائبَيْنِ و سَخَّرَ لَكُمْ اللّيل و النَّهارَ وَ آتاكُمْ مِنْ كُلّ ما سَألْتُمُوهُ و إنْ تَعُدّوا نِعْمَةَ الله لا تُحْصُوها إنَّ الأنسانَ لَظَلُومٌ كَفّارٌ) ابراهيم ٣٢, ٣٣, ٣٤.

*واته :* ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون وە لە ئاسمانێ وە ئاوی ناردۆتە خوارێ وە بەو ئاوە میوەجاتی پێ بەرهەم هێناوە کە بژێو بێ بۆتان . وە کەشتی بۆ ڕام کردوون کە بە فەرمانی خوا لە دەریادا دەڕوات وە ڕووبارەکانی بۆ مەیسەر کردوون . وە خۆرو مانگی بۆ دەستەمۆ کردوون کە بەردەوام کاردەکەن ،وە شەو و ڕۆژی بۆ مەیسەر کردوون، وە لە هەر چی -بەزمانی حالّ- داواتان کردوە پێی بە خشیون، وە ئەگەر چاکەکانی خوا سەرژمێر بکەن بۆتان ناژمێردرێن بە ڕاستی ئینسان -ی کافر- زۆر ستەمکار و سپڵەیە .

ب_ ( و لَقَدْ كَرّمنا بَني آدَمَ و حَمَلناهُمْ في البَرّ و البَحْرِ و رَزَقْناهُمْ مِنْ الطَّيّبات و فَضَّلْناهُمْ علـى كَثيرٍ مِمَّنْ خَلَقنا تَفْضيلا ) الاسراء ٧٠.

*واته :* وە بێگومان ڕێزو حورمەتمان لە وەچەی ئادەم گرتووە و لە ئیشکانی و دەریادا هەڵمان گرتوون و لە ڕۆزییە چاك و پاكەكان بژێومان داونێ ، وە بە سەر زۆر لە وانەدا کە دروستمان کردوون هەڵمان بژاردوون.

ج- ( وَما أرسالناكَ الا رَحمَةً للعالمين) الانبياء ١٠٧.

*واته :* وە - ئەی محمد - تۆمان تەنیا وەك بەزەیی یەك بۆ تێكڕای جیهانییان ڕەوانە كردوە.

وەك دەبینین بەزەیی و بەخششی ماددی و مەعنەوی خوای پەروەردگار و كاربەجێ كە لە : ( ئاسمانەكان و زەوی ، باران ، بەروبووم و میوەجات ، كەشتی ، ڕووبارەكان ، خۆر و مانگ ، شەو و ڕۆژ ، هەرچی پێداویستی ژیان و گوزەرانیئینسانە لە سەر زەوی ، ناز و نیعمەتە لە ژمێرە نەهاتووەكان ، ڕێز و حورمەت لێ گیران ، ڕەخسان و ڕام كرانی هۆیەكانی هاتوچۆی ئینسان و بارو سواری لە ئیشكانی و دەریادا ، ڕۆزی

و بژێـوە چـاك و پاكـەكان ، بەرزكرانـەوە و هـەڵبژێردران بەسـەر زۆربـە یـان تێكـڕای دروست كراوەكان دا ) تەجـەللای كـردوە سـەرجەم مرۆڤـەكانی بـە چـاك و خراپـەوە گرتۆتەوە و هیچ كەس نەبوێرراوە و هەڵنە وێردراوە ! ، كەواتە : ڕاستە كە بەزەیی و چاكە و لوتف و كەرەمی خوا لە هەردووك ڕووی ماددی و مەعنەوی‌یەوە گشتگیرە بۆ تێكڕای ئینسانەكان لەم ژیانە دنیایی‌یەدا بەبێ جیاوازی.

## دووەم : دەربارەی دواڕۆژ و خەڵكی چاكەكار و بەدكار:

ا – ( إنَّ الأبرار لَفي نَعيم . و إنَّ الفُجّار لَفي جَحيم ) الانفطار – ١٣ , ١٤– .

*واتـه:* بێگومـان چاكـەكاران لـە نـاز و نیعمـەت – ی بەهەشـت – دان ، وە بێگومـان تاوانباران لە نێو كڵپە–ی دۆزەخ – دان .

ب– ( و سيق الذين كفروا الى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إذا جاؤها فُتِحَتْ أَبْوابُها و قال لَهُمْ خَزَنَتُها أَلَـمْ يأتِكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَتْلونَ عَلَيكُمْ آيات رَبِّكُمْ و ينذرونكم لقاءَ يَوْمِكُمْ هذا؟ قالوا بَلى و لكن حَقَّتْ كلمة العَذاب على الكافرين , قيل ٱدْخُلوا أبْوابَ جَهَنَّمَ خالدين فيهافبِئسَ مَثْوىٰ المتكـــبِّرين , و سِيْقَ الذين ٱتقَّوا ربَّهم الىٰ الجنةِ زُمَراً حتى اذا جاؤها وَ فُتِحَتْ أبْوابُها و قال لَهُمْ خَزَنَتُـــها سَـلامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلوها خالدين , و قالوا الحمد لله الذي صَدَقَنا وَعْدَهُ و أوْرَثَنا الأرْضَ نَتَبوَّءُ مِـــن الجنَّة حَيْثُ نَشاءُ فنِعْمَ أجْرُ العالمين) الزمر ٧١– تا ٧٤–.

*واتـه :* وە ئەوانـەی بێ بڕوان دەستە دەسـتە بـەرەو دۆزەخ بـەڕێ كـران هـەتا كـاتێك گەیشـتنە لای دەرگاكـانی كرانـەوە ، وە دەرگاوانـەكانی پێیـان گوتـن : ئـەدی چـەند پێغەمبەرێكتان لە خۆتان نەهاتبوونە لاتان ئایەتەكانی پەروەردگارتانیان بە سەر دا دەخوێندنەوە و لـەم دیدارەی ئەمڕۆ كـەتان ئاگاداریـان دەكردنـەوە ؟! – كافرەكـان – گوتیان : با ، بەڵام فـەرمانی – خوا– بە ئەشكەنجەدان لە سەر كافران پێویست بوو بوو. – پێیان – گوترا : دەبچنە نێو دەروازەكانی دۆزەخەوە و تێیدا هەمیشـەیی بن ، خراپـترین جێگـاش جێگـای خـۆ بەزلگرانـە. وە ئەوانـەی پارێزكـاری یـان لـە بەرانبـەر پـەروەردگاریان دا كردبوو كۆمەڵ كۆمـەڵ بەرەو بەهەشتێ بەڕێ كران ، هـەتا كـاتێك گەیشتنە لای و دەرگاكانیشی ئـاوەڵا كرابوونـەوە ، وە دەرگاوانـەكانی پێیـان گوتـن: سەلامتان لێبێ ئێوە – بە هۆی بەندایەتی و خواپەرستی تانەوە – پـاك و چاك بـوون دەبچنە نێو بەهەشتەوە بە هەمیشەیی‌وە؛– پارێزكارانیش – گوتیـان سوپـاس بۆ ئـەو خوایەی كە بەڵێنی لەگەڵ بردینە سەر وە سـەر زەمینـی – بەهەشتی – كـردە میراتمـان لە كوێ حەزبكەین تێیدا نیشتەجێ دەبین . بە ڕاستی ئەم بەهەشتە– چاكترین پاداشتی ئیشكەرانە – لە پێناوی خوادا–.

ج- ( إنّ الذين كَفَروا مِنْ أَهْلِ الكتاب و المشركين في نار جَهَنَّمْ خالدين فيها أولئكَ هُمْ شَرُّ البريّة . ان الذين آمنوا و عَمِلوا الصّالحات أولئك هُمْ خَيْرُ البريّة جَزاءهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنّاتُ عَدْنٍ تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها أبداً رضيَ الله عَنْهُم و رَضُوا عنه ذلك لِمَنْ خشي رَبَّهِ ) البينة ٦- ٧- ٨- .

*واتە :* بێگومان ئەوانەی بێ بڕوان لە خاوەن كتێبەكان و هاوبەشی - بۆ خوا - دانەرەكان بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخ دان ، - چونكە - ئەوانە خراپترینی دروستكراوەكان - ی خوا - ن ، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان ئەنجام داون ئەوانە چاكترینی دروستكراوەكان - ی خوا - ن پاداشتیان لە لای پەروەردگاریان : باغاتێكی بەردەوامن چەندان ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن هەتاهەتایە تێیاندا بە هەمیشەیی،خوا لەوان ڕازی‌یە و ئەوانیش لەو ڕازین ئەو - پاداشت - ەش بۆ كەسێكە كە لە پەروەردگاری ترس و سامی هەبێ.

خوێنەری خۆشەویست!

وەك دیتمان لە ڕۆژی دوایی‌دا بە پێچەوانەی دنیاوە خوای كار بەجێ و بەخشندە و دادگەر ڕەحمەت و بەخشش و چاكە و ناز و نیعمەتەكانی خۆی تایبەت كردوە بە ئەهلی ئیمان و چاكەوە و ، ئەهلی كوفر و خراپەی نەك هەر بێبەش كردوە ، بەڵكو سزاو جەزرەبەی پڕ بە پێستیشی بۆ داناون و ڕووڕەش و سەر بە هەشی كردوون ، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوای دادگەر و بەخشەر بە زۆری پاداشتی خۆی - كە ڕەزامەندی و بەهەشتە - لە ژێر ناوونیشانی ( ئیمان ) دا بۆ بەندە دۆست و وەفادارەكانی باس كردوە و ، سزا و تۆڵەكەیشی - كە تووڕەیی و دۆزخە - بە زۆری لە ژێر ناوونیشانی ( كوفر ) دا بۆ ناحەز و دوژمنە لاڕێ و بەدكارەكانی باس كردوە ، هۆی ئەمەش ئەوەیە كە ( ئیمان ) یەكەمین و گەورەترین هەنگاوی بەندایەتی و خوا پەرستی‌یە و بە بێ ئیمانێكی ڕاست و دروست ڕەنجی ئینسان بە بایەو هەوڵ و تەقەللای بەكەڵك نایە ،وە ( كوفر ) یش گەورە ترین و یەكەمین هەنگاوی لاساری و لە خوا یاخی بوون و خۆڵ بایی بوون و ڕێ لێ تێكچوونە و بێجگە لە كوفر - كە شیرك یەكێك لە جۆرە كانیەتی - هەر گوناح و هەڵەیەك هەرچەندە زل بێ ڕێی تێ دەچێ چاوپۆشی لێ بكرێ و هەرچۆن بێ پاش سزا و جەزرەبە و تۆڵە بابای خاوەن ئیمان هەر قوتاری دەبێ ! وەك لە چەندان فەرمودەی پێغەمبەر دا ﷺ باس كراوە و داكۆكی لە سەر كراوە.

بەڵام دەبێ لەو ڕاستی‌یەش بێ ئاگا نەبین كە چاكەكاری و پارێزكاری زادە و بەرهەمی ئیمانە و ئیمانیش پێی زیاد دەكات و گەشە دەكات ، وە بە پێچەوانەوە خراپەكاری و تاوانباری پەرێز و بەرهەمی كوفرە و دەشبێتە هۆی زیاتر ڕۆچوونی

کوفر له کافران دا و کزبوونی ئیمانیش له بڕواداران دا [1].
کۆتایی ئەم باسەش بە هێنانەوەی دوو دەقی قورئانی بەرێز و تێبینی یەك دێنین:
(ان رحمة الله قريب من المحسنين ) الاعراف ٥٦, واته : بێگومان بەزەیی خوا له چاکەکارانەوە نزیکه ، چەمکی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة) ی ئەم ئایەتە بە پێزەش ئەوەیە کە بەزەیی خوا له خراپەکارانەوە نزیك نیە و دوورە.
(و رَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيءٍ فَسَأَكْتُبُها لِلَّذين يَتَّقُونَ و يُؤْتُونَ الزَّكاةَ و الَّذين هُمْ بآياتنا يؤمنـــون الذين يَتَّبِعون الرَسُولَ النبيَّ الأُمِّـــيَّ ...) الاعـراف ١٥٦, ١٥٧. واته : وه بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە بەڵام بەس بۆ ئەوانەی تۆمار دەکەم کە پارێز دەکەن و خۆیان تەزکیە دەکەن [2]، وه ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتەکانمان هەیە ، ئەوانەی شوێن ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار دەکەون ...

**تێبینی** :

مەبەست له نزیکی ڕەحمەتی خواو نووسران و تۆمارکرانی بۆ بڕواداران هەم دنیا و هەم دوا ڕۆژیش دەگرێتەوە هەرچەندە زیاتر مەبەست دوا ڕۆژە ، چونکە ڕەحمەتی گشتی خوای میهرەبان و بەخشندە تەجەللا ماددی و بەرهەستەکەی ناز و نیعمەتە ماددییە ئاشکرا و پەنهانەکانی خوان کە هەموو پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانی

---

[1] ئەم ڕستەیە لە زۆربەی کتێبە عەقائیدیەکانی زانایانی پێشینان دا هاتووە : ( الأيمان : قَولٌ و عَمَلٌ قولُ القَلْبِ و اللِّسانِ ، و عَمَلُ القَلْبِ و الجَوارِحِ ، يَزِيْدُ بالطّاعَةِ و يَنْقُصُ بالمَعْصيَةِ ) واته : ئیمان گوته و کردەوەیه ، گوتەی دڵ – کە بە ڕاست زانین (تصديق ) ە – و گوتەی زمان-کە دان پێدا هێنان ( إقرار ) ە – وه کردەوەی دڵ – کە مل کەچی و قبوڵ کردن و خۆشویستنه – و کردەوەی ئەندامەکان – کە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆ دوور گرتن له قەدەغە کراوەکانه – ، وه ئیمان به فەرمانبەری ( طاعة ) زیاد دەکات و بە سەر پێچی ( معصية ) کەم دەکات .
بۆ وێنەیەکی کتێب و سەرچاوەکانی زانایانی پێشین ( سلف ) لەو بارەوە سەرنجی کتێبی : ( شَرْحُ أُصولِ اعتِقادِ أَهْلِ السُّنَّةِ و الجَماعَةِ ) بدە ، بەرگی ( ٢) کۆتایی بەشی ( چوارەم ) وه بەرگی ( ٣) بەشی پێنجەم ، دانراوی : الشيخ الحافظ ابي القاسم هبة الله ابن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي .
[2] دیارە لێرەدا مەبەست له ( زکاة) تەزکیەی نەفسە نەك زەکاتی ماڵ و سامان ، چونکە سوورەتەکە مەککییە و زەکات دانیش له مەدینە فەرز بووە.

ئینسان داین دەکات وە تەجەللا مەعنەویەکەیشی بریتیە لە ئایین و بەرنامەی تێرو تەواوی خوا کە بیر خەرەوە و ڕێڕوونیکەرە بۆ سەرجەم ئینسانەکان بە بێ بڕوا و بڕوادارەوە . وەك فەرموویەتی :

(إِنْ هو الاّ ذِكْرٌ للعالمين ) التكوير ٢٧،( شَهْرُ رَمَضانَ الَّذي أُنْزِلَ فيه القرآنُ هُدىً للنَّاسِ)البقرة ١٨٥،

بەڵام خوای بەخشەر و هیدایەت دەر ڕەحمەت و نیعمەتێکی دیکەی تایبەتی هەیە بۆ بڕواداران کە غەیری ئەوانی تێدا بەشدار نیە ، کە بریتیە لەو هیدایەت و بەرچاو ڕوونی و ئارامی و ئۆخژن ڕشتنە نێو دڵ و بەدەنگەوە هاتن و مشوور بۆ خواردن و پشت گرتن و بەرگری لێ کردن و ... هتدی کە لە ئەنجامی ئیمان و تەقوا کەیانەوە خوای دادگەر و بەخشەر پێیان دەبەخشێ ، ئەمەش چەند دەقێك لە قورئانی بەرێز بۆ هەرکام لەو جۆرە ڕەحمەت و نیعمەتانەی خوای پەروەردگار:

(الم ذلك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين ) البقرة -١-

*واتە :* ئەلیف لام میم ، ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە ڕێڕوونی کەرە بۆ پارێزکاران ، کە دیارە وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە ، ئەم جۆرە هیدایەتەی کە تایبەت کراوە بە پارێزکارانەوە ، جیایە لە هێدایەت بوونی قورئان بۆ تێکڕای خەڵکی ، چونکە هیدایەت دانی گشتی بۆ خەڵکی ڕێگای ڕاست پێشاندانیانە ، بەڵام هی پارێزکاران دەست گرتنیان و دڵ وەر چەرخاندنیانە بەرەو ڕێی ڕاست و ڕەزامەندی خوا.

*(... إِن تتَّقوا الله يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقاناً ..) الانفال ٢٩ ، واتە : ئەی بڕوادارینە : ئەگەر پارێزکاری لە بەرانبەر خوادا بکەن ڕۆشنایییەکی جیا کەرەوەتان بۆ دەرەخسێنێ.

*( هو الَّذي أَنْزَلَ السَّكينة في القلوب مؤمنين لِيَزْدادوا إِيماناً مع إِيمانِهِمْ ... ) الفتح ٤ ,

*واتە :* خوا ئەو زاتەیە کە ئارامی ڕشتە نێو دڵی بڕواداران تاکو لەگەڵ ئیمانەکەیان ئیمان زیاد بکەن.

* ( إِذْ تستغيثونَ ربكم فَاسْتَجابَ لَكُمْ أَنِّيَ مُمِدُّكُمْ ... ) الأنفال ٩ ، واتە کاتێك هاوارتان بۆ پەروەردگارتان دەکرد ئەویش وەڵامی دانەوە کە من پشتگیریتان دەکەم ... .

* ( الله وَلِيُّ الذين آمنوا يُخْرِجُهُمْ من الظُّلُماتِ الىٰ النورِ ..) البقرة ٢٥٧ ، واتە خوا مشوورخۆر و دۆستی ئەوانەیە کە بڕوایان هێناوە لە تاریکییەکان بەرەو ڕۆشنایی قوتاریان دەکات.

* ( أَلَيْسَ الله بكافٍ عَبْدَهُ ..) الزمر ٣٦ ، ئایا خوا بەس نیە بۆ - پشتیوانی - بەندەکەی ؟!

* (إِنَّ الله يُدافِعُ عَنِ الَّذين آمنوا .. ) الحج ٣٨ واتە : بێگومان خوا لە سەر ئەوانە دەکاتەوە و بەرگری یان لێ دەکات کە بڕوایان هێناوە.

## خاڵی شەشەم : ڕۆڵــی خــوا پـەرستیی لە پێکەوە جۆشدانی ڕیزەکانی کۆمەڵی ئیسلامی و [1]، تۆکمە و توندو تــۆڵ کـردنـی توێژەکـــانی کۆمەڵگای ئیسلامیدا[2].

گرنگترین دەستە بەر کەر ( ضامن ) ی سەرکەوتن و بە ئامانج گەیشتنی کۆمەڵێکی ئیسلامی و پاراستن و بەرەو پێش بردنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی بریتیە لە تۆکمەیی و توند و تۆڵی و پێکەوە جۆشدراوی ڕیزەکانیان و پێکەوە پەیوەستی توێژەکانیان ، جا خوا پەرستی ( عبـادة) کاریگـەرترین هۆکـارە و گـەورەترین ڕۆڵ دەگـێـڕێ لـەو بارەوە ، چونکە کۆمەڵێك کە هەموو ئەندامەکانی بە وردو درشتەوە خۆیان بە بەندەی یەك خوای پەرستراو و بەندایەتی بۆ کراو دەزانن و ، هـەموویان کڕنـووش بـۆ یـەك پەرستراو دەبەن و ڕووی نیاز و مەبەستەکانیان تەنیا لەو دەکەن و جگە لەو هیچ کەس و هیچ سەرچاوەیەکی تر بە بەرنامەدانـەر ( شارع ) و فـەرمانڕەوا ( حـاکم ) ی خۆیان نـازانن و بە کورتـی : تـەنیا ئـەو دەپەرسـتن و پشتیشـیان بـەس بـەو دەبەسـتن و بۆجێبەجێ کردنی ( اِيَّاكَ نَعْبُدُ و اِيَّاكَ نَسْتَعِيْنُ ) دەست لە سەر سینگ و گیـان لە سەر لەپی دەستن، بەڵێ کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ئاوا بێگومان لە سەر بنچینەی مەحکەم و دامـەزراوی بەندایـەتی ( العبودیـة ) ، بە هـێز تریـن جـۆری پێکـەوە پەیوەسـتیو یـەك هەست و نەستی و یەك هەڵوێستی و برایەتی ( الأُخُوَّة ) یان لە نێو دا پەیدا دەبێ کە

[1] مەبەستمان لە کۆمەڵی ئیسلامی یان کۆمەڵی مسوڵمان ( الجماعة الاسلامية و الجماعة المسلمة ) بوونی مسوڵمانانی تێکۆشەر و هەوڵدەرە بۆ پیادە کردنی ئیسلام لە واقیعی ژیان دا بەر لەوەی حوکم و دەسەڵات بگرنە دەست ، وە مەبەست لە کۆمەڵگای ئیسلامی یان کۆمەڵگای مسوڵمان (المجتمع الاسلامي ، المجتمع المسلم ) بوونیانە دوای پێکهێنانی قەوارە و دەستەڵاتی سیاسی.

[2] مەبەستم لە ( توێژەکان ) ئەو واتایەی نیە کە شیوعی و مارکسـی‌یەکان لـە نووسـینەکانیان دا بـەکاری دێنـن کـە چینـەکان (طبقـات ) ی کۆمەڵگایـە لـە ڕووی ئابووری‌یـەوە ، بـەڵکو مەبەسـتم پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگایە لە ڕووی کار و چالاکی‌یانەوە ، وەك جوتیار ، کرێکار ، بازرگان ، کارمەند ، قوتابی ... هتد . بۆیەش وشەی توێژەکان ( شرائح ) م بە کارهێنا تاکو لە چینەکان (طبقات ) بە چەمك و زاراوی شیوعی و سۆشیالیستەکان جیای بکەمەوە ، چونکە کۆمەڵگای ئیسلامی ڕاست جێگای چینەکانی تێدا نابێ.

لە هیچ کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی دیکەدا وێنەی نەبێ ، وەك حەقیقەت و واقیعی‌یەت و(مصداقية) ی ئەو جۆرە برایەتی یە بە چاکترین و تەواو ترین شێوەی لە کۆمەڵی یەکەمی مسوڵمانان لە شاری مەککە و پاشان لە کۆمەڵگای یەکەمی مسوڵمانان لە شاری مەدینەدا دەبینین ، کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لە سەر بناغەی خوا بە یەکگرتن و خوا پەرستی ( التوحيد و العبادة) تیْ‌ی گەیاندن و پیْ‌ی گەیاندن و لە نێو خۆیاندا بوونە چاکترین برا و بۆ خەڵکی دیکەش بوونە ڕووناکی و چرا ، خوا لێیان ڕازی بێت و بە ڕەزامەندی و بەخششی خۆی ڕازی یان بکات و پلە و پایەیان زیاتر و چاکتر بەرز و بڵند بکات .

کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان لە سۆنگەی ئەوەوە کە تاك تاکی ئەندامەکانیان لە سەر یەك بناغەی عەقیدەیی و لە نێو یەك قاڵب و بۆتەی خوا پەرستی و لە بازنە و جوغزی یەك ڕەوشت و ڕەفتاردا ، کە عەقیدەی ئیسلامی و خوا پەرستی ئیسلامی‌یانە و ڕەوشت و ڕەفتاری مسوڵمانانەیە کە سایەتی‌یان بنیات نراوە و پەروەردە کراوە، کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی پێکەوە گونجاو و جۆشدراو و یەك هەست و نەست و هەڵوێست و لەگەڵ یەك پەیوەستن ، وەك چۆن ئەو خشتانەی دیواری خانوویەکیان لیْ پێك دیْ لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە یەك شێوە و لە یەك کەرەسە دروست کراون و لە قاڵب و بۆتەیەك دا داڕێژراون زۆر باش پێکەوە ڕیز دەبن و لەگەڵ یەك پەیوەست دەبن.

دیارە پێغەمبەری داناو پێشەواشمان ﷺ بە خۆڕایی نیە کە کۆمەڵ و کۆمەڵگای بڕواداری بەخشتە پێکەوە جۆشدراوو تێك ترینجاوەکانی دیواری چواندووە :
(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً) متفق عليه ، واتە : بڕوادار بۆ بڕوادار وەك خانوو وایە هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات.

هەروەها بۆیە کۆمەڵی مسوڵمان و کۆمەڵگای مسوڵمانی وەك جەستەیەك داناوە کە هەرکام لە ئەندامانی ئەو جەستە بە پەرۆشە و دڵسۆزە بۆ ئەندامەکانی دیکە ، وەك فەرموویەتی : (مَثَلُ المؤمنين في تَوادِّهِمْ و تَراحُمِهِمْ و تَعاطُفِهِمْ مَثَلُ الجَسَدِ اذا اشْتَكَىٰ مِنْهُ عُضْوٌ تَداعىٰ لَهُ سائِرُ الجَسَدِ بالسَّهَرِ و الحُمّىٰ ) متفق عليه .

*واتە :* وێنەی بڕواداران لە یەکتر خۆشویستن و بەزەیی پێکداهاتنەوە و پەرۆشیان بۆ یەکتر وەك جەستەیەکە کە ئەگەر ئەندامێکی ئازاری بوو تێکڕای جەستە کە هاودەردی دەکات بە شەو نخوونی و تا.

بەڵێ هەروەك چۆن یەك ڕووح هەموو ئەندامانی جەستەیەك پێكەوە دەبەستێت و بە هۆی ئەو ڕووحەوە چاكترین هاوكاری و تەبایی یان لە نێوان دا هەیە ، ئەندامانی كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی ئیسلامیش یەك ڕووح كە ڕووحی ئیمان و خوا پەرستی و بەندایەتی كردنە بۆ خوا وەك دەزووی تەسبیحێك پێكیانەوە دەبەستێ و ڕیزیان دەكات و ڕێكیان دەخات.

ئێستاش با بۆ نموونە سەرنجی چەند جۆرە خواپەرستییەك بدەین داخوا چۆن چۆنی دەبنە هۆی پێكەوە جۆشدان و تۆكمەكردنی كۆمەڵ و كۆمەڵگای ئیسلامی :

١- نــوێــژ : نوێژ كە بە گەورەترین و چاكترین جۆرە خواپەرستی شەخسی دادەنرێ ، كاریگەرترین دەوریشی هەیە بۆ پێكەوە گرێ دانی دڵی بڕواداران و بەهێز كردن و مەحكەم كردنی ڕیزەكانیان ، بە تایبەتیش كە نوێژ لە شەو و ڕۆژدا پێنج كەڕەتان دووبارە دەكرێتەوە و بە جەماعەت كردنی لە لای زۆر لە زانایان فەرزی عەین یان كفایە و لە لای هەندێكیشیان سوننەتێكی داكۆكی لە سەر كراو ( مۆكەدە) ە ونوێژی بە كۆمەڵ بۆ ( پێنج) فەرزەكان بە (٢٥) یان (٢٧) پلە بە چاكتر دانراوە لە نوێژی تاك ، وە بە هۆی نوێژی بە كۆمەڵەوە مسوڵمانان ناچارن لە شەو و ڕۆژدا پێنج كۆبوونەوە بكەن وە لە هەفتەدا لە سەر ئاستی شارو ئاوەدانی بە هۆی نوێژی جومعەوە لە سەر یان پێویستە كۆبوونەوەی هەفتانە وە بە هۆی نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانیشەوە لە سەریان فەرزە یان لانی كەم سوننەتە دووجار كۆبوونەوەی ساڵانە بكەن ، دیسان چۆنیەتی نوێژ كردنەكە كە وەك دواتر - لە باسی نوێژدا - باسی دەكەین كۆمەڵێك ئاداب و ڕێ و ڕەسمی هەیە كە پێویستە نوێژكەران ڕەچاویان بكەن ، ئەمانە هەموویان دەورێكی یەكجار كاریگەر بۆ نوێژ دەڕەخسێنن لە بواری پێكەوە بەستن و جۆش دانی مسوڵمانان لە نێو خۆیان دا .

٢- مــاڵ بەخشین : ئەمیش چ بە جۆری فەرزی عەینی كە زەكاتە ، وە غەیری زەكاتیشە لە هەندێك حاڵەتی نا ئاسایی‌دا كە زانایان بە وردی باسیان كردوون ، وە چ جۆری فەرزی كیفایەی و ، چ جۆری سوننەتی ڕۆڵێكی یەكجار گرنگ دەگێڕێ لە چەسپاندنی برایەتی و بە هێز كردنی خۆ شەویستی و لابردن و نەهێشتنی هۆكارەكانی نا تەبایی و ناكۆكی نێو خۆ وەك حەسوودی و بوغز و كینە و ... هتد .

٣- ڕۆژوو گرتن : ڕۆژوو گرتن بە هەموو جۆرەکانی فەرز و سوننەتی‌یەوە دیسان کاریگەریەکی زۆری هەیە لە ڕووی برایەتی و هەست بە دەردو ئازاری یەکتر کردن و ، بە تەنگ یەکدی‌یەوە بوون و ، دەستبار بۆ یەکتر گرتن ، بە تایبەت ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کە کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامی بە تێر و برسی و هەژار و دەوڵەمەند و پادشا و گەداوە لە سەریان فەرزە برسی و تینوو بن و بەلای کەمەوە لە ساڵی‌دا مانگێك دەوڵەمەندەکان هاو دەردی لەگەڵ نەدارەکان دا بکەن و لە برسیەتی و ناڕەحەتی دا یەکسان بن و هەست بە ئێش و ژان و مەینەتی‌یان بکەن ، بۆ ئەوەی وێڕای حوکمی یاسای ڕواڵەتی[1] هاندەرێکی دەروونی و ویژدانیشیان هەبێ بۆ هاوکاری و دەست گرتنیان.

٤- حەج کردن : حەجیش کە وەك هەر کام لە شایەتمان و نوێژ و زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج پایە بنەڕەتیەکانی ئیسلام و ، وێڕای لایەنە مەعنەوی و ئەخلاقی و فیکری و جیهادی و ئابووری و ... هتدیەکانی کۆنگرەی سیاسی ساڵانەی ئوممەتی ئیسلامیشە لە سەر ئاستی هەموو گەلانی ئوممەتی ئیسلامی و نیشتمانی ئیسلامی‌دا ئەگەر ڕژێمە طاغووتی‌یەکان لێ بگەڕێن ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەر دەگێڕێ بۆ ناساندی مسوڵمانان بەیەکتر و پەیدا بوون و بە هێز بوونی شارەزایی بە بارو دۆخی یەکتر و پتەو بوونی پەیوەندی برایەتی و سەرەنجام هاوکاری پێکەوە کردن و دەستبار بۆ یەکتر گرتن بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەرکە مەزنەکان و هێنانەدی ئامانجە بەرزەکان کە پەکیان لە سەر کاری هەرەوەزی سەرجەم مسوڵمانانی دنیا کەوتوە بە هەموو ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و ڕەگەزەکانیانەوە تەنانەت لەو حاڵانەش دا کە طاغووت و ڕژێمە نا شەرعی‌یەکانیش پەرچ و لەمپەری جۆراو جۆر دەخەنە بەردەم وەك پێویست ئەنجام درانی ئەرك و کارەکانی حەج‌دیسان لە سوود و کەڵکی زۆر هەر خاڵی نیە بۆ چاوکرانەوەی مسوڵمانان و بێدار بوونەوەیان سەبارەت بە حاڵ و باڵی یەکتر کە بێگومان ئەمەش هەنگاوی یەکەم و بەردی بناغەی برایەتی و تەبایی و هاوکاری و هەرەوەزکاری نێوانیانە.

---

[1] چونکە زۆر لە زانایان کە یەکێکیان ( ابن حزم الأندلسي ) یە دەڵێن : لە سەر دەوڵەمەندەکانی هەر ناوچەیەك فەرزە مادام دەوڵەتی ئیسلامی توانای نەبێ کە نەدارەکانی دەوروبەریان بژیەنن و لە سەر ئەوە ئیجبار دەکرێن و لە کاتی کەمتەرخەمیان دا سزای توندیش دەدرێن ، بڕوانە : ( المحلی ) ج ٦ ص ١٠٨ .

٥- زیکــری خوا کردن : ئەمەش کە چەندان دەقی قورئان و سوننەت ئەوە دەگەیەنێ کە وێڕای بەتەنیاو بە تاکی کردنی ، بە کۆمەڵ ئەنجام دانیشی شتێکی پەسندە و مایەی داباریني ڕەحمەتی خواو ئارامی و ئۆخژن (سكينة) ە بە سەر دڵی بەشدار بووانی کۆڕی زیکردا و، مایەی کۆبوونەوە و دەورەدانی فریشتەچاك و پاکەکانی خوایە لەو کۆڕو کۆمەڵە ، دیسان دەورێکی بە هێز و پێزی هەیە بۆ پێکەوە جۆشدانی دڵەکان و زیاد بوونی خۆشەویستی و سۆزو پەرۆش و ڕێز و حورمەت بۆ یەکتر، وە لە ڕاستی دا ئەو خۆشەویستی‌یە بە تینەی کە لە ئەنجامی زیکر و یادی خوادا لە نێو مسوڵمانان دا پەیدا دەبێ بە کەم هۆکاری تر وا پەیدا دەبێ و ، خۆشەویستی خواو زیکری‌خوا کردن بۆ مسوڵمانان وەك تەزوویەکی کارەبایی وایە کە بە گڵۆپ و چرای دڵ و دەروونی هەموویان دا تێپەڕ دەبێ و دایان دەگیرسێنێ. [1]

٦- فەرمان بە چاکە کردن و ڕێ لە خراپە گرتن: ئەمیش یەکێکە لەو خوا پەرستی ( عبادة) یانەی کە کاریگەری‌یەکی زۆری هەیە لە ڕووی توند و تۆڵ کردنەوە و بژارکردن و پاك کردنەوە و گەشە پێدانی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامی ، دیارە دەقی قورئان و سوننەتیش لەم بارەیەوە زۆرن بەڵام ئێمە بەس دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە :

١- ( و المؤمنون و المؤمنات بعضهم أولياءُ بَعْضٍ يَأْمرون بالمَعْرُوفِ و يَنْهَوْنَ عَنْ المنكرِ وَ يُقيمـونَ الصَّلاةَ و يُؤتونَ الزَّكاةَ و يُطيعون الله و رسولَهُ أولئكَ سَيرحَمُهُمُ الله إنَّ الله عزيزٌ حكيم) التوبة -٧١-

*واتە :* وە پیاوانی بڕوا دار و ئافرەتانی بڕوا دار هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن ، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن ، وە نوێژ بەر پا دەکەن و زەکاتێ دەدەن، وە فەرمانبەری خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن ئەوانە بێگومان خوا بەزەیی پێیاندا دێ بە ڕاستی خوا زاڵ و کاربەجێ‌یە.

بەڵی بێگومان لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوادارانی نێر و مێ دۆست و پشتیوانی یەکترن دەتوانن فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکەن ، وە بێگومان لە ئەنجامی

[1] هەرکام لە ( نوێژ ، ماڵ بەخشین ، ڕۆژوو گرتن ، حەج کردن ، زیکری خواکردن ) لە باسەکانی دوایی ئەم کتێبەدا قسەیان لە سەر کراوە و توێژراونەوە و ئەو دەقانەی کە پەیوەندی‌یان پێیانەوە هەیە کەم و زۆر هێنراونەوە و لێکدراونەوە ، بۆیە لێرە بە پێویستمان نەزانی بیان نووسین.

ئەو خوا پەرستیی‌یە مەزنەشدا کە گەورەترین و چاکترین جۆرە خواپەرستی‌یە کە بە تاکی و بە کۆمەڵ و لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی دا ئەنجام دەدرێ،دۆستایەتی و نزیکی و پشتگیری بڕواداران بۆ یەکتر زیاد دەبێت و ڕیزەکانیان مەحکەمتر و توێژەکانیان پێکەوە پەیوەست تر دەبن .

٢- ( و لْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ الىٰ الخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بالمَعْرُوفِ وَ يَنْهَوْنَ عَنِ المُنكَرِ وَ أُولئكَ هُمُ المفْلِحون ) ال عمران – ١٠٤ – .

*واتە :* وە ئێوە ئەی مسوڵمانینە – کۆمەڵێك بن – یان باکۆمەڵێکتان لە نێو دا هەبن [١] – کەبانگەواز بۆ چاکە – کە ئیسلامە – دەکەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن وە هەرئەوانەشن سەرکەوتوو و بە مراد گەیشتوو.

لەم ئایەتە بە پێزەش دا خوای پەروەردگار سەرکەوتن و بە مراد گەیشتنی دنیا و داو ڕۆژی تایبەت کردووە بەو مسوڵمانانەوە کە کۆمەڵێکن یان کۆمەڵێکی وایان لە نێو دا هەن ، سەرگەرمی بانگەوازی خەڵك بۆ ئیسلام و لەنێو خۆشیان دا فەرمان بەچاکە و ڕێ گرتن لەخراپەن ، بەڵێ کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان وەك باغێکە کە خاوەنەکەی بەردەوام سەرگەرمی بژارکردنیەتی لە درك و داڵو گژو گیا و جڕو جانەوەری زیانبەخش ، وە ناشتنی نەمامی چاك و پاك و بەرداری هەمە جۆر ، وە لەڕاستی‌دا سەرفرازی و بەختەوەری و ساغ و سەلامەتی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان بەندە بە بەردەوام بوونی پرۆسەی بژارکردن و پاککردنەوەی لە هەڵەو پەڵە و نا شەرعی یەکان و چاککردن و ڕازاندنەوە و ئاوەدان کردنەوەی بە کردار و ڕەفتار و هەڵس و کەوتە چاك و پاکە شەرعی‌یەکان ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ( قَدْ أفلَحَ مَنْ تَزَكَّى )[٢] الأعلى – ١٤ – جا هەر چەندە لێرەدا مەبەست تاکی مسوڵمانە بەڵام کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانیش هەمان حوکمی هەیە.

---

[١] (چونکە وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن ئەگەر ( مِنْ) ی سەر (منکم ) بۆ ( تبعیض) بێ ئەوە مەعنای‌دووەم و ئەگەر ( بیانیة) ش بێت مەعنای یەکەم دەگەیەنێ.

[٢] وشەی ( تزکیە) هەم واتای پاککردنەوە و بژارکردن و هەم مەعنای گەشە پێدان و زیاد کردنیش دەگەیەنێ کەواتە : وشەی (تَزَكَّى) یانی ، خۆی پاك و چاك کرد ، خراپەوهەڵە و پەڵەی لابرد و خێر و چاکەی زیاد کرد.

٧- جەنگ و جیهاد کردن : ئەمیش یەکی دیکەیە لەو جۆرە خواپەرستی‌یانەی کە کاریگەر ترین فاکتەرە هەم بۆ خۆ توندو تۆڵ کردنەوە و هەم بۆ نێو خۆ بژاردکردن و خۆ پالاوتنیش لە خڵتە وخاڵ چ لە سەر ئاستی تاك تاکی مسوڵمانان و چ لە سەر ئاستی سەرجەم کۆمەڵ و کۆمەڵگاکانیشیان ، دیارە جەنگ و جیهادیش مەزنترین و بەرز ترین جۆرە خوا پەرستی‌یە کە مسوڵمانان بە هەرەوەزی و دژی غەیری خۆیان ئەنجامی دەدەن [١].

ئینجا دەقی قورئانی بە پێز و سوننەتی پێغەمبەری بەرێزیش ﷺ دەربارەی جیهاد و جەنگ زۆر زۆرن بەلام ئێمە هەر بۆ نموونە سێ لەو دەقە بە پێزانە دێنینەوە :

١- ( إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ ) الصف -٤- ، واتە : بە ڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە لە پێناوی دا بەرێز دەجەنگن هەر دەڵێی دیوارێکی پێکەوە جۆشدراون.

٢- ( و لا تَهِنوا و لا تَحزَنوا و أَنتُمُ الأَعلَونَ إِن كُنتُم مُؤمنين , إِن يَمسَسكُم قَرحٌ فَقَد مَسَّ القَومَ قَرحٌ مِثلُهُ و تِلكَ الأَيّامُ نُداوِلُها بَينَ الناسِ و لِيَعلَمَ اللهُ الذين آمنوا و يَتَّخِذَ مِنكُم شُهَداءَ و اللهُ لا يُحِبُّ الظّالِمين و لِيُمَحِّصَ اللهُ الذينَ آمنوا و يَمحَقَ الكافرين) ال عمران ١٣٩, ١٤٠ , ١٤١ - ،

*واتە :* وە - ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی شکستی جەنگی ئوحودەوە - بێ هێزی مەنوێنن و دڵتەنگ مەبن لە حاڵێك دا کە ئەگەر بڕوادارbن هەر ئێوە سەرکەوتوو و بەرزترن ، ئەگەر برینێکتان تێ بووە ئەوە بێگومان کۆمەڵی کافرانیش برینێکی بە هەمان شێوە یان تێ بووە - کە لە جەنگی بەدردا شکستیان خوارد - وە ئەو ڕۆژانەش - کە سەرکەوتن و شکستیان تێدا دەبێ - لە نێو خەڵکی دا دەستا و دەستیان پێ دەکەین ، وە بۆ ئەوەی کە خوا ئەوانە بزانێ کە بڕوایان هێناوە [٢] .وە بۆ ئەوەی چەند

---

[١] کەواتە جیاوازی نێوان ( فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە ) و ( جەنگ وجیهاد ) ئەوەیە کە یەکەمیان لە نێو مسوڵمانان دا ئەنجام دەدرێ و دووەمیان لە نێوان مسوڵمانان و دوژمنانیان لە ئەهلی کوفر .

[٢] واتە بە کردەوە و پەرێزی خۆیان و لە دنیای واقیع دا دەربکەون ئەگەر نا خوا لە ئەزەلەوە پێیان زاناو ئاگادارە.

شەهیدێکتان لە نێودا هەڵبژێرێ ، وە بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێن ، وە بۆ ئەوەی خوا بڕواداران بپاڵێوێ و لە بێژینگیان بدات وە کافران نابووت بکات ،
٣- ( ما كانَ اللهُ لِيَذَرَ المؤمنينَ على ما أَنْتُمْ عليهِ حتّى يَمِيزَ الخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ و ماكانَ اللهُ لِيُطلِعَكُمْ على الغَيْبِ و لكنَّ اللهَ يَجْتَبِي مِنْ رُسُلِهِ مَنْ يَشاءُ فآمِنوا باللهِ و رُسُلِهِ و إنْ تُؤْمِنوا و تَتَّقُوا فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظيمٌ ) ال عمران – ١٧٩ – واتە : ناکرێ و ناگونجێ خوا واز لە بڕواداران بێنێ لە سەر ئەو حاڵەتە کە ئێوە لە سەرینی – کە پاك و پیس تێکەڵ و ئاوێتە بن – ( بەڵکو بە جەنگ و سەختی‌یەکان تاقی یان دەکاتەوە ) هەتا پیس لە پاك جیا دەبێتەوە ، وە خوا وا ناکات کە ئێوە پەنهان ( غیب) بزانن – تاکو بڕوادارانی پاك و مونافیقانی ناپاك لێك هەڵاوێرن – بەڵام خوا لە نێو پێغەمبەرانی دا ئەوانەیان کە حەز بکات هەڵیان دەبژێرێ – بۆ ئەوەی وێڕای هاوەڵانیان لەگەڵ دوژمنانی خوادا بجەنگن تاکو لە ئەنجامی ئەوەدا پاك و نا پاك لە یەك جیابنەوە – دەجا بڕاوا بە خوا و پێغەمبەرانی بێنن، وە ئەگەر بڕوابێنن و پارێزکاری بکەن پاداشتێکی مەزنتان هەیە.

*جا ئێستا با سەرنج بدەین:*

لە دەقی یەکەم دا خوای بالاّ دەست ڕای دەگەیەنێ کە ئەو بڕوادارانەی خۆش دەوێ کە بە ڕیزێکی پۆڵاین و مەحکەمەوە لە پێناو خوادا دەجەنگن ، کەواتە لە سۆنگەی جیهادەوە و لە گەرمەی جەنگ و جیهاد دا مسوڵمانان دەبنە کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی مەحکەم و پتەو و پێکەوە جۆشدراو وە کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان بەبێ پاڵ لێکدان و تێك ترنجان وەك خشت و چینەکانی دیوارێکی قایم و قورقوشمی ناتوانن جەنگ و جیهاد بکەن و لە بەرانبەر دوژمن و ناحەزانی خواو خۆیان دا بوەستن.
وە لە دەقی دووەم دا خوای کار بەجێ بە بۆنەی تێشکانی مسوڵمانان لە جەنگی ئوحود دا بە هۆی سەرپێچی لە فەرمان و نەخشەی پێغەمبەرەوە ﷺ دڵی هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر رضي الله عنهم دەداتەوە و بۆشیان ڕوون دەکاتەوە کە مەسەلەی شکست و سەرکەوتن لە جەنگ دا یاسایەکی خوایی یە و شتێکی چاوەڕوان کراو و ئاسایی‌یە ، پاشان پێنج حیکمەت و پەندی گەورە و گرنگیش لەو جەنگ و شکستەیان دا دەخاتە ڕوو :
* زانران و ناساندنی بڕوادارانی ڕاستەقینە لە مەیدانی واقیع دا .
( و ليعلم الله الذين آمنوا )

* هەڵبژاردن و گوڵبژێر کردنی بڕواداران بۆ پلەی بەرزی شەهیدی ،
( و يتخذ منكم شهداء )
* پەردە هەڵماڵین لە سەر ماهیەتی پووچی ئەو زرە مسوڵمان و بەنا و مسوڵمانانەی کە خۆیان خزاندۆتە ڕیزی موجاهیدان و سوپای پێغەمبەرەوە ﷺ وە خوای دادگەر لە بەر ستەم و خراپەیان خۆشی ناوێن ، ( و الله لا يحب الظالمين)
* لە بێژنگ دان و پالأوتنی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان لە هەموو ڕوویێکەوە : ئیخلاص و ساغیيان بۆخوا ، دنیا بە کەمگرتن و دوا ڕۆژ هەڵبژاردنیان ، گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریان بۆ باڵای خۆیان، فیداکاری و بێباکیيان لە مەرگ و ... هتد
( و لِيُمَحِّصَ الله الذين آمنوا).
* لە بەین بردن و نابووت کردنی کافران کە دیارە بەبێ جەنگی سەخت و خوێناوی و قوربانی دان و ئێش و ژان مەیسەر نابێت و ( نۆش ) بەبێ (ئێش ) نابێ ! .
( ويمحق الكافرين).
ئنجا لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین داخوا بۆچی ڕستەی : ( ويمحق الكافرين ) بەدوای ڕستەی : ( وليمحص الله الذين آمنوا ) دا هاتووە؟
جارێ پێویستە بزانین کە وشەی ( يَمحق ) لە چاوگی (مَحق ) ەوە هاتووە کە بە مانای لە نێو چوون و پووکانەوەی پلەپلە و پەنهان بوون و ون بوون دێ ، هەر بۆیەش بەشەوەکانی کۆتایی مانگی ( قَمَري ) دەگوترێ (مَحاق ) چونکە لەو شەوانەدا مانگ (قمر ) وردە وردە ڕۆشنایی کز دەبێ و پاشان پەنهان دەبێ ، کەواتە دەبێ بڕوادارانی جەنگاوەر و موجاهیدیش خەیاڵ پلاوی وانەکەن کە بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ و ساڵ و دوو ساڵ یەکسەر هێزی کوفر تەخت بکەن و نەیهێڵن ، بەڵکو جەنگ و کێشەی نێوان ئیمان و کوفر درێژ خایەنە و پشووی درێژی دەوێ ، دیسان هەڵبژاردنی وشەی ( يَمحق ) کەوەك گوتمان مانای نەهێشتنی ڕۆشنایی و وردە وردە خەفەکردن و کوژاندنەوە دەگەیەنێ ، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە جەنگ و جیهادی ئیسلامی نایەوێ نەیارو ناحەزەکانی ئیسلام بنبڕو قەلاچۆ بکات ! بەڵکو گرنگ ئەوەیە حوکم و دەستەلاتیان نەمێنێ و چرای حوکمڕانی یان خەفە بکرێ و بکوژێتەوە و خۆری ئیسلام جێگای بگرێتەوە ! ئنجا بۆیەش ڕستەی ( و يَمْحَقَ الكافرين ) بە دوای ڕستەی ( وَ لِيُمَحِّصَ الله الذينَ آمنوا ) دا هاتووە تاکو مسوڵمانان دڵنیا بن و بزانن کە هەتا خۆیان نەبنە کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی پوخت و پاك و هەڵبژاردە و پالأوتە توانای وڵات پاك

کردنەوەیان نابێ ، بەڵێ کاتێك مسوڵمانان دەتوانن دەوروبەریان بژارو پاك بکەنەوە لە کوفر و ستەم و خراپە کە پێشتر خۆیان لە سەر ئاستی تاك و کۆمەڵ و کۆمەڵگاشیان پالأوتبێ و بژاردکردبێ ، ئەگەر نا پیس بە پیس لاناچێ و ئەهلی ستەم ئەهلی کوفریان پێ لە نێو ناچێ !

وە لە دەقی سێیەمیش دا خوای کار بەجێ و پەنهان بین ئەم سێ ڕاستی‌یە مەزنەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە :

(١)- یاسا و سوننەتی خوا وانیە کە واز لە کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانان بێنێ و لێیان بگەڕێ کە بڕوادار و مونافیق و پاك و ناپاك و پارێزکار و تاوانبار و ئازاو بوێر و ترسنۆك و خۆ بوێر تێکەڵ بن و لە یەك هەڵنەوێررێن ، وەك حاڵەتی مسوڵمانانی مەدینەی پێغەمبەر ﷺ پێش جەنگی ئوحود کە نزیکەی سێ یەکی (٣١١ ) ی سوپای ئیسلام بە فیتی ( عبدالله بن أُبَيّ بن سلول ) لە ناسك ترین و دژوار ترین کات دا پشتی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانانیان بەردا و پاشەکشەیان کرد ، بەڵکو خوای کاربەجێ یاسای وایە کە خواپەرستان و طاغووت پەرستان لە یەك جیا بکاتەوە و کۆمەڵ و ڕیزی بڕواداران لە خڵتە و خاڵ و چڵك چەپەری دەغەڵ و دڵنەخۆشان پاك بکاتەوە.

(٢)- ڕێگا و چۆنیەتی ئەو پاك و پیس لێك هەڵأواردن و جیا کردنەوەیەش ئەوە نیە کە خوا مسوڵمانان لە دڵ و دەروونی خەڵکی ئاگادار بکات و غەیب و پەنهان بزانن! چونکە بەس خوا نهێنی‌یەکانی دڵان و پەنهانی زەوی و ئاسمانەکان دەزانێ ، (قُلْ لايَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمواتِ و الأَرْضِ الغَيْبَ إلاّ الله .. ) النمل ٦٥ ، واتە ، بڵێ - بێجگە لە خوا هیچ کەس پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی نازانێ .....

(٣)- بەڵکو ڕێگای لە یەك جیا کردنەوەی پاك و ناپاك و بێژینگی لێك هەڵأواردنیان بریتیە لە جیهاد و بەرەنگاری کە پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خوا ﷺ و شوێن کەوتوانی ڕەسەنیان پێی هەڵدەستن ، هەرکاتێك زەمینەی ئەنجام دانی یان بۆ بڕەخسێ کە ئەو زەمینەیەش بە هۆی ئەوەوە سازدەبێ هێندەیان هێزو بڕست هەبێ کە پێی بەگژ باطڵ و ئەهلی کوفر و ستەم و خراپەدا بچن. جا دیارە ئێمە و مانانیش ئەگەر بە ڕاستی بڕوا بە خواو پێغەمبەرانی علیهم الصلاة و السلام بهێنین و پارێزکاری بکەین ، کە بە شێکی گرنگی ئەو پارێزکاری‌یەش خۆ پاراستنە لە دەستە و ئەژنۆ دانیشتن و مل کەچ کردن بۆ طاغووت و ملهوڕان ، ئەوە بێگومان پاداشتێکی مەزنمان هەیە لە لای خوای باڵادەست و دادگەر ، وێڕای عیززەتمەندی و سەربەرزی دنیاش.

٨- پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان : یەکی دیکە لەو جۆرە خواپەرستی و بەندایەتییانەی کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕن لە یەك ڕیزی و یەکدەنگی و یەك ڕەنگی و یەکسەنگی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان دا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە زۆر و جۆراوجۆرەکانن کە ئیسلام گرنگی و بایەخێکی تایبەتی پێ داون ، جا دیارە ئێمە لێرەدا مەوداو دەرفەتی ئەوەمان نیە کە مەسەلەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بتوێژینەوە کە خوا یاربێ لە بەشی سێیەمی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا بە ناوی (خوووڕەوشت ) بە تێر و تەسەلی باسیان دەکەین ، بەڵام لێرەدا هەروا بە خێرایی ئاماژەبە دە (١٠) لەو پەیوەندی یە گرنگ وسەرەکی یانە دەکەین:

**یەك: ژن و مێردایەتی (الزوجیة):**

دیارە خێزان (الأُسْرة)خشتی یەکەمی پێکهێنانی کۆمەڵگایەو پەیوەندی نێوان ژن و مێردو پێکەوە پەیوەست بوونیان لە سەر بناغەی بەرنامەی خواوبە ئیزن و مۆڵەتی خوایەبۆیە ئەو پەیوەندی یە بە پەیوەندی یەکی پیرۆز دادەنرێت و لە سەر بنچینەی ڕێزو خۆشەویستی و سۆزو پەرۆش بۆ یەکتر بنیات دەنرێ،وە هەر کام لە ژن و مێرد کۆمەڵێك ئەرك و مافیان لەگەڵ یەکتردا هەیەو هەر کامێکیان بە بەرگ و پۆشاکی ئەوی تر دادەنرێت، جا بێگومان دەقی قورئان و سوننەت سەبارەت بە ئەرك و مافەکانی ژن و مێردبەرامبەر بە یەکترو ئەو ئادابە شەرعی یانەی کە دەبێ پابەندیان بن و ڕەچاویان بکەن لە هەڵس و کەوتی نێوانیان دا زۆر زۆرن و ئێمە لێرەدا دەرفەتی خستنە ڕوویانمان نیە، بۆیە بە هێنانەوەی ئەم ئایەتە قەناعەت دەکەین: (و مِنْ آياتِهِ أنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أنْفُسِكُمْ أزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إليها و جَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَّ رَحْمَةً إنّ في ذلك لآياتٍ لِقَومٍ يَتَفَكَّرُونْ ) الروم_٢١_، واتە: وەلەنیشانەکانی خوایەتی خوا_ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان هاوسەری بۆ وەدی هێناون تاکو بەهۆیانەوە ئۆخژنتان بۆ بێت، وە خۆشەویستی و بەزەیی لە نێوانتان دا گێڕاوە، بێگومان لەو پەیوەندی و هۆگرییەی ژن و مێردایەتی_ەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بیربکەنەوە.

*دوو: باب و دایك و ڕۆڵایەتی:*

پەیوەندی نێوان باب و دایك و ڕۆڵەکانیشیان وێڕای ئەوەی کە وەك پەیوەندی نێوان ژن و مێردشتێکی خوا ڕسك و فیطرییە ئیسلامیش گرنگی و بایەخێکی زۆری

پـیٚداوه،بـەلاّم جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە مەگـەر بەدەگمـەن دەنـا هـەر فـەرمان بـە ڕۆڵەکان_کوڕو کچ_کراوەکە ڕێزی باب‌و دایکیان بگرن‌و لە گەڵیان چاك بن‌و بە باب‌و دایك نەگوتراوە! هۆیەکەش ئەوەیە کە چاکی باب‌و دایك لـە گـەڵ منداڵـەکانیان کـە جگەر گۆشـەیانن شتێکی خوا ڕسکەو پێویستی بـە ئاگـادار کردنـەوەو ئامۆژگـاری ناکات مەگەر لە هەندێك حاڵەت دا، جا دیارە لە بارەی پەیوەندی نێوان باب‌و دایك‌و ڕۆڵـەکانیان دەقـی قوڕئـان‌و سـوننەت زۆرن بـەلاّم ئێمـە بـەس دوانیـان لێ بـە نموونـە دێنینەوە:

١- (و قَضىٰ رَبُّكَ أَلاّ تَعْبُدوا إلاّ إيّاهُ و بالوالِدَيْنِ إحْساناً , إما يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الكِـبَرَ أحَدُهُمـا أو كِلاهُما فَلا تَقُلْ لَهُما أُفٍّ و لا تَنْهَرْهُما و قُلْ لَهُما قَولاً كَريماً , و اخْفِضْ لَهُما جَناحَ الـذُّلِّ مِـنْ الرَّحْمَةِ و قُلْ رَبِّ ارْحَمْهُما كَما رَبَّياني صَغيراً) الاسراء_٢٣_٢٤_٢٥_.

*واتە:* وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە جگە لـەو نەپەرستن وە لەگەڵ باب‌و دایکتان چاکە بکەن[1]،

هەر کات یەکێکیان یان هەردووکیان لەلات بوون‌و گەیشتنە قۆناغی پیری، نەچی هیچ وشـەیەکی هەسـت ڕوشـێنەریان پـێ بلێـی، وەدەنگیـان مـەدەو قسـەیەکی پـڕ ڕێـزو حورمەتیان لـە گـەڵ بکـە. وە لەئەنجامی بەزەیی‌و پەرۆش دا بـاڵی گـەردن کـەچی‌یان بەسـەردا شـۆڕ بکـەوە، وە بڵێ: پـەروەردگارم!بەزەییت پێیـان دا بێ وەك چـۆن ئـەوان منیان بەگچکەیی بەخێو کرد.

ئەمە دەربارەی هەڵوێسـتی ڕۆڵـەکان بەرامبـەر دایـك‌و بابیـان، دەربـارەی هەڵوێسـتی دایك‌و بابیش لەگەڵ منداڵەکانیان_بەتایبەتی باب_فەرموویەتی:

٢- (يا أيُّها الَّذينَ آمَنوا قُوا أنْفُسَكُمْ و أهليكم ناراً و قُودُها النّاسُ و الحِجارةُ عَلَيْـها مَلائِكَـةٌ غِلاظٌ شِدادٌ لا يَعْصُونَ اللهَ ماأمَرَهُمْ و يَفْعَلُونَ ما يُؤْمَرُونَ) التحريم_٦_

*واتە:* ئەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە خۆتـان و مـاڵ‌و خێزانتـان لـە ئاگرێك بپارێزن کە سوتەمەنی‌یەکەی خەڵك‌و بەردە، چەند فریشتەیەکی زبرو بە هێزی لەسەرن هەر شتێك خوا فەرمانیان پێ بکات سەرپێچی ناکەن‌و چیان فەرمان پێبکرێ ئەنجامی دەدەن.

---

[1] سەرنج بدە چۆن خوای دادگەر دوای پەرستنی خۆی فەرمانی بە چاکە کردنی لەگەڵ دایـك و باوکی کردووە.

*سێ: خزمایەتی:*

بازنەیەکی دیکەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان کە لە بازنەی یەکەم و دووەم فراوانترە بریتیە لە پەیوەندی خزمایەتی (صِلَةُ الرَّحِمْ) کە لەزۆر دەقی قورئان و سوننەت دا فەرمان بە پاراستنی کراوەو هەڕەشەی توند لە پچڕاندنی کراوە، کە ئێمە لێرە بەس ئاماژە بە سێ لەو دەقە بە هێزو پێزانە دەکەین:

١- ( و أُولوا الأَرْحام بَعْضُهُمْ أولى بِبَعْضٍ في كتابِ اللهِ مِنَ المُؤْمِنين و المُهاجرين... ) الاحزاب_٦_.

*واته:* وە لە کتێبی خوادا خزمان لەنێو خۆیان دا لە یەکتر نزیک ترن و هەقیان بەسەر یەکەوە زیاترە لە باقی برواداران و کۆچکەران. وەخوای تۆڵە ستێن بە هەڕەشەوە ڕوو لە کەسانێک دەکات کە هەڵوێستی دەغەڵانەیان لە بەرانبەر جیهادو بەرگری کردن لە کۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامی هەیەو پێیان دەفەرموێ:

٢- (فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدوا في الأَرْضِ و تُقَطِّعوا أَرْحامَكُمْ أُولئك الذين لَعَنَهُمُ اللهُ فأَصَمَّهُمْ و أَعْمى أَبْصارَهُمْ) محمد_٢٢_٢٣_. واته: ئایا زۆر نزیک نیە ئەی دەغەڵان! کە ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست خراپە کاری لە زەوی دا بکەن و خزمایەتیتان بپچڕێنن! ئەوانەی کەئاوا دەکەن_ کە سانێکن خوا نەفرینی لێ کردوون بۆیە کەڕی کردوون و چاوەکانیانی کوێر کردوون.

٣- ( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قاطِعُ ، قال سفيان في روايته : يعني قاطِعُ رَحِمٍ ) متفق عليه،

*واته:* (پچڕێنەر ناچێتە بەهەشتێ) سۆفیان لە کاتی گێڕانەوەی ئەم فەرمودەیەدا گوتویەتی: یانی پچڕێنەری خزمایەتی.

*چوار : دراوسێیەتی :*

پەیوەندی دراوسێ یەتیش یەکێکی دیکەیە لە بازنەگرنگەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئیسلام گرنگی یەکی زۆری پێداوەو لە زۆر دەقی قورئان و سەننەتدا فەرمان بەموسوڵمانان کراوە کە ئەرک و مافەکانی دراوسێیەتی لەگەڵ یەکتردا جێ بە جێ بکەن و زۆر وریا بن لە ئازارو زیان بە یەکتر گەیاندن و یەکتر ڕەنجاندن. بۆ وێنە خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: (و اَعْبُدوا اللهَ و لا تُشْرِكوا بِهِ شَيْئاً و بالوالِدَيْنِ إِحْسانَاً و ذي القُرْبى و اليَتامىٰ و المَساكِينِ و الجار ذي القُرْبى و الجار الجُنُبِ و الصّاحِبِ بالجَنْبِ و إبنِ السَّبيلِ و ماملَكَتْ أَيْمانُكُمْ .. ) النساء_٣٦_. واته: وە خوا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەنە هاوبەشی ، وە لە گەڵ دایک و باوکتان چاکە بکەن وە لەگەڵ خزمان و هەتیوان و نەداران و دراوسێی نزیک و دراوسێی دوورو هاوەڵی نزیک و ڕێبوارو ئەو کۆیلانەی لە بەردەستانن..

پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ دەربارەی گەورەیی و گرنگی ئەرك و مافی دراوسێ یەتی فەرموویەتی:(ما زال جِبْرِيلُ يُوصِيني بِالجارِ حتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ) متفق عليه.
واتە: جوبرائیل ئەوەندە دەربارەی دراوسێ ڕای سپاردم و داکۆکی لێ کردم هەتا گومانم وابوو کە دەیکاتە میراتگر!

*پێنج: هاوەڵایەتی (االصَّداقة):*

پەیوەندی دۆستایەتی و هاوەڵایەتیش یەکی دیکەیە لە جوغزەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پێکەوە گرێ دانی ئەندامان و توێژەکانی کۆمەڵگا، ئەوەندە بەسە بۆ گرنگی و بایەخی ئەو جۆرە پەیوەندییە لە ئیسلام دا کە لە ئایەتی ژمارە(٣٦)ی (نساء) دا لە ڕیزی چاکە لەگەڵ باب و دایك و خزمان و هەتیوو هەژارو دراوسێ دا باس کراوە وەلە ئایەتی ژمارە(٦١)ی سوورەتی (النور)یش خواردن و خواردنەوە لەماڵی:دۆست و ڕەفیق بۆ ئینسان موباح کراوە لە ڕیزی ماڵی خۆ، باب و دایك، براو خوشك، مام[1] و پوور، خاڵ و پلك، وە ماڵێك کەتێیدا کراوە بە ئەمیندار وەکیل وەك دەفەرموێ: ( لَيْسَ على الأَعْمَىٰ حَرَجٌ و لا علىٰ الأَعْرَجِ حَرَجٌ و لا علىٰ المَرِيْضِ حَرَجٌ و لا علىٰ أَنْفُسِكُمْ أَنْ تَأْكُلوا مِنْ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهاتِكُمْ أَو بُيُوتِ إِخْوانِكُمْ أَو بيُوتِ أَخَواتِكُمْ أَو بيُوتِ أَعْمامِكُمْ أَو بيُوتِ عَمَّاتِكُمْ أَو بيُوتِ أَخْوالِكُمْ أَوْ بيُوتِ خالاتِكُمْ او ما مَلَكْتُمْ مَفاتِحَهُ أَوْ صَدِيْقِكُمْ ... ) .

*شەش: میوانداریتی (الضِّيافَة):*

ئەمیش یەکێکی ترە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و لە زۆر دەقی قورئان و سوننەتیش دا هەم باسی ئەرکی خانە خوێیەتی و مافی میوان و هەم باسی ئەو ئاداب و ڕەوشتە بەرزانە کراوە کە دەبێ هەردووکیان ڕەچاویان بکەن کە ئێمە لێرەدا بەس دووان لەو دەقانە بە نموونە دێنینەوە کە یەکێکیان پەیوەندی بە بابای خانەخوێ و ئەوی تریشیان پەیوەندی بە میوانەوەهەیە:

---

[1] دیارە ((عَمّات ))کە کۆمەڵ و کۆی (( عَمَّة )) یە ، کە خوشکی بابە ، وە ( خالات ) کۆی ( خالَة ) یە کە خوشکی دایکە ، جا لە کوردیدا ( پوورو پلك ) هەردووکیان بۆ هەر کام لە ( عمة ) و (خالة ) بەکار دێن ، بەڵام ئەگەر وەك من جیام کردوونەوە جیا بکرێنەوە باشترە.

١- ( مَنْ كانَ يُؤْمِنُ باللهِ و اليَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ... ) متفق عليه،

*واته:* هەرکەسێك بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانەکەی بگرێ..،ئینجا شایانی باسە کە ڕێز لە میوان گرتن تەنیا بە خواردن پێدانی باش تەواو نابێ، بەڵکو وێڕای ئەوە دەبێ لە ڕووی مەعنەوی‌و ئە خلاقیشەوە ڕێزو حورمەتی بگرێ، بەڵکو ئەمیان لە ڕێز گرتنی ماددی گرنگتریشە، وەك کوردەواری دەڵێن: (نانت جۆین بێ خوڵقت گەنمین بێ).

٢- (لا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُقِيمَ عندَ أَخيهِ حتَّى يُؤْثِمَهُ ، قالوا : يا رسول الله و كيف يُؤْثِمُهُ ؟ : قال يُقيمُ عِنْدَهُ و لا شيءَ لَهُ يُقْرِيهِ بِهِ) رواه مسلم،

*واته:* هیچ مسوڵمانێك بۆی نیە کە هێندە لە لای برایەکەی میوانی بێ تا گوناحباری دەکات ! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جا چۆن گوناحباری دەکات ؟! فەرمووی: ئەو هەر میوانی دەبێت‌و خانە خوێیەکەیشی شتێکی وای لەلا نیە کە میوانداریتی پێ بکات !

کەواتە: وەك چۆن لێزانی‌و خوڵق‌و خووی جوان‌و سەخاوەت‌و بەر چاو تێری بۆ بابای خانەخوێ پێویستن، میوانیش دەبێ وورد بین‌و بە سەلیقەو کارامە بێت‌و بزانێ ئەگەر مانەوەی گیرو گرفتێك دروست بکات مایەی دەردەسەری خاوەن ماڵ بێ و پێی ناخۆش بێ،نابێ بمێنێتەوە.

## *حەوت: سەردان‌و هاموشۆ:*

وەك چەندان جار دووبارەمان کردۆتەوە هەموو جم وجۆڵ‌و چالاکی‌یەکانی مسوڵمانان ئەگەر بۆ خوا بوون‌و بە پێی شەرع بوون (الأُخْلاص والأُتِّباع) یان لەگەڵ بێ بە خوا پەرستی لە قەڵەم دەدرێن، جا یەکی تر لەو پەیوەندی‌و چالاکی‌یانەی نێو کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان کە کاریگەری‌و شوێنەوارێکی گرنگ‌و بەرچاوی لە تۆکمەوتوندو تۆڵ کردنی ڕیزەکانیان دا هەیە بریتیە لە سەردان (زیارة) و هاموشۆی یەکتر بە مەبەستی بەیەك ئاشنا بوون‌و ئاگا لە یەکتر بوون‌و چاك‌و چۆنی‌و هەواڵ پرسینی یەکتر ..هتد.

ئەمەش چەند دەقێکی سوننەتی پێغەمبەری سەروەر ﷺ لە بارەی سەردان‌و هاموشۆو هەواڵپرسینی یەکترو گرنگی‌و کاریگەری لە بواری لە خوا نزیك بوونەوەو لە یەك نزیك خستنەوەی مسوڵماناندا:

١- ( عن النبي ﷺ أَنَّ رَجُلاً زارَ أَخاً لَهُ في قَرْيةٍ أُخْرىٰ ، فَأَرصَدَ الله لَهُ علىٰ مَدْرَجَتِه مَلَكاً فلمّا أَتىٰ عليه قال : أَيْنَ تُرِيدُ ؟ قال : أُرِيدُ أَخاً لي في هذه القرية قال : هَلْ لَـكَ عليـه مِـنْ نعمـةٍ تَرُبُّها عَلَيْهِ ؟! قال : لا ، غَيْرَ أَني أَحْبَبْتُهُ في اللهِ تعالىٰ ، قال : فَاني رسولُ الله إليكَ بأَنَّ الله قَـدْ أَحَبَّكَ كما أَحْبَبْتَهُ فيْهِ ) رواه مسلم.

*واته:* پیاوێك سەردانی برایەكی خۆی كردلە دێیەكی تر، خواش فریشتەیەكی لەسەر ڕێگاكەی بۆ بە چاودێر دانا، جا كاتێك گەیشتەلای پێی گوت: بۆ كوێ دەچی ؟ گوتی: دەمەوێ سەردانی برایەكم بكەم لەم گوندە، گوتی: ئایا هیچ چاكەو بەرژەوەندی‌یەكت لەلای ئەو هەیە، بچی مشووری لێ بخۆی ؟ ! گوتـی : نـەخێر، هـەر ئەوەندەیـە كەلـە پێناوی خوای بەرزدا خۆشم ویستوە، -فریشتەكە_گوتی: دەجا بزانە كە من نێرراوی خوام بۆ لای تۆ كە پێت ڕابگەیەنم خواش تۆی خۆشویستوە چونكە تۆ ئەوت لە بەر خوا خۆشویستوە.

٢- (ما مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلتقِيانِ فَيَتصافَحانِ إِلاّ غُفِرَ لَهُما قَبْلَ أَنْ يَفتَرِقا) رواه ابو داود. واتە: هیچ كاتێك دوو مسوڵمان ناگەنە یەكترو پێكەوە تۆقە ناكەن، مەگەر لێیان دەبوردرێ بەر لەوەی لە یەك جیا بنەوە.

٣- (عن انس رضي الله عنه قال : قال يارسول الله الرَّجلُ مِنّا يَلقىٰ أَخاهُ أَوْ صديقَهُ أَيَنْحَني لَهُ ؟ قال : لا ، قال : أَفَيَلْتَزِمُهُ و يُقَبِّلُهُ ؟ قال : لا ، قال و يُصافِحُهُ ؟ قال : نَعَمْ ) رواه الترمذي و قـال: حديث حَسَنٌ.

*واتـە:* ئەنـەس خـوای لێ ڕازی بێت گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك لـە ئێمـە بـە برایەكەی یان هاوەڵەكەی دەگات ئایا بۆی بچەمێتـەوە؟ فەرمووی: نـەء ، گوتـی: ئەی بەخۆیەوە بگووشێ و ماچی بكات؟ فەرمووی : نەء ، گوتی : ئەی تۆقەی لەگەڵ بكات؟ فەرمووی: بەڵێ .

٤- ( لا تَحقِرنَّ من المعروف شيئاً و لو أَنْ تَلقىٰ أَخاكَ بِوَجْهٍ طَليْقٍ) رواه مسلم.

*واته :* هیچ شتێك لە چاكە كردن بەكەم مەگرە ئەگەر هەر ئەوەندەش بێت كە بە ڕووی كراوە و گەشەوە بگەیە براكەت.

### *هەشت: سەر لێدانی نەخۆش: (عيادة المريض )*

یەكی دیكە لە چالاكی‌و پەیوەندی‌یە گرنگ‌و كاریگەرەكانی نێو كۆمەڵگای مسوڵمان سەر لێدان‌و هەواڵ پرسینی ئینسانی ناساغ‌و پەك كەوتەیە، كە بێ گومان پێویستی

به دڵدانەوەو قسەی خۆش و ئامۆژگاریی و خەم ڕەواندنەوەو ورە بەرز کردنەوە هەیە، دیارە ئەم جۆرە خوا پەرستییەش ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە زیاد کردنی خۆشەویستی و بەزەیی و پەرۆش و سەرەنجام پێکەوە توندو تۆڵ کردنی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:

١- (عُودوا المَرِيْضَ و أَطْعِموا الجائِعَ و فُكُّوا العانِيَ ) رواه البخاري.

واتە: سەر لە نەخۆش بدەن و خواردن بدەن بە برسی و دیل بەرهەڵدا بکەن.

٢- ( حَقُّ المُسْلِمِ على المُسْلِمِ خَمْسٌ : رَدُّ السَّلامِ ، و عِيادَةُ المَرِيْضِ ، و اِتِّباعُ الجَنائِزِ ، و إِجابَةُ الدَّعْوَةِ ، و تَشْمِيْتُ العاطِسِ ) متفق عليه. واتە: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان پێنجن: وەڵامدانەوەی سەلام، وەسەرلێدانی نەخۆش، وەشوێن کەوتنی جەنازەکان_ بۆ سەر گۆڕستان_، وە وەڵامدانەوەی دەعوەت کران، وە گوتنی (يرحمك الله) بە بابای پژمیو.

٣- (ان الله عز و جل يقول يوم القيامة : يا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي : قال يارَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ و أَنْتَ رَبُّ العالمين ؟! قال : أَما عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ ؟ أَما عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ ؟! ... ) رواه المسلم. واتە: بێگومان خوای باڵا دەست و شکۆمەند ڕۆژی قیامەتێ دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد نەخۆش کەوتم سەرت لێ نەدام!_ ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن سەرت لێ بدەم کەتۆ پەروەردگاری جیهانەکانی ؟!دەفەرموێ: ئەدی نەتزانی کە فلانە بەندەیەم نەخۆش بوو سەرت لێ نەدا ؟ ئایا نەتزانی ئەگەر سەردانت کردبایە منت لەلای وی دەبینی ؟!

بێگومان مەبەستیش لە( لە لای نەخۆش بوونی خوای بێوێنە ) لەوێ بوون و دەستگیر بوونی ڕەزامەندی و پاداشتەکەیەتی بە هۆی ئەو سەر لێدان و هەواڵ پرسینەوە. لەم فەرموودە بە پێزانەی پێغەمبەری پایە بەرزو بەرێزیشمان دا دەبینرێ کە سەرلێدان و دڵدانەوەو هەواڵپرسینی نەخۆش چ خوا پەرستییەکی بەرزەو چ کاریگەرییەکیشی هەیە لە لەخوا نزیك خستنەوەو لەیەك نزیك کردنەوەی مسوڵمانان دا.

## نۆ: لەگەڵ جەنازە چوونە سەر گۆڕستان و سەرە خۆشی کردن و دڵدانەوەی خاوەن مردوو:

دیارە ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چ زیندوو بێت چ مردووڕێزو حورمەتی پارێزراوە، جا یەکێکی دیکە لەو پەیوەندی یە کۆمەڵایەتییانەی کە تا ڕاددەیەکی زۆر کاریگەری هەیە لە بڵاوکردنەوەی ڕووحی برایەتی و بە تەنگ یەکترەوە بوون و یەکتر

خۆشویستن بریتیە لەگەڵ مردوو چوونە سەر قەبران‌و سەرە خۆشی‌و دڵدانەوەی خاوەن مردوو، جا دیارە کە شۆردن‌و کفن کردن‌و نوێژی مردوو لە سەر خوێندن‌و بردنە سەر گۆڕستان‌و ناشتنی مردوو فەرزی کیفایەن و لەسەر کۆمەڵگای مسوڵمان پێویستە جێبەجی یان بکات، فەرموودەش لەو بارەوە زۆرن کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:

١- ( مَنْ شَهِدَ الجِنازةَ حتّى يُصَلّى عليْها فلهُ قيْراطُ ، وَمَنْ شَهِدَها حتّى تُدفَنَ فَلَـهُ قيْراطـانِ ، قيل : و ما القراطانِ ؟ : قال : مِثْلُ الجَبَلَيْنِ العَظيْمَيْنِ ) متفق عليه. واتە: هەرکەسێك ئامادەی جەنازەیەك بوو هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ ئەوە (قیراط)ێکی پاداشت هەیە، وە هەرکەسێك ئامادەی_ سەرەو بەرە کردنی_ بوو هەتا دەنێژرێ ئەوە ئەندازەی دوو قیراطی پاداشت هەیە، گوترا: دوو قیراط چین؟!فەرمووی: هێندەی دوو چیای گەورەن.

٢- ( مَنْ عَزّى أَخاهُ المُؤْمِنَ في مُصِيْبَةٍ كَساهُ الله حُلَلَ الكَرامَـةِ يَـوْمَ القيامَـة ) أخرجَه البَيـهَقي.
*واتە:* هەرکەسێك دڵی برایەکی بڕواداری بداتەوەلە بە لایەك کە بەسەری هاتوە، خوا لە بەرگ‌و پۆشاکی ڕێزو حورمەتیدەبەر دەکات ڕۆژی قیامەتیّ.

٣- ( مَنْ عَزّىٰ مُصاباً فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ ) أخرجَه البَيْهَقي والترمذي و إبن ماجه. واتە: هەرکەسێك دڵی لێقەوماوێك بداتەوە، ئەوە هێندەی ئەو پاداشتی هەیە.

### *دە: بەشداری کردنی شادی‌و خۆشی یەکتر:*

وەك چۆن پێویستە مسوڵمانان لە کاتی تەنگانەو لێقەومان‌و بەلاو گرفتاریدا بەدەم یەکدی‌یەوە بچن‌و بە خەم یەکترەوە بن‌و هاوکاری یەکتر بکەن، بە هەمان شێوەش لە کاتی شایی‌و شادی‌و خۆشی‌و بۆنە(مناسبة) شەرعی‌یەکانیش دا پێویستە هاوکاری یەکتر بکەن‌و بە دەم بانگەواز و دەعوەتی یەکترەوە بچن، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (... و تَعاوَنُوا علىٰ البِرِّ و التقوى و لاتَعاوَنُوا علىٰ الأثْمِ و العُدْوان ... ) المائدة -٢،
*واتە :* وە هاوکاری یەکتری بکەن لە سەر چاکەکاری و پارێزکاری ، بەڵام لە سەر گوناح و دەستدرێژی دەستبار بۆ یەکتر مەگرن...

ئەمەش چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری ڕەوشت مەزن ﷺ لەو بارەوە :

١- (اذا دعا أَحَدُكُمْ أخاهُ فَلْيُجِبْ عُرْساً كانَ أوْ نَحْوَهُ ) رواه مسلم و ابو داود و البغوي.
*واتە :* ئەگەر یەکێکتان برایەکەی دەعوەت کرد بۆ – نان خواردن– زەماوەند و شێوەی ئەوە، با بچێت.

٢-(إذا دُعِيَ أَحَدُكُمْ الىٰ طَعام فَلْيُجِبْ، فَانْ كان مُفْطِراً فَلْيَطْعَمْ و إنْ كانَ صائِماً فَلْيُصَلِّ ) رواه مسلم و البيهقي ،

*واتە :* هەر کات یەکێکتان بانگهێشت کرا بۆ خواردنێك با بچێ جا ئەگەر بە ڕۆژوو نەبوو با بخوات و ئەگەر بە ڕۆژووش بوو با دووعا - بۆ خاوەنی خواردنەکە - بکات .

٣- ( شَرُّ الطَّعام طَعامُ الوَليمَة ، يُدْعىٰ الغَنِيُّ و يُتْرَكُ المِسْكينُ و هِيَ حَقٌّ فَمَنْ تَرَكَها فَقَدْ عَصىٰ الله و رَسُولَهُ ) (متفق عليه)،

*واتە :* خراپترین خواردن خواردنی زەماوەندە دەوڵەمەندی بۆ بانگهێشت دەکرێ و هەژار فەرامۆش دەکرێ ! بەڵام چوونیش بۆی هەر پێویستە و هەرکەسێك نەچێ ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووە.

دیارە مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە خواردنێك کە لە کاتی بووك هێنان و شایی و زەماوەند دا ساز دەکرێ ئەگەر دەوڵەمەندەکانی بۆ بانگهێشت بکرێن و نەدارو برسییەکان فەرامۆش بکرێن ئەوە دەبێتە خراپترین جۆرە دەعوەت کردن ، بەڵام چوون هەر پێویستە بۆ دڵڕاگرتنی بابای خاوەن خواردن ، کەواتە لێرەدا دوو خراپە تێك دەگیرێن و ئینسان ناچارە یەکیان کە زیانی کەمترە لەوی تر هەڵبژێرێ بە پێی یاسای ( إحْتِمالُ أَخَفِّ الضَّرَرَيْنِ ) وە ( إتِّقاءُ أَقْوىٰ الشَّرَّيْن ) ، کە دیارە بە ڕنامەی خوا دڵ ڕەنجاندنی بابای خاوەن خواردن و کەس وکاری پێ خراپتر و زیانبەخش ترە لە خواردنی خواردنێکی ئەوتۆ! ئینجا بێگومان ئەگەر ( وليمة ) کەش بەو جۆرە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە ، بەڵکو هەژار و دەوڵەمەندی وەك یەك بۆ بانگهێشت بکرێن ، ئەوە بێگومان ئەو خراپی و مەترسییەش نامێنێ ، بە مەرجێك لە لایەکی دیکەوە پێچەوانەی شەرع و ئادابە شەرعییەکان ڕەفتار و هەڵس و کەوت نەکرێ ، ئەگەر نا ئەو کاتە حوکمی چوون و نەچوون بە ئەندازەی ئەو ناشەرعی و سەرپێچییانە دەگۆڕێ .

*مسوڵمانی بەڕێز و خۆشەویست :*

پێم وایە دوای ئەم برە توێژینەوەیە دەربارەی دە ( ١٠ ) لە پەیوەندی و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، ڕوون بۆوە کە خوا پەرستی (عبادة) چ ڕۆڵێك دەگێڕێ لە پێکەوە بەستن و هۆنینەوەی مسوڵمانان بە دەزووی بەندایەتی بۆ خوا کردن ، کە وەك پێشتریش باسمان کرد یەکەمین و گرنگترین هەنگاوی ئەو بەندایەتی و

خواپەرستی‌یەش ( ئیمان )ە و ، ئیمان بناغەی و بنچینەی هەموو جۆرو شێوە تاکی و کۆمەڵی و ئاشکرا و پەنهانەکانی خواپەرستی‌یە ، وە لە ڕاستی‌دا ئەو هەموو جۆرو شێوە زۆر و زەوەندانەی خوا پەرستی کە لە هەموو جم و جۆڵ و چالاکی‌یە مەعنەوی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسی‌یەکان دا خۆیان دەنوێنن ، بە میوە و بەرهەمی ئیمان دادەنرێن ، هەر بۆیەش پێغەمبەری سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ لە پێناسەکردنی ئیمان دا فەرموویەتی : ( الأيمانُ بِضْعٌ و سَبْعُون – او بِضْعٌ و ستُّون – شُعْبَةً ، أَفْضَلُها قَولُ / لا اله الا الله ، و أَدْناها : إِمَاطَةُ الأَذىٰ عن الطَّرِيْقِ ، و الحياءُ شُعْبَةٌ مِنَ الأيْمانِ ) متفق عليه ، واته : ئیمان حەفتاو ئەوەندە – یان شەست و ئەوەندە – بەشەیە ، چاکترینیان گوتنی : (هیچ پەرستراونێن بێجگە لە خوا ) یە ، وە کەمترینیان لابردنی ئازارە لە سەر ڕێگا ، وە شەرم و شکۆش بە شێکە لە ئیمان )[1].

بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرکام لەو جم وجۆڵ و چالاکی‌یە کۆمەڵایەتی‌یانە بۆ خواو بە پێی شەرعی خوا ئەنجام بدرێن و هەردووك مەرجی بنەڕەتی قبووڵ کران : بۆ خوا بوون و بە پێی شەرع بە ڕێوە چوون ( الاخلاص و الاتباع ) یان تێدا بێنەدی ، ئەو جار ئەو شوێنەوار و کاریگەری‌یەی باسمان کرد دێتە دی ، ئەگەر نا زۆر جاران ئەو پەیوەندی و چالاکی‌یە کۆمەڵایەتی‌یانە لە بەر ڕەچاو نەکردنی سنوورەکانی شەرع و پابەند نەبوون بە ئادابە بەرزەکانی‌یەوە ، دەبنە سەرچاوە و کانگای گەلێك کێشە و هەراو دەردەسەری و ئێش و ژانی زۆریان لێ دەکەوێتەوە، چ بۆ تاك و چ بۆ خێزان و چ بۆ کۆمەڵگاش، بە کۆتایی پێ هێنانی ئەم خاڵی شەشەمەش کۆتایی بەم بەشی سێیەمە ( شوێنەوار و بەرهەمە گرنگەکانی خوا پەرستی ) دێنین و دەچینە سەر باسی چوارەم.

---

[1] پێویستە بزانین کە هەرکام لە وشەکانی (ایمان) و ( اسلام ) و (عبادة) و ( تقوی) ئەگەر بە جیاجیا باس بکرێن ئاشکرا و پەنهان و درشت و وردی ئاینی خوا دەگرنەوە ، بەڵام ئەگەر پێکەوە بن ، ئەوە ئیمان ئەسڵی عەقیدە و، ئیسلام پابەندی ڕواڵەتی و ، عیبادەت پابەندی بە ئیسلامەوە لە و ڕووە وە کە مل کەچی و بەندایەتی یە بۆ خوا و ، تەقوا حاڵەتی دڵ و دەروون و لایەنی تەزکیە دەگرنەوە.

# دابەش بوونی خوا پەرستی بە سەر هەموو ئەندامەکانی جەستەدا [1]

دوای ئەوەی لە باسەکانی ڕابردوودا چەمك و واتای خوا پەرستی و گرنگی و پلە و پایەی و بەرهەم و شوێنەوارەکانیمان تا ڕادەیەکی باش بۆ ڕوون بۆوە ، خوا پشتیوان بێ لەم باسەش دا لە سەر تاپای جەستەی خۆمانەوە ڕادەمێنین داخوا چۆن چۆنی خوا پەرستی بەسەر هەموو ئەندامەکانی دا دابەش دەبێت !

جا ئێمە بۆ چۆنیەتی دابەش بوونی خوا پەرستی بەسەر جەستەی ئینسان دا باسی دە (١٠) ئەندامی جەستە دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە کە چۆن پێنج حوکمە شەرعیەکان کە پێویست بوون و حەڕام بوون و سوننەت بوون و نا پەسەند بوون و موباح بوون ( الوجوب و الحُرْمَةَ و النَّدْب و الكَرَاهَةَ و الأُبَاحَة ) ن ، بەسەر هەر کام لەو دە ئەندامەدا دە چەسپێن ، کە کۆی هەموو ئەو حوکمە شەرعی یانە و سەرجەمی هەموو ئەو (-پلە -انەی خواپەرستیی پەنجا (٥٠) حوکم و پەنجا پلەیە بەم جۆرەی خوارێ :

١-عەقڵ

٢-دڵ

٣-زمان

٤-گوێ

٥-چاو

٦-دەست

٧-لاق

٨-زار

٩-لووت

١٠-تێکڕای جەستە



---

[1] بۆ نووسینی ئەم باسە جگە لە خاڵی یەکەم (عەقڵ)، سوودم لە (مدارج السالكين)ی إبن القيم الجوزية وەرگرتووە، بەڵام بە لێ زیاد کردن و دەستکاری زۆرەوە، بڕوانە: ج١ ص١١٠ ت١٢٢.

ئنجا وەك گوتمان هەر كام لەم دە( ١٠) ئەندامە هەر پێنج حوكمە شەرعی یەكانی بەسەردا دەچەسپن، واتە هەر كامێكیان خوای پەروەردگار هەندێك شتی لەسەر فەرز كردووەو هەندێكی لێ حەرام كردوەو چەند شتێكی بە سوننەت بۆ داناوەو هەندێك شتیش بە نا پەسەند (مكروه)و هەندێك شتیش هیچ كام لەو چوار حوكمانەی نین و موباحە، جا ئەگەر بێت و ژمارەی ئەندامەكان لە ژمارەی حوكمە شەرعی یەكانیان بدەین، ئەنجامەكەی ئاوا دەردەچێ:

١٠ ئەندام × ٥ حوكم = پەنجا حوكم، كە بێگومان هەركام لەو پەنجا حوكمە شەرعی یە بە پلە (درجة)یەك لە پلە كانی خوا پەرستی(درجات العبودیة) دادەنرێ. جا ئێستا با بە ووردی سەرنج بدەین داخوا ئەركی بەندایەتی و خوا پەرستنی هەركام لەو دە(١٠) ئەندامەی جەستەمان چی یەو چۆنە! بەلام پێویستە ئەوە بزانین كە ئێمە لێرە نامانەوێ بە تێرو تەسەلی باسی ئەرك و خوا پەرستی یەكانی هیچ كام لەو دە(١٠) ئەندامە بكەین چونكە ئەوە كارێكی ئاسان نی یەو بەم برە توێژینەوەیەی ئێمە تەواو نابێت، بەڵكو لێرەدا زیاتر مەبەستمان ئامارە كردن و ئاگادار كردنەوەی خوێنەرانی بەرێزو خۆشەویستمانە بۆ چۆنیەتی خوا پەرست (عابد) بوونی ئەندامەكانی جەستە، بۆیە تەنیا ئەو شتانەی كە سەرەكی و بەر چاون و لە كاتی ئەم نووسینەدا بە بیرو زەینمان دا دێن، دەنووسین، بۆیەش لە بەرایی دا ئەم ڕاستیەم خستەڕوو، تاكو هیچ كەسێك وانەزانێ كە ئەرك و خوا پەرستی یەكانی ئەندامەكانی جەستە هەر ئەوانەن كەباسیان دەكەین، وە هیچ كەسیش ئەگەر شتێك یان چەند شتێكی دیكەی بە زەین دا هات نەیكاتە مایەی گلەیی و ڕەخنە:

**١- عـەقڵ ، ژیـری (العقـل)** : كە چەق و نێوەندی بیر كردنەوە و تێگەیشتن و كۆكردنەوەی زانیاری و زانراوە جۆراوجۆرەكانە.

یەك: ئەوەی لەسەری پێویستە: وەك: سەرنج دان و تێوە ڕامانی ((خۆ))و بوونەوەرو دەوروبەر كە ئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی ناوە چاكەكان و سیفەتە بەرزەكانی خوان، بە مەبەستی ناسینی خوای بەدی هێنەرو پەروەردگار، بۆ ئەوەی وێڕای ناسینی دڵ و فیطرەت زانین و تێگەیشتنی عەقڵ و حیكمەتیش پەیدا بێ و ناسینی خوا (معرفة الله) لە دڵ دا دامەزراوتر بێ. وە وەك بیر كردنەوەو تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت و ئەو زانیاریانەی پێیانەوە پەیوەستن، بایی ئەوەندە كە ئینسان ئەرك و فەرزەكانی سەر

شانی پێ جێ بە جێ بکات، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوەو چ لەڕووی هەموو لایەنەکانی دیکەی دینداری و مسوڵمانەتی یەوە، جا چ فەرزی عەین بن، چ فەرزی کیفایە، کە بێگومان لە نێو فەرزەکانی کیفایەدا حەوجێ نەبوونی مسوڵمانانە بە غەیری خۆیان بۆ هیچ شتێك[1] چونکە وەك زانایان گوتوویانە: ( ما لایتم الواجب الا به فهو واجب ) ، وە وەك ناسین و شارەزا بوونی دۆست و دوژمن و واقع و دەورووبەری نزیك و دوور ، بایی ئەوەندە کە بتوانێ ئەرکی سەر شانی خۆی بەرامبەر بە مسوڵمانان و دژی نا حەزانیان و ، خۆ پاراستن لە فێڵ و پیلانیان ، بەو شارەزاییە جێبەجێ بکات.

دوو: ئەوەی بۆ عەقڵ سوننەتە : وەك سەرگەرم کردنی عەقل و هۆش بە هەر شتێکەوە کە لە سەر مسوڵمان پێویست نیە ، بەڵکو ئەگەر بیکات ، یان بیزانێ خێری

---

[1] ( محمد ابو حامد الغزالی ) خوا لێی خۆش بێ لەو بارەوە لە کتێبی ( إحیاء علوم الدین) دا گوتوویەتی: (....فالعلوم التي لیست بشرعیة تنقسم إلی ما هو محمودٌ وإلی ما هو مذمومٌ وإلی ما هو مُباحٌ. فالمحمودُما یرتبط به مصالح امور الدنیا کالطب والحساب، وذلك یَنقَسِمُ إلی ماهو فرض کفایة وإلی ما هو فضیلة ولیست بفریضة. أ ما فرض الکفایة فهو علم مالایستغنی عنه فی قِوام امور الدنیا کالطب ..... فَلا یُتعجَب من قَولِنا إن الطب والحساب من فروض الکفایات، فإن اصول الصناعات ایضاً من فروض الکفایات کالفلاحة والحیاکة والسیاسة بل والحجامة والخیاطة...)ج١ ص٢٧. هیئه التالیف والتحقیق والترجمه فی دار الهادی ط ١٩٩٢/١ .

واتە : وە ئەو زانیاریانەی کە شەرعی نین – واتە لە ڕێی شەرعەوە پەیدا نەکراون – دەبنە سێ بەشەوە : ١- پەسەند کراو ٢- ناپەسەند ٣- موباح ، جا هەرچی جۆری پەسەندکراوە ئەوەیە کە بەرژەوەندیەکانی کار و باری دنیایی پێوە پەیوەستە وەك پزیشکی و ژمێریاری ، ئەویش دوو جۆرە : جۆرێکیان – پەیدا کردنی بەفەرزی کفایە دادەنرێ وە جۆرەکەی دیکەیان بە شتێکی باش و پەسەندبەلاَم – فەرز نیە ، جا هەر چی فەرزی کیفایە بریتیە لە زانینی هەر شتێك کە بەرێوە چوونی کار و باری ژیانی کۆمەڵگای پێوە پەیوەستە وەك پزیشکی ... نابێ کە سیش ئەو قسەیەمانی پێ سەیر بێ کە دەڵێین: پزیشکی و ژمێریاری لەفەرزەکانی کیفایەن : بەڵکو دیسان ئەسڵی فێر بوونی پیشەکانیش هەر فەرزی کیفایەن وەك جوتیاری و جولاَیی ( ڕستن و چنین ) و سیاسەتمەندی و بگرە کەڵە شاخ گرتنەوە و بەرگ دروینیش ... ( بەڵێ مسوڵمانان ئەگەر یەکیان لە سەر دەرزی یەکیش بکەوێ و بۆ دروست کردنی ئاتاجی غەیری خۆیان بن تێکرا گوناحبار دەبن چونکە فەرزێکی کیفایەیان چواندوە!! )

دەگات بەڵام بە پێچەوانەوە گوناحبار نابێت ، جا چ پەیوەندی بە تێوە رامانی بوونەوەر و دەوروبەر و خۆیەوە هەبێ ، چ بە تێگەیشتن و شارەزا بوونی ئایینی خواو، چ زانینی هەر زانیارییەك كە بەرەو پێش بردن و گەشە پێدانی كۆمەڵگای ئیسلامی لە ئەندازەی فەرز بەولاوە پەكی لە سەری كەوتوە ، بەڵام ئەگەر بێت و ئەو زانیاری و شارەزاییيە فەرزێك پەكی لە سەری كەوتبێ بۆ وێنە: بەرگری لە خۆ كردنی كۆمەڵگای ئیسلامی، یان ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەی خواو ڕوون كردنەوەی بۆ سەر جەم خەڵكی سەر زەوی و بیانوو بڕینیان ، ئەوەفەرزە نەك سوننەت!

سێ : ئەوەی لە عەقڵ حەرامە : دیارە زانین و پەی بردنی هیچ شتێك لە عەقڵ حەرام نیە، بەڵام ئەوەی كە حەرامە ئەوەیە كە عەقڵ و هۆش خەریك بكرێ بە بیر كردنەوە و نەخشەدانان بۆ شتی خراپ و زیانبەخش و پیس ، وەك پیلان گێڕان دژی ئیسلام و مسوڵمانان ، یان نەخشە كێشان بۆ ئەنجام دانی هەركارێك كە نا شەرعی بێت.

ئەگەر نا تەنانەت هەوڵدان بۆ پەی بردن بە جادووی جادووگەرانیش نەك حەرام نیە بگرە جاری وا هەیە فەرزیشە بۆ ئەوەی بەرپەرچی بدرێتەوە[1] ، بەڵام بە مەرجێك خوودی شارەزا بوونەكە شتی حەرام و ناشەرعی تێدا نەبێ ، ئنجا پێویستە ئەوەش بزانرێ كە لە كاتێك دا ئینسان عەقڵ و هۆشی بەشتێكی نا پەسەند و موباح بگرە بە سوننەتیشەوە خەریك كردبێ بەڵام لەسەر حسابی زانین و تێگەیشتنی شتێكی فەرز بێت ئەوە حەرامە نەك لەبەر خودی شتە ناپەسندو موباح و سوننەتەكە ، بەڵكو لە بەر ئەوەی لە سەر حیسابی شتێكی فەرزە و فەرزێكی بۆ چوێنراوە وەك ئەو كەسەی كە لە پایەكانی ئیمان وئیسلام یا هەرشتێكی تر كەلەسەری فەرزە بیزانێ،بێ ئاگایە كەچی بیرو هۆشی خۆی خەریك كردووە بە موتاڵای گۆڤار و ڕۆژنامەیەك یان كتێبێك ، یان تەماشا كردنی بەرنامە و فلیمێك ، كە بابەتێكی یان چەند بابەتێكی موباح و سوننەت وبگرە فەرزیشی تێدا یە ، چونكە لە نێو فەرزەكانیش دا گرنگ و گرنگ تر هەیە، دەبێ مسوڵمان وریابێ لە كاتێك دا فەرزێكی گرنگتر وەستا بێ خەریكی فەرزێكی گرنگیش نەبێ ، چ جای سوننەت و موباح !!

---

(١) دیارە مەبەست شارەزا بوونی جادوو مومارەسە كردنی نیە چونكە ئەوە هەر حەرامە بەڵكو ناسینی جۆر و شێوەكانیەتی ، كە بێگومان بە بێ ناسین و دەرك كردنی جۆر و شێوەكانی ناكرێ بەرپەرچ بدرێتەوە ، مەبەستیش لە بەرپەرچ دانەوە و هەڵوەشاندنەوەی جادوو پەنا بردنە بەر جادوونیيە ، بەڵكو بەكارهێنانی ڕێگا و وەسیلە شەرعییەكانە وەك جۆرەكانی دووعا.

چوار : ئەوەی بۆ عەقڵ نا پەسندە : وەك چۆن زانینی هیچ شتێك لە خودی خۆی دا لە عەقڵ حەرام نیە ، هیچ شتێکیش نا پەسەند (مکروه ) نیە، بەلاّم وەك لە خاڵی پێشەوە باسمان کرد ، سەرگەرم کردن و خەریك کردنی عـەقڵ بـەزانین و بیر کردنـەوەوە لـە دوو حـاڵەن دا خراپـە یـان ناپەسـەندە ، یەکـەم : ئەگـەر بـە نیـاز و مەبەستێکی خراپەوە بێت ، دووەم : ئەگەر لە سەر حیسابی شتێکی لە خۆی گرنگتر و پێویست تر بێت .

جا ئەوەی کە بۆ عەقڵ و بیر و هۆش ناپەسەندە پێیەوە خەریك بێـت ، ئەوەیـە کـە یەکەم : سەرگەرمی شتێك بێ کە بەلای کەمەوە زۆربەی زانایان بە ناپەسندیان زانیوە ، بۆ وێنە : شەترەنج و ئەو یاریانەی هاو وێنەینی ، دووەم : لە سەر حیسابی زانین و فێر بوون و شارەزا بوونی شتێکی سوننەت سەرگەرمی شتێکی موباح بێت ، جا ئەو سوننەتە چ سوننەتێکی عەینی بێت چ کیفائی [1] .

پێنج : ئەوەی بۆ عەقڵ موباحە [2] : خەریك بوونی بیر لێ کردنەوە و زانینی هەر شتێکە کە نە فەرز و سوننەت بێ و نـە حەرام و ناپەسـند ، ئینجـا وەك پێشـتریش تەئکیدمان کردەوە لە ئەسڵ دا پەی پێ بردن و زانینی هەر شتێك بۆ عە قڵ موباحە و شەرع هیچ کۆت و بەندێکی نەخستۆتە سەر عەقڵ و چالاکی‌یەکانی ، بەلاّم ئەوەی کە دەبێتە هۆی پاداشت لە سەر وەرگرتن و مەدح کران ، یان گوناحبار بوون و زەم کرانی ئینسان ، ئەوەیە کە لـە حاڵـەتی یەکـەم دا بە نیـاز و مەبەسـتێکی باشـەوە عـەقڵ و بیروزەینی ئاراستەی بیر لێ کردنەوە و زانینی شتێکی پێویست یان نا پەسەند بکات ، وە لە حاڵەتی دووەم دا ئاراستەی شتێکی حەرام یا ناپەسەند بکات ، یان بە نیازو

---

[1] سوننەتی عەینی وەك نوێژ و ڕۆژووی سوننەت و سیواك کردن ، سوننەتی کیفائیش وەك سەلام کردنی یەکێك لە نێو کۆمەڵێك دا ، بەلاّم دیارە وەلاّمی سەلام کردن فەرزی کیفایەیە .

[2] (( واجب ، فرض )) ئەوەیە کە لە سەر کردنی پاداشت و لە سەر نەکردنی گوناح هەیە و ، ( حرام ، محظور ) ئەوەیە کە لە سەر کردنی گوناح و لە سەر نەکردنی پاداشت و ، ( سنة ، مندوب ) ئەوەیە کە لە سەر کردنی پاداشت و لە سەر نەکردنی گوناح نیە و ، ( مکروه ) ئەوەیە کە لە سەر کردنی گوناح نیە و لە سەر نەکردنی پاداشت هەیە و ( مباح ) یش ئەوەیە کە نە لە سەر کردنی و نە لە سەر نەکردنی پاداشت و گوناح نیە.

مەبەستی خراپــەوە بــەکاری بـهێنی، بـا ئـەو شـتەی خـەریکی زانـین و بـیر لێ کردنەوەشیەتی لە خودی خۆیدا حەرام و ناپەسند نەبێ و بگرە فەرزو سوننەتیش بێ وەك ئەو کەسەی کە موتالأی قورئان و سوننەت و زانستە ئیسلامییەکان دەکات - بە خەیاڵی خاوی خۆی - بە مەبەستی ڕەخنە لێ گرتن و توانج و پلار لە ئیسلام و مسوڵمانان گرتن .

**٢- دڵ ( القلب )**[1]: کە نێوەندی هەست و نەستە وەك : خۆشویستن و بوغزاندن و کانگای هەڵوێستە وەك : ویستن و نەویستن و ئیمان و کوفر و یەقین و گومان .

پلە و حوکمەکانی خوا پەرستی ( عبادة ) ی دڵیش کە لە ڕاستی دا سەرۆك و پادشای وڵاتی جەستەیە ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : **( أَلا و انَّ في الجَسَدِ لَمُضْغَةً اذا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّه و اذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّه الَا و هي القَلْبُ)** رواه البخاري ،

*واته* : بزانن کە لە جەستە پارچەیەك هەیە ئەگەر باش بێ جەستە هەمووی باش دەبێ ، وە ئەگەر خراپ بوو هەموو جەستە تێك دەچێ ئەویش دڵە ، دیسان هەر بۆیەش جێی سەرنج و لێڕوانینی خوای پەروەردگاریش هەر (دڵ) ە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : **( ان الله لا يَنْظُرُ الىٰ أَجْسامِكُمْ و لا الىٰ صُوَرِكُمْ و لٰكِنْ يَنْظُرُ الىٰ قُلُوبِكُمْ )** رواه مسلم ، واتە: بێگومان خوا سەرنجی جەستە و دیمەکانتان نادات بەڵکو سەرنجی دڵەکانتان دەدات ، بەڵێ جا خوا پەرستی دڵ و پلەکانی ئەو خواپەرستییەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

---

[1] ئەم چوار وشەیە ( عقل ، قلب ، روح ، نفس ) کە بە : ( ژیری ، دڵ ، گیان ، دەروون ) ، لە زمانی کوردیدا ماناکراون ، لە ڕاستیدا چوار ناون بۆ یەك ناوبراو ( أربعة أَسْماءٍ لِمُسَمًّى واحِدٍ ) کە بریتیە لەو ڕووحەی کە خوا لە ڕێی فریشتەوە بە بەر جەستەی مرۆڤی دا دەکات ، جا لەو ڕووەوە کە شت دەرك دەکات و دەزانێ بە هۆی مێشکەوە عەقڵی پێ دەگوترێ، وە بەو ئیعتبارە کە بە هۆی دڵەوە شت قبوڵ یان ڕەفز دەکات و شتی خۆش یان ناخۆش دەوێ دڵی پێ دەگوترێ، وە لە بەر ئەوەی لەگەڵ جەستەدا تێکەڵ و ئاوێتەیە پێداویستییەکانی جێبەجێ دەکات و غەریزەکانی تێر دەکات نەفسی پێ دەوگوترێ ، وە لە و ڕووەوە کە دروست کراوێکی مەعنەوی و نا بەرهەستیتایبەتی خوایە گیان ( ڕوح ) ی پێ دەگوترێ ، بەڵام هەتا ئێستا هیچ کەس بەوردی نازانێ چۆنیەتی و حەقیقەتی پەیوەندی ڕووح لەگەڵ مێشك و دڵ و جەستەدا بە چ شێوەیەکە و تەنیا شوێنەوار و بەرهەمەکانی ئەو پەیوەندییانە دەزانین .

یەك : ئەوەی لە سەر دڵ پێویستە : وەك : ئیمان بە هەموو پایەکانییەوە ، یەقین ، ئیخلاص ، پشت بە خوا بەستن ( التوكل ) ، خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی و هەرچی ئەوان فەرمانیان بە خۆشویستنی کردوە، ئومێد هەبوون بە خوا ، ترس و سام و شەرم بەرانبەر بە خوا ، خۆڕاگری ( الصبر ) ، گەڕانەوە ( الأَنابَة) لای خوا ، نیاز و مەبەست ( النیة و القصد ) بۆ خوا پەرستی و کردەوەی خێر و چاکە ، ڕازی بوون لە خوا لە بواری قەزا و قەدەر دا ، هەروەها دڵسۆزی و خۆشەویستی و پەرۆش و خەم خواردن و بە تەنگەوە بوونی ئەهلی ئیمان و ، ڕق و بوغز و دوژمنایەتی بۆ ئەهلی کوفر و نیفاق و خراپە ی خراپەکاران .

دوو: ئەوەی بۆ دڵ سوننەتە: هەموو ئەو کردەوانەی دڵ ( اعمال القلب ) کە سەرەکییەکانیانمان لە خاڵی یەکەم باس کرد ، بە شێکیان کە ئەسڵ و بنەڕەتیانە پێویستە و ، کامڵ کردن و تەواو کردنیشیان سوننەتە کە زانایانی تەزکیە و ئەخلاق بە دوو وشەی : (واجِبٌ مُسْتَحقٌ )[1] واتە : پێویستیەکی بەهەق دانراو ، وە ( كَمالٌ مُسْتَحَبٌ ) واتە : تەواوییەکی پەسەندکراو ، تەعبیریان لێ داونەوە بۆ وێنە : خۆڕاگری ( صبر ) لە سەر ئەو شتانەی کە فەرزە ئینسان صەبریان لە سەر بگرێ لە هەرسێك بواری : خۆڕاگری بۆ ئەنجام دانی فەرمانبەری (الصبر علی الطاعة) و ، خۆڕاگری لە سەر سەرپێچی نەکردن (الصبر علی المعصیة) خۆڕاگری لە بەرانبەر قەزا و قەدەر دا (الصبر علی الأَقْدار ) ، پێویستە ، بەڵام خۆڕاگری لە سەر ئەنجام دانی سوننەت و دووره پەرێزی لە شتی ناپەسەند ئەوە سوننەتە. هەروەها باقی خەسڵەت و کردەوە دەروونییەکانی دیکەش بە هەمان شێوە ، ئەو ئەندازەیەیان کە بۆ ئەنجام دانی فەرزەکان و دووره پەرێزی لە حەرامەکان مەرجە ، بە پێویست دادەنرێ و باقییەکەشیان کە بۆ ئەنجام دانی سوننەتەکان و خۆ پاراستن لە نا پەسندەکان بە مەرج گیراوە سوننەتە .

---

[1] یەکێك لەو زانایانە ( ابن قیم الجوزیة) یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ، بڕوانە: ( مدراج السالكین ) ج١ ص ١١٠.

سێ : ئەوەی کە لە سەر دڵ حەرامە: پێچەوانەی ئەوانەیە کە لە سەری پێویستن ، کەواتە هەرکام لە کوفر بە هەموو شێوەکانی یەوە وەك : بڕوا بە هیچ نەبوون (الأُلحاد) و شیرك و نیفاق و ، بە درۆزانین ( التكذيب) و دان پێدانە هێنان ( الجحود ) و خۆبەزلگرتن ( الأُستكبار ) و نەزانین ( الجَهْل ) و دوودڵی ( الشَّكّ ) و پشت تێ کردن ( الأَعْراض ) ، وە ڕیابازی و، پشت بە غەیری خوا بەستن و ، هەبوونی خۆشەویستی و ، هیوا و ئومێد و ، ترس و سام ، شەرم و شکۆ بەرانبەر بە غەیری خوا بە ئەندازەی ئەوانە بۆ خواو ، خۆ ڕانەگری و ، نەگەڕانەوە لای خوا و ، ڕازی نەبوون لە خوا لە بەرانبەر قەزا و قەدەری دا ، ...... ئەمانە هەموویان و هاو وێنەکانیان لە سەر دڵ حەرام و قەدەغەن، جا هەیانە بە کوفریش دادەنرێ و هەشیانە بەس گوناح و تاوانە و پێی کافر نابێ ، دیسان حەسەد و خیانەت و بوغزو کینە و بێ خەمی و بایەخ پێنەدانی ئەهلی ئیمان و دڵسۆزی و خۆشویستن و دۆستایەتی ئەهلی کوفر و نیفاق و بێ هەست و نەستی و بێ هەڵوێستی لە ئاقار گوناح و خراپەی خراپەکاران داو ، خۆ پەسەند کردن و خۆ بەزلگری و فیز و کەشخە و شانازی کردن و ، لە بەزەیی خوا نائومێد بوون و لە سزا و تۆڵەی خوا دڵنیا بوون و ، دڵخۆش بوون بە زیانی مسوڵمانان و دڵتەنگ بوون بە قازانج و سودیان ... ئەمانەش هەموویان لە سەر دڵ حەرامن و مایەی گوناحباری و شەرمەزاری و ، بگرە هەندێکیشیان هۆی لە بازنەی ئایین دەرچوون و کافر بوونیشن !

چوار : ئەوەی کە بۆ دڵ نا پەسندە : هەموو ئەو شتانەن کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ مسوڵمانانیان لێ ئاگادار کردوونەوە کە توخنیان نەکەون و خۆیانیان لێ بپارێزن بێ ئەوەی لێیان قەدەغە بکەن ، جا لە ڕاستی دا زانایان لە سەر سنووری نێوان حەرام و نا پەسەند لە زۆربەی شتەکان دا کێشەو جیاوازی بیرو ڕایان زۆرە ، گەلێك شت هەیە هەندێکیان بە حەرام و هەندێکی دیکەیان بە نا پەسەند (مکروه ) ی دادەنێن ، بەڵام دەتوانین ، وەك بنچینەیەکی گشتی بڵێین : هەروەك چۆن خەسڵەت و کردەوە فەرزەکانی دڵ بریتین لە بەشی بنەڕەتی و سەرەکییان و ، بەشی تەواوکەر ( مُكَمِّلْ ) یشیان سوننەتە ، بەشی سەرەکی و پێکهێنەری خەسڵەت و ڕەفتارە پیس و بەدەکانی دڵیش حەرامە و ، لای کەم و پلەی خوارەوەشیان کە ئینسان بە زەحمەت خۆی بۆ لێ دەپارێزرێ ، وەك کەمێك لە حەسەد و خۆ بە زلگری و

ڕیابازی و خۆزگە خواستن بە هەندێك جۆرە گوناح و ... هتد ئەوە شتێکی نا پەسندە! بەڵام بێگومان جۆرەکانی کوفر لەم بنچینەیە بەدەرن .
چونکە بێگومان بە تێوەڕامانی فەرمان پێکراو و نەهی لێ کراوەکان بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خوای میهرەبان و کاربەجێ هەرشتێك سوود و قازانجێکی هەبێ کە بە نەبوونیەئینسان زیانی لێ بکەوێ و کەلێنی تێ ببێ ئەوە فەرزی کردووە ، بەڵام هەرشتێك باش بێ بەڵام ئەوەندە گرنگ و پێویست نەبێ و هەموو کەسیش پێی نەکرێ ئەوە بەس بە سوننەتی داناوە ، وە بە پێچەوانەوە هەرشتێك هێندە خراپ و زیانبەخش بێت کە حاڵ و باڵی ئینسان لە دنیا و قیامەت دا یان لە یەکێکیان[1] دا تێك بدات ئەوە حەرامی کردووە و ، ئەگەر هێندەش زیانەکەی کاریگەر نەبێ و هەموو کەسیش توانای خۆ لێ پاراستنی نەبێ ئەوە بە نا پەسندی داناوە!کەواتە جیاوازی نێوان کردەوە و خەسڵەتە سوننەت و کردەوە و خەسڵەتە نا پەسەندەکانی دڵ ئەوەیە، کە هەرچی سوننەتەکانن ئەو ئەندازەیەن کە کردەوە و خەسڵەتە باشە فەرزەکانی دڵیان پێ تەواو و کامڵ دەبن ، بەڵام نا پەسندەکان ئەو ئەندازەیەن کە هێندە نین و بایی ئەوە ناکەن کە کردەوە و خەسڵەتە خراپە حەرامەکانی دڵیان پێ بێنەدی و بنیات بنرێن ، کەواتە سوننەتەکان لە کۆتایی فەرزەکانەوە دێن بۆ تەواو کردن و کامڵ کردنیان ، بەڵام نا پەسندەکان لە سەرەتاو سەرهەڵدانی قەدەغە کراوەکانەوە دێن بۆ هێنانەدی و بنیات نانیان ، بەڵام هەتا پێهەلاتر نەچن و پێ نەنێنە قۆناغێکی دیکەوە بایی سەرهەڵدان و پێکهێنانیان ناکەن، بۆیە کردنیان چاوپۆشی لێ کراوە و گوناح نییە ، بەڵام خۆ لێ پاراستنیان خێرە و پاداشتی هەیە ،

پێنج : ئەوەی کە بۆ دڵ ڕەواو موباحە : بریتیە لە هەڵس و کەوتی دڵ بە باری ئیجابی و سەلبی دا لەگەڵ ئەو شتانە و ئەو حاڵ و خەیاڵانەدا کە هیچ کام لە چوار حوکمەکان : (فەرز و سوننەت و حەرام و ناپەسەند ) یان بە سەردا نا چەسپێن ، بۆ وێنە: خۆ شویستنی گوڵ و ڕێحان و بۆغزاندنی مار و دووپشك !

---

[1] مەگەر بەدەگمەن دەنا هیچ شتێك نیە خوا لە ئینسانی قەدەغە کردبێ و وێڕای دنیا زیانی قیامەت و وێڕای قیامەت زیانی دنیاشی تێدا نەبێ .

٣- **زمان ( اللسان ) :**

کە ئامرازی[٢] دەربڕین و ڕوونکردنەوە و ڕاگەیاندنی مەبەست و دان پێداهێنان (الأُقرار ) و پێ لێنان (الأعتراف)ە .

ئەرك و خوا پەرستی‌یەکانی زمانیش بە پێی پێنج حوکمەشەرعی‌یەکان بەم شێوەیەی خوارەوەن :

یەك : ئەوەی لە سەر زمان پێویستە : وەك بێژتن و دەربڕینی دوو شایەتمانەکان ( التَّلَفُّظ و النُّطْقُ بالشَّهادَتَيْن )، وە خوێندنی ئەو ئەندازەیەی کە لە سەری پێویستە بۆ دروست بوونی نوێژەکەی ( ما تَتَوَقَّفُ عَلَيْهِ صِحَّةُ صَلاتِهِ ) لە قورئان وە خوێندنی ئەو زیکرانەی کە فەڕزە لە نوێژدا بگوترێن وەك زیکرەکانی ڕکووع و کڕنووش و تەحیات خوێندن و ...... هتد ، وە وەڵامدانەوەی سەلام ، وە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە ، وە فێرکردنی نەزان لە فەڕزەکای ئایین و ، شایەدی دانێك کە بۆتە فەڕزی عەین و ،ڕاست گۆیی و ، بەرگری کردن لە ئایین و بەرپەرچ دانەوەی تیر و توانجی ناحەزان لە کاتێك دا بوبێتە فەڕزی عەین ..... هتد ،

دوو: ئەوەی بۆ زمان سوننەتە : وەك بەردەوام یادی خوا کردن و قورئان خوێندن و دەرس گوتنەوە و باس و خواسی زانستەکان کە جێبەجێ کردنی فەڕزێك یەکی لە سەریان نەکەوتووە ، وە بانگەواز و ئامۆژگاری کردنی خەڵك لە هەر بوارێك دا کە پێی سوودمەند بن ، وە لە سەر کردنەوەی ئیسلام و بەرگری لێ کردنی لە کاتێکدا خەڵکی تریش هەیە بەو کارە هەستێ و نەبۆتە فەڕزی عەین .

سێ : ئەوەی لە زمان حەرام و قەدەغەیە : هەر شتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان ناخۆش بێ بێژرێ وەك جۆرەکانی کوفر و شیرك و بیدعەت و ، بوختان کردن و قسە هێنان و بردن ( النَّمِيْمَـة ) و جادوو کردن و خۆ هەڵکێشان و نهێنی درکاندن و ، جنێودان و گاڵتە کردن بە مسوڵمانان و ناوو ناتۆرە لێ هەڵدان و زەم و غەیبەتیان- هەروەها نامسوڵمانانیش مەگەر لە حاڵەتی جەنگ دا و بە پێی پێویست و لە سنوری شەرع و ئادابەکانی دا – وە درۆ و دەلەسە و ، شایەدی دانی بە درۆ (شَهَادَةُ الزُّور ) و بە ناوی خواو ئایینی خواوە قسەکردن بە بێ زانیاری ، وە لە کاتی

---

[٢] زمان ئامرازی چێژتنی ( ذَوْق ) یشە بەڵام لە باسی زار ( فَمْ ) دا باسم کردوە .

جەنگ دا بلاو کرنەوەی پڕ و پاگەندە و قسە و قسەلۆکی وا کە ترس و دلە ڕاوکێ لەنێو مسولمانان دا پەیدا بکات کە ئەمە عادەتی مونافیقەکان بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا ... هتد .

چوار : ئەوەی بۆ زمان نا پەسندە بیلێ : هەر قسە و دەربڕینێکە کە واز لێ هێنان و نەگوتنی باشتر بێت لە بێژتنی ، هەر چەندە سزاو تۆلەی لە سەر نیە و خاوەنەکەی گوناحبار نابێ ، ئینجا وەك پێشتریش گوتمان سنوور و نێوانی حەرام و نا پەسەند لە زۆربەی شتان دا یەکجار وردە و بە هەموو کەس نا دۆزرێتەوە ، بە تایبەت جم و جۆلی زمانیش کە بە ڕاستی زۆر مەترسی دارە و وریایەکی تەواوی پێویستە.

پێنج : ئەوەی کە بۆ زمان موباحە: بێژتنی هەموو قسە و وشەیەکە کە هیچ کام لە چوار حوکمەکان ( فەرز ، سوننەت ، حەرام ، نا پەسەند ) پەیوەندیيان پێیەوە نیە ، وەك هەموو ئەو قسە و باسە ئاسایيیانەی کە خەلك لە ژیانی ڕۆژانەیان دا پێکەوە دەیانکەن ، هەرچەندە خەلك لە قسە و باسە ئاسایيیەکانیشیان دا مەگەر چۆن دەنا بەهۆی ڕەچاو نەکردنی سنوور و ئادابەکانی شەرع خۆیان دووچاری چەندان جۆرە گوناح و تاوانی زل و گچکە دەکەن .

ئێستاش با چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەربارەی گرنگی و مەترسی بەکارهێنانی زمان و لێ وریا بوونی بهێنینەوە :

أ- ( ..من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ ) متفق عليه ، واتە :
هەرکەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با چاکە بلێ یان بێ دەنگ بێت .

ب- ( مَنْ يَضْمَنْ لي ما بَيْنَ لِحْيَيْهِ و ما بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ ) متفق عليه ، واتە :
(هەرکەسێك ئەوەی نێوان ڕیش و سمێلی و ئەوەی نێوان دوولاقەکانی بۆمن - لە خراپە - بپارێزێ دەستەبەری بەهەشتی دەبم ) . ( دیارە مەبەست زمان و داوێنە)

ج- ( ان العَبْدَ ليَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ رِضْوانِ الله تعالىٰ ما يُلْقي لَها بالاً يَرْفَعُهُ الله بِها دَرَجاتٍ ، و ان العَبْدَ ليتكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ الله تعالىٰ لا يُلْقي لَها بالاً يَهْوِي بِها في جَهَنَّمَ ) رواه البخاري .

واتە : جاری وا هەیە بەندە قسەیەك لە ڕەزامەندی خوای بەرزدا دەکات و پێی گرنگ نیە بەلام خوا چەندان پلە بەو قسەیە بەرزی دەکاتەوە ، جاری واش هەیە بەندە قسەیەك لە توڕەیی و و نارەزایی خوای بەرزدا دەکات و ئەمیەتی پێ نادات بەلام پێی سەرەو ژێر دەبێتە نێودۆزەخەوە .

٤- گویٚ ( السَّمْع ) : کە تۆڕ و شەداوی گرتن و کۆکردنەوەی دەنگە بیستراوەکان ( المسموعات) ە بە هەموو جۆر و شێوەکانیەوە .

یەك : ئەوەی لە سەر گویٚ پێویستە بیبیستیٚ : وەك هەر شتێك کە خوای بیٚ وێنە و پێغەمبەری بەڕێز ﷺ پێویستیان کردوە گویٚی بۆ بگیریٚ و وەربگیریٚ ، وەك پایە و بنچینەکانی ئیسلام و ئیمان ، وە گویٚ گرتن بۆ قورئان خوێندنی ئیمامی نوێژ لە نوێژە دەنگ تێدا بەرز کراوەکان ( الصلوات الجهرية ) دا، وە گویٚ هەڵخستن بۆ وتاری نوێژی جومعە و جەژنەکانی رەمەزان و قوربان چونکە خواپەرستیی سوننەتیش کەدەستت پیٚ کرد پێویستە تەواوی بکەی و ئاداب و سنوورەکانی رەچاو بکەی ، وە گویٚ گرتن بۆ ئامۆژگاری دڵسۆزان و قسەی حەق و رەخنە و پێشنیاری بەجیٚ و شەرعی‌یانە چونکە مادام هەق وەرنەگرتن و نەبیستنی و رەت کردنەوەی خەسڵەتی خۆ بەزلگران بیٚ و حەرام بیٚ ، دەبیٚ وەرگرتن و بیستنی پێویست بیٚ تاکو گیرۆدەی ئەو حەرام و گوناحە نەبیٚ ، دیارە پێغەمبەریش ﷺ لە پێناسەی خۆ بەزلگریٚ فەرموویەتی :( الكِبْرُ بَطَرُ الحَقِّ و غَمْطُ الناس) رواه البخاری واتە : خۆ بەزلگرتن رەت کردنەوەی هەق و بەکەم سەیر کردنی خەڵکە .

دوو: ئەوەی بۆ گویٚ بیستنی سوننەتە : وەك بیستنی خوێنرانی قورئان لە حاڵێك دا بە بیستنی یان ئەنجامدانی خواپەرستیی‌یەکی تری وەك خۆی یان گەورەترەوە خەریك نەبیٚ ، وە بیستنی زانیاری‌یەك کە فەرز نیە ، وە گویٚ ڕاگرتن لە زیکری خوا ، وە گویٚ گرتن لە هەر شتێکی تر کە خوای میهرەبان رەزامەندی لە سەرە بەڵاّم فەرزی نەکردوە و ... هتد .

سیٚ : ئەوەی کە بیستنی لە سەر گویٚ حەرامە: دیارە هەرچی بیستنی لە سەر ئینسان پێویستە پێچەوانەکەی حەرامە مەگەر بە مەبەستی زانین و لیٚ حاڵی بوونی و پاشان بەرپەرچ دانەوە و هەڵوەشاندنەوەی گویٚی لیٚ بگریٚ ، دیسان هەموو ئەو گۆرانی‌یانەی کە وشە و تەعبیری ناشەرعی و بیٚ نەزاکەتیان تێدایە، یان بە جۆرێکی حەرام باسی ئافرەت بە گشتی ، یان بە هەر شێوەیەك باسی ئافرەتێکی دیاری کراو دەکەن ، یان باسی شتی پیس و حەرام وەك شەراب و قومار و ..... هتد دەکەن ، هەروەها ئەو جۆرە ئاواز و مۆسیقایانەی کە غەریزەی شەڕ و خراپە لە مرۆڤ دا

دەجوڵێنن و بەرەو گوناح و لادان پەلکێش و بگرە سەرخۆشی دەکەن ، هەروەها ئەو سروود و قەصیدانەی بە جۆرێك بە شێخێك یان هەر کەسێکی دیکە هەڵدەڵێن کە دەچێتە ڕیزی هاوبەش بۆ خوادانان ، بە هۆی زێدە ڕۆیی کردن لە بە گەورە گرتن و مەدح و پێدا هەڵگوتن دا.

چوار : ئەوەی کە بیستنی بۆ گوێ ناپەسەندە : کە بریتیە لە بیستنی هەر قسە و دەنگ و سەدایەك کە شەرع حەزی پێ ناکات و پەسەندی ناکات بەڵام حەز پێ نەکردنەکەشی بە ئەندازەیەك نیە حەرامی کردبێ و تۆڵە و سزای بۆ دانابێ .

پێنج : ئەوەی کە بۆ گوێ -موباح - ڕەوایە ببیستێ : کە بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی بە بەڵگەیەکی شەرعی ڕوون و بێ چەند و چوون نەچوونەتە خانەی فەڕز و سوننەت هەتا پاداشتیان هەبێ و ، لە ڕیزی حەڕام و ناپەسندیش نین تاکو سزا و هەڕەشە یان گلەیی و خێر لە دەست چوونیان بە دواوە بێ .

٥- **چاو ( البصر )** : کە تۆڕ و داوی ڕاوکردن و کۆکردنەوەی وێنە بینراوەکان (الصور المرئية) ە بە گشت شێوە و دیمەن و قەبارەکانیانەوە .

یەك : ئەوەی پێویستە چاو تەماشای بکات و سەرنجی بدات : وەك لێڕوانین و سەرنج دانی قورئان و سوننەت و ، کتێب و سەرچاوەکانی ئەو زانستە شەرعی و غەیرە شەرعی‌یانەی[1] کە زانیاری‌یەکیان تێدایە و ئەنجام دانی ئەرکێکی پێویست پەکی لە سەری کەوتووە، جا ئەو ئەرکە چ پەیوەندی بە کار و باری دینداری (تَعَبُّد ) یەوە هەبێ ، چ دنیاداری ( تَمَدُّن ) ، چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە لە ئیسلام دا دەبێ دینداری و دنیاداری (التعبد و التمدن) بە پێی شەرع و بەرنامەی خوا بن و ، ناگونجێ لە یەك جیابن، وە سەرنج دان و تێوەڕامانی و وردبوونەوەی ئینسان لە خۆی

---

[1] مەبەستم لە زانستە غەیرە شەرعی‌یەکان ئەو زانستانەن کە لە ڕێگای عەقڵ و ئەزموونەوە وەدەست هاتوون ، وەك گەردووناسی و فیزیا و کیمیا و پزیشکی گەری ... دیارە زانستە شەرعی‌یەکانیش لە ڕێی وەحی‌یەوە پەیدا بوون ، کەواتە کەس وا تێنەگات کە زانستە شەرعی‌یەکان و غەیرە شەرعی‌یەکان دژن ، چونکە شەرع فەرمانی کردوە بەوەدەست هێنانی هەموو زانیاری یەکی سوود بەخش ، مادام وابێ دەتوانین : بڵێین زانستە غەیرە شەرعی‌یەکانیش کە لەکۆمەڵگایەکی ئیسلامی دا سەر هەڵدەدەن بەو ئیعتبارە کە شەرع فەرمانی پێ کردوون زانستی شەرعیین ، بەڵام لەو ڕووەوە کە سەرچاوەی پەیدا بوونیان لێك جیایە ، جیاکراونەوە ، ئینجا بێگومان ( ناشەرعی ) و (غەیرە شەرعی ) یش زۆر جیاوازن ، وە نابێ تێکەڵ بکرێن.

و دەوروبەری و بوونەوەر ، هەم بۆ چاكتر دەرك كردن و پەی بردن بە نهێنییەكانی سروشت و وردەكارییەكانی بە مەبەستی زیاتر ئاشنا بوون و شارەزا بوون بە كتێبی بینراوی خوا ( كتاب الله المنظور ) و چاكتر خواناسین و ئیمان پتەو تر بوون ، وە هەم بۆ دۆزینەوەی یاساكانی خوا لە سروشت دا ( سنن الله في الطبيعة ) بە مەبەستی باشتر كەڵك و بەهرە وەرگرتن لە سروشت و بوونەوەر ، كەخوای زاناو پەنهان بین لە چەندان ئایەت دا فەرمانی پێ كردووین كە لە بوونەوەر و دەروبەر و خۆمانەوە رامێنین[9] ، وە پێی ڕاگەیاندووین كە ئاسمانەكان و زەوی و هەرچی تێیاندایە بۆ سوود و كەڵك لێ وەرگرتنی ئێمەی مەیسەر كردوون ، وەك فەرموویەتی : (و سَخَّرَ لَكُمْ ما في السَّمٰوات و ما في الأَرض جميعاً مِنْهُ .... ) الجاثية، واتە : وە - خوا - هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە لە لایەن خۆیەوە بۆ ئێوەی مەیسەر كردوە. هەروەها لە سەرچاو پێویستە كە وردبێتەوە و سەرنج بدات بۆ لەیەك جیاكردنەوە و هەڵاواردنی حەڵاڵ و حەڕام و پاك و پیس و سوودبەخش و زیانبەخش لە خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و هەر

---

[9] بۆ وێنە : أ - ( فَلْيَنظر الإنْسانُ مِمَّ خُلِقَ ) الطارق - ٥- , واتە : دەبا ئینسان سەرنج بدات لە چی دروست كراوە !( بێگومان بۆ جێبەجێ كردنی ئەم فەرمانەی خواش زانیارییەكانی پزیشكی ( الطب ) و توێكاری (تشريح ) و كۆرپە ناسی ( علم الأَجِنَّة ) پێویستن.

ب- (فَلْيَنظُرِ الإنْسانُ الىٰ طعامِهِ ) عبس - ٢٤- , واتە : دەبا ئینسان لە خواردنەكەی رامێنێ! ( دیارە مەبەست چۆنیەتی دروست بوونی خواردن و خۆراكە كە سەرجەم لە ڕووەك و گیانداران پێك دێ و ئەمیش پێویستی بەو زانیارییانە دەكات كە لە جۆرەكانی ڕووەك و دار و درەخت و جۆرەكانی گیاندارانی نێو ئیشكانی و دەریا دەكۆڵنەوە ، واتە : ڕووەك ناسی و زیندەوەر ناسی و لقەكانیان).

ج- ( أَوَ لَمْ ينظروا في مَلكوتِ السَّمٰوات و الأَرضِ و ما خَلَقَ الله مِنْ شَيءٍ... ) الاعراف -١٨٥ - ، واتە : ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵكی گەورەی ئاسمانەكان و زەوی و هەر شتێك كە خوا دروستی كردوە !! ( دیارە بۆ جێبەجێ كردنی ئەم فەرمانە خواییەش سەرجەم لقەكانی زانستە سروشتییەكان پێویستن هەر لە گەردیلە ناسی ( عِلْمَ الذرَّة) ەوە هەتا گەردوونناسی ( عِلْمُ الكَوْن ) ! وە هەرچەندە مرۆڤ بە میكرۆسكۆب و تەلیسكۆبەكانی خەریكی لێكۆڵینەوە بێت لە ورد و درشتی كائیناتی خوا ، ئەگەر نیاز و مەبەستی چاك بێ ئەوە هەر سەر گەرمی خوا پەرستییە بە هۆی جێبەجێ كردنی ئەم فەرمانەی خوای پەروەردگار!)مەبەستیشم لە نووسینی ئەم پەراوێزە ئەوەبوو كە هەم ئێمەی مسوڵمان تێ بگەین چەندە كەمتەرخەمین لە جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی خوا لە بواری زانستە سروشتی و ئەزموونییەكان ( العلوم الطبيعية و التجريبية ) دا وە هەم ئەوانەش كە ئیسلام ناناسن و بە نەزانی تۆمەتی ئایدیالی (میثالی) بوون و دژی زانست بوونی پاڵدەدەنە لا ، تێ بگەن چەندە لە ئیسلام بێ هەواڵن و بەكجار فەقیر حاڵن!

شمەك و كەل و پەلێكی تر كە دەیەوێ بەكاریان بێنێ، وە لە سەری پێویستە كە لەو سپاردە ( امانة )انـــە وردبێتـەوە و ڕامێنـێ كـە لـە لای دادەنرێـن بـۆ ئـەوەی بـە هەڵەدانەچێ لە تەسلیم كردنەوەیان بە خاوەنەكانیان ، وە .... هتد .

دوو: ئەوەی كە سەرنج دان و لێ ڕوانینی بۆ چاو سوننەتە : وەك موتالاّ و لێ ڕوانینی ئەو كتێب و سەرچاوانە و ، ئەو دیمەن و دیاردە سروشتی‌یانەی كە سەرنج دان و تەماشاكردنیان دەبێتە هـۆی زیـاد بـوون و كـامڵ بوونـی ئیمـان و یـەقین و شارەزایی دەربارەی ئیسلام، وە هەر شتێكی دیكە كە لە بواری دینداری و دنیاداری‌دا مایەی كەڵك و سوودە ، وە تەماشا كردنـی قوڕئـان ( مُصْحَفْ ) ، وە سـەیر كردنـی ڕووی باب و دایك و هاوسەر و ، ڕووی زانا و پیاو چاكان.

سێ : ئەوەی كە لە چاو حەڕامە تەماشای بكات : وەك لێڕوانینی دەم و چاوی ئافرەتانی بێگانە بە ئارەزووە وە[1]، وە تەماشا كردنی عەوڕەتی پیاوان و ئافرەتان بە موتڵـەقی، مەگـەر عوزرێكی شـەرعی هـەبێ وەك چارەسـەر و ( عِلاجْ ) و قوتاركردن لـە بەلاّ و تەنگانەیەك ، وە تەماشاكردنی ماڵی خەڵكی لە درزی دەرگا و پەنجەرەوە یان بە هەر شێوەیەكی دیكە، وە ئەم گوناحە هێندە زل و ناقۆلاّیە تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ چاوكوێر كرانی ئەو كەسەشی بەڕەوا داناوە ، كە بەبێ هـەق و مۆڵـەتی شـەرعی سەرنجی ماڵ و حاڵی خەڵكی دەدات وەك فەرموویەتی : ( مَـنْ اطَّلَـعَ في دارِ قَـوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَفَقَأوا عَيْنَهُ فَقَدْ هُدِرَتْ عَيْنُهُ ) متفق عليه ، واتە: هەركەسێك تەماشای ماڵی كۆمەڵێك بكات بـەبێ ئاگاداری و مۆڵـەتیان و چاویان كوێر كـرد ، ئـەوە چاوەكـەی بـە بـەلاش ڕۆیوە و تۆڵە و خوێنی نیە[2].

هەروەها لە سەر چاو حەڕامە كە بە شێوەیەك سەرنجی پێ لە مسوڵمانێك بدرێ كە ببێتەمایـەی ترسـاندنی ، كـە لـە كـوردی دا ( مۆڕبوونـەوە ) ی پـێ دەڵێـن :

---

[1] هەندێك لە زانایان تەماشا كردنی ئافرەتی نامەحرەم بە موتڵەقی ، واتە بە ئارەزوو یان بێ ئارەزوو بە حەڕام دادەنێن ، بەلاّم ئەو ڕایە بەهێز ترە كە بەبێ ئارەزوو ئەگەر بۆ كارێكی پێویست بێ وەك دادگایی، چارەسەری نەخۆشی ، شایەدی دان ، كڕین و فرۆشتن .... هتد ئەوە موباحە ئەگەر نا نا پەسندە.

[2] (شافعی و احمد ) ڕەحمـەتی خوایان لێ بێ ڕایان ئەوەیە كە نوسیومانە بەلاّم ( ئەبو حەنیفە و مالك ) خوالێیان خۆش بێ ڕایان وایە كە بژاردن (أَرْش ) ی لە سەرە ، بەلاّم ڕای ( شافعي و أحمد ) بەهێزترە ، بڕوانە : ( روائع البيان تفسير آيات الأحكام ) ج ٢ ص ١٣٩-١٤٠.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی : ( مَنْ نَظَر الىٰ مُسْلم نَظْرَةً يُخيفُهُ بها في غَيْرِ حَقٍّ أخافَهُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ) رواه الطبراني و الخطيب ، واتە : هەر کەسێك بەڕوانینێك بڕوانێتە مسوڵمانێك کە بیترسێنێ بێ ئەوەی هەقێکی هەبێ ، خوا لە ڕۆژی دوایی دا دەیترسێنێ ، یان بە جۆرێك سەرنجی کەسێك بدات کە بە سووك دانان و گاڵتە پێ کردنی تێدا بێ ، چونکە ( لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ ) الحجرات -١١- ، بە هەر شێوەیك بێ دەیگرێتەوە ، هەروەها ڕوانین بۆ هەرشتێك وەك : نامە ، نێو جانتا ، نێو ژوور .... کە بابای خاوەنی نهێنییەکی تێدا هەڵگرتووە و حەز ناکات کەس ببینێ ، وەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتە: ( مَن نَظَرَفي كتابِ أخيْهِ بغَيرإذنه فإنما يَنظرُ في النّار) رواه ابو داود. واتە:هەرکەسێك تەماشای نامەی برایەکی بکات بەبێ مۆڵەتی وی ، ئەوە بێگومان تەماشای ئاگری دۆزەخ دەکا. (هەرچەندە ئەم فەرموودەیە بەلاواز (ضعیف) دانراوە بەڵام نێوەڕۆکەکەی ڕاستو ڕەوایەو گرێی تێدا نیە ).

چوار: ئەوەی بۆ چاو ناپەسەندە لێی بڕوانێ : ئەو لێڕوانینو سەرنج دانانەی کە نە جێبەجێ کردنی شتێکی پێویست نە شتێکی سوننەت پەکی لەسەریان نەکەوتوە بۆ وێنە: تەماشا کردنی دەم وچاوی ئافرەتان بەبێ ئارەزووکردنو بەبێکارێکی پێویست یان سوننەتیش کە ببێتە پاساو (مُبَرِّر) یان وەك پێشتر باسمان کرد ، بۆیەش ئەو ڕوانینە نا پەسەندە چونکە ڕەنگە سەربکێشێ بۆ ڕوانینی حەرام کە سەرنج دانی بە ئارەزووەوەیە ئنجا شایانی باسە کە چاو تێهەڵەنگوتنی کتوپڕ (نَظَرُ الفُجاَة) ئەوە هیچ حەرام نیە بەڵکو ناپەسەندیش نیە بەڵام دەبێ وریا بێ و بەبێ بەڵگەو پاساوێکی شەرعی دووبارەی نەکاتەوە وەك پێغەمبەرﷺ( فەرموویەتی: (يا عَليّ لا تُتْبِعِ النَظْرَةَ النَظْرَةَ، فإنّما لَكَ الأولىٰ وَ لَيستْ لَكَ الآخِرَةُ) رواهُ أحمد وأبو داوُد، واتە: ئەی عەلی_کوڕیئەبو طالیب_ جار لەدوای جار تەماشای ئافرەتی نا مەحرەم مەکە، چونکە تەماشا کردنی یەکەمت بۆ هەیە بەڵام هی دووەم نا. ( چونکە مەگەر بەدەگمەن دەناهی یەکەم چاو تێ هەڵەنگوتنەو بەدەست خۆت نیە بۆیە پێی گوناحبار نابی).

هەروەها شتێکی ناپەسەندە کە خانە خوێ لە دەمی نان خواردن دا سەرنجی نان خواردنی میوان بداتو چاوی تێ ببڕێ، چونکە شەرم دەکاتو نا ڕەحەت دەبێو بێگومان ئەمەش پێچەوانەی ڕێز لێ گرتنی میوانە کە پێشتر باسمان کرد.

پێنج: وە ئەوەی بۆ چاو موباحە تەماشای بکات: ئەو سەرنج دانو تەماشا کردنانەن کە نەزیانو خراپەی دواڕۆژو دنیاو نە قازانجو بەرژەوەندی هیچ کامیانیان تێدایەو هیچ کام لە حوکمە شەرعییەکانیان بەسەردا ناچەسپن کە فەرزو سوننەتو حەرامو ناپەسەندن.

٦- **دەست(اليَدْ)** : كە ئامرازی دەست لێ كوتان(لمس)و شت گرتنو ئەنجام دانی هەموو یان زۆربەی زۆری كارە جەستەییـیەكانە.

ئەو ئەركو خوا پەرستیانەش كە ئینسان بە دەست ئەنجامیان دەداتو وەدەستیان دێنێو پێنج حوكمە شەرعیە كانیان بەسەردا دەچەسپێن بەم شێوەیەی خوارێن:

یەك: ئەوەی كە پێویستە (دەست) جێبەجێی بكات: وەك كاسبی كردنو كار كردن بۆ پەیدا كردنی ڕۆزیو بژێوی خۆیو هەموو ئەوانەی ژیاندنو مەسرەف كێشانیانی لەسەر فەرزە وەك ماڵو خێزانو دایكو بابی نەدارو هەر خزمێكی نەدار كە لەو نزیكتر یان بە توانا تریان نەبێت، وە یارمەتی دانی لێقەوماوێكو تێگیراوێك كە هاواری بۆ هێناوە، یان ئاگاداری حاڵیەتیو دەشتوانێ ڕزگاری بكات، هەروەها ئەنجامدانی هەموو ئەو كارانەی كە بەدەست یان هاوكاری دەست ئەنجام دەدرێن، وەك بەرگری لە خۆو خێزانو منداڵو خزمانو ماڵو سامان كردن لەكاتی دەست درێژی كرانە سەردا.، وە وەك خۆ شۆردنی فەرزو دەست نوێژ گرتنو بەرد باران كردنی جەمرەكان ( رَمْيُ الجِمار) لە كاتی حەج داو، دەست كردنە جەستەی هاوسەر لە كاتی پێویست بوونی جیماع لەگەڵ كردنی داو، شۆردنی مردووێك كە لەسەری بۆتە فەرزی عەین،وە نووسینی هەر نووسینێك كە بۆ دینداری یان دنیاداری لە سەری پێویست بوویو ...هتد.

دوو: ئەوەی كە بۆ (دەست) سوننەتە: دەست لێ كوتانو دەست پێ گرتنو بە دەست گرتنو بە دەست جێبە جێ كردنی هەموو ئەو جمو جۆڵو كارو چالاكییانەیە كە لەسەر ئینسان پێویست نین و سوننەتە ئەنجامیان بدات، بۆ وێنە: دەست بەسەری منداڵان دا هێنان بە تایبەت منداڵی هەتیوو منداڵی خۆی، وە دەست بە جەستەی هاوسەردا هێنان لە دەمی جیماع كردنێكی فەرز نەبوودا، وە كاسبی كردنو ڕۆزی پەیدا كردن بۆ ئەنجام دانی ئەو خزمەتو كارو چالاكییانەی كەلەسەری پێویست نەبوون، وە هاوكارییو یارمەتی كەسانێك كە لێیان قەوماوە لە حاڵێك دا كەلەسەری پێویست نەبووە، وە نووسینی ئەو شتانەی كە خێرو قازانجی مسوڵمانانو كۆمەڵگایان تێدایەو لەسەریشی پێویست نین، وە دەست گەیاندنە ڕوكنی یەمانی لە گۆشەی دیواری كەعبەدا، وە دەست گەیاندنە بەردە ڕەش ( الحجر الأَسْوَد)_ ئەگەر

بۆی نەکرا ماچی بکات_ یا بەدەست ئیشارە بۆ کردنیو سەلام لێ کردنی، وە هەر جۆرە جمو جۆڵو چالاکیەکی دیکەی شەرعیو بە کەڵك بۆ دنیاو دوارۆژ وەك: تۆقە کردن و لە کاتی پاڕانەوەدا دەست بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوەو، شایەتمان هێنانو ژماردنی زیکرو ویردەکان بە پەنجەکانی دەستی ڕاست.

سێ: ئەوەی کەلەسەر دەست حەڕامە: ئەنجامدانی هەموو ئەو کارو چالاکی‌یانەیە کە شەرع حەڕامی کردوون وەك: کوشتنی کەسێك بەناهەق ، دزینی ماڵ، لێدانی کەسێك بەبێ بەڵگەی شەرعی ، کردنی قومار و هەر یاری‌یەکی دیکەی حەڕام ، نوسینی باس و بابەتی حەڕام و خراپ هەر لە کوفرو بیدعەتەوە بگرە هەتا شتی درۆو ناهەق، مەگەر بۆیە بینووسێ کە بەرپەرچی بداتەوەو بە درۆی بخاتەوە، وە نووسینو دروست کردنی هەر شتێك کە زەرەرو زیانی مسوڵمانانی تێدایە، وەك دروست کردنی پەیکەرو وێنەکێشانی حەڕامو[1]، دروست کردنی شەڕاب و هەر خواردنو خواردنەوەیەکی پیسو زیانبەخشو ، لێدانی ئەو ئامێرە مۆسیقایی یانەی کە ئاوازو مۆسیقایەکی حەڕامو زیانبەخشو بەرەو خراپە پەلکێشکەریان لێ پەیدا دەبێت، وە لە پێش خەڵك دانانی شەڕاب و گۆشتی بەرازو هەر خواردنو خواردنەوەیەکی دیکەی پیسو حەڕام، وە دەست لێکوتانی دەستو هەر ئەندامێکی دیکەی ئافرەتی بێگانە، مەگەر بە عوزرێکی شەرعی وەك: چارەسەرو تیمار یان دەست گرتنو قوتارکردن لە مەترسیو بەڵایەك، وە ئاوی خۆ هێنانەوە بە دەست( الإسْتِمْناء).

چوار: ئەوەی کە بۆ دەست نا پەسەندە: وەك جوڵاندنی دەست بە بەلاش بێ ئەوەی سوودێکی لێ ببینرێ بۆ دنیاو دوا ڕۆژ، وە نووسینی شتی بێ هوودەو، یاریو گەمەی بێ جێ و دەست لێدانی هاوسەر لە کاتی ئیحرامو ئیعتیکاف دا بە مەبەستی لەزەت وەرگرتن .وە لەکاتی ڕۆژوو گرتن دا مەگەر لە خۆی دڵنیا بێ کە لە سنوور دەرناچێ، وە....هتد.

---

[1] دیارە دروست کردنی بووکە شووشەو شتی گەمەی منداڵانو هەر پەیکەرێك کە مەبەستێکی زانستی پەکی لەسەری کەوتبێ، حەڕام نینو ، وێنە کێشانی حەڕامیش تایبەتە بەشتی خاوەن گیان(ذي روح)ەوە و شتی تر لەو حوکمە هەڵاوێراوەو مەبەستیشمان لە وێنە کێشانی بە دەست، ئەو وێنانەن کە بە دەست دروست دەکرێنو وێنەی فۆتۆگرافی مەگەر بابەتی وێنەکە حەڕام بێت ئەگەر نا ڕای بە هێزتر ئەوەیە کە موباحە.

پێنـج: ئـەوەی بـۆ دەست موباحـە: هـەر دەسـت لێ كوتـانو گرتـنو دەسـت پـێ گرتنێكـە كـە هيــچ كـام لـە چـوار حوكمـەكانی پێشـەوە نايگرنـەوەو نـە قـازانجو بەرژەوەندی تێدایە و نە هیچ خراپەو زیانێكی لێ دەكەوێتەوە، وەك: ( تەسبیح) لـە دەست وەردان.

٧- لاق (الـرِّجْل): كە ئامرازی لەسەر وەستانو پێ‌ڕۆشتنو ڕاكردنو هەموو جمو جۆڵو چالاكیەكانی لەو بابەتانەیە.

یەك: ئەوەی لەسەر (لاقان) فەرزە: وەك: لە سەر وەستانیان بۆ ئەنجام دانی ئەو ئەركو پێویستیانەی بە پێوە ئەنجام دەدرێن ، بۆ وێنە ڕاوەستان بۆ خوێندنی فاتیحە لە نوێژی فەرزداو چوونە ڕكووع و، ڕاوەستان لەكاتی ئێشكگرتنو جەنگ كردن داو، لە كاتی ڕاپەڕاندنی هەر ئەركو كارێكی فەرزدا چ لە بواری دینداری (التَّعَبُّدُ) و چ لە بواری دنیا داری (التَّمَدُّنْ) دا، وە ڕۆشتن بەرەو ئەنجام دانی ئەو كارانەی پێویستن بۆ وێنە، نوێژی جومعە، وە پێنج نوێژەكان كە زۆر لە زانایان دەڵێن فەرزە بـە كۆمـەڵ بكرێن، وە حەج كردن، وە جیهاد كردن، وە زەكات دان بۆ كەسێك لە سەری فەرز بووە، وە ڕۆیشتن بەرەو دادگایی كران بۆ جێ‌بە جێ كردنی حوكمی شەرع هەركات بانگ كرا، وە ڕۆیشتن بۆ چاكە كاری لەگەڵ بابو دایكو گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وەبـەرەوكۆڕی زانیـاری بـۆ فێر بـوونو وەرگرتنـی ئـەو زانیاری‌یـە شـەرعیو غـەیرە شەرعی‌یانەی لە سەری فەرز بوون، وە ڕۆیشتن و ڕاكردن بۆ بە هاناوە چوونی خەڵكی لێقـەوماو و تێگـیراو ، مـادام داوایـان لێ كردبـێ یـان هەسـتی پـێ‌یـان كردبـێ و لـە تواناشی‌دا هەبێ بە دەنگیانەوە بچێ و هاوكاری‌یان بكات ، وە ڕاكردن لە هـەر شتێك كە مەترسـی مـەرگ یـان زیان پێگـەیاندنێكی گـەورەی لێ دەكرێ ، مەگـەر لە مـەیدانی جەنگ و جیهاددا [٢].

---

[٢] دیارە لە گەرمەی جەنگ و جیهادیش دا لە دوو حاڵەت دا مەیدان چۆڵ كردن و پشت لە دوژمـن كـردن بـەلای كەمەوە دروست (جائز) و جاری وایە سوننەت و بگرە پێویستیش دەبێ ، وەك خـوای كاربـەجێ فەرموویـەتی : (.... وَ مَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ .. .. ) الانفال -١٦- ، واتە هەر كەسێك لەو ڕۆژە دا پاشیان تێ بكات ئـەوە بێگومـان خـوا لـێی تـووڕە بـووە ، مەگـەر بـە مەبەسـتی بارسووڕاندن و تاكتیكی جەنگی یان پاڵدانە لای كۆمەڵێكی دیكە – لە برواداران – بۆ پشتگیری كردنیان یان بـۆ خۆ دەرباز كردن لە ئابڵۆقەی بێ ئامانی دوژمنان.

دوو : ئەوەی کە سوننەتە بۆ لاقان : بریتیە لە ڕاوەستان و ڕۆیشتن و ڕاکردن بۆ هەر کار و چالاکی‌یەکی شەرعی و پەسەند کە خێر و قازانجی دینداری و دنیاداری تێدایە ، بەڵام پێویست نیە و ئینسان بەنەکردنی گوناحبار نابێ ، بۆ وێنە : ڕۆیشتن بۆ ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی کە ئینسان زانستی هەمە جۆریان تێدا وەدەست دێنێ کە سوود و بەرژەوەندی دینداری و دنیاداری‌یان تێدایە ، وە ڕۆیشتن بۆ نوێژ لە سەر جەنازە کردن و شۆردن و ناشتنی لە کاتێك دا کە خەڵکی‌تر هەیە ئەو کارانە ئەنجام بدات ، وە سەردانی دۆست و ڕەفیقان و ، سەرلێدانی نەخۆش و پەککەوتان و ، چوونە سەر گۆڕستان بە تایبەتی باب و دایك و خزمان .

سێ : ئەوەی کە لە ( لاقان ) حەرامە : بریتیە لە بەکارهێنانیان بە لەسەر ڕاوەستان و جووڵاندنیان بۆ هەر ئیش و کار و جم و جۆڵ و چالاکی‌یەك کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان ناخۆشە و قەدەغەیان کردووە ، جا ئەو شتە قەدەغە کراوە کە پێ هەڵسانی و بەرە و ڕوو چوونی حەرامە چ لە بواری عەقیدە و لایەنی مەعنەوی و ئەخلاقی‌دا بێ ، وەك بەشداری کردنی ئەهلی کوفر و شیرك و بیدعەت لەو بۆنە و ئاهەنگە تایبەتی‌یە نا شەرعی‌یانەیان دا کە پێیان هەڵدەستن و وشە و تەعبیر و هەڵوێست و ڕەفتاری کوفری و شیرکی و بیدعەتی یان تێدایە ، وە چ لە بواری کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری‌دا بێ کە داب و نەریتی لاسایی کەرەوانە و هەڵوێست و بیر و بۆ چوونی نەفامانە و ڕێ و ڕەسمی تاغووتی‌یانەیان تێدایە.

بەڵام هەر کاتێك کار و چالاکی و بەرژەوەندی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی ئیسلامی پەکی لە سەر نزیك بوونەوە و هەڵکردن (مداراة ) کەوت ، ئەوە دەستە لاتی بالای سەرنجی بارو دۆخی خۆی و واقیع دەدات و چ شتێك و چ هەڵوێستێك بەرژەوەندی‌یەکی گەورەتر بۆ کاری ئیسلامی دابین بکات و ، زیان و مەترسی‌یەکی زلتر دوور بخاتەوە ، بە پێی بنچینەکانی ( دَرْءُ أَعْظَمِ المَفْسَدَتَيْنِ) و ( جَلْبُ أَكْبَرِ المَصْلَحَتَيْنِ ) و ( إِحْتِمالُ أَخَفِّ الضَّرَرَيْنِ) و (إِتِّقاءُ أَشَدِّ الشَّرَّيْنِ)، کە چەند بنچینەیەکن زانا و پێشەوایانی ئیسلام بە کۆن و تازەوە لە بواری کار و خەباتی سیاسی و جیهادی دا بە تایبەت و لە بوارەکانی دیکەش دا بە گشتی لە سەریان پێکهاتوون و ڕێك کەوتوون ، بڕیار لە سەر جۆر و چۆنیەتی و ئەندازەی ئەو هەلس و کەوت و هەڵوێستە قۆناغی و کاتی و تاکتیکی‌یە دەدات ، بەڵام بەبێ ئەوەی لە پرانسیپەکان ( مَبادِئ ) و ستراتیژی خۆی دا

بەزیّ، کە ئەمە بە هیچ جۆرێك مەودای مامەڵەو سەنگ و سووکی تێدا نیە و دەبیّ نەلەخشاو و پارێزراو بێت لە ژێر فشاری هیچ ترس و تەماعێکدا دروست نیە دەستکاری بکریّ ، وەك خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی : ( ثُمَّ جَعلناكَ علـى شَـريعةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتبِعْـها و لا تَتبِّـعْ أَهْـوَاءَ الّذيـن لا يَعْلَمُـون ) الجاثية - ١٨- ، واتە : پاشان - ئەی موحەممەد - تۆمان خستە سەر ڕێبازێك لە ئایین -ی خۆمان - دەجا باش پەیڕەوی لیّ بکە‌ ومەکەوە شوێن هەواو ئارەزووی ئەو - کافر- انەی کە نەزانن!

چوار : ئەوەی کە بۆ (لاقان ) نا پەسندە : ڕاوەستان و ڕۆیشتن و جووڵانەوە بەرەو هەر جم و جۆڵ و چالاکی‌یەك کە نەکردنی و واز لێهێنانی لە ئەنجام دانی باشتر بێت، هەر چەندە کردنیشی گوناحباری لە دوا نەبیّ .

پێنج : ئەوەی کە بۆ لاقانیش ڕەوایە : بەکارهێنانیانە لە هەر ئیش و کار و جم و جۆڵێك دا کە نە پاداشتی لە سەر بێت و نەگوناح و لۆمەشی بە دوادا بیّ وەك پیاسە کردن و گەشت و سەیران و سەفەر کردن و گەڕان ، بەڵام بە مەرجێك لە نێو خودی ئەو کارانەدا گوناح و خراپە یان نیاز و مەبەستی بەد نەشێررابێتەوە ، چونکە لە حاڵێکی وا دا حوکمەکەیان دەگۆڕیّ بەرەو خراپە ، هەروەك چۆن ئەگەر فەرمانبەری و چاکە و نیاز و مەبەستی باشیان تێدا ڕەچاو کرابیّ ، حوکمەکەیان بەرە و طاعەت دەگۆڕیّ .

**٨- زار (الفـــم ) :** کە ئامرازی شت پیّ چێژتن و تام کردن و خواردن وخواردنەوەیە.

یەك : ئەوەی کە لە سەر (زار ، دەم ) پێویستە : خواردن و خواردنەوەی خۆراك و ئاو لە دەمی ناچاری و پێویست پیّ بوون و تین بۆ هاتن دا کە مەترسی مەرگ هەبیّ ، وە زۆربەی زانایان دەڵێن لە کاتی وادا ئەگەر بێجگە لە خۆراك و خواردنەوەی پیس و حەرام بۆ وێنە: مردار و شەراب ، هیچی دیکەی گیر نەکەوت ، بەشی ئەوەی پیّی لە مردن قوتار بیّ لە سەری پێویست دەبیّ بیخوات و بیخواتەوە ، چونکە ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمی‌یەوە لەو بارەوە بمریّ بە کوژەر (قاتل ) ی خۆی دادەنریّ [١] !

هەروەها خواردن و خواردنەوەی دەرمانێك کە یەقینی هەبیّ پیّی چاك دەبیّ ، بەڵام ئەگەر هەر گومانی هەبیّ کە پیّی چاك دەبیّ ئەوە سوننەتە ، هەروەها خواردن و خوادرنەوەیەك کە جەستەی پێویستی‌یەتی بۆ ڕاوەستانی و ئەنجام دانی ئەرك و پێویستی یەکانی سەرشانی .

---

[١] بروانە: ( نيل الأوطار ) للشوكاني ج ٩ ص ٣١، ٣٢، وە بروانە ( تفسير القاسمي ) ج٦ المجلد الرابع ص ٥٦ .

دووو: ئەوەی سوننەتە بۆ (زار ) : خواردن و خواردنەوەی هەر شتێکە کە حەڵاڵ و پاك و چاکە و دەبێتە هۆی ساغ و بەهێز و پتەو بوونی جەستە و بەردەوام بوونی لە سەر ڕاپەڕاندنی فەرمانبەری (طاعة) بۆ خوای پەروەردگار ، وە خواردن و خواردنەوە لەگەڵ میوان دا بۆ ئەوەی باش بخوات و شەرم نەکات ، وە خواردن و خوادرنەوە لە کاتی دەعوەت کران دا جا چ بەدەم دەعوەتەوە چوونە کە فەرز بێت چ سوننەت ، هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە کە دەعوەتی زەماوەند ( وليمة) کە فەرزە بە دەمیەوە بچی ، فەرزیشە لێی بخۆی ، چونکە شەرع فەرمانی کردووە بە بەدەمەوە چوون و ئەویش بە مەبەستی خواردنە، وە خواردن و خواردنەوەی دەرمان لە کاتی نەخۆشیدا هەرچەندە دڵنیاش نەبێ لەوە کە پێی چاك دەبێتەوە ، چونکەپێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی : (لِكُلِّ داءٍ دواءٌ فاذا أُصِيْبَ دواءُ الدّاءَ بَرِأَ بأذنِ الله عزّ و جَلَّ ) رواه مسلم ، واتە : هەموو دەردێك دەرمانی هەیە جا هەر کات دەرد دەرمانی خۆی گەیشتێ بەویستی خوای زاڵ و پایەبەرز چاك دەبێتەوە،وەهەروەها لە کاتێك دا پرسیاری لێ کرا کە ئایا خۆمان چارەسەر بکەین و دەرمان بەکاربێنین؟ فەرموویەتی : ( نَعَمْ يا عبادَ اللهِ تَداووا ..) رواه احمد و ابو داود و ابن ماجة و الترمذي و ابن حبان و صححه كل من الترمذي و ابن حبان.

*واتە* : بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا خۆتان دەرمان بکەن و بەکاری بێنن!

سێ : ئەوەی کە حەرامە زار تامی بکات و بیخوات : وەك : تام کردنی شەراب و هەر سەرخۆشکەرێکی دیکە ، یان بێهۆشکەر بە بێ عوزری شەرعی ، وە خواردنی ژەهر ، وە تاماندنی بابای ڕۆژوو گر – مادام ڕۆژوەکەی فەرز بێت ، بەبێ عوزر و پاساوی شەرعی[1]، وە خواردن و خواردنەوەی ڕیباو ماڵی هەتیو و هەر ماڵێکی دیکەش بە زوڵم و ماڵی دزراو و زەوتکراو و هەر شتێکیتر کە حەرام بێت یان پیس و زیانبەخش بێت مەگەر لە کاتی ناچاری و تێگیراوی‌یەکی جیددی دا .

چوار : ئەوەی کە بۆ زار نا پەسندە : وەك : تام کردنی خواردن و خواردنەوەیەك کە جێگای شوبهە و تۆمەت بێ ، وە خواردن و خواردنەوە زیاد لە ئەندازەی پێویست و زیادە ڕۆیی کردن وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ( و كُلُوا و اشْرَبُوا و لا تُسْرِفُوا ..... ) الاعراف -٣١- ،

---

[1] وەك تامکردنی چێشت لێنەر لەو خواردنەی ئامادەی دەکات.

*واتـه :* وه‌- ئه‌ی وه‌چه‌ی ئادەم - بخۆن و بخۆنه‌وه به‌ڵام زیاده ڕۆیی مه‌کـه‌ن ... ! ، هه‌روه‌ها خواردن و خواردنه‌وه له‌و شوێنانه‌ی که ئیشکالێکی شه‌رعی‌یان هه‌یه ، وه‌ك ماڵی ئینسانی ڕیاباز ، وه ماڵی که‌سێك کـه لـه شـه‌رمی ڕووان نـه‌ك بـه مورتـاحی و دڵخۆشی ده‌عوه‌تی ساز کردوه ...... هتد .

پێنج : ئه‌وه‌ی که بۆ زار موباح و ڕه‌وایه : لێ چێژتن و خواردنه‌وه و خواردنی هه‌ر خوارده‌مه‌نی‌یه‌که که هیچ کام له چوار حوکمه شه‌رعی‌یه‌کانی ڕابردن نه‌یگرنه‌وه ، که هـه‌ر شتێکه پاك و چاك بێ و نه‌عه‌ینه‌که‌ی پیس و زیانبه‌خش و نه حوکمه‌کـه‌ی حه‌ڕام و نا په‌سند بێ و ، نه له ئه‌ندازه و سنووری پێویست و ما قوڵیش سنووری پێ ببه‌زێنرێ.

٩- **لـووت ( الانـــف )** : کـه ئامڕازی بۆنکـردن و لـه‌یـه‌ك جیـا کردنـه‌وه‌ی بۆنـه جیاجیاکانه به خۆش و ناخۆش و به‌که‌ڵك و زیانبه‌خشیانه‌وه.

یه‌ك : ئه‌وه‌ی که له سه‌ر لووت پێویسته : وه‌ك بۆنکردنی هه‌ر شتێك له خواردن و خواردنـه‌وه‌و غـه‌یری ئـه‌وانیش کـه بـه‌بێ بۆنکـردن حـه‌ڵاڵ و حـه‌ڕامیان لێـك جیـا نابێته‌وه ، وه بۆنکردنی ئه‌و شتانه‌ی که به‌س له ڕێی بۆنکرانه‌وه پاك و پیس و ، به‌که‌ڵك و زیانبه‌خشیان له یه‌ك جیا ده‌کرێته‌وه، یان ئه‌وه‌یان که موڵکی خۆیه‌تی له وه‌یان که ئی وی نیه جیا ده‌کرێته‌وه ، به کورتی ، هه‌ر شتێك پێویست بێ بیناسێ و ته‌نیا له ڕێی بۆنکردنیشه‌وه بیناسێ و بۆی ده‌ربکه‌وێ‌پێویسته بۆنی بکات.

دوو : ئـه‌وه‌ی کـه بـۆ لـووت سوننه‌ته : بۆنکردنـی هه‌رشتێکی بۆنخـۆش و هـه‌ر بۆنێکی خۆشه که ده‌بێته هۆی یاریده‌ده‌ری ئینسان بۆ فه‌رمانبـه‌ری خـوا ، چونکـه بۆنی خۆش دڵی ئینسان ده‌کاته‌وه و مێشکی ئاسووده ده‌کات و ده‌روونی شاد ده‌کات ، هـه‌ر بۆیـه‌ش پێغه‌مبـه‌ر ﷺ زۆر حه‌زی له بۆنـی خۆش کـردوه ، وه‌ك فه‌رموویـه‌تی: (حُبِّبَ إِلَيَّ مِن دُنْيَاكُمْ : النِّسَاءُ و الطِّيْبُ ) اخرجه احمد و النسائي و صححه الحاكم ، واته : ( له دنیای ئێوه‌دا ئافره‌ت و بۆنی خۆشم له لا خۆشه‌ویست کراون ، دیاره هـه‌ر بۆیـه‌ش پێغه‌مبـه‌ری خۆشه‌ویسـتمان ﷺ عـاده‌تی وا بـووه کـه قـه‌ت بۆنـی خۆشـی ڕه‌ت نه‌کردۆته‌وه : ( كَانَ ﷺ لا يَرُدُّ الطِّيْبَ ) رواه البخاري ، وه فه‌رمانیشی پێ کردووین که بۆنی خۆش ڕه‌ت نه‌که‌ینه‌وه : (مَن عُرِضَ عَلَيْهِ طِيْبٌ فَلا يَرُدَّهُ فَإِنَّهُ خَفِيْفُ المَحْمَلِ طَيِّبُ الرَّائِحَةِ ) رواه أبو داود و النّسائي و صَحّحَهُ ابنُ حِبّان .

سێ: ئەوەی کە لە سەر لووت حەرام کراوە : وەك بۆنکردنی بۆنی دزراوو زەوت کراو، وە بۆنکردنی بۆنی خۆش بە ئانقەست لەکاتی ئیحرام دا، وە بە ئانقەست بۆنکردنی بۆنی خۆشی ئافرەتانی نامەحرەم ، وە بۆنکردنی هەرشتێکی بۆگەن و پیس و بۆن ناخۆش و زیانبەخش کە یەقین یان گومانی زاڵ (الظن الراجح ) وایە لە ئەنجامی ئەو بۆنکردنەدا دووچاری مەرگ یان نەخۆشی یان سەرخۆشی، یان بێهۆشی ببێ بەبێ پاساوێکی شەرعی.

چوار : ئەوەی کە بۆ لووت نا پەسەندە: وەك بۆنکردنی بۆنی خۆشی ستەمکاران، یان ئەوانەی کە تۆمەتبارن و شوبهەی خراپەیان لە سەرە ،وە هەر شتێك و هەر بۆنێك کە دڵنیایی پەیدا نەبووە لە حەڵاڵی یان سوود بەخشی و پێ زیانبار نەبوونی.

پێنج : ئەوەی کە بۆ لووت موباحە بۆنی بکات : بریتیە لە بۆنکردنی هەموو ئەو شتانەی کە یەکێك لەو چوار حوکمانە نایانگرنەوە کە باسمان کردن ، دیارە بە پێی یاسای : (الأَصْلُ فِي الأَشياء الأُباحة) هەموو شتەکان لە ئەسڵ دا موباحن ، هیچ کۆت و بەندێك لە سەر نەك هەر لووت بگرە هیچ کام لە ئەندامەکان نیە مەگەر بە بەڵگەیەکی شەرعی ڕوون و بێ چەند و چوون شتێکیان لێ قەدەغە کرابێ ، چونکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە بۆ خاتری ئینسان و بەهرە وەرگرتنی و گوزەران و بەڕێوە چوونی خوڵقێنراوە، وە لە ڕاستی دا خوای میهرەبان و کار بەجێ بێجگە لە کردەوە و ڕەفتار و قسە و وتاری بەد و خراپ ڕێی هیچ قسە و هەڵس و کەوتێکی لێ نەگرتوە ، وەك فەرموویەتی : ( .... يَأْمُرُهُمْ بِالمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ المُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الخَبَائِثَ ...) الاعراف - ١٥٧- ، *واتە* : - پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان پێ دەکات بەهەرچی چاکەیە و ، هەرچی خراپەیە لێیان قەدەغە دە کات ، وە هەرچی چاك و پاکە بۆیان حەڵاڵ و هەرچی پیس و زیانبەخشە لێیان حەرام دەکات .

١٠- تێکڕای جەستە ( کل الجسد ): کە وەسیلە و ئامرازێکە بە دەست ڕووحەوە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان و داخوازی‌یەکانی خێر بن یان شەڕ .

دوای ئەوەی لە نۆ (٩) خاڵی ڕابردوو دا باسی ئەرك و خواپەرستیی‌یە زۆر و جۆراو جۆرەکانی عەقڵ و دڵ و زمان و گوێ و چاو و زار و لووت و دەست و لاقمان کرد ، ئەمجار با سەرنجێك لە سەرجەم جەستە بدەین و چەند وێنەیەك بێنینەوە بۆ چۆنیەتی چەسپانی پێنج حوکمەکان بە سەر جم و جۆڵەکانی دا :

یەك : ئەوەی کە لە سەر جەستە پێویستە : وەك : داپۆشینی عەوڕەت – کە لە کتێبە فیقهی‌یەکان‌دا بە ڕوونی باسی سنووری عەوڕەتی پیاو و ئافرەت کراوە – بە هۆی دەبەرکردنی بەرگ و پۆشاکی شەرعی‌یەوە ، بۆ ئەنجام دانی ئەرك و چالاکی‌یەکانی مسوڵمانەتی بە دینداری و دنیاداری‌یەوە و بۆ پارێزران لە سەرماو گەرما و ....... هتد، وە پاراستنی پێش و پاش لە حەڕام و نا شەرعی وەك زینا و نێربازی و خۆتێك هەڵسوونی ئافرەتان ( السّحاقْ ) ، وە سوار بوونی وڵاخ و هۆیەکانی دیکەی سەفەر و هاتوچۆ وەك سەییارە و شەمەندەفەر و کەشتی و فڕۆکە و .... هتد ، بە مەبەستی حەج کردن و جەنگ و جیهاد و جێبەجێ کردنی هەر ئەرك و کارێکی دیکەی شەرعی پێویست، وە جووت بوون ( جماع ) لەگەڵ هاوسەردا بە ئەندازەی پارێزرانی خۆی و هاوسەری لە گوناح و حەڕام ،. وە ... هتد .

دوو: ئەوەی کە بۆ جەستە سوننەتە : وەك : بەرگ و پۆشاکی پاك و پوخت دەبەرکردن بۆ کاتی نوێژی جومعە و نوێژە فەڕزەکان و بۆ نێو خەڵك، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ( يا بني آدَمَ خُذُوا زِيْنَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ) الاعراف – ٣١-

*واتە* : ئەی وەچەی ئادەم ! لە لای هەر مزگەوتێك – یان لە کاتی هەر نوێژێك دا – بەرگ و پۆشاکتان دەبەربکەن ...، پێغەمبەریش ﷺ بە هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی فەرمووە : (اِنَّكُمْ قادِمونَ علىٰ إِخْوانِكُمْ فَأَصْلِحوا لِباسَكُمْ و رِحالَكُمْ حتّى تَكونوا كأَنَّكُمْ شامَةً في الناسِ ...) رواه ابو داود ، *واتە* : ئێوە لە بەر ئەوەی دەچنە لای برایەکانتان بەرگ و پۆشاك و جل و کورتانی وڵاخەکانتان چاك و ڕێك و پێك بکەن هەتا واتان لێ دێ کە لە

نێـو خـەڵکی دا وەك خـاڵ دیـار بـن .... ، وە سـوار بوونـی هۆیـەکانی هـاتو چـۆ و گواستنەوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرك و کارێکی خێر و پەسەند کە فەرز نەبێ وەك پەیدا کردنی زانست و وەدەست هێنانی بژێوی حەڵاڵ و سەردانی خزم و ئاشنا و .... هتد ، وە خۆ پاك و خاوێن ڕاگرتن بەهۆی خۆشۆردن و بەلای کەمەوە هەفتەی جارێك ، وە جێبەجێ کردنی ئەو شتانەی کە پاك و خاوێن ڕاگرتنی جەستە بە بێ ئەوان نایەتەدی کە پێغەمبەر ﷺ بە بەشێك لە (فیطرەت)[1] ی لە قەڵەم داون و ناوی هێناون کە گرینگترینیان ئەمانەن :

١- سیواك کردن ٢- خەتەنە کردن ٣- سمێڵ کورت کردنەوە ٤- ڕیش هێشتنەوە ٥- لابردنی تووکە بەر ٦- لابردنی مووی بن هەنگڵ ٧- نینۆك کردن ٨- شۆردنی گرێی جومگەکانی دەست و پێ ٩- تارەت گرتن ١٠ – ئاو لە لووت وەردان ١١- ئاو لە دەم وەردان .

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەندێك یان زۆربەی ئەم خەسڵەتانە پێویستن و ئینسان لە سەر نەکردنیان عەیبدار و گوناحبارییش دەبێ ، بەڵام بۆیە لێرەدا نووسیمانن

---

[1] وەك فەرموویەتی : (عَشْرٌ مِنَ الفِطْرَةِ : قَصُّ الشَّارِبِ و إِعْفاءُ اللِّحْيَةِ و السِّوَاكُ ، و اسْتِنْشاقُ المَاءِ و قَصُّ الأظافِرِ و غَسْلُ البَرَاجِمِ ، و نَتْفُ الإبْطِ و حلقُ العانَةِ و انْتِقَاصُ الماءِ ، قال زكريا : قال مصعب : و نَسِيْتُ العاشِرَةَ إلا أَنْ تكونَ المَضْمَضَةُ) رواه مسلم . واتە : دە (١٠) خەسڵەت لە سروشت و فیطرەتی ساغی ئینسانن : سمێڵ کورت کردنەوە و ڕیش هێشتنەوە و سیواك کردن و ئاو لە لووت وەردان و نینۆك کردن و شۆردنی گرێی جومگەکان و هەڵکێشانی مووی بن هەنگڵ و بەرتاشین و تارەت گرتن بە ئاو ، زەکەریبا دەڵێ : موصعەب گوتوویەتی : وە ئی دەیەمم لە بیرچۆتەوە مەگەر ئاو لە زار وەرکردن بێت .

تێبینی : ( نووي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرموویەتی : مەبەست لەوە کە فەرموویەتی ( دە شت لە فیطرەتن ) واتە گرنگترینیان دە ( ١٠) ن ، وەك فەرموویەتی : حەج عەرەفەیە ، ئەگەر نا بەس ئەم دەیە نین ... بڕوانە (المجموع) ج١ ص٢٨٤ .

چونكه به گشتی به سوننەت دانراون هەروەها خۆ بۆنخۆش كرد[1] كه پێشتر باسمان كرد پێغەمبەر صلى‌الله عليه وسلم چەندە ئەمیەتی پێداوە ، وە خۆپاراستن لە هەر بۆن و بەرامەیەكی ناخۆش وەك خواردنی سیر و توورو پیاز و خراپتر لە مانەش جگەرە كێشان كە وێڕای حەرامی و زیانبەخشی خۆی بۆخڵتەكەش وەك بۆنی سیرو توورو بگرە ناخۆشتریشە نەخۆشیشی لێ دەكەوێتەوە ، پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی هەركام لە پیازو سیروكەوەر فەرموویەتی : ( مَنْ أَكَلَ البَصَلَ و الثُّومَ و الكُرَّاثَ فلا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنا فانَّ الملائِكة تَتَأذَّىٰ مِمّا يتأذَّىٰ مِنْهُ بَنو آدَمَ ) رواه مسلم ، واتە : هەركەسێك پیواز و سیرو كەوەری خوارد با نزیكیمزگەوتەكەمان نەكەوێ ، چونكە فریشتەكان بەوە نارەحەت دەبن كە وەچەی ئادەم پێی نارەحەت دەبن - واتە ئەوانیش وەك ئینسانەكان بۆنی سیرو پیازو كەوەریان پێ ناخۆشە ، بەڵام ئەگەر كەسێك ناچار بوو هەر بیانخوات پێویستە بیانكوڵێنێ تاكو بۆنەكەیان بڕوات . وەك فەرمویەتی : (إِنْ كُنْتُمْ لابُدَّ آكِلِيْها فَأَمِيْتوهُما طَبْخاً ) رواه احمد ( كە لە فەرموودەكەدا باسی پیوازو سیر كراوە ) .

دیسان ئەگەر نەشڵێین پێویستە ! سوننەتەكە بابای موسڵمان ئاگای لە جەستەی خۆی بێت و بپارێزێ لە هەر شتێك كە ببێتە هۆی سستی و تەنبەڵی و دزێو بوون و تێكچوونی دیمەن و قەدو قیافەتی وەك زۆر قەڵەو بوون و گەدەو گیپاڵ پەیدابوون و خاوبونەوەی جومگەو ماسولكەو دەمارەكانی بەهۆی زۆر دانیشتن و خەوتن و نەجوڵان و كارنەكردن و وەرزش نەكردنەوە .

سێ : ئەوەی كە لە جەستە بە گشتی قەدەغەكراوە : وەك ، دەرخستنی عەورەت بۆ كەسێك كە حەرامە بیبینێ ، وە دەبەركردنی بەرگ و پۆشاكی ناشەرعی جاچ ئەسڵی ماددەكەی حەرام بێ وەك بەكارهێنانی ئاوریشم و زێڕ بۆ پیاوان ، یان چۆنیەتییەكەی ناشەرعی بێ وەك پۆشاكی تەنك و تەسكی ئافرەتان كە هەندێك جار لە ڕووتی ئاسایی خراپترە ! وە پارێزگاری نەكردنی پاش و پێش لە گوناح و ناشەرعی ، وە سواربوونی هۆیەكانی هاتوو چۆ و گواستنەوە بۆ هێنانەدی مەبەستی

---

[1] بەڵام بۆ ئافرەت نابێ بۆنەكەی بۆ خەڵك بچێ لە كاتێك دا لە شوێنێك بێ یان بە شوێنێك دا ڕابرێ كە پیاوی نامەحرەمی لێ بێ ، پێغەمبەر ﷺ لەوە بارەوە فەرمویەتی ( إِذا اسْتَعْطَرَتِ المرأةُ فَمَرَّتْ علىٰ القَوْمِ لِيَجِدوا رِيْحَها فَهِيَ كَذا و كَذا — قَوْلاً شَدِيْداً ) رواه ابو داود ، واتە هەر كاتێك ئافرەت خۆی بۆنخۆش كرد و بەلای خەڵكدا ڕۆیشت تاكو بۆنی بكەن ئەوە ئاواو ئاوایە — قسەیەكی توندی فەرموو — لە كتێبی ( تحفة الاحوذي بشرح الجامع الترمذي ) دا لە شەرحی ئەم وشەیەدا ( فهي كذا و كذا ) نووسیویەتی: ( لانها هَيَّجتْ شهوة الرجالِ بِعِطْرِها و حَمَلَتْهُم علىٰ النَّظَرِ اِلَيْها .. فَهِيَ آثِمَةٌ لِهذا السَّبَب ) بڕوانە ( المُفَصَّلُ في أحكام المرأةِ ) ج٣ ص ٢٧٧. د.عبد لكريم زيدان .

ناشەرعی وەك : دزی و جەردەیی ، یارمەتی دانی ئەهلی ستەم وکوفر ، جەنگ کردن دژی ئیسلام و موسڵمانان و.. هتد ، وە خۆ پەنادان و خۆبواردن و دواکەوتن لە جەنگ و جیهادێك کە لەسەری پێویست بووە ، هەروەها خۆ بواردن و تەنبەڵی کردن و خۆحەشاردان بۆ ئەنجام نەدانی هەرکارو چالاکی‌یەکی پێویستی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامی چ دینداری بێت چ دنیاداری ، وە لە شوێنی چۆڵ بەتەنیا پێکەوە دانیشتن و ڕاوەستانی ئافرەت و پیاوی لەیەکتر بێگانە ،[1] وە ئازاردانی دایك و باب (عقوق الوالدین) .

چوار : ئەوەی کە بۆ جەستە ناپەسەندە : بریتی‌یە لە هەر جم و جوڵ و چالاکی‌یەکی جەستەچ لە خودی خۆی‌دا وەك : خواردن و خواردنەوە و بەرگ و پۆشاك و پاك و خاوێنی ، وە چ لەگەڵ دەورو بەری‌دا وەك : هەستان و دانیشتن و سواربوون و ڕاکردن ..هتد کە نەکردنی و وازلێهێنانی باشتر بێ لە ئەنجام دانی ، یان بە پێچەوانەوە ، واتە ئەنجام دانی چاکتر بێ لە چواندن و پشت گوێ خستنی ، بەڵام لە هەردووك حاڵەن دا تووشی لۆمەو گوناحباری نەبێ .

پێنج : ئەوەی بۆ تێکڕای جەستە موباحە : بریتی‌یە لەسەرجەم جم و جوڵ و چالاکی‌یەکان کە جەستە پێیان هەڵدەستێ و نەحەرام و ناپەسند و نە پێویست و سوننەتیشن ، جا ئەو جم و جوڵ و چالاکی‌یانە چ لە خودی خۆی دابن چ لە دەرەوەی خۆی و لەگەڵ دەورووبەری‌دا ، ئەوەندە هەیە کە هەموو ئەو شتانەی کە (موباح)ن هەرکات زیادەڕۆیی (اسراف)یان تێداکرا ئەوە بە ئەندازەی زیادە ڕۆیی‌یەکە حوکمەکەیان دەگۆڕێ و زۆر جار دەبنە ناپەسەند (مکروە) و جاری واهەیە دەگەنە حەرامیش ، بۆ وێنە : خەوتن و خواردن .کە لە ئەسڵ دا موباحن ئەگەر هێندە زیادەڕۆیی‌یان تێدابکرێ کە ببنە مایەی قاڵب گرانی و سستی و خاوی مرۆڤ ئەوە ئەندازە زیادەڕۆیی تێداکراوەکەیان دەبێتە ناپەسەند ، بەڵام ئەگەر بەئەندازەیەك بوو کە ببێتە هۆی نەخۆش بوون و حاڵ تێکچوون ئەوە بێگومان حەرام دەبێ .

---

(1) پێغەمبەر صلی الله علی وسلم فەرموویەتی : ( لَايَخْلُوَنَّ أَحَدُكُمْ بِأمْرَأَةٍ إلاَّ مَعَ ذِي رَحِمٍ مَحْرَمٍ) متفق علیه

واتە : هیچ کامێکتان بە تەنیا لەگەڵ ئافرەتێك نەبێت مەگەر خزمێکی مەحرەمی لەگەڵ بێت .

*خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم !*

ئەمەی ڕابرد پوختەیەك بوو دەربارەی چۆنیەتی خواپەرست (عابد)بوونی ئینسان بە هۆی ئەندامەکانی (عەقڵ - دڵ - زمان - گوێ - چاو - زار - لووت - دەست - لاق) وە بە هۆی تێکرای جەستەیەوە ، واتە هەموو ئەندامەکانی تێکرا ، ئینجا لە کۆتایی ئەم باسەشدا خستنەڕووی ئەم سێ تێبینی‌یە بەپێویست دەزانم:

**یەکەم** :هەرچی لەو دە(١٠) خاڵ و پەنجا(٥٠) حوکمەدا دەربارەی بەندایەتی و خواپەرستی ئەندامەکانی ئینسان خستمانە ڕوو ، نێرو مێ ، تێیدا بەشدارن بە بێ جیاوازی ، مەگەر شتێك بە بەڵگەیەکی شەرعی ڕوون و بێ چەند و چوون و تایبەت کرابێ بە یەکێکیانەوە ، بۆ وێنە : جەنگ و نوێژی جومعە کە تەنیا لەسەر پیاوان فەڕزن ، دیارە ئایەتەکانی کتێبی خوای پەروەردگار و فەرموودەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ کە بە گشتی ڕوو لە مسوڵمانان دەکەن و دەیان دوێنن بە هەمان شێوە هەردووك ڕەگەزی نێر و مێی کۆمەڵگای ئیسلامی دەگرنەوە بەبێ جیاوازی مەگەر بەبەڵگەو نیشانەیەکی تایبەتکەر ( قَرِيْنَةٍ مُخَصِّصَةٍ) دواندن ( خِطاب) ەکە تایبەت کرابێ بە پیاوانەوە یان بە ئافرەتانەوە .

**دووەم** : وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردوە ئێمە لە کاتی ڕوونکردنەوەی پێنج حوکمە شەرعی‌یەکان دا کەبەسەر هەرکام لە عەقڵ و دڵ و زمان و گوێ و زار و چاو و لووت و دەست و لاق و تێکڕای جەستەش دا دەچەسپێن تەنیا وەك وێنە هێنانەوە چەند شتێکمان خستۆتە ڕوو ، نەك وەك سەر ژمێر و کۆکردنەوەی هەموو مەسەلەکانی ئەو ئەندامانە کە پێنج حوکمە شەرعی‌یەکان دەیانگرێتەوە ، دیارە تاڕاددەیەکیش هەوڵمان داوە مەسەلە گرنگ و سەرەکی‌یەکان بخەمە ڕوو ، بەڵام بەهەر حاڵ هەر بە وێنە هێنانەوەی دادەنرێن .

**سێیەم** : بۆ ڕوونکردنەوەی حوکم و پلەکانی خواپەرستی هەرکام لەو ئەندامانەی باسکران نەمانویستوە کە لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلیان لەبارەوە بکەین ، چونکە ئەم باسە تەنیا بۆ خستنە ڕووی چۆنیەتی دابەش بوونی خواپەرستی بەسەر هەموو جەستەدا نووسراوە نەك بۆ توێژینەوەی پڕ بە پێست لەو بارەوە کە بێگومان پێویستی بە شوێنێکی گونجاو ترو کاتێکی زیاتر دەکات .

خوای میهرەبان و بەخشەریش بە لوتف و کەرەمی بێ سنوری خۆی هەموومان سەرکەوتوو بکات کە بەدەرو دەروونمانەوە خواپەرستین و هەموو ئەندامەکانمان بە وردو درشت و ئاشکراو پەنهانەوە چاکترین و ساغترین و ڕاسترین بەندایەتی و خواپەرستی بۆ خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاریان ئەنجام بدەن .

# بابەتی دووەم

# بنچینەکانی هەڵس و کەوتی شەرعی یانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافی یەکان دا



# ئەم بابەتە و ڕوونکردنەوەیەک

*خوێنەری بەڕێز :*

دوای ئەوەی لەبابەتی یەکەم دا لەدوو توێی چوار کورتە باس دا لەچەمك و واتای وشەی خواپەرستی (عبادة) تێگەیشتین و ،زانیمان لەتەرازووی بەرنامەی خوادا کێش وسەنگی چەندەو چ پلەو پایەیەکی هەیەو ،کاریگەری و شوێنەوارو بەرهەمی لەژیان و گوزەرانی تاك وکۆمەڵ دا چیەو چۆنەو ،چ ڕووبەرێك لە ژیانی ئینسان دا بەتاك وکۆمەڵەوە دادەگرێ ! کاتی ئەوە هاتوە کەڕاستەوخۆ بچینە سەر توێژینەوەی پایە و دروشمە سەرەکی و بنەڕەتی‌یەکانی خوا پەرستیی کە (نوێـژو زەکـات و ڕۆژوو و حەج و زیکر )ن ،کەزاناو شەرعزانان بە خواپەرستی‌یە ڕووتەکان (العبادات المحضة) ناویان بردوون .

بەڵێ پێویستە پاش ئەوەی بەگشتی باسی "خواپەرستیی" مان کرد باسی "خواپەرستیی تایبەتی" یش بکەین کەدروشم و نیشانەکانی خواپەرستی و دینداریین ،جا بێگومان دوای لێکۆڵینەوەش دەربارەی ئەو پێنج دروشمانە بۆمان ئاشکرا دەبێ کەخوای کاربەجێ‌و زانا لەبەرچی و چ حیکمەتێکی تێدایە کە ئەو پێنج دروشمەی کردوون بەنیشانەو پێناسی تاك و کۆمەڵی خواپەرست و مسوڵمان !

بەڵام بەپێویستم زانی بەرلەوەی ،بچمە سەر توێژینەوەی درووشمە گەورەو گرنگەکانی خواپەرستی چەند ئاگاداری و بنچینەیەکی گرنگ لەبارەی چۆنیەتی هەڵس و کەوت(تعامل) لەگەڵ ئەو وردە بابەتە خیلافی‌یانەدا کەجێگای وتووێژو مشت ومڕی زانایانن و بەزۆریش پەیوەستن بەو دروشمانەی خواپەرستی‌یەوە ،بخەمە ڕوو ،چونکە بەداخەوە زۆر جاران مسوڵمانان لەسۆنگەی چاك لەئایین تێنەگەیشتن و باش پێنەگەیشتنیانەوە ئەو جۆرە مەسەلە جوزئی و خیلافی‌یانە دەکەنە مایەی دەمارگیری (تعصب) و هەراو کێشە نانەوەی بێ جێ ، تەنانەت ئی وا هەیە چەند جۆرو بارێکی ئەو مەسەلانە دەکاتە بناغەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی (اساس الموالاة والمعاداة) و نیشانەی ئیمان و ئیسلام و ،وەك تەرازوو و پێوەرێك ئیمان و تەقوای خەڵکیان پێ‌هەڵدەسەنگێنێ و -بەخەیاڵی خۆی- مسوڵمانەتی و دینداری یانیان پێ دەجەڕبێنێ ! بێ خەبەر لەوەی کەسەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی و تەرازوو وپێوەری

پارێزكاری و دینداری دەبێ ئەسڵ و بنچینەكانی ئایین بن ، نەك مەسەلە جوزئی‌یەكان و بیرورِا خیلافی و ئیجتیهادی‌یەكان ،كەبەدرێژایی مێژوو زاناو شارەزایانی ئیسلام تێیان دا كەوتوونە كێشەو مشت ومرِەوەو هەر كامێكیان ئەو رِایەی هەڵبژاردوە كەپێی رِاست ترو پەسەندتر بووە ،بێ‌ئەوەی كەبیروبۆچوونە هەڵبژاردەكانی خۆی بەخودی شەرع و ئایین بزانێ و ،دەمارگیرانە بیرورِاو ئیجتیهادەكانی بەرانبەریان رِەد بكاتەوە ! یان تۆمەتی ئیمان كزی و كەم پارێزی ئاراستەی خاوەنەكانیان بكات !!

ئومێدیشم وایە كە تێگەیشتن و كارپێكردنی ئەو چەند بنچینەو ئاگاداری‌یە گرنگانە مایەی نەهێشتن و بنبرِكردنی گەلێك هەڵس وكەوتی هەڵەو ناشەرعی و رِاست كردنەوەی گەلێك هەڵوێست و بیروبۆچوونی فەقیرحاڵانەو نەزانانە بێ كەكەم وزۆر لەزۆر كەسی دڵسۆزەوە دەبینرێن و هەست پێ دەكرێن لەبواری دروشمەكانی خواپەرستی دا ،كەلەئەنجامی سەركێڵی و سادە حاڵی بوون لەئایین و قووڵ نەبوونەوە بەقورئان و سوننەت و كەلەپوور و بەرهەمی زاناو پێشەوایانمان دا دووچاریان دەبن،چونكە بەرِاستی كەم زانستی و نەشارەزایی هەمیشە بیركورتی‌و دەمارگیری و تەنگە پرِێسكەیی پەیدا دەكات و شارەزایی و بەرچاو رِوونی و قووڵ بوونەوەش دڵ گەورەیی و سنگ فراوانی و سەماحەت دەرِەخسێنێ و ،خاوەنەكەی بەرەو خاكی‌یەتی و حیساب بۆ خەڵك كردن و گوێ گرتن و قسە وەرگرتن دێنێ‌و ،بەلای كەمەوە لەچاڵی قووڵی بێ ئاگایی و نەزانی‌ی ئاوێتە (الجَهْلُ المُرَكَّبْ) قوتاری دەكات و دەری دێنێ .[1]



---

[1] دەگێرِنەوە كەلەسوقراط فەیلەسووفی ناوداری یۆنانی‌یان پرسیوە كەئایا تۆ زانای یان نەزانی ؟! ئەویش گوتوویەتی نەزانم ! گوتوویانە : ئەدی جیاوازی نێوان تۆو خەڵكی "ئەثینا" چی‌یە ؟! گوتوویەتی : هەردووك لامان نەزانین ئەوەندە هەیە من دەزانم كەنازانم ،بەڵام ئەوان نازانن كەنازانن !

# ڕێ خۆشکردن

*خوێنەری بەڕێز !*

بێگومان برایەتیویەکریزی و یەکبوون و تەبایی مسوڵمانان یەکێکە لەو شتە هەرەگرنگ و بنچینەیی‌یانەی کەخوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەقورئان و سوننەت دا زۆر جەختیان لەسەر کردووەو مسوڵمانانیان بۆ هانداون و ،بەپێچەوانەوە لەچەندان جێگای قورئان و سوننەت و بەچەند شێوە مسوڵمانانیان ئاگادار کردۆتەوەو ترساندوویانن لەسەرەنجامی ناکۆکی و دووبەرەکیّ و جیاجیایی و پەرتەوازەیی ،وە هەر کەسێك ئاشنایی بەقورئان و سوننەت هەبێ زۆر بەڕوونی بۆی دەردەکەویّ کە یەکبوون و برایەتی و تەبایی سیماو نیشانەو درووشمی ئەهلی ئیمان و (توحید)ەو ،پەرتەوازەیی و جیاجیایی و لێك دابڕانیش نیشانەو درووشمی ئەهلی کوفرو شیرك ونیفاقە.

ئنجا ئەوەی کەزۆر جێگای سەرسوڕمان و عاجبایەتی‌یە ئەوەیە کەئەو خواپەرستییە تایبەتی‌یانە[1](العبادات المحضة) ی کەبرایەتی و خۆشەویستی و یەکبوونی خواپەرستان گەورەترین بەرهەمی دنیایی‌یانە ،بکرێنە زەمینەی کێشەو بگرەو بەردەو مشت ومڕو شەڕە دەنووکەو ببنە مایەی ناکۆکیی و دووبەرەکی و پەرتەوازەیی و جیاجیایی یان بەلای کەمەوە بوغزو غەرەزو کینەو زەم و غەیبەت !!

کە لەڕاستی‌دا بێجگە لە کرچ وکاڵی و تێنەگەیشتن و پێنەگەیشتنی مسوڵمانان هیچ هۆکارو فاکتەرێکی دیکە نیە بۆ سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئەو حاڵەت و دیاردە ناشەرعی و ناماقووڵە دزێوە زیانبەخشە ،لەسۆنگەی هەبوونی جیاوازی (خلاف) لەنێوان پێشەواو زانایان دا ،لەسەر زۆر لە مەسەلە جوزئی‌یەکانی خواپەرستی‌یە تایبەتی‌یەکان ،چونکە ئاشکرایە کە سەرجەم مسوڵمانان لەپایەو بنچینە گرنگ و گەورەکانی ئایین و شەریعەتدا یەکن و یەکدەنگن و مەسەلە جوزئی‌یە خیلافی‌یەکانیش لەڕووی حیکمەتەوە بەو شێوەیە هەڵخراون بۆ فراوان بوونی ڕێی دینداری و خواپەرستی و ئاسان بوونی کاروچالاکی‌یەکانی مسوڵمانان لە بارودۆخ

---

[1] مەبەست لەخواپەرستی یە تایبەتی‌یەکان کە شەرعزانەکان (الفقهاء) بە(العبادات المحضة) پێناسەیان کردوون ئەو جۆرە خواپەرستی‌یانەن کەزیاتر پەیوەندی‌یان بەنێوانی خواو بەندەوە هەیە وەك هەرکام لەنوێژ ،زەکات ،ڕۆژوو، حەج ،زیکرو ،دووعا ... هتد .

وكات و شوێن و ژینگە(بیئە) و حاڵەتە جیاجیاکانی ژیان و گوزەرانی تاکی و کۆمەڵییان دا .

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەسوپاس بۆخوای بەخشەرو دادگەر لەمێژە هەر لەبیری ئەوەدام ،کەچۆن چۆنی مسوڵمانان تێکڕاو وێکڕا بێدار ببنەوە و ،لەژێر چەترو سێبەری شەریعەتی فراوان و ئاسانی خوادا کۆببنەوەو ،لەکۆڵ ڕێچکەی خوارو بیردۆزەی نالەبارو پیاوی بێ بار ببنەوە ، زۆر جار کەدیتوومە یان بیستوومە دوو مسوڵمان یان دوو دەستەو کۆمەڵە مسوڵمان لەسەر ئەو وردە بابەتە شەرعییانە کەخوای کاربەجێ و لەڕووی حیکمەت و ڕەچاوکردنی قازانج و بەرژەوەندی مسوڵمانانەوە وای لێ کردوون شێوەیەك زیاتر هەڵبگرن و بەجۆرێك زیاتر جێبەجێ بکرێن ، بۆتە دەمەقاڵێ و مشت ومڕیان و لەیەك هەڵبەزیونەتەوە ،زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بووم و پەرۆش و بەزەییم بەرانبەر بە وەزعی ئیسلام و مسوڵمانان هاتۆتە جۆش و خرۆش ،ئاخر بۆچی و چۆن دەبێ مسوڵمانانێك کەتێکڕاو وێکڕا تەنیا خوایەك دەپەرستن و شوێن پێی تاقە پێشەوایەك هەڵدەگرن و بۆ یەك بەرنامە و ڕێباز گیان لەسەر دەستن و بەس ڕوو بەیەك قیبلە ڕادەوەستن و لەئاقار هەر مەسەلەو بابەتێکی گرنگی عەقیدەیی و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خاوەنی یەك جۆرە هەڵوێستن ،لەسەر هەندێك وردە بابەتی وا کە ئەوپەڕەکەی ڕایە لەیەکتر جیاوازەکانیان ئەگەر یەکسان و وەك یەکیش نەبن هەر چاکترو چاکن یان بەهێزترو بەهێز یان بەهێزو بێ هێزن ، پێکەوە بیکەنە کێشەو هەراو دووچاری تێکگیران و پاشان بوغزو کینەو هەندێك جاریش ناکۆکی و دووبەرەکی و پەرتەوازەیی ببن ؟!!

ئەوە لەلایەکەوە ،لەلایەکی دیکەشەوە چۆن و بەچ شەرع و عەقڵ و ویژدانێك دەبێ کەسانێك کە بەحیساب سەرگەرمی بووژاندنەوەی ئایین و هیدایەت دانی کۆمەڵگاو هێنانەوەی حوکمیخوان لەگەڵ خەڵکی مسوڵمانی چەواشەکراو یان ناحاڵی و نەشارەزادا لەسەر ئەو وردە بابەتانە بیکەنە هەراو کێشەو بەزم وڕەزم و نەزانانەو ناشێیانە هێندە سەخت گیری لەسەر هەندێك جۆرو شێوەی ئەو خواپەرستییانە بکەن - بەتایبەت ئەو جۆرو شێوانە کەخەڵکی پێیان نائاشنان و پێیانەوە ڕانەهاتوون و بەچاوی نامۆیی سەیریان دەکەن - کە زەمینەی کۆمەڵێك پروپاگەندەی نەزانانەی بێ غەرەزانە یان زۆرزانانەی ژەهراوییانە خۆش بێ ،کە لە دژی ڕەوتی ئیسلامی بڵاو بکرێنەوەو لەپێش خەڵك و جەماوەر ببێزرێنرێ و دەهۆڵ بۆ ئیسلامییەکان لێ بدرێ کە : ئەوانە ئایینێکی تازەیان هێناوە جیا لەوەی ئێمە لەسەری بووین ؟!!!

جاسەرەنجام ئەو خەفەت و ناسۆرو دڵتەنگی و بەزەیی و پەرۆش و دڵ پێ سووتانە هانی دام و پاڵی پێوەنام کە کورتە باسێك بۆ چارەسەری ئەو حاڵەتە ناشەرعییە

مەترسیدارو زیانبەخشە بنووسم و لەبەرئەوەش کەئەو جۆرە ڕەفتارو هەڵس و کەوتە هەڵانە لەتەك ئەو مەسەلە خیلافییانەدا زیاتر لەلایەن کەسانێکەوەیە کەخۆیان بەشوێن کەوتووی پێشینی چاکمان (سلفنا صالح) و زانایانی پایەبەرزی وەك (ابن تیمیة) و(ابن حزم) - خوالێیان خۆش بێ - دەزانن بەپەسەندم زانی لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت و جۆری تێگەیشتنی پێشینی چاکمان لەقورئان و سوننەت ،بەتایبەت (ابن تیمیة) ی حەڕانی و (ابن حزم) ی ئەندەلوسی کەبیروڕاو هەڵوێستی ڕاست و دروستی زۆربەی پێشەواو زانایانی پێشینیان بۆ پاراستووین و تۆمار کردووین ،باسەکەم بخەمە ڕوو .

بەهیوای ئەوەی کەتوانیبێتم لەم کورتە باسەدا تارادەیەکی باش نوختە بخەمە سەر پیت ،بۆ چۆنیەتی ڕەفتارکردن و هەڵس و کەوت کردنی شەرعییانە و ژیرانە لەگەڵ ئەو جۆرە مەسەلانەدا کەجیاوازی (اختلاف) تێیان دا هەڵقوڵاوی خودی دەقە شەرعییەکان و جیاوازی عەقڵ و ئەزموون و ژینگەو حاڵ و باڵی جیاجیایی موسڵمانانە و ،شتێکی زۆر سروشتی و ئاساییە و ، زاناو پێشەوایانیشمان بەدرێژایی مێژوو وەك شتێکی ئاسایی و سادە هەڵس وکەوتیان لەتەك دا کردووەو قەت ڕێیان نەداوە بکرێنە زەمینەی کێشەو هەراو نێوان تێکچوون و دۆست زویر بوون و دووژمن و ناحەز پێ خۆش بوون ،وەك بەداخەوە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا بەزەقی دەبینرێ ،لەئاکامی چاك و قووڵ لەئایین حاڵی نەبوونی موسڵمانان یان سینە پیس بوون و تەزکیە نەبوونی دڵ و دەروونیان دا.

وە بەهیوای ئەوە کە لەمەودوا ئەهلی ئیمان و ئەهلی مزگەوت بەهیچ ڕەنگێك ڕێ بەخۆیان نەدەن کە خۆبەخۆ لەنێو خۆیان دا هەراو گێچەڵی لابەلاو بی مەعنا بەرپا بکەن ،لەسەر بەلاداخستن و هەڵبڕین و حەسم کردنی ئەو جۆرە باس و بابەتانەی کە بەدرێژایی مێژوو نەگونجاوە حەسم بکرێن و بەلادا بخرێن ، بەکەڵە زاناو پێشەوایانی وەك چوار سەرمەزهەبەکان و غەیری ئەوانیش ، وە ئەگەر گریمان گونجاش حەسم بکرێن و یەکێك لەو ڕایانە پەسەند بکرێ و هەڵبژێررێ و ئەوانی تر فڕێ بدرێن ،دیسان هیچ شتێکی گەورەو گرنگ لەژیانی موسڵمانان دا ڕوو نادات و گۆڕان بەسەر ئەم بارودۆخ و واقیعە ناشەرعییەیان دا نایەت کە لە سۆنگەی لەئارادا نەبوونی شەریعەتی خواو حوکم نەکردنی ئایینی خوا موسڵمانان سەرجەم گوناحبارو عەیبدارن .

***کەواتە :***

با بەس بێت سەرقاڵ بوون بەشەڕی لاوەکی و بێ مەعناوە لەنێوخۆو لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگاداو ،با لەبواری مەسەلە شەرعییە خیلافییەکان دا بەگیانی برایەتی و

سەماحەت و سینگ فراوانی‌یەوە پێکەوە ڕەفتار بکەین ،ئەو گیانی برایەتی و سەماحەتەی کەزاناو پێشەوایانی پێشینمان هەڵس وکەوتیان پێ لەگەڵ یەکتردا کردووە ، *بۆ وێنە* : شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەوبارەوە ئەو بنچینە زێڕینە ( القاعدة الذهبية) ی بۆ داناووین کەدەڵێ : (قَوْلِي صَوابٌ يَحْتَمِلُ الخَطأَ وقَوْلُ غَيْرِي خَطأٌ يَحْتَمِلُ الصَّوابَ) واتە : ( قسەو ڕای خۆمم پێ ڕاستە بەڵام دەگونجێ هەڵەش بێ ،وەقسەو ڕای بەرانبەرەکەمم پێ هەڵەیە بەڵام ڕێی تێ‌ئەچێ ڕاستیش بێ ) .

وە باهەوڵ بدەین بەهیچ جۆرێك لەگەڵ کۆمەڵگاو خەڵکە مسوڵمانەکەماندا لەسەر ئەو مەسەلە جوزئی‌یە خیلافی‌یانە دووچاری تێك گیران نەبین و ،ئەگەر هەر لەیەك هەڵدەبەزینەوەو یەکتر دەڕەنجێنین بالەسەر بابەتە گرنگ و بنەڕەتی‌یە کانی دینداری و مسوڵمانەتی بێت لەبوارەکانی ئیمان و عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق و حەڵاڵ و حەرام و ...هتد دا !

چونکە بێگومان ئێمە شوێن کەوتووی بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرانین صلی الله علیهم و سلم ئەوانیش تەنیا لەسەر مەسەلە بنەڕەتی‌یەکان لەگەڵ گەل و کۆمەڵگایەکانیان دا دووچاری تێك گیران بوونە ،وەبێگومان کاتێکیش ئێمە لەو بوارە سەرەکی و مەسەلە بناغەیی و مەزنانەدا لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەرماندا دەگەینە قۆناغی حەسم و بەلادا خستن ئەوە بەتەئکید گۆڕانکاری ڕیشەیی و ڕاستەقینە بەسەر کۆمەڵگاکەمان دا دێت، ئەگەر نا ناوی خۆ زڕاندن و دەنگ و دوو بلاو کردنەوە لە سەر مەسەلە جوزئی وبیروڕا جیاجیاکانی زانایان هیچ لە وەزع ناگۆڕێ - مەگەر بەرەو خراپتر - چونکە ئەو حاڵەتە وەك پێشتریش باسمان کرد هەر بریتیە لەگەڵ خۆدا خەریك بوون بگرە خۆ خواردنەوە و گەندەڵ و پووچەڵ بوون و ، مێژووش بۆمان دەگێڕێتەوە کە مسوڵمانان لە ڕۆژگاری دەستەڵاتدارێتی عەبباسی‌یەکاندا لەکاتێك دا کەتەتەر و مەغۆل لە ڕۆژهەڵاتەوە و خاچ پەرستەکان لە ڕۆژئاواوە هێرشیان کردە سەر ئوممەتی ئیسلامی و کیان و قەوارەی ئیسلامی، هەر سەرگەرمی ئەو جۆرە باس و بابەتە لاوەکی‌یانە بوون ، ئیدی ئەوان هەر لەو مشت و مڕە لاوەکی و بێ مەعنایانە دابوون هەتا دەوریان گیرا و وڵاتیان داگیر کراو هەر هێندە بە خۆیان زانی کە سەرجەمیان و بە هەموو بیرو بۆچوونە جیاوازەکانیانەوە دیل و زەلیل و ژێر دەست و پەستن!!

*لە کۆتاییش دا دەڵێم :* با هیچ کەس بە هەڵە وا لەم قسانەم حاڵی نەبێت کەمن ڕام وایە لێکۆڵینەوە نەکرێ و لە نێو ڕاو بۆچوونەکانی زانایان دا هەڵسەنگاندن و تەتەڵە و بێژنگ نەبێ! با هەبێ بەڵام لە کاتی خۆی‌دا و لە شوێنی خۆی دا و لەگەڵ ئەهلی خۆی‌دا و بە ئەندازەی کە پێویست بکات و با زۆریش وریا بین لە سەر حیسابی باس و بابەتە سەرەکی و بنچینەیی‌یەکانی دین و ژینمان نەبێ .

**پێناسەی ئەم کورتە باسە :**

ئەم کورتە باسەی بەردەست تان لە چوار ئاگاداری گرنگ پێك هاتوە کە هەرکامێکیان بنچینەیەکە بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنێکی شەرعی یانە و ژیرانە لەگەڵ مەسەلە خیلافی یە فیقهی یەکان دا .

## ئاگاداری یەکەم:

دەربارەی گرنگی و گەورەیی یەکڕیزی و برایەتی و تەبایی یە ، کە زۆر جار پێویست دەکات هەندێك شتی سوننەت و فەڕزیشی بە قوربان بکرێ بۆ پارێزگاری لێ کردنی و مەحکەم کردنی و زیاتر چەسپاندنی ، چ جای چاوپۆشی کردن لە جێبەجێ کردنی هەندێك لە جۆرەکانی خوا پەرستی بەپێی قسەی بەهێزتر ( ارجح) !! چونکە بە ئەزموونگەلی جۆراوجۆر ئیسپات بووە و دەرکەوتوە کە هەر گەل و کۆمەڵێك برایەتی و یەکبوون وتەبایی نێو خۆیان لە دەست بدەن دووچاری زیان و نەهامەتی جۆراوجۆر دەبن و بە هیچ شتێك بۆیان قەرەبوو ناکرێتەوە ، ئنجا بێگومان شەرع و عەقڵیش ڕازی نابن بەوە کە یەکێك یان کۆمەڵێك سوننەتێك جێبەجێ بکات بەلام لە بەرانبەردا فەڕزێك لەدەست بدات ، یان زیانی پەیدا بوونی حەرامێك هەڵبگرێ ، چ جای بە هۆی هەڵبژاردنی ڕایەکی بەهێزترەوە ئەو زیانەی لێ بکەوێ ، نەك هەرئەوە بگرە شەرع و عەقڵ پێویست دەکەن کە فەرزی گچکەتر بۆ قوربانی گەورە تر بکرێ و لە پێناوی پارێزران لەزیانی گەورە تر هی گچکەتر ( تَحَمُّل ) بکرێ ، وە ئەمانە چەند بنچینەیەکی شەرعیین کە سەرجەم زانایان بێ جیاوازی لە سەریان ڕێك کەوتوون.

کەواتە با ئەو کەسەی کە دەڵێ : من حەتمەن فلانە سوننەت یان فلانە ڕایە هەر جێبەجێ دەکەم و هەرچی دەقەومێ با بقەومێ! سوور سوور بزانێ کە ئەو هەڵوێستەی هەرچەندە حەماسەت و دڵگەرمی زۆری پێوە دیارە ، بەلام لە ڕووی دینداری‌یەوە بە پێی شەرع لە سەری گوناحبار و قەرزدارە و سەودایەکی نەزانانەی کردوە، کە لە پێناو وەدەست هێنانی قازانج و بەرهەمێکی کەم دا زەرەر و زیانێکی گەورەی لێ کەوتوە ، یان خێر و پاداشتێکی چاکتر و زیاتری لە دەست چووە!!

## ئاگادرای دووەم :

خستنە ڕووی ئەو ڕاستی‌یەیە کە تێکڕای یان زۆربەی ئەو ڕاجیایی (( الإختلاف )) انەی کە لە بواری مەسەلە جوزئی‌یەکانی خواپەرستی‌یە تایبەتی‌یەکان . لە نێو زانایان دا سەریان هەڵداوە و سەرهەڵدەدەن ناگەنە جوغزی فەڕز و حەڕام تاکو پاساو و بیانووی تێك گیران و کێشەو ناکۆکی نێوان مسوڵمانان بن ، بەڵکو هەر لە بازنەی سوننەت و سوننەتتر یان ئەو پەڕەکەی سوننەت و نا پەسند ( مکروه ) دان و ،

بێگومـان ئـەو جـۆرە شـتانەش مـادام گوناحباری‌یـان تێـدا نـەبێ دروسـت نی‌یـە هەراوکێشەیان لە سەر بنیات بنرێ و بکرێنە دەستە چیلەی ئاژاوە و مایـەی لا لووتـی و ڕەنجان و لە یەك دابڕان .

## ئاگادرای سێیەم :

هۆشـیار کردنــەوە و بێـدار کردنـــەوەی مســولمانانە دەربـارەی ئـەوە کــە لایەنــە جوزئی‌یەکانی خـوا پەرستیی‌یەکان خـوای کاربەجێ و پەنهان بـێن بـە شـێوەیەکی لێ کردوون و وای هەڵخستوون کە بە شێوەو چۆنیـەتی جیاجیا بکرێـن و ، هەمووشیان هـەر لـە بازنـەی فراوانی سوننەت دا بن و ، لە خێر و پاداشتیش دا یـان وەك یـەك و یەکسانن یان بۆ حاڵەتە جیاجیاکانن.

جا دیـارە لـەم ڕووەشـەوە هیـچ کـەس بیـانوو و پاسـاوی دەمـەقاڵێ و هـەراو کێشـە نانەوەی نیە و ، مەگەر لە سەر بناغەی دەمارگیری و تەسك بینی کە بەرهەمی نـەزانی (جـهل ) و عیلـم پـێ نـەبوون و کـەم تـەقوایی و تەزکیـە نـەبوونن ، ئەگـەرنا مەحاڵـە مسوڵمانی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو ڕێگا بەخۆی بدات لە سەر ئەو جۆرە مەسەلانە کێشەو فەرتەنە دروست بکات .

## ئاگادرای چوارەم :

ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستی‌یە شەرعی‌یە گرنگەیە کە زۆر لە مسوڵمانان لێی بێ ئاگان ، ئەویش ئەوەیە کە مادام ئەو وردە بابەتانەی کە زانایان تێیان دا ڕای جیاوازیـان هەیـە هـەموویان دروست و ڕەوابن ، جا چ لە خێر و پاداشت دا یەکسان بن ، چ بـەرزی و نزمی ( تفاضل ) یان لە نێوان دا هـەبێ ، پەسند وایە هەرجارە بە جۆرێکیان ڕەفتار بکرێ ، نەك هـەر لـە سـەر جۆرێکیـان دەوام بکـرێ یـان دوو جۆریـان لـە یـەك کـاتدا کۆبکرێنەوە ، کە بێگومان ئەگەر بەو پێیە ڕەفتار بکرێ کە گوتوومانـە (پەسـند ) ە هەم تێکڕای دەقەکانی سوننەت کاریان پێدەکرێ و هیچیان فەرامۆش ناکرێن ، وە هەم ئەو شێوە ڕەفتارە ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە پەیدا کردنـی ئولفـەت و تـەبایی و پێکەوە گونجان و برایی ، بەڵام بە پێچەوانـەوە بـەردەوام بـوون لـە سـەر جۆرێکیـان وێڕای پشت گوێ خستنی بەشێکی زۆری سوننەت ، سـەریش دەکێشـێ بـۆ دەمـار گیری و تەسك بینی و کەللەئیشکی ، وە کۆکردنەوەی دوو جۆر یان زیـاتریش لـە یـەك حاڵ و کات دا لەگەڵ سوننەت دا ناکۆکە چونکە بێگومان پێغەمبـەری خـوا ﷺ هیـچ کاتێك وای نەکردووە وەك لەدەقەکانی سوننەت دا بە ڕوونی دەبینرێ. ئێسـتاش تـۆ و هەر چـوار ئاگادرای‌یـە گرنگـەکان بـە هیـوای ئـەوەی کـە بـە جـارێك و دووان واز لـە خوێندنـەوە و تێوەڕامان و سەرنج دانیان نەهێنێ، بۆ ئەوەی چاکـتر و زیـاتر تێیـان بگەی و هەزمیان بکەی و پاشانیش جێبەجێیان بکەی و ڕەفتاریان پێبکەی.

# بنچینەو ئاگاداری یەکەم

((یەکریزیو تەبایيو برایەتی یەکێکە لەو ئەسڵ و بنچینە هەرە گەورەو گرنگانەی کە ئیسلام گرنگی‌یەکی زۆری پێداون و داکۆکی زۆری لەسەر کردوون، بۆیە هەر قسەو هەڵوێستێك ببێتە مایەی مەحکەم بوون و پتەو بوونی پێویست (فرض) یان لانی کەم پەسندی کردووەو، بە پێچەوانەشەوە هەرشتێك هۆکاری لاوازیو کەلێن تێدا پەیدا کردنی بێ حەرام یان بەلای کەمەوە بە ناپەسەند (مکروە)ی حیساب کردووە)).

ئەمەش چەند وێنەیەك لە دەقەکانی قورئان و سوننەت کە لە لایەکەوە فەرمان بە برایەتيو یەکریزیو یەکدەنگ و ڕەنگی مسوڵمانان دەکەن و بۆ زیاترو چاکتر پێکەوە جۆشدانی ڕیزەکانیان هانیان دەدەن و، لەلایەکی دیکەشەوە لە ناکۆکيو دووبەرەکی دەیانترسێنن و لە پەرتەوازەيیو جیاجیایی دەیان سڵەمێننەوە.

١-(یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله حَقَّ تُقاتِه ولا تَموتُنَّ الاّ وأَنتم مُسْلمون. واعْتَصِموا بِحَبْلِ اللهِ جمیعاً ولا تفرَّقوا...) آل عمران -١٠٢، ١٠٣- ، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە وەك بۆخوا شایستەیە پارێزکاری لێبکەن وە بە مسوڵمانەتی نەبێ مەمرن. وە تێکڕاو وێکڕا توند دەست بە ڕێسمانی - ئایینی - خواوە بگرن و پەرتەوازە مەبن.

٢- (وأَطیعوا اللهَ وَرَسُولَهُ ولا تَنازَعوا فَتَفْشَلوا وَتَذْهَبَ رِیحُكُمْ واْصْبِروا انَّ اللهَ مَعَ الصّابرین) الانفال -٤٦- ، واتە: وە - ئەی بڕوادارینە:- فەرمانبەری خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، وە پێکەوە ناکۆك مەبن ئەگەرنا فەشەل دێنن و هێزو پێزتان نامێنێ. وە خۆڕابگرن بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە.

٣- (عن عائشة رضي الله عنها ان النبي ﷺ قال لها: یا عائشة! لَولا أَنَّ قَومَكِ حَدیثُ عَهدٍ بجاهلیةٍ، لأَمَرْتُ بالبَیْتِ فَهُدِمَ، فَأَدْخَلْتُ فیه ما أُخرِجَ مِنْهُ وأَلْزَقْتُهُ بالأَرْضِ، وجَعلْتُ لَهُ باباً شَرْقیاً وباباً غربیّاً فَبلغتُ بِه أَساسَ ابراهیمَ) رواه البخاري ومسلم.

*واتە:* عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پـێی فەرمووە: ئەی عائیشە! ئەگەر هاتباو گەلەکەت لە سەردەمی نەفامێتی‌یەوە نزیك نەبوونایە، فەرمانم دەکرد کەعبە بڕوخێنرێ، بۆ ئەوەی ئەو ئەندازەیەی کە لێی کەم کراوەتەوە بیخەمەوە سەریو دیوارەکانی نزیك بکەمەوە لە زەوی، وە دەرگایەکی ڕۆژهەڵاتيو

دەرگایەکی ڕۆژئاوایی بۆ دابنێم و بیگێڕمەڕسەر ئەو بناغەو نەخشەیەی کە لە کاتی خۆی ئیبراهیم بۆی داناوە.

وەك لەم فەرمودەیەدا دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاشکاوی بەعائشەی هاوسەری دەفەرموێ کەلەبەرئەوە چاوپۆشی دەکەم لەچاککردن و ڕاست کردنەوەی کەعبەو گێڕانەوەی بۆسەر نەخشەو بناغەیەك کە ئیبراهیم علیه الصلاة والسلام بۆی داناوە، چونکە گەلەکەت – واتە قورەیش یان گەلی عارەب بەگشتی – لەسەردەم و ڕۆژگاری نەفامێتیەوە نزیکن و لەمێژ نیە هاتوونە نێو ئیسلامەوە، واتە نەبادا تێکدان و ڕاست کردنەوەی دیوارو دەرگاکانی کەعبە ببێتە مایەی پەیدابوونی پەشێوی‌و ئاژاوەو ئالۆزی‌و ناکۆکی‌و زیان بەیەکڕیزی‌و تەبایی موسڵمانان بگات و ڕاست کردنەوەی کەعبە موسڵمانان – بەهۆی لەژێر کاریگەری بیروبۆچونەکانی سەردەمی نەفامێتی دا بوونیان – دووچاری کێشەو گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیەك بکات کە زەرەرو زیانی زیاتر بێت لە خێرو قازانجی چاککردن و ڕاست کردنەوەی کەعبە، دیارە ئەم ئەنجامگیری (استنتاج)ە یە هەرچەندە دەقی ئەو فەرموودەیەی هێناومانە دەلالەتی لەسەر دەکات، بەڵام لەڕیوایەتی دیکەی ئەو فەرموودەیەدا کەهەر لە (صحیح البخاری)یش داهاتووە بەڕاشکاوی باس کراوە، کە فەرموویەتی : **(فاخافُ أنْ تُنكِرَ قُلوبِهمْ)**

*واتە:* دەترسم دڵیان بگۆڕێ‌و ئەو کارە – ڕاست کردنەوەی کەعبە – بەشتێکی نامۆو خراپ بزانن.

جا بێگومان ئەگەر پێویست بێ یان بەلای کەمەوە پەسندو چاکتر بێ کە لەبەر دڵڕاگرتن و پەیدا نەبوونی کێشەو ئاژاوە لەنێو خەڵکی‌دا چاوپۆشی لەڕاست کردنەوەی کەعبە بکرێ، دیارە حەوجار حەوجار(بطريقة الأَوْلَى) پێویست و پەسندە کە بە مەبەستی پاراستنی تەبایی‌و یەکڕیزی‌و برایەتی موسڵمانان سەخت گیری لەسەر هەندێك وردە بابەتی عیبادەت کە بەسوننەت ترو چاکتر دادەنرێن نەکرێ‌و لەئەندازەو قەبارەی شەرعی‌و سروشتی خۆیان زلتر نەکرێن و نەکرێنە نیشانەو دروشمی شوێن کەوتنی قورئان و سوننەت و بناغەی دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی (أُساسَ المُوالاةِ والمُعاداة)، زانای پایەبەرز (ابن تيمية) لەوبارەوە چەند قسەیەکی جوانی کردوون کەئەم چەند ڕستەیەی لێ دەخوازینەوە:

(...ويَسوغُ ايضاً أَنْ يَتْرُكَ الانسانُ الأَفْضَلَ لتأْليفِ القُلوبِ واجتماعِ الكلمة خَوفاً من التنفير عَما يَصْلُح كما تَرَكَ النبيُّ (ﷺ) بناءَ البَيْتِ على قواعد ابراهيم لِكَوْنِ قُرَيْشٍ كانوا حديثي عهدٍ بالجاهلية وخشي تنفيرهم بذلك. ورأى انَّ مَصْلحة الاجتماع والأئتلاف مُقَدَّمةٌ علىٰ مصلحة البناء على قواعد ابراهيم..)[1]

*واته:* (...وه هەروەها دروست و ڕەوایە کە ئینسان بەمەبەستی ڕاگرتن و هۆگربوونی دڵەکان و یەکدەنگی و یەکریزی مسوڵمانان و نەوەك ببێتە هۆی سڵەماندنەوەیان لەکاروکردەوەی باش، واز لە کردەوەیەکی چاك بێنێ. وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) وازی لەدروست کردن و بنیاتنانەوەی کەعبە لەسەر بناغەی ئیبراهیم هێنا لەسۆنگەی ئەوەوە کە قورەیشی‌یەکان زۆر نەبوو لەسەردەمی نەفامێتی‌یەوە ڕزگاریان بووبوو، وە لەوە ترساوە کە بەدەستکاری کردنی کەعبە بیانسڵەمێنێتەوە - لەئیسلام - وەزانیویەتی کەبەرژەوەندی کۆبوون و تەبایی و یەکریزی موسڵمانان لەپێش سوودو بەرژەوەندی بنیاتنانەوەی کەعبەوەیە لەسەر بناغەی ئیبراهیم... )

**٤-(عن عبدالله بن عمر وبن العاصي رضي الله عنهما أن رجلاً سال رسول الله ( ﷺ): أي المسلمين خيرْ؟! قال: مَنْ سَلِمَ المسلمون من لِسانه ويدهِ) رواه مسلم.**

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو مسوڵمانەی بەچاکترین مسوڵمان داناوە کە مسوڵمانان لەدەست و زمانی پارێزراوو سەلامەت دەبن .

(نووي) لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: (فيه جُمَلٌ من العلم،فَفِيْهِ الحَثُّ علىٰ الكَفِّ عما يُؤْذي المسلمين بقولٍ أو فعْلٍ، بمباشرةٍ او سَبَبٍ، وفيه الحَثُّ على الأمساك عن إحتقارهم،وفيه الحَثُّ على تألف قلوب المسلمين واجتماع كلمتهم، وأسْتجْلابُ مايُحصِّل ذلك، قال القاضي عياض: والأُلْفَةُ إحدىٰ فرائِضِ الدين وأركان الشريعة ونِظامُ شَمْلِ الأُسلام)[2].

---

(١) بڕوانە: (الفتاوى الكبرى) لأبن تيمية ج١ ص (٨٨-١٠٤).

(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٢ ص١٠، وە بڕوانە: (رسالة الألفة بين المسلمين) ص١٠، نووسراوی (ابن تيمية) و (تحقيق)ی (عبدالفتاح أبوغدة).

*واته:* (لەم فەرموودەیەدا چەند زانیاری‌یەك هەن، وەك:

ا-هاندان بۆ خۆپاراستن لەهەر شتێك كەئازاری مسوڵمانان دەدات بە قسە یان بەكردەوە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

ب-وە خۆگرتن لەبەسووك سەیركردنی مسوڵمانان.

ج-وە هاندانیان لەسەر یەكخستنی دڵی مسوڵمانان و یەكدەنگ و یەكڕەنگ كردنیان و پەیداكردنی ئەو هۆكارانەی كەئەو مەبەستە دێننە دی.

(قاضی عیاض)یش گوتوویەتی: تەبایی‌و پێكەوە گونجان یەكێكە لەفەڕزەكانی ئیسلام و پایەكانی شەریعەت و مایەی توند و تۆڵی‌و تۆكمەیی ئیسلامەتی‌یە.

٥-(عن سهل بن سعد الساعدي رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله (ﷺ : المؤمن مألَفَةٌ ولاخَيْرَ فِيمَنْ لايـألَفُ ولايُؤْلَفُ)رواه احمد الطبراني واسناده جيد، وفي رواية: (المؤمن آلِفٌ مألوفٌ)،

*واته:* بڕوادار مایەی هۆگری و تەبایی‌یە، وەكەسێك لەگەڵ خەڵك هۆگرو هۆگر كراو نەبێ خێری پێوەنیە.

بەڵێ مسوڵمان پێویستە نەرم و نیان و تەباو گونجاو بێ، نەك شڕودڕو ڕەق وتەق و بێ سەلیقەو نەگونجاو.

٦-(عن ابي موسى الأشعري رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): المؤمن للمؤمن كالبُنْيان يَشُدُّ بَعضُه بَعْضاً، ثم شَبَّكَ بَيْنَ أَصابِعِه) متفق عليه، واتە بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە هەندێكی ئەوی دیكەی مەحكەم دەكات، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەكانی تێك ترینجاندن و خستنیە نێویەك.

(مناوي)لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە گوتوویەتی[1] :مەبەست: بڕواداران هەندێكیان بۆ هەندێكیان وەك دیوار وان، بەهاوكاری برایەكەی نەبێ لەكاروباری دین و دنیای‌دا بەهێز نابێت هەروەك چۆن دیوار هەندێكی هەندێكی مەحكەم و بەهێز دەكات.)

(نووي)ش ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت گوتوویەتی[2]: (ئەم فەرموودەیە زۆر ڕاشكاوانە مافی موسڵمانان لەسەر یەكتر دەخاتە ڕوو، وەهانیان دەدات كەلەگەڵ یەكتر بەبەزەیی‌و خاوەن لوتف بن و پشتگیری یەكتر بكەن مەگەر لەسەر گوناح و شتی ناپەسەند).

---

[1] بڕوانە: (فیض القدیر) ج٦ ص ٢٥٢.

[2] بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج١٦ ص ١٣٩.

٧-(يد الله مع الجماعة والشيطان مَعَ مَنْ خَالَفَ يَرْكُضُ) رواه الطبراني وقال الهيثمي رجاله ثقات.

*واته:* دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵ دایەو شەیتانیش لەگەڵ ئەو کەسەدا غار دەدات کە پێچەوانەی کۆمەڵ ڕەفتار دەکات.

وە ئەم فەرموودەیە بەچەند شێوەیەکی دیکەش گێڕراوەتەوە یەکێکیان: (عليكم بالجماعَةِ، وإيّاكُمْ والفُرْقَةَ فانّ الشّيْطانَ مع الواحِدِ وهو مع الاثنين أبْعَدُ..) رواه الترمذي وقال: هذا حديث حسن صحيح غريب من هذا الوجه. واتە: لەگەڵ کۆمەڵ دابن و خۆتان لەجیاجیایی بپارێزن چونکە شەیتان لەگەڵ کەسی تەنها دایە بەڵام لەدووان دوورترە.

٨-(ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصلاةِ والصِّيام والصَّدَقَةِ والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر؟! قالوا : بلى يارسول الله، قال: صَلاحُ ذاتِ البَيْنِ، فانّ فَسَادَ ذاتِ البَيْنِ هي الحالِقَةُ، لاأَقولُ تَحلِقُ الشَّعْرَ ولكِنْ تَحلِقُ الدِّيْنَ) رواه ابو داود الى قوله (الحالقة) رواه الى آخرة الترمذي والبزار في مسنده باسنادٍ جيد.

*واته:* ئایا هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی شتێك كەپلەی باشتر بێت لەپلەی نوێژو ڕۆژوو ماڵ بەخشین و فەرمان بە چاكەكردن و ڕێ لەخراپە گرتن؟! گوتیان:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: چاكبوون و خۆش بوونی نێوانتان، چونكە تێكچوونی پەیوەندی نێوانتان هەڵتاشەرە، ناڵێم هەڵتاشەری موو، بەڵكو دین هەڵدەتاشێ و دادەپاچێ.

*جا ئێستا خوێنەری بەڕێز:* دوای ئەوەی لەبەر تیشكی ئەم چەند ئایەتەی قورئان و فەرموودەیەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تا ڕاددەیەك گەورەیی و گرنگی برایەتی و تەبایی و پێكەوە گونجان و پشتی یەكتر گرتنمان بۆ دەركەوت، وە بەپێچەوانەشەوە زانیمان كە دووبەرەكی و پەرتەوازەیی و جیاجیایی نێوان مسوڵمانان چەندە دەردێكی گران و نەخۆشییەكی بێڕەزاو بێ ئامانە، كە دەتوانین بڵێین: هەروەك چۆن یەكبوون و تەبایی پاش خوا بەیەككرتن و بڕوا (التوحيد و الأيمان) گەورەترین و چاكترین چاكەیە، پەرتەوازەیی و ناكۆكیش دوای كوفرو شرك زلترین و خراپترین تاوانە لەسەر ئاستی كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمان، بەڵێ ئێستا جێی خۆیەتی بچینە سەر باس و خواسی ئاگادارییەكانی‌تر كە بێگومان هەموویان لەخزمەت ئەم ئەسڵ و بنچینە گەورەو گرنگەدان كەلەم ئاگاداری یەكەمەدا خستمانەڕوو.

# بنچینەو ئاگاداری دووەم

﴿سەرجەم یان زۆربەی ڕاجیاییەکان (إختلافات) کەلەبواری وردە بابەتەکانی عیبادەتەکاندا سەرهەڵدەدەن لەجوغزی سوننەت و سوننەتریان ئەوپەڕی سوننەت وناپەسەند (مکروە) ناچنە دەرێو، ناگەنە نێو بازنەی فەرزو حەرام﴾ .

(إبن تیمیة) خوالێی خۆش بێ لەو بارەوە چەند نموونەیەك دێنێتەوەو دەڵێ:

(چونکە پیاو ئەگەر بە (تمتُّع[1]) یان (إفراد[2]) یان (إقران[3]) حەج بکات، ئەوە هەرچەندە زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەوە کە کامیان چاکترە ڕایان جیاجیایە، بەڵام هەمویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەحەجەکەی تەواوەو بۆی بەردەکەوێ، بەڵام هەندێك لەو تاقمانەی کە لە ڕێبازی جەماوەری موسوڵمانان لایان داوە یەکێك لەو جۆرانە پێویستیان مەنع دەکات، بۆ وێنە هەندێك لەشیعەکان جۆری (تمتع) فەرز دەکەن و، هەندێك لە (ناصبة)ش بەحەرامی دەزانن و دەڵێن بەهیچ جۆرێك حەج کردنی (تمتع)دروست نیە).

هەروەها بانگ بەشێوەی (ترجیع[2]) بێ یان نا، ئەوە لەلای تێکڕای زانایانی ئۆممەت بەپێشین و پاشینەوە بانگێکی ڕاست و دروستە. دیسان چوار (الله اکبر)ەکانی سەرەتای بانگ بەجیاجیایان بڵێ یان دوو دوو پێکەوە جووتیان بکات، هەردووك جۆرەکە دروستن و تەنها هەندێك لەشەرعزانە ڕیزپەڕەکان لەو بارەوە ڕایان جیاوازە هەروەك چۆن هەندێك لەشیعەکان ڕایان جیایەو گوتنی (حَيَّ علىٰ خَيْرِ العَمَل) لەبانگدا بەفەرز دەزانن، هەروەها قامەت خوێندنیش وشەکانی یەك یەك بڵێ یان دوو دوو، ئەوە لەلای سەرجەم زانایانی ئیسلام قامەتەکەی دروستەو هیچ کەس لەوبارەوە ناکۆکی نیە جگە لەهەندێك خەڵکی ڕیزپەڕ.

---

[1] و [2] و [3]: چەند جۆرە حەج کردنێکن کە بەیارمەتی خوا لەباسی (حەج)دا ڕونیان دەکەینەوە.

[2] لەبانگ دا ئەوەیە کە بەر لەوەی بانگبێژ بەدەنگی بەرز بڵێ: (أشهد أن لاَ إله الا الله... وأشهد أن محمداً رسولُ الله...) بەدەنگی نزم بیانڵێ.

دیسان دەنگ بەرز کردنەوەو نزم کردنەوە لەکاتی خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) دا هەردووکیان دروستن و هیچ کامیان نوێژ بەتاڵ ناکەنەوە، هەرچەندە هەندێك لەزانایان یەکێکیان بەسوننەت وئەوی تریان بە ناپەسەند (مکروە) بزانێ، یاخود وای پێ باشتر بێت کە بەو جۆرەیان نەخوێنێ، کەواتە کێشە لەسەر ئەوەیە کامیان باشترە ئەگەر نا لەلای تێکڕای زانایان نوێژ بەهەرکامێکیان دروستە، هەرچەندە زانایان دەربارەی دەنگ بەرز کردنەوەو نزم کردنەوە هەرکامێکیان لە شوێنی خۆیدا ئایا فەرزە یان نا؟ مشت و مڕیان هەیەو لەمەزەبی (مالك)و (احمد)و غەیری ئەوانیش دا کێشەیەکی زانراوی لەسەرە، بەڵام ئەوە لەدەنگ هەڵێنانی قورئان خوێندنی زۆردا، وەك قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی بەدەنگی کپ و دەنگ بەرز کردنەوە لەقورئان خوێندنی نوێژی نیوەڕۆدا، بەڵام دەنگ هەڵێنان یان نزم کردنەوە بەئەندازەیەکی کەم لەقورئان – لەغەیری شوێنی خۆیان دا – ئەوە هیچ کەس بۆی نیە نوێژ بەوە بەتاڵ بکاتەوەو هیچ کەسیشم پێ شك نایەت قسەی وای کردبێ، چونکە لە (صحیح)ی (بخاري ومسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) جاری وا هەبووە لەنوێژێك دا کەپەنهانی دەخوێندرێ وای دەکرد کە گوێ بیستی خوێندنەکەی بن.

وە لە (صحیح البخاري)دا لە (رفاعة بن رافع الزرقي) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە لەپشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژمان دەکرد، کاتێك سەری لە ڕکووع بەرزکردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) پیاوێك لەدوایەوە گوتی: (رَبَّنا ولَكَ الحَمْدُ حَمْداً كثيراً طَيِّباً مُباركاً فيه)، جا کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: (مَنِ المُتَكَلِّمُ؟) واتە: کێ بوو قسەی کرد؟!، کابرا گووتی: من، فەرمووی: (رأيتُ بِضْعةً وثلاثين مَلَكاً يَبْتَدِرونَها أيُّهُمْ يَكْتُبُها أوَّلَ) واتە: سیوئەوەندە فریشتەیەم دیتن پێشبڕکەیان بوو کامەیان لەپێش دا بینوسێ، ئنجا ئاشکرایە کە ئەگەر بەدەنگی بەرز نەیگوتبایە پێغەمبەر (ﷺ) نەیدەبیست، هەروەها گێڕەرەوە (راوی)ش، ئاشکراشە کە سوننەتە نوێژکەر (مأموم) ئەو جۆرە شتانە بەدەنگی نزم بڵێ.

هەروەها لە (صحیح المسلم) داهاتوە کە عومەر خوالێی ڕازی بێ بەدەنگی بڵند دوعای دەست پێ کردنی نوێژ (الاستفتاح)ی دەگوت: (سُبْحانَكَ اللّهُمَّ وبِحَمْدِك، وتَبارَكَ اسْمُكَ، وتعالىٰ جَدُّكَ، ولا إلهَ غَيْرُكَ)وە ئەمەشی لەنێو کۆچکەران و پشتیوانان دا کردوە، سوننەتی بەردەوامیش لەو حاڵەدا دەنگ نزم کردنەوەیە.

دیسان لەنێو هاوەڵان دا خوالێیان ڕازی بێ هی وا هەبوو کەدەنگی بە گوتنی: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) هەڵدەهێنا، وە لە (صحیح البخاری)دا هاتوە کە (ابن عباس) خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ بەدەنگی بەرز سووڕەتی فاتیحەی لەنوێژی سەر جەنازەدا خوێندوە، وەگوتوویەتی: تاکو بزانن کە ئەمەش سوننەتە، وە وێنەی ئەمانە شتی دیکەی هەیە.

هەروەها کێشە لەوەدا نیە کە هەندێك لە هاوەڵان وەك (ابن الزبیر) و هاوەڵانی خوالێیان ڕازی بێ دەنگیان بە (بسم الله الرحمن الرحیم) بەرزکردۆتەوەو هەشیان بووە وەك (ابن مسعود) خوا لێی ڕازی بێ و غەیری ئەویش بەدەنگی بەرز نەیانگوتوە وە هاوەڵان لەو بارەوە دواون، بەڵام هیچ کەس بەهۆی ئەوەوە نوێژی کەسی بەبەتاڵ نەزانیوە، لەمەدا کێشەم نەزانیوە بووبێ. هەرچەندە لە فەرزبوون و نەبوونی خوێندنیدا کێشە هەیەو ئەوەش مەسەلەیەکی دیکەیە.

هەمدیسان خوێندنی قونووت لەنوێژی بەیانیدا کێشە لەنێو زانایان دا لەسەر ئەوەیە کە ئایا سوننەتە یان ناپەسەند (مکروه)ە، وەئایا سوجدەی سەهوو بۆ نەکردنی یان بۆکردنی ببرێ، ئەگەر نا تێکڕایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەوەی نەیخوێنێ نوێژەکەی تەواوەو قونووت فەرز نیە، هەروەها ئەوەش کە دەیخوێنێ بەلای ئەوانەوە کە سوننەت نیە، نوێژەکەی تەواوە چونکە قونووت بەس تۆزە درێژکردنەوەیەکی ڕاست بوونەوەو ڕێك بوونەوە (اعتدال) – ی دوای ڕکووع – یە، وە لەخوا پاڕانەوەیە لەو شوێنەدا، وەئەگەر گریمان لەغەیری نوێژی بەیانیش دا ئەوە بکات بەڕای سەرجەم زانایان ئەوەندەی من بزانم نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

هەروەها خوێندنی دووعای قونووت لە وەتردا ، ئایا لەهەموو ساڵ دایە یان بەس لەنیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزان دا؟! ئەوە بەس لەسوننەت بوونیدا ڕای جیاجیا هەن، ئەگەر نا لەوەدانیە کە فەرز نیەو نوێژیشی پێ بەتاڵ نابێتەوە، هەروا لەپێش یان لەپاش ڕکووع بەهەمان شێوەیە.

دیسان سەلام دانەوەی دووەم ئایا لە نوێژی تەواوو ناتەواو – واتە نوێژی مردوو – دا هەیە، یان تەنیا لەنوێژی تەواودا هەیە؟! یان هەر شەرعینیە؟ مشت و مڕ لەم مەسەلەیەش دا دیسان لەسوننەت بوون و نەبوون دایە.

هەروەها گوتنی (الله اكبر)ە زیادەكان لەنوێژی جەژن دا كێشە لەسوننەت بوونیان دا هەیە، ئەگەرنا مشت و مڕ لەوەدانیە كە هەرچۆن بێ بگوترێن یان نەگوترێن هەر بەردەكەوێ.

دیسان جۆرەكانی تەحییات هەموویان دروستن و نەمزانیوە جیاوازی لەوەدا هەبێ مەگەر جیاوازی‌یەكی ڕیزپەڕ، بەڵكو لەمەش دا مشت و مڕ لەسەر ئەوەیە كام جۆرەیان سوننەتەو خێرترە.

هەروەها ئەسڵی دووعای دەست پێ كردنی نوێژ (دعاء الاستفتاح)و جۆرەكانی مشت ومڕ لەسەر سوننەت بوونیەتی‌و لەسەر ئەوە كە كام جۆرەیان چاكترە، مشت و مڕیش لەسەر فەڕز بوونی شتێكی كەمەو قسەیەكە لەمەزەبی ئیمام ئەحمەددا - ڕەحمەتی خوای لێ بێ -.

جا مادام كێشە و جیاوازی تەنیا لەسوننەت بوون و نەبوون دابێ، مانای وایە زانرا كە هەموو لایەك لەسەر ئەوە كۆكن كە هەردووك باری كردن و نەكردنی ئەو شتانە دروستن و بەردەكەون، وەئەوەمەسەلانەش وەك مەسەلەی جۆرەكانی قورئان خوێندن (انواع القراءات)ن كە هەموویان دروستن، هەرچەندە هەندێك كەس هەندێك لە جۆرەكانی بەسەر هەندێكیان دا هەڵدەبژێرێ"[1].

جا موسڵمانی بەڕێزو خۆشەویست!

بەرەچاوكردنی ئەو ئاگاداری‌و بنچینە گرنگەی كە لەزمانی كەڵە زانای ئیسلام (ابن تیمیة) چەند وێنەیەكمان هێنانەوە بۆ تیشك خستنە سەری‌و ڕوون كردنەوەی بێگومان لەزۆر هەراو كێشە دروست كردن و دم بەدمەی لابەلاو بێ كەڵك و بگرە زیانبەخش دەپارێزرێن كەدەبنە مایەی سەرهەڵدانی بوغزو كینەو پێكەوە خەریك بوون و پۆخەڵ بوون و گەندەڵ بوونی كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمان.

---

[1]: بڕوانە (رسالة الالفة بين المسلمين) نووسراوی: (شێخ الاسلام احمد ابن تيميه الحرانى) كە (عبدالفتاح ابو غده) تەحقیقی كردوە، ص٢٤ تا ٤٦.

# بنچینەو ئاگاداری سێیەم

«زۆربەی مەسەلە جوزئییەکانی خواپەرستییەکان بەشێوەو چۆنیەتی جیاجیا دەکرێن و هەموویشیان هەر لەبازنەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)دان، جا یان یەکسانن و وەك یەکن یان بۆ حاڵەتە جیاجیاکانن»

دیارە ئەم ئەسڵ و بنچینەیەش زانین و تێگەیشتنی دەورێکی یەکجار گرنگی هەیە بۆ خۆپاراستن لەکێشەو مشت و مڕە لابەلاو بێ سوودەکانی، کە لە ئەنجامی کەم شارەزایی‌و بیرکورتی و دەمارگیرییەوە پەیدا دەبن، هەڵبەتە بەتاقی کردنەوەو تێوەڕامانیش بۆم دەرکەوتوە کەهۆی بنەڕەتی دەمارگیری (تعصب) بریتییە لە نەزانی‌و نەمافی‌و ناشارەزایی، چونکە کابرا لەئەنجامی کەم زانستی‌دا هەق و ڕاستی‌و دینداری تەنیا لە قسەیەك و لەڕاو بۆچوونێك دا دەبینێ‌و، وادەزانێ ئیسلام لەو بارەوە بەس ئەو ڕایەی هەیە! پاشان وەك ئەنجامێکی سروشتی‌و بەپێی یاسای: (لكل تَصَرُّفٍ خَاطِئٍ أَسَاسُ تَصَوُّرِيٍّ خَاطِئٍ) هەر هەڵس و کەوتێکی هەڵە بناغەکەی بۆچوونێکی هەڵەیە، ئەو تاقە ڕاو تەنها بۆچوونە کە ئەو پێی گەیشتوە، لێی دەبن بە (دین)و هەر قسەو ڕایەکی دیکە کە لەو بارەوە بخرێتەڕوو وەك شتێکی دژو پێچەوانەی دین وەردەگرێ‌و دژایەتی دەکات!!

هەر بۆیەش کە دەبینین چ لە ڕابردوودا و چ لەواقیعی هاوچەرخیشمان دا زاناو پێشەواو شارەزایان نموونەی سینگ فراوانی‌و لێبوردەیی‌و بارقووڵی بوون لەبواری جیاوازی بیروڕاو بابەتە ئیجتیهادی‌یەکاندا، بەڵام شوێن کەوتووە لاساکەرەوە ناحاڵی‌و کەم شارەزایەکان زۆر بەگرژی‌و هەڵچوون و دەمارگیرییەوە لەگەڵ ئەو باس و بابەتانەدا مامەڵەیان کردووەو گەلێك جار هەڵوێستی هێندە نەفامانەو کرچ و کاڵیان لێ پشکوتۆتەوە کەبۆتە نوکتەی سەرزاری خەڵکی.

جا ئێمە لێرەدا هەڵوێستی یەك زاناو پێشەوای گەورەمان بەنموونە دێنینەوە لەسەر سەماحەت و سینگ فراوانی ئەوانەی ئەهلی عیلم و عەقڵ و شارەزایین.

ئەویش زانای پایەبەرز (ابن حزم الاندلسی[1])یەخاوەنی کتێبی (المُحلّی).

(ابن حزم) لەوەڵامی بابایەکی مالیکی مەزهەب دا کە پرسیاری لێ کردوە دەربارەی نوێژکردن لەپشت کەسێکەوە کە لە مەزهەب دا لێی جیاوازە، ئایا دروستە یان نا؟!

وە دیارە بابای پرسیارکەر هەموو ئەو برگانەی کە کابرای ئیمام تێیاندا جیاوازە لە بابای نوێژکەر (مأموم) خستوونیەڕوو، جا (إبن حزم) پاش پێشەکی‌یەك وەڵامەکەی ئاوا ئاراستەی بابای پرسیارکەر دەکات:

(١-خوا ئێمە و تۆش سەرکەوتوو بکات بۆ زانیاری‌یەك کە لەومان نزیك بخاتەوەو کردەوەیەك کەمایەی ڕەزامەندی بێت! باست کردوە کەئەو کابرایەت بینیوە کە لەدوای ئیمامێکەوە ڕۆژانێکی زۆر نوێژی کردوە کە نازانێ مەزهەبەکەی چی‌یە! جا تۆ ئاگاداربە - خوا ئێمەش و تۆش سەلامەت بکات - کە بەدوادا گەڕانی ئەو جۆرە مەسەلانە خەواریج دایان هێناو ئەوان بوون کە لە بیروبۆچوونی خەڵکییان دەکۆڵیەوەو تاقی‌یان دەکردنەوە، هەرکام لە (مأمون)و (معتصم)و (واثق)یش لەگەڵ (ابن ابي دؤاد)و (بِشْرُ المَريسي)و ئەوانەی وەك ئەوان وان بەدوای ئەو ڕێبازەی خەواریج کەوتن، ئەگەرنا هیچ کام لەهاوەڵان خوالێیان ڕازی بێ‌و هەڵبژاردەی تابعین نکوڵییان نەبوە لە نوێژ کردن لە پشت هەر ئیمامێکەوە کە نوێژی بۆ کردبن، تەنانەت لەپشت (حَجّاج)و (حُبَيْش بن دُلْجة)و (نَجْدَة الحَروريّ)و (مُخْتار) یشەوە کەهەموویان بەکوفر تۆمەتبار کراون!!

وە لەو بارەوە پرسیار لە (ابن عمر) کراوە گوتوویەتی: (اذا قالوا حَيَّ علىٰ الصَّلاةِ أَجَبْناهُمْ وإذا قالوا حَيَّ علىٰ سَفْكِ الدِّماءِ تَرَكْناهُمْ) ئەگەر گوتیان وەرن بۆ نوێژ بەدەنگیانەوە دەچین، بەڵام کە گوتیان وەرن بۆ خوێن ڕێژی بەقسەیان ناکەین، وە

---

(١): (ابن حزم) یەکێکە لەو زانا هەڵکەوتووە بلیمەتانەی کە گەیشتوە بەپلەی ئیجتیهادی موتڵەق و کتێبی (المحلی)ش باشترین بەرهەم وشاهیدیەتی لەوبارەوە، بۆیەش ئەوم بەنموونە هێنایەوە چونکە لەگەڵ ئەندازەیەك توندی‌و زیادە ڕۆییشی‌دا لەگەڵ نەیارە فیکری‌یەکانی‌دا،لەسۆنگەی ئەوەوە کە شارەزایی و زانیاری‌یەکی چاکی لە قوڕئان و سوننەت دا هەبووە ، دەبینین کە زۆر بە سینگ فراوانی و ویژدان و دادگەرانەوە لەو مەسەلانە دەدوێ کە ڕاو بۆچوونی جیاوازی لە بارەیانەوە هەیە! کەواتە با هیچ کەس بە بیانوی پابەندی بە قوڕئان و سوننەتەوە قسە و ڕەفتاری وای لێ نەپشکوێتەوە کە پێچەوانەی قوڕئان و سوننەت بێ و ، لافی شوێن کەوتنی سەلەفی صالح لێ نەدات لە حاڵێکدا کە لە ڕێبازی ئەوان لای‌داوە و سەرپێچی‌یان لێدەکات.

(عثمان) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (إن الصَّلاة مِنْ أَحْسَنِ ماعَمِلَ النّاسُ، فـاذا أَحْسَنوُا فأَحْسِنْ معهم، وإذا أساؤا فَاْجْتَنِبْ إِساَئَتَهُمْ) نوێژ چاکترین کردەوەی خەڵکی‌یە جا هەرکات چاکەیان کرد لەگەڵیان بەشدار بەو، ئەگەر خراپەشیان کرد لێیان دوورە پەرێزە بە.

٢-پاشان گوتووتە، کە پێت گوتراوە: (کە ئەوکەسەی نوێژی لەدواوە دەکەین مەسح لەسەر گۆرەوی (جورب) کردن بێ ئەوەی چەرمین بن بەدروست دەزانێ)، جا براگیان ئەو قسەیە سەیرە! بزانە کەلەڕێی ڕاست (صحیح)ەوە لەپێغەمبەر(ﷺ) گێڕراوەتەوە کە مەسحی لەسەر گۆرەوی کردوە بێ ئەوەی هیچ کەس باسی چەرم (جِلْد) بکات، ئەوە هەرکام لە (أبو مسعود البدريّ)و (البَرَاءُ بنِ عازِبْ)و (أَنَس بن مالك) و (ابن عُمَر)و (علي بن أبي طالب)و (عُمَر بن الخطاب) ڕوونیان کردۆتەوەو نەشزانراوە هیچ کام لە هاوەڵان خوالێیان ڕازی بێ ڕای جیاوازی هەبێ لەو بارەوە.

هەروەها لەڕێی ڕاست (صحیح)ەوە لە (سعید بن المُسَيِّبْ) و (ابراهیم النَّخَعي)و (الأَعْمَش)یش گێڕراوەتەوە،بەڵام بۆ (عَطاء) ڕای جیاجیا هەن ئەوەندە هەیە کە موباح بوونی – مەسح کردن لەسەر گۆرەوی- لەویشەوە ڕاست ترە.

وە لەو بارەوە پرسیار لە (احمد بن حنبل) کراوە گوتوویەتی: (ئەوە لەحەوت یان هەشت لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕراوەتەوە)، جا ئەگەر بەدروستی نازانی نوێژ لەدوای ئەوانەوە بکەی کە بۆم ناوبردی ئەوە بێگومان زەرەرمەندو هەڵەی!

٣-پاشان باست کردوە کە لە بارەی ئەو ئیمامەوە گوتراوە کە دەست نوێژگرتن بە خۆشاو (نَبِیْذ[1]) بەدروست دەزانێ! جا براگیان بزانە کە هەرچەندە ئێمە دەست نوێژ گرتن بە (نَبِیْذ) بەباش نازانین چونکە فەرموودەی ڕاست (صحیح) لەو بارەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتوە، بەڵام دروست بوونی دەست نوێژ بە (نبیذ) مان گێڕاوەتەوە لە (علي بن ابي طالب)و (عِکْرَمَة)و (أَوزاعي)، وە گێڕراوەتەوە لە (حسن بن حيّ) و (حمید بن عبدالرحمن) وە غەیری ئەوانیش لەشەرعزانان، جا ئەگەر نوێژ لەپشت ئەوانەوە بەڕەوا نازانی ئەوە خۆت زاناتری!

---

(1) نبیذ: ( خۆشاو) ئەو ناوەیە کە چەند دەنکە خورمایەکی تێ دەهاویشترێن بۆ ئەوەی شیرین بێت بەڵام بێ ئەوەی زۆر بیگۆڕێ‌و ببێتە سەر خۆشکەر، کە بێگومان ئەو کاتە حوکمەی جیایەو هەم بەحەرام و هەم بە پیس (نجس)یش دادەنرێ.

٤-پاشان گوتووته: كه ئەو ئیمامە دەست نوێژو خۆشۆردن لەگۆمی ڕاوەستاوی گەرماودا بەدروست دەزانێ، ئەمەش براگیان جێی سەرسوورمانە! ئایا نەتزانیوە كە هاوەڵە زۆر وردو ژیرەكانی مالیك، وەك (اسماعیل القاضي) و ئەوانەی دوای ئەو هەموویان ئەوە ڕایانە، وە هەر ئەو ڕایەشە كە دەڵێن بەڕاستی مالیك هەر ئەوەی گوتووەو پشتگیری دەكەن؟! ئەویش ئەوەیە كە بەلایانەوە هەر ئاوێك هەرچەندە پیسی‌یەكی تێ كەوتبێ بەڵام ڕەنگ وتام و بۆنی نەگۆڕیبێ ئەوە پاكەو دەستنوێژی پێ دەگیرێو خۆی پێ دەشۆررێ!

٥-دوایی گوتووتە: كەئەو ئیمامە خۆشۆردن بە پێویست نازانێ مەگەر لەحاڵەتی ئاو هاتنەوەدا، جا تۆ بزانە! كە ئەم قسەیە هەرچەندە ئێمە ڕامان لێ نیە چونكە لەڕێی ڕاست (صحیح)ەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتوە كەبەبێ ئاو هاتنەوە (إِنْزالُ المَنِيِّ) خۆشۆردنی پێویست كردوە، ئێمەش ئەو فەرموودەیەمان لەو بارەوە وەرگرتوە چونكە زیادەی تێدایە لە فەرموودەكەی دیكە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا كەسێكی‌وا ئەو ڕایەی پەسند كردوە كە تەنها ڕۆژێك لەڕۆژانی ژیانی بارتەقای هەموو ئەوانەیە كەلەدوایەوە هاتوون و دێن هەتا هاتنە خواری مەسیح علیە السلام، ئەوانەش (عُثْمان بن عَفّان) و (علي بن أبي طالب) و (طَلْحة)و (زُبَيْر)و (سَعْد بن أَبي وقّاص)و (أَبو أَيوّب الأنْصاري) و (أُبَيّ بن كَعْب) و (عبدالله بن مسعود) و (ابو سعید الخُدْري)و (زید بن ثابت)و (رافع بن خدیج) و (ابن عباس) و (النُّعْمان بن بشیر) ن - خوالێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بكات.

وە لەزانایانی تابعین: (الأعمش)و (ابو سلمة بن عبدالرحمن بن عوف)و (هِشامُ بن عَوْدة)و (عطاء بن أبي رباح)و كۆمەڵێكی دیكە لەدوای ئەوانەوە، جا ئەگەر خۆت بە بەرز دەگری كە لە دوای ئەوانەوە نوێژ بكەی ئەوە دەچیە قیامەت و دەزانی!!

٦-پاشان گوتووتە: كە لەبارەی ئەو ئیمامەوە گوتراوە كە پێی وایە كە (قوم) ێك لەشەراب حەرام نیە، وە دڵۆپەیەك و دوو دڵۆپە لەشەراب بەدەن و پۆشاك پیس ناكات!

جا ئەوە جیایە لەوەی ئێمە باسمان دەكرد، چونكە هیچ كەس لەمسوڵمانان لاری لەوەنیە كەهەركەسێك كەم و زۆری شەڕاب بەحەڵاڵ بزانێ ئەوە كافرو هاوبەش دانەرو هەڵگەڕاوەیەو بەلای ئێمەوە داوای پەشیمان بوونەوەی لێ دەكرێ، جا ئەگەر پەشیمان

بـۆوە باشـە، ئەگـەر نـا دەكـوژرێو ماڵەكەشـی دەبێتـە دەسـكەوت – و دەخرێتــە (بيت المال)ەوە – .

بەڵام ئەگەر مەبەستت لەشەراب (خمر) خۆشاوی غەیری گوشراو (عصیر)ی تری بێ، ئەوە هەرچەندە ئێمە رامان وانیەو هەموو ئەو جۆرە خۆشاو (نبیذ[1])انە بەشەراب و حەرام دەزانین، بەڵام پێشەوایانێكی وا بەحەڵاڵیان زانیون كە زۆر پایە بەرزترن لەوانەی كە لەدوایانەوە هاتوون لەوانەی كە دینیان لێ وەردەگیرێ، وەك (عَلْقَمَة) و (ابراهیم النخعي)و (أَعْمَش)و (سُفْيان الثّوري)و (وَكِيْع) كە لەو بارەوە زۆر توند بووە، هەروەها لە كەسانێكەوە گێڕراوەتەوە كە لەوانەش بەرزتربووە، جا ئەگەر خۆت پێ لەوە چاكترە كە لەپشت ئەوانەوە نوێژ بكەی، ئەوە هێندە نەفامیو گێلی‌یەت بەسە، وە ئەوەندە سەرپێچی‌یەت بۆ – زانایانی– ئوممەت بەسە لەرێزو حورمەت گرتنی ئەو زانایانەو وەرگرتنی دین و سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ)لێیان: وە بێگومان لەدوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ كەس لەهەڵە پارێزراو نەبووە، بەڵام هەموو كۆششكەر (مجتهد)ێك پاداشتی هەیە، ئەگەر هەڵەی كرد پاداشتێك و ئەگەر پێكای دوو پاداشت، وە هەرچۆن بێ كۆششكەری بەهەڵەداچوو لە لاساكەرەوەی پێكەر چاكترە (والمجتهد المُخْطِئُ أَفْضَلُ مِنَ المُقَلِّدِ المُصِيْبِ) چونكە بەس زانا[2] دەتوانێ كۆشش بكات و ئەوەی نەزانیش نەبێ تەقلید ناكات.

بەڵام ئەوە كەشەراب هەرچی بەری بكەوێ پیسی دەكات، نەمانزانیوە لەوەدا كەس نكۆڵی هەبێ، جگە لەقسەیەك كەهەندێك لەزانایان لە (ربیعة)ەوە باسیان كردوە ئەویش قسەیەكی پووچە، وە (حسبنا الله ونعم الوكيل).

٧–پاشان باست كردوە كەئەو ئیمامە بەس مەسحی بەشێك لەسەری دەكات، جا ئاگاداربە كەئەمەش كردەوەیەكە لەرێی راست (صحیح)ەوە لە پێغەمبەری (ﷺ)

---

([1]) دیارە مەبەستی (ابن حزم) ئەو جۆرە خۆشاو (نبیذ)انەی كە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەڵام جارێ نەچوو نەتە قۆناغی شەراب و سەرخۆشكەری‌یەوە، بۆ زیاتر شارەزایی لەوبارەوە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٩ ص ٧٥ تا ٧٨، (نبیذ)یش زیاتر بەخۆشاوی خورما دەگوترێ.

([2]) كەواتە باكەس خەیاڵ پلاو نەكات و بە بێ ئامادەیی و شایستەیی لافی ( اجتهاد ) لێ نەدات ، بە بیانوی ئەوەی كە (اجتهاد) چاكترە لە ( تقلید) چونكە (اجتهاد) باشترە بەڵام بۆ ئەهلی خۆی نەك بۆ هەركەسێك كەیفی لێی بوو چونكە ئەو كاتە بە ( مُشْتَهِيْ) دادەنرێ نەك ( مُجْتَهِدْ) !!

گێڕراوەتەوە، هەروەها لەڕێی ڕاستەوە لە (ابن عمر)ەوە هاتووە، دوایی لە (ابراهیم النخعي)و (صَفِيَّة بِنتِ أَبي عُبَيْد) و (فاطمة بنت المُنْذر)و (شَعْبي)و (عبدالرحمن بن ابي ليلىٰ)و (عِكْرَمَة)و (حسن البصري)و (عطاء)و (أبي العالية)و (الأَوزاعي)و (اللَّيث)و جەماوەری شەرعزانان و غەیری ئەوانیش، جائەگەر ڕازی نی لەپشت ئەوانەوە نوێژبکەی، ئەوە لەوەدا کەم و کووڕیو عەیب ملی خۆت دەگرێ نەك هی ئەوان وە (حسبنا الله ونعم الوكيل).

٨-پاشان باست کردوە کەئەو ئیمامە پاش دانیشتن[٣] هەڵدەستێتەوە - بۆ ڕکاتی دووەم و چوارەم - جا تۆ بزانە کە ئەمە لەڕێی ڕاست (صحيح)ەوە لەپێغەمبەر (ﷺ)و لە (عمرو بن سلمة الجرمي) کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەر نوێژی بۆ هاوەڵان کردوە، هەروەها کۆمەڵانێکی زۆر لە زانایان لەدوای ئەوان ئەوە ڕایان بووە، جا ئەگەر خۆت پێ لەوە ناوەشێتەوە کە لەپشت ئەوانەوە نوێژ بکەی کەباسمان کردن ئەوە خۆتت بێ عەقڵ کردوەو ستەمت لەخۆت کردوە، وە (حسبنا الله ونعم الوكيل).

ئەوەش کەدەڵێ: هەندێك لە زانایان قەدەغەیان کردوە، ئاگامان لێیەتی، بەڵام بشزانە کە ئەو زانایانەی ڕایان وابووە - بکرێ - وبۆم باس کردی پایەبەرزترن لەوانەی قەدەغەیان کردوە، وە بێگومان هەندێك لە زانایان بەڵگەنین لەسەر هەندێکیان، بەڵکو بەس پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەڵگەیە لەسەر هەموویان، خوای بەرز فەرموویەتی: ( فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ الىٰ اللهِ والرَّسولِ إنْ كُنْتُمْ تؤمِنونَ باللهِ واليومِ الآخِرِ) النساء -٥٩-
*واتە:* جا لەهەر شتێك دا کەوتنە کێشە ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر بڕواتان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە.

٩-وە لەبارەی ئەو ئیمامەوە دەڵێ: کە (بسم الله) لەسەرەتای سوورەتی فاتیحەوە دەکات و بەئایەتێکی دادەنێ، جا تۆ بزانە کە قورئان خوێنە کوفەیی یەکان کە (عاصِمْ)و (حَمْزَة)و (كِسائي)ین وایان کردووەو بەئایەتێکی فاتیحەیان ژماردوە، وە ئەوە قسەی (علي)و (ابن عمر)و (أُبَيّ بن كعب)و (أُبي هُرَيْرَة)و (ابن الزُبَيْر)و (ابن عباس)و (عبدالله بن مُغَفَّل)و (زُهْري)و (ابراهيم النخعي)و (سعيد بن جبير)و

---

[٣] مەبەست دانیشتنی دوای سەجدەی دووەمە کەبە (جِلسَة الأَستِراحَة) ناو دەبێ.

(سعيد بن رَباح)و (طاوس)و (الحَكَم بَن عُتَيْبَة) و (أَبي إِسْحاق السَّبيْعى)يش هەمان ڕايان هەبووە.
وە كۆمەڵانێکی زۆر لە زانایانی دوای ئەوان هەمان بۆچوونیان هەبووە، وەك: (ابن المُبارَك) و (أحمد بن حنبل) و (إِسْحاق بن راهْوَيهْ) و غەیری ئەوانیش، تەنانەت هەندێکیان نوێژی هەرکەسێك کە لەسەرەتای فاتیحەوە نەیگوتبێ بەبەتاڵ زانیوە، جا ئیمە هەرچەندە نوێژی ئەو کەسە کە (بسم الله الرحمن الرحیم) ناخوێنێ بەبەتاڵ دانانێین، بەڵام ئەوانەی باسمان کردن ڕایان وابووە، وە ئەوە – واتە خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) لەسەرەتای فاتیحەوە لەجەماوەری هاوەڵان و لە (ابو بکر) و (عمر)یش خوا لەهەموویان ڕازی بێ گێڕاوەتەوە، جا ئەگەر نوێژ لەدوای ئەوانەوە بەڕەوا نازانی ئەوە ستەمت لەخۆت کردوە و نەفامیی خۆتت ڕاگەیاندوە، وە (حسبنا الله ونعم الوکیل).
١٠–وە لەبارەی ئەو ئیمامەوە گوتووتە: کەئەو ئیمامە – دوای تەواوکردنی نوێژ – بەلای ڕاست و چەپ دا سەلام دەداتەوە[1]: (السلام علیکم ورحمة الله)، (السلام علیکم ورحمة الله)! جا تۆ ئاگاداربە کە ئائەوە ڕاستەو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)پاشان لە (ابوبکر) و (ابن مسعود) و (علي بن ابي طالب ) و (عمار بن یاسر)و (نافع بن الحارث بن عبدالحارث)دوایی لە (علقمة)و (ابي عبدالرحمن السُّلمي)و (اسود بن یزید)و (ابراهیم النخعي)و (خَیْثَمة)، وەلەوانەی دوای ئەوان: (سفیان الثوري)و (الحسن بن حي) و (احمد بن حنبل)و (اسحاق)و (ابي ثور)و غەیری ئەوانیش وە جەماوەری زانایانی فەرمووده ناس، وە تەنانەت هەندێك لەوانەی باسمان کردن بەفەڕزی دەزانن.
جا ئەگەر خۆت لەوە بەبەرز دەگری کە لەپشت ئەوانەوە نوێژ بکەی ئەوە بێگومان بەو ڕەفتارەت جگە لەخۆت زیان لەهیچ کەس نادەی، وە (حَسْبُنا الله ونعم الوکیل).
١١–پاشان باسی ئەوەت کردوە لەدوای نوێژ دەپارێتەوە، ئەوە شتێکی باشە، خوای بەرز فەرموویەتی: (أدْعوني أسْتَجِبْ لکم) غافر – ٦٠–،
*واتە:* لێم بپاڕێنەوە بەدەنگتانەوە دێم.

---

[1] بۆیە ئەو پرسیارەی کردوە چونکە مالیکییەکان یەك جار سەلام دەدەنەوە ڕووبەڕووی قیبلە بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ لای ڕاست و چەپ.

وە گوتووتە نوێژی نیوەڕۆ لە سەرەتای لادانی ڕۆژ (اول زوال الشمس)دا دەكات، جا بێگومان ئەوە چاكترە مەگەر لە هاوین لەكاتی گەرمای بەتین دا، چونكە لەفەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتوە كە پرسیاری لێ كراوە دەربارەی چاكترین كردەوە! ئەویش فەرموویەتی: (الصلاة في أوّل وَقْتِها) نوێژ لەسەرەتای كاتەكەیەوە، هەروەها لەڕێیەكی ڕاستەوە لەهاوەڵانی دوای خۆی و ئەوانەی دوای ئەوانیش گێڕراوەتەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، وە دواخستنیشی مادام لەكاتی خۆی نەچێتە دەرێ مەودای هەیە، وە هیچ كەسێكمان پێ شك نایەت لە مسوڵمانان كەڕێی لەنوێژكردن گرتبێ لەسەرەتای كاتەكەیەوە، تاكو ڕێی تێ بچێ لەنوێژی ئەو كەسە بپرسی كەلەپشت كەسێكەوە دەیكات كەلەوكاتەدا نوێژ دەكات، وە (حَسْبُنا الله ونعم الوكيل).

١٢–بەڵام عادەتی بەرز كردنەوەی هەردووك دەست لەكاتی هەموو (الله اكبر)ەكان دا، ئەوە لەسوننەتی (صحیح)ی پێغەمبەر (ﷺ)دا هاتوە، وە سەیر ئەوەیە كە لەو كتێبەی (الموطأ)یش دا هەیە كەڕەنگە بینیبتان، بەڵام كتێبەكانی دیكەی زانایان و كتێبەكانی فەرموودە (دواوین الحدیث)، ئەوە لەم وڵاتانەی ئەندەلووس دا كەمتر كاریان پێ دەكرێ، وە من دەمویست كە ئەوانەت بۆ باس بكەم كەئەوەیان نەقڵ كردوەو زۆر بەتوندی جەختیان لەسەر كردوە، بەڵام ئەوەندەم بەسە كە (أَشْهَبْ) و (ابن وَهَبّ)و (اباالمُصْعَبْ) فەرموودەی دەست بەرز كردنەوەیان لەپێش ڕكووع و دوای ڕكووع لەقسەو كردەوەی مالیك گێڕاوەتەوە، جا ئەگەر ڕازی نی نوێژی لەدواوە بكەی ئەوە بیروڕای خۆتت لەو بارەوە بەسە!

وە براگیان بزانە كە (ابن عمر) هەركەسێكی دیبایە نوێژی كردباو هەردووك دەستەكانی لەكاتی ڕكووع و سوجدەدا بەرز نەكردبانەوە دەنكە چەوی تێ دەگرت، ئەوانەش كەوایان كردوە زۆر لەوە زیاترن كەنەزانەكان نەیانناسن[1]).

پێم وایە دوای ئەو ڕوونكردنەوانەی زانای پایەبەرز (إبن حزم)یش، ئاگاداری و بنچینەی سێیەم پێویستی بەهیچ ڕوونكردنەوەی دیكە ناكات، خوا بەچاكترین شێوە پاداشتی ئەو كەڵە زانا موجتەهیدە بداتەوە.

---

([1])بڕوانە: (رسالة في الأمامة في جواز الأقتداء بالمخالف في الفروع) نووسراوی: الامام المجتهد أبي محمد علي بن حزم الظاهري الأندلسي ص١٢٣ تا ١٢٩، كەلەگەڵ (رسالة الألفة بين المسلمين) چاپ كراوە.

# بنچینەو ئاگاداری چوارەم

((مادام ئەو خواپەرستییانەی کە لە بازنەی سوننەت دا بەشێوەی جۆراوجۆر دەکرێن هەموویان دروست و ڕەوابن، جاچ لە خێر و پاداشت دا یەکسان بن، چ بەرزیو نزمی (تفاضل) یان لەنێوانداهەبێ، وە چ بابای خواپەرست (عابد) سەرپشك (مختار)بێ لە هەڵبژاردنی جۆرێکیانداو چ جیاوازیەکەیان بۆ حاڵەتە جیاجیاکان بێت، بەڵێ مادام وابێ سوننەت و پەسەند وایە هەرجارە بەجۆرێکیان ڕەفتار بکرێ، نەك هەر لە سەر جۆرێکیان بەردەوام بێ یاخود دوو جۆریان لەیەك کاتدا کۆبکاتەوە))

دیارە ڕەچاوکردن و کارپێکردنی ئەم ئاگاداریو بنچینە گرنگەش ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێ لەپاراستنی برایەتیو تەباییو یەکریزی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامیداو بژارکردنیو پاککردنەوەی لەزۆر تێك گیران وشەڕە دندووکەی فامکاڵانەو فەقیرحاڵانە کە لە سەر حیسابی یەکلاکردنەوەی کێشە سەرەکیو چارەنووسسازەکان دێتە گۆڕیو کۆمەڵێك قوڵەشەڕی وەهمی نێوخۆ لەنێو موسڵماناندا پەیدا دەکەن و دوژمن و ناحەزانی خواو کۆمەڵ و کۆمەڵگای موسڵمانیش شادوخەنی دەکەن.

ئینجا با ئەم ئاگاداریو بنچینە گرنگەش بخەینە بەر تیشك و ڕۆشنایی یەکی دیکە لەزانا پایەبەرزو هەڵکەوتووە پێشینەکانمان کە (شیخ الاسلام ابن تیمیە)یە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەو پێشەوا شارەزاو پارێزکارو فیداکارە لەیەکێك لەفتواکانیدا[1] لەو بارەوە گوتوویەتی:

---

([1])بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢٤ ص ٢٤٢ تاکو ٢٥٢.

زانای ناوداری پارێزکار (نووی)یش لەوبارەوە چەند قسەیەکی زۆر جوانی کردوون کە دەڵێ:

(...فهو أن النبي (ﷺ) كانت له في الصلاة أحوال، حال يفعل فيها هذا، وحال يفعل فيها هذا، كما كانت له أحوال في تطويل القراءة وتخفيفها، وغير ذلك من أنواعها، وكما توضأ مرةً مرةً ومرتينِ مرتينِ وثلاثاً ثلاثاً، وكما طاف راكباً وطاف ماشياً، وكما أوتر أولَّ الليل وآخِرَهُ وأوسَطَهُ وأنتهى وِترُهُ الى السَّحَر، وغير ذلك كما هو معلوم من أحواله (ﷺ) وكان يفعل العبادة على نوعين أو أنواع لِيُبيِّنَ الرُّخْصَةَ والجوازَ بمرةٍ، أو مَرَّاتٍ قليلةٍ ويُواظِبُ على الأفْضَلِ بَيْنَهُما على أنه المُختارُ و الأوْلى..)(المجموع)ج٣ ص٤٠١.

واتە:...ئەویش لەبەرئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژکردنیدا چەند حاڵەتێکی هەبین، لەحاڵەتێك دا ئەمەی کردوەو لەحاڵەتێکی تردا ئەوەی کردوە، هەروەك چۆن لەدرێژ کردنەوەی قورئان خوێندنی نێو نوێژ یان کورت کردنەوەی داو جۆرەکانی دیکەیدا حاڵەتی جیاجیای هەبوونە، وە هەروەك چۆن لە دەست نوێژگرتن دا یەك

(...تێکڕای جۆرە خواپەرستیەکان چ گوتەیی بن چ کردەیی، ئەگەر بەشێوەیەك گێڕابنەوە کە دروست بێ پێیانەوە پابەند بین، هیچ کامیان ناپەسەند نین، بەڵکو هەموو ئەو جۆرانە شەرعیو دروستن وەك لەجۆرەکانی نوێژی ترس (صلاة الخوف) دا باسمان کردوە، وە لەدوو جۆرەکانی بانگ دان دا، بە (ترجیع)و بەبێ (ترجیع)، وە لە دوو جۆرەکانی قامەت کردن دا: بەجووتی یان بەتاکی[1]، وە هەروەك دەربارەی جۆرەکانی تەحییات و جۆرەکانی (استفتاح)و جۆرەکانی (استعاذة[2])و جۆرەکانی قورئان خوێندن و جۆرەکانی (الله اکبر)ە زیادەکانی جەژن و، جۆرەکانی نوێژی مردوو و سەجدەی سەهوو و دووعای قونووت پێش یان پاش ڕکووع و (تَحْمِيدْ[3])کردن بەهێشتنەوەی (و) یان بەلابردنیو، غەیری ئەوانەش باسمان کردوە.

بەڵام جاری واش هەیە هەندێك لەو گێڕراوانە (المأثورات) بە پەسەندترو چاکتر دادەنرێو بەسەر هەندێکی دیکەدا هەڵدەبژێررێ هەرکات بەڵگەیەك هەبێ ئەوە پێویست بکات، بەڵام ئەوەی تریش بە ناپەسەند دانانرێ.

وە شتێکی ڕوونە کە ئینسان لەیەك کات دا بۆی ناکرێ کە لە جۆرەکانی خواپەرستیدا دووجۆر کۆبکاتەوە، بۆی نالوێ کەدوو تەحییات پێکەوە بخوێنێ، یان دوو جۆرە قورئان خوێندن پێکەوە، وە ناتوانێ دوو جۆرە نوێژی مردوو وێکڕا بکات، وە ئەگەر ئەو شتانە هەموویان بەیەك جارو لەیەك کات دا بکات ئەوە شتێکە قەدەغە کراوەو کۆکردنەوەی ئەو جۆرە خواپەرستیانە جاری واهەیە حەرام و جاری واش هەیە ناپەسندە.

---

یەك و دوو دوو و سێجار سێجار ئەندامەکانی شۆردوە، وە هەروەك چۆن بەسوارىو بەپیادە طەوافی کردوە، وە هەروەك چۆن لە سەرەتای شەوو کۆتاییەکەیو نێوەڕاستیدا نوێژی وەتری کردوەو سەرەنجام نوێژی وەتری گەیاندۆتە کاتی سەحەر (پێش بەرەبەیان و بانگ دان)، وە غەیری ئەوانەش کە لە حاڵ و باڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرایە، وە بۆیە بە دووجۆر یان زیاتر خواپەرستیەکانی ئەنجام داوە تاکو بەجارێك یان چەند جارێکی کەم مۆڵەت و دوروست (جائز) بوون بخاتەڕوو، وە بەهۆی دەوامیشی لەسەر حاڵەتێکیان پێشانی بدات کەئەوەیان چاکترو پەسەندترە.

(1)واتە (الله اکبر) ەکان چوار جار و (اشهد ان لا اله الا الله)و (اشهد ان محمدا رسول الله) وەك بانگ دوو دوو بڵێ، یان (الله اکبر)ەکان دووان و شایەتمانەکانیش تاك تاك بن.

(2)مەبەست (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) گوتنە کەچەند جۆرێکی هەیە.

(3)واتە پاش گوتنی (سمع الله لمن حمده) بگوترێ: (ربنا ولك الحمد)یان (ربنا لك الحمد).

وەنەچی تەماشای ئەوانە بکەی کەحەز دەکات هەندێك لەوشتانە پێکەوە کۆبکاتەوە وەك ئەوەی هەندێکیان هەمو جۆرە صەڵەواتەکانی کەلە پێغەمبەر (ﷺ)گێڕراونەوە کۆی کردوونەوەو لێکی داون و ئەو جۆرە دووعایە لێکدراو (مُلَفَّق)ەی پێ پەسند بووە! وە دەربارەی ئەو فەرموودەیەی کە (بخاریو مسلم)لە (ابوبکر الصدیق)- خوا لێی ڕازی بێ - دەگێڕنەوە کەلە کاتێك دا بە پێغەمبەری (ﷺ) گوت: دووعایەکم فێربکە کەلە نوێژەکەم دا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: (قُلْ: اَللَّهُمَّ اِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَبِيْراً، وفي رواية كثيراً إنّه لايغفر الذنوب الا أنت، فاغفر لي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وارحمني انك انت الغفور الرحيم). بەڵێ لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە گوتوویەتی: واباشە بڵێ: (كثيراً كبيراً)هەروەها لە وێنەی ئەمەدا لەشتەکانی تردا هەمان ڕای هەبوو!! جا بێگومان ئەم ڕایە بێ هێزە،چونکە

__یەکەم:__ ئەمە سوننەت نیە بەڵکو پێچەوانەی سوننەتەئاخر پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دوو شانەی وێکڕا نەگوتوون، بەڵکو جارێك ئەم و جارێکی تر ئەوی دیکەی فەرمووە، جا مادام ڕاست بێ هەردووکیان لەوەوە گێڕرابنەوە کەواتە کۆکردنەوەیان سوننەت نیە بەڵکو هەرچەندە دروست (جائز)یش بێ بیدعەتە.

__دووەم:__ کۆکردنەوەی هەموو بێژە (لفظ)کانی دووعایەك یان جۆرە زیکرێك بە مەبەستی خواپەرستی (تعبد)، وەك کۆکردنەوەی سەرجەم جۆرەکانی قورئان خوێندنی قورئان خوێنەکانە بەمەبەستی قورئان خوێندن و بیر لێ کردنەوە لەگەڵ جۆراوجۆر بوونی واتاکان - نەك بە مەبەستی دەرس گوتنەوەو لەبەرکردن کەئەمە دروستە ، وەك ئەوەی کە لە نوێژدا ئەم ئایەتانە ئاوا بخوێنی:

١-(..في قلوبهم مَرَضٌ فَزادَهُم الله مَرَضاً ولهم عذاب أليم بما كانوا يَكذِبون)البقرة-١٠- ( بما كانوا يُكَذِّبُون)

٢-(ربنا باعِدْ بين أسفارنا) السبأ - ١٩- (.. بَعِّد بين أسفارا).

٣-(وما الله بغافل عَمّا تعْمَلون) البقرة - ٨٥ - (.. عَمّا يَعْمَلون).

٤-(.. ويضع عنهم إِصْرَهم) الاعراف- ١٥٧- (آصارَهُمْ).

٥-(.. وأَرْجُلَكم الى الكعبين) المائدة - ٦- (وأَرْجُلِكُم).

٦-(..ولاتَقْرَبُوهُنَّ حتّى يَطْهُرْنَ) البقرة - ٢٢٢- (حتى يَطَّهَّرْنَ).

٧-(ولايَحِلُّ لكم أَنْ تأخُذوا مما آتيتموهُنَّ شيئاً إلاّ أن يَخافا..) البقرة -٢٢٩ - (الاّ أَنْ يُخافا..).

٨-(..أولامستم النساء ..) المائدة - ٦- (.. أو لَمَستم..).

وە بێگومان ئەو جۆرە - قورئان خوێندنە - بیدعەتێکی ناپەسەند و ناقۆڵایە.

سێیەم: تەنانەت زیکرە بەڕەوا دانراوەکانیش پەسند نیە کە لێك بدرێن - و زیکرێکی دیکەیان لێ پێك بهێنرێ بۆ وێنە ئەگەر یەکێك بێنێ لەو فەرموودەیەی کە (ابن مسعود) دەربارەی تەحییات گێراویەتەوە، وشەی: (التحیات والصلوات)لەگەڵ وشەی: (الزاكیات)ی تەحییاتی (عمر بن الخطاب)و وشەی: (المباركات)ی (ابن عباس) پێکەوە کۆبکاتەوە کە سەرەنجام تەحییاتەکەی ئاوای لێبێ: (التحیات لله والصلوات و المباركات والزاكیات) ئەوە بەو شێوەیە ڕەواو پەسند نیە.

چوارەم: ئەم ڕەفتارە کەسێك دەیکات کەپێی وایە هەتا پیت و بێژەکان زیاتر بن چاکترە، بەڵام جاری وا هەیە واتاکەی کەمترو بگرە گۆڕانیشی بەسەردا دێ، وە ئەو کەسە ئەگەر چاك لەفەرموودەکانەوە ڕامابایە دەیزانی کە هەر کامێکیان مەبەست دێنێتە دی هەرچەندە هەندێکیان باشتر بیهێنێتەدی، چونکە کە دەڵێ: (..ظُلْماً كَثْيِراً) ئەوە بێگومان هەرکاتێك شت زۆر بوو ئەوە گەورەشە لە واتادا، وە هەر کاتێك گەورەبوو ئەوە زۆریشە.

وە لەکاتێك دا دەڵێ: (اللهمَّ صَلِّ علىٰ مُحَمَّدٍ وعلىٰ آلِ مُحَمَّدٍ)یان دەڵێ: (اللهم صل علی محمد و أَزْواجِهِ وذُرِيَّتِهِ) ئەوە بێگومان هاوسەرەکانیو وەچەکەیشی هەر لەجوغزی (آل)ەکەی دان یان خودی (آل)ەکەین، جا کاتێك کۆی کردنەوەو گوتی: (علی آل محمد وعلی أَزْواجِهِ وذُرِّيَّتِهِ) ئەوە دیارە لە دەقە شەرعیەکانەوە ڕانەماوە.

پوختەی قسان: ئەگەر یەکێك لەدوو زیکرەکان لە ئەسڵی واتادا لەگەڵ ئەویتر یەکی دەگرتەوە، ئەوە وەك ئەو دوو جۆرە قورئان خوێندنانەن کە یەك واتایان هەیە، بەڵام ئەگەر واتایان جۆراوجۆر بوو ئەوە وەك ئەو دوو جۆرە قورئان خوێندنانەن کە واتایان جیاجیایە، وە لە هەردووك حاڵەتیش دا لەیەك کات دا کۆکردنەوەیان دروست نیە.

بەڵام کۆکردنەوەی نوێژەکانی ترس یان تەحییاتەکان یان قامەت کردنەکان.. هتد دووجۆریان پێکەوە کۆبکرێنەوە- لەیەك کات دا - ئەوە بەیەکدەنگی هەموو موسوڵمانان قەدەغەیە. ئینجا ئەگەر ئەو خواپەرستیيە گوتەییو کردەیيیانە پێویست بێ بەشێوەیەك لەشێوەکانیان هەر بکرێن - وەك قورئان خوێندن بەپێی هەندێك لەجۆرەکانی قورئان خوێندن - ئەوە مەرج نیە کە هەرکەسێك وا بکات حەتمەن لەسەر چاکترین شێوەی - بەلای خۆیەوە - ئەنجامی دابێ، بەڵکو دەبینی ئەو مەسەلەیە چاکتر (افضل)ی هەر تێدا نیە، بەڵکو وەك ڕێیەکانی حاجییانە بەرەو مەککە چونکە

خەڵکی هەر ناوچەیەکی لەرێگای خۆیانەوە حەج دەکەن و هەڵبژاردنیشیان بۆ ئەو رێیە لەبەر ئەوە نیە کە باشترە، تاکو حەجەکەیان لەحەجی خەڵکی باشتر بێت، بەڵکو هەر دەبووایە بەرێیەك دا بچن و ئەو رێیەیان گرتوە یان لەبەر ئاسانی یان لەبەر هەر هۆیەکی تر، هەرچەندە هەمووشیان یەکسانن.

کەواتە پێویستە جیاوازی بخرێتە نێوان هەڵبژاردنی هەندێك لەرووە شەرعی‌یەکانی مەسەلەیەك لەبەر چاکی لە زاتی خۆیدا بەلای هەڵبژێرەریەوە، وە هەڵبژاردنی یەکێکیان لەبەر ناچاریو پێویستی، کەبەهۆی ئاسانی یان هۆیەکی دیکەوە هەڵبژێرراوە.

دیارە زانایانی پێشینیش هەر کامێکیان بەشێوەیەکی شەرعی قورئانی خوێندوەو نوێژی کردوەو پاڕاوەتەوەو زیکری کردوە، وە هاوەڵە هاوشوێن و هاوچەرخەکانیشی ئەو شێوەیەیان لێ وەرگرتوە، جا دەبینی ئەو شێوانە یەکسانن یان هەندێکیان چاکترن.

پاشان زانایانی پاشین (خَلَفْ)ەی وایان تێدا پەیدا بووە کە ویستوویەتی وایپێشان بدات کە ئەو رایەی هەڵی بژاردوە لە بەرچاکی هەڵی بژاردوە، یەکی دیکەش هاتوەو بەرپەرچی داوەتەوە ئیدی لەوەوە بگرەو بەردەو مشت و مڕی لەسەر ئارەزووو دامەزراوو سەرلێشێوین سەریان هەڵداوە! چونکە دەبینی هەردووك شێوەکانی لەلای خواو پێغەمبەرەکەی وەك یەکن، کەچی هەر کۆمەڵێك رێبازی خۆی پێ باشترەو هەرکەسێکی خۆش دەوێ کە لەو بارەوە لەگەڵیەتیو پشت لەوانەش دەکات کە شێوەکەی تری دەکەن، بەو جۆرە ئەوەی کە خوا وەك یەکی داناون بەرزیو نزمی‌یان تێدا پەیدا دەکەن و، ئەوەش کە خوا بەرزی و نزمی تێدا داناون وەك یەکیان تەماشا دەکەن.

جا ئەمە دەروازەیەکە لەو دەروازانەی کە جیاوازی و پەرتەوازەیی‌یان لێوە هاتۆتە نێو ئوممەت، کە بێگومان قورئان و سوننەت نەهی‌یان لێ کردوە، وە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لەخودی ئەم جۆرە جیاوازیو کێشمە کێشە کردوە لە فەرموودەی راست (صحیح)ی خۆیدا[1]...

---

[1] عن نزّال بن سَبرة عن ابن مسعود رضى الله عنه أنه سَمِعَ رجلاً يقرأ آيةً سَمِعَ النبي (ﷺ) قرأ خِلافَها فأخَذتُ بِيَدِهِ فانْطلقتُ به الى النبي (ﷺ) فقال: كِلاكُما مُحْسِنٌ فاقرآ... رواه البخاري.

واتە: ابن مسعود دەڵێ گوێم لەپیاوێك بوو ئایەتێکی خوێند کە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستبوو بەجۆرێکی تری خوێندبوو، بۆیە دەستم گرت و بردمە لای پێغەمبەر (ﷺ)ئەویش فەرمووی: هەردووکتان چاکتان خوێندوە بیخوێنن...

(ابن تیمیە)ڕەحمەتی خوای لێ بێ دوای ئەوەی ئەو فەرموودەیەی هێناوە لەکتێبی: (اقتضاء الصراط المستقم) ج١ ص ١٢٤، دا گوتوویەتی: بزانە کە زۆربەی کێشەو جیاوازی نێو ئۆممەت کە دەبێتە مایەی شوێن کەوتنی هەوا و ئارەزوو، لەم جۆرەیە: ئەویش ئەوەیە کە هەرکام لەو دووانەی ڕایان جیاوازە، لەوەدا کە ئیسپاتی دەکات پێکاویەتی، بەڵام لەوەدا کەنەفی کردوە بەهەڵەدا چووە، هەروەك چۆن هەردووك قورئان خوێنەکان لەو جۆرە خوێندنەدا کە بۆ خۆی خوێندبووی پێکابووی، بەڵام لە بەهەڵەدانانی خوێندنی بەرانبەرەکەیدا بەهەڵەدا چوو بوو، وە بێگومان زۆربەی نەزانی بەهۆی نەفی‌یەوەیە کە بریتیە لەبڕوا پێ نەبوون و بەدرۆدانان، نەك لەئیسپات کردندا، چونکە ئاگادار بوونی ئینسان لەوشتانە کە ئیسپاتیان دەکات ئاسانترە لەئاگاداری لەوەی کە نەفی دەکات...

ئینجا جۆرەکانی جیاوازی (اختلاف)یش بەگشتی دووانن: جیاوازی جۆراوجۆر (اختلاف التنوع) وە جیاوازی پێکەوە دژبوون (اختلاف التضاد)، جیاوازی جۆراوجۆریش چەند شێوەیەکی هەن، بۆ وێنە:

أ-ئەوەیەکە هەردووك قسەکان یان کردەوەکان ڕاست و ڕەوابن، وەك ئەو جۆرە قورئان خوێندنانەی کە هاوەڵان تێیان دا کەوتونە مشت و مڕەوە، هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرزەنشتی کردوون لەسەر مشت و مڕو فەرموویەتی: هەردووکتان چاکتان خوێندوە، هەروەها جیاوازی لەجۆرەکانی بانگدان و قامەت خوێندن و (استفتاح)و تەحییات و نوێژی ترس و (الله اکبر)ەکانی جەژن و (الله اکبر)ەکانی نوێژی جەنازەو ... هتد کە هەموو جۆرەکانیان دروستن، هەرچەندە بگونجێ بگوترێ کەهەندێکیان چاکترن.

پاشان دەبینی زۆر لەئۆممەت لەو بارەوە بەجۆرێك کەوتونە کێشەو مشت و مڕەوە کە بۆتە هۆی شەڕو کوشتار لەنێو چەند کۆمەڵێکیان دا لەسەر ئەوە کە ئایا قامەت وشەکانی دوو دووبن یان تاك تاك، وە ئەو جۆرە بابەتانە، وە بێگومان ئەمەش حەرامێکی گەورەیە، وە هەندێکیان بەهۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەوە -ئەگەر نەشگەیشتبنە ڕاددەی شەڕو کوشتار دەبینی زۆریان مەیل و ئارەزووی یەکێك لەو جۆرانەیان چۆتە دڵ و پشتیان لەجۆرەکانی کردوە یاخود نەهی‌یان لێ دەکەن و، بەو جۆرە ڕەفتارانەش کەوتوونە بەر هەڕەشەو نەهی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

ب-ئەوەیە کە هەردووك قسەکان یەك نێوەڕۆکیان هەیە بەڵام دەربڕینەکانیان جیاوازن ، وەك ئەوەی زۆر لەخەڵکی دەکەونە مشت ومڕو ڕای جیاوازەوە دەربارەی بێژەی سزا شەرعی‌یەکان و تەعبیری بەڵگەکان و ناونانی ناوبراوەکان و دابەش کردنی یاساکان و ..هتد ، پاشان نەفامی و ستەم دەبنە فاکتەری مەدح کردنی کۆمەڵێك و زەم کردنی ئەوی تر .

ج-شێوەیەکی تر ئەوەیە کە واتاکان لەیەك جیان بەڵام دژی یەکتر نین : ئەم قسەیەش ڕاستەو ئەوی تریش ڕاستە ،هەرچەندە مانای یەکێکیان عەینی ئەوی دیکە نی‌یە ،ئەمەش لەکێشە و مشت ومڕەکان دا زۆر زۆرە .

جا پێویسته ئەم جۆره خواپەرستی‌یانه بـەبێ بەڵگـەی شـەرعی هـەندێکیان بەسـەر هەندێکیان دا بەرز نەکرێنەوه ،وه کەیەکێکیان لەبەر ناچاری جێبەجێ کردنـی ئەرکی خواپەرستیی دیـاری دەکـرێ ، نەکرێتـه بەڵگـەی چاکـتربوونی ،چونکـه ئەگـەر خـوا لەسـەری پێویسـت کـردم کۆیلەیەك ئازاد بکـەم یـان نوێژێـك بەکۆمـەڵ بکـەم ،ئـەوه وا داخواز دەکات که یەکێك ئازاد بکەم و نوێژ بەکۆمەڵ بکەم ،بەڵام مەرج نی‌یه ئەو کاره لەغەیری خۆی چاکتر بێت ، بگره بەهیچ شێوەیەك چاکتر نیه .

بەڵکو بۆ بەچاکتر دانانی کارێك حەتمەن دەبـێ سـەرنج بـدرێ ،پاشـان ئەگـەر گریمـان بەبەڵگـەی شـەرعی دەرکـەوت کـەفلان کـاره چاکتره ،نـابێ ڕەخنـه لـەو کەسـەش بگـیرێ

---

د-شێوەیەکی دیکەش ئەوەیه کەهەردووك ڕێیەکان دروستن ،بەڵام پیاوێك یان کۆمەڵێك ئەم ڕێیەیان گرتووەو ،کۆمەڵێکی دیکەش ڕێیەکەی تری هەردووکیشیان لەئیسلام دا پەسەندو چاکن ،پاشان نەزانی یان ستەم دەبێته مایەی زەم کردن یان بەچاکتر دانانی یەکێکیان بەبێ نیازێکی باش ،یان بەبێ زانیاری ،یان بەبێ زانیاری و بێ نیازی باش ...

وەئەم بەشه کەناومان لێ ناوه : جیاوازی جۆراوجۆر (اختلاف التنوع) ،بێ دوودڵی هەردوو طرەفی جیاواز پێکاوریانه ،بەڵام خراپ ئەوەیانه کەستەم و دەست درێژی دەکاته سەر ئەوی تر ،وه قورئانیش ئەوەی ڕاگەیاندووه کەهەرکام لەو دوو لایه لەو حاڵانەدا چاکن و شایستەی مەدحن بەمەرجێك دەستدرێژی پەیدا نەبێ ،وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ( ما قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوها قائِمةً علىٰ أُصولِها فَبِإِذْنِ اللهِ )الحشر – ٥– – واته : هەر دارخورمایەك که بڕیوتانه یان لەسەر ڕەگ و ڕیشەکەی هێشتووتانەتەوه ئەوه بەفەرمانی خوا بووه ... ، چونکه هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەوتبوونه کێشەوه دەربارەی بڕینەوەی درەختەکان هەندێکیان بڕیوویانن و ئەوانی دیکه نەیانبڕیوون .

وه وەك فەرموویەتی : ( و داودَ و سُلَيْمانَ إِذْ يَحْكُمانِ فِي الحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ القَوْمِ وكُنّا لِحُكْمِهِمْ شاهِدِيْن . فَفَهَّمْناها سُلَيْمانَ وكُلّاً آتَيْنا حُكْماً وعِلْماً ..) الانبياء – ٧٨، ٧٩ – .

وه لەوەدا که پێغەمبەر ﷺ له ڕۆژی ( بني قريظة ) دا هەم دانی به هەڵوێستی ئەوانەدا هێنا که نوێژی عەسریان له کاتی خۆیدا کرد و هەم بەهی ئەوانەش دا کەدوایان خست هەتا گەیشتنه لای ( بني قريظة ).

وه وەك لەفەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ دەبینرێ که فەرموویەتی : ( إذا اجْتَهَدَ الحاكِمُ فأَصابَ فَلَهُ أَجْرانِ وإذا اجْتَهَدَ فأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ ) وه وێنەی ئەوه زۆرن .

کەئەوەی دیکەیان دەکات مادام دروستە ، وە نابێ لەسۆنگەی ئەوەوە کەچاکترنییە خەڵکی لێ بسڵەمێنرێتەوە ، وە نابێ چاکیی چاکترەکەش لەو ئەندازەیەو ڕاددەیە کەشەریعەت دیاری کردووە لێی زیاد بکرێ ،چونکە دەبینی بەرزی و نزمییەکە شتێکی کەمە .

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە کە لەوەی پێشەوە پەیدا دەبێت ،ئەویش ئەوەیە کەلەکاتی یەکسان بوون یان چاکتر بوونی بارێکیان ،کام لایە بۆ ئینسان باشترە : هەر لەسەر جۆرێکیان بەردەوام بێت ،یاخود جارێك ئەم جۆرەیان و جارێکی تر جۆرەکەی دیکەیان بکات ، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی ؟!

هەندێك کەس هەیە لەسەر جۆرێکیان کەهەڵی بژاردووە یان پێی چاکترە بەردەوام دەبێ و پێی وایە کە بەردەوام بوونی لەسەر ئەو جۆرە چاکترە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەردەوام بوونەکەی هەر نەریتێکە و بۆ دڵڕاگرتنی دۆست ونزیکانی و ڕەچاوکردنی ئەو عادەتەی کە هاوەڵانی و هاورێبازانی خوویان پێوە گرتووە پێیەوە پابەندە نەك لەبەر ئەوەی پێی چاکترە .

***بەڵام هەڵوێستی ڕاست ورەوا ئەوەیە کە بگوترێ :***

ئەنجام دانی هەموو جۆرەکان – کەمایەی شوێن کەوتنی پێغەمبەرە ﷺ کە بێگومان لەوەدا پابەندی بەرێبازی پێغەمبەرو کۆمەڵی مسوڵمانانەوە و زیندووکردنەوەی ڕێوشوێنەکەی و کۆکردنەوەی دڵی ئوممەت و بەهرەمەند بوون لەتایبەتمەندییەکانی هەرکام لەوجۆرە خواپەرستییانە هەیە چاکترە لەبەردەوام بوون لەسەر جورێکی تایبەت کەپێغەمبەریش ﷺ دەوامی لەسەر نەکردووە ،لەبەر ئەم هۆیانە :

**یەکەم**: ئەمەیە شوێن کەوتنی سوننەت و شەریعەت چونکە مادام پێغەمبەر ﷺ جارێك ئەمەی کردبێت و جارێك ئەمی دیکە و لەسەر یەکێکیان دەوامی نەکردبێ ،ئەوە بێگومان وەك ئەو کردن بریتییە لەکردنە سەرمەشقیو شوێن کەوتنی ،واتە ئەوە بکرێ و بەو شێوەیە بکرێ کە ئەو کردوویەتی چونکە ئەو کردوویەتی .

**دووەم**: ئەوە دەبێتە مایەی کۆکردنەوەی دڵی ئەندامانی کۆمەڵ و پێکەوە هۆگربوونیان و لاچوونی زۆر جۆرە جیاوازی و پەرتەوازەیی و شوێن کەوتنی ئارەزوو ،وە بێگومان ئەوەش هەم بەرژەوەندییەکی گەورەو هەم لابردنی زیانێکی زلە کە

قورئان و سوننەت هانیان داوین ئەو بەرژەوەندی‌یە بێنینە دی و ئەو زیانە دوور بخەینەوە ،خوای بەرز لەوبارەوە فەرموویەتی :
(وَٱعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً و لا تَفَرَّقُوا..) ال عمران -١٠٣- .
وەفەرموویەتی :( ولاتكونوا كالَّذين تَفَرَّقُوا وَٱخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ ما جاءَهُمْ الْبَيِّنَاتُ) ال عمران- ١٠٥-
وەفەرموویەتی : (إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وكانوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ) الأنعام -١٥٩- .

**سێیەم:** بەهۆی ئەو ڕەفتارەوە شتی سوننەت و دروست لەوە دەچێتە دەر کە وەك فەرز تەماشا بکرێ ،چونکە بەردەوام بوون لەسەر سوننەت یان شتی دروست (جائز) وەك فەرزی لێ دەکات ،بۆیە دەبینی زۆر لەو کەسانەی کە دوام لەسەر ئەو شتە دروست و سوننەتانە دەکەن ئەگەر بگوازنەوە بۆ جۆرێکی دیکە هەست بە دڵتەنگی و نامۆیی دەکات زیاتر لەوەی لە فەرزەکان بچوێنێ ،لەسۆنگەی ئەو خوو پێوەگرتنەوە کەشتێ پەسەندو دروستی لەلا وەك فەرز لێ کردوە .

**چوارەم:** وە بەو شێوازە کەڵك و بەرژەوەندی هەرکام لەو جۆرانە دەستگیر دەبێ ،چونکە هەرکام لەو جۆرانە تایبەتمەندی‌یەکی هەر هەیە ئەگەر کەمیش بێت چ جای ئەگەر یەکسانیش بێ لەگەڵ ئەوەی تردا ،پێشتریش باسمان کرد کەجاری واهەیە شتێکی بەسەردا هەڵبژێرراو (مرجوح) لەچەند حاڵێك دا دەبێتە هەڵبژێرراو (راجح) .

**پێنجەم:** وە بەو ڕەنگە زۆر لەو بارەگران و کۆت و زنجیرانەی کەشەیطان بەبێ بەڵگەیەك لەکتێبی خواو زانیاری‌یەکی بەجێماو خستوونیە سەر پشت و دەست و پێو گەردنی ئۆممەتەوە لادەچن ، چونکە بەردەوام بوونی ئینسان لەسەر کارێکی دروست (جائز) بەجۆرێك کە هەڵی‌بژێرێ بەسەر غەیری ئەو کارەدا ، وە وای لێ بکات کە هەر کەسێك وەك وی بکات خۆشی بوێو ئەوەی وانەکات نەك هەر خۆشی نەوێ بگرە بیبوغزێنێ لە بەرئەوەی وازی لەو کارە هێناوە کەئەو دەیکات ،پاشان ئەوە ببێتە هۆی فەوتاندنی گەلێك هەق و مافی برایەتی کەدەبێ بۆی جێ‌بەجێ بکات ،لەئاکامی ئەمەدا ئەو جۆرە بۆچوونە هەڵەو خوارە دەبێتە کۆڵێکی قورس و کۆت و پێوەندێك لەدەست و گەردنی دا کە ناهێڵێ هەندێك لەو ئەرکە ئەنجام بدات کەفەرمانی پێ کراوە ،بەڵکو تووشی هەندێك لەو ناشەرعی‌یانەشی دەکات کە قەدەغە کراون .

وە ئەو ئەندازەیەی کەباسم کرد زۆر ڕووی داوە ،چونکە لەئەنجامی بەردەوام بوون و هۆگری بەو حاڵەوە کەباسمان کرد ،بڕوا پێ بوون و خۆشویستنی ناشەرعی پەیدا

دەبیٚ ،پاشان ئەمیش سەردەکێشیٚ بۆ مەدح و زەم و فەرمان پیٚ کردن و قەدەغە کردنی بە ناهەق ،دوایش ئینسان پەلکێش دەکریٚ بۆ جۆرێك لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی ناڕەوا لەڕەگەزی خوو وخدەی نەفامێتی وەك خوو خدەی ئەوس و خەزرەج لە سەردەمی نەفامێتی دا .

ئینجا دوای ئەوە سەردەکێشیٚ بۆ بەخشین و دەست گرتنەوەو کابراماڵەکەی لەو پێناوەدا دەبەخشیٚ بەشێوەی سوننەت و فەرز وە غەیری ئەوەش بیٚ ئەوەی ڕوویکی شەرعی هەبیٚ ، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوەی کەشەرع فەرمانی بە بەخشینی کردوە لەشێوەی فەرزو سوننەت دا نایبەخشیٚ ،پاشان سەرەنجام سەردەکێشیٚ بۆ جەنگ و کوشتار وەك لەهەندێك لەسەر زەمینی ڕۆژهەلات دا ڕووی داوە .[1]

دیارە سەرچاوەی ئەو حاڵەتەش بریتی‌یە لەبەچاکتر دانان و بەردەوام بوون لەسەر ئەوەی کە شەریعەت بەچاکتری دانەناوە ،ئینجا ئەگەر بڕواو قەناعەت هەبوون بەچاکی و پەسەندی ئەو شتەش هۆکاری هەڵبژاردنیشی نەبیٚ ،ئەوە هەر بەتەنها لەسۆنگەی بەردەوام بوون لەسەری خاوەنەکەی دووچاری ڕەفتارێکی نەهی لیٚ کراو یان بەلای کەمەوە بەسەردا هەڵبژێرراو (مَفْضُولْ ) دەبێت ، ئاشکراشە کە جۆراو جۆر بوونی حاڵەتەکانیش لەجوغزی شەرع داو بەو جۆرەی کەپێغەمبەر ﷺ کردوویەتی چاکترو تەواوترە .

**شەشەم:** وە بەهۆی بەردەوام بوون لەسەر تەنها شێوەیەکیان وازهێنان لەبەشێك لەشەریعەت ڕوو دەدات و ئەوەش دەبێتە مایەی لەبیرچوونەوەو پشت گویٚ خستنی ، هەتا وای لیٚ دیٚ کەوەك شتێکی جیا لەئایین دابنریٚ ،بەجۆرێك کەلەدڵی زۆر لەخەڵکی عەوام دا لە بازنەی شەریعەت دەردەهاویشتریٚ، وە لە دڵی خەڵکە تایبەتی‌یە کەش دا کردەوەو زانیاری‌یان لەیەك دەترازێن ،چونکە زانایەکانیان دڵنیان کەئەوجۆرە خواپەرستی‌یانە بەشێکن لەئایین ،بەلاّم ڕوونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە پشت گویٚ دەخەن یان لەترسی خەڵك یان بەمەبەستی گۆڕینەوەی ئایەتەکانی خوا بەنرخێکی کەم لەسەرۆکایەتی و سامان وەك پیشەی ئەهلی کیتاب .

---

[1] مەبەست ئەو سەر زەمینەیە کەئێستا وڵاتانی وەك هیندو پاکستان و ئەفغانستان و ئێرانی لیٚ هەن ،کەلەم ڕۆژگارەش دا ئەو جۆرە بیروکرتی و دەمارگیری و گرژی‌یە هەر هەیەو بەردەوامە .

وەك چۆن دیتوومانە کەئەو کەسەی عادەتی بەوەوە گرتوە کەوشەکانی قامەت بەتاك تاك یان جووت جووت ببیستێ ،کاتێك جۆرەکەی دیکەی دەبیستێ لێی دەسڵەمێتەوە ،وەك ئەوە کەبانگێکی بیستبێ بانگی مسوڵمانان نەبووبێ !! هەروەها ئەو کەسەی کەعادەتی بەدووعای قونووتەوە گرتوە پێش یان پاش ڕکووع !

دیارە واز لێهێنانی بەشێکی شەرعیش دەبێتە هۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی و بوغزو غەرەز لەنێو ئۆممەت دا ،خوای بەرز فەرموویەتی : (ومن الذين قالوا إِنَّا نَصارىٰ أَخَذْنا مِيْثاقَهُم فَنَسُوا حَظّاً مِمّا ذُكِّروا بِهِ فَأَغْرَيْنا بَيْنَهُم العَداوة والبَغْضاءَ الىٰ يَوْمِ القِيامَةِ..) المائدة –١٤– .

وەك دەبینین خوای پاك و تاك ڕای گەیاندوە کە لەسۆنگەی لەبیرچوونەوەی بەشێك لەو ئایینەی پێیان ڕاگەیەنرابوو دوژمنایەتی و کینەو غەرەزیان لەنێودا پەیدابوو ، جا لەکاتێك دا ئینسان سەرجەم جۆرەکانی سوننەت ڕەچاو بکات و هەموو شێوە شەرعی و ڕەوایەکان بەکاربهێنێ جارێك ئەمیان و جارێك ئەویان ئەوە هەم سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەڕووی زانیاری و کردەوە (علماً وعملاً) وە پارێزراوە و ،هەم ئەو زەرەرو زیانە مەترسی لێ کراوەش کە بەهۆی گرتنی بەشێکی و وازلێ هێنانی بەشێکیەوە سەر هەڵدەدات لەبەین چووە .

***حەوتەم:*** وە لەبەر ئەوەی خوا فەرمانی بە دادگەری و چاکەکاری کردوە ، دادگەریش ئەوەیە کە ئەو شتانەی وەك یەك دەچن یەکسانییان لەنێوان دا بکرێ ، وەخوا ستەمی لەسەر خۆی قەدەغەکردوە و لەنێو بەندەکانیشیدا قەدەغەی کردووە ،جا دیارە کە گەورەترین دادگەری دادگەرییە لەکاروباری ئایینی دا ،چونکە هەرچەندە دادگەری لەکاروباری دنیاشدا وەك تۆڵەی خوێن و میراتی ماڵ و سامان پێویستەو پشت گوێ خستنی ستەمە ،بەڵام دادگەری لەکاروباری ئایین دا مەزنترە کە بریتییە لە دادگەری لەنێوان بەرنامەکانیداو لەنێوان شوێن کەوتووانی دا .

مادام بەرنامە دانەر دوو کردەوە یان ئەنجام دەرانی دوو کردەوەی یەکسان کرد بن ، بێگومان بەچاکتر دانانی یەکێکیان ستەمێکی گەورەیە ،هەروەها ئەگەر یەکێکیانی پەسەندتر کردبێ ئەوە یەکسان کردنیان ستەمە ،ئینجا بێگومان بەچاکتر دانان یان وەك یەك تەماشاکردنی شتان بەگوێرەی هەواو ئارەزوو و لەسەر بناغەی گومانیش لەڕەگەزی ئایینی کافرانە ،چونکە تێکڕای شوێن کەوتووانی ڕێچکەو تاقمەکان

هەرکامێکیان ئایین و رێبازی خۆی لەسەر بنچینەی گومان یان ئارەزوو یان قەناعەت[1] پێ بوون یان لاساکردنەوەی کوێرانە هەڵدەبژێرێ و هەر ئەمەشە هۆی پابەندی و دەمارگیری کوێرانەیان بەو رێچکەو بیردۆزانەوە و زەم کردنیان بۆ غەیری ئەوە کەخۆیان لەسەرینی .

ئینجا مادام پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو جۆرانەی بەدروست و رەوا دانابێ چ بەقسە چ بەکردەوە ، وە زۆربەش هیچی بەسەر هیچی‌دا پەسەند نەکرابێ ،کەواتە یەکسان کردنیان دادگەری‌یەو بەچاکتر دانانی هەندێکی تر ستەمە ،وە گەلێك جاران چەند دەستەو کۆمەڵێك لە ئوممەت دەکەونە کێشەو مشت ومڕەوە دەربارەی چەند جۆرە خواپەرستی‌یەك کە بەرزی و نزمی‌یان لەنێوان دا نیە بەڵکو یەکسانن ،یان ئاستەکانیان لەیەکترەوە نزیکین ،کەچی یەکێك دەبینی دەپرسێ :
کامیان چاکترە ئەم یان ئەو ؟! بەڵام بێگومان ئەوە پرسیارێکی هەڵەیە چونکە مادام ئەسڵی بەرزی و نزمی و چاك و چاکترەکەیان ئیسپات نەبووبێ ،دیاری کردنی یەکێکیان بەباشتر شتێکی بێ جێ‌یە !
وە پێویستە لەو حاڵەدا بگوترێ : ئەم دووانە وەك یەکن ،یان چاك و چاکترن ،ئینجا چاك و چاکتریش بن ئایا بەموتڵەقی یان پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە بەجۆرێك کەئەمیان لەکاتێك دا چاکترەو ئەویان لەکاتێکی دیکەدا ؟!
ئینجا لەکاتێك دا ئەو جۆرە پرسیارە دەکرێ دەبینی زۆربەی وەڵامەکان هەڵقوڵاوی ئارەزوو و گومانی هەڵەو درۆن ، گەورەترین هۆکاری ئەوەش - وەك پێشتریش چەند جار جەختمان لەسەر کردوە - عادەت گرتن و بەردەوام بوونە لەسەر شتێك کە ڕەوا نی‌یە دەوامی لەسەر بکرێ .

جائێستا مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست باسەرنج بدەین !
ئایا ئەگەر بێت و ئەو چوار ئاگاداری‌یە گەورەو ئەو چوار بنچینە گرنگە ڕەچاو بکەین و بەگوێرەی ئەو چوار دەستوورە بەرزە ڕەفتار بکەین وەك لە سەرەتای ئەم باسەوە گوتمان کۆتایی بەو هەموو مشت ومڕو شەڕە دەنووکە بێ‌جێ‌یانە ناهێنین کە مایەی سەر ئێشەو ناکۆکی و کات بەفیڕۆچوونێکی زۆرن ؟!

---

[1] دەبێ مەبەست قەناعەت و بڕوامێنانی بێ لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوە بێت .

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە هەرئەوەندە بەپێویست دەزانم کە دەقی ئەوچوار ئاگاداری و بنچینە و دەستوورە گرنگ و مەزنە بخەمەوە بەرچاو :

**یەکەم :** یەکریزی و برایەتی و تەبایی یەکێکە لەئەسڵ و بنچینە هەرە گەورەکانی ئیسلام و هەر قسەو هەڵوێستێك ببێتە مایەی مەحکەم بوون و پتەو بوونی ئەگەر فەرزیش نەبێ سوننەتەو ،بەپێچەوانەوەش هەر شتێك هۆکاری لاوازیو کەلێن تێ کردنی بێت ئەگەر حەرامیش نەبێ ناپەسەندە (مکروه) ە .

**دووەم :** سەرجەم یان زۆربەی ئەو مشت ومڕو تێك گیرانانەی کە لە بورای خواپەرستیی‌یەکان دا ڕوو دەدەن ،لەجوغزی سوننەت و سوننەت تر یان ئەوپەڕی سوننەت و ناپەسەند ناچنەدەرێ و ناگەنە نێو بازنەی فەرزو حەرام ،کەواتە کەسانێك لەسەر ئەو جۆرە بابەتانە کێشەو دم بەدمە دەکەن کەوەك پێویست شارەزای ئایین نین و هەر لەئاستی خەڵکی عەوام دان .

**سێیەم:** :زۆربەی خواپەرستیی‌یەکان بەشێوەو چۆنیەتی جیاجیا دەکرێن و هەمووشیان هەر لەبازنەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دان ، جا یان وەك یەك و یەکسانن ،یان بۆ حاڵەتە جۆراو جۆرەکانن ، دیارە هیچ کەسێکیش مافی ئەوەی نیە کەرێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەجوغزی تەسکی تێگەیشتن و بۆچوونەکانی خۆیدا کورت هەڵبێنێو ئایینی خوا و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی لەخەڵکی تەسك و گچکە بکاتەوە .

**چوارەم:** مادام ئەو خواپەرستیی‌یانەی کە لە بازنەی سوننەت دا بەشێوەی جۆراو جۆر ئەنجام دەدرێن هەموویان دروست و ڕەوا بن ،جا چ لەخێرو پاداشت دا یەکسان بن چ جیاواز بن بەرزی و نزمی (تَفاضُلْ)یان لەنێوان دا هەبێ ،وە چ بابای خواپەرست (عابِدْ) سەر پشك بێ لە هەڵبژاردنی جۆرێکیان دا چ جیاوازیەکەیان بۆ حاڵەتە جیاجیایەکان بێ ،مادام وابێ سوننەت و پەسەند وایە کەهەر جارە بەجۆرێکیان ڕەفتار بکرێو لەسەر جۆرێکیان دەوام نەکرێو لەیەك کات دا دوو جۆر یان زیاتریان کۆنەکاتەوە .

ئیدی بەهیوای ئەوە کەهەموومان وەك پێویست لـەم ئاگاداری و بنچینـە گـەورەو گرنگانە حاڵی بین و ،بەشێوەیەکی ڕاست و دروستیش ڕەفتاریان پێبکەین ،کە ئەگەر وابین و وابکـەین بێگومـان زۆر چاك دەتوانین لەسایەی هـەڵس وکـەوت و ڕەفتـاری شەرعی‌یانەو ژیرانە لەگەڵ ئەو جۆرە مەسەلانەدا کۆتایی بەگەلێك شەڕە قسەو مشت ومڕو تێکگیرانی بێ جێو زیانبەخش بێنین ،کە کات و ڕەنجێکی زۆرمان بێ هوودە بـەفیڕۆ دەدەن و ،لـە گـەلێك ئـەرکی گـەورەو گرنـگ بـێ ئاگامـان دەکـەن و ،لـە چارەسـەرکردنی زۆر کێشەو گـیروگرفتی پێویـست کـە پـەکمان لەسـەر چارەسـەریان کەوتووە ،لامان دەدەن و دوامان دەخەن و پـەکمان دەخـەن و ،سـەربارەش بیـانوو و پاساوی ناهەق دەخەنە بەردەستی دڵنەخۆش و ناحەزان کەتوانج و پلار لە ئیسلام بگرن و خۆیان دوورە پەرێز بگرن ، وە لایەنێك کە لەڕاستی‌دا نوختەی هێزو بڕستی ئیسلامە – کەمەودا دانە بەهەبوونی جیاوازی بیروڕا لەووردە بابەتەکان دا – بەهۆی خراپ تێگەیشتن و ڕەفتاری ناشی‌یانەوە وا پێشان دەدرێ کە عەوڕەت و عەیب و عارو ناتەواوی‌یە و بەو شێوەیە ئەو جۆرە کەسانە دەبنە موحامی‌یەکی دۆڕاوی کێشەیەکی هەق و ڕەوا .

# بابەتی سێیەم
# پاك و خاوێنی (الطَّهارة)

- ئاو و جۆرەكانی.

- پیسی و جۆرەكانیو چۆنیەتی لابردنیان (النّجاسة وأنواعها و كيفية إزالتها).

- لەش پیسی گەورە و گچكە ((الحدث الأكبر والأصغر).

- تارەت گرتن و خاوێن ڕاگرتنی جەستە و پۆشاك و جێگا و شوێن.

- خۆشۆردن (الغُسْل).

- دەستنوێژگرتن (الوضُوء).

- تەیەمموم كردن (التَّيَمُّمْ).

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری بەڕێز! شتێکی ئاشکراو زانراوە کە نوێژ بەرپاکردن و چەند جۆرە خواپەرستی‌یەکی دیکەش بەبێ پاکی‌یەتی جەستەو خاوێنی بەرگ و پۆشاک دروست نین، کە دیارە مەبەست لە پاکی‌ی جەستە (طهارة البدن) پاکییەتی لە هەردووك پیسی ماددی و حوکمی (العينية والحكمية)، وە مەبەست لە خاوێنی بەرگ و پۆشاك (نظافة اللباس)یش پاك و خاوێنی‌یەتی لە هەر جۆرە پیسی‌یەك کە شەرع بە پیسی داناوە.

بۆیە بە پێویستم زانی کە بەرلەوەی بچینە سەر توێژینەوەی پێنج دروشمەکانی خواپەرستیی، بەتایبەت نوێژ، باسی پاك و خاوێنی بکەین و بە گوشراوی هەموو ئەو مەسەلانە بتوێژینەوە کە دەکەونە نێو بازنەی (پاك و خاوێنی) یەوەو، کەم و زۆر دەبنە ڕێخۆشکەر و پێشەکی بۆ ئەنجام دانی چەند جۆرە خواپەرستی‌یەك بەتایبەتی نوێژ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ) رواه ابوداود والترمذي و قال: حديث حسن،

واتە: ڕێگاکەرەوەی نوێژ پاك و خاوێنی‌یە.

ئەو بابەتانەش کە خوا پشتیوان بێ لەم باسەدا دەیانتوێژینەوە، ئەمانەی خوارەوەن:

١- ئاو و جۆرەکانی.

٢- پیسی و جۆرەکانی‌و چۆنیەتی لابردنیان (النجاسة وأنواعها و كيفية إزالتِها).

٣- لەش پیسی گەورە و گچکە ((الحدَث الأكبر والأصغر).

٤- تارەت گرتن و خاوێن ڕاگرتنی جەستە و پۆشاك و جێگا و شوێن.

٥- خۆشۆردن (الغُسْل).

٦- دەستنوێژگرتن (الوضُوء).

٧- تەیەموم کردن (التَّيَمُّم).

شایانی باسیشە کە باسی پاك و خاوێنی بە هەموو بابەت و مەسەلەکانی‌یەوە زانایانی ئیسلام بایەخێکی زۆریان داوەتێ و ڕەنگە زۆرجار زیادەڕۆیی (إفراط) یشیان تێدا کردبێ،[1] لەسەر حسابی گەلێك بابەتی گەورە و گرنگ:

---

[1] بۆ وێنە زاناو پێشەوای پارێزکارو شارەزا (نووي) دوو بەرگی یەکەم و دووەمی کتێبی (المجموع شرح المهذب) ی بۆ پاك و خاوێنی‌و بابەتەکانی تەرخان کردووە!

بەڵام خوای بەخشەر و هیدایەت دەر پشتیوان بێ هەوڵ دەدەم کە لەبەر تیشکی دەقەکانی قورئان و سوننەت و بە بەهرە وەرگرتن لە دەریای پڕ گەوهەر و مرواریی بەرهەم و کەلەپووری زانایانمان شیلە و پوختەی ئەو باسە بنووسم، چونکە بێگومان پاك و خاوێنی بە هەردووك بەشی مەعنەوی و ماددیی‌یەوە گرنگی و بایەخێکی تایبەتی هەیە لە بەرنامەی خواداو مەگەر چۆن دەنا شەرعزانان (فقهاء) یش کتێبەکانی خۆیانیان هەر بە باسی پاك و خاوێنی دەست پێکردووە، خوای پەروەردگار و لێبوردەش دەربارەی هەردووك جۆرە پاکی مەعنەوی و ماددی فەرموویەتی: (ان الله يُحِبُ التَوّابِين ويُحِبُّ المتَطَهرين) البقرة -٢٢٢-، واتە بێگومان خوا تۆبەکەران و خۆپاککەرەوانی خۆش دەوێن. (چونکە «تەوبە» خۆ پاککردنەوەی مەعنەوی‌یە لە چڵك و چەپەری هەڵە و گوناهەکان).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (الطهورُ شَطْرُ الإيمانِ) رواه مسلم.

واتە: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە، بەڵێ ئیمان و مسوڵمانەتی دوو بەشی سەرەکی‌یە: نیوەی پاکی‌یە و نیوەشی چاکی‌ی، نیوەی خۆ پاککردنەوە و نیوەشی خۆڕازاندنەوە، خۆپاککردنەوە لە پیسی و پۆخەڵی دەروونی و جەستەیی وە خۆڕازاندنەوە بە دەروون و دەرەوە بە خەسڵەت و ڕەوشتە بەرز و جوانەکان و بە بەرگ و کاڵای پاك و حەڵاڵ.

هەروەها خوای کاربەجێ و بەبەزەیی لە سەرەتای پێغەمبەرایەتی و پەیام و سرووش (وحي) بۆ ناردنی‌یەوە فەرمانی بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد ﷺ) کردوە کە ڕواڵەت و ڕووحی پاك بکاتەوە و پاك ڕابگرێ:

(يا أيهاالمدثر. قُمْ فأنذِر، وَ رَبّكَ فَكَبِّرْ. وَ ثيابَكَ فَطَهِّرْ. والرُّجْزَ فَاهْجُرْ. ولاتَمْنُنْ تَسْتَكثِرْ. و لِرَبّكَ فَاصْبِرْ) المدثر -١ تا ٧.

واتە: ئەی خۆداپۆشەر! هەستە و - خەڵکی - ئاگاداربکەوە، وە پەوەرەردگارت بە گەورە بگرە، وە بەرگ و پۆشاکت خاوێن بکەوە، وە لە پیسی - گوناح - خۆت دووربگرە، وە بەهۆی بەخشین(یان ئامۆژگاری کردن)ەوە منەت مەکە و بەزۆری مەزانە، وە لەپێناوی پەروەردگارت دا خۆت ڕاگرە.

ئینجا بێگومان پاکی‌ی دەروون و خاوێنی‌ی ڕواڵەتیش پێکەوە پەیوەستن بەتایبەت پاکی‌ی دەروون و ڕووح هەمیشە خاوەنەکەی پەلکێش دەکات بۆ خاوێن

ڕاگرتنی جەستەو ڕواڵەتیشی، دیارە پەرستن و بەندایەتی بۆ خوا کردنیش کارێکی هێندە بەرز و پیرۆزە کە شایستەی هەموو کەسێك و هەموو حاڵێك نیە، بەڵکو تەنیا کەسانێك لەئەنجامدانی دەوەشێنەوە کە دەرو دەروون و ڕووح و ڕواڵەتیان پاك و خاوێن بێت، وەك فەرموویەتی: (الخَبِيثاتُ للخبيثين، والخبيثون للخبيثات، والطيِّبات للطيِّبين والطيِّبون للطيِّبات) النور-٢٦-

واتە[٢]: کردەوە بەد و پیسەکان بۆ کەسانی پیسن و کەسانی بەدو پیس لە کردەوە پیسەکان دەوەشێنەوە، وە کردەوە پاك و چاکەکان شایستەی کەسانی پاك و چاك و، کەسانی پاك و چاکیش لە کردەوە پاك و چاکەکان دەوەشێنەوە.

خواش بە کەرەمی خۆی هیدایەتمان بدات کە هەمیشە پاك و چاك بین بۆئەوەی شایستەی بەندایەتی بۆ کردنی و چاك پەرستنی خوای تاك و پاك بین.



[٢] ئەم ئایەتە تەفسیر و لێکدانەوەی دیکەشی هەیە کە ئەویشیان لەگەڵ سیاق و زنجیرەی ئایەتەکان گونجاوترە، کە مەبەست لە (خبيثات و خبيثين) و (طيبيات و طيبين) ئافرەتان و پیاوانی پیس و بەدو چاك و پاکە و ئەم ئایەتەش یەکێکە لەو ئایەتانەی کە بەبۆنەی تۆمەت بۆ هەڵبەسترانی (عائيشة) وە خوا لێی ڕازی بێ و پاکی و چاکی خستنەڕووی هاتنە خوار، بەڵام ئەو مانایەش کە ئێمە هێناومانە هەر دەیگرێتەوە و تەفسیرەکانیش هێناویانە

# ئاو و جۆرەكانی

وەك زانایان گوتوویانە: ئاو بەگشتی دوو بەشە:

ا- ئەوەی كە لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ (ما نَزَلَ من السَّماء)، وەك خوای بالادەست فەرموویەتی: (وَ يُنزِّلُ عَلَيكُمْ من السَّماءِ ماءً لِيطهِّرَكُمْ بِهِ) الانفال -١١-

واتە: وە لە ئاسمانەوە ئاوێكتان بۆ دەنێرێتە خوار تاكو پێی پاك و خاوێن ببنەوە.

كە ئەمەیش سێ جۆرە: باران (مَطَر) و بەفر (ثَلْج) و تەرزە (بَرَدْ)، وەك پێغەمبەر ﷺ لە پاڕانەوەیەكیدا فەرموویەتی: (اللهُمَّ اغْسِلْ خَطايايَ بالماءِ والثلْجِ والبَرَدِ) رواه مسلم و احمد و النسائي وابوداود و ابن ماجة و البيهقي..

ب-ئەوەی كە لە زەویدایە یان دێتەدەرێ و هەڵدەقوڵێ، كە ئەمەیش چوار جۆرە: دەریا (بحر) و ڕووبار (نهر) و كانیاو (ینبوع) و بیر (بئر)، ئاشكراشە كە ئاوی ڕووبار و كانی و بیر و كارێزەكانیش هەر لە ئاوی ئاسمانەوەیە وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (أَنزَلَ من السَماءِ ماءً فَسَلَكَهُ يَنابيعَ في الأَرْضِ) الزمر٢٤- واتە: خوا لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارێ وە لە سەرچاوەكانی نێو زەویدا عەمباری كردووە.

هەروەها ئاشكرایە كە ئەسڵی ئاوی شیرین لە ئاوی ئاسمانەوەیە و ئەسڵی ئاوی سەر زەویش بەگشتی ئاوی دەریاكانە كە سوێر و تاڵ و تفتە و بەكەڵكی خواردنەوە نایەت، بەڵام خوای كاربەجێ بەهۆی بارانی لە ئاسمانەوە بە هەرسێك شێوەكانی باراندنی و بەفر و تەرزە لەو تاڵی و سوێری و تفتیەی بۆمان دەپاڵێوێ و ئاوێكی شیرین و زوڵاڵمان بۆ پەیدا دەكات، وەك فەرموویەتی: (أَفرأيتم الماءَ الذي تَشْرَبون؟! أَ أَنتُمْ أَنزلْتُمُوهُ من المُزْنِ أم نَحْنُ المُنزِلون؟ لَو نَشاءُ جَعَلناهُ أُجاجاً فَلولا تَشكرون!) الواقعة -٦٨ تا ٧٠-

واتە ئایا ئەو ئاوەتان نەدیوە كە دەیخۆنەوە؟ جا ئایا ئێوە لە هەوران دەنێرنە خوارێ یان خۆمان ناردوومانەتە خوارێ؟ ئەگەر ویستبامان سوێر و تاڵمان دەكرد، دەبووایە لەسەر ئەو نیعمەتانە سوپاسگوزاری بكەن.

دیارە هەركام لە ئاوی ئاسمان كە هەموو جۆر و شێوەكانی ئاوی شیرین دەگرێتەوە و، ئاوی دەریا كە سوێرە و ئەسڵی ئاوەكانە بەگشتی بە سوێر و شیرینیانەوە، پاكن و پاككەرەوەشن[٣]، چونكە خوای پەروەردگار دەربارەی ئاوی ئاسمان فەرموویەتی: (و أنزلنا من السَّماءِ ماءً طهوراً) الفرقان -٢٨-

واتە: وە لە ئاسمانەوە ئاوێكی پاك و پاككەرەوەمان ناردۆتە خوارێ.

---

[٣] وشەی(طَهُور)یانی پاك و پاككەرەوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) وشەی (طهر).

پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەی ئاوی دەریاوە که پیاوێك لێی پرسی ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟! (اَفَنَتَوضّأُ بِماءِ البَحْرِ؟) فەرمووی: (هوَ الطَّهورُ ماءُهُ الحِلُّ مَيْتَتُهُ) رواه مالك و واحمد و اصحاب السنن و صححه البخاري.

كما قال الترمذي، و صححه الحاكم ووافقه الذهبي، و اخرجه كل من ابن حبان و الطبراني و البيهقي والدارقطني و صححه ابن خزيمة و ابن المنذر والبغوي.[٤]

واته: دەریا ئاوەکەی پا ك و پاککەرەوەیه و مردارەوەبووەکەی حەڵاڵه.

هەروەها شایانی باسه که ئاو (ماء) ئەسڵه له پاك و خاوێنیدا و شتەکانی دیکه جێدار (بدیل) نیو له کاتی نەبوونیدا، یان نەگونجانی بەکارهێنرانیدا کەڵکیان لێوەردەگیرێ.[٥]

ئینجا ئەوه که ئاو به گشتی پاك و پاككردنەوە (طاهِرْ و مُطَهِّرْ)یه زانایان لەسەری یەکدەنگن و جیاوازی‌یان لەنێوان دا نیه،[٦] هەروەها لەسەر ئەوەش یەکدەنگن که هەرکاتێك ئاو پیسی (نجاسة) یەکی تێکەوت که تام (طعم) ی یان بۆن (ريح) ی یان ڕەنگ (لون) ی بگۆڕێ ئەوه ئەو ئاوه زۆربێ یان کەم، وه ڕاوەستاو بێ یان ڕۆیشتوو به پیس (نجس) دادەنرێ و نەپاك (طاهر) دەمێنێ و نه پاككەرەوە (مُطَهِّر)یش.[٧]

هەروەها زۆربەی هەرەزۆری نزیك به یەکدەنگی (إجماع) زانایان ڕایان وایه که هەرکاتێك ئاو ماددەیەکی دیکەی تێکەڵ بوو که له حاڵەتی ئاوی ڕووت (الماء المطلق) بیباتەدەرێ و نەگونجێ پێی بگوترێ (ئاو)، ئەوه هەرچەنده - ئەگەر ماددەکه پاك بێت - هەر به پاك دادەنرێ، بەڵام بەکەڵکی پاككردنەوە نایەت و له پاككەرەوەیی دەشۆرێ،[٨] بەڵام ئەگەر ئەو مادەیەی که ئاوێتەی ئاوەکه بووه وێڕای پاکی نەشگونجێ لەئاوەکه جیابکرێتەوەو له (ئاو) ێتیشی نەباتە دەرێ، وەك قەوزەو گەڵای درەخت و قوڕو لیتەو زەعفەران و.. هتد، ئەوه دیسان له پاككەرەوەیی ناشۆرێ و وێڕای پاکی بەپاككەرەوەش دادەنرێ[٩].

---

[٤] بڕوانه: (المجموع) ج١ ص ١٢٣، ١٢٤.

[٥] بڕوانه: (بداية المجتهد) ج١ ص ٢٤.

[٦] بڕوانه: (روضة الندية شرح الدرر البهية) ج١ ص٢١.

[٧] بڕوانه: (بداية المجتهد) ج١ ص٢٤.

[٨] بڕوانه: (الأدلة الرضية شرح الدرر البهية) ص١٩.

بەڵگەی ئەوەش کە ڕابرد ئەم دەقەیە:

(عن ابي سعيد الخدري ﷺ: قيل يا رسول الله ﷺ أَتَتَوضأُ من بِئرِ بضاعةَ وهي بِئرٌ يلقى فيها الحِيَضُ و لَحْمُ الكِلابِ والنَّتَنُ؟! فقال رسول الله ﷺ: إِنَّ الماءَ طَهورٌ لا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ) رواه مالك في الموطاء والشافعي و احمد وابوداود والترمذي والنسائي و غيرهم و قال الترمذي: حسن صحيح، *[9]

واتە: گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن لە بیری (بضاعة) دەستنوێژ دەگری کە بیرێکە پەڕۆی حەیز و گۆشتی سەگان و شتی بۆگەنی تێ فڕێدەدرێ؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێگومان ئاو پاك و پاككەرەوەیە و هیچ شتێك پیسی ناكات.

بەڵگەی ئەوەش کە هەرکاتێك ئاو بەهۆی پیسییەوە یەکێك لە تام و بۆن و ڕەنگی گۆڕان بە پیس دادەنرێ و سیفەتی پاکی و پاککەرەوەیی نامێنێ، یەکدەنگی (اجماع)ی زانایانە، وەك زۆر لە زانایان نەقڵیان کردوە بۆ وێنە، (نووي)[10] و (ابن المنذر)[11] و (ابن قدامة)[12] و (ابن الملقن)[13].

واش پێدەچێ ئەو ڕایەی هەندێك لە زانایان کە دەڵێن: {هەرکاتێك ئاو لە (قُلَّتَين)[14] کەمتر بوو ئەگەر پیسییەکی کەمیشی کەوتە نێو هەر بەپیس دادەنرێ، با هیچ کام لە تام و بۆن و ڕەنگیشی نەگۆڕێ} ڕایەکی بێهێز بێت و، ئەو ڕایە بەهێزتر بێ کە جیاوازی ناخاتە نێوان ئاوی کەم و زۆرەوەو، گۆڕانی یەکێك یان زیاتر لە تام و بۆن و ڕەنگی ئاو بەهۆی پیسی تێکەوتنەوە بە سنووری نێوان پاکیی و پیسیی ئاو دادەنێ، کە ڕای زۆربەی[15] هەرە زۆری زانایانە، چونکە: ئەو فەرموودەیەی کە کراوە

---

[9] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ١٥٥، ١٥٦.

* هەمان بەرگو سەرچاوە ص ١٢٤ ، ١٢٥ وە بڕوانە (الروضة الندية) ج١ص٢٣

[10] بروانە (المجموع) ج١ ص ١٦٣.

[11] بڕوانە: هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.

[12] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص ٢٤.

[13] بروانە: (الأدلة الرضية) ص ١٩.

[14] (قُلَّتَين) واتە دوو گۆزە (جَرَّة) یان کووپە.

[15] (نووي) گوتوویەتی: ئەو ڕایە کە دەڵێ ئاو چ کەم بێ چ زۆر بە پیسی تێکەوتن پیس نابێ هەتا نەگۆڕێ، ڕای: (ابو هريرةَ و ابن عباس و ابن المسيب والحسَن البصرى و عكرمةَ و سعيد بن الجبير وابن ابى ليلىٰ و جابر بن زيد و يحى بن سعيد القطان و عبدالرحمن بن مهدي و مالك و اوزاعي و

به بەڵگەی ڕای ناوبراو کە بە (حديث القُلَّتَيْنِ) ناسراوە و ئەمە دەقەکەیەتی: (عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال: سمعت رسول الله ﷺ وهو يُسْأَلُ عن الماءِ يَكُونُ في الفَلاةِ من الأَرْضِ و ما يَنُوبُهُ مِنَ السِّباعِ والدَّوابِّ فقال: إذا كان الماءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الخَبَثَ) و في لفظ احمد: (لَمْ يُنَجِّسْهُ شَيْءٌ) و في لفظ الابي داود (لم يَنْجُسْ) رواه احمد و اصحاب السنن والشافعي وابن خزيمة و ابن حبان والحاكم والدارقطني والبيهقي و صححه الحاكم على شرط الشيخين.[16]

واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەربارەی ئاوێك پرسیاری لێکرا کە لە دەشت و بیابانێك دا دەبێ و دڕندە و ئاژەڵ هاموشۆی دەکەن، فەرمووی: هەرکاتێك ئاو دوو گۆزە (کووپە) بوو پیسی هەڵناگرێ.

بەڵێ ئەم فەرموودەیە وێڕای ئەوە کە زانایان مشت و مڕی زۆریان لەسەری کردووە و هەندێکیان گوتوویانە:* (وقع الأضطراب في إِسْنادِهِ و مَتْنِهِ)، وە (ابن عبدالبرّ) لەبارەیەوە گوتوویەتی: (ما ذهب اليه الشافعي من حديث القلتين مَذْهَبٌ ضَعيفٌ من جِهةِ النَّظَرِ، غَيرُ ثابتٍ مِنْ جِهَةِ الأَثَرِ، لانه حَديثٌ تكلَّم فيه جَماعةٌ من أهل العلم، ولأن القلتين لَمْ يُوقَفْ على حقيقة مَبْلَغِهما في أَثَرٍ ثابتٍ ولا إِجماعٍ)[17]

واتە: بۆچوونی شافیعی دەربارەی فەرمودەی دوو گۆزەکان لە ڕووی عەقڵەوە بێهێزە و لە ڕووی نەقڵیشەوە سەلمێنراو نیە، چونکە فەرمودە گۆڕین کۆمەڵێك لە زانایان قسەیان لەسەر کردوە، وە چونکە هیچ بەڵگەیەکی نەقڵی یان ئیجماعی لەبارەی دیاریکردنی ئەندازەی دوو گۆزەکانەوە بە دەستەوە نیە.[18]

---

ثوري و نخعي و داود و و ابن المنذر) ە و پەسەندکراوی (غزالي و روياني) و ژمارەیەك لە زانایانی شافیعی مەزهەبە لە (خۆراسان و عراق)، بڕوانە : المجموع) ج٢ ص ١٦٦ ، ١٦٧.

[16] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ١٢٤.

* (بڕوانە: الروضة الندية) ج١ص٢٤، واتە: ناڕێکیو پەشێوی هەم لە زنجیرەی ڕاوییەکانی و هەم لە دەق (متن) ەکەشیدا هەیە.

[17] بڕوانە: پەراوێزی (المجموع شرح المهذب) ج١ ص ١٦٥.

[18] دەربارەی ئەندازەی (قلتين) زۆر قسەکراون، بڕوانە: (الأَدِلَّة الرضية) ص ٢٠، بەلام ڕای شافیعییەکان و حەنبەلییەکان ئەوەیە کە پێنج کوندە ((خمس قرب) ئاون کە دەکەنە پێنج سەد (٥٠٠) ڕەتڵ بە ڕەتڵی عیراقی، بڕوانە: (المغني) ج١ ص ٢٣، وە: (المجموع) ج١ ص١٧٩.

ویّرای ئەوە وەك خاوەنی (الروضة الندیة) گوتوویەتی:[19] فەرمودەی ناوبراو ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکاتێك ئاو گەیشتە ئەندازەی دوو گۆزە پیسی هەڵناگرێ بەڵام ئەگەر کەمتر بێ پیسی هەڵدەگرێ، جا هەروەك چۆن فەرموودەی: (الماءُ طَهورٌ لا یُنَجِّسُهُ شَيءٌ) بە ڕستەی: (إلاّ ما غیرَّ طَعْمَهُ أَو رِیْحَهُ أَو لَوْنَهُ)[20] پابەند (مقیَّد) کراوە، پێویستە فەرموودەی (قُلَّتَین) یش بە هەمان بەند (قید) ەوە ببەسترێتەوە و بگوترێ، ئاو مادام گەیشتبێتە ئەندازەی دوو گۆزە لە هیچ حاڵێك دا پیسی هەڵناگرێ، مەگەر بەهۆی ئەو پیسییەوە تام یان بۆن یان ڕەنگی بگۆڕێ، بە واتایەکی دیکە، ئاوێك کە لە ئەندازەی دوو گۆزە کەمتر بێ، ئەگەر پیسییەکی تێکەوت کە یەکێك لە سیفەتەکانی بگۆڕێ، ئەوە پیس بووە و پاك و پاککەرەوە نەماوە، بەڵام ئەگەر پیسییەکە هیچ کام لە سیفەتەکانی نەگۆڕی ئەوە ئەو پیسی تێکەوتنەی مایەی پیس بوون و لە پاکیی و پاککەرەوە شۆران نیە.



[19] بروانە: (الروضة الندیة) ج١ ص ٢٥، ٢٦.

[20] هەرچەندە ئەو ڕستەیە زانایان لەسەری یەکدەنگن، بەڵام فەرموودەیەکیش لەوبارەوە هەیە کە (ابن ماجە) گێڕاویەتەوە، ئەوەندە هەیە زۆر بەهێز نیە، بۆیە زانایان پشتیان بە (اجماع) ەکە بەستووە.

# ئـاوی بەکـارهێنراو

لەبارەی ئاوی بەکارهێنراو (الماء المستعمل) یش کە بریتیە لەو ئـاوەی کـە بـۆ لابردنی بـێنوێژی گـەورە و گچکـە (الحـدث الأکـبر والأصغـر)، یـان لابردنـی پیسـی (نجاسـة)یەك بـەکارهاتبێ، زۆربـەی هـەرە زۆریـان مـادام تـام یـان بـۆن یـان ڕەنگـی نەگۆڕابێ هەر بە پاك (طاهر) ی دەزانن،[21] بەلاّم زۆربەیان بە پاککەرەوە (مُطَهِّر) ی نازانن و لەو بارەشەوە مشتومڕێکی زۆریـان کـردوە و منیـش پـاش سـەرنج دان و لێوردبوونەوەی بەڵگەکانی هەردووك لایان گەیشتوومە ئەو قەناعەتە کە هیچ کامیان – واتە نە ئەوانەی کە ئاوی بەکارهێنراو بە پاککەرەوە دەزانن و نە ئەوانەش کە بە پاککەرەوەی نازانن – بەڵگەی ئەوتۆیان بەدەستەوە نیە کە لایەکی دیکە بێ قسە بکات و ئیسپاتی دەعوای خۆی پێ بکات، بۆیە من هیچ کام لەو دوو ڕایە زاڵ ناکەم بەسەر ئەوی دیکەدا و دووربینی (إحتیاط) یش ئەوەیە کە لە بەکارهێنانی ئاوی بەکارهێنراو پارێز بکرێ، بەلاّم پێشم وا نیە کە بەدەست تێخستن یان هەڵچۆڕانی چەند دڵۆپەیەك ئاوی بەکارهێنراو و ئاوێتـەبوونی لەگـەڵ ئاوێکی کـەمی بەکارنـەهێنراودا، ئـەو ئـاوە دەست تێخراو یان دڵۆپە تێدا هـەڵچۆڕاوە تـەنیا بەوەندە لە پاککەرەوەیی دەشۆرێ، وەك هـەندێك لـە شـەرعزانان (فقـهاء) گوتوویانـە و هیـچ بەڵگەیـەکی ئەوتۆشـیان لەوبارەوە بەدەستەوە نیە.[22]

ئینجا هەرچەندە من لەبارەی پاککەرەوەیی و پاکنەکەرەوەیی ئاوی بـەکارهێنراو وەسـتان (توقـف) م هـەڵبژاردوە و هیـچ کامیـان (ترجیـح) ناکـەم، بـەلاّم بۆئـەوەی وانەزانرێ کە ڕای زۆربە بەشێوەیەکە کە ڕای بەرانبەریان هێز و پـێزێکی نـەبێ! بـە پەسەندی دەزانم ئاماژە بکەم بۆ ژمارەیەك لەو زانایانەی کە پێچەوانەی ڕای زۆربەیان پەسندکردوە:

---

[21] ئەمـە ڕای مـالك و شـافعی و احمـد و ڕای بـاوی (ابـو حنیفـة) و جـەماوەری زانایانـە، بڕوانـە: (المجموع) ج١ ص ٢٠٧.

[22] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٢١٩، وە بڕوانە: (نیل الأوطار) ج١ ص ٣٠ ، ٣١.

(سفيان الثوري و ابوثور و اهل الظاهر) وه (ابو حنيفة و مالك و شافعي) يش يەكێ لە ڕایەکیان دا،[23] وه هەرکام لە (إبن حزم)[24] و (شوکاني)[25] و (قنوجي)[26] و (سیدسابق)[27] یش .. ڕایان وایه که ئاوی بەکارهێنراو وێڕای پاکیی پاککەرەوەشە، هەڵبەتە بەمەرجی نەگۆڕانی تام یان بۆن یان ڕەنگی.

وه (ابن المنذر) لەوبارەوە گوتوویەتی:[28]

{ لە هەرکام لە: (علي و ابن عمر و ابي امامة و عطاء و الحسن و مكحول والنَّخَعي) یەوە گێڕراوەتەوە کە گوتوویانە: کەسێك لەبیریچووبێ سەری مەسح بکات و ئاو و تەڕایی بە ڕدێنییەوە مابێ دەتوانێ سەری پێ مەسح بکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە – ئەو زانایانە – ئاوی بەکارهێنراویان بە پاککەرەوە زانیوە و منیش هەمان ڕام هەیە }.

ئەوانەش کە بە پاککەرەوە (مُطَهِّر) ی نازانن زۆربەی زانایانن و هەرکام لە (احمد و لیث و اوزاعي و شافعي و مالك و ابو حنيفة)یان لەنێودا هەن، ئەوەندە هەیە (ابو حنيفه و مالك و شافعي) ڕای دیکەشیان هەیە، وەك پێشتر گوتمان.[29]



---

[23] بروانە: ( (الروضة الندية) ج١ ص ٣١.

[24] بروانە: (المحلى شرح المحلى) ج١ ص ١٩٤ تا ١٩٨، مسالة: (١٤١).

[25] بروانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٣١، وه: (الأدلة الرضية) ص ٢٠، ٢١.

[26] بروانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٣١.

[27] بروانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٢ ، ٢٣.

[28] بروانە: ( سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٢٣)

[29] بروانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٣٠.

# پیسی و جۆرەکانی ( النَّجاسة و أنواعُها ) و چۆنیەتی لابردنیان

پیسی (نجاسة) بریتیە لە هەرشتێك كە سروشتی ساغ بە پیسی بزانێ و بێزی لێ بێتەوە و قێزەون بێت و شەرعیش بە پیسی دانابێ، وەك میز و پیسایی و تەرس و مردارەوەبوو.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە كە یاسای: ئەسڵ لە هەموو شتێكدا پاكی‌یە مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر پیسیی (الأصل في الأشْياءِ الطَّهارة إلا مادلَّ الدليلُ علىٰ نَجاستِهِ) بنچینەیەكە زانایان لەسەری رێك كەوتوون و، نابێ هیچ شتێك بە پیس دابنرێ مەگەر شەرع بە پیسی لەقەڵەم دابێ، ئەوە لە خوارەوە هەمو ئەو شتانەی كە بەڵگەی شەرعی لەسەر پیس (نجس) بوونیان هەیە بە ریز دەیان نووسین و ئەو شتانەش كە زانایان لە بارەیانـەوە رایـان جیـاوازە دەیانخەینـە كۆتاییـیـەوە و ئامـاژەش بـە را جیایی(اختلاف)ی زانایان دەكەین:

## یەك: پاشەرۆكی ئینسان (الغائط): لەوبارەشەوە بەڵگە زۆرن بۆ وێنە:

(عَنْ ابي سعيد الخدري رضي الله عنهُ أن النبي ﷺ قالَ: إذا جاءَ أَحَدُكُـمْ المَسجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيهِ وَلْيَنظُرْ فيهما فَإنْ رأىٰ خَبَثاً فَلْيَمْسَحْهُ بالأرضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فيهِما) رواه احمد و ابوداود و هو حديث حسن.

واتە: ئەگەر یەكێكتان هاتە مزگەوت با پێڵاوەكانی سەرەوبن بكات و تەماشایان بكات جا ئەگەر پیسایی پێوەبینێ با بە زەوی بیسرێتەوە، پاشان نوێژیان پێوە بكات.

هەرچەندە وشەی (خَبَثْ) هەر جۆرە پیسی‌یەك دەگرێتەوە بەڵام زانایان گوتوویانە لێرەدا مەبەست پیسایی ئینسانە.

## دوو: میزی ئینسان (بول الأنسان):

ئەمیش بەڵگەی زۆری لەسەر هەن بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە:

(عَنْ أبي هريرة رضى الله عنه قال: قام أعرابي فَبال في المَسْجدِ فَتناوَلَهُ الناسُ فقـال لهم النَبيُّ ﷺ: دَعُوهُ و هَرِيقُوا على بَولِهِ سَجْلاً من ماءٍ – أو ذَنُوباً من ماءٍ – فَإنما بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِيْنَ وَ لَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِيْنَ) رواه البخاري و اصحاب السنن.

واته: عارەبیێکی خێڵەکی هەستا و لە مزگەوتێ میزی کرد، خەڵکیش کەوتنە قسە پێ‌گوتنی، پێغەمبەریش ﷺ پێیێ فەرموون: لێی بگەڕێن - با میزەکەی تەواو بکات - پاشان دۆڵچەیەك ئاو بە شوێنی میزەکەی دا بکەن، چونکە ئێوە نێرراون - بۆ مرۆڤایەتی - کە ئاسانکەر بن نەك وە زەحمەت خەر.

شایانی باسە کە زانایان لە پیسی‌یەتی (پیسایی و میزی ئینسان) دا یەکدەنگن.[٣٠]

## سێ: لیکاوی سەگ (لُعاب الکلب)

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (عَنْ أبي هريرة رضي الله عنه قال: قالَ رسول الله ﷺ: طَهُور إناءِ أَحَدِكُمْ إذا وَلَغَ فيهِ الكَلْبُ أَنْ يُغْسَلَ سَبْعَ مَرّاتٍ أُولاهُنَّ بالتُّرابِ) رواه مسلم.

واته: پاککەرەوەی دەفری[٣١] یەکێکتان ئەگەر سەگ دەمی تێنا ئەوەیە کە حەوت کەڕەتان بشۆرێ یەکەمیان بە گڵ بێ.

## چوار: گۆشتی بەراز (لحم الخنزير):

چونکە خوای پەروەردگار و پەنهان بین فەرموویەتی: (قُلْ لاَّ أَجِدُ فِيْمَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَو دَماً مَسْفُوحاً أَو لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ..) الانعام -١٤٥-.

واته: بڵێ لەوەدا کە خوا وەحی بۆم ناردووە نابینم هیچ شتێك لەسەر بابای بخۆر قەدەغەکرابێ کە بیخوات مەگەر مردارەوەبووبێ یان خوێنی ڕێژراو یان گۆشتی بەراز کە بێگومان پیسە...

## پێنج: تەرسی کەر و ئێستر و پاشەڕۆی هەر ئاژەڵ و دڕندە و گیاندارێك کە گۆشتی نەخورێ؛

بەڵگەی ئەوەش ئەم فەرموودەیەیە: (عَنْ ابن مسعود رضي الله عنه قال: أتى النبيُّ ﷺ الغائطَ فأمَرَني أَنْ آتِيَهُ بثلاثةِ أَحْجارٍ، فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ والتَمسْتُ الثالِثَ فَلَمْ أَجِدْهُ فأخَذْتُ رَوْثَةً فأتيتُهُ بها، فَأَخَذ الحَجَرينِ وأَلْقى الروثةَ وَ قال: هذا رِكْسٌ)

رواه البخاري و أصحاب السنن الا ابو داود.

واته: پێغەمبەر ﷺ چوو تارەت بگرێ و پێی فەرمووم کە سێ بەردی بۆ بهێنم، منیش دوو بەردم پەیداکردن و بۆ سێیەمیش گەڕام چنگم نەکەوت بۆیە تەرسەقولێکم

[٣٠] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ ص ٨٢، وە بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٣٢ ، ٣٣.

[٣١] وشەی (اناء) کە کۆیەکەی (أواني) یە بەهەرشتێك دەڵێن کە خواردن و خواردنەوەی تێ‌بکرێ، کەواتە قاپ و مەنجەڵ و تەشت و ... هتد دەگرێتەوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) وشەی (اناء).

هەڵگرت و بۆیم هێنان، ئەویش دوو بەردەکەی وەرگرتن و تەرسەقولەکەی فڕێدا و فەرمووی: ئەمە پیسە.

شایانی باسیشە کە پیسیی پاشەڕۆك (رجیع) و میزی هەموو ئەو ئاژەڵ و دڕندە و گیاندارانەی کە گۆشتیان ناخورێ یەکدەنگی (اجماع) ی زانایانی لەسەرە، هەرچەندە خاوەنی (بدایة المجتهد) گوتوویەتی[٣٢]: هەندێك لە زانایان بە پیسیان دانانێن، بەڵام وابێدەچێ ڕای (رافعي) ڕاستتر بێت کە دەڵێ: زانایان لەسەر پیسیی میز و پاشەڕۆکی هەر گیاندارێك کە گۆشتی ناخورێ یەکدەنگن.[٣٣]

## شەش: خوێنی حەیز (دم الحیض):

بەڵگەی ئەوەش ئەم فەرموودەیەیە: (عَن أسماء بنت أبي بكر رضـي الله عنهما قـالت: سَأَلَتْ امراءةٌ رسولَ الله ﷺ فقالتْ: أرأيتَ إحْداناَ إذا أصابَ ثَوْبَها الدَّمُ من الحَيْضَةِ، كَيـفَ تَصْنَعُ؟ فقال رسول الله ﷺ: إذا اصابَ ثوبُ إحْداكنَّ الدَّمُ مِن الحَيْضةِ فَلتَقرُصْهُ ثم لتَنضَحْهُ بِماءٍ ثم لتصلي فيه) رواه البخاري و مسلم و أصحاب السنن.

واتە: ژنێك لە پێغەمبەری خوای ﷺ پرسی گوتی: ئایا ئەگەر یەکێکمان خوێنی حەیز بەر پۆشاکەکەی کەوت چی بکات؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان خوێنی حەیز بەر پۆشاکەکەی کەوت با هەڵی گوشێ و بیکرێنێ پاشان ئاوی لێ بپرژێنێ، ئینجا نوێژی پێوە بکات.

## حەوت و هەشت: ئاشقاو و ئاوی دوای میز (المَذِيّ والوَدْيُ):

ئاشقاو (مَذْي) ئاوێکی سپی و خەست و لینجە کە لەکاتی ئارەزووی جینسی جووڵان و دەستبازی (مُلاعبة) دا لە ئەندامی جنیسی پیاو و ئافرەت دا پەیدا دەبێ و زۆربەی هەرەزۆری زانایان بە پیسی دەزانن، بە بەڵگەی ئەم دەقە:

(عَنْ علي رضي الله عنه قال: كُنْتُ رجُلاً مَذّاءً و كُنْتُ اَسْـتَحِيْ أن أَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ لِمكَـانِ إبنتِهِ، فأمَرْتُ المِقدادَ بِنِ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ فقال: يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَ يَتَوَضَّأ) متفق عليه واللفظ للبخاري

واتە: عەلی خوا لێی ڕازیبێ گوتوویەتی: من پیاوێکی زۆر بە ئاشقاو بووم و لەبەر کچەکەیشی کە لە لام بوو شەرمم دەکرد کە لە پێغەمبەر ﷺ بپرسم جا بە مقداد بن الأسودم گوت: ئەویش لێی پرسی، ئەو - پێغەمبەر - یش فەرمووی: با چووکی بشوات و دەستنوێژ بگرێ.

---

[٣٢] بڕوانە: (بدایة المجتهد) ج١ ص ٨٢.

[٣٣] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٢٩١، پەراوێزەکەی، بە ئاشکراش دیارە کە پاشەڕۆکی سەگ و بەراز و گورگ و چەقەڵ و پشیلە یەکجار پیس و بۆگەنە.

ئاوی دوای میز (وَدْي) یش ئاوێکی مەیلەو بۆری خەستەو بەبێ ئارەزوو جووڵان پاش میز دێتە دەرێ و، (نووي) گوتوویەتی[٣٤]: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پیسە، (ابن عباس) یش خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ لە بارەی هەر کام لە (مني و ودي و مذي) یەوە گوتوویەتی:

(المنيُّ والوَدْيُ والمَذْيُ، أمّا المَنيُّ فَهو الّذي مِنه الغُسْلُ، وأما الوديُ والمذيُ، فقال: أغْسِلْ ذكرك أو مذاكيرك و توضأ وضُوءَك للصَّلاةِ) رواه ابوداود والبيهقي.

واتە: مەنی و وەدی و مەذی هەرچی مەنی‌یە ئەوەیە کە خۆشۆردنی پێویستە، بەڵام وەدی و مەذی، گوتی: چووکت یان گوتی گەڵ و گونت بشۆ وە وەك دەست نوێژی نوێژ دەست نوێژ بگرە.

(شوکاني) گوتوویەتی[٣٥]: {زانایان لەسەری پیسی ئاشقاو یەکدەنگن و تەنیا هەندێك لە – شیعە – ئیمامی‌یەکان ڕایان جیایە و بە پاکی دەزانن بە بیانووی ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ تەنیا فەرمانی کردوە بە ئاو لێپرژاندنی و ئاو لێپرژاندنیش لای نابات، کەواتە پیس نیە ئەگەرنا فەرمانی دەکرد بە شۆردنی! جا ئەگەر ئەمە وابێ دەبێ (پیسایی ئینسان) یش پاك بێ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە سڕینەوە (مسح) ی بە زەوی و پاشان نوێژ پێوەکردنی، کە بێگومان سڕینەوەش بەزەوی بەتەواوی لای نابات!!}

## نۆ: مردارەوەبوو (الميتة):

بەڵگەی پیسی‌ی مردار (ميتة) یش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، وەك (ابن عباس) لێی گێڕاوەتەوە: (إذا دُبِغَ الإهابُ فَقَد طَهُرَ) رواه مسلم و اصحاب السنن.

واتە: هەرکاتێك پێستە دەباغ (خۆش) کرا ئەوە مسۆگەر پاك بۆتەوە. کەواتە بەرلەوەی خۆش بکرێ پیسە و دیارە ئەو گۆشتەش کە ئەو پێستەیەی بەدەورەوە بووە هەر پیسە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لا تُنَجِّسوا مَوْتاكُم فَإنَّ المؤمِنَ لا يَنْجُسُ حَيّاً ولا مَيِّتاً) رواه الحاكم و البيهقي عن ابن عباس رضي الله عنهما و قال الحاكم: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين.

واتە: مردووەکانتان بە پیس مەزانن چونکە بڕوادار پیس نیە نە بە زیندوویی و نەبە مردوویی.

---

[٣٤] بڕوانە: (المجموع) ج ص ٥١٠، کە گوتوویەتی: (أجْمَعتِ الأمّةُ علىٰ نَجاسَةِ المذي والودي)

[٣٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٦٤.

لەم فەرموودەیەش دەفامرێتەوە کە غەیری مسوڵمان بە مردوویی بە پیس دادەنرێ، دیارە بێجگە لە مردووی ئینسان، دوو گیانداری دیکەش بە مردوویی بە پاک دادەنرێن، کە بریتین لە ماسی و کوللە (السَّمك و الجَرَاد) چونکە (ابن عمر) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: (أُحِلَّتْ لَنا مَيْتَتانِ و دَمانِ: فالمَيْتَتانِ: السَّمَكُ والجَرادُ، والدَّمانِ الكَبِدُ والطِّحالُ) رواه البيهقي و هو صحيح و في حكم المرفوع كما قال النووي[36].

واتە: دوو مردار و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراون: دوو مردارەکان ماسی و کوللەن، وە دوو خوێنەکانیش جەرگ و سپڵن.

*ئەم شتانەی ڕابردن تێکرایی زانایان یان بەلای کەمەوە زۆربەی هەرەزۆریان بە پیسیان دادەنێن، چەند شتێکی دیکەش هەن کەزانایان تێیان دا جیاوازن کە ئەمانەی خوارێ سەرەکی یەکانیانن:*

## دە: ڕشانەوە (القيء):

کە وەك (نووي) گوتوویەتی[37]: زۆربەی جەماوەری زانایان بە پیسی دەزانن بەهەر شێوەیەك و لە هەر گیاندارێکەوە بێ، ئینسان و غەیری ئینسان.

## یازدە: خوێن (الدم)

ئەمیش زانایان تێیدا ڕاجیایی (إختلاف)یان هەیەو، هەندێکیان بۆ وێنە: (نووي) گوتوویەتی[38]: (والدلائلُ علیٰ نَجاسةِ الدَّمِ متظاهِرَةٌ ولا أَعلَمُ فيهِ خِلافًا عن أحد مِن المسلمين إلا ما حَكاهُ صاحِبُ الحاوي عَن بعضٍ مِن المتكلِّمين انه قال: هو طاهِرٌ، و لكِن المتكلِّمين لا يُعتَدُّ بِهم في الأجماع والخِلافِ على المذهب الصحيح..)

واتە: وە بەڵگە لەسەر پیسیی خوێن زۆر و زەوەندن و نەمزانیوە هیچ کەس لە مسوڵمانان لەوبارەوە ڕای جیاوازبێ جگە لەوە کە خاوەنی (الحاوي) لە هەندێك لە زانایانی (علم الكلام) ەوە گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: خوێن پاکە، بەڵام زانایانی کەلام لە بواری ئیجماع و خیلاف دا بەپێی بۆچوونی ڕاست گوێیان نادرێتێ.

---

[36] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥١٦.

[37] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥٠٩، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص٢٩.

[38] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص٥١٤.

هەشیانە پێی وایە کە خوێن پاکە بێجگە لە خوێنی بێنوێژی (دم الحیض)[39]، بەڵام وا پێدەچێ رای ئەوانە راست تر و بەهێزتر بێت کە هەموو جۆرەکانی خوێن بە پیس دەزانن، ئەوەندە هەیە لە کاتی ناچاری و تێگیراوی‌دا وەك کاتی جەنگ و بریندار بوون، چاوپۆشی لە خوێنی زۆر و لە کاتی ئاسایش دا چاوپۆشی لە خوێنێکی کەم کراوە، وەك لە دەقەکانی سوننەت دا گێڕراوەتەوە، بۆ وێنە: (عَن الحسن البصري رحمه الله قال: مازالَ المسلمون يُصَلُّون في جِراحاتِهِمْ) رواه البخاري.

واتە: بەردەوام مسوڵمانان بە برینەکانیەوە نوێژیان کردووە.

هەروەها دەربارەی (عمر بن الخطاب) خوا لێی رازیبێ گێڕراوەتەوە کە پاش بریندارکرانی لەلایەن (ابو لؤلؤة المجوسي) یەوە نوێژی کردووە و برینەکەشی خوێنی لەبەر رۆیشتووە.

## دوازدە: پاشەڕۆك و میزی ئەو گیاندارانەی‌کە گۆشتیان دەخورێ:

زانایان لەوبارەشەوە رایان جیاوازە و بەشێکیان کە (مالك و احمد و اوزاعي و نخعي و زهري و زُفَر) و هەندێك لە شافیعی‌یەکان، وەك (رافعي و ابو سعید الأصطخري و القاضي الروياني و ابن خزيمة و ابن المنذر و ابن حبان)[40] یان لەنێودان، دەڵێن هەر گیاندارێك گۆشت یان گۆشت و شیری بخورێ میز و پاشەڕۆکیشی پاکە، هەندێکیشیان وەك حەنەفی‌یەکان و هەندێك لە شافیعی‌یەکان میز و پاشەڕۆکی هەموو گیاندارێك بە پیس دەزانن، بەڵام رای یەکەم کە رای زۆربەیە لە راستی‌یەوە نزیکترە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە:

(عَنْ أنس بن مالك رضي الله عنه أن رَهْطاً من عُكَلْ أو قال عُرينَة قَدِمُوا فَاجْتَوَوا المدينة فَأَمَر لهم رسولُ الله ﷺ بِلقاحٍ وأَمرهم أَن يَخْرُجُوا فَيَشْرَبُوا من أَبْوالِها وأَلبانِها) متفق عليه.

واتە: کۆمەڵێك لە عوکەل یان گوتی عورەینە هاتن - بۆ مەدینە - بەڵام ئاو و هەوای مەدینەیان پێنەکەوت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە چەند حوشترێکی شیردەریان بۆ تەرخان بکرێ و فەرمانی کرد بچنە دەرێ و لە میز و شیری حوشترەکان بخۆنەوە.

---

[39] بروانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٣٩ ، ٤٠، وە بروانە: (الأدلة الرضية) ص ٢٤.

[40] بروانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٦٠.

(ابن المنذر) گوتوویەتی[٤١]: (هەرکەسێك پێی وابێ کە ئەوە تایبەتە بەو کۆمەڵەوە نەی‌پێکاوە چونکە بە بەڵگە نەبێ ئەوە ئیسپات نابێ، هەروەها دان پێداهێنانی زانایان کە قشپلی مەڕو بزن لە بازار بفرۆشرێ‌و بەکارهێنانی میزی حوشتر لە داو و دەرمان دا بەڵگەی پاکی‌ی پاشەڕۆك و میزی ئەو جۆرە گیاندارانەن)[٤٢].

شایانی باسیشە کە میزی سەرجەم گیانداران و ئینسانیش هەر ناوێکی هەیە کە بریتیە لە (بول)، بەڵام پاشەڕۆکیان ناوی جیاجیای هەیە، جارێ ناوی گشتی پاشەڕۆکی هەموویان (رجیع)ە، کە وشەی: (پاشەڕۆك) لە کوردی‌دا پڕ بەپێستیەتی، پاشان گیاندارانی یەك سم (حافِرْ) پاشەڕۆکەکەیان پێی دەگوترێ: تەرس (رَوْث)، واتە: کەر و ئیستر و ئەسپ و ماین.

وە پاشەڕۆکی حوشتر و مەڕو بزن پێی دەگوترێ قشپل - پشقل - (بَعْر).

وە پاشەڕۆکی ڕەشەوڵاخ (گا و مانگا و کەڵ و گامێش) پێی دەگوترێ: ڕیخ - شیاکە - (سِرْجِین) وە (زِبْل)، بە ئیشك بووەوەیش بە کوردی (تەپاڵە) ی پێ‌دەڵێن.

پاشەڕۆکی باڵندە و پەلەوەریش بە گشتی جیقنە (ذَرْق) ی پێ‌دەگوترێ.

## سێزدە: گیانداری پیسایی خۆر (الحیوان الجَلاّلة)

بۆیە بەوجۆرە گیاندارانە دەگوترێ (جلالة) کە پیسایی و جیقنە و تەرس و ڕیخ دەخۆن، چونکە (جِلّة) ناوە بۆ قشپل و تەرس و پاشەڕۆك بە گشتی.

ئەو گیاندارانەش کە جاری وا هەیە بە خواردنی پیسایی‌یەوە ڕادێن، دەگونجێ حوشتر یان مانگا یان مەڕو بزن یان مریشك و مراوی و قاز بن، جا ئەو جۆرە گیاندارانە هەم گۆشتیان و هەم شیریان و هەم سواربوونیشیان قەدەغەیە و لەوبارەوە چەندان دەق هەن، بۆ وێنە: (عَنْ إبن عباس رضي الله عنهما قال: نَهىٰ رسول الله ﷺ عن شُرْبِ لَبَنِ الجَلاّلَةِ) رواه الخمسة الا ابن ماجة و صححه الترمذي.

(عن عَمرِ بن شعيب عن أبيه عن جَدِّه رضي الله عنهم قال: نَهىٰ رسول الله ﷺ عَن لحوم الحُمُرِ الأَهْلِيَّة و عَنْ الجَلاّلة، عن رُكُوبِها و أَكْلِ لُحُومِها) رواه احمد والنسائي و ابوداود.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی کەری ماڵی قەدەغەکردوە، وە گیانداری (جەلالە) ی قەدەغەکردوە: سواربوونی و خواردنی گۆشتەکەی.

---

[٤١] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە.

[٤٢] (ابن تیمیە) گوتوویەتی: (پاشەڕۆك و میزی ئەو گیاندارانە کە گۆشتیان دەخورێ بە ڕای زۆربەی زانایان پاکن وە گەلێك بەڵگەی شەرعی لەوبارەوە هەن) بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ٢٤.

## چوارده: بەرماوی گیانداران (سؤر الحیوانات):

وشەی (سُؤر) کە کۆیەکەی (آسار)ەو بە کوردی (بەرماو) ی پێ دەڵێن، بە پاشماوەی ئەو خواردن و خواردنەوەیە دەگوترێ کە ئینسان یان گیاندار دەیخۆن و دەیخۆنەوە و لێیان دەمێنێتەوە.

جا زانایان دەربارەی (بەرماو) ی ئینسان چ مسوڵمان بێ چ کافر و چ نێر چ مێ زۆربەیان ڕایان وایە کە پاکە[43].

وە تێکڕایان[44] دەربارەی بەرماوی سەگ و زۆربەی[45] هەرەزۆریشیان دەربارەی هی بەراز (خنزیر) یەکدەنگن کە پیسە و دەبێ ئەو دەفر (إناء) ەی کە تێشیان دا خواردووە و خواردۆتەوە بشۆردرێ و پاك بکرێتەوە.

وە دەربارەی بەرماوی سەرجەم گیاندارانی دیکەش بە یەك سم و ئاژەڵ (أنعام) و درندە و پەلەوەرەوە،زۆربەیان[46] ڕایان وایە کە پاکە و بەکەڵکی خواردنەوە و پاك و خاوێنیش دێ مادام نەگۆڕابێ.

ئەمەش چەند دەقێك کە زانایان بۆ ئیسپاتی قسەو بیروڕایەکانیان بە بەڵگەیان هێناوەتەوە:-

جارێ بۆ ئیسپاتی ئەوە کە بەرماوی ئینسان ئەگەر کافر و هاوبەش بۆ خوا دانەر (مُشرِك)یش بێت، هەر پاکە ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە کە چەندان جار نوێنەر (وفد) ی کافران بە خاوەن کتێب و هاوبەش دانەرەوە هاتوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و خواردن و خواردنەوەشیان خواردوە و چاك و چۆنی و تێکەڵیشیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان دا بووە و هاتوونەتە مزگەوت و پێغەمبەریش ﷺ نەیفەرمووە ئەو شتانە بشۆنەوە کە ئەوان خواردن و خواردنەوەیان تێدا خواردوون، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: (وَ إِنْ أَحَدٌ مِنَ المُشرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كلامَ اللهِ ثم أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ..) التوبة -٦-

واتە: وە ئەگەر یەکێك لە هاوبەش دانەرەکان پەنای لێ خواستی پەنای بدە، بۆئەوەی گوێبیستی فەرمایشتی خوا بێت کە (قورئان)ە پاشان (ئەگەر مسوڵمان نەبوو) بیگەیەنەوە شوێنی ئاسایش و دڵنیایی خۆی.

---

[43] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص ٢٥، وە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٥.

[44] وەك پێشتریش باسمان کرد.

[45] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥٢٤، بەڵام مالك ڕای وایە تا زیندووبێ پاکە.

[46] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥٤٠، وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ ص ٣٠، ٣١.

جا بێگومان لەو هەموو پەنادان و حەواندنەوە و کەین و بەینەدا بابای (مشرك) پێویستی بە خزمەت و خواردنەوە و شتن و شوار دەکات و، نەش زانراوە مسوڵمانان هیچ پاریزێکیان لەوبارەوە لە (مشرك) ەکان کردبێ.

بۆ خاوەن کتێبەکان (اهل الکتاب) یش خوای پەروەردگار بە ڕاشکاوی فەرموویەتی: (وَ طَعامُ الَّذین أُوتوا الکتاب حِلٌّ لکُمْ و طعامكُمْ حِلٌّ لَهُمْ، والمُحْصَنَاتُ مِنَ المُؤمِناتِ والمُحْصَنَاتُ من الَّذين أُوتوا الکتابَ من قَبْلِکُمْ.) المائدة -٥-.

واتە: وە خواردنی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە بۆ ئێوە پاك و ڕەوایە و خواردنی ئێوەش بۆئەوان پاك و ڕەوایە، وە ئافرەتانی پاکیزەی بڕوادار و ئافرەتە پاکیزەکانی ئەوانە کە بەر لە ئێوە کتێبیان دراوەتێ - بۆتان ڕەوان-ئەوە ئایەتی: (انّما المشرکون نَجَسٌ) التوبة -٢٨- واتە: بێگومان هەر هاوبەش دانەرکان پیسن، وەك زانایان گوتوویانە مەبەست پێی پیسی مەعنەوی‌یە کە شیرك و کوفر و خراپەکانیانە نەك پیسی جەستەو ئەندامەکانیان.

بۆ بەرماوی سەگیش پێشتر فەرموودەمان لەسەر هێنایەوە و، بۆ هی بەرازیش لەبەر زێدە پیسی و پۆخەڵی و قیزەونی و زانایان گوتویانە[47] لە سەگ پیستر و خراپتریشە، وە (ابن المنذر) گوتوویەتی[48]: زانایان لەسەر پیسی بەراز یەکدەنگن، بەڵام وەك (نووي) گوتوویەتی[49]: مادام (مالك) بە زیندویی بە پیسی نەزانیبێ یەکدەنگی (اجماع) ی لەسەر دانەمەزراوە.

بەڵگەی پاکیی بەرماوی گیاندارانی دیکەش ئەم دەقانەن:

ا- (کبشة بنت کعب بن مالك) کە هاوسەری کوڕی (أبو قتادة) بووە، گێراویەتەوە کە ڕۆژێك (ابوقتادة) هاتۆتەوە و ئەویش ئاوی دەستنوێژی بۆ ڕۆکردوە و پشیلەیەکش هاتووە و لیێ خواردۆتەوە، ئەویش (واتە ابو قتادة) دەفرەکەی بۆ لارکردۆتەوە تا خواردوویەتەوە، (کبشة) دەڵێ: کە دیتمی تەماشادەکەم، گوتی: ئەی کچی برام پێت سەیرە؟! گوتم: بەڵێ: گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

---

[47] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ٥٢٤، وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ ص ٣١ وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٦.

[48] هەمان سەرچاوە.

[49] هەمان سەرچاوە.

(إنها لَيْسَتْ بِنَجس إنَّها من الطوَّافينَ عليكم والطوَّافات) رواه الخمسة و قال الترمذي: حديث حسن صحيح [50]، واته: ئەمە (واتە پشیلە) پیس نیە چونکە لەو گیاندارانەیە کە زۆر بە سەرتان دا دەگەڕێن و دەسووڕێن.

ب- (عَنْ أبي هريرة رضي الله عنه قال: سأل رسول الله ﷺ عن الحياض التي بين مكة والمدينة، فقيل ان الكلابَ والسّباعَ تَرِدُ عَلَيْهَا، فقالَ: لَهَا ما أَخَذَتْ في بُطُونِهَا ولَنَا ما بَقِيَ شَرابٌ وَ طَهورٌ) اخرجه الدارقطني.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو گۆماوانەی نێوان مەککە و مەدینە پرسیاری لێ‌کراو و گوترا: سەگ و دڕندەکان دەچنە سەریان لێیان دەخۆنەوە! فەرمووی: بۆ ئەوان (واتە: سەگ‌و دڕندەکان) ئەو مافە هەیە کە لە زگی خۆیان دا هەڵی گرن، ئەوەش کە بۆ ئێمە دەمێنیتەوە بۆ خواردنەوەیە و پاك و پاککەرەوەشە.

## پازدە: شەڕاب (الخمر):

زۆربە و جەماوەری [51] زانایان شەڕاب بە پیس دەزانن و ئەم ئایەتەش بە بەڵگە دەهێننەوە: (إِنَّمَا الخَمْرُ وَالمَيْسِرُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِن عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ) المائدة -٩- واتە: بێگومان شەڕاب و قومار و بتەکان و (زەلەم)* ەکان پیسن لە کردەوەی شەیتانن و خۆیان لێ دووربگرن...

بەشێك [52] لە زانایانیش ڕایان وایە کە شەڕاب هەرچەندە حەرامە بەڵام پیس نیە و دەڵێن ئایەتی ناوبراویش پیسیی شەڕاب ناگەیەنێ چونکە مەبەست لە پیسییان پیسی مەعنەوی‌یە بەبەڵگەی ئەوە کە شەڕاب لە ڕیزی (قومار و بت و تیر) دا هاتووە و بێگومان هیچ کام لەو سێ‌یانەش ئینسان بەدەست لێدانیان دەستی پیس نابێ، کەواتە شەڕابیش بە هەمان شێوە، هەڵبەتە مەرجیش نیە هەر شتێك حەرام بێت پیسیش بێت، بەڵکو زۆر شت پیس نیە و حەرامیشە، بۆ وێنە: پارەی دزراو، تووتن، تلیاك، ژەهر - هتد.

---

[50] بڕوانە (نیل الأوطار) ج١ ص ٤٣ ، ٤٤.

[51] کە (ابو حنیفة و مالك و شافعي و احمد) یان لەنێودان، بەڵام (نووي) و ( (غزالي) یش ڕایان بەلای پیس نەبوون دایە، بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٤٣ ، ٤٤، وە بڕوانە: (فقه السنه) ج١ ص ٣٢ ، ٣٣.

* (ازلام) کۆی (زلم) ە کە تیری بێ نووکە و بۆ (یانسیب) بەکاریان هێناوە.

[52] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٤٣ ، ٤٤، وە بڕوانە: ( الأدلة الرضية) ص ٢٣ ، ٢٤.

به بۆچوونی بەندەش ڕای دووەم ڕاست تر و بەڵگەدارترە، چونکە ئەسڵ لە هەموو شتێکدا پاکییە (الأصل في الأشياءِ الطَّهارة) و بەبێ بەڵگەیەکی ڕوون وبێ چەندوچوونیش بۆمان نیە شتێکی بە پاك دانراو بە پیس دابنێین.

## شازدە: تۆو (مَنيّ)

دەربارەی تۆو (مَنيّ) زانایان ڕایان جیاوازە و زۆربەیان[53] کە (سعيد بن المسيب و عطاء و اسحاق بن راهُوَيهْ و ابو ثور و داود و شافعي و ابن المنذر و احمد في اصح الروايتين) یان لەنێودان بە پاکی دەزانن و، (ثوري و اوزاعي ابو حنيفة و مالك) یش[54] بە پیسی دەزانن، واش پێدەچێ ڕای جەماوەر و زۆربە ڕاست تر بێت کە ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە بەڵگەکانیان: (عن عائشة رضي الله عنها قالت: لَقَدْ رأيتني أفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسولِ اللهِ ﷺ فَرْكاً فَيُصَلِّي فيه) رواه مسلم و اصحاب السنن:، واتە: جاری وابووە کە لە پۆشاکی پێغەمبەری خوا پرواندوومە بە پرواندن وە نوێژی پێوەکردووە. (واتە: مەنییەکەی لێ پرواندووە).

جا دەڵێین ئەگەر مەنی پیس بوایە نەدەبوو بهێڵرێ پێیەوە ئیشك بێتەوە و نەدەبوو بە پرواندنیش وازی لێبهێنرێ و دەبوو بشۆردرێ وەك پیسییەکانی دیکە، بەڵام وەك (نووي) گوتوویەتی[55] و الحافظ ابن حجر یش پشتگیری کردوە،[56] ئەگەر حوکم بە پاکیەتی (مەنی) یش بکرێ بێگومان شۆردنەوەی بەرگ و پۆشاك و خاوێن کردنەوەی لێی هەر شتێکی سوننەت و پەسندە، چونکە هەندێك لە فەرموودەکان باسی شۆردنەوەیان تێدایە بەتایبەت ئەگەر مەنییەکە تەڕ (رطب) بێ، کە ئەمە یەکێکیانە: (عن عائشة رضي الله عنها قالت: كُنْتُ أَغْسِلُ الجِنابَةَ مِنْ ثَوْبِ النَبِيِّ ﷺ..) متفق عليه و هذا لفظ البخاري، واتە: من شوێنەواری لەش پیسیم لەبەرگ و پۆشاکی پێغەمبەر ﷺ دەشۆریەوە.

ئاشکراشە کە لە هەر مەسەلەیەك دا بەڵگەکان لە بەهێزیدا لە یەك نزیك بوون وا باشە ئینسان ئیحتیاط بکات و لای خۆپارێزی لە گوناح بگرێ.

---

[53] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥١١، ٥١٢ ، وە بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص ٣ ، ٢٤.

[54] هەمان سەرچاوە.

[55] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥١١، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٦٧.

[56] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## حەڤدە: کێم و زووخاو (القيح و ماء القروح):

ئەمیش وەك (نـووي) گوتوویـەتی[٥٧]: بـەبێ ڕاجیـایی (إختـلاف) پیسـە، مەگـەر بەشێوەیەك بێ کە ئاوێکی ڕوون بێت و زەردکاوێکی سادەبێت، ئەوە ڕاستتر ئەوەیە کە پاك بێت.

هۆکاری بە پیس لەقەڵەم دانی کێم و زووخاویش وەك (نووي) گوتوویەتی[٥٨] و لە ڕووی زانستی پزیشکی (علم الطب) یشەوە سەلمێنراوە، ئەوەیە کە کێم و زوخاو لە ئەسڵ دا خوێن بووە و پاشان گۆڕاوە و بۆگەنیش بووە، جا ئەگەر ئەسڵەکەی پیس بێ دەبێ خۆی چاکتر بە پیس دابنرێ.

بەڵام ئەو شتانەی دیکە کە لە جەستەی[٥٩] ئینسان پەیدا دەبن، وەك: ئارەقە (العرق) و لیکاو (لعاب)وتف (بُصاق) و بەڵغەم و چڵم (مُخاط)- و فرمێسك.. ئەوە زانایان بە پاکیان داناون، هەروەها ئەگەر هی گیاندارانی دیکەش بن جگە لە سەگ و بەراز.[٦٠]

ئێستاش کـە جۆرەکـانی پیسـی (نجاسـە)مـان سـەرژمێرکردن بـا بـە کورتـی باسـی چۆنیەتی لابردنیشیان بکەین:

**یەکەم:** وەك پێشتریش گوتمان ئەسڵ لە پاك و خاوێنیداو لـە پاککردنـەوەدا ئاوە، کەواتە دەبێ هەموو شتێك کە پیس بوو بە ئاو پاك بکرێتەوە مەگەر ئاو نەبێ، ئەوکاتە دروستە ئەگەر بەشێوەیەکی کاتی(مؤقت)یش بێ جێدار (بدیل)ەکەی کە گڵ (تـراب) ە بەکاربـهێنرێ بەمـەرجێك شـەرع ڕێی دابـێ کـە لـەو حاڵـەت و شـتەدا بەکاربهێنرێ.

**دووەم:** بەڵام بێگومان خاوێن کردنەوەی شتە پیس بووەکان بەپێی جیاوازی شتەکان و جۆری پیسی‌یەکانیان جیاجیایە، بۆ وێنە:

---

[٥٧] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥١٥.

[٥٨] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

[٥٩] چ مسوڵمان بێ چ نا مسوڵمان. بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٥١٦.

[٦٠] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە، بێگومان تف و بەڵغەم و چڵم و لیکاو قیزەون و بێز لێکراون و خۆ لێ پاراستنیان پێویستە، بەڵام نوێژیان پێوەیە و لە ڕووی شەرعەوە پیس نین.

**أ-جەستەو پۆشاک:** هەرکاتێك جەستەی ئینسان و بەرگ و پۆشاکی پیس بوون پێویستە بە ئاوێ پاك بکرێنەوە و هێندە بشۆرێن هەتا هیچ شوێنەواریکی ئەو پیسی‌یە لە تام و بۆن و ڕەنگ بەو شوێنەوە نامێنێ.

بەڵام ئەگەر ئاو چنگ نەکەوت ئایا گڵ لە جیاتی وی بەکاردەهێنرێ؟! جارێ بۆ بەرگ و پۆشاك ئەوە زانایان یەك قسەن کە نابێ، بۆ جەستەش جەماوەریان دیسان ڕایان وایە کە نابێ، بەڵام هەندێکیان وەك (ثوري و اوزاعي و ابو ثور) گووتویانە: بە گڵ شوێنەکەی دەسرێتەوە و نوێژەکەی دەکات، بەڵام بێگومان ڕای جەماوەر بەهێزترە چونکە بێگومان گڵ (تراب) جیداری ئاوە و دەبێ بەس لەو شتانەدا و لەو شوێنانەش دا جێداری بکات کە شەرع مۆڵەتی داوە.[٦١]

پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنایەوە کە (بخاري و مسلم) لە (اسماء بنت ابي بکر)ەوە گێڕاویانەتەوە دەربارەی چۆنیەتی پاککردنەوی بەرگ لە خوێنی حەیز.

بەڵام دامێنی کراسی ئافرەت لەم حوکمی گشتی‌یە هەڵاویرداوە وەك لەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێ:

(عَن أم ولَدٍ لأبراهيم بن عبدالرحمن بن عوفٍ أنَّها سالت أُمَّ سَلَمَة زوج النبي ﷺ فقالت: إني امرَأةٌ أُطيلُ ذَيْلي و أَمْشي في المكانِ القَذِر؟ فقالت أُمُّ سَلَمة: قال النبي ﷺ يُطَهِّرُهُ ما بَعْدَهُ) رواه مالك و اصحاب السنن الا النسائي و صححه الالباني.[٦٢]

واتە: ئافرەتێك لە (أم سَلَمە) ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ پرسی گوتی: من ئافرەتێکم دامێنی کراس درێژدەکەم و بەشوێنی پیسیش دا دەڕۆم؟ (ام سلمة) خوا لێی ڕازی‌بێ - گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەو - زەوی‌یە- ەی دوایە پاکی دەکاتەوە.

هەروەها میزی منداڵی شیرەخۆرەی نێرینە کە بەر جەستە یان بەرگ بکەوێ، وەك هی کچ شۆردنی ناوێ‌و بەس ئاو لێ پرژاندنی دەوێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يُغْسَلُ مِنْ بَولِ الجارِيةِ وَ يُرَشُّ مِنْ بَولِ الغُلامِ) رواه ابوداود والنسائي.

واتە: میزی کچۆڵە - ئەگەر بەر جەستە یان بەرگ کەوت - دەشۆرێتەوە، بەڵام بۆ میزی کوڕۆکە ئاوی لێ‌دەپرژێنرێ.

پێشتریش باسمان کرد کە بۆ ئاشقاو (مَذْي) یش شوێنێك لە جەستە کە بەری‌کەوتوە دەشۆرێ، بەڵام بۆ بەرگ و پۆشاك ئاو لێ‌پرژاندن بەسە.

---

[٦١] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٢٤٠.

[٦٢] بڕوانە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) عبدالعظيم بن بدوي، ص ٢٢.

ب- ژێرەوەی پێڵاوو نەعل: ئەمیش وەك پێشتریش باسمان کرد بەهۆی سرینەوە بە زەوی پاك دەبێتەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا وطِــئَ أَحَدُكُمْ بنعلِهِ الأذىٰ فانَّ التُرابَ لَهُ طَهورٌ) رواه ابوداود: ئەگەر یەکێکتان بە نەعلەکەی پێی لە پیسایی‌نا، ئەوە گڵ پاککەرەوەیەتی.

ج- زەوی و خاك: ئەمیش ئەگەر ئەو پیسی‌یەی کەوتۆتە سەری چوو بووە نێوی - بۆ وێنە میز - ئەوە بە ئاو پێداکرنەپاك دەبێتەوە، وەك پێشتر باسمان کردو ئەو فەرموودەیەمان لەسەر هێنایەوە کە (بخاري و اصحاب السنن) دەربارەی (أعرابي) ،یەکە گێراویانەتەوە، بەڵام ئەگەر جورمی هەبوو - بۆ وێنە پیسایی - ئەوە دەبێ لابرێ پاشان شوێنەکەی بشۆرێ.

هەروەها ئەگەر پیسی‌یەکە جورمی نەبوو بە ئیشك بوونەوەش هەر پاك دەبێتەوە، چونکە (عائشة) - خوا لێی ڕازی‌بێ گوتوویەتی: (زَكَــاةُ الأَرْضِ يُبْسُــها) رواه ابن ابي شيبة[٦٣]، واتە: ئیشك بوونەوەی زەوی پاكبوونەوەیەتی.

د- پێستی مردارەوەبوو: پێشتر باسمان کرد کە بەخۆش کردن و دەباغ کران پاك دەبێتەوە، کە ئەوە ڕای زۆربەی هەرە زۆری[٦٤] زانایانە و هەندێکیشیان - بۆ وێنە (مالك) لە ڕای باو (مشهور) ی‌دا پێیان وایە پێستی مردار (میتة) بە خۆش کردن (دباغ) پاك نابێتەوە، بەڵام ڕای زۆربە ڕاست ترە و فەرموودەی زۆر پشتگیری دەکەن، بۆ وێنە:

( عن ابن عباس ان النبي ﷺ مَرَّ بشاةٍ مَيِّتَةٍ فقال: هَلاَّ اسْتَمْتَعْتُمْ بِإِهابِها! قالوا: يا رسول الله إنَّها مَيِّتَةٌ! قال: إنَّما حُرِّمَ مِنَ المَيْتَةِ أَكْلُها ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەر ﷺ بەلای مەڕێکی مرداردا تێپەڕی فەرمووی: دەبووایە کەڵك لە پێستەکەی وەربگرن! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە مردارە: فەرمووی: مردار تەنیا خواردنی حەرامە.

ئینجا لەو بارەوە کە ئایا چ جۆرە گیانلەرێك پێستی لە دەباغ دێ و چ جۆرێك پێستی لە دەباغ نایەت، زانایان ڕایان جیاوازە.

---

[٦٣] بروانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٤.

[٦٤] بروانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ٥٣ ، ٥٤.

(داود الظاهري و ابو يوسف) ڕایان وایە پێستی هەموو شتێك تەنانەت بەراز (خنزیر) یش بە دەباغ پاك دەبێتەوە. بەلاَم (أبو حنیفة) ڕای وایە کە بەس پێستی بەراز دەباغ پاك نابێتەوە.[٦٥]

(شافعي) و (احمد) یش لە قسەیەکیدا ڕایان وایە کە جگە لە (سەگ و بەراز) پێستی هەموو گیاندارێك لە دەباغ دێ و پاك دەبێتەوە.[٦٦]

زۆر لە فەرمووده ناسان و (احمد) یش لە قسەیەکی دیکەدا ڕایان وایە کە هەر گیاندارێك بەسەربڕین (ذكاة) گۆشتەکەی بۆ خواردن حەلاَڵ نەبێ پێستیشی بە دەباغ پاك نابێتەوە،[٦٧] واش پێدەچێ ئەم ڕایەی دوایی لە هەموویان ڕاست تر بێت چونکە لە چەند فەرموودەیەك دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەکارهێنانی پێستی دڕندەکان (سباع)ی قەدەغە کردووە، بۆ وێنە: (عَنْ أُسامة بن عُمَيْر الهُذَلي أن النبي ﷺ نهىٰ عَنْ جُلودِ السِّباعِ) رواه احمد و ابوداود والنسائي.

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ دەربارەی پاکیەتی:

ئێسك و سم و پێچك و قۆچ و نینۆك و ددان و موو و خوری و تووك و پەڕی مردارەوەبووە زانایان لەبارەی ئەوانەی سەرێ کە بە عارەبی بە ڕیز ناوەکانیان ئاوان: (عَظْم) و (حافِرْ) و (ظِلف) و (قَرْن) و (ظُفْر) و (سِنّ) و (شَعْر) و (صُوف) و (وَبَرْ) و (ريش)، سەبارەت بە پاکی و پیسی‌یان ئەگەر هی مردارەوەبوو (میتة) بن ڕایان جیاوازە:

هەرچی (شافعي)یە لە ڕای باو (مشهور) ی داو (احمد) لە ڕیوایەتێکیدا پێیان وایە هەموویان پیسن.

(مالك و احمد) یش لە ڕای باویان دا پێیان وایە ئێسك و هاووێنەکانی پیسن و (موو) و هاووێنەکانیشی پاکن.

(ابو حنیفة) و هەرکام لە (مالك واحمد) یش یەکی لە قسەیەکیان دا هەموو ئەو شتانە بە پاك دەزانن، هەروەها (داود الظاهري) یش هەمان ڕای هەیە*

---

[٦٥] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ، ص ٥٥ ، ٥٦ وە : (المجموع) ج١ ص ٢٧١ ، ٢٧٢.
[٦٦] هەمان سەرچاوە.
[٦٧] هەمان سەرچاوە.
* بڕوانە: (مجموعه الفتاوى) ج٢ ص ٥٧، وە بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٢٩٥ ، ٢٩٦.

واش پێ‌دەچی کە هەر ڕای سێیەم ڕاست و دروست بێ وەك (ابن تيمية) گوتوویەتی**، چونکە وەك زۆرجاری دیکە گوتراوە: ئەسڵ لە هەموو شتێك دا پاکی‌یە مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر پیسی‌ی.

بەڵگەی ڕاستی ڕای هەڵبژێردراویش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ) المائدة - ٣ - واتە: مردارتان لێ‌قەدەغەکراوە، جا بێگومان مردار (ميتة) پێچەوانەی زیندوو (حي) ە‌و، زیندوێتی و ژیان (حياة) یش دوو جۆرە: گیانداری (حيواني) و ڕووەکی (نباتي)، وە تایبەتمەندی گیاندار پێنج هەستەکان و جم و جوڵی ئازادانە (الحس والحركة الأرادية) یە، بەڵام تایبەتمەندی ڕووەك گەشەکردن (النمو)ە، جا ئاشکراشە کە مەبەست لە (حرمت عليكم الميتة) ئەو شتانەیە کە ژیانی گیانداری (حەیوانی) یان نامینێ، نەك ڕووەکی، بە بەڵگەی ئەوە کە درەخت و ڕووەك (الشجر والزرع) پاش بڕان و ئیشك بوونیان بە پیس دانانرێن و بە مردوو ناونابرێن، هەروەها خوای کاربەجێ کە فەرموویەتی: (والله أنزل من السماءِ ماءً فَأَحْيا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها) النحل - ٦٥ - واتە: وە خوا لە ئاسمانێوە ئاوی ناردۆتە خوارێ و زەوی پاش مردنی پێ زیندوو کردۆتەوە، ئاشکراشە کە بە مردوو ناوبردنی زەوی و خاك نابێتە مایەی بە پیس دانرانی.

*جا ئێستا با سەرنج بدەین:* بێگومان (موو[٦٨]،تووك[٦٩]، خوری[٧٠] پەڕوپۆ*) ژیان و زیندوویتی‌یەك کە هەیانە لە شێوە و ڕەگەزی ژیانی ڕووەکە نەك گیاندار، واتە ژیانێکی گیاندارانەی نیە تاکو بە نەمانی بە مردوو دابنرێ و سەرەنجام حوکمی مردار وەربگرێ لە پیسی‌یەتی‌دا، هەروەها ئەگەر هاتبا و (موو و تووك و پەڕوپۆ) بە بەشێکی ئەو گیاندارانە دانرابان کە لێیان دەڕوێن؛

ئەوە بێگومان دروست نەدەبوو بە زیندوویتی لێیان ببڕێن، چونکە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە دەربارەی کەسانێك کە بە زیندوویی (سَنام)[٧١] حوشترو

---

** بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢٢ ص ٥٧.

[٦٨] موو (شَعْر) وەك هی بزن و ڕەشەوڵاخ.

[٦٩] تووك (وَبَر) هی حوشترە.

[٧٠] خوری هی مەڕە.

[٧١] وەك دونگی (دوگ) مەڕ وایە بۆ وشتر بەڵام لەسەر لوتکەی پشتی‌یەتی.

دونگی مەڕ دەبرن؟ فەرموویەتی: (ما أُبِيْنَ من البَهِيْمَةِ و هي حَيَّةٌ فَهُوَ مَيِّتٌ) رواه ابو داود و ابن ماجة والترمذي و قال: هذا حديث حسن غريب.

واتە: هەر پارچەیەك بە زیندوویی لە ئاژەڵ بكرێتەوە بە مردار دادەنرێ.

جا مادام سەرجەم زانایان لەسەر مردارێتی پارچە گۆشتی بە زیندووێتی لە ئاژەڵ پچڕێنراو و پاكی و حەڵاڵی ی (خوری و موو و تووك و پەڕوپۆ) ی بە زیندووێتی لە ئاژەڵ بڕرا وولە پەڕەوە دەركێشراو، یەكدەنگن، كەواتە ئەو شتانە وەك گۆشت نین و بەهۆی مرداربوونی ئەو گیاندارانەوە بە مردار و پیس دانانرێن.

دەربارەی ئێسقان و پێچك[٧٢] و سم و قۆچ و نینۆك و ددانیش ئەگەر بگوترێ: لەبەرئەوەی هەست و ئازاریان هەیە بە بەشێك لە جەستەی گیانداری مردار دادەنرێن!

لە وەڵام دا دەگوترێ: زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە كە ئەو زیندەوەرانەی خوێنیان نیە، كەلە زاراوی شەرع دا بە وشەی (ما لا نَفْسَ لَهُ سائِلَةٌ) تەعبیریان لێدراوەتەوە، وەك: مێش (ذُباب) و قالۆنچە و سیسركە و دووپشك و زەردەواڵە و هەنگ و پەپوولە و.. هتد بە پیس دانانرێن و ئەگەر بكەونە نێو ئاو یان شلەمەنی (سوائل)یشەوە پیس نابن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا وَقَعَ الذُّبابُ في إناءِ أحدِكُمْ فَلْيَغمسْهُ ثم لِيَنزِعْهُ، فإن في أحدِ جَناحَيْهِ داءً و في الآخَرِ شفاءً) رواه البخاري.
واتە: ئەگەر مێش كەوتە دەفری یەكێكتانەوە با نقوومی بكات و پاشان فڕێی بدات (وە خواردنەكەی واز لێنەهێنێ) چونكە لە باڵێكی[*] دەرد هەیە و لەوەی دیكەیان دا چارەسەر[٧٣]!

كەواتە: هۆی پیسی ی مردارەوەبوو ئەوەیە كە ئەو خوێنەی تێیایە ماوەتەوە و حەپس بووە، جا ئەو زیندەوەرانەی كە خوێنیان تێدا نیە، مادام بە مردنیان هیچ خوێنیان تێدا قەتیس نامێنێ بە پیس دانانرێن، دەجا بێگومان ئێسقان و ئەو شتانەش كە وەك وین هیچ خوێنیان تێدانیە و، مادام وابێ هیچ پاسا و (مُبَرِّر)ی پیس بوونیان تێدانیە.

---

[٧٢] پێچك (ظِلْف) بۆ مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ لە جێی (سم) ی كەرو ئێستر و ئەسپە، بۆیەش لە كوردەواری‌دا بەو جۆرە گیاندارانە دەگوترێ (دوو سم) و بەوانی دیكەش (یەك سم).

[٧٣] زانیاری پزیشكی گەری (علم الطب) یش ئەو ڕاستی‌یەی سەلماندوە.

* پەڕوپۆ (ریش) هی پەلەوەری وەك مریشكو قازو قەلو مراوی‌یە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: مادام پێغەمبەری خوا ﷺ وەك پێشتر فەرموودەکەمان هێنا، دەربارەی مردار فەرموویەتی: (إنَّما حُرِّمَ من الميتة اكلُها) متفق عليه، کەواتە: جگە لە خواردنی گۆشت و بەزو چەوری مردار هەموو جۆرە کەڵك لێوەرگرتنێکی دیکەی ڕەوایە، جا هەرچی پێستەکەیەتی پاش دەباغ، شتەکانی دیکەش بەشێوەیەکی ئاسایی، وە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ئەم ڕایە هی زۆربەی زانایانە، هەرچەندە ڕاست و هەڵە بە زۆری و کەمی لایەنگران و شوێن کەوتووانیان ناپێورێن، بەڵام وەك لەئەنجامی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانمان دا دەردەکەوێ، مەگەر چۆن دەنا کەمتر وایە ڕایەك زۆربەی زانایان لەسەری یەکدەنگن بن بێ هێز و بارلار (مَرْجوح) بێت، کۆتایی ئەم ڕوونکردنەوەیەش کە بە پێویست و گرنگم زانی ئەندازەیەکی لەسەر بڕۆم چونکە زۆرکەس پێویستی بە زانیاری و شارەزایی هەیە دەربارەی حوکمی پاکیی و پیسی ئەو شتانە کە باس کران، بەڵێ کۆتایی ئەم ڕوونکردنەوەیە بە قسەیەکی یەکێك لە گەورە پێشەوایانی شوێن کەوتووان (التابعين) دێنم کە (الزهري) یەو گوتوویەتی[٧٤]:

(كان خيارُ هذه الأمة يَمْتَشِطونَ بأمْشاطٍ من عِظامِ الفيلِ) واتە: چاکان و صالحانی ئەم ئوممەتە بە جۆرە شانەیەك سەرو ڕیشیان دادەهێناو شانە دەکرد کە لە ئێسقانی فیل دروست کرابوو[٧٥]!

## هـ- ئاوێنە و شووشە و چەکو چەقۆ و ئێسك و نینۆك و ..هتد:

ئەمانیش سەرجەم بە سڕانەوە (مسح) پاك دەبنەوە، واتە ئەگەر بە شتێکی پاك بسڕێنەوە خاوێن دەبنەوە، چونکە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە چەك و چۆڵ و شمشێرکانیانەوە نوێژیان کردووە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وإذا كنت فيهم فأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاةَ فَلْتَقُمْ طائِفَةٌ منهُمْ مَعَكَ ولْيأخُذوا أسْلِحَتَهُمْ..) النساء -١٠٢-

واتە: وە ئەگەر – ئەی موحەممەد!– تۆ لە نێویان بووی و نوێژ– ی ترس– ت بۆ بەرپاکردن با کۆمەڵێك لەوان – بۆ ڕکاتی یەکەم – لەگەڵت ڕابوەستن، وە با چەکەکانیان بەدەستەوە بگرن..

ئاشکراشە کە شمشێرەکانیان زۆرجار بە خوێن بوون و هەر بە سڕینەوەشیان قەناعەتیان کردوە.

---

[٧٤] بڕوانە: (مجموعه الفتاوى) ج٢٢ ص ٥٩.

[٧٥] بۆ نووسینی ئەو (ڕوونکردنەوە) یە سوودم لە (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ٥٧ تا ٥٩، وەرگرتووە.

## و- ڕۆن و خواردەمەنی‌یە توندو شلەکان:

(الحافظ ابن حجر) گوتوویەتی[٧٦]: (ابن عبدالبَرّ) هێناویەتی کە زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر خواردەمەنی‌یەکە توندو خەست پیسی‌یەکی چووە نێو، دەبێ پیسی‌یەکە و دەوروبەرەکەیشی لەگەڵ فڕێبدرێو، ئەوەی دیکە بە پاك دادەنرێ، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە: (عَنْ إبن عباس عَنْ ميمونة رضي الله عَنهم أن النبي ﷺ سُئِلَ عن فَأْرةٍ سَقَطَتْ في سِمْنٍ، فقال: أَلْقُوها و ما حَوْلَها فـاَطْرَحوهُ و كُلُـوا سِمْنَكُمْ) رواه البخاري، واتە: دەربارەی مشکێك کە کەوتۆتە ڕۆنیکەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا؟ فەرمووی: مشکەکە و ئەوەی دەوروبەریشی فڕێبدەن و ڕۆنەکەتان بخۆن.

بەڵام ئەگەر شلەمەنی بوو ئەوە زۆربەی زانایان دەڵێن تازە پیس بووە و بە کەڵك نەماوە هەندێکیشیان دەڵێن خواردەمەنی‌یە شلەکان (مائعات) یش هەر حوکمی ئاویان هەیە و مادام هیچ کام لە تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕابێ هەر بە پاك دادەنرێ، ئەمەش ڕای (زُهْري و أُوزاعي و بخاري)یە[٧٧]، بەڵام هەرچەندە خاوەنی (فقه السنة) گوتوویەتی[٧٨]: (وهو الصحيح) هەر ئەوە ڕاستە! من پێم وایە لە ڕاستی‌یەوە دوورە و پیسی و میکرۆبی وا هەیە بەبێ گۆڕینی تام و بۆن و ڕەنگی ڕواڵەتی، خواردن وا لێدەکات هەرکەس بیخوات لینگان نەگرێ و نان و دۆی بابی خۆی نەخواتەوە.

<u>سێیەم</u>: شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە بۆ پاککردنەوەی شتی پیس چ بە ئاو چ بە گڵ و بەرد و.. هتد دەبێ پاککردنەوەکە بە جۆرێك بێ کە بەتەواوی ئەو پیسی‌یە و شوێنەوارەکانی لاببات، هەر بۆیەش دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پاککردنەوەی جێگای زارولیکی سەگ (حەوت کەڕەت شۆردن کە یەکەمیان بە گڵ بێ) ی داناوە[٧٩]، چونکە وادیارە بەو ئەندازە و شێوە شۆردنە نەبێ ئەو پیسی‌یە لاناچێ!

دیسان شتێکی ڕوون و بێچەندو چوونە کە بەکارهێنانی هەر ماددەیەکی دیکەی وەك تایت و صابون‌و سیم و لفکە و.. هتد بە مەبەستی چاکتر و زیاتر پاککردنەوە،

---

[٧٦] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٥.

[٧٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٥.

[٧٨] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەرە.

[٧٩] پێشتر ئەو فەرموودەیەمان هێناو (مسلم) گێڕاویەتەوە.

شتێکی پەسند و ڕەوایە، چونکە ئامانج لە شۆردن پاککردنەوەیە و بە چ شێوەیەك ئەو ئامانج (هدف) ە باشتر دابین بکرێ چاکتر و پەسندترە.

**چوارەم:** ئینجا ئەگەر ئینسان توانای خۆی بەکارهێنا لە پاککردنەوەی شتێك دا بەڵام شوێنەواری پیسی‌یەکەی هەر پێوەماو لانەچوو ئەوە لەو حاڵەتەدا قەیدێ ناکات چونکە (لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً الاّ وُسْعَها) البقره - ٢٨٦-، وە ئەم فەرموودەیەش لەوبارەوە هەیە:

* (عَنْ أبي هريرةِ رضي الله عنه أنَّ خولة بنت يسارٍ قالت: يا رسول الله لَيْسَ لي إلا ثَوْبٌ واحِدٌ، وَ أنا أَحيضُ فيهِ؟ قال: فأذا طَهُرْتِ فَاغْسِلي مَوْضِعَ الدَّمِ ثم صَلّيّ فيهِ، قالت: يا رسول الله إِنْ لَمْ يَخْرُجْ أَثَرُهُ؟! قال: يكفيكِ الماءُ ولا يَضُرّكِ أَثَرُهُ) رواه ابوداود والبيهقي و صححه الألباني

واتە: (خولە کچی یسار)خوالێی‌ڕازی‌بێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەس کراسێکم هەیە و تێشیدا دەکەومە حەیزەوە؟ فەرمووی: ئەگەر پاکبوویەوە ئەو شوێنە بشۆ کە خوێنی بەرکەوتوە پاشان نوێژی پێوە بکە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی ئەگەر شوێنی هەرما؟ فەرمووی: ئەوەندەت بەسە کە بە ئاوێ بیشۆی وە مانەوەی شوێنەواری زیانت لێ‌نادات.

لێرەش کۆتایی بەم باسە دێنین و لە باسێکی سەربەخۆش دا باسی تارەت گرتن و خۆ پاککردنەوە لە میز و پیسایی دەکەین، بۆیە لێرە لێی گەڕاین.



[80] بڕوانە: (الوجيز) ص٢١.

# لەش پیسی گەورەو گچکە
# (الحدث الاكبر والحدث الأصغر)

لەش پیسی (الحدث الأكبر، الجنابة) بریتیە لەو حاڵەتەی کە بەسەر مرۆڤ دا دێت و شۆردن (غُسلْ)ی هەموو جەستەی لەسەر پێویست دەبێ بۆ پاکبوونەوەی، لەش پیسی گچکە (الحدث الأصغر) یش بریتیە لە حاڵەتی بێدەستنوێژی کە بە دەستنوێژگرتن لادەچێ.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەش پیسی گچکە (الحدث الأصغر) بەس بریتیە لە نەبوونی دەست نوێژو بە دەستنوێژگرتنیش لادەچێ، لێرەدا زیاتر لەسەری نادوێین هەتا لە برگەی شەشەم دا بەتایبەت باسی دەکەین، بەڵام لەش پیسیی گەورە (جنابة) پێویستی بە توێژینەوەیە و لە چەند خاڵێکی کورت دا دەیخەینەڕوو:

**یەک: هۆیەکانی لەش پیسی ( أسباب الجنابة ):**

١- دەرچوونی تۆو (مَنِّي) بە ئارەزووەوە (خروج المني بشهوة) بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە:

***(عَن علي رضي الله عنه قال: سألْتُ النبيَّ ﷺ عَن المَذِيِّ؟ فقال، من المذي الوضُوءُ وَ من المَنِيِّ الغُسلُ)** رواه ابن ماجة والترمذي و قال: حديث حسن صحيح.

واتە: دەربارەی ئاشقاو پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد؟ فەرمووی: ئاشقاو دەستنوێژی دەوێ و تۆو (مني) هاتنەوەش خۆشۆردن.

٢- پێکەوە جووت بوونی پیاو و ئافرەت (الجماع) با تۆویشیان نەیەتەوە، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە:

***(عَن أبي هريرةِ رضي الله عنه عَن النبي ﷺ قال: إذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِها الأَربَعِ ثمَ جَهَدَها فَقَد وَجَبَ الغُسْلُ)** و في رواية المسلم **( و إن لَم يُنْزِلْ)** متفق عليه.

واتە: هەرکاتێك (مێرد) لە بەینی چوارپەلەکانی (ژن) دانیشت پاشان بەخۆیەوە گوشی ئەوە خۆشۆردن (بۆ هەردووکیان) فەرزە، وە لە ڕیوایەتێکی (مسلم) دا هاتوە: ئەگەر تۆویشی نەهاتبێتەوە.

٣- لە خەون دا ئاوهاتنەوە (الأحتلام) ویڕای هەبوونی نیشانە (قرینة)، بەبەڵگەی ئەم دەقە:

*(عن أم سلمة رضي الله عنها قالت: جاءَتْ أمُّ سُلَيْم امـرأةُ أبـي طلحـة الى رسـول الله ﷺ فقالت: يا رسول الله لا يَستحْي من الحق، هل على المرأة من غُسْـلٍ إذا هـي ٱحتلَمت؟! فقـال رسول الله ﷺ: نَعَمْ إذا رَأَتِ الماءَ) متفق عليه.

واته: ( ام سُلَيْم ) هاوسـەری (ابي طلحة) هاتـەلای پێغەمبـەری خـوا ﷺ وه گوتـی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خوا له هەقیدا شەرمێ ناکات. جا ئایا ئافرەت ئەگـەر ئیحتیلامی بوو خۆشۆردنی لەسەره؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بینی.

٤- کۆتایی پێ هاتنی بێنوێژی (انقطاع الحيض)، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە:
( وَ يَسأَلونَك عَنْ المحَيْضِ قُلْ هُوَ أذىً فَٱعتزِلوا النساءَ في المحيضِ وَلا تَقْرَبوهُـنَّ حتىَّ يَطْـهُرْنَ فـإذا تَطَهَّرْن فأتوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أمركم الله..) البقرة -٢٢٢-

واتـه: وه دەربارەی کەوتنـه حـەیزەوه پرسـیارت لـێدەکەن، بڵـێ ئـەوه ئـازار – و نەخۆشیـ – ە جا لـەکاتی بێنوێژیدا لـه (چوونـه لای) ئافرەتـان دوورەپـەرێزبن، وه هەتا پاك نەبنەوه توخنیان مەکەون، جا کاتێك کەخۆیان شۆرد لەو شوێنەوه کـه خـوا فەرمانی پێکردوون بچنه لایان.

٥- کۆتـایی پێهـاتنی زەیسـتانی (انقطـاع النفـاس)، بەڵگـەی ئەمـەش یـەکدەنگی (اجماع) ی زانایانه، وەك هەرکام له (ابن المنذر)[81] و (ابن جرير الطبري[82]) و (نووي)[83] نەقڵیان کردوه.

٦- مسـوڵمان بوون، زانایان دەربارەی پێویسـت بـوون یـان نـەبوونی خۆشـۆردن بەهۆی هاتنه نێو ئیسلام و مسوڵمان بوونەوه ڕایان جیاوازه، بەشێکیان کە (مالك و أحمد و أبو ثور) یان لەنێودان و (إبن المنذر) و (خَطّابي)، و (شوکاني) یش هـەڵیان بژاردوه بەپێویستی دەزانن و، بەشێکیشـیان کـە (أبـو حنيفـة و شـافعي) و بـەپێی قسەی (نَووي) زۆربەی زانایانیان لەنێودان دەڵێن: تەنیا سوننەتەو فـەرز نیـە[84]، دیاره ئەوانەش کە خۆشۆردنی بابای کافر لەکاتی مسوڵمان بوونـیدا بـە پێویسـت دەزانن بەڵگەیان زۆرن بۆ وێنە:

---

[81] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ١٦٧، وه بڕوانه: (الأدلة الرضية) ص ٣٧.
[82] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[83] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[84] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ١٧٢.

• بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی (ثمامة بن اثال) کە لە کۆتاییەکەیدا ئەمە هاتوە: (فقالَ رسول الله ﷺ أَطْلِقوا ثُمامة، فَانْطَلَقَ الىٰ نَخْلٍ قريبٍ، من المسجدِ فَاغتسَل ثم دَخَلَ المَسْجِدَ فقال: أَشْهَدُ أَنْ لاَ اله الا الله و أن محمداً رسول الله) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ثمامة) ئازاد بکەن، ئەوجار یەکسەر چوو بۆ نێو باغێکی خورما کە لە مزگەوتەوە نزیك بوو، خۆی شۆرد، پاشان هاتەوە مزگەوت و گوتی: شایەدی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، وە کە موحەمەد پێغەمبەری خوایە.

• (عَنْ قَيسِ بن عاصم أنه أَسْلَمَ فَأَمَرهُ النبيُّ ﷺ أَنْ يَغتَسِلَ بماءٍ وسِدْرٍ) رواه النسائي و ابوداود والترمذي و صححه الألباني[85].

٧-مردن، مردنیش یەکی دیکەیە لەو هۆکارانەی کە شۆردنی ئینسان پێویست دەکەن، دیارە شۆردنی مردوش لەسەر مسوڵمانان فەرزە و زانایانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن.[86] هەرچەندە فەرموودەش لەوبارەوە زۆرن بۆ وێنە:

• (عن أم عطية الأنصارية رضي الله عنها قالت: دَخَلَ علينا رسول الله ﷺ حين تُوفِّيَتْ ابْنَتَهُ، فقال: إغْسِلْنَها ثَلاثاً أو خَمْساً أو أكثر من ذلك..) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان وەژوورکەوت کاتێك کە کچەکەی مردبوو، فەرمووی: سێ کەرەتان بیشۆن یان پێنجان یان زیاتریش..



---

[85] بڕوانە: (الوجيز ص ٤٤).

[86] بڕوانە: (فقه السنة) ج ١ ص٧٣، و بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص ٢٠٦.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی: بێنوێژی (حیض) و زەیستانی (نفاس) و خوێنەچرکە (استحاضة)

١- بێنوێژی (حیض): وشەی (حیض) لە ئەسڵی زمان دا بە مانای ڕژان (سَیَلان) دێ و لە شەرع و عورفیش دا بەو خوێنە دەگوترێ کە لە داوێنی ئافرەت دێتەدەرێ لە حاڵەتی ساغیدا بەبێ هۆی منداڵ بوون و پەردەی کچێنی لاچوون[87].

وە زۆربەی زۆری زانایان ڕایان وایە کە بەر لە تەمەنی نۆ (٩) ساڵی ئافرەت نایبینێ، وە دەگونجێ هەتا کۆتایی تەمەن درێژە بکێشێ[88].

وە ڕەنگی خوێنی بێنوێژی دەگونجێ سوورێکی تۆخی مەیلەو ڕەش، یان سووری ئاسایی، یان مەیلەو زەرد، یان لێڵ و بۆر بێت[89].

بەڵگەی ڕەنگ سووری ئەوەیە کە ڕەنگی ئەسڵی خوێنەو، بەڵگە ڕەنگ ڕەش بوونیشی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: (إذا كان دَمُ الحَيْضَةِ فإنَّه أَسْوَدُ يُعْرَفُ) رواه ابوداود والنسائي وابن حبان والدارقطني و رواه الحاكم و قال: على شرط مسلم.

بەڵگەی ڕەنگی زەرد و لێڵ و بۆریش ئەم دەقەیە: (عَنْ أم عطية رضي الله عنها قالت: كُنّا لا نَعُدُّ الصُّفْرَةَ والكُدْرَةَ بَعْدَ الطُهْرِ شَيْئاً) رواه ابوداود، و رواه البخاري. بدون كلمة (بعد الطهر).

واتە: ئێمە پاش پاکبوونەوەمان - لە خوێنی بێنوێژی - زەردیی و لێڵاییمان بە هیچ نەدەزانی. واتە: (لەکاتی بێنوێژیدا بە نیشانەی حەیزیان زانیوە، بەڵام پاش پاکبوونەوە و بەسەرچوونی حەیز حیسابی خوێنی حەیزیان بۆ نەکردوە)[90].

وە دەربارەی ماوەی کەوتنە بێنوێژی و ماوەی پاکبوونەوە و پاکیی نێوان دوو حەیزەوە زانایان قسەیان زۆر کردوون، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکی متمانە پێکراو لەوبارەوە نیە[91]، کەواتە بۆ پەیبردن بە کاتی بێنوێژی و پاکبوونەوە، چارە

---

[87] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٥٠ ، ٣٥١، وە (الفقه السنة) ج١ ص ٩١.

[88] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٧٤.

[89] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٩١، وە بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٩٢.

[90] ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە، وەك (ابو حنيفة، مالك، سفيان، أوزاعي، شافعي، أحمد، اسحاق) بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٩٢.

[91] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص٤٢، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ٣٥٣.

هەر ئەوەیە کە ئەوەی عادەتی خۆی بزانێ عادەتی خۆی دەکاتە بنەماو پێوەر، ئەگەرنا دەبێ هەوڵ بدات بە نیشانەکانی خوێنی حەیز بناسێتەوە و لە غەیری خۆی – واتە غەیری حەیز – جیای بکاتەوە[92].

ب–زەیستانی (نِفـاسْ): بەو خوێنە دەگوترێ کە لە دامێنی ئافرەت دێتە دەرێ بەهۆی منداڵ بوونەوەو، لای کەمی ماوەی هاتنەکەی تاو (لحظة) یێکە و لای زۆری‌یەکەیشی چل (٤٠) ڕۆژە، چونکە (ام سلمة) خوا لێی ڕازی‌بێ گوتوویەتی: (كانت النُّفَساءُ تَجْلِسُ علىٰ عَهْدِ رسولِ اللهِ ﷺ أَرْبَعِيْنَ يَوماً) رواه الخمسة إلا النسائي.

واتە: ئافرەتی زەیستان لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ چل ڕۆژ دادەنیشت (و نوێژی نەدەکرد و ڕۆژووی نەدەگرت).

بەڵام ئەگەر لە چل ڕۆژ زیاتر خوێنی دی ئەوە بە ڕای زۆربەی[93] هەرەزۆری زانایان بە خوێنی منداڵ بوون و زەیستانی دانانرێ و نابێ لە چل ڕۆژ زیاتر واز لە نوێژ بهێنێ، وە (ترمذي) گوتوویەتی[94]:( وقد أَجْمَعَ أَصْحابُ النبي ﷺ والتابعون ومن بعدهم على أَنَّ النُّفَساءَ تَدَعُ الصلاة أربعين يَوْماً، إلاّ أَنْ تَرىٰ الطُّهْرَ قَبْلَ ذلك فانَّها تَغْتَسِلُ وتُصَلِّي...) واتە: وەسەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتوانیان لەدوایانەوە یەکدەنگن کەژنی زەیستان چل ڕۆژ واز لەنوێژ دێنێ، مەگەر بەر لەوە پاکی ببینێ، ئەوە دەبێ خۆی بشوات و نوێژ بکات.

دیارە لەکاتی خوێن دیتنی زەیستانیشدا وەك حاڵەتی حەیز ئافرەت نوێژی لەسەر نی‌یەو بۆی نی‌یە بیکات، هەروەها نابێت ڕۆژووش بگرێ، بەڵام دەبێ دوایی ڕۆژووکانی بگێڕێتەوە، وە وەك (شوكاني) گوتوویەتی[95]: زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە زەیستانی لە هەموو شتێك دا کە حەرام دەکرێ یان بە ڕەوا دادەنرێ، وەك حەیز

---

[92] هەمان سەرچاوە.

[93] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٣٥٧ تا ٣٥٩، وە بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص١٠٨.

[94] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٣٥٨، وە (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٣، بەڵام (ابن حزم) دەڵێ: (و لا حَدَّ لِأَقَلِّ النفاسِ و اما أَكثره فَسَبْعَةُ ايام لا مَزِيْدَ) واتە: لای کەمی زەیستانی سنووری نیە، بەڵام لای زۆری‌یەکەی تەنیا حەوت ڕۆژە! بڕوانە: (المحلّى) ج٢ ص ١٢٨، مسالە: ٢٦٨، بەڵام بێگومان ڕایەکەی هەڵە و سەیر و پێچەوانەی واقیعیشە!

[95] بڕوانە نيل الأوطار ج١ص٣٥٩.

وایە، ([redacted]). بەڵگەی ئەوەش کە ڕابرد ئەم دەقەیە:

(عن عاصم عن معاذة قالت سالت عائشة: ما بالُ الحائِضِ تَقْضي الصَّومَ ولا تَقْضـي الصَّلاةَ؟ قالت عائشة: كان يُصْيبُنا ذٰلِك فَنُؤمَرُ بِقَضاءِ الصَّوْمِ ولا نُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّلاةِ) رواه مسلم و رواه البخاري بلفظ قريب منه.

واتە: پرسیارم لە (عائشة) کرد: بۆچی حەیزدار ڕۆژوو دەگێڕێتەوە بەڵام نوێـژ ناگێڕێتـەوە؟ عائیشە گوتـی: ئیمە کـاتی خـۆی ئـەو حاڵەتـەمان تـووش دەبـوو، جا فـەرمانمان پـێدەکرا کـە ڕۆژوو بگێڕینـەوە بـەڵام فـەرمانمان پێنـەدەکرا کـە نوێـژ بگێڕینەوە.

## ج- خوێنە چرکە (الأستِحاضة)[96]: ئەمیش بریتیە لە خوێن هاتن لە داوێنی

ئافرەت بەبەردەوامی لە غەیری کات و حاڵەتی ئاسایی خۆیدا.

ئافرەتێکیش کە تووشی ئەو نەخۆشی‌یە دەبێ وەك هی پاك (طاهرة) دادەنرێ، دەبێ لە کاتی هەر نوێژێك دا پاش خۆپاککردنەوە لە خوێن و خۆبەستن، دەستنوێژ بگرێ و نوێژەکەی بکات، هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە کە پێویستە بۆ هەر فەرزێك خۆی بشوات، بەڵام ڕایەکەیان بێهێزە و وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی[97]: هیچ کام لە چوار پێشەوا سەرمەزەبەکان (ابو حنیفة و مالك و شافعي و أحمد) خۆشۆردنی ئافرەتی (مستحاضة) بۆ هەر نوێژێك بە فەرز نازانن و، ئەو فەرموودەیەش کە لەو بارەوە هاتووە:

- (عَنْ عائشة أَنَّ أم حَبِيبَةَ رضي الله عنها اُسْتُحِيضَتْ سَبْعَ سِنيْنَ فَسأَلَتْ رسولَ الله ﷺ عَنْ ذٰلِكَ فَأَمَرَها أَنْ تَغْتَسِلَ لِكُلِّ صلاةٍ) رواه مسلم.

واتە: (أم حبيبة) خوا لێی ڕازیبێ حەوت ساڵان لە حاڵەتی (استحاضة) دابوو جا لەو بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: ئەویش فەرمانی پێکرد کە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات.

---

[96] خۆم ئەو تەرجەمەیەم بۆ وشەی (استحاضة) دانا، چونکە (استحاضة) ش وەك (سَلِسُ البول) میزەچرکە وایە و بەردەوام دێ هەرچەندە لە هەموو چرکە (ثانية) یەکیش دا هەرنایەت بەڵام زۆر ناو زیادەڕۆیی (مبالغة) یان تێدایە و چاوپۆشی کراوە.

[97] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ٣٥٥ تا ٣٥٩.

بەڵێ ئەم فەرموودەیە زۆربە و جەماوەری زانایان گوتوویانە یان مەبەست لە خۆشۆردن خۆ پاککردنەوە و خۆشۆردنەوەیە لە خوێن و دەستنوێژگرتنە، یان خۆشۆردنەکە سوننەتە، واتە:فەرمان (امر) ەکە بۆ (ندب)ە نەك (وجوب) بەڵگەی ئەوەش کە دەربارەی ئافرەتی خوێنە چرکە دار (مستحاضة) گوتمان. ئەم فەرموودەیەیە:

*(عن عائشة رضي الله عَنها أنها قالت: فاطِمةُ بنتِ أبي حُبَيْشٍ لرسول الله ﷺ: يا رسول الله إني لاَأَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلاةَ؟ فقال رسول الله ﷺ: إنما ذلكِ عِرْقٌ وَ لَيْسَ بالحَيضةِ، فاذا أقبلَتِ الحَيْضَةُ فاَتركي الصَّلاة، فأذا ذَهَبَ قَدْرُها فاَغْسِلي عنكِ الدَّمَ وَ صَلِّي) رواه البخاري.

واته: (فاطمه بنت ابي حُبَيْش) به پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا من – لە خوێن – پاك نابمەوە، جا ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە حەیز نیە و دەمارێکە، جا کاتێك کەوتیە حەیزەوە واز لە نوێژ بهێنە، وە کە زانیت ئەندازەی کەوتنە حەیزەکەت ڕابردوە، ئەوجار خوێنەکە لە خۆت بشۆوە – و دەستنوێژ بگرە– و نوێژبکە.

وەك پێشتریش گوتمان چاکترین پێوەر – کە ڕەنگە جێدار (بدیل) یشی نەبێ – بۆ لەیەك جیاکردنەوەی خوێنی حەیز و غەیری حەیز – کە بەزۆری هەر خوێنە چرکەیە – ئەوەیە کە:

أ–ئەگەر ئافرەتەکە عادەتی کەوتنە حەیزی خۆی دەزانی، ئەو ئەندازە ڕۆژانەی جاران تێیاندا کەوتۆتە حەیزەوە بە حەیزیان حیساب دەکات و، ئەوەی مایەوە بە خوێنە چرکە (استحاضة) ی دادەنێ.

ب–ئەگەر عادەتێکی زانراویش نەبوو وەك ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ئەو نەخۆشی خوێنەچرکەی گرتبێ، ئەوە دەبێ بەهۆی نیشانە و سیفاتەکانی خوێنی حەیزەوە ئەو دوو حاڵەتەی لەیەك جیابکاتەوە[٩٨].

---

[٩٨] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص٤٢ کە لەسەر (متن) ی (الدرر البهيّة) ی (شوكاني) یەو لە (متن) دا گوتوویەتی: (فَذاتُ العادةِ المتقرِّرةِ تَعمل عليها. و غيرُها تَرجِعُ الى القَرائن).

## دوو: بە لەش پیس ( جنابة ) چ شتێک لە ئینسان قەدەغەدەکرێ؟!

ئەو شتانەی کە بەهۆی لەش پیسی ی گەورە (جنابة) وە لە ئینسانی مسوڵمان حەرام دەبن ئەمانەن:

١-نوێژ بە فەرز و سووننەتی یەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَقْبَلُ الله صَلاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ و لا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ) رواه مسلم و احمد و اصحاب السنن.

واتە: خوا نە نوێژی بێ لەش پاکی و نە خێر لە ماڵی غەنیمەت دزراو وەرناگرێ.

٢-تەوافی ماڵی خوا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الطَّوافُ صَلاةٌ إلاّ أنّ الله تَعالىٰ أحَلَّ فيه الكلامَ فَمَنْ تَكَلَّمَ فلا يَتَكَلَّمْ إلاّ بِخَيْرٍ) رواه الترمذي والدارقطني. و صححه الحاكم و ابن خزيمة عن ابن عباس.

واتە: تەواف نوێژە ئەوەندە هەیە خوای بەرز قسەکردنی تێدا حەڵاڵ کردوە، جا هەر کەسێك قسەی کرد با شتی چاکە نەبێ نە بێژێ.

٣-دەست لە قورئان دان، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يَمَسُّ القرآنَ إلاّ طاهِرٌ) رواه النسائي والدارقطني والبيهقي عن ابوبكر بن محمد بن عمرو بن حزم عن ابيه عن جده

واتە: ئینسانی پاك نەبێ نابێ دەست لە قورئانێ بدات. وە ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە کە (ابو حنيفة و مالك و شافعي و احمد) یشیان لەنێودان[99]، کە نەك بە لەش پیسی گەورەوە بگرە بەبێ دەست نوێژیش دروست نیە دەست لە قورئان بدرێ، بەڵام هەندێك لە زانایان بۆ بابای لەش پاکی بێدەستنوێژ بە دروستی دەزانن، کە (ابن عباس و شعبي و ضحاك و زيد بن علي و داود الظاهري و ابن حزم و حماد بن ابي سليمان) یان لەنێودان، بەڵکو (داود و ابن حزم) بۆ بابای لەش پیس (مُجنبْ) یش دەست لە قورئان دانیان بە دروست (جائز) داناوە[100]! کە بێگومان ڕایەکەیان بێهێزەو، ئەو فەرموودەیەی سەرێ کە (ابن عبدالبَرّ) گوتوویەتی: (إنهُ أشْبَهُ بالتواترِ لِتَلَقّي الناسِ لَهُ بِالقَبُولِ) بەڵگەیە لەسەریان[101].

٤-قورئان خوێندن، ئەمیش ڕای زۆربەی[102] زۆری زانایان لە بابای لەش پیس حەرامە و دەقیش لەوبارەوە زۆر بەبەڵگە هێنراونەوە کە ڕەنگە بەهێزترینیان ئەوەبێت:

---

[99] بروانە: (مجموعة الفتاوى) ابن تيمية، ج٢٢ ص ١٥٢.

[100] بروانە: (فقه السنة) ج١ ص ٦٣.

[101] هەمان سەرچاوە.

[102] بروانە: (المجموع) ج٢ ص١٧٩.

*(عن علي رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ كان لا يَحجبُهُ عن القرآنِ شَـيءٌ لَيْسَ الجنابَـةُ) رواه أصحاب السنن و صححه الترمذي و غيره.

واته: هیچ شتێك بێجگه له لەش پیسی پێغەمبەری خوای ﷺ له قورئان خوێندنیَ نەدەگێڕایەوە و پێشگیری لیَ نەدەکرد.

شایانی باسیشه که هەندێك له زانایان که (بخاري و طبراني و داود و ابن حزم) یان لەنێودا هەن، قورئان خوێندنیان بۆ بابای لەش پیس به دروست (جائز) داناوه[103].

٥-مانەوه له مزگەوتیَدا (المكث في المسجد)، ئەمیش زۆربەی زانایان بۆ بابای لەش پیسی به حەرام دەزانن[104]، بگره هەندێکیان پێیدا ڕەت بوونیش هەر به حەرام دەزانن[105]، کەمێکیشیان وەك (داود الظاهري) و (ابن المنذر و المزني) بـه موتڵـەقی هەم مانەوه و هەم تێپەڕبوونیش به دروست دەزانن، (نووي)یش که گوتوویـەتی: (و أَحْسَنُ ما يُوَجَّهُ به هذا المَذْهَبُ: أَنَّ الأَصلَ عَدَمُ التحريم، وَ لَيسَ لِمَنْ حَرَّمَ دليلٌ صَحيحٌ صَرِيحٌ)[106]

واته: (چاکترین بەڵگه که ئەم ڕایەی پیَ پشتگیری بکریَ ئەوەیه: که ئەسڵ حەرام نەبوون – ی مانـەوه و تێپـەڕبوون – ه و ئەوانـەش کـه حـەرامیان کـردوه بەڵگەیـەکی ڕاست و ڕاشکاویان بەدەستەوه نیه). بەڵیَ (نووي) یش لەم قسەیەوه دەردەکەویَ که ڕای دووەمی لا پەسەند و بەهێز بێت.

واش پیَدەچیَ ڕای ڕاست و ڕێك ئەوەبیَ که بگوتریَ: پەسەند و سوننەت وایه که بەبیَ لەش پاکی – هەم گەوره و هەم گچکەش – ئینسان له مزگەوت دا نەمێنێتەوه و پێشـیدا تێپەڕنـەبیَ، بـەڵام فـەرز نیـەو، دروسـته، بەتایبـەت لـه کـاتی ناچـاری و تەنگیراویَدا که هەم پێیدا تێپەڕیَ و هەم تێشیدا بمێنێتەوه.

٦ و ٧- ئافرەتی حەیزدار و زەیستان جگه لەو شتانەی که ڕابردن ڕۆژووگرتن و جووت بوون (جماع)یشیان لیَقەدەغەکراوه، که بەڵگەی هەردووکیشیان له ڕابوردوودا خراوەتەڕوو.

---

[103] بروانه: (فقه السنة) جذ ص٧٥، وه بروانه: (المجموع) ج٢ ص١٧٩.

[104] بروانه: (المجموع) ج٢ ص ١٨١.

[105] هەمان سەرچاوه.

[106] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص ١٨٢.

بەڵام لێرەدا دوو مەسەلە هەن بە پێویستی دەزانم تۆزێك تیشكیان بخەینە سەر:

**یەكەم**: زانایان پاش ئەوەی لەسەر ئەوە رێك كەوتوون كە جووت بوون لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار و زەیستان دا حەرامە و یەكێكە لە گوناهە زلەكان و تەنانەت هەندێكیان رایان وایە (كَفَّارة)یشی دەكەوێتە سەر وێڕای گوناهبارێیەكی زۆر[107]، لەوبارەوە كە ئایا مێرد چی بۆ ڕەوایە لەكاتی حەیز و زەیستانی هاوسەرەكەی! رایان جیاوازە، بەشێكیان كە (ابو حنیفة و شافیعي و مالك)یان لەنێودان، وێڕای: (سعید بن المسیب و طاوس و شریح و عطاء و قتادە و سلیمان بن یسار)[108] رایان وایە كە لەززەت وەرگرتن (استمتاع) بەنێوان نێوك و ئەژنۆیشی هەر حەرامە.

زۆربەشیان كە وێڕای: (عِكرمة و مُجاهِد و شَعْبي و نخعي و الحاكم) هەركام لە (ثوري و أوزاعي و محمد بن الحسن و أحمد و أصبغ المالكي و ابوثور و اسحاق و ابوداود و ابن المنذر)، وە هەندێك لە شافیعیيەكانیان لەنێودان[109]، رایان وایە جگە لە جووت بوون[110] (جماع) دروستە لەززەتی لێوەربگرێ، كە لە زاراوەیشەرعزانان دا پێی دەڵێن، (المُباشَرَة) واتە: پێست (بشرة) بە پێست كەوتن بە هەر شێوەیەك بێ[111]، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە: (إِصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّكَاحَ) رواه مسلم.

واتە: جگە لە جیماع هەموو شتێك بكەن.

**دووەم**: پاش پاكبوونەوەی ئافرەت لە خوێنی بێنوێژی (حیض) بە رای زۆربەی هەرەزۆری زانایان كە (سالم بن عبدالله و سلیمان بن یسار و زُهْري و ربیعة و مالك و ثوري و لَیْث و احمد و شافعي و اسحاق و ابوثور و ابن المنذر) یان لەنێودا هەن، هەتا خۆی نەشوات یان تەیەمموم نەكات ئەگەر ئاوی بۆ نەگونجا، دروست نیە مێردەكەی لەگەڵی جووت بێت، بەڵام (داود الظاهري) گوتوویەتی: هەركە تارەتی

---

[107] (نووي) گوتویەتی: (أَجْمَعَ المُسْلمون علی تحریم وَطْء الحائِضِ للآیة الكریمة وللأحادیث الصحیحة) بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٢، بەڵام رای (كفارة) كەوتنە سەر بێهێزە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٣.

[108] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٧.

[109] هەمان سەرچاوە.

[110] ئاشكرایە كە دواوە (دُبُرْ) ی ئافرەت بە هەموو شێوەیەك حەرامە و گوناهی گەورەیە.

[111] (نووي) یش رای زۆربەی پەسند كردووە و گوتوویەتی: (وهو أَقْوَى مِنْ حَيْثُ الدَّلِيل)، بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٦، واتە: لەڕووی بەڵگەوە ئەو رایە بەهێزترە.

گرت و داوێنی خۆی لە خوێن و خوڕ پاککردەوە لەگەڵدا جووت بوونی ڕەوایە، (ابو حنیفة) ش ڕای وایە کە ئەگەر ماوەی بێنوێژییەکەی دە ڕۆژ بوو - کە بەلای ئەوەوە لای زۆری کەوتنە حەیزەوەیە، ئەوە یەکسەر پاش خاوێن بوونەوەی لە خوێن جیماع کردنی و لەگەڵ کرانی ڕەوایە[112].

بەئاشکراش دیارە کە ڕای زۆربە بەهێزترە، چونکە ئەم ئایەتە زۆر ڕوون و بێ چەند و چوونە لەو مەسەلەیەدا: (و يَسْأَلُونَكَ عَنِ المَحِيْضِ؟ قُلْ هُوَ أَذىً فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي المَحِيْضِ ولا تَقْرَبُوهُنَّ حتىٰ يَطْهُرْن، فإذا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ من حيثُ أمركم الله ان الله يُحِبُّ التوّابين و يحب المتطهّرين) البقرة - ٢٢٢-، کە پێشتر ماناکمان کرد.

چونکە وەك زانایان گوتوویانە[113]: خوای کاربەجێ پاش فەرمان کردنی بە دوورە پەرێزی لە جیماعی ژنی بێ نوێژ (حائض)، دوو شتی کردوون بە مەرج بۆ کۆتایی هێنان بەو دوورەپەرێزی‌یە: (ولاّ تقربوهُنَّ حتّى) وە لێیان نزیك مەکەونەوە هەتا:

أ-(يَطْهُرْن) پاك دەبنەوە، وە بە (يَطَّهَّرْنَ)ش خوێندراوەتەوە و لە حەوت جۆرە خوێندنەوەکانیشە، کە بێگومان بە خوێندنەوە (قراءة) ی دووەم ڕاشکاو (صریح) ە لە خۆشۆردن دا.

ب-(فإذا تَطَهَّرْنَ) کە خۆیان پاککردەوە، کە بێگومان ئەمەیان مەبەست پێی خۆشۆردنیانە.

کەواتە: دەرکەوت کە ڕای زۆربەی نزیك بە یەکدەنگی زانایان بەهێزترە و ژنی حەیزدار پاش کۆتایی هاتنی حەیزەکەی هەتا خۆی نەشۆرێت دروست نیە مێردی بچێتە لای.

بەڵام بۆ ڕۆژووگرتن ئەوە زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە بە کۆتایی پێهاتنی خوێنی حەیزەکەی، نەك هەر بۆی هەیە بەڵکو لەسەریشی فەرزە نیەتی ڕۆژووی بەیانی بهێنێ با لە شەوێدا فریای خۆشۆردنیش نەکەوێ[114].

---

[112] بروانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٩ ، ٣٧٠.

[113] بروانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٧٠.

[114] چونکە ڕۆژووگرتن لەسەر حەیزدار حەرامە و ئەو ئافرەتەش بە کۆتایی پێهاتنی خوێنەکەی حەیزدار نەماوە، بروانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٧١، وە بروانە (متن) ی (المهذب) ج٢ ص ٣٦٧.

## سێ: حوکمی لابردنی لەش پیسی ( حكم رفع الجنابة ):

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئەسڵ لە ئینسانی مسوڵمان دا لەش پاکبوونە و لەش پیسی تەنیا حاڵەتێکی زووتێپەڕ (طارئ) ەو پێویستە لە نزیکترین دەرفەت دا لابچێ چونکە وەك پێشتر باسمان کرد زۆربەی خواپەرستییە مەزنەکان پەکیان لەسەر لەش پاکی (طهارة) و خاوێنی (نظافة) کەوتووە.

بەڵێ لابردنی لەش پیسی فەڕزە و خوای کاربەجێ و پێغەمبەری پێشەوا لە چەندان دەق دا فەرمانیان پێکردوە، بۆ وێنە: خوای زانا فەرموویەتی:

*(و إِنْ كنتم جُنُباً فَاطَّهَّروا) المائدة -٦- واتە: وە ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆتان بشۆن.

*(يا أُيهاالذين آمنوا لا تَقْرَبوا الصَّلاةَ وأَنْتُمْ سُكارىٰ حَتَّىٰ تعلموا ما تقولون و لا جُنُباً إِلاّ عابِري سَبيلٍ حَتّىٰ تَغْتَسِلوا..) النساء - ٤٣-.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە کاتێك دا کە سەرخۆشن توخنی نوێژ مەکەون هەتا دەزانن چی دەڵێن، هەروەها بە لەش پیسی نوێژمەکەن هەتا خۆتان نەشۆن مەگەر ڕێبوار بن – ئەوکاتە مادام ئاو نەبێ تەیەممموم دروستە- .

یان وەك هەندێك لە توێژەرەوان (مفسرين) گوتوویانە: (ولا جُنُباً الا عابري سبيل حَتّى تَغْتَسِلوا) یانی: وە ئەگەر لەشتان پیس بوو مەگەر بە ڕێڕەوی ئەگەرنا مەچنە مزگەوت – کە شوێنی نوێژە – هەتا خۆتان نەشۆن.

*(.. وان كنتم مَرْضىٰ أو على سَفَرٍ أَوْ جاءَ أَحَدٌ مِنكم من الغـائِطِ او لا مَسْتُمُ النِّساءَ فَلَمْ تَجِدوا ماءً فَتَيمَّمُوا صَعْيداً طَيِّباً فَامْسَحوا بِوُجوهِكُمْ وأَيدْيكُمْ مِنْهُ..) المائدة -٦-

کە لە باسی تەیەمموم‌دا مانای دەکەین‌و کورتەکەی ئەوەیە کە تەیەمموم کردن بەخاك یان ڕووی زەوی جێدار (بدیل) ی خۆشۆردن و دەستنوێژە بۆ کەسێك ئاوی چنگ نەکەوێ یان هەبێ بەڵام بۆی نەلوێ بەکاری بهێنێ؛ بەڵام ئایا لابردنی لەش پیسی پێویستیەکی دەستبەجێ (واجب فوري) یە یان بە کاوەخۆ (على التراخي)یە؟!

ئەوەندەی سەرنجی کتێبەکانی سوننەت و شەرعم دا شتێکم چنگ نەکەوت کە بەڵگەبێ لەسەر دەستەبەجێ (فوري) بوونی بە پێچەوانەوەش بەڵگەی زۆر و زەوەند هەن لەسەر ئیسپاتی بەکاوەخۆ بوونی، بەڵام بێگومان هەرکاتێك ئەنجام دانی فەڕزێك

پەکی لەسەر ئەو پاکی‌یە کەوتبێ‌و، ئەگەر دەست و بردیش لە لابردنی لەش پیسی‌یەکە نەکات فەرزەکەی بچێ، ئەوە لەسەری پێویستە دەستبەجێ خۆی پاك بکاتەوە و، بە سستی کردنی گوناهبارە، زانایانیش وەك بنچینەیەکی شەرعی گوتوویانە: هەر شتێك ئەنجام دانی فەرزێك پەکی لەسەری کەوتبێ ئەویش دەبێتە فەرز (ما لاَیتِمُّ الواجِبُ اِلاّ بِهِ فَهُوَ واجِبٌ).

## چوار: لەش پیسی بە چی لادەچێ؟!

لە باسەکانی ڕابردوودا ڕوون بۆوە کە هۆکاری ئەسڵی لابردنی لەش پیسی (جنابة) ئاوەو، ئەگەر ئەو نەبوو یان نەگونجا بەکاربهێنرێ جێدار (بدیل) ەکەی خاك یان ڕووی زەوی‌یە کە دەم و چاو و هەردووك دەستی پێ مەسح بکرێن.

جا لەبەرئەوەی لە برگەکانی (٥ ، ٦ ، ٧) دا باسی هەرکام لە خۆشۆردن و دەستنوێژ و تەیەممووم دەکەین لێرە بەم ئەندازەیە لەم باسە دەگەڕێین.

# تارەت گرتن (الاستنجاء) و خاوێن ڕاگرتنی جەستەو پۆشاك و جێگاو شوێن

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێكردوە پاك و خاوێنی مەرجی بنەڕەتی ئەنجام دانی زۆر لە خوا پەرستییەكانە بەتایبەتی نوێژ، جا ئەوە لەم برگەیەدا خوا یاربێ بە كورتی و لە چەند خاڵێك دا هەم باسی تارەت گرتن - واتە خۆ پاك كردنەوە لە میز و پیسایی - و هەم باسی خاوێن ڕاگرتنی جەستە دەكەین بەهۆی جێبەجێكردنی خەسڵەتە سروشتییەكان (خصال الفطرة) ەوە.

## یەكەم: تارەت گرتن:

### ١- تارەت گرتن چییە؟!

مەبەست لە تارەت گرتن یان[115] دەست بەئاوگەیاندن، خۆپاككردنەوەیە لە شوێنەوار و پاشماوەی میز و پیسایی دوای خۆ خاڵیكردنەوە (التخلي)، جا لە كتێبەكانی سوننەت و شەرع (فقه) دا چەند وشە و زاراوەیەك بەكارهاتوون بۆ تەعبیر لەو مەسەلەیە كە ئەمانەن:

(إلأَسْتنجْاء، الأَسْتجْمار، الأسْتِطابَة، الأسْتِنْقاءْ، الأسْتِنْزاه، الأسْتِبْراءْ)

**كە ماناكانیان لە یەك نزیكن:**

**الأَسْتنجاء:** یانی لابردنی پیسی و پیسایی چونكە (نَجْو)[116] ناوە بۆ پیسایی.

**الأستجمار:** یانی پەیداكردنی بەردووچكە بۆ خۆپاككردنەوە، چونكە (جَمْرَة) بەردی گچكەیە.

**الأستطابة:** واتە: خۆ پاك كردنەوە. چونكە (طَيِّب) پاك و چاكە.

**الأسْتِنزاه:** واتە: وەدەست هێنانی (نزاهة) كە بریتییە لە دووربوون لە پیسی.

**الأسْتبراءْ:** واتە: وەدەست هێنانی دووری و بەریبوون لە میز و پیسایی.

**الأستنقاء:** یانی خۆ خاوێن كردنەوە چونكە (نَقاءْ) خاوێنییە و (نَقِيّ) (خاوێن)ە.

---

[115] لە زمانی كوردی دا - زار (لهجة) ی سۆرانی - بە زۆری ئەو دوو وشەیە بەكاردێن.

[116] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص ٩٠٥، وشەی (نَجْو).

## ٢-حوكمی تارەت گرتن:

خۆپاككردنەوە لە شوێنەواری میز و پیسایی بە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان فەرزە، بەڵام (ابو حنیفة) و (مالك) یش لە قسەیەكیدا بە سوونەتیان داناوە، ئەوەندە هەیە ئەوانیش گوتوویانە: ئەگەر لە قەبارەی درەمێك زیاتر بێت فەرزە بشۆرێ و بە غەیری ئاویش پاك نابێتەوە[117].

بەڵام بێگومان ڕای جەماوەر و زۆربەی هەرەزۆری زانایان ڕاستە و ئەوەی دیكە بە تەئكید هەڵەیە چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندان فەرموودەدا فەرمانی كردوە بە خۆپاككردنەوە و تارەت گرتن و ئەگەر گریمان پێغەمبەریش ﷺ نەیفەرمووبایە، هەر پێویست بوو چونكە بە حوكمی عەقڵ و فیترەت شتێكی ئاشكرا و بەڵگەنەویستە.

ئەمەش چەند نموونەیەك لەو فەرموودانە:

*(عن سلمان رضي الله عنه قال: نهانا رسـول الله ﷺ ان يَسْتَنْجِي أَحَدُنـا بِـأَقَلَّ مِـنْ ثَلاثَةِ أَحْجارٍ) رواه مسلم، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغەكردووین كە یەكێكمان بە كەمتر لە سێ بەردووچكە (لە كاتی نەبوونی ئاودا) خۆی پاك بكاتەوە.

*(عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: إذا ذَهَبَ أَحَدُكُـمْ الیٰ الغـائِطِ فَلْيَذهَـبْ مَعَـهُ بِثَلاثَةِ أَحْجارٍ يَسْتَطِيبُ بِهِنَّ فانَّـها تُجْزِئُ عَنْـهُ) رواه احمد و اصحاب السنن الا الترمذي والدارقطني و صححه هو والنووي[118].

واتە: ئەگەر یەكێكتان چووە سەر پێشاو با سێ بەردووچكە لەگەڵ خۆی ببات خۆییان پێ پاك بكاتەوە، بۆی بەردەكەون (واتە لەجیاتی ئاو بە پاككەرەوە بۆی حیساب دەكرێن).

*(عن عائشة رضي الله عنها أنها قـالت لنسوةٍ: مُـرْنَ أَزْواجَكُـنَّ أَنْ يَسْتَنْجُوا بالمـاءِ فـانّي أَسْتَحْيِيهِمْ وَأَنَّ النبيَّ ﷺ كان يَفْعَلُهُ) رواه احمد و اصحاب السنن الا ابوداود و صححه الترمذي و ابن حبان والنووي[119].

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی‌بێ بە چەند ژنێكی گوت: بە مێردەكانتان بڵێن با بە ئاو تارەت بگرن، چونكە پێغەمبەر ﷺ وای دەكرد بەڵام من شەرمێ دەكەم پێیان بڵێم.

---

117 بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ١١٤، ١١٥.

118 سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص ١١٥.

119 هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ١٢١.

## ٣-تارەت گرتن و خۆپاککردنەوە بە چی دەبێ؟!

ئاشکرایە و چەندان جاریش گوتوومانە کە (ئاو) ئەسڵە لە پاك و خاوێنیدا، بۆیە بۆ تارەت گرتنیش (ئاو) بە پلەی یەکەم دێت، بەڵام ئەگەر ئاو چنگ نەکەوت ئەوە بە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان بەرد (حَجَر) و هەر شتێکی دیکەی وەك ویش کە بگونجێ خۆی پێ خاوێن بکرێتەوە، دروستە[120].

وە ئەگەر بگونجێ بە هەردووکیشیان خۆی پاك بکاتەوە چاکترە، سەرەتا بە بەرد یان هەرشتێکی دیکەی پیسی لابەری ڕێز نەگیراو (غَيْرَ مُحتَرَمْ) پیسی‌یەکە لابەرێ پاشان بە ئاوەکەش بەتەواوی خۆی پاك بکاتەوە[121].

بەڵام زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە مەرجی خۆ پاککردنەوە بە غەیری ئاو ئەوەیە کە لە شوێنی تایبەتی میز و پیسایی پێداهاتن بەلاوە پیس نەبووبێ و تێوە نەچووبێ، ئەگەرنا پێویستە هەر بە ئاو خۆی پاك بکاتەوە و غەیری ئاو بەرناکەوێ[122].

### ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە کە بەچی تارەت دەگیرێ؟

*(عن أنسٍ رضي الله عنه قال: كان النبي ﷺ يأتي الخَلاءَ فأَتْبَعُهُ أنا و غُلامٌ بإداوةٍ من ماءٍ فَيَسْتَنجي بِها) متفق عليه و رواه احمد والنسائي وابوداود و والدارمي و ابوعوانة والطياليسي والبغوي و صححه ابن خزيمة.

واتە: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کە دەچووە ئاودەست من و منداڵێکی دیکە بە قاپە ئاوێکەوە بەدوایدا دەچووین خۆی پێ پاك دەکردەوە.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه كان النبي ﷺ إذا أَتىٰ الخَلاءَ أَتيتُهُ بماءٍ في رَكْوَةٍ فاَسْتَنْجىٰ ثم مَسَحَ يَدَهُ علىٰ الأرضِ ثم أَتَيْتُهُ بإناءٍ آخر فَتَوَضَّأَ) رواه احمد و ابوداود و ابن ماجة والبيهقي و قال النووي: اسناده صحيح.

واتە: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کە دەچووە ئاودەست من لە قاپێکی چەرمدا ئاوم بۆ دەبرد و تارەتی دەگرت پاشان دەستی بە زەوی دەسری، دوایی قاپێکی دیکە – ئاو – م بۆ دەهێناو دەستونێژی دەگرت.

---

[120] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ١٣٢. ئەمە ڕای سەرجەم زانایانە جگە لە (داود الظاهري)، بەڵام (القاضي ابو الطيب) گوتوویەتی: ئەویش هەمان ڕای هەیە، وە بڕوانە: (المغني) ج١ ص ١٥٠.

[121] ئەمەش ڕای زۆربەی زۆری زانایانە، بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص١٢٠.

[122] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص ١٥١ وە (المجموع) ج٢ ص ١٤٣.

*پێشتریش ئەو فەرمووودانەمان هێنانەوە، کە (مسلم) لە (سلمان الفارسی) و (احمد و اصحاب السنن) لە (عائشە)وە گێڕاویاننەوە خوا لێیان ڕازیبێ، دەربارەی خۆ پاککردنەوە بە سێ بەردووچکە لە کاتی نەبوونی ئاودا.

شایانی باسیشە کە زۆربەی زانایان ڕایان وایە ئەگەر بابای تارەت گر لەبەر نەبوونی ئاو بەبەرد و وێنەی وی خۆی پاك کردەوە نابێ، لە سێ بەرد کەمتر بێ[123]، هەروەها زۆربەش ڕایان وایە کە ئەگەر بە سێ بەردیش پاك نەبۆوە دەبێ بەردی تر بەکاربهێنێ تا دڵنیا دەبێ[124]، ئەگەر لەبەر بڵاوبوونەوەی پیسییەکەش بە جەستەیەوە، ئەگونجا بە غەیری ئاو خۆی پاك بکاتەوە فەرزە ئاو بەکاربهێنێ وەك پێشتریش گوتمان.

## ٤-ئەدەب و ڕەوشتەکانی تارەت گرتن:

١)هەرکاتێك ویستی بچێ بۆ شوێنی خۆڵێ خاڵیکردنەوە (التخلّي) و خۆپاککردنەوە (الاستنجاء) بەرلەوەی پێی بچێتە نێو سنووری ئەو شوێنەوە بڵێ: (بسم الله) بەناوی خوا، چونکە پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: (سِتْرُ ما بين الجنّ و عَوْراتِ بَنِي آدم إذا دخَلَ أحدُكُمْ الخَلاءَ أنْ يَقُولَ بسم الله) رواه الترمذي و ابن ماجة و صححه الالباني[125].

واتە: پەردەی نێوان جن و عەورەتی ئادەمیزادەکان کاتێك یەکێکیان دەچێتە سەر پێشاو ئەوەیە کە بڵێ: بەناوی خوا. وە سوننەتە بڵێ: (اللّهُمَّ اني أعوذُ بِكَ مِن الخُبُثِ والخَبائِثِ) چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرمووە وەك (انس) گێڕاویەتەوە:

*(كان رسول الله ﷺ اذا دخَلَ الخلاءَ قال: اللّهم اني أعوذ بِكَ مِن الخُبُثِ والخَبائِثِ) رواه البخاري و مسلم و اصحاب السنن، واتە: ئەی خوایە پەنات پێدەگرم لە شەیطانە نێرو مێیەکان.

دیارە دەتوانێ هەرجارە یەکێك لەو دوو زیکرە بڵێ، یان پێکەوە و وێکڕا بیانڵێ.

٢)وە سوونەتە لە چوون دا لاقی چەپ و لە هاتنەدەرەوەدا لاقی ڕاستی پێش بخات، چونکە چەندان دەقی سوننەت هەن ئەوە دەگەیەنن کە وا باشە ئینسان بۆ هەر

---

[123] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ١٢١ تا ١٢٥، وە بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص ٢٧، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) د. وهبة الزحيلي، ج١ ص ٣٤٧ تا ٣٥١.

[124] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

[125] بڕوانە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ص ٢٦، عبدالعظيم بن بدوي.

شتێك و هەر شوێنێكی چاك و پاك لای ڕاست – چ دەست چ لاق – پێش بخات و بۆ پێچەوانەی ئەوەش لای چەپ، ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله ﷺ يُعْجِبُهُ التَيَمُّنُ في شَأْنِهِ كُلِّهِ في طُـهُورِهِ و تَرَجُّلِهِ و تَنَعُّلِهِ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەكرد لە هەموو كاروبارێكی‌دا بەلای ڕاست دەست پێ‌بكـات لـە دەسـتونوێژگرتنی و سـەر و ڕیـش شـانەكردنی و نـەعل بەسەرپێوەكردنی‌دا.

*(عن عائشة رضي الله عنها كانت يَدُ رسول الله ﷺ اليُمنىٰ لِطَهُورِهِ و طَعامِهِ و كانتِ اليُسـرىٰ لِخلائِهِ و ماكان مِنْ أذىً) رواه ابوداود و غيره باسناد صحيح.

واتـە: دەسـتی ڕاستی پێغەمبـەری خوا ﷺ بۆ دەستونێژگرتن و خواردنـی بـوو، وە دەستی چەپیش بۆ تارەت گرتن و شتی پیس بوو.

٣) وە سـوننەتە كـە هیـچ شـتێكی پێ‌نـەبێ بـۆ سەرپێشـاو كـە نـاوی خـوای بەسەرەوەبێ، ئەگەر ئاڵقە و ئەنگوستیلەش بێ. چونكە پێغەمبەر ﷺ وای كردوە:

*(عن أنسٍ أن النـبي ﷺ كـان اذا دَخَلَ الخَلاءَ وَضَعَ خَاتَمَـهُ) رواه اصحاب السنن و قال ابوداود: هذا حديث، و صححه الترمذي.

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ كە دەچووە ئاودەسـتەوە ئەنگوستیلەكەی دادەنـا. (بخـاري و مسلم و اصحاب السنن إلا ابن ماجة) ش گێڕاویانەتەوە لە (ابن عمر)ەوە خوا لێیان ڕازی‌بێ گێڕاویانـەتەوە كەنـەخش و نووسـینی سـەر ئەنگوسـتیلەی خۆشەویسـت ﷺ بریتی بووە لە: (محمدُ رسولُ الله)[١٣٦].

بەڵام (ابن المنذر) لە كۆمـەڵێكی وەك سعيد بن المسيب والحسن البصري و ابن سيرين) گێڕاویەتەوە كە مۆڵەت (رخصة) دراوە ئەو جۆرە شتانەشی پێ‌بێ[١٣٧].

٤) وە سوننەتە پاش تەواوبوونی و هاتنەدەرەوەی بڵێ: (غُفْرانَكَ)، چونكە (عائشە) خوا لێی‌ڕازی‌بێ گێڕاویەتەوە: (كان رسول الله ﷺ إذا خَرَجَ مِن الغائِط قال: غُفْرانَكَ). رواه اصحاب السنن و حسنه الترمذي و صححه ابن خزيمة والحاكم وابن حبان.

واتـە: پێـغەمبـەری خوا ﷺ كە لە شـوێنی تارەت گرتـن دەهاتە دەرێ دەیفـەرموو: لێبوردنت (داوادەكەم ئەی پەروەردگارم).

---

[١٣٦] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٩٢.

[١٣٧] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

بەڵام ئەو دەقەی کە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الحَمْدُ لِلّهِ الَّذي أَذْهَبَ عَنِّي الأَذَىٰ و عافاني) رواه النسائي وابن ماجة عن ابي ذر رضي الله عنه.

واتە: ستایش بۆئەو خوایەی کە پیسیی لە کۆڵ کردمەوە و سەلامەتی کردووم، ئەوە زۆر لە پسپۆرانی سوننەت بە بێهێز (ضعیف) یان داناوە[128].

٥) وە ئەگەر لە دەشت و چۆڵایی تارەتی گرت دەبێ لە خەڵکی دووربکەوێتەوە و وا پەسەندە بچێتە پەناو نەدیوێکیش، چونکە:

*(عن المغيرة كان ﷺ إِذا أَراد الحاجَةَ أَبْعَدَ في المَذْهَبِ) رواه احمد واصحاب السنن و صححه الترمذي والنووي،

واتە: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کە دەیویست تارەت بگرێ دەچووە شوێنێکی دوور.

*(عن عبدالله بن جعفر رضي الله عنهما كان أَحَبَّ ما اسْتَتَرَ بِهِ النبيُّ ﷺ هَدَفٌ أو حائِشُ نَخْلٍ) رواه احمد و مسلم و ابوداود و ابن ماجة، واتە: چاکترین شت کە پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد – لەکاتی تارەت گرتن دا – خۆی پێ پەنهان بکات تەپۆڵکە و بەرزاییەک یان کۆمەڵێك دارخورمای چروپڕ بوون.

٦) وە سوننەتە هەتا لە زەوی نزیك نەبێتەوە بەرگ و پۆشاکی خۆی هەڵنەداتەوە چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ:

*(عن ابن عمر رضى الله عنهما أن النبي ﷺ كان إِذا أَراد الحاجة لا يرفع ثَوْبَهُ حَتّى يَدْنُوَ مِنَ الأَرضِ) رواه ابوداود والترمذي وابن ماجة.

٧)وە بە ڕای زۆربەی زۆری زانایان حەرامە کە بابای تارەت گر مادام لە دەشت و سارا و چۆڵایی بێت ڕوو یان پشت بکاتە قیبلە، چونکە:

*(عن ابي ايوب رضى الله عنه أن النبي ﷺ قال: اذا أَتَىٰ أَحَدُكُم الغائِطَ فلا يَسْتَقْبِلِ القِبلَةَ ولا يُوَلِّها ظَهرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا) رواه البخاري ومسلم. و احمد و اصحاب السنن، لكن بعضهم عن ابي هريرة رضى الله عنه.

واتە: ئەگەر یەکێکتان چووە سەر پێشاو با ڕوونەکاتە قیبلە و پشتیشی تێنەکات، ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا.

---

[128] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٩٤، هەندێك لە زانایانیش بە ڕاست و (صحيح) یان داناوە، بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٦٢.

وەلەبارەی ڕوو یان پشت کردنە قیبلەوە لە کاتی تارەت گرتن دا زانایان ڕایان جیاوازە و بەم شێوەیەی[129] خوارێیە:

(مالك و شافعي و اسحاق) و احمد یش لە ڕیوایەتێکیدا دەڵێن لە دەشت و سارا حەرامە بەڵام لەنێو خانوبەرەدا دروستە.

(ثوري و ابوثور) و (احمد) لە ڕیوایەتەکەی دیکەدا دەڵێن لە هیچ شوێنێك دا دروست نیە و بە موتڵەقی حەرامە.

(داود الظاهري) یش بە موتڵەقی بە دروستی دەزانێ.

(ابو حنیفە) ش لە هەموو شوێنێك ڕووتێکردنی قیبلە لە حاڵەتی تارەت گرتن دا بە حەرام، بەڵام پشت تێکردنی لە شارو دەشت بە ڕەوا دەزانێ. واش پێدەچێ ڕای یەکەم لە هەموویان بەهێزتربێت، بەڵگەشیان ئەم چەند دەقەیە:

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: رَقَيْتُ على ظَهْرِ بَيْتٍ فرأيتُ رسول الله ﷺ قاعِداً علىٰ لَبِنَتَيْنِ مُستقبلاً بيتِ المقدس مُسْتدبراً الكعبة) متفق عليه.

واتە: سەرکەوتمە سەربانی خانوویەك پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر دوو خشتە (بۆ تارەت گرتن) دانیشتوەو ڕووی لە (بیت المقدس) و پشتی لە کەعبەیە.

*(عن مروان الأصفر قال: رأيْتُ ابن عُمَرَ أَنَاخَ راحِلَتَهُ مُستَقْبِلَ القبلة ثم جَلَسَ يبول اليها، فقلنا يا ابا عبدالرحمن أَلَيْسَ قد نُهِيَ عن هذا؟! قال: بلىٰ، انما نُهِيَ عن ذلك في الفضاء، فاذا كان بَيْنَكَ و بَيْنَ القِبْلَةِ شَيءٌ يَسْتُرُكَ فَلا بَأْسَ) رواه ابوداود والدارقطني والحاكم و قال هو صحيح على شرط البخاري و وافقه الذهبي.

واتە: (ابن عمر)م بینی حوشترەکەی ڕوو بە قیبلە یەخ دابوو، پاشان دانیشت بەرەو ڕووی حوشترەکەی میزی کرد، گوتمان: ئەی (ابو عبدالرحمن) ئەدی ئەمە قەدەغە نەکراوە؟ گوتی: با، بەڵام نەهی لەوەکراوە ئەگەر لە دەشت و سارابێ، بەڵام ئەگەر شتێك لەنێوان تۆ و قیبلەدا هەبێ بتشارێتەوە قەیدێ ناکات.

وە وەڵامی قسەکەی (ابو ایوب) یشیان خوالێیڕازیبێ. کە گوتوویەتی: (فَقَدِمْنا الشّامَ فوجَدْنا مَراحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ نَحْوَ الكَعْبَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْها و نَسْتَغْفِرُ اللهَ تعالىٰ) متفق عليه.

واتە: جا کاتێك چووینە شامێ دیتمان ئاو دەستەکانیان بەرەو کابە دروست کردوون، بۆیە لە کاتی دانیشتن دا خۆمان دەسوڕاند و داوای لێبوردنمان لە خوای بەرز دەکرد، بەڵێ وەڵامی ئەم قسەیەیان بە دوو شت داوەتەوە:

---

[129] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٩٩، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٩٣ تا ٩٧.

يەكـەم: لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە گومـانی هـەبووە لـەوەدا ئایـا نەهی‌یەكـەی پێغەمبـەر ﷺ گشتی‌یە و بـۆ هـەردووك حاڵـەتی لـە ئـاوەدانی بـوون و لـە دەشـت و سارابوونە، یان نا؟! جا ئەو دووربینی (احتیاط) ی كردوە.

دووەم: ئەوە ڕای خۆیەتی و هاوەڵانی دیكەش ڕای دیكەیان هەبووە و (ابو ایوب) بۆچوونەكەی خۆی پاڵ نەداوەتە لای پێغەمبەر ﷺ[130].

پێویستە ئەوەش بگوترێ كە هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە كە حەرام بوونی ڕوو و پـاش كردنـە قیبلـە لـە كـاتی تـارەت گرتـن دا نەسـخ كراوەتـەوە و ئـەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دەهێننەوە:

*(عن جابر رضي الله عنه قال: نَهَىٰ نَبِيُّ اللهِ ﷺ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِبَوْلٍ، فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعامٍ يَسْتَقْبِلُها) رواه احمد و ابوداود والترمذي و حسنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغەكردبووین كە لە كاتی میزكردن دا ڕوو بكەینە قیبلە، بەڵام ساڵێك بەرلەوەی گیانی بكێشرێ دیتم ڕووی تێكردبوو.

بـەڵام وەك (نـووي) گوتوویـەتی[131]: ئـەو ڕایـە كـە دەڵـێ ئـەو فەرموودانـە نەسـخ كراونـەوە بـێ‌هێزە و لـە هـەر بابـەتێكیش دا چـەند فەرموودەیـەك هـەبن چاكتر وایـە هەموویان كاریان پێ‌بكرێ، نەك بكرێنە (ناسخ) و (منسوخ) ی یەكترا ئاشكراشە كە بەپێی ئەو ڕایەی كە زۆربەی زانایان لەسەری كۆكن كە دەڵێ: قەدەغەكردنی ڕوو یان پاش كردنە قیبلە بۆ دەشت و سارایە و بە ڕەوادانانی ڕوو وە پشت تێكردنیشی بۆ نێـو ئـاوەدانی و خانووبەرەیـە،سـەرجەم دەقـەكانی سـوننەت كـار پێ‌دەكـات و هەركامێكیان لە شوێنی تایبەتی خۆی‌دا بەكاردێنێ.

٨)وە زانایان هەموو لەسەرئەوە یەكدەنگن كە قسەكردن لە كاتی تارەت گرتن دا شـتێكی ناپەسـەندە، تەنانـەت ئەگـەر سەلامیشـی لـێ‌كرا وا باشـە وەڵام نەداتـەوە هەرچەندە وەڵامی سەلام لە كاتی ئاسایی‌دا فەرزیشە، هـەروەها زیكری خواكردنیش مەگـەر لـە دڵـی خـۆی‌دا بـێ ئەگـەرنا زۆربـەی زانایـان پێیـان شـتێكی ناپەسـەند و نەشیاوە[132]، بەڵگەی ئەوەش كە گوترا ئەم فەرموودانەن:

---

[130] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص١٠١.

[131] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

[132] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ١٠٧ ، ١٠٨، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٩٠ ، ٩١.

*(عن أبن عمر رضى الله عنهما قال: مَرَّ رَجُلٌ بالنَبيّ ﷺ وهو يبولُ فسَلّم عليْهِ فلَمْ يردَّ عليْـهِ) رواه مسلم و اصحاب السنن الا ابن ماجة، واتـه: پیاوێك بەلای پێغەمبەردا ﷺ ڕەت بوو كە لەوكاتەدا میزی دەكرد، سەلامی لێكرد بەڵام - پێغەمبەر - وەڵامی نەدایەوە.

*(عن أبي سعيد الخدري رضى الله عنه أن النبي ﷺ قال: لا يَخْرُجِ الرَّجلان يَضْرِبانِ الغـائِطَ كاشِفَيْنِ عن عَوْراتِهِما يَتَحدَّثان فَأَنَّ الله تَبارَكَ و تعالىٰ يَمقُتُ علىٰ ذٰلِكَ) رواه ابو داود و احمد و صححه الحاكم، واتـه: دوو پیـاو پێكـەوە نەچنـە سـەر پێشاو عـەورەتیان دەربخـەن و پێكەوە بدوێن، چونكە خوای پایەدار و بەرز لەسەرئەوە ئینسان دەبوغزێنێ.

٩)هەروەها زۆربەی[١٣٣] زۆر لەسەرئەوە كۆك (متفق) ن كە مەگەر لەبەر ناچاری و عوزرێك ئەگەرنا هەرچەندە دروستە بەڵام پەسند وایە بە دانیشتنەوە میز بكات، بە بەڵگەی:

*(عن عائشة رضى الله عنها قالت: مَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ النبي ﷺ كان يَبولُ قائِمـاً فـلا تُصَدِّقـوه، ماكان يَبولُ الاّ قاعِداً) رواه احمد و اصحاب السنن الا ابو داود. واسناده جيد و حسنه النووي.

واتـە: هەركەسێك پـێی گوتـن كـە پێغەمبـەر ﷺ بـەپێوە مـیزی كـردوە، بـڕوای پێمەكەن، چونكە بەدانیشتنەوە نەبێ میزی نەدەكرد.

*(عن حُذَيفَةَ بنِ اليَمانِ رضي الله عنه أن النـبي ﷺ أَنْتَهىٰ الى سُباطَةِ قَوْمٍ، فَبـالَ قائِمـاً فَتَنحيتُ فقال أُدْنُه فَدَنَوتُ حتّى قُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ فَتَوضّأَ و مَسَحَ علىٰ خُفَيْهِ) رواه البخاري و مسلم و احمد واصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەر ﷺ هات گەیشتە لای زبڵدانی خەڵكێك و بەپێوە میزی كرد منیش لێی دووركەوتمەوە، كەچی فەرمووی: نزیك بەوە منیش نزیك بوومەوە هەتا لـەلای پاژنەپێیەكانی‌یەوە وەستام، ئینجا دەستنوێژی گرت و مەسحی خووفەكانی كرد.

دیارە - وەك زانایان گوتوویانە[١٣٤] - عائیشە خوالێی‌ڕازی‌بێ دیارە بـە گوێـرەی زانیاری خۆی و ئەوەی كە لەماڵەوە لە پێغەمبەری دیوە قسەی كردوەو، (حذيفة) ش بەپێی دیتن و زانیاری خۆی قسەی كردوەو، (حذيفة) شتێكی دیوە لە دەرەوەی ماڵ كە عائیشە نەیبینیوە بۆیە ئینكاری كردوە.

---

[١٣٣] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ١٠٧ تا ١١٠، وە (المجموع) ج٢ ص ١٠٣ ، ١٠٤.

[١٣٤] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ١٠٣ ، پەراوێز.

(ابن المنذر گوتوویەتی[١٣٥]: (البَوْلُ جالِساً أَحَبُّ إِلَيَّ و قائماً مُباحٌ و كُلُّ ذٰلِكَ ثابِتٌ عن رسولِ الله ﷺ) واتە: بە دانیشتنەوە میزکردنم پێ پەسەندترە وە بە پێوەش ڕەوایە و هەردووك لاش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوون و چەسپاون.

١٠)دەست سڕینەوە بە زەوی یان شۆردنەوەی بە صابوون و وێنەی وی پاش تارەت گرتن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردووە، وەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە پێشتر هێنامان و (احمد و أبوداود و ابن ماجة و بیهقي) لە (ابو هريرة) گێڕاویانەتەوە و ڕستەی (فَاسْتَنْجَى ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ)، واتە: تارەت گرتن پاشان دەستی بە زەوی سڕی.

١١)حەرامە کە بە دەستی ڕاستی تارەت بگرێ، وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (عبدالرحمن بن زيد) بەم شێوەیە گێڕاویەتەوە، کە لە زاری (سلمان الفارسي) یەوەیە:

*(قيل لَهُ: قَدْ عَلَّمَكُم نَبِيُّكُمْ كُلَّ شيءٍ حتّى الخَرَاءَةَ! قال أَجَلْ لقد نَهانا أن نَسْتَقبِلَ القِبْلَةَ لِغائِطٍ أَوبولٍ أَو أَنْ نَسْتَنْجِي بِيَمِيْنٍ، أو أَنْ نَسْتَنْجِيَ بأَقَلَّ مِنْ ثلاثةِ أَحْجارٍ، أو أن نَسْتَنْجِيَ بِرَجيعٍ أَوْ عَظْمٍ) رواه مسلم و أبوداود و ابن ماجة والبيهقي.

واتە: پێی گوترا: پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون تەنانەت چونە سەرپێشاویش! (سەلمان) گوتی: بەڵێ، لێی قەدەغەکردووین کە لەکاتی پیسایی و میزکردندا ڕوو لە قیبلە بکەین، یان کە بە دەستی ڕاست تارەت بگرین، یان کە بە سێ بەرد و کەمتر خۆمان پاك بکەینەوە، یان کە بە پاشەڕۆك یان بە ئێسقان خۆمان پاك بکەینەوە.

١٢-حەرام یان بەلای کەمەوە زۆر ناپەسەندە کە لە چەند شوێنێك دا میز و پیسایی بکرێ، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

سەر ڕێگاوبان، ڕێگای ئاوهێنان، سێبەر و شوێنی دانیشتنی خەڵکی، شوێنی خۆڵ‌ی شۆردن، ئاوی ڕاوەستاو، بن داروردەختی میوەدار، کون وکەلێن. ئەمەش ئەو دەقانەی کە بەڵگەی قەدەغەکرانی میز و پیسایی کردنن لەو شوێنانەدا:

*(عن مُعاذٍ رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: إتَّقوا المَلاعِنَ الثلاثة: البَرازُ في الموارِد، و قارِعَةِ الطَّرِيْقِ والظِّلِّ) رواه ابوداود و ابن ماجة والبيهقي والحاكم و صححه.

واتە: خۆتان لە سێ لەعنەت هێنەرەکان بپارێزن: پیسایی‌کردن لەسەر ڕێگاکانی ئاو هێنان، وە نێوەڕاستی ڕێگا، وە ژێر سێبەر.

---

[١٣٥] سەرچاوەی بەرگی پێشوو، ص ١٠٤.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إتّقوا اللّعانَيْن، قالوا، و ما اللّعانان يا رسول الله؟! قال: الّذي يَتَخلّى في طَريقِ الناسِ أو في ظِلّهِمْ) رواه مسلم. كه ماناكەی رۆشنه.

*(عن عبدالله بن مُغفّل رضي الله عنه أن النبيّ ﷺ قال: لا يَبولَنّ أحَدُكُمْ في مُسْتَحمِه..) رواه الخمسة،

واته: با یەکێکتان له شوێنی خۆشۆردنی میز نەکات.

*(عن جابر رضي الله عنه أن النبي ﷺ نَهى أنْ يُبال في الماءِ الرّاكِدِ) رواه احمد و مسلم والنسائي و ابن ماجة، واته: پێغەمبەر ﷺ میزکردنی له ئاوی وەستاودا قەدەغەکردوه.

*(عن عبدالله بن سرجس قال: نَهى رسول الله ﷺ أن يُبالَ في الجُحْرِ..) رواه احمد والنسائي و ابوداود والحاكم والبيهقي و صححه ابن خزيمة. واته: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوه که میز بکرێته کون و کەلەبەرەوە..

*دەربارەی میز و پیسایی نەکردنیش له بن درەختی بەردارا، (نـووي) گوتوویەتی: ئەوە شتێکه یەکدەنگی لەسەرە[١٣٦].







[١٣٦] بڕوانه: (المجموع) ج٢ ص ١٠٦، و بڕوانه: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص ١٥٦ ، ١٥٧.

## دووەم: خاوێن ڕاگرتنی جەستەو پۆشاك و جێگاو شوێن

*خوێنەری بەڕێز!* وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە پاك و خاوێنی بە مەعنەوی‌و ماددی‌یەوە پلەو پایەیەکی گەورە و گرنگی لە ئیسلام دا هەیە و ئەوەندە بەسە کە پێغەمبەر ﷺ بە نیوەی ئیمانی داناوە: (**الطُّهور شَطْرُ الأيمـان**) رواه مسلم، وە خوای کاربەجێ بە جووت و هاوشانی (توبة) داناوە و خۆشەویستی خۆی بە خاوەنەکەی بڕیاردراوە، (إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التوّابين و يُحِبُّ المُتَطَهِّرِين) البقرة - ٢٢٢ -.

جا دیارە ئەو پاك وخاوێنی‌یەش تایبەت نیە بە شتێکی دیاریکراوەوە و هەموو شتەکان دەگرێتەوە: هەم جەستە (بدن)، هەم بەرگ و پۆشاك، هەم جێگا و ڕێگا، جا ئێمە لێرەدا لەپێشەوە چەند دەقێك لەسەر پاك و خاوێن ڕاگرتنی جێگاو ڕێگاو بەرگ و پۆشاك و دێنینەوە، پاشان باسی پاك و خاوێنی جەستەش دەکەین:

### أ-پاك وخاوێن ڕاگرتنی جێگاو شوێن و بەرگ و پۆشاك:

***(عن ابي هريرة رضی الله عنه قال: قام أَعرابيٌّ فبَالَ في المَسْجِد فتَنَاوَلَهُ النّاسُ، فقال لَهُمْ النَّبيُّ ﷺ: دَعُوهُ و هَرِيْقُوا علىٰ بَوْله سَجْلاً من ماء - أو ذَنُوباً مِنْ ماءٍ - فانّما بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِيْنَ و لَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِيْنَ)** رواه البخاري و اصحاب السنن.

کە پێشتر مانامان کردووە و ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ مسوڵمانان جێگاو ڕێگایان، پاك و خاوێن ڕابگرن، بەتایبەت مزگەوت کە شوێنی خواپەرستی‌یەکی گەورەی وەك نوێژە.

***(عن أبي سعيد رضی الله عنه أن النبي ﷺ قال: إذا جاءَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيْهِ و لِيَنْظُرْ فِيهِما فَإِنْ رأىٰ خَبَثـاً فَلْيَمْسَحْهُ بِالأرْضِ..)** رواه احمد و ابوداود و غيرهما. کە پێشتر ماناکمان کردوە.

*خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (و ثيـابك فطَهِّرْ) المدثر -٤ -، واتـە: وە بەرگ و پۆشاکت پاك بکەوە.

***(عن جابر بن سَمُرَةَ رضِي الله عنه قال: سَمِعْتُ رَجُلاً سَأَلَ النبيَّ ﷺ: أُصَلِّي في الثَّوبِ الَّذي آتِيْ فيهِ أَهْلِي؟ قال: نَعَمْ إلاّ أَنْ ترىٰ فيْهِ شَيْئاً فَتَغْسِلَه)** رواه احمد و ابن ماجة بسند رجاله ثقات.

واتـە: گوێم لێ بوو پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئایا لەو بەرگەمدا کە پێی دەچمە لای هاوسەرەکەم نوێژ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ مەگەر شتێکی - پیسی - پێوە ببینی دەبێ بیشۆی.

*(عن ابي سعيد أنَّه ﷺ صلّىٰ فخلعَ نعليْه فخلعَ النّاسُ نعالَهُمْ، فلمّا انْصرفَ قال: لِمَ خَلَعْتُمْ؟! قالوا رأيْناكَ خَلَعْتَ فَخَلَعْنا، فقال: إنَّ جبْريلَ أتاني فأخْبَرَني أنَّ بهما خَبَثاً..) رواه احمد و ابوداود والحاكم وابن حبان وابن خزيمة و صححه. واتـه: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك نوێژی‌کرد نەعلەکانی دانا، خەڵکیش نەعلەکانیان دانا، جا کاتێك تەواوبوو، فەرمووی: بۆچی نەعلەکانتان دانا؟! گوتیان: دیتمان تۆ داتنان ئێمەش دامانـنان، فەرمووی: ئەوە من جوبرائیل هاتەلام هەواڵی دامێ کە پیسی‌یەکیان پێوەیە.

*(عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه قال: أتانا رسول الله ﷺ زائراً في منزلنا فرأىٰ رجلاً شَعْثاً فقال: ما كان هذا يَجدُ ما يُسَكّن به رَأسَهُ! و رأى رَجُلاً عَلَيْه ثِيابٌ وَسْخَةٌ فقال: أما كان هذا .. يَجِدُ ما يَغْسِلُ به ثَوْبَهُ؟!) رواه ابوداود والنسائي.

واتـه: پێغەمبەری خـوا ﷺ هاتـە لامـان لـە ماڵـەوە سـەردانی کردیـن، پیـاوێکی سەرچڵکن و ئاڵۆزی دی، فەرمووی: ئەوە ئەو کابرایە شتێکی دەست نەکەوتووە کە سەرو قـژی خـۆی پـێ ڕێـك بخـات؟. وە پیـاوێکی دی بـەرگێکی چڵکنـی لەبـەربوو، فەرمووی: ئەوە ئەم کابرایە هیچی چنگ نەکەوتوە جل و بەرگی خۆی پێ بشۆرێ؟!

## ب - پاك و خاوێن ڕاگرتنی جەستە:

پاك و خاوێن ڕاگرتنی جەستە بەشێوەیەکی گشتی بە سێ شتان دێتەدی:

١)خۆشۆردن و خۆگۆڕین.

٢)خۆ بۆنخۆش کردن و خۆ پاراستن لە بۆن و بەرامەی ناخۆش.

٣)جێبەجێ‌کردنی خسڵەتە سروشتی‌یەکان (خصال الفطرة).

### ١- خۆشۆردن و خۆگۆڕین:

سوننەتێکی داکۆکی لەسەرکراوە، هەندێکیش دەڵێن فەرزە[١٣٧]، کە بەلای کەمەوە هەفتەی جارێك مسوڵمان خۆی بشوات و خۆی بگۆڕێ لە ڕۆژی جومعەدا و بە چڵکنی و دڕۆینی نەچێتە نێو خەڵکی، بە بەڵگەی:

*(عن ابي سعيد رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: علىٰ كُلِّ مُسْلِمٍ الغُسْلُ يَوْمَ الجُمُعَةِ و يَلْبَسُ مِنْ صالحِ ثِيابِه وإنْ كانَ لَهُ طِيْبٌ مَسَّ مِنْهُ) رواه احمد والشيخان.

واتە: لەسەر هەر مسوڵمانێك پێویستە کە ڕۆژی جومعە خۆی بشۆرێ و بەرگی پاك و چاکی دەبەربکات، وە ئەگەر بۆنی خۆشیشی هەبوو دەستی بکەیەنێتێ.

---

[١٣٧] بڕوانە: (المحلّىٰ شرح المجلّىٰ) ج٢ ص ٩. مسالة: ١٧٨، کە گوتوویەتی: (و غُسْلُ يَوْمِ الجُمُعَةِ فَرْضٌ لازِمٌ لِكُلِّ بالغٍ مِنَ الرِّجالِ والنِّساءِ و كذلِكَ الطِّيْبُ والسِّواكُ).

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال: حَقٌّ اللهِ علىٰ كل مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ في كُلِّ سَبْعَةِ أَيّامٍ: يَغْسِلُ رَأْسَهُ و جِسْمَهُ) متفق عليه. واته: هەقی خوایە لەسەر هەر مسولمانێك كە هەر حەوت ڕۆژێك خۆی بشوات، سەری و جەستەی بشوات.

ئەم فەرموودەیەش وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی[128]: بەلگەیە لەسەر فەرزبوونی پاك و خاوێنی و خۆشۆردن هەر هەفتەی جارێك، با ئینسان نوێژی جومعەش نەكات.

٢- خۆ بۆنخۆش كردن و خۆ پاراستن لە بۆن و بەرامەی ناخۆش:

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر فەرمودەیدا باسی بەكارهێنانی بۆنی خۆش و خۆ دووركرتن لە بۆن و بەرامەی ناخۆش كردووە، بۆ وێنە:

*(حَقٌّ علىٰ كُلِّ مُسْلِمٍ الغُسْلُ والطِّيْبُ والسِّوَاكُ يَوْمَ الجُمُعَةِ) رواه احمد بسند الصحيح.

واتە: ڕۆژی جومعە خۆ شۆردن و سیواك كردن و خۆ بۆنخۆش كردن لەسەر هەموو مسولمانێك پێویستە.

*(عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ الدُّنْيا النِّساءُ والطِّيْبُ و جُعِلَتْ قُرَّةُ عيني في الصَّلاةِ) رواه احمد والنسائي.

واتە: لە نیعمەتەكانی - دنیا ئافرەت و بۆنی خۆشم لەلا خۆشەویستن، وە تروسكایی چاوانم نوێژكردنە.

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ طِيْبٌ فلا يَرُدُّهُ فَاِنَّهُ خَفِيْفُ المَحْمَلِ طَيِّبُ الرائِحَةِ) رواه مسلم والنسائي وابوداود.

واتە: هەر كەسێك بۆنی خۆشی بۆ ڕاونێنراو پێشكەش كرا، با نەیگێڕێتە دواوە چونكە هەلگرتنی سووكە و بۆنیشی خۆشە.

*(عن جابر رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: مَنْ أَكَلَ مِنْ هٰذِهِ الشَّجَرَةِ: الثُّوْمِ قال: ثم قال بعد الثُّوْمِ والبَصَلِ والكُرّاثِ - فلاَ يَقْرَبَنا في مَسْجِدِنا، فَاِنَّ الملائكَةَ تَتَاذَّىٰ مِمّا يَتَاذَّىٰ مِنْهُ الأنْسانُ) متفق عليه.

واتە: هەركەسێك لەم ڕووەكە: (سیر) ی خواردبێ - گوتی: پاشان دوای سیر فەرمووی پیواز و كەوەریش - با لە مزگەوتەكەمان دا نزیكمان نەكەوێتەوە چونكە فریشتەكانیش بەوەی كە ئینسان پێی ناڕەحەت دەبێ (كە بۆنی ناخۆشە) ناڕەحەت دەبن.

---

[128] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٢ ص ١٧٥.

ئاشكرايه كه پێویسته مسوڵمان هەمیشه پاك‌وخاوێن بۆنخۆش بێت و دووربێ لە پیس‌وپۆخەڵێ و بۆن و بەرامەی ناخۆش، بەلام بۆ نێو خەڵك و بۆ مزگەوت و شوێنە گشتی و قەڵەبالغەكان پێویست تره، بۆیه لەو حاڵانەدا زیاتر داكۆكی لەسەركراوه، هەروەها بۆنی ناخۆشیش تەنیا سیر و پیواز و كەوەر نیه، بەڵكو هەرشتێكی دیكەی بۆن ناخۆشی وەك وانیش هەمان حوكمی هەیه، بۆ وێنه: توور (فجل) و جگەرەكێشان و بۆن چڵك و ئارەقه و.. هتد.

٣)جێ‌بەجێ‌كردنی خەسڵەته سروشتی‌یەكان:

مەبەست لە خەسڵەته فیطری و سروشتی‌یەكان ئەو جۆره پاك و خاوێنی‌یانەن كه عەقڵ و سروشتی‌ساغ پەسەندیان دەكات و لە رێبازی هەموو پێغەمبەرانی خوادا علیهم الصلاة والسلام هەبوون و فەرمانیان پێ‌كراوه و خەڵكی دیندار و خواپەرستیان پێ لە خەڵكی بێ‌دین و خوانەناس و گەندەڵ جیادەكرێتەوه: جا هەرچەنده – وەك دواتر فەرمووده‌كان دێنین – لە چەند فەرموودەیەك ژمارەیەكی دیاری‌كراو وەك پێنج یان ده (١٠) بۆ ئەو خەسڵەته بەرزانه دانراوه، بەلام وەك زانایان گوتوویانه: ئەو خەسڵەتانه لەو ژمارانەدا كورت هەڵنەهاتوون و زیاترن، فەرموودەكانیش هەر ئەوەیان لێ‌دەفامرێتەوه، چونكه بەشێوەی: (خَمْسٌ مِنَ الفِطْرَة)وه(عَشْرٌ مِنَ الفِطْرَة) هاتوون، ئێستاش با سەرنجێكی خێرا لەو خەسڵەته سروشتی‌یانه بدەین لەبەر تیشكی چەند فەرموودەیەك دا، كه بێگومان ئەگەر ئەو خەسڵەتانه بەتەواوی جێ‌بەجێ بكرێن كاریگەری‌یەكی گەورەیان لەسەر پاك و خاوێن راگرتنی جەستەی ئینسان و جوان و رێك و پێك كردنی سیما و كەسایەتی دەبێت:

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ خَمْسٌ مِنَ الفِطْرَةِ: الأسْتِحدادُ والخِتان و قَصُّ الشّارِبِ و نَتْفُ الأبْطِ وَتَقليمْ الأَظافِر) رواه البخاري و مسلم و اصحاب السنن.

واته: پێنج خەسڵەت لە سروشتی ساغەوەن (یان لە رێبازی پێغەمبەرانەوەن): تووكە بەر تاشین و سوونەت كردن و سمێڵ كورت كردنەوه و مووی بن هەنگڵ كردن و نینۆك كردن.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال: مِنَ السُّنَّةِ[١٣٩]: قَصُّ الشّارِبِ وَ نَتْفُ الأبْطِ و تَقليمُ الأَظافِرِ) رواه البخاري.

---

[١٣٩] وشەی (السنة) لێرەدا بە مانا فیقهی و (اصولي) و عورفی‌یەكەی نی‌یه كه بریتیه لە شتی خێر (تطوع) و بەرانبەری فەرز (واجب)، بەڵكو بە مانای رێبازی پێغەمبەر یان سەرجەم پێغەمبەرانه صلی

واتە: سمێڵ کورت کردنەوە و بن هەنگڵ کردن و نینۆك کردن لە ڕێبازی – ی پێغەمبەران – ە علیهم الصلاة والسلام.

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله ﷺ: عَشْرٌ مِنَ الفِطْرَةِ: قَصُّ الشّارِبِ و إِعْفاءُ اللِّحْيَةِ والسِّواكُ واَسْتِنْشاقُ الماءِ و قَصُّ الأَظافِرِ و غَسْلُ البَراجِمِ و نَتْفُ الأُبْطِ و حَلْقُ العانَةِ وانْتِقاصُ الماءِ، قال مصعب بن شيبة أحد رواته: و نَسِيتُ العاشِرَةَ الا أَنْ تكون: المَضْمَضَةُ) رواه مسلم و ابو داود.

واتە: دە خەسڵەت لە سروشتی ساغ (یان ڕێبازی پێغەمبەران)ەوەن: سمێڵ کورت کردنەوە و ڕیش هێشتنەوە و سیواك کردن و ئاو لە لووت وەردان و نینۆك کردن و شۆردنی گرێ و جومگەکانی پەنجەکان و مووی بن هەنگڵ و هەڵکێشان و تووکەبەر تاشین و تارەت بە ئاوگرتن، (مصعب بن شیبة) کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرمایشتە گوتوویەتی: دەیەمیش مەگەر (ئاو لە زاروەرکردن) بێت ئەگەرنا لەیادم چۆتەوە.

*ئێستاش با سەرنجێکی ئەو خەسڵەتە پەسەندە سروشتییانە بدەین لەبەر تیشکی بیروراو بۆچوونی زانایان دا:*

١) – دەربارەی سوننەت کردن (خِتانْ) بەتایبەت بۆ نێرینە – ڕای زۆربەی زانایان وایە کە فەرزە، بەڵام (ابو حنیفه و مالك) بە سوونەتی دەزانن[١٤٠]، ڕای جەماوەریش بەهێزترە بەتایبەت[١٤١] بۆ پیاوان کە جگە لەو فەرموودەیەی هێناومانەوە فەرموودەی دیکەش پشتگیری دەکەن، بۆ وێنە:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: إِخْتَتَنَ إِبْراهيمُ خَليلُ الرَّحْمٰنِ بَعْدَ ما أَتَتْ عَلَيْهِ ثَمانون سَنَةً) متفق عليه.

واتە: ئیبراهیم – علیه الصلاة والسلام – خۆشەویست و دۆستی خوا پاش تێپەڕبوونی هەشتا (٨٠) ساڵ خۆی خەتەنەکرد.

---

الله علیهم وسلم بە فەرز و سوننەتییەوە. وە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە وشەی (فطرة) یش لە فەرموودەکانی دیکەدا هەر ڕێبازی پێغەمبەرانە کە بێگومان پڕبەپێستی فیطرەت و سروشتی ساغی ئینسانەکانە.

[١٤٠] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٦٦ ، ٣٦٧، وە بڕوانە (المغنی) ج١ ص٧٠.

[١٤١] چونکە بۆ ئافرەتان ڕای سوننەت (تطوع) بوونی بەهێزترە، بڕوانە: (المغني) ج١ ص ٧٠.

*پێغەمبەر ﷺ بە کابرایەکی فەرموو کە تازە مسوڵمان بوو بوو: (أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الكُفْرِ وَاخْتَتِنْ) رواه ابوداود وابن ماجة والبيهقي و احمد عن عثيم بن كليب عن ابيه عن جده. واتە: مووی کافرێتی بەخۆتەوە مەهێڵە و خۆت خەتەنە بکە.

٢ و ٣ ) – دەربارەی ریش هێشتنەوە و سمێڵ کورت کردنەوەش زانایان رایان جیاوازە، جارێ بۆ ریش هێشتنەوە ئەوە مالیکی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان بە فەرزی دەزانن و تاشینی بە حەرام دەزانن، هەروەها رای حەنەفی‌یەکانیش لە حەرامەوە نیزکترە، چونکە دەڵێن (يُكْرَهُ تَحْرِيماً)، بەڵام شافیعی‌یەکان بەس بە ناپەسەند (مكروه) ی دەزانن بتاشرێ کەواتە هێشتنەوەی بە سوننەت دەزانن[142].

بۆ کورت کردنەوەی سمێڵیش زۆربەی هەرە زۆریان بە سوننەتی دەزانن و هەندێکیشیان کە (ابن حزم)[143] یەکێکیانە دەڵێن: فەرزە.

بە سەرنج دانی دەقەکانی سوننەتیش – بە رای بەندە – روون دەبێتەوە کە رای بە فەرز زانینی هێشتنەوەی ریش و بە فەرز زانینی سمێڵ کورت کردنەوە بەهێزترە، بەمەرجێك گۆڕانی مانای (سنة) لە چەمکە ئەسڵی‌یەکەیەوە کە (رێباز)ە، بۆ چەمکی عورفی و فیقهی سەرمان لێ تێك نەدات، کە پێم وایە سەری لە زۆر کەس شێواندوە لە زۆر مەسەلان دا، بەڵێ مادام لە چەندان فەرموودەدا فەرمان کراوە بە هێشتنەوەی ردێن و سمێڵ کورت کردنەوە ناگونجێ هەموو ئەو دەقە داکۆکی کەرانە بەس بۆ کارێکی خێرو (تطوع) بن! کە ئەمە یەکێکیانە:

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ خَالِفُوا المُشْرِكِيْنَ وَ فَرُّوا اللِّحَى وَاَحْفُوا الشَّوارِبَ) رواه احمد والشيخان واتە: پێچەوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکەن: ردێنان بهێڵنەوە و سمێڵان کورت بکەنەوە.وە ئەمەش یەکێکی دیکەیانە:

*( عن زيد بن أرقم رضي الله عنه قال: قال النبي ﷺ: مَنْ لَمْ يَأْخُذْ مِنْ شارِبِهِ فَلَيْسَ مِنّا ) رواه احمد و النسائي والترمذي و صححه. واتە: هەرکەسێك لە سمێڵی کورت نەکاتەوە لە ئێمە نیە.

ئینجا زانایان پاش یەکدەنگ بوونیان لەسەر فەرزبوون یان پەسەند بوونی هێشتنەوەی ریش، لەسەرئەوە رایان جیاوازە کە ئایا دروستە ریش لە پانایی و درێژایی بگیرێ و رێك بخرێ یان نا؟!

---

[142] بروانە: (الفقه الاسلامي و ادلته) ج١ ص ٤٦٢.
[143] بروانە: (المحلّى) ج٢ ص ١٣٨، مسألة: ٢٧٠.

بەڵام وا پێدەچێ ڕای ئەوانە بەهێزتر بێت کە ڕێك وپێك کردنی و لێ‌گرتنی‌یان بە دروست و ڕەوا زانیوە کە جگە لە (ابو هریرة و ابن عمر) خوا لێیان ڕازی‌بێ کە بێگومان زۆر لەو جۆرە شتانەدا وردبین و شارەزا بوون و لێیان گێڕاوەتەوە کە ڕیشی خۆیانیان ڕێك و پێك کردوە، ژمارەیەك لە زانایانی (تابعین) یش وەك (ابن سیرین و شعبي) هەمان ڕایان هەبووە، و هەرکام لە (طبري)و(الحافظ و ابن حَجَر)یش ئەو ڕایەیان پەسند کردوە و (طبري)بە زنجیرە (سند)ێك بردوویەتەوە سەر (عمر) خوا لێی ڕازی‌بێ کە ڕیشی پیاوێکی ئاوا ڕێك و پێك کردووە، وە لە هەرکام لە (ابو هریرة) و (ابن عمر)یش گێڕاوەتەوە کە وایان کردووە[144].

هەندێکیش لە زانایان وەك (حسن البصري و قتادة) لێ‌کەم کردنەوەی ڕیشیان بە ناپەسەند (مكروه) زانیوە[145]، بەڵام لە ڕاستی‌دا هیچ بەڵگیەکیان بەدەستەوە نیە کە بایی ئیسپاتی ئەو دەعوایەیان بکات، جگە لە دەست گرتن بە ڕواڵەت (ظاهر)ی ئەو فەرموودانەی کە فەرمان دەکەن بە ڕیش هێشتنەوە، ئاشکراشە کە ڕێك وپێك کردنی ڕیش لەگەڵ هێشتنەوەی‌دا دژ نیە، بگرە دەبێتە مایەی چاکتر جی‌بەجێ‌کردنی ئەو خەسڵەتە پەسندە، بەڵام بەمەرجێك ڕێك و پێك کردنی ڕیش نەکرێتە بیانووی هێندە کورت کردنەوەی کە بە قوربانی تاشینێ‌ی بکات!!

٤ و ٥ و ٦) - دەربارەی هەرکام لە: (نینۆك کردن و مووی بن هەنگڵ کردن و تووکەبەر تاشین) یش کە سەرجەم زانایان تەنانەت (ابن حزم)[146]یش دەڵێن سوننەتن و کارێکی خێرو(تطوع)ن، من پێم سەیرە و ڕام وایە ئەگەر ئەو زاناو پێشەوا بەرز و پایەبڵندانەمان[147] وێنەو بیچمی کەسێکیان هێنابایە بەرچاو کە بۆماوەیەکی زۆر نینۆك و.. هتد یان نەکردبێ، وایان نەدەگوت و ئەوانیشیان وەك گەلێك شتی دیکەی پێویست بە پێویست دادەنا[148].

---

[144] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٥٧ ، ٣٥٨ وێڕای پەراوێزی (محقق)ەکە.

[145] بڕوانە (المحلی) ج٢ ص ١٣٨.

[147] بڕوانە (المغنی) ج١ ص ٧٠-٧٢، وە بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٣٥٢ و ٣٥٥ و ٣٥٦.

[148] بەڵگەشم ئەوەیە کە وشەی (فطرة) و (سنة) فەرز و پەسەند دەگرنەوەو هەرکام لەو شتانەش ئەگەر ئینسان ئەنجامیان نەدات ئەنجام و ئاکامی حەرامیان لێ‌دەکەوێتەوە وەك پیس و پۆخەڵی و بۆن و بەرامەی ناخۆش و دیمەن دزێوی و نەخۆشی و دەرد.

(نووي) گوتوویەتی[150]: {مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە ئەو جۆرە شتانە لە کاتی خۆیان دوانەخەن، وە ئەگەر دوایان خستن لە چل شەو تێنەپەڕێ‌نەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە بە موتڵەقی مۆڵەتی دواخستنیانیان درابێت}، وە وا باشە لەمیانەی هەفتەدا ئەنجام بدرێن[151].

بۆ سیواك کردنیش ئەوە لە فەرموودەکان دا دیاریی‌کراوە کە لەکاتی هەر نوێژێك یان هەر دەستنوێژێك دا بکرێ، بەلای کەمەوە: (عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ) متفق عليه عن ابي هريرة، (مَعَ كُلِّ وضُوءٍ) رواه ابن خزيمة والحاكم و صححاه، بەلام بێگومان جگە لەو کاتانەش هەر سوننەتە، چونکە عائیشە خوا لێی ڕازی‌بێ گێراویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەهاتەوە ماڵ یەکسەر سیواکی دەکرد: (كان إذا دَخَلَ بَيْتَهُ يَبدأُ بالسِّواكِ) رواه مسلم و اصحاب السنن الا الترمذي.

دیارە کاتی سروشتی و گونجاوی ئاو لە زار و لووت وەردان و گرێ و جومگەی پەنجەکان شۆردنیش کاتی دەستنوێژگرتنە، وەك لە باسی دەستنوێژگرتن دا دەیخەینەڕوو.

بۆ کاتی خەتەنەکردنیش زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە لە کاتی حەوتووچوونی منداڵی مەلۆتکەدا بێ و ئەگەر دواتریش بێ هەر دەگونجێ[152]، بەلام زۆربەی زانایان بە حەرامی دەزانن کە بخرێتە پاش باڵغ بوونەوە[153].

***کۆتایی ئەم باسەش بەم چەند وردە تێبینی‌یە دێنین:***

١)هەڵکێشانی مووی سپی لە ڕیش و سەر حەرامە[154] یان لانی کەم ناپەسندە و لەوبارەشەوە چەند فەرموودیەك هەن کە ئەمە یەکێکیانە:

*(لا تَنْتِفُوا الشَّيْبَ فَانَّهُ نُورُ المُسْلِمِ يَوْمَ القِيامَةِ) رواه اصحاب السنن و حسن الترمذي عن عمر و بن شعيب عن ابيه عن جده عن النبي ﷺ واتە: مووی سپی هەڵمەکێشن چونکە لە ڕۆژی قیامەت دا ڕووناکیی‌یە بۆ مسوڵمان.

---

[150] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٣٥٣.

[151] بەتایبەت نینۆك کردن و بەرسمێڵ، بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٣٥٣.

[152] بڕوانە: (المجموع) ج ٣٦٧ ، ٣٦٨.

[153] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

[154] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٣٥٩.

٢)هەرکاتێك ئینسان مووی سەری هێشتەوە فەرزە یان لانی کەم سوننەتە خزمەتی بکات بەڵام بەبێ زیادەڕۆیی لەبەرئەم فەرموودانە:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال مَنْ كانَ لَهُ شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ) رواه ابوداود باسناد حسن. واتە: هەرکەسێك قژی هەبوو با ڕێزی بگرێ. (مەبەستی خزمەت کردنیەتی بەهۆی داهێنان و چەورکردن و بۆنخۆشکردنیەوە).

*(عن عبدالله بن مغفل رضي الله عنه أنّ رسولَ الله ﷺ نَهى عَنْ التَّرَجّلِ الاّ غِبّاً) رواه احمد و اصحاب السنن الا ابن ماجة و قال الترمذي: حديث صحيح. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەر شانەکردنی قەدەغەکردوە مەگەر بەین بەین. (واتە نابێ مسوڵمان هەمیشە خەریکی سەرو ڕیشی بێت و هەر خەریکی دەست بەخۆدا هێنان بێت)[155].

٣)زۆربەی هەرەزۆری[156] زانایان ڕەنگ کردنی سەروڕیشی سپی بە ڕەنگی گونجاو وەك زەرد و قاوەیی بە سوننەت دەزانن[157]، بەڵام بە ڕەنگی ڕەش بە حەرام یان بەلای کەمەوە بە ناپەسەند (مکروه) دەزانن[158] بەڵام لە حاڵەتی جەنگ و جیهادا بە دروست (جائز) دەزانن[159]، هەندێکیشیان ڕەنگ کردنی سەرو ڕیشی سپی بە سوننەت نازانن و دەڵێن واز لێهێنانیان چاکترە[160]، هەروەها هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە کە ڕەنگی ڕەشیش هەر دروستە[161]، وە ڕەنگی ڕەش بەکارهێنان لە: (عثمان بن عفان و الحسن والحسين ابني علي و عقبة بن عامر و ابن سيرين و ابي بردة) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاوەتەوە[162].

---

[155] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٣٦٠، پەراوێزی (محقق)ەکە.

[156] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ٣٦٠.

[157] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

[158] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٣٦٠ ، ٣٦١، پەراوێز.

[159] هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

[160] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٣٦١. پەراوێز.

[161] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٣٦١، پەراوێزی (محقق).

[162]

*ئەمەش چەند دەقێك كە زۆربەی زانایان بۆ دەربڕینی ڕایەكانیان لەوبارەوە پشتیان پێبەستوون:*

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إنّ اليَهُودَ والنّصارىٰ لا يَصْبِغُونَ فَخالِفُوهُمْ) رواه البخاري و مسلم و اصحاب السنن الا ابن ماجة واحمد. واتە: جوولەكە و دیانەكان – سەروریشی سپی بوویان – ڕەنگ ناكەن، جا ئێوە پێچەوانەی ئەوان بكەن؛ ئەمە بەڵگەی سوننەت بوونی ڕەنگ كردن.

*بەڵگەی حەرامی‌ی ڕەنگی ڕەشیش ئەم دەقەیە.*

*(عن جابر رضي الله عنه قال: أُتِيَ بِأَبيّ قُحافَةَ والِدِ أبي بَكْرٍ الصدّيقِ رَضِيَ الله عنهما يوم فَتْحِ مَكّةَ و رَأْسُهُ و لِحْيَتُهُ كالثّغامَةِ بَياضاً فقال رسول الله ﷺ غَيِّروا هٰذا و اجْتَنِبُوا السّوادَ) رواه مسلم و اصحاب السنن الا الترمذي.

واتە: ساڵی ئازادكرانی شاری مەككە (ابو قحافة) بابی (ابوبكر الصديق) هێنرا كە سەرو ریشی وەك (ثغامة)[١٦٣] سپی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم – سەر و ریشە سپی–ە بگۆڕن بەڵام خۆتان لە ڕەنگی ڕەش دوور بگرن.

هەروەها ئەم دەقەشە:

*(عن ابن عباس رضی الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ: يكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ في آخِرِ الزّمانِ بِالسّوادِ كحواصِلِ الحَمَامِ لايُرِيْحُونَ رائِحَةَ الجَنّةِ) رواه ابوداود والنسائي.

واتە: كۆمەڵێك لە كۆتایی دنیادا – سەروریشی سپی خۆیان – بە ڕەنگی ڕەش ڕەنگ دەكەن وەك سینگی كۆتر – ی ڕەش – جا ئەوانە بۆنی بەهەشت ناكەن.

شایانی باسیشە كە زۆربەی[١٦٤] هەرەزۆری زانایان ڕایان وایە كە ژن و پیاو لەو مەسەلەیەدا وەك یەكن، بەڵام (اسحاق بن راهويه) ڕای وایە كە بۆ ژن دروستە مادام بۆ مێردی خۆی خۆی جوان بكات[١٦٥].

---

[١٦٣] ثغامة: رووەكێكە گوڵێكی زۆر سپی دەردەكات. بڕوانە (المعجم الوسيط) ص٩٧.

[١٦٤] بڕوانە: (المجموع) ج١ ص ٣٦٠ تا ٣٦٢.

[١٦٥] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەرە

٤) زۆربەی هەرەزۆری زانایان ڕایان وایە کە هەرکام لە هێشتنەوە و کورت کردنەوە و تاشینی سەر بۆ پیاوان دروستن، وە وا پەسەندە ئەگەر هێشتیەوە ڕێکی بخات و هەڵی بداتەوە نەک لێی بگەڕێ وەك خۆی بێتەخوارێ، بەلام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پەڵە تێخستن واتە تاشینی هەندێکی و هێشتنەوەی هەندێکی حەرام یان لانی کەم ناپەسەندە کە لە سوننەت دا (قزع) ی پێدەگوترێ[١٦٦].

ئەو دەقانەش کە لەوبارەوە بەبەڵگە هێنراونەوە ئەمانەن:

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: نَهىٰ رَسولُ اللهِ ﷺ عَنِ القَزَعِ) رواه البخاري و مسلم و احمد و أصحاب السنن الا الترمذي.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: رأىٰ رسولُ اللهِ ﷺ صَبياً قَدْ حلَقَ بعْضُ شَعْرِه و تُرِكَ بعْضُهُ فنَهاهُمْ عَنْ ذٰلِكَ و قال: إحْلِقوهُ كُلّهُ أو أتْرُكوهُ كُلَّه) رواه ابوداود والنسائي واحمد و ابن حبان باسناد صحيح على شرط الشيخين.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕۆکەیەکی دی بەشێکی سەری تاشرابوو، وە بەشێکی هێڵرابۆوە، جا ئەوەی لێ قەدەغەکردن و فەرمووی: یان هەمووی بتاشن یان هەمووی بهێڵنەوە.

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما كان أهل الكتاب يَسْدلونَ أشْعارَهُمْ، و كانَ المشْرِكونَ يفرِقونَ رؤُسَهُمْ و كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ موافَقَةَ أهْلِ الكتابِ فيما لَمْ يؤْمَرْ بِهِ، فَسَدَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ ناصِيَتَهُ ثُمَّ فرَقَ بعْدَه) متفق عليه.

واتە: خاوەن کتێبەکان عادەتیان وابوو قژیانیان وەك خۆی بەردەدایەوە، وە هاوبەش دانەرەکان سەریان هەڵدەدایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ مەگەر لە شتێك دا کە فەرمانی پێکرابایە دەنا پێی خۆش بوو وەك خاوەن کتێبەکانی کردبایە، جا لەسەرەتاوە پێغەمبەری خوا ﷺ قژی پێشەسەری بەردەدایەوە بەلام دوایی هەڵیدایەوە.

٥) وە تێکڕای زانایان لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون کە ئافرەت بۆی هەیە و سوننەتیشە کە دەست و پێی خۆی بە خەنە (حناء) ڕەنگ بکات بۆ مێردی خۆی، بەلام بۆ پیاوان مەگەر لەبەر چارەسەر (علاج) ئەگەرنا دروست نیە چونکە جۆرێکە لە خۆبە ژنان چواندن کە قەدەغەکراوە، هەروەها ئەو جۆرە بۆنانەی کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە وەك زەعفەران و خەلووق دیسان بۆ پیاوان حەرامن[١٦٧]، لەبەر هەمان هۆ

---

[١٦٦] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص ٣٦٣ ، ٣٦٤.

[١٦٧] بڕوانە، (المجموع) ج١ ص ٢٦٢ ، ٢٦٣.

واتـه: لەبـەر خـۆ بـەئافرەتان چوانـدن (التَشَبُه بالنِساءِ) ئەمـەش چـەند دەقێکـی سوننەت لەوبارەوە:

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ أُتيَ بمخنثٍ قَدْ خَضَبَ يديـه و رِجْلَيْه بالحناءِ فقال: ما بالُ هذا؟ فقيل: يا رسول الله يَتَشَبَّه بالنِّساءِ! فأمَرَ بِه فَنُفِيَ الى النَقيْعِ، فقالوا يا رسـول الله أَلا نَقْتُلُه؟! فقال: إنّي نُهِيْتُ عَنْ قَتْلِ المُصَلِّين) رواه ابوداود.

واتـه: پیاوێکی سەرژنانەیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ کە دەست و لاقی خۆی بە خەنە ڕەنگ کردبوو، فەرمووی: ئەوە بۆ وایکردوە؟ گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا خۆی بە ژنان دەچوێنـێ! جا فـەرمانی کرد کە بۆ (نقیـع)* دوور بخرێـتەوە، گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوا ئەیکوژین؟ فەرمووی: کوشتنی نوێژکەرانم لێقەدەغەکراوە.

*(عن أنس رضي الله عنه أن النبيَّ ﷺ نَهى أنْ يَتَزَعْفَرَ الرَجُلُ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە پیاو زەعفەران لەخۆی بدات.

*(عن يعلى بن مرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ رأىُ رجلاً عليـه خَلوقٌ، فقـال: إذْهَبْ فاغسِله ثُم لا تعدْ) رواه ابوداود والترمذي و حسنه. واتـه: پێغەمبـەری خوا ﷺ پیاوێکی دی خەلووقی[168] پێوەبوو، فەرمووی: بڕۆ بیشۆ وە پاشان بیشۆوە. ئینجا دووبارەی مەکەوە.

*دیارە هەرجۆرە بۆن و ڕەنگ لەخۆدان و هەڵس و کەوتێکی دیکەش کە ژنانە بێ و تایبەت بێ بەوانەوە هەمان حوکمی هەیە، هەروەها بەپێچەوانەشەوە هـەرجۆرە شتێك و هـەڵس و کەوت و ڕەفتارێك کە پیاوانە بێ و تایبـەت بێ پێیانەوە بۆ ئافرەتـانیش حەڕامە، بەکورتی:

لەسەر هەرکام لە پیاوان و ژنان حەڕامە کە خۆیان بەیەکتر بچوێنن لەهـەر هـەڵس و کەوت و ڕەفتارێك جا کە تایبەت بێ بەیەکێکیانەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لەو جۆرە ژن و پیاوانە کردوە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنـهما قـال: لَعَنَ رسـولُ الله ﷺ المتَشَبِّهيْنَ مِنَ الرِّجـالِ بالنِّسـاءِ والمتَشَبِّهاتِ مِنَ النِّساءِ بالرِّجالِ) رواه البخاري و اصحاب السنن الا النسائي و قال الترمذي: حسن صحيح. واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەعنەتی لـەو پیاوانەکردوە کە خۆیـان بە ئافرەتـان دەچوێنن، وە لەو ئافرەتانە کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

---

[168] (خَلوق) یان (خَلاق) جۆرە بۆنێکی ڕەنگدارە کە لە چەند شتێك پێك دێ یەکێکیان زەعفەرانە و تایبەتە بە ئافرەتانەوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط)

# خـۆشـۆردن ( الغسل )

مەبەسـتمان لـە خۆشـۆردن لـێرەدا خۆشـۆردنە بـۆ لابردنـی لـەش پیسـی، جـا لەبەرئەوەی لە برگەی سێیەم دا بە درێژی باسی هۆیەکانی لەش پیسی (جنابة)مان کردوە، هەروەها باسی ئەو شتانەمان کردوە کە لـە سـۆنگەی لـەش پیسـییەوە لـە ئینسان حەرام دەبن، دیسان باسی حوکمی لابردنی لەش پیسی و هۆی لابردنیمان کردووە، لێرە دووبارەیان ناکەینەوە یەکسەر دەچینە سەر باسی خۆشۆردن کە هۆی ئەسڵی و بنەڕەتی لابردنی لەش پیسییە و لە برگەی حەوتەمیش دا – خوا یاربێ – باسی تەیەمموم دەکەین کە جێدار (بدیل) ی هەرکام لە خۆشۆردن و دەستنوێژگرتنە لەکاتی نەبوونی یان نەلوانی بەکارهێنانی ئاودا.

ئەم برگەی پێنجەمەش لەم خاڵانە پێك دێ:

یەك: خۆشۆردن چییە و پایەکانی چین.

دوو: چۆنیەتی خۆشۆردنی پیاو و ئافرەت.

سێ: خۆشۆردنە فەرزەکان و سوننەتەکان.

چوار: چەند وردە تێبینییەك دەربارەی خۆشۆردن.

## یەك: خۆشۆردن چییە و پایەکانی چین؟!

خۆشۆردن (الغَسْل، الغُسْل) بریتیە لە ئاو پێداکردن و ئاوپێگرتنەوەی سەرتاپای جەستە، واتە سەرجەم ئەندامە ڕواڵەتییەکانی.

پایەکانی خۆشۆردنیش دووانن:

١)نیاز و مەبەست هەبوون (النیة) کە جیاکەرەوەی عیبادەت و عادەتە لە یەکتر و شوێنەکەیشی دڵ و دەروونە و هیچ پەیوەندی بە زمان و دەربڕینەوە نیە، وەك خوا یاربێ لە نیەت هێنانی نوێژدا بە وردی ڕوونی دەکەینەوە. بەڵگەی فەرزبوون یان مەرج بوونی نیەتیش بـۆ دامـەزران و قبـووڵ کرانـی هـەر کردەوەیـەکی خـێر و چاکـە ئـەم فەرموودەیەیە:

*(عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقولُ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بالنِّيَاتِ وإنَّما لِكُلِّ امْرِئٍ ما نَوىٰ..) متفق عليه.

واتـە: بێگومـان هـەموو کـردەوە – چاکـە – کـان بـەگوێرەی نیـاز و مەبەسـتەکان وەردەگیرێن؛ وە بێگومان هەرکەسێك بەپێی نیاز و مەبەستەی پاداشتی هەیە.

٢)شۆردنی هەموو ئەندامە ڕواڵەتی‌یەکانی جەستە، چ بەشێوەی ئاو بەخۆداکردن وە چ بەشێوەی خۆ لە ئاودا نقووم کردن.

ئەمە ڕای زۆربەی[١٦٩] هەرەزۆری زانایانە و هەموویشیان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر بابای خۆشۆر(مُغْتَسِلْ) پیسی‌یەك لەسەر جەستەی هەبوو پێویستە بەر لە خۆشۆردن لای بەرێ[١٧٠].

بەڵام هەندێك لە زانایان – وەك (مالك و المُزَني) دەست پێداهێنان (دَلْك) ی ئەندامەکان هەم بۆ خۆشۆردن و هەم بۆ دەستنوێژیش بە فەرز دەزانن[١٧١]، جا هەرچەندە زۆربەو جەماوەر بەس بە سوننەتی دەزانن، بەڵام واپێدەچێ ئەگەر بەبێ دەست پێداهێنان جەستە باش تەڕ نەبێ، دەست پێداهێنان (دلك)ی ئەندامەکان فەرز بێت، چونکە تەڕبوونی سەرتاپای جەستە فەرزە.

هەروەها سەرجەم زانایان – وەك دواتریش باسی دەکەین – دەستنوێژگرتن لە پێش خۆشۆردن دا بە فەرز نازانن و بەس بە سوننەت و پەسەندی دەزانن، بەڵام (ابوثور و داود الظاهري) بە پێویستی دەزانن و (طبري)یش یەکدەنگی زانایان (اجماع العلماء)ی نەقڵ کردوە لەسەر فەرز نەبوونی[١٧٢].

هەرچەندە دەعوای فەرزبوونی دەستنوێژ پێش خۆشۆردن بەڵگەیەکی وای لەسەرنیەو ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترو بەڵگەدارترە، بەڵام دەعوای یەکدەنگی زانایانیش وێڕای هەبوونی ڕای جیا لەلایەن دوو کەڵە زانای وەك (ابوثور و داود)ەوە دیسان دەعوایەکی لاوازو بێ بەڵگەیە.

هەروەها هەندێکیش لەزانایان ئاو لەزارو لووت وەردانیش بۆ خۆشۆردن بەفەرز دەزانن، بەڵام ڕای سوننەتو پەسەندبوونیان کەڕای زۆربەی زانایانە بەهێزترە[١٧٣].

---

[١٦٩] بڕوانە: (المجموع) ج٢ ص ٢١٤، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج١ ٥٢٢ تا ٥٢٧

[١٧٠] بڕوانە: (المهذب) للشيرازى لە (المجموع) ج٢ ص ٢٠٩.

[١٧١] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٨٩ ، ٩٠ وە بڕوانە (المجموع) ج٢ ص ٢١٤.

[١٧٢] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ ص ٣٠٦ ، ٣٠٧، وە: (المجموع) ج٢ ص ٢١٤.

[١٧٣] بڕوانە: (الفقه الاسلامى) ج١ص٥٢٦، وە بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٩٠.

## دوو: چۆنیەتی خۆشۆردنی پیاوو ئافرەت

دەربارەی چۆنیەتی خۆشۆردن و لەش پیسی لەخۆدەرکردن هەرکام لە (عائشة و میمونة) دایکانی بڕواداران خوالێیان ڕازی بێ چەند دەقێکیان لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاونەوە کە بەوردی چۆنیەتی خۆشۆردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوون دەکەنەوە بەهەموو ئەو شتانەوە کەفەرز یان پەسەندن لەخۆشۆردن دا، ئەمەش دوو دەقی سەرەکی لەوبارەوە:

*(عن عائشة رضي الله عنها (ﷺ) ان النبي كان اذا اغْتَسَلَ مِنَ الجنابة يَبْدأُ فيغْسِلُ يَدَيْه، ثم يُفْرِغُ بِيَمِيْنه علىٰ شِمالِهِ فيغسلُ فرْجَهُ، ثم يَتوضأُ وضُوْءَهُ للصَّلاة، ثم يأْخُذُ الماءَ وُيدْخِلُ أَصَابِعَهُ في أُصُولِ الشَّعر حتَّى اذا رأَىٰ أَنْ قَد استَبْرأَ حَفَنَ علىٰ رأْسِه ثَلاثَ حَثَيات ثم أَفاضَ علىٰ سائِر جَسَدِه ثم غَسَلَ رِجْلَيْهِ (وفي رواية أُخرىٰ) ثم يُخَلِّلُ بِيَدَيْه شَعْرَهُ حتَّى إذا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوىٰ بشرَتَهُ أَفاضَ عَلَيْهِ الماءَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ) متفق عليهما.

واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کەخۆی لەلەش پیسی دەشۆرد بەشۆردنی هەردووك دەستی دەستی پێدەکرد، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکردە دەستی چەپی و داوێنی خۆی دەشۆرد، ئنجا وەك دەستنوێژی نوێژ دەستنوێژی دەگرت، پاشان بە چەنگی ئاوی دەگرت و قامکەکانی دەخستە بنی مووەکانی سەرییەوە، جا کاتێك دڵنیا دەبوو کەقژی تەڕبووە سێ مستی بەسەری خۆیدا دەکردن، پاشان ئاوی بەسەرتاپای جەستەی خۆیدا دەکرد، ئنجا لەکۆتاییدا - هەردووك لاقی خۆی دەشۆرد، (وەلە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە) پاشان بەهەردووك دەستی پەنجەکانی دەخستە بنج و نێوان مووەکانییەوە، جا کاتێك دڵنیا دەبوو کەپێستی -سەری - ئاوی گەیوەتێ سێ کەڕەتان ئاوی بەخۆیدا دەکرد.

*عن ميمونة رضي الله عنها قالت: وَضَعْتُ لِلنَّبيِّ ﷺ ماءً يغْتَسِلُ بِه فأَفْرَغَ علىٰ يَدَيْه فغسلَهُما مرَّتين أو ثَلاثاً، ثم أفْرَغ بِيَمِيْنِهِ علىٰ شِمالِهِ فَغَسَلَ مَذاكِيْرَهُ، ثم دَلَكَ يَدَهُ بالأَرْضِ ثم مَضْمَضَ، وٱستَنْشَقَ، ثم غَسَلَ وَجْهَهُ ويَدَيْه، ثُمَّ غَسَلَ رأْسَهُ ثلاثاً، ثم أفرَغَ علىٰ جَسَدِهِ ثم تَنحَّى مِنْ مَقامِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْه، قالت: فأتَيْتُهُ بخِرْقَةٍ فلَمْ يُرِدْها وَجعلَ يَنفُضُ الماءَ بِيَدِه) متفق عليه.

واتە: ئاوێکم بۆ پێغەمبەر ﷺ دانا کەخۆی پێ بشوات، جا ئاوی بەهەردووك دەستیدا کردو دوو یان سێجار شۆردنی، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی کردە دەستی چەپیەوەو گەڵو گونی خۆی شۆری، ئنجا دەستی بە زەوی خشاند، (بۆ ئەوەی چاك خاوێن بێتەوە) دوایی ئاوی لەزاریو لووتی وەردا، پاشان ڕوو و هەردووك دەستی (وێڕای ئانیشکەکانی) شۆری، ئنجا سێجار سەری شۆری، پاشان ئاوی بەجەستەی خۆیدا کرد، وە لەکۆتاییدا لەو جێیەی لێی بوو لاچوو وە پێیەکانیشی شۆری، (میمونة) گوتوویەتی: وەپارچە پۆشاکێکم بۆ هێنا نەیویست، وەبەدەستی ئاوی لەخۆی دەکردەوەو دادەشۆری.

پێم وایە پاش ئەم دوو فەرموودەیەش پێویست بەهیچ ڕوونکردنەوەی دیکە ناکات، بەڵام دەربارەی خۆشۆردنی ئافرەت دوو تێبینی پێویستن:

١-خۆشۆردنی ئافرەتیش بەڕای تێکڕای زانایان کتومت وەك هی پیاو وایەو هیچ جیاوازییان نیە[١٧٤].

٢-زانایان لەوبارەیەوە کەئایا ئافرەتان بۆ خۆشۆردن لەسەریان پێویستە ئەگەر پرچیان هۆنیبێتەوەو کردبیان بەکەزی (ضفيرة) کەزییەکەیان بکەنەوە یان نا؟ ڕایان جیاوازەو (نووي) گوتوویەتی[١٧٥]:(زۆربەیان ڕایان وایە کە ئەگەر بەبێ کردنەوەی کەزییەکانیان پێستی سەریان تەڕببێ ئەوە کردنەوەی ناوێ، ئەگەرنا دەیەوێ، هەندێکیش لەزانایان ڕایان وایە کە بەموتڵەقی کردنەوەی پرچی هۆنراوە پێویستەو هەندێکیش بەپێچەوانەوە ڕایان وایە کە بەموتڵەقی پێویست نیە).

منیش پێم وایە بەسەرنج دانی دەقەکانی سوننەت لەوبارەوە هیچ ئیشکالمان نامێنێو دڵنیا دەبین کەڕای سێیەم لەڕایەکانی دیکە ڕاست ترو بەڵگەدارترە[١٧٦]، چونکە:

---

[١٧٤] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢١٤، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٨١، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ص٢١٨، ٢١٩.

[١٧٥] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢١٥، ٢١٦.

[١٧٦] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج١ص٣١٢، ٣١٣، وە بڕوانە: (المُحلّى) ج٢ص٢٨، ٢٩. بەڵام (ابن حزم) بەس بۆ خۆشۆردنی (جنابة) بەفەرزی نازانێ.

ا-(ام سلمة) خوالێیڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە بە پێغەمبەری ﷺ گوتووە: من ژنێکم قـژم بەکـەزی دەهۆنمـەوە جـا ئایـا بـۆ خۆشـۆردن و لـەش پیسـی لـەخۆدەرکردن کەزییەکانم بکەمەوە؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (لا إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِيَ عَلَى رَأْسِكِ ثَلاثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ فَتَطْهُرِينَ) رواه مسلم واحمد و اصحاب السنن. ([177])

واته: نەء (پێویست ناکات کەزییەکانت بکەیەوە) بەڵکو ئەوەندەت بەسە کەسێ مستان بەسەری خۆت دا بکەی (و سەروپرچت هەڵگوشی تاکو باش تەڕبێت) پاشان ئاو بەخۆتدا بکەی و پاك دەبیەوە.

ب- (عبيد بن عمير) دەگێڕێتەوە کە (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ بیستی کە (ابن عمر) خـوا لێیـان ڕازی بـێ فـەرمان بـەئافرەتان دەکـات کـە لـەکاتی خۆشـۆردن دا کەزییەکانیان بکەنەوە ئەویش بەسەرسوورمانەوە گوتی: (يَا عَجَبًا لابْنِ عُمَرَ وَهُوَ يَأْمُرُ النِّسَاءَ إِذَا اغْتَسَلْنَ بِنَقْضِ رُؤُسِهِنَّ: أَوَمَا يَأْمُرُهُنَّ أَنْ يَحْلِقْنَ رُؤُسَهُنَّ! لَقَدْ كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ وَمَا أَزِيدُ عَلَى أَنْ أُفْرِغَ عَلَى رَأْسِي ثَلاثَ إِفْرَاغَاتٍ) رواه احمد ومسلم.

واته: ئای لە (ابن عمر) چەند سەیرە کە فەرمان بەئافرەتان دەکات کە خۆیان شۆری قژی سەریان بکەنەوە! ئەدی پێشیان ناڵێ سەریشیان بتاشن!! ئاخر من و پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەك دەفردا خۆمان دەشۆردو لەوە زیاترم نەدەکرد کەسێ کەرەتان ئاوم بەسەری خۆمدا دەکرد.

شایانی باسیشە کە هەندێك لەزانایان جیاوازییان خستۆتە نێوان خۆشۆردن بۆ لابردنی بێنوێژی (حیض) و خۆشۆردنی لەش پیسی و گوتوویانە، بۆ حەیز پێویستە کەزییەکانی بکاتەوە بەڵام بۆ لەش پیسی (جنابة) پێویست ناکات! بەڵام لەڕاستیدا بەڵگەیەکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نیە کەبایی ئیسپاتی قسەکەیان بکات[178].

---

[177] بۆ ئاگاداری خاوەنی (فقه السنة) ئەو فەرمودەیەی وا هێناوە کە (ام سلمة) لەئافرەتێکی دیکەی بیستووە بەڵام وا نییەو ڕاستەوخۆ قسەی خۆیەتی، بڕوانە: ج١ص٨١.

[178] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج١ص٣١٢.

## سێ: خۆشۆردنە فەرزەکان و خۆشۆردنە سوننەتەکان

پێشتر باسی هۆی خۆشۆردنە فەرزەکانمان کرد لەبڕگەی سێیەم دا کە ئەم حەوتەن:

١-تۆو هاتنەوە بەئارەزووەوە.

٢-پێکەوە جووت بوونی ژن و مێردو بائاویشیان نەیەتەوە.

٣-ئیحتیلام بوون لەگەڵ هەبوونی نیشانەیەك دا.

٤، ٥ -کۆتایی پێهاتنی بێنوێژی و زەیستانی.

٦-مسوڵمان بوون.

٧-مردن.

بەڵام خۆشۆردنە سوننەتەکان هەرچەندە هەندێك لەشەرعزانان (فقهاء) بۆ وێنە (نووي) لە (المجموع)[١٧٩] دا ژمارەیەکی زۆریان ڕیزکردوون، بەڵام بێگومان حوکمی شەرعی (واتە بەفەرز یان سوننەت یان حەرام یان ناپەسەند زانینی کردەوەیەك) بەبێ بەڵگەی قورئان و سوننەت ناچەسپێ، بەتایبەت لەبواری خوداپەرستییە ڕووتەکان (العبادات المحضة)دا، بۆیە ئێمە تەنیا ئەو خۆشۆردنانە دەنووسین کەبەڵگەیەکی شەرعی یان لەسەر هەبێ:

### ١-خۆشۆردنی ڕۆژی جومعە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن، واتە: ئەگەر یەکێکتان هاتە نوێژی جومعە باخۆی بشوات.

کەپێشتریش باسمان کردوەو ئاماژەشمان بەوەکردوە کەژمارەیەك لەزانایان ئەو خۆشۆردنەی ڕۆژی جومعە بەپێویست (واجب) دەزانن و واش پێدەچێ ڕایەکەیان لەڕای ئەوانە بەهێزتر بێت کەبەس بەپەسند (تطوع)ی دەزانن[١٨٠].

### ٢و٣ - خۆشۆردن بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان:

لەبارەی خۆشۆردن بۆ نوێژی دوو جەژنەکان چەند دەقێك لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراونەوە کە لەمەحەکی فەرمودەناسان (محدثین) سەلامەت دەرنەچوون و بێهێز (ضعيف) یان داناون[١٨١]، بەڵام چەند هەواڵێکی ڕاست لەوبارەوە لەهاوەڵانەوە خوالێیان ڕازی بێ هاتوون بۆ وێنە:

---

[١٧٩] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص ٢٣١ تا ٢٣٣، (فصل: في الأغتسال المسنونة).

[١٨٠] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٢٩٢، ٢٩٣.

[١٨١] بڕوانە: هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٩٧.

*(عن نافع أن عبدالله بن عمر كان يَغْتَسِلُ يَوْمَ الفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ الىُ المُصلَّـى) رواه مالك في (الموطا)[182].

واتـه: عـەبدوڵڵای کـوڕی عومـەر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) عـادەتی وابـوو ڕۆژی جـەژنی ڕەمەزان بەرلەوەی بچێتە نوێژگە خۆی دەشۆری.

٤-خۆشۆردن بەهۆی مردووشۆرینەوە:

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی

* (مَنْ غَسَّلَ المَيِّت فَلْيَغْتَسِلْ، وَمَنْ حَمله فَلْيَتوضأ) رواه اصحاب السنن الا النسائي عن ابي هريرة.

واتە: هەر کەسێك مردووی شۆری باخۆی بشوات، وەهەر کەسێکیش هەڵیگرت با دەستنوێژ بگرێ.

بۆیەش زانایان بەفەرزیان نەزانیوە چونکە فەرموودەی دیکە هەیـە دەقـە لەسـەر سوننەت بوونی: (ليس عليكم في غَسْلِ ميتكمْ غُسْلُ اذا غَسَّلتموه فَـانَّ ميتكُـمْ لَيْـس بِنَجِس فَحَسْبُكُمْ أَنْ تَغْسِـلوا أَيْدِيكُـمْ) رواه البيـهقي والحـاكم عن ابـن عبـاس وهـو حديـث حسـن[183].

کەماناکەی ئاسانو ئاشکرایە.

٥-خۆشۆردنی بابای لەهۆش چوو پاش هۆشیار بوونەوەی:

یەکی دیکە لەخۆشۆردنە سوننەتەکان ئەوەیە کەئینسـان پـاش هاتنـەوە هۆشـی دوای لـەخۆچوون خـۆی بشـوات، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەنەخۆشـی مـەرگیدا سێجار پاش هاتنـەوە هـۆش خـۆی شـۆردوە، وەك (بخاري و مسلم) لـە (عائشة) يـان گێڕاوەتەوە لەفەرموودەیەکی درێژدا[184].

٨،٧،٦- خۆشۆردن بۆ ئیحرام بەستنو چوونە شاری مەککەوەو ڕاوەستان لەعەرەفات:

لەوبارەشەوە چـەند شـوێنەوارێك لـەهاوەڵان (اصحـاب) ەوە خـوا لێیـان ڕازی بـێ گێڕراونەوە، بۆ وێنە:

*(عن جعفر بن محمد عن ابيه ان عَليّاً رضي الله عنه كان يَغْتَسِلُ يَوْمَ العِيْدَيْن، وَيَوْمَ الجُمُعَةِ ويوم عَرَفَةَ واذا أَرادَ أَنْ يُحْرِمَ) رواه الشافعي، واتـە: عـەلی خـوا لێـی ڕازیبێ عادەتی وابـوو ڕۆژی دوو جەژنەکانو ڕۆژی جومعەو ڕۆژی عەرەفەو کە دەیویست ئیحرام ببەسـتێ خۆی دەشۆری.

---

[182] بڕوانە: (الموطا) ص١٤٧.

[183] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص٣٩.

[184] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٣٠٥، ٣٠٦ کە فەرموودەی ناوبراوی بەتەواوی هێناوە.

* (عن ابن عمر رضي الله عنه انه كان لايَقْدِمُ مكّةَ إلاّ باتَ بذِيْ طوىً حتّى يُصْبِحَ ويَغْتَسِلَ ثم يَدْخُلَ مكة نَهاراً، ويَذْكُرَ عَنِ النبيِّ ﷺ أنّه فَعَلَهُ) رواه مسلم والبخاري بمعناه

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لەخۆیو بابی ڕازی بێ عادەتی وابوو نەدەچووە نێو شاری مەککەوە هەتا لە (ذي طوى) شەوێ نەمابایەوەو پاشان بەیانی دەکردەوەو خۆی دەشۆرد، ئنجا بەڕۆژ دەچووە مەککەوە، وە باسی دەکرد کە پێغەمبەریش ﷺ هەروای کردوە.

## چوار: چەند وردە تێبینییەك دەربارەی خۆشۆردن

### ١-زیادەڕۆیی نەکردن لەبەکارهێنانی ئاودا:

زانایان سەرجەم لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە زۆر بەکارهێنانی ئاو بۆ خۆشۆردنو دەستنوێژ حەرام یان بەلای کەمەوە ناپەسەندە ئەگەر ئینسان لەسەر ڕووباریش بێت[185]، لەوبارەشەوە فەرموودە زۆرن بۆ وێنە:

*(عن انس رضي الله عنه كانَ النبيُّ ﷺ يَغْتَسِلُ بالصّاعِ الىٰ خَمْسةِ أَمْدادٍ ويَتَوَضّأُ بِالمُدِّ) متفق عليه، واتە: پێغەمبەر ﷺ بەصاعێك ئاو تا پێنج مست خۆی دەشۆری و بەمستێکی دەستنوێژی دەگرت.

> **تێبینی:**
> مست (مد)ێك (٥٤٤) گرامە، کەواتە: ٤×٥٤٤ = ٢,١٧٦گرام، چونکە (صاع)ێك چوار مستە، کە دەکاتە دوو کیلۆو سەدو حەفتا و شەش گرام[186].

### ٢- بەڕووتی خۆشۆردنی پیاو لەنێو پیاوانو ئافرەت لەنێو ئافرەتان دا حەرامە:

چونکە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دروست نیە بێجگە لەژنو مێرد هیچ کەس عەورەتی یەکدی ببینن، بەڵام ئەگەر شوێنەکە چۆڵو خاڵی بوو ئەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایان بەدروست (جائز)ی دەزانن، ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

---

[185] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٣١٤تا٣١٧، وە بڕوانە: (فتح الباري) ج١ص٣١٣.

[186] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١٢٣، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج١ص١٤٢.

* (إِحفظْ عورَتكَ إلاّ مِنْ زَوجَتِكَ أَو ماملَكَتْ يَمِينُكَ) رواه اصحاب السنن وحسنه الترمذي عن بهز بن حكيم بن معاوية بن حيده عن ابيه عن جده.

*واتـــه: عـــەورەتی خـــۆت بپـــارێزە (واتـــه بیشـــارەوە) مەگـــەر لـــەخێزانت یـــان لەکەنیزەکەکەت.

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أَنَّ موسىٰ اَغْتَسَلَ عُرْيانـاً فَذَهَـبَ الحَجَـرُ بِثَوْبِه) متفق عليه، واتـه: مووسا (عليه السلام) بەرووتـی خـۆی شـۆردو بەردەکە پۆشـاکەکەی ڕفاند... (دیارە شوێنەکەی چۆڵو خاڵی بووە).

٣- دروستە ژنو مێرد وێکڕا خۆیان بشۆن[187]، وە بەپاشماوەی ئاوی یەکتر خۆیان بشۆن[188].

بە بەڵگەی:

*(عن عائشة رضي الله عنها أنها كانَتْ تَغْتَسِلُ هيَ والنَبيُّ ﷺ في إِناءٍ واحِدٍ ...) رواه مسلم

واته: عائیشە خوا لێی ڕازیبێت لەگەڵ پێغەمبـەردا ﷺ پێکـەوە لەدەفرێکدا (واتـه بەئاوی دەفرێك) خۆیان دەشۆرد.



[187] (نووی) گوتوویەتی: ئەمە زانایان لەسەری یەکدەنگن، بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٢١، ٢٢٢

[188] ئـەمیش وەك (نـووی) گوتوویـەتی: ڕای زۆربـەی زۆری زانایانـە، سـەرچاوەو بـەرگی پێشـوو، ص٢٢١،

# دەستنوێژ گرتن

خوا پشتیوان بێ لەم حەوت خاڵەی خوارەوەدا بەکورتیی و گوشراوی باسی دەستنوێژ دەکەین:

یەك: دەستنوێژ چییەو چۆن دەگیرێ؟!

دوو: فەرزەکانی دەستنوێژ

سێ: سوننەتەکانی دەستنوێژ.

چوار: هەڵوەشێنەرەوەکانی دەست نوێژ (نواقض الوضؤ).

پێنج: دەستنوێژ بۆچیی و چی پێویستە؟

شەش: دەستنوێژ بۆچیی و چی سوننەتە؟

حەوت: چەند وردە تێبینییەك دەربارەی دەستنوێژ

## یەك: دستنوێژ چییەو چۆن دەگیرێ؟!

خوای بەبەزەیی و بەخشەر فەرموویەتی: (يا أيها الذين آمنوا اذا قمتم الى الصلاة فَاغْسِلوا وجوهكم وأَيديكُمْ الىٰ المِرافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤسِكُمْ وأَرْجلكُمْ الىٰ الكَعْبَيْنْ..) المائدة - -٦-

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەرکاتێك بۆ نوێژێ هەڵسان ڕووتان و دەستانتان هەتا ئانیشکانتان بشۆن، وە دەستی تەڕ بەسەرتاندا بهێنن، وە لاقەکانتان تا گوێزینگان بشۆن.

بەڵێ دەستنوێژ کە لەزمانی کوردیدا تەرجەمەی وشەی (وضۆ)ە (وضؤ)یش لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا مانای: چاکی و جوانی و پاکی (الحُسْن والجَمال والنظافة) دەگەیەنێ و لەزاراوەی شەرعیشدا بریتیە لەشۆردنی دەموچاوو هەردووك دەست و دەستی تەڕ بەسەردا هێنان و شۆردنی هەردووك پێیەکان[189].

---

[189] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص١٠٣٨.

بۆ چۆنیەتی دەستنوێژ گرتنیش دەقی سوننەت زۆرن کە ئەمە یەکێکیانە:

*(عن حُمْران حَوْلىٰ عثمان بن عَفان انه رأىٰ عُثْمانَ دعا بِوضوٍ فأفْرَغَ علىٰ يَدَيْهِ من إنائِهِ فَغَسلهُما ثلاثَ مراتٍ، ثم أَدْخَلَ يَمِينَهُ في الوضوءِ ثم تَمَضْمَضَ واَستنشَق واَستَنثَر، ثم غَسَلَ وجْهَهُ ثلاثاً، ويَدَيه الى المِرفَقَيْن ثلاثا، ثم مسح برأسه، ثم غسل كل رجل ثلاثا، ثم قال: رأيت النبي ﷺ يتوضأ نحو وضوئي هذا، وقال: مَنْ توَضَّأ نحو وُضوئي هذا ثم صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لايُحَدِّثُ فِيهِما نَفْسَهُ غَفَرَالله لَهُ ماتقدَّم مِنْ ذَنْبِهِ) متفق عليه.

واتە: (حمران) کۆیلەی ئازادکراوی (عثمان بن عفان) گێڕاویەتەوە کە (عثمان)ی - خوا لێی ڕازی بێ - بینیوە داوای ئاوی[٢٥٩] دەستنوێژی کردوە، (دەڵێ) جا لەدەفرەکەی ئاوی بەهەردووك دەستیدا کردو سێجاران شۆردنی پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو ئاوەکەوەو ئنجا ئاوی لەزاری وەرداو ئاوی لەلووتی وەرکردو فڕێی دایەوە، ئنجا سێ جاران دەمو چاوی شۆرد، هەروەها هەردووك دەستی تا ئانیشکەکانی - شۆری -، پاشان دەستی تەڕی بەسەریدا هێنا، ئنجا هەر لاقێکی (مەبەست پێیەتی) سێجاران شۆرد، ئنجا گوتی: پێغەمبەرم ﷺ دی دەستنوێژێکی وەك ئەوەی منی گرت وە فەرمووی: هەرکەسێك دەستنوێژێکی وەك ئەوەی من بگرێ پاشان دوو ڕکات بکات کە دالغەی تێیان دا نەبێ، لەگوناحی پێشووی دەبوردرێ.

شایانی باسیشە کە ئەوەندەی سەرنجی ئەو دەقانەم داوە کە لەبارەی دەستنوێژگرتنەوە هاتوون لەو فەرموودەیەی سەرێ کۆکەرەوە (جامع)تر گشتگیر (شامل)ترم تێیان دا نەبینیوەو مەگەر چۆن دەنا تێکڕای فەڕزو سوننەتەکانی دەستنوێژی کۆکردوونەوە، بۆیە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی دەستنوێژگرتن بەو فەرموودەیە واز دێنین.

## دوو: فەڕزەکانی دەستنوێژ

زانایانی سوننەتو شەرع (علماء السنة والفقه) دەربارەی فەڕزەکانی دەستنوێژگرتن ڕایان جیاجیایە، بەڵام ئەوەی زۆربەی هەرەزۆریان لەسەری کۆکن و بەڵگەی بەهێزیش پشتگیری دەکات ئەو ڕایەیە کە دەڵێ فەڕزەکانی دەستنوێژ ئەم شەشەن:

---

[٢٥٩] وشەی (وضؤ)یش ناوە بۆ ئەو ئاوەی دەستنوێژی پێ دەگیرێ.

١-نیازو مەبەست هەبوون: کە لەباسی خۆشۆردنیش دا ڕوونمان کردەوەو لەنیەتی نوێژ بەرپارکردنیشدا بەوردیو بەڕوونی دەیتوێژینەوە.

وە فەرزبوونی نیەت بۆ هەرکام لە خۆشۆردن (الغسل)و دەستنوێژو تەیەمموم ڕای: (زهـريو ربيعـة و مالكو ليث شافعي و احمد واسحاق و ابوثور وابوعبيد وداود الظاهري) یەو کەمێکیش لەزانایان گوتوویانە نیەت مەرج و فەرز نیە[191]، بەڵام ڕایەکەیان بێهێزەو ئەوەش کە دەڵێن مادام لەئایەتی دەستنوێژو لەفەرموودەکانیشدا بەڕاشکاوی باس نەکراوە بەڵگەیە لەسەر فەرز نەبوونی! بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە هەم ئایەتەکەو هەم دەقەکانی سوننەتیش ناڕاستەوخۆ ئاماژەیان پێ کردوە، چونکە (اذا قمتم الى الصلاة) وە (دعا بِوَضُوءٍ) حەتمەن نیازو مەبەستیان لەگەڵدایە، ئنجا مادام ئێمە دەقێکی گشتی (نص عام)ی وەك فەرموودەی: (انما الاعمال بالنيات)یمان هەیە، ئەوە پێویستە تێکرای کردەوە باشەکانی پێبگرینەوە مەگەر بەبەڵگەیەکی شەرعی ڕوونو بێ چەندوچوون هەڵباوێرێنو جیا بکرێنەوە.

٢- شۆردنی ڕوو (غسل الوجـه): کە دەقی ئایەتی دەستنوێژو فەرموودەی زۆریش بەڕاشکاوی باسیان کردوە، بۆیە تێکڕای زانایان لەسەری یەکدەنگن[192]. سنووری ڕوو (دەموچاو)یش بەباری درێژیدا لەکۆتایی سنووری نێوچەوان (تەوێڵ) تا نووکی چەناگە (ذقن) و، بەباری پانیش دا لەگوێی ڕاستەوە بۆ هی چەپە[193].

٣-شۆردنی هەردووک دەستەکان وێڕای ئانیشکەکان: ئەمیش وێڕای بەڵگەی ڕوونی قورئانو سوننەت یەکدەنگی (اجماع)ی زانایانیشی لەسەرە[194]، بەڵام پێشخستنی دەستی ڕاست بەیەکدەنگی زانایان سوننەتەو فەرز نیە[195] وە زۆربەی هەرە زۆری نیزیك بەیەکدەنگی زانایان ڕایان وایە کە ئانیشك (مرفق)یش لەگەڵ

---

[191] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٣٧٤، ئەوانەش کە بەفەرزو مەرجی نازانن (اوزاعی و سفيان الثوری)و وابوحنيفة)ن، بەڵام بۆ تەیەمموم بەفەرزی دەزانن.

[192] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص٤٣١

[193] بڕوانە: (المجموع) ج١ص ٢٤٣١، وە بڕوانە: (المغني) ج١ص٩٦.

[194] بڕوانە: (االمجموع) ج١ص٤٤٤، وە بڕوانە: (المغني) ج١ص١٠٧، بەڵام ئەم دەڵێ هەندێك لەزانایان شۆردنی ئانیشك بەفەرز نازانن.

[195] هەمان سەرچاوەی پێشوو

دەست (يد) دايەو شۆردنی فەرزە[196]، چونكە وێڕای دەلالەتی ئايەتی[197] دەستنوێژ، ئەم دەقەش لەوبارەوە بەڵگەيەكی ڕوونە:

*(عن نعيم بن عبدالله المجمر قال: رأيت ابا هريرة يتوضا، فَغَسَلَ وَجْهَهُ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثم غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى حتّى أَشْرَعَ في الْعَضُدِ، ثم يَدَهُ الْيُسْرَى حتى أَشْرَعَ في الْعَضُدِ، ثم مَسَحَ رَأْسَهُ، ثم غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى حتى أَشْرَعَ في السّاقِ، ثم غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى حتى أَشْرَعَ في السّاقِ، ثم قال: هكذا رَأَيْتُ رسولَ الله ﷺ يَتَوَضَّأ) رواه مسلم.

واتە: (ابوهريرة)م بينی دەستنوێژی دەگرت: دەموچاوی خۆی بەتەواوی شۆرد، دوايی دەستی ڕاستی هەتا گەيشتە قۆڵی شۆرد، پاشان دەستی چەپی هەتا قۆڵی، ئنجا دەستی تەڕی بەسەريدا هێنا، ئەوجار پێی ڕاستی شۆری هەتا گەيشتە لوولاكی، ئنجا پێی چەپی شۆرد هەتا گەيشتە لوولاكی، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بينی ئاوا دەستنوێژی گرت.

٤- دەستی تەڕ بەسەرداهێنان (مسح الرأس): ئەمەش وێڕای بەڵگەی دەقی قوڕئانو دەقی سوننەت، يەكدەنگی (اجماع)ی زانايانيشی لەسەرە[198]، بەڵام زانايان لەوبارەوە كەئايا مەسح كردنی هەموو سەر فەرزە يان نا؟! ڕايان جياوازە. پاش ئەوەی لەسەر پەسەندو چاكتربوونی مەسح كردنی هەمووی ڕێك كەوتوون[199]، هەرچی زۆربەو جەماوەری زانايانن ڕايان وايە كە مەسح كردنی هەندێكی فەرزەكەی پێدێتەدی[200]،

---

[196] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٤٧.

[197] چونكە وشەی (الى) هەم بەمانای: (لەگەڵ: مع) هاتوە، هەم بەمانای: (هەتا ئەو شوێنە)ش، جا ئەگەر بەمانای يەكەميان بەكارهاتبێ ئەوە دەلالەتەكەی ئاشكرايەو ئەگەر بەئی دووەميش بێت هەروايە، چونكە كەتۆ دەڵێی (قَطَعْتُ أَصابِعَهُ من الخِنْصَرِ الى المُسَبِّحَةِ) ئەوە هەموو كەس دەزانێ كە هەردووك پەنجەكان لەبازنەی بڕران (قطع) دان. بڕوانە، (المجموع) ج١ص٤٤٧.

[198] بڕوانە: سەرچاوەو بەرگی پێشوو، ص٤٥٥.

[199] بڕوانە، (نيل الاوطار) ج١ص١٩٢.

[200] بڕوانە، (المجموع) ج١ص٤٥٧تا٤٥٩، وە بڕوانە: (مجموعه الفتاوى) ج١ص٧٣تا٧٦.

تێبينی: هەرچەندە پێشتر ڕای جەماوەرم بەلاوە بەهێزتر بووەو (ترجيح)م داوە بەڵام ئێستا پاش سەرنج دانی قسەكانی (ابن تيمية) ئەو قەناعەتەم گۆڕاوەو پێم وايە ئەو ڕايە بەهێزترە كەمەسحی هەموو سەر بەفەرز دەزانێ، بەڵام وەك خاوەنی (المغني) گوتوويەتی پێم وايە مەسح كردنی زۆربەی سەر دەكەوێتە بری هەمووی، بڕوانە: ج١ص١١٢، ١١٣.

جا ئەمانیش دەربارەی دیاریکردنی ئەندازەی ئەو (هەندێك: بعض) ە ڕایان جیا جیایە، کەمێکیش لەزانایان - کە (مالك واحمد) یان تێدان لەقسەی باو (مشهور) یان دا ڕایان وایە کەمەسح کردنی هەمووی فەرزە[201].

واش دێتە بەرچاو کەڕای زۆر بە ڕاست تر بێت، هەرچەندە چاکتر وایەو دووربینی (احتیاط) لەوەدایە کە مەسحی هەمووی هەربکرێ بۆ دەرچوون لەبازنەی ئیشکالی ڕا جیایی (اختلاف)ی زانایان[202].

هەروەها زانایان لەسەر مەسەلەیەکی دیکەش ڕایان جیاوازە، ئەویش بریتیە لە مەسحی مێزەر (عمامة) کەبێگومان کڵاوو کلێتەو هەر شتێکی دیکەش کە سەری پێ دادەپۆشرێ دەگرێتەوە[203].

بەشێکیان کە (عروة بن الزبیرو شعبي و نخعي و قاسم ومالك و اصحاب الراي و شافعي) یان لەنێودان وەك (ابن المنذر) گێڕاویەتەوە، وە لە: (علي بن ابي طالبو جابر و ابن عمر) یشەوە خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە، ڕایان وایە کە ئەگەر پێشە سەر (ناصیة)ی مەسح بکاتو نەیەوێ سەرداپۆشەرەکەی دابنێ وایەسەندە کەسەر داپۆشەرەکەیشی مەسح بکات، بەڵام ئەگەر بێتو پێشەسەری لەگەڵ مەسح نەکات ئەوە مەسح کردنی سەرداپۆشەرەکەی بەتەنیا فەرزی سەر مەسح کردنی پێنایەتەدی[204].

بەشێکیشیان کە (ابوبکر الصدیق وعمر وانس بن مالك و ابو امامة وسعد بن ابي وقاص و ابو الدرداء) خوا لێیان ڕازی بێ و (عمر بن عبدالعزیز و مکحولو حسنو قتادە اوزاعي و احمد واسحاق وابوثورو ثوري) یان لەنێودان، ڕایان وایە بەتەنیا دەستی تەڕ بەسەرداپۆشەردا هێنان فەرزی مەسحی سەرکردن دێتەدی، هەرچەندە هەندێکیان ئەوەیان بەمەرج گرتوە کە ئەو سەرداپۆشەرە لەسەر پاکی (طهارة) بووبێ و، هەندێکیشیان دەڵێن مەرجە کە ئەو سەرداپۆشەرە لە جۆری ژێر چەناگەدار (مُحَنَّكْ) بێت، واتە بەشێکی کەوتبێتە ژێر چەناگەوە، بەشێکیشیان هیچ کام لەو

---

[201] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[202] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٦٠، وە بڕوانە: (فتح الباري) ج١ص٢٩٣.

[203] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٦٣.

[204] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٦٤.

شتانەیان بەمەرج نەگرتوەو پێشم وایە هیچ کام لەو دوو مەرجە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان لەسەرنیە[205].

دیارە پیاوو ئافرەتیش لەم مەسەلەی مەسح لەسەر سەرداپۆشەرو هەموو مەسەلەکانی دیکە مەسحی سەرکردنو سەرجەم دەستنوێژیش دا جیاوازییان نیەو وەك یەکن[206].

ئێستاش با چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی مەسحی سەرکردنەوە بێنینەوە، سەرەتا ئەم دەقە دەربارەی چۆنیەتی مەسح کردنی سەر:

*(عن عبدالله بن زيد ﷺ أَنَّ رسولَ الله ﷺ مَسَحَ رأْسَهُ بِيَدَيْهِ فأَقْبَلَ بِهما وأَدْبَرَ، بَدأَ بِمقَدمِ رَأْسِهِ ثم ذَهَبَ الىٰ قفاهُ ثم رَدَّهُما الى المَكانِ الَّذي بَدَأَ مِنْهُ) رواه احمد والبخاري ومسلم ومالك واصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەردووك دەستی مەسحی سەریکرد بردنیە پێشو گێڕانیەوە دواوە، لەپێشەسەرییەوە دەستیپێکرد ئنجا بەرەو پشتی ملی بردن، پاشان گێڕانیەوە بۆ ئەو شوێنەی کەلێیەوە دەستی پێکردبوو.

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە کە مەسح کردنی مێزەر یان هەر داپۆشەرێکی دیکەی سەری پیاوانو ئافرەتان، فەرزی مەسح کردنی سەر (مسح الراس)ی پێ دێتەدی، کەڕای ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی بەڕێز خوالێیان ڕازیبێو زاناو پێشەوایانی دیکەیەو واش پێدەچێ کە لەڕایەکەی دیکەش بەهێزتر بێت:

*(عن بلال ﷺ قال: رَأَيْتُ رسولَ الله ﷺ مَسَحَ علىٰ الخُفَّيْنِ والخِمار) رواه مسلم واصحاب السنن الا ابوداود، (مەبەست لە (خِمار)یش هەر مێزەرە)[207].

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستی تەڕی بەدوو خوففەکانو مێزەردا هێنا.

*(عن ثوبان قال: بَعَثَ رسولُ الله ﷺ سَرِيَّةً فَأَصابَهُم البَرْدُ، فَلَمّا قَدِمُوا علىٰ رسول الله ﷺ أَمَرَهُم أَنْ يَمْسَحوا علىٰ العَصائِبِ والتَّساخِيْنِ) رواه ابوداود والحاكم واحمد وصححه الحاكم وقال الذهبي صحيح على شرط مسلم.

---

[205] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[206] بڕوانە: سەرچاوەو بەرگی پێشوو، ٤٦٧، چونکە هەموو یاسا شەرعییەکان مەگەر بە بەڵگەیەکی ڕوون تایبەت بکرێن بەپیاوان یان ئافرەتانەوە ئەگەرنا لەئەسڵدا خوای کاربەجێو دادگەر بۆ هەردوو ڕەگەز (جنس)ی نێرو مێی ناردوون.

[207] بڕوانە: (المعجم الوسيط) كلمة (خمر).

واتــه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کۆمـەڵێکی ڕەوانـە – ی جیهاد – کـردو سـەرما کـاری تێکـردن جـا کـاتێك هاتنـەوەلای پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی پـێکردن کـە لەسـەر (مێزەرەکانو خوففەکان)[208] – یان – مەسح بکەن.

٥-شۆردنی هەردوو پێیەکانو گوێزینگەکانیان: بەڵگەی ئەمیش سـەرەڕای دەقی قورئانو دەقی سوننەت یەکدەنگی زانایانی ئیسلامە[209] بێجگە لە: (شیعە) کە پێیان وایە مەسح فـەرزە نـەك شۆردن، وە (ابـن جريـر الطـبري) کـەڕای وایـە بابـای دەستنوێژگر سەرپشك (مختـار)ە لـەنێوان شـۆردنو مەسـح کـردن دا، وە هـەندێك لـە ظاهیرییەکان کە هەرکام لەشۆردنو مەسح کردنیان بەپێویست داناون[210].

*ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەسەر فەرزبوونی شۆردنی پێیەکان:*

*هـەر کـام لـە (ابوهريـرة)و (عبـدالله بـن عمـر وبـن العـاص) خوالێیـانڕازی بـێ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی بینیـوە کـە دەسـتنوێژیان گرتـوەو پاژنەی پێیان دیاربووە کە ئاوی پێنەکەوتوەو تەڕ نەبووە، بۆیە فەرموویەتی: **(وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ)** رواه البخاري ومسلم واحمد واصحاب السنن الا الترمذي وغيرهم.

واتە: سزای سەخت بۆ پاژنەپێیەکان لەئاگر – ی دۆزەخ –.

*هەروەها (عمر بن الخطاب) خوالێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە: **(أَنَّ رَجُلاً توضأَ فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ علىٰ قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النبيُّ ﷺ فقال: إِرْجِعْ فَأَحْسِنْ وَضُوْءَكَ)** رواه مسلم والدارطني والطبراني.

واتــە: پیـاوێك دەسـتنوێژی گرتبـوو بـەڵام هێنـدەی شـوێنی نینۆکێکـی بەسـەر پێیەکانییـەوە هێشـتبۆوە، جـا پێغەمبـەر ﷺ دیتـیو فـەرمووی: بگـەڕێوە دەستنوێژەکەت بەچاکی بگرە.

*هـەرکام لـە (ابوهريـرة) و(عمـر و بـن عَبْسَـة) خـوا لێیـان ڕازیبـێ یـەکی لەفەرموودەیـەکی درێـژدا لەپێغەمبـەری خـواوە ﷺ گێڕاویانەتـەوە کـە پـاش دەستنوێژگرتنو شۆردنی هـەرکام لەئەندامـەکان گوناحـەکان لادەچنو ئـەو ئەندامـە لێیان پاك دەبێتـەوە جا لەباسی شۆردنی پێیەکانیشدا بەهەمان شێوە فەرموویـەتی

---

[208] چونکە (عصائب) بریتیە لە (عمائم) و (تساخين)یش (خفاف)ە.

[209] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٧٦.

[210] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

پاش شۆردنیان لەهەموو ئەو گوناحانە کە لەسۆنگەی (ڕۆیشتن)یانەوە بۆیان کردوویانە پاك دەبنەوە، شایانی باسیشە کە هەرکام لەو دوو فەرموودانە (مسلم) گێڕاونیەوە.

بەڵگەی شۆردنی گوێزینگەکانیش وێڕای پێیەکان بێجگە لەدەلالەتی ئایەتی دەستنوێژ وەك لەباسی شۆردنی دوو دەستەکاندا ئامازەمان پێکرد، چەندان فەرموودەش بەڵگەینی کە یەکێکیان ئەو فەرموودەیە کە (مسلم) لە (نعیم بن عبدالله المجمر) ەوە گێڕاویەتەوەو پێشتر هێناومانەو تەرجەمەشمان کردوە.

ئەوانەش کەڕایان وایە فەرزی پێیەکان مەسح کرانە نەك شۆردن یان ڕایان وایە هەردووکیانە یان بابای دەستنوێژگر سەرپشکە بەهێزترین بەڵگەیان ئەوەیە کە وشەی: (وأَرْجُلِكُمْ) بەژێر (کسرة) ی لامی (ارجلکم) خوێندراوەتەوە کەواتە پێویستە یان دروستە کە مەسح بکرێ چونکە (عطف) دەبێتەوە بەسەر (وآمسحوا بِرُؤُسِكُمْ)!

زۆربەو[211] جەماوەری زانایانیش چەند وەڵامێکیان داونەوە کە ئەم سێیە بەهێزترینیانن:

یەکەم: وەك چۆن (ارجلکم) بەژێر خوێندراوەتەوە بەسەر (فتح)یش خوێندراوەتەوە جا خوێنرانەوەی بە(سەر) هیچ ئیشکالی تێدا نیەو دەق (نص)ە لەسەر شۆردن، خوێندنەوەی بە(ژێر)یش لەسۆنگەی نیزیکی و دراوسێیەتیەوەیە لەگەڵ وشەی: (برؤسکم) کە لەزاراوەی زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (جَرَّةُ الجوار)،، وە لەزمانی عەرەبیدا بەگشتی و لەقورئانیش دا بەتایبەت شتی وا هەیە، وێنەی قورئان: (إنِّي أخافُ عليكم عَذابَ يومٍ أليْمٍ) هود - ٢٦- وێنەی زمانی عارەبیش: قسەی شاعیر:

*لم يَبْقَ إلاّ أسيرٌ غَيْرُ مُنْفَلِتٍ ... ومُوثَقٍ في عقالِ الأَسْرِ مَكْبولُ*

کە لەئایەتەکەدا وشەی (الیم) لەبەر دراوسێیەتی (یوم) ژێردار بووەو، لەشیعرەکەش دا وشەی (موثق) کە (معطوف) ە بۆ سەر (اسیر) و دەبووایە بۆردار (مضموم) بێت. ژێردار (مخفوض) کراوە بەهۆی نیزیکی لە وشەی (منفلت) ەوە.

---

[211] هەرسێك وەڵامەکان (نووی) هێناونی لە: (المجموع شرح المهذب) ج١ص٤٨٠، ٤٨١دا، هەروەها بۆ بەرپەرچ دانەوەی ڕایەکانی جیا لەڕای جەماوەرو زۆربە بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٧٠تا ٧٢، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٧٧تا ٨٠.

دووەم: هەردووك خوێندنەوە (قراءة) ژێردراو سەردار وەك یەكن، بەڵام سوننەت شۆردنی زاڵ كردوە بەسەر مەسح كردن دا و ئیحتمالی مەسح كردنی نەهێشتوە.

سێیەم: خوێندنەوەی ژێردار ئەگەر گریمان بەس مەسح بگەیەنێ، مەبەست پێی مەسحی سەر خوفف و گۆرەوییەو، خوێندنەوەی (منصوب)یش بۆئەوەیە كە شۆردن بگەیەنێ لەكاتی نەبوونی خوفف و گۆرەویدا [٢١٢].

٦- ڕەچاوكردنی ڕیز (ترتیب) لەكردەوەكانی دەستنوێژدا: ئەمیان زانایان تێیدا جیاوازن بەشێكیان كە جگە لە: (عثمان و ابن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ، (قتادة و ابوثور و ابوعبیدو اسحاق بن راهویةو شافعي واحمد) لەڕای باو (مشهور)یدا لەنێویان دان بەفەرز، بەشێكیشیان كە وەك (نووي) لە (بغوي)یەوە هێناویەتی زۆربەی زانایانن و جگە لە (علي وابن مسعود) خوا لێیان ڕازی بێ، (سعید بن المسیب وحسن وعطاء ومكحول و نخعي و زهري ربیعة و اوزاعي و ابوحنیفة و مالك و داود الظاهري و مزني وابن المنذر) یان لەنێودان بەس بەسوننەتی دەزانن و دەڵێن فەرز نیە [٢١٣].

بەڵام وا پێ دەچێ ڕای یەكەم بەهێزتر بێ چونكە:

أ-ئایەتی دەستنوێژ دەلالەتی لەسەر دەكات كە خوای پەروەردگار مەسحی سەری خستۆتە نێوان شۆردنی دەست و پێیەكانەوە ئەگەر ڕیز پێویست نەبووایە، خوای پەروەردگارو كاربەجێ مەسحی سەركردنی نەدەخستە نێوان دوو ئەندامی شۆراوەوە.

ب-دەلالەتی چەندان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كە باسی چۆنیەتی دەستنوێژ گرتن دەكەن و سەرجەمیان ڕیز (ترتیب) یان ڕەچاو كردوە.

---

[٢١٢] هەروەها ئەوە كە خوای كاربەجێ سنوور (حَدّ)ی شۆردنی پێیەكانی دیاریكردوە كە هەتا پشت گوێزینگەكانە، دیسان بەڵگەیە لەسەر فەرزبوونی شۆردن چونكە مەسح كردن بەهیچ مەزهەبێك ناگاتە پشت گوێزینگ! بەڵكو بەس پشتی پێیە كەمەسح دەكرێ، هەر بۆیەشە كە شیعەكان بۆ ئاراستەكردنی ڕایە هەڵەكەیان ناچاربوون بڵێن گوێزینگ (كَعْب) لە پشتی پێیە!! بەڵام بێگومان ئەو ڕایە پێچەوانەی دەقی قورئانە كە وشەی (كعب) بە دووان (مُثَنَّى) هێناوەو فەرموویەتی: (وارجلكم الى الكعبين) كەواتە هەر پێیەك دوو (كعب)ی هەیە نەك یەك، وەك (مِرْفَق) بۆ دەست، دیسان وشەی (كعب) شتی مەیلەو خڕ دەگەیەنێ هەر بۆیەش بەكچۆڵەی تازە مەمك كردوو دەگوترێ (كاعِبْ) كۆیەكەی (كواعب) وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وكواعِبَ أُترابًا) النبأ، جا دیارە گوێزینگ كە لەملاولای پێیەكانن مەیلەو خڕن، نەك پشتی پێ كە مەیلەو درێژو پانە!!

[٢١٣] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٥٠٥، ٥٠٦.

ج- فەرموودەی: (نَبْدَأُ بِما بَدَأَ اللهُ بِهِ) رواه مالك واحمد ومسلم واصحاب السنن، الا النسائي، واتە: (بەوە دەست پێدەکەین کە خوا لێیەوە دەستی پێکردووە) کە لەکاتی هاموشۆی نێوان صەفاو مەروەداو سەرکەوتنە سەر تەپۆڵکەی صەفادا فەرموویەتی، بەڵام بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان ئەوجۆرە دەقانە هەرچەندە هۆیەکەیان تایبەتە بەڵام حوکمەکەیان گشتی یە.

*لەکۆتایی فەرزەکانی دەستنوێژیش دا دەڵێین:*

ئایەتی دەستنوێژ هەرکام لەو شەشە فەرزانەی دەستنوێژگرتنی تێدان، بەم شێوەیە:

یاأیها الذین آمنوا:

١-اذا قمتم الی الصلاة (نیازو مەبەست).

٢-فاْغسلوا وجوهکم (شۆردنی دەموچاو).

٣-وایدیکم الی المرافق (شۆردنی هەردووك دەست وێڕای ئانیشکەکانیان).

٤- واْمسحوا برؤسکم (دەستی تەڕ بەسەردا هێنان).

٥- واْرجلکم الی الکعبین (شۆردنی هەردووك پێو گوێزینگەکانیشیان).

٦-(ترتیب) (ڕیزبوونی کردەوەکان وەك لەئایەتەکەدا هاتوە).

## سێ: سوننەتەکانی دەستنوێژ

سوننەتەکانی دەستنوێژ کە دەقەکانی سوننەتیان لەسەرن و زۆربەی زانایان لەسەریان ڕێك کەوتوون ئەمانەن:

١-ناوی خوا هێنان لەسەرەتاوەو بەر لەدەست پێکردن، واتە گوتنی: (بسم الله) یان (بسم الله الرحمن الرحیم)، زۆربەی زانایان بەسوننەتی دەزانن وەك: (ابوحنیفةو مالك و شافعي) وە هەندێکیان وەك (اسحاق واهل الظاهر)و (احمد)یش لە ڕیوایەتێکیدا بەفەرزی دەزانن، هەروەها لە (مالك) گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی:

موباحە، یان بیدعەتە[٢١٤] !

بەڵام ڕای زۆربە لەڕاستی یەوە نیزکترە کە دەڵێن سوننەتەو چەند دەقێکی سوننەتیشی لەسەر دێننەوە کە ئەمە یەکێکیانە:

---

[٢١٤] بروانە: (المجموع) ج١ص٤٠٨-وە: (المغني) ج١ص١١٠، ١١١.

*(لاوُضوءَ لِمَنْ لَمْ يُسَمِّ اللهَ) يان (لاوضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ) رواهما الترمذي وابن ماجة عن سعيد بن زيد، واتـه: هەركەسێك ناوی خوا نەهێنێ دەستنوێژەكەی بەرنەكەوتوە. (زانایان گوتوویانە: مەبەست دەستنوێژی كامڵو تێرو تەواوە).

جا هەرچەندە (نووي) گوتوویەتی[215] (واسانيد هذه الاحادث كلها ضعيفة) بەڵام هەندێك لەزانایانی دیكە ڕای تریان هەیە، بۆ وێنە (احمد شاكر) گوتوویەتی[216]: (والحديث اسناده حسن)، هەروەها (ابن حجر العسقلاني) گوتوویەتی[217]: (والظاهر ان مجموع الأحاديث يَحْدُثُ مِنْها قُوَّةٌ تَدلُّ علىٰ أنَّ لَهُ أصْلاً).

٢-سیواك كردن، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لولا ان اشق على امتي لامرتهم بالسواك عند كل وضوء) رواه مسلم. (پێشتریش باسمان كردوە).

٣-سێ جار شۆردنی هەردووك دەست هەتا بازنە (رُسْغ) كانیان، وەك لەو فەرموودانەدا هاتوە كە (عثمان) و (عبدالله بن زيد) خوا لێیان ڕازی بێ دەربارەی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ هێناویانەو (بخاري ومسلم) گێڕاویاننەوە، ئەمەش زانایان لەسەری یەكدەنگن، بەڵام ئەگەر دەستنوێژگرتنەكە دوای لەخەو هەستان بێ، هەندێك لە زانایان ئەو دەست شۆردنە بەفەرز دەزانن[218]، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە: (اذا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهُمَا الأناءَ ثَلاثاً فانَّ أَحَدَكُمْ لايَدْرِي أَيْنَ باتَتْ يَدُهُ) متفق عليه عن ابي هريرة.

واتە: ئەگەر یەكێكتان لەخەوێ بێداربۆوە با بەرلەوەی دەستەكانی بخاتە دەفرەكەیەوە (بۆ دەستنوێژگرتن) سێ جاران بیان شوات، چونكە یەكێكتان نازانێ دەستی لەكوێ بووە!

٤-سێ جار ئاو لەزارو لووت وەردان، ئەمانیش زۆربەی[219] هەرەزۆری زانایان بەسوننەتو هەندێكیشیان بەفەرزیان دەزانن و ڕای جەماوەریش بەهێزترو

---

[215] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٠٤، ٤٠٥.

[216] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٠٤، ٤٠٥، پەراوێزی (المحقق).

[217] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[218] بڕوانە: (المغني) ج١ص١١٢، ١١٣.

[219] بڕوانە: (المغني) ج١ص١١٣، ١١٤.

بەڵگـەدارترە[220] وەك لەفـەرزەكانی دەسـتنوێژدا باسمـان كـرد، دەقـی سـوننەتیش لەوبارەوە زۆرن بۆ وێنە: (فَتَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاثاً) رواه البخاري ومسلم عن عبدالله بن زيد. كە لەوەسفی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەردا ﷺ باسی كردوە، واتە: جاپێغەمبەر ﷺ سێ جاران بەلوێچە ئاوێك ئاوی لەزاریو لەلووتی وەركرد.

٥-پەنجە تەڕەكانی دەست خستنە نێو ڕیشەوە (تَخْلِيْلُ اللِّحْيَةِ)، ئەمیش زانایان[221] لەسەر سوننەتو پەسەندبوونی یەكدەنگن‌و فەرموودەی زۆریشی لەسـەر هـەن، بـۆ وێنە:

*(عن عثمان رضي الله عنه أَنَّهُ ﷺ كان يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ) رواه الترمذي وقال: حسن صحيح.

تێبینی: دیارە ڕیش ئەگەر تەنك بوو - واتە پێستی تێڕا دەبینرا - زۆربەی زانایان كە (مالك‌و شافعي‌و احمد و داود الظاهري)یان لـەنێودان دەڵێن پێویسـتە دەرەوەو ژێرەكەیشی لەگەڵ دەم‌و چاودا بشۆرێ، بەڵام ئەگەر چڕوپڕ (كَثِيْف ،كَثٌّ) بـوو - واتـە پێستی تێڕا دیارنەبوو - ئەوە شۆردنی ژێرەوەی پێویست نیەو بـەس ڕواڵەتەكـەی دەشۆرێ[222].

٦-پەنجەی تەڕ خستنە نێوان پەنجەكانی دەست‌وپێوە، ئەمیش بۆ پەنجەكانی پێ زۆربەی زانایان‌و بۆ هی دەستیش هەندێكیان بەسوننەتی دەزانن‌و چەند دەقێكیش لـەوبارەوە گێڕراونـەوە كـە زانایـان مشـت‌ومڕیان لەبارەیانـەوە هەیـە[223]، كـە ئەمـە یەكێكیانە:

*(عن المستورد بن شداد رضي الله عنه قال: رأيت رسول الله ﷺ تَوَضَّأَ فَخَلَّـلَ أَصَابِعَ رِجْلَيْـهِ بِخِنْصَرِهِ) رواه احمد واصحاب السنن الا النسائي.

واتـە: پێغەمبـەری خـوام ﷺ بینـی دەسـتنوێژی دەگـرت پەنجە قلیجـەی بـەنێوان پەنجەكانی پێیەكانیدا هێنا.

* (اذا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ أَصابِعَ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ) رواه الترمذي وحسنه.

---

[220] هەندێك لەزانایانیش وەك (ابوحنيفة و سفيان الثوري) بـۆ خۆشـۆردن بەفـەرزو بـۆ دەسـتنوێژ بەسوننەتیان دەزانن، بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٢٤، ٤٢٥.

[221] بڕوانە: (المغني) ج١ص١١٤.

[222] بڕوانە/ (المجموع) ج١ص٤٣٦، ٤٣٧.

[223] بڕوانە: (المغني) ج١ص١١٤، ١١٥، وەبڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٨٥ تا ٤٨٧.

٧-سیٚ جار سیٚ جار شۆردنی دەموچاو و دەستو پێیەکان، ئەمیش چەندان دەقی سوننەتی لەسەرن کەپێشتر ئاماژەیان پێکراوە، بۆ وێنە: (فَتَوَضَّأَ ثَلاثاً ثَلاثاً) رواه مسلم عن عثمان.

بەلاّم دەربارەی دووبارە بوونەوەی مەسح کردنی سەر زانایان مشتومڕی زۆریان بووەو زۆربەیان لەگەلّ دووبارە نەبوونەوەینی[٢٢٤]، کە (ابن تیمیة)ش[٢٢٥] پەسەندی کردووەو بەلّگەی چاکیشی لەسەر هێناونەوە، بەشێکیشیان رایان وایە کە مەسحی سەریش وەك شۆردنی ئەندامەکان دووبارەو سێبارەبوونەوەی سوننەتەو چەند دەقێکیشی بەبەلّگە لەسەر دێننەوە کە ئەمە یەکێکیانە: (عن عثمان رضي الله عنه انه تَوضَّأ فَمَسَحَ ثلاثاً وقال: رأيت رسولَ الله ﷺ تَوضَّأَ هكذا) رواه ابوداود باسناد حسن و رواه البيهقي، وحسنه ابوعمرو بن الصلاح الشهرزوري[٢٢٦].

منیش ئەوەندەی سەرنجم دا هیچ کام لەو دوو رایەم بەسەری ئەوی دیکەیاندا بۆ هەلّنەبژێررا.

٨- دەست پێکردنی بەلای راست پێش چەپ لەهەموو کردەوەکاندا، چونکە بێجگە لەیاسای گشتی: (كان يُعْجِبُهُ التَّيامُنُ في شَأْنِهِ كُلِّهِ) متفق عليه، لەچەندان دەقی تایبەت بەدەستنوێژگرتنیشدا بەلای راست دەست پێکردن فەرمانی پێکراوە، بۆ وێنە: (اذا لَبِسْتُمْ واذا تَوَضأتُمْ فابْدأوا بأيامِنِكُمْ) رواه احمد واصحاب والسنن باسناد جيد، وقال ابن دقيق العيد كما نقل ابن حجر: هو حقيق بان يُصَحَّحَ[٢٢٧].

٩-دەست پێداهێنان و لێخشاندن (دلك)ی ئەندامەکانی دەستنوێژ، ئەمیش زۆربەی هەرە زۆری زانایان بەسوننەتو (مالكو مزني) یش بەفەرزی دەزانن لەهەرکام لەخۆشۆردنو دەستنوێژگرتن دا[٢٢٨].

منیش وای بۆ دەچم کە ئەگەر بەبێ دەست لێخشاندن ئەندامەکان تەڕ نەبن فەرزە ئەگەرنا سوننەتە، چونکە تەڕکردنی ئەندامەکان فەرزەو هەر شتێکیش فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ فەرز دەبێ.

---

[٢٢٤] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٩٥تا٥٠٠، هەرچەندە (نووی) رایەکەی دیکەی پەسند کردووەو وەسەرخستوە کە (شافعي) و (داود) و(احمد)یش لەرایەکیدا لەسەرنی.

[٢٢٥] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٧٢تا٧٦.

[٢٢٦] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٤٩٧، ٤٩٨.

[٢٢٧] بڕوانە: هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٤٤٣، پەراوێزی (محقق).

[٢٢٨] هەمان سەرچاوە، ج١ص...

١٠- بەدوای یەكدا هاتن (مُوالاة) ی شۆردنی ئەندامەكان، ئەمیش زانایان لەسەری یەكدەنگن كە سوننەتەو، هەمووشیان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كەپێوەخران و دواكەوتن (تأخر)ێكی كەم لەنێوان شۆردنی ئەندامەكان دا زیانی نیە، هەروەها ئەگەر زۆریش بێ مادام بەعوزرەوە بێ زۆربەی زانایان ڕایان وایە كە دیسان زیانی نیەو هەندێكیشیان دەڵێن زیانی هەیە[٢٢٩]، بەڵام ڕای جەماوەر كە (مالك و لیث و ثوري و شافعي واحمد و داود الظاهري و ابن المنذر) یان لەنێودان بەهێزترە[٢٣٠].

١١- دەستی تەڕ بەدەرەوەو نێوەوەی گوێیەكان دا هێنان، ئەمیش سەرجەم زانایان لەسەری یەكدەنگن كەدەبێ یان بشۆرێن یان مەسح بكرێن، چونكە ئەوانەی كەپێیان وایە گوێیەكان بەشێكن لە دەموچاو، دەڵێن دەبێ وەك ڕوو (وجه) بشۆرێن، ئەوانەش كە دەڵێن: دوو ئەندامی سەربەخۆن وەك: (شافعي و ابوثور) یان دەڵێن: بەشێكن لەسەر كە زۆربەی زانایانن و (قتادة و مالك و ابوحنيفة و ثوري و احمد وابن المبارك و اسحاق)یان لەنێودان، ڕایان وایە كەسوننەتە بەس بەدەستی تەڕ مەسح بكرێن[٢٣١].

دەقی سوننەتیش لەسەر مەسح كردنی گوێیەكان زۆرن، بۆ وێنە: (عن ابن عباس رضي الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وأُذُنَيْهِ ظاهِرَهُما وباطِنَهُما) رواه الترمذي وقال، حسن صحيح وروى ابوداود والنسائي وابن ماجة وغيرهم مثله.

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەستی تەڕی بەسەری و بەدەرەوەو نێوەوەی گوێیەكانیدا هێنا.

## دوو تێبینی:

١-زۆربەی هەرە زۆری[٢٣٢] زانایان ڕایان وایە كە دەبێ ئەو ئاوەی گوێیەكانی پێ پاك دەكرێنەوە ئاوێكی تازە (ماء جديد) بێت، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە: (عن عبدالله بن زيد رضي الله عنهما انهُ رأىٰ رسولَ الله ﷺ يَتوضأ فأخَذَ لأُذُنَيْهِ ماءً خِلافَ الماءِ الَّذي أَخَذَ لِرَأْسِهِ) رواه البيهقي وقال: اسناده صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوای ﷺ بینی، دەستنوێژی دەگرت، جا ئاوێكی دیكەی جیا لەوە بۆ مەسحی سەری هەڵیگرتبوو، هەڵیگرت و مەسحی گوێیەكانی پێكرد.

---

[٢٢٩] هەمان سەرچاوە، ج ص٥١٤

[٢٣٠] (ابن تيمية)ش هەر ڕای ناوبراوی پەسند كردوە، بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٨١تا٨٥.

[٢٣١] هەمان سەرچاوە، ج١ص٤٧١ تا٤٧٥.

[٢٣٢] بڕوانە: (المغني ج٢ ص١١٥، وە: (المجموع) ج١ص٤٧

١١- زانایـان پـاش یـەکدەنگ بوونیـان لەسـەر ئـەوە کـە پەسـندە گوێیـەکان پـاك بکرێنەوە لەسەر ئەوەش یەکدەنگ بوون - وەك (طبري) هێناویەتی - کە ئەگەر کەسێك گوێیەکانیشی پاك نەکاتەوە دەستنوێژەکەی هەر دروستە، کەواتە ئەوە کە لە (اسحاق بن راهویە) گێڕراوەتـەوە کـە مەسـح کردنـی گوێیـەکانی بەمـەرجی دروسـت بوونـی دەسـتنوێژ دانـاوەو گوتوویـەتی هـەر کەسێك بەئانقەسـت نـەیکات دەسـتنوێژەکەی بەرناکەوێ! وەك (نووي) گوتوویەتی ئیعتیباری پێناکرێ چونکە یەکدەنگی (اجماع) ی زانایانی پێش کەوتوە[٢٣٣].

١٢-بـەزیادەوە شـۆردنی دەموچـاوو دەسـتو لاقـەکان، ئـەمیش کەزۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان بەپەسندو چاکیـان زانیـوە[٢٣٤]، ژمارەیـەکی زۆر دەقـی سـوننەتی لەسـەر هەن بۆ وێنە:

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه قال سَمِعْتُ رسولَ الله ﷺ يقول: إِنَّ أُمَّتِي يَأْتونَ يَوْمَ القِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِيْنَ مِنْ أَثَرِ الوُضُوءِ، فَمَنْ اسْتَطاعَ منكم أَنْ يُطِيْلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ) رواه مسلم.

واتە: ئۆممەتی من ڕۆژی قیامەتێ بەنێو چاوان سپێتیو دەستو لاق بازووی دێن بەهۆی دەستنوێژەوە، جا هەر کامێکتان دەتوانێ سپێتییەکەی زیاترو درێژتر بکات با درێغی نەکات.

١٣- زیادەڕۆیی نەکردن لەبەکارهێنانی ئاودا، ئەمیش سەرجەم زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون، وەك لەباسی خۆشۆردنیش دا ڕوونمان کردەوەو ئەم فەرموودەیەشمان هێنایەوە: (عن انس رضي الله عنه قال: كان النبيُّ ﷺ يَغْتَسِلُ بالصّاعِ الى خَمْسةِ أَمْدادٍ وَيَتَوضَّأُ بِالمُدِّ) متفق عليه، جائێمە پێشتر ئەم فەرموودەیەمان تەرجەمە کردوەو باسی ئەندازەی (صاع)یشمان کردوەو لێرە دووبارەی ناکەینەوە، مەبەستیش لە (مد) پڕی هەردووك دەستی پێکەوە گیراوی ئینسانێکی میانەیە[٢٣٥].

---

[٢٣٣] بڕوانـە: (المجمـوع) ج١ص٤٧٥، (نـووي) گوتوویـەتی: "وحكـى القـاضي ابوالطيـب وغـيره عـن الشيعة انهم قالوا: لايُسْتَحَبُّ مَسْحُ الأُذُنَيْنِ لِأَنَّهُ لا ذِكْرَ لَهُما في القرآنِ! ولكنَّ الشيعةَ لايُعتَدُّ بِهِمْ في الخِلافِ".

[٢٣٤] هەندێکیشیان وەك (ابن بَطّال) گوتوویەتی: بەسوننەتی نـازانن، بـەبیانووی ئـەوە کـە زۆربـەی زانایان باسیان نەکردوە، بەڵام وەك (نووي) گوتوویەتی: مادام فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی لەسەر بێ هەر سوننەتە ئەگەر هیچ کەسیش نەیزانیبێ بڕوانە: المجموع ج١ص٤٩١.

[٢٣٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٣١٤.

١٤- پارانەوە دوای دەستنوێژ، ئەمیش تێکڕای زانایان لەسەر سوننەت بوونی ڕێك کەوتوونو چەند فەرمودەیەکیش لەوبارەوە هاتوون، بۆ وێنە:

*(عن عمر رضي الله عنه ان رسول الله ﷺ قال: مَنْ تَوَضَّأَ فقال: أَشْهَدُ أَنْ لاَّ اِلهَ الا الله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ واشهدُ أَنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إلاّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ الثَّمانِيَةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّها شاءَ) رواه مسلم واصحاب السنن. وزاد الترمذي في روايته: (اَللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوابِيْنَ وَاجْعَلْني مِنَ المُتَطَهِّرِيْنَ).

واتە: هەرکەسێك دەستنوێژ بگرێ و بڵێ: شایەدی دەدەم کە بێجگە لەخوا هیچ پەرستراونین و تەنیایەو هیچ هاوەڵی نین، وەشایەدی دەدەم کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی وی‌یە، ئەوە مسۆگەر هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ ئاوەڵا دەکرێن و لەهەر کامێکیانەوە حەز بکات دەچێتە ژوورێ.

(ترمذي) ئەمەشی زیادکردوە: ئەی خوایە بمگێڕە لەباش گەڕاوان و بمگێڕە لەپاکبووەوان.

١٥- دوو ڕکات نوێژی دەستنوێژ، لەوبارەشەوە فەرمووده زۆرن یەکێکیان ئەوەیە کە لەخاڵی یەکەم (دەستنوێژ چی‌یەو چۆن دەگیرێ؟) دا هێناومانەو (بخاري ومسلم) لە (حُمْران مَوْلىٰ عثمان بن عفّان) ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە.

## چوار: هەڵوەشێنەرەوەکانی دەستنوێژ (نواقض الوضوء)

زانایان دەربارەی ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەو شکاندنی دەستنوێژ مشتو مڕو ڕاجیایی (اختلاف)ی زۆریان بووە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر ئەم چوارەی خوارەوە ڕێك کەوتوونو واش پێدەچێ جگە لەو چوارە شتەکانی دیکە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان لەسەر نەبێ:

١-هەر شتێک لەپاش و پێش (الدُّبُرْ و القُبُلْ) بێتە دەرێ: چەندان دەقی ڕاست و ڕاشکاو (صحيح و صريح) ئەوە دەگەیەنن کە هاتنەدەرەوەی هەرشتێك لەپێش و پاشی ئینسان دەستنوێژی پێ‌دەشکێ، وە زۆربەی[٢٣٦] هەرە زۆری نزیك بەیەکدەنگی زانایان لەسەر ئەو مەسەلەیە کۆکن، ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

* خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (.. أوجاءَ أَحَدٌ مِنكُمْ مِنَ الغائِطِ..) النساء -٤٣-. کە بێگومان میزو پیسایی دەگەیەنێ.

---

[٢٣٦] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ص١٦٠، شایانی باسە کە لەسەر میزو پیسایی و مەذی و وەدی زانایان یەکدەنگن، بەڵام لەسەر شتە دەگمەنەکان هەندێك لەزانایان ڕایان جیایە.

*(عن عبدالله بن زيد بن عاصم ﷺ قال: شُكِيَ الى النَبيّ ﷺ الرَجلُ يخيلُ إليهِ انهُ يَجدُ الشَيئَ في الصَّلاة؟ فقال: لاينصَرِفُ حَتَى يَسْمَعَ صَوْتاً أو يَجِدُ رِيْحاً) متفق عليه.

واته: سكالآ برايه لاى پێغەمبەرى ﷺ لەوبارەوە كە كابرا وا دەزانێ كە لەنوێژیدا هەست بەشتێك دەكات؟ فەرمووى: با هەتا دەنگێك نەبیستێ یان بۆنێك نەكات نوێژەكەى بەجێ نەهێڵێ.

دیارە وەك (نووي) گوتوویەتی[٢٣٧]: مەبەست لەبیستنی دەنگ یان بۆن كردن دڵنیابوونە لە (با) لێبوونەوە، واتە: تڕ (ضُراطْ) وفس (فُساءْ).

وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەى ناشقاو (مذي) فەرموویەتی: (يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ) متفق عليه عن علي رضي الله عنه.

هەروەها (ابن مسعود وابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ گوتوویانە: (في الـوَدْيِ الوُضُوءُ) رواه البيهقي.

٢- نوستن، خەوتن: زانایان دەربارەى شكان و نەشكانی دەستنوێژ بەهۆی نووستن (نوم) ەوە ڕاجیایی (اختلاف)ی زۆریان هەیە[٢٣٨]:

هەندێكیان پێیان وایە نووستن بەموتڵەقی دەستنوێژ دەشكێنێ كە هەركام لە (اسحاق بن راهَوَيْهْ وابو عُبَيْد و المُزَني وابن حَزْم)[٢٣٩] یان لەنێودان، هەندێكیشیان ڕایان وایە كەهیچ جۆرە خەوتنێك دەستنوێژ ناشكێنێ كەهەركام لە (ابو موسى الأشعري وسعيد بن المسيب وابو مجلزو حميد الأعرج) یان لەنێودان، هەندێكیشیان كە (مالك و أحمد) یان لەنێودان ڕایان وایە كەخەوتنی زۆر دەستنوێژ دەشكێنێ بەڵام هی كەم نایشكێنێ، زۆربەشیان كە (ثوري و ابن المبارك و شافعي) و (احمد) لەڕایەكیدا لەنێویان دا هەن، هەروەها (ابوحنيفة وداود)یش ڕایان لێیانەوە نزیكە، دەڵێن: ئەگەر شێوەى خەوتنەكە بەجۆرێك بێت كەبابای نووستوو ژێرەوەى خۆی لەزەوی چەسپاندبێ و (مُتَمَكِّنْ) بێت دەستنوێژی ناشكێ، ئەگەرنا دەشكێ، هەركام لە (ابن تيمية)[٢٤٠] و(شوكاني)[٢٤١]یش ئەم ڕایەیان پەسەندكردوە.

---

[٢٣٧] بروانە: (المجموع) ج٢ص ٤، ٥.

[٢٣٨] بروانە: (المجموع) ج٢ص٢٢، كەسەرجەم ئەو ڕا جیاییەم لێوە نەقڵ كردوە.

[٢٣٩] بروانە: (المحلى) ج١ص٢١٨، مسالة: ١٥٨.

[٢٤٠] بروانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٢٢٢تا ٢٢٤.

منیش پێم وایە کە ئەم ڕایەی دوایی بەهێزترو بەڵگەدارترە وەك ڕوونی دەكەینەوە، وە دەبێتە هۆی كۆكردنەوەو كارپێكردنی سەرجەم فەرموودەكانیش، وە واشی بۆ دەچم كە جیاوازی لەنێوان دانیشتن بەشێوەی خۆ چەسپاندن (علىٰ هَيْئَةِ المُتَمَكِّنِ) و ڕاوەستان (قیام) یش دا نیە وەك هەندێك لەزانایانیش گوتوویانە[٢٤٢]. ئەمەش چەند دەقێك دەربارەی بابەتی لێكۆڵراوە.

*(عن صَفْوان بن عَسّال قال: كان رسول الله ﷺ يأمُرنا إذا كُنّا سَفراً أنْ لانَنزِعَ خِفافَنا ثَلاثَةَ أيّامٍ ولياليهِنَّ إلاّ مِنْ جِنابَةٍ لكِنْ مِنْ غائطٍ وبَوْلٍ ونَوْمٍ) رواه احمد والنسائي والترمذي وصححه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەكردین كە ئەگەر ڕێبوار بووین خوفەكانمان سێ ڕۆژ و سێ شەوان دانەكەنین مەگەر بەهۆی لەش پیسیەوە، بەڵام بەهۆی پیسایی و میزو خەوتنەوە دایان نەنێین؛ ئاشكرایە كە ئەم فەرموودەیە هەرچەندە زانایان قسەیان لەسەری هەیە دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات كە نووستنی ئاسایی وەك میزكردن و پیسایی‌كردن دەستنوێژ دەشكێنێ.

*(عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: العَيْنُ وِكاءُ السَّهِ فَمَنْ نامَ فَلْيَتَوَضَّأ) رواه احمد وابوداود وابن ماجة.

واتە: چاو دەزووبەندی كۆمە، جا هەر كەسێك خەوی لێكەوت با دەستنوێژ بگرێتەوە، وشەی (وكاء) بەو دەزوو و بەنە دەگوترێ كە زاری كوندەو مەشكەو شتی وای پێدەبەسترێ، وشەی (سَه) یش ناوە بۆ (دُبُر)ی ئینسان.

دیارە ئەم دوو فەرموودەیەی كەڕابردن بەڵگەن لەسەر دەستنوێژ شكان بەخەوتن، بەڵام چەند فەرموودەیەكی دیكەش هەن دەریدەخەن كە هەموو جۆرە خەوتنێك دەستنوێژ ناشكێنێ وچەمك و واتای گشتی ئەو فەرموودانە تایبەت (تخصیص) دەكەن بەجۆرە نووستنی عادەتی‌یەوە كەڕاكشانە لەسەر پشت یان تەنیشت:

*(عن انس رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: (اذا نَعَسَ أحَدُكُمْ في الصَّلاةِ فَلْيَنَمْ، حتّى يَعْلَمَ ما يَقرأ) رواه البخاري[٢٤٣].

واتە: ئەگەر یەكێتكان لەنوێژێدا وەنەوزی هاتێ با بخەوێ، تاكو بزانێ چی دەخوێنێ.

---

[٢٤١] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٢٤١.

[٢٤٢] وەك (ابوحنيفة وداود) بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٢.

[٢٤٣] بڕوانە: (فتح الباري) ج٢ص٤٢٠.

لـەم فەرمووده‌یـەوە دەزانـرێ کـە خـەوتنی کـەم دەسـتنوێژ ناشـکێنێ، ئەگـەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی دەکردەوەو ڕای دەگەیاند کە بابای وەنەوزگرتوو (ناعِسْ) دەستنوێژی شکاوەو با بیگرێتەوە.

*(عن انس رضي الله عنه قال: أُقِيْمَتْ صَلاةُ العِشاء فقال رَجُلٌ: لِيْ حاجَةٌ، فقامَ النَّـبِيُّ ﷺ يُناجِيْهِ حَتّى نامَ القَوْمُ أَوْ بَعْضُ القَوْمِ ثُمَّ صَلُّوا) رواه مسلم.

واتە: قامەت بۆ نوێژی خەوتنان کراو پیاوێك گوتی: ئیشێکم هەیە، جا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بەئەسپایی دواندی هەتا خەڵکەکە یان هەندێك لەخەڵکەکە خەوتن، پاشان نوێژیان کرد.

*(عن ابن عباس رضي الله عنه قال: إِعْتَمَّ رَسولُ اللهِ ﷺ بالعِشاءِ حَتَّى رَقَدَ النّاسُ وَاسْتَيْقَظُوا وَرَقَدُوا وَاسْتَيْقَظُوا) رواه البخاري.

واتە: شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی خەوتنانی دواخست هەتا خەڵکی خەویان لێکەوت پاشان بێداربوونەوەو پاشان خەوتنەوەو پاشان بێداربوونەوە.

*(عن انس رضي الله عنه قال: كانَ أَصْحابُ رَسولِ اللهِ ﷺ يَنامُونَ ثُمَّ يُصَلُّـونَ ولايَتَوَضَّـؤُونَ) رواه ابوداود وغيره باسناد صحيح.

واتـە: هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ جـاری وابـوو خـەویان لـێدەکەوت پاشـان بێئەوەی دەستنوێژ بگرنەوە نوێژیان دەکرد.

ئەم چوار دەقەش کەڕابردن دەری دەخەن کە هەموو جۆرە خەوتن (نوم) ێك نابێتـە هـۆی هەڵوەشـاندنەوەی دەستنوێژ ڕوونـی دەکەنەوە کەدەقـەکانی دیکە کە دەلالـەت لەسەر شکانی دەستنوێژ دەکەن بەهۆی خەوتنەوە، موتڵەقی خەوتنیان مەبەست نیە، بەڵکو مەبەستیان خـەوتنی ئاسایی (نوم عـادي)یە، وەك چۆن فەرمووده‌کانی دوایی مەبەستیان لەخەوتن جۆرە خـەوتنێکی تایبەتی‌یـە کەبریتیە لەوەی بابای نووسـتوو بەشێوەیەك بخەوێ کەخۆی قایم کردبێت و ئیحتمالی دەستنوێژ شکانی بەهۆی (با) لێبوونەوەوە زۆر کەم بێتەوە.

دیاره بەم شـێوەیەش سـەرجەم فـەرموودەکان کۆدەبنـەوەو یـەکتر تـەواو دەکـەن. بۆیـەش من ڕاوەسـتان (قیـام) یشـم خسـتە گـەڵ جـۆرە دانیشـتنی چەسـپاو (القعـود المتمکن) و لەڕای جەماوەری زانایانم زیادکرد چونکە وەك چۆن لەدەقەکانی سوننەت دا باسـی ئەوجۆرە دانیشتنە کراوە کە دەستنوێژی پێ ناشکێ، بەهـەمان شـێوەش

باسی ڕاوەستان (قیام)یش کراوە کە بابای خەوتووی بەپێوە وەستاو دیسان دەستنوێژی ناشکێ، کە ئەم فەرموودەیەیە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنه قال: قام رسولُ الله ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيلِ فقُمْتُ الىٰ جَنْبه الأيْسرِ فَجَعَلني في شِقِّهِ الأيْمَنِ فجعلتُ إذا أغفيتُ يأخُذ بشَحْمةِ أُذُني، فَصَلّى إحْدىٰ عَشْرَةَ رَكْعَةً) رواه مسلم.

شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە واتە کە شەو نوێژ بکات، منیش لەتەنیشتی لای چەپی‌یەوە ڕاوەستام، ئەویش هێنامیە لای ڕاست، ئنجا منیش کەجاروبار چاوم دەچوونە خەوەوە (پێغەمبەر ﷺ) نەرمەی گوێی دەگرتم - و بێداری دەکردمەوە - وە یازدە ڕکات نوێژی کرد.

٣-بێهۆش بوون و لاچوونی عەقڵ بەهەر هۆیەکەوە بێت: زانایان[٢٤٤] تێکڕا لەسەر ئەوە کۆك و ڕێکن کە هەر کەسێك بەهەر هۆیەکەوەبێ عەقڵ و هۆشی لەلانەمێنێ، وەك شێتی، لەخۆچوون، فێگرتن، سەرخۆش بوون، بەنج کران، ئەوە دەستنوێژی نامێنێ، (ابن المنذر) و زانایانی دیکەش یەکدەنگی (اجماع) ی زاناو پێشەوانیان لەوبارەوە نەقڵ کردوە[٢٤٥]، دیارە بەر لەیەکدەنگی‌ی زانایانیش ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري ومسلم)[٢٤٦] لە (عائشة) یان گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەنەخۆشی کۆچکردنی‌دا سێ کەڕەتان لەخۆی چووەو کەبێداربۆتەوە خۆی شۆردوە.. بۆ نوێژ، بەڵگەیە لەسەر دەستنوێژ نەمان بەهۆی لەخۆچوونەوەو بگرە هەندێکیان ڕایان وایە کە خۆشۆردنیشی لەسەر پێویست دەبێ، بەڵام مادام زانایانی وەك (ابن المنذر) و (ابن الصباغ) یەکدەنگی‌ی زانایانیان لەسەر ئەوە هێناوە کە خۆشۆردنی لەسەر فەرز نیە قسەکەیان بە ڕیز پەڕ (شاذ) دادەنرێ[٢٤٧].

---

[٢٤٤] بڕوانە: (المغني) ج١ص ١٦٤، کە گوتوویەتی: (وزَوالُ العَقْل علىٰ ضَرْبَيْن: نَوْمٌ وغَيْرُهُ، فامّا غَيْرُ النَّوْمِ وهو الجُنونُ والأغْماءُ والسُّكر وما أشْبَهَهُ من الأدوية المُزيْلَةِ لِلعَقْل فَيَنْقُضُ الوُضُوءَ يَسيْرُهُ وكثيرُهُ إجْماعاً)، وەبڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٨.

[٢٤٥] بڕوانە هەردووك سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕەکانیان.

[٢٤٦] ) بڕوانە (فتح الباري) ج٢ص٣٩٩.

[٢٤٧] ) بڕوانە: (المجموع) ج٢ص ٢٩، ٣٠.

٤- دەست لێدانی ئەندامی زاوزێ (لمس العضو التناسلي): زانایان لەوبارەوە کە ئایا بەدەست پێکەوتنی ئەندامی جنسی دەستنوێژ دەشکێ یان نا ڕا جیایی (اختلاف)ی زۆریان هەیە:

جارێ بەشێکیان کە جگە لە (علي و ابن مسعود و حذيفة وعمار وابن عباس وعمران بن الحصين وابو الدرداء) خوا لێیان ڕازی‌بێ (ربيعة وثوري و ابوحنيفة واصحابه و ابن القاسم وسُحْنون وابن المُنْذِر) یان لەنێودان دەڵێن بەهیچ شێوەیەک دەست پێکەوتنی ئەندامی جیسنی دەستنوێژ ناشکێنێ[٢٤٨]، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

*(عن طلق بن علي رضي الله عنهما قال: قَدِمْنا علىٰ النبيِّ ﷺ فجاءَ رَجُلٌ كأنَّهُ بَدَوِيٌّ فقال: يا نَبِيَّ اللهِ ماترىٰ في مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بعْدَما يَتَوَضَّأ!! فقال: هَلْ هُوَ إلاّ بضْعةٌ مِنْكَ!) رواه احمد واصحاب السنن وغيرهم.

واتە: چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا پیاوێك هات دەتگوت خێڵەکی‌یە گوتی ئەی پێغەمبەری خوا! ڕات چی‌یە دەربارەی دەست لێدانی پیاو لەچوکی خۆی پاش دەستنوێژگرتن؟ فەرمووی: ئایا ئەویش هەر پارچەیەك نیە لەخۆت!

زۆربەشیان کە جگە لە: (عمر بن الخطاب وسعد بن ابي الوقاص وابن عمر وابوهريرة و عائشة) خوا لێیان ڕازی‌بێ، (سعيد بن المسيب وعطاء وأبان بن عثمان وعروة بن الزبيرو سليمان بن يسار ومجاهد وابوالعالية والزهري و مالك و اوزاعي و اسحاق وابو ثور و شافعي واحمد والمزني) یشیان لەنێودان، دەڵێن:

ئەگەر بەبەری دەستی دەستی لێ‌بدات دەستنوێژی دەشکێ، ئەگەرنا ناشکێ، هەندێکیشیان گوتوویانە جیاوازی پشتی دەستو بەری دەست نیە[٢٤٩].

هەندێکیش لەزانایان گوتوویانە ئەگەر بەئانقەست یان بەئارەزووە وە بێ دەشکێ ئەگەرنا ناشکێ[٢٥٠].

بەڵگەی ئەوانەش کە دەڵێن: ئەگەر بەبەری دەستی دەستی لێ‌بدات دەستنوێژی دەشکێ ئەم فەرموودەیەیە:

---

[٢٤٨] بڕوانە: ٠المجموع) ج٢ص٥٢.

[٢٤٩] بڕوانە: هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٥١.

[٢٥٠] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص١٣٢، وە بڕوانە: (الوجيز في فقه السنة و الكتاب العزيز تاليف: عبدالعظيم بدوي، ص٣٧.

*(عن بُسْرَةَ بِنتِ صفْوانٍ رضي الله عَنْهاان النبي ﷺ قال: إِذا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ فليتوضّأ) رواه احمد واصحاب السنن وغيرهم.

واته: هەركەسێك دەستی لەچووك (ذكر) ی خۆیدا با دەستنوێژ بگرێتەوە.

منیش وای تێدەگەم كە ئەو رایە لەهەموو رایەكان راست ترە كەدەڵێ: ئەگەر بە ئانقەستو بەئارەزووەوەبێ دەستنوێژی دەشكێ ئەگەرنا ناشكێ، وە ئەم رایە سەرجەم فەرموودەكانیش كۆدەكاتەوەو كار بەهەموویان دەكات، بەم شێوەیە:

ئەو فەرموودەیەی كە وەڵامی پرسیاری بابای پرسیاركەری خێڵەكی داوەتەوە بۆ حاڵەتێكە كە ئینسان بەبێ ئاگاداریو ویستی خۆی دەستی بەر چووكی (ذكر)ی دەكەوێ، وە فەرموودەكەی دیكەش بۆ حاڵەتێكە كە ئینسان بەئانقەست (دیارە بەئانقەستیش حەتمەن ئارەزووی لەگەڵ دایە یان بێ سەلیقەیی‌یەكی خراپتر لەئارەزوو) دەستی لێبداتو هەر ئەسڵی تەعبیرەكەش ئەوەی لێ دەفامرێتەوە: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ) كە مسۆگەر دەلالەت لەسەر ویستنو مەبەست (قَصْد) دەكات.

جا دیارە ئەو دوو فەرمودەیەی هێناومانەوە تایبەتن بەپیاوانەوە، بۆیە زۆر لەزانایان رایان وایە كە ئەو مەسەلەیە ئافرەتان ناگرێتەوە[251]، هەندێكیشیان[252] وەك (شافعي و احمد) رایان وایە كە ئافرەتو پیاو لەوبارەوە وەك یەكنو ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە:

*(عن بسرة بنت صفوان ان رسول الله ﷺ قال: إذا مَسَّ احدكُم فرجه فليتوضأ والمرأةُ مِثْلُ ذٰلِكَ) رواه البيهقي والدارمي وابن حبان[253].

واته:هەركات یەكێكتان دەستی لەداوێنیدا با دەستنوێژ بگرێتەوە، وە ئافرەتیش هەروایە.

واش پێدەچێ ئافرەتیش هەمان حوكمی پێشووی هەبێت كە هەڵمان بژارد؛ بەڵام ئەندامی جنسی غەیری ئینسان ئەوە وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی[254]: زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە دەست لێدرانی دەستنوێژ ناشكێنێ بەزیندویی بێت یان

---

[251] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٥٥، ئەمە رای: (ابوحنيفة و مالك)ە.

[252] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە، وە بڕوانە، (المغني) ج١ص١٨٦.

[253] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٥٥، پەراوێزی (محقق).

[254] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص١٢٢

بەمردوویی، بەڵام (نووي) هێناویەتی کە (عطاء و لیث) ڕایان وایە ئەویش دەستنوێژ دەشکێنێ[255]، بەڵام بێگومان ڕایەکەیان ڕیزپەڕە (شاذ)ە.

ئنجا بۆ دەست دان لەکۆم (دُبُرٌ) یش، کە مەگەر بەقیاس بۆ سەر (ذکر، فرج) ئەگەرنا هیچ دەقێکی لەسەر نیە، یان مەگەر بگوترێ وشەی داوێن (فرج) ئەویش دەگرێتەوە، ئەوە دیسان زانایان ڕایان جیاوازەو زۆربەیان کە (ابو حنیفة و مالك و احمد) لەقسەیەکیدا، لەنێویان دان، دەڵێن: دەستنوێژ ناشکێنێ و هەندێکیشیان کەزۆربەی شافیعیەکان و (احمد) لەقسەیەکیدا، لەنێویان دا دەڵێن: وەك دەست لەچووك (ذکر) دان ئەویش دەستنوێژ دەشکێنێ[256].

پێشم وایە ڕای یەکەم ڕاستو تەواوەو ئەو جۆرە مەسەلانە بەبێ دەق (نص) ی شەرعی ئیسپات نابن.

جا خوێنەری بەڕێز! ئەو چوار شتەی باس کران وەك بۆت ڕوون بۆوە هەرکامیان دەقی قورئان یان سوننەتی لەسەرەو تێکڕا یان زۆربەی زانایانیش لەگەڵ چەند وردە جیاوازیەك لەبیرو ڕایەکانیان دا لەسەریان پێکهاتوون، بەڵام بێجگە لەو چوارە چەند شتێکی دیکەش هەن کە کە مو زۆر زانایان پێیان وایە دەستنوێژ دەشکێنن، بەڵام واپێ دەچێ بێجگە لەو چوارەی کەباس کران شتەکانی دیکە هیچ کامیان بەڵگەیەکی ئەوتۆی لەسەرنەبێ کەبایی ئەوە بکات ئیسپاتی دەعوای پێبکرێ.

ئەمەش سەرژمێرێکی کورتو خێرای ئەو شتانەی دیکە:

**٥-بەریەک کەوتن المس)ی پێستی پیاوو ئافرەت: کەشەرعزانان بەوشەی** (إلتِقاءُ البَشَرتَينْ)ی ناوی دەبەنو کێشەومشتو مڕی زۆری لەسەرە کە ئەمە کورتەو پوختەکەیەتی[257].

ا-شافیعیەکان ڕایان وایە پێك کەوتنی پێستی پیاوو ئافرەتێکی بەیەك شیاو بەموتڵەقی دەستنوێژ دەشکێنێ و بەڵگەشیان ڕستەی: (أَوْ لَٰمَسْتُمُ النِّسَاءَ) النساء (٤٣)، یە، کە بە: (لَمَسْتُمْ)یش خوێندراوەتەوەو دەڵێن مەبەست دەست لێدرانو پێست بەریەك کەوتن (التقاء البشرتين)ە.

---

[255] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٥٥.

[256] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

[257] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٧، ٣٨.

ب- بەشێکیش لەزانایان کە(ابو حنيفة و سفيان الثوري) يان لەنێودان دەڵێن: بەهیچ شێوەیەك دەستنوێژی پێناشکێ و ڕستەی: (اولا مستم النساء)ەش بەجوت بوون (جماع) تەفسیر دەکەن.

ج-زۆربەش کە (حمادو مالك و ليث و اسحاق) وە ڕیوایەتێکی (ثوري واحمد)یش، لەنێویان دان دەڵێن: ئەگەر بەئارەزووەوە بێ دەیشکێنێ ئەگەرنا ناشکێ.

د-(داود الظاهري)یش ڕای وایە کە ئەگەر بەئانقەست (عمداً) بێت دەشکێ، ئەگەرنا ناشکێ.

واش پێدەچێ ڕای دووەم لەهەموویان بەهێزتر بێت چونکە چەند دەقێك پشتگیری دەکەن بۆ وێنە:

*(عن ابراهيم التيمي عن عائشة رضي الله عنها أَنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ ثُمَّ يُصلِّي ولا يَتَوضَّأ) رواه ابوداود و النسائي وهو مرسل لان ابراهيم التيمي لم يسمع من عائشة وقال النسائي ليس في هذا الباب احسن من هذا الحديث وان كان مرسلاً، ورواه ايضاً كل من احمد والترمذي وابن ماجة من طريق عروة بن الزبير[٢٥٨].

واتە: پێغەمبەر ﷺ هەندێك لەهاوسەرەکانی خۆی ماچ دەکردن پاشان بێئەوەی دەستنوێژ بگرێتەوە نوێژی دەکرد.

*(عن عائشة قالت: فَقَدْتُ رسولَ الله ﷺ ليلةً مِنَ الفِراشِ فالْتَمَسْتُهُ فوضَعْتُ يَدِيْ على باطِنِ قَدَمَيْهِ وهو في المَسْجِد وهُما مَنْصُوبَتانِ..) رواه مسلم والترمذي.

واتە: شەوێك پێغەمبەری خوام ﷺ لەسەر جێگا نەبینی، بۆی گەڕام بینیم لەمزگەوتەو - لەسەجدەدایە- هەردووك پێیەکانی چەقاندوون منیش دەستم بۆ گێڕاو دەستم لەسەر بەری پێیەکانی دانا..

ئنجا دوای ڕای دووەم ڕای سێیەم کەڕای زۆربەی زانایانیشە لەڕایەکانی دیکە بەهێزترە، بەتایبەتیش کە ڕایەکی میانە (وَسَط) یەو سەرجەم دەقەکانیش کۆدەکاتەوە، بەڵام پێم وایە ڕای چاکتر ئەوەیە کە بگوترێ: سوننەتەو پەسەندە کەبابای بەئارەزوەوە دەست یان پێست (بشرة) بەئافرەتی پێشیاو (اجنبية) کەوتوو، دەستنوێژ بگرێتەوە[٢٥٩].

---

[٢٥٨] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج١ص٢٤٦

[٢٥٩] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ ص ١٣٦ تا ١٣٩.

٦- خواردنـی هـەر شـتێک کـە بـەئاگر ئامادەکرابـێ وەک گۆشـتو بەتایبەتی گۆشتی حوشتر: لەو بارەشەوە زانایان مشتومڕی زۆریان بووە، کە ئەمە پوختەی ڕاوبۆچوونەکانیانە[٢٦٠]:

أ-کەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە کە جگە لـەچوار خەلیفە ڕاشیدەکان خـوا لێیان ڕازیبێ (ابوحنیفة ومالك وشافعي وثوري واحمد واسحاق)یشیان لـەنێودان، دەڵێن: هیچ جۆرە خواردنێك دەستنوێژی پێناشکێ، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

*(عن جابر رضي الله عنه قال: كان آخِرُ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسولِ الله ﷺ تركُ الوُضُوءِ مِمّا غَـيرتِ النارُ) رواه ابوداود والنسائي والبيهقي وابن حبان وابن خزيمة وغيرهم بأسانيد صحيحة.

واتـە: دوایین بڕیاری پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو خواردنانەوە کە بەهۆی ئاگرەوە سازدەکرێن، دەستنوێژ نەگرتنەوەیە.

ب-کۆمەڵێکیش ڕایـان وایـە کەهـەر خواردنێك تینـی ئاگری گەیشـتبێتێ فـەرزە بەهۆی خواردنییەوە دەستنوێژ بگیرێتەوە، بەڵگەیشیان ئەم فەرموودەیەیە: (عن ابـي هريرة وعائشة وزيد بن ثابت رضي الله عنهم عن النبيِّ ﷺ توضأوا مِمّا مَسّتِ النّارُ)رواه مسلم.

واتە: هەر خواردنێك تینی ئاگری گەیشتبێتێ (کەخو اردتان) دەستنوێژ بگرنەوە.

ج- کۆمـەڵێکیش کـە (نـووي) گوتوویـەتی ڕای: (احمـدو اسـحاق و ابوثـور)ەو پەسندکراوی (ابن خزيمة وابن المنذر)یشە، وە (نووي) خۆیشی هەڵیبژاردوە، دەڵێن: بەس خواردنی گۆشـت حووشـتر (جَـزُور) دەسـتنوێژ دەشـکێنێ، بەڵگەشـیان چـەند فەرموودەیەکە بۆ وێنە:

(عن جابر بن سمرة رضي الله عنه أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رسولَ الله ﷺ: أَنَتوضَّأُ مِنْ لُحومِ الغَنَمِ؟ قال: إِنْ شِئْتَ تَوَضَّأْ، وإِنْ شِئْتَ فَلا تَتَوَضَّأْ، قال: أَنَتَوضأُ مِنْ لُحومِ الإِبلِ؟ قال: نَعَمْ تَوَضَّأْ مِنْ لحُومِ الإِبِلِ، قال، أُصَلّي في مَرابِضِ الغَنَمِ؟ قال: نَعَمْ، قال: أُصَلِّـي في مرابِضِ الإِبـلِ؟ قـال: لا) رواه احمد ومسلم.

وەك دەبینین پێغەمبەری خـوا ﷺ دەسـتنوێژگرتنەوەی بـەهۆی خواردنـی گۆشـتی مەڕو بزن بەپێویست نەزانیوە، بەڵام بەهۆی خواردنی گۆشتی حوشترەوە بەپێویستی زانیوە، هەروەها نوێژکردنی لەئاغەڵی مەڕو بزن دا بەدروستو لەئاغەڵی حوشتردا بە نادروست داناوە.

---

[٢٦٠] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٧٠تا٧٥-وە: (نيل الأوطار) ج١ص٢٥٢تا٢٥٥.

منيش واى بۆ دەچم ڕاى سێيەم زۆر بەهێزە هەرچەندە قەناعەتم هەر بەلاى ڕاى يەكەمدايە وە واى تێ دەگەم كە (جابر بن عبدالله) لەخۆوە نەيگوتوە، (كَانَ آخِرُ الأَمْرَيْنِ.. الخ)، ئنجا لەڕاستىدا ئەگەر ئەوەى (جابر بن عبدالله) خوا لێى ڕازى بێ گێڕاويەتەوە، وەك زۆربەى زانايان گوتوويانە بەلابەر (ناسخ) دانەنێين، ئەوە بێگومان بەپێى فەرموودەى: (تَوَضَّأُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ) رواه مسلم، پێويستە هەموو ئەو گۆشتو خواردەمەنىيانەى كە تينى ئاگريان دەگاتێ ببنە هەڵوەشێنەرەوەى دەستنوێژ نەك تەنيا گۆشتى حوشتر! وە ئەگەر بشگوترێ ئەو فەرمان (أمر)ە بۆ (نَدْب) ە نەك (وجوب)، دەگوترێ، دە مادام وايە با (بانێكەو دوو هەوا) نەبێو فەرمان كردن بەدەستنوێژ گرتنە وە بەهۆى خواردنى گۆشتى حوشتريش هەر بەسوننەت دابنرێ.

### ٩،٨،٧ - ڕشانەوەو كەڵەشاخ گرتن (الحجامة) و خوێن لێهاتنو خوێن ڕاسان:

هيچ كام لەمانە بەڵگەيەكى شەرعى ڕوونو بێچەندو چوونيان لەسەرنيە كە دەستنوێژيان پێ بشكێ، چ زۆربن چ كەم، (بغوي)[٢٦١] وەك (نووي) لێيەوە نەقڵى كردوە گوتوويەتى: ئەمە ڕاى زۆربەى هاوەڵانو شوێن كەوتوان (الصحابة والتابعين)ە خواليان ڕازى‌بێ، وە ڕاى: (مالك و شافعي و ربيعة و ابوثور و داود)ە، هەندێكيش كە (ابوحنيفة و ثوري و اسحاق و اوزاعي واحمد) و وەك (خطابي) گوتوويەتى: زۆربەى شەرعزانان (فقهاء) يشيان لەنێودان، ڕايان وايە كە هەركامێكيان دەستنوێژ دەشكێنێ، وە كۆمەڵێك دەق (نص) يشيان لەوبارەوە هێناون، بەڵام (ابوبكر بن المنذر) گوتوويەتى[٢٦٢]: ( لا وُضُوءَ فِي شَيءٍ مِنْ ذلِكَ لِأَنِّي لا أَعْلَمُ مَعَ مَنْ أَوْجَبَ الوُضُوءَ فِيهِ حُجَّةً)

واتە: هيچ كام لەو شتانە دەستنوێژگرتنيان پێويست نيە چونكە ئەوەى دەستنوێژى بۆ ئەو شتانە پێويست كردوە هيچ بەڵگەيەكيان بەدەستەوە شك نابەم!! (نووي)يش دەربارەى ئەم قسەيەى (ابن المنذر) گوتويەتى: (هذا كَلامُ ابْنُ المُنْذِرِ الَّذي لاشَكَّ فِي إِتْقانِهِ وتَحْقِيقِهِ وكَثْرَةِ إطِّلاعِهِ علَى السُّنَّةِ ومَعْرِفَتِهِ بالدَّلائِلِ الصَّحيحةِ وعَدَمِ تَعَصُّبِهِ)

---

[٢٦١] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٦٥.

[٢٦٢] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٦٩.

واتـه: ئەمە ڕای (ابن المنذر) كە هیچ كەسێك گومانی لە وردە كاریو پشكنینو شارەزایی زۆری دەربارەی سوننەتو زانیاری لەبارەی بەڵگە ڕاستو دروستەكانەوە، نیە وێڕای دەمارگیر (متعصب) نەبوونی[٢٦٣].

## ١٠- دوو دڵی (شک) پەیدابوون دەربارەی شكانو نەشكانی دەستنوێژ:

ئەمیش زۆربەی[٢٦٤] هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە كەهیچ زیانی نیە بۆ دەستنوێژ چونكە هەرشتێك لەسەر یەقین بنیات نرابێ بەگومان هەڵناوەشێتەوە (اليَقِيْنُ لاَيـزُوْلُ بِالشَّـكِّ) و ئەم بنچینەیەش تێكڕای زانایـان لەسـەری یـەكدەنگن، پێغەمبـەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إِذَا وَجَدَ أَحدكُمْ فيِّ بطنه شَيْئاً فَأَشْكَلَ عَلَيهِ أَخَرَجَ مِنْهُ شَـئٌ أَمْ لا؟! فَلا يَخْرُجْ مِنَ المَسْجِدِ حَتّى يَسْمَعَ صَوْتـاً أَوْ يَجِـدَ رِيْحـاً)[٢٦٥] رواه مسلم والترمذي عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتـه: ئەگـەر یـەكێكتان لـەزگیدا هەسـتی بەشـتێك كـردو كەوتـە گومانـەوە داخـوا هیچی لـێدەرچووە یان نا؟! با لەمزگەوتێ نەچێتە دەرێ هـەتا دەنگێك دەبیستێ یان بۆنێك دەكات.

ئنجا وەك (نووي) یش گوتوویەتی زانایان بنچینە (قاعدة)ی ناوبراویشیان هەر لەم فەرموودەیەوە وەرگرتوە[٢٦٦].

## پێنج: دەستنوێژ بۆچیو چی پێویست دەبێ؟!

لەسـۆنگەی ئـەوەوە كـە لـەخاڵی دووەمـی برگـەی سێیەم (لـەش پیسـی گـەورەو گچكە)دا باسـی ئـەو شـتانەمان كـردوە كـە بـەهۆی لـەش پیسـی گـەورە (جنابـة) وە لەئینسـان حـەڕام دەبـن، كـە زۆربـەی هـەرە زۆری شـتەكانیش پـەیوەندییان بەدەستنوێژیشەوە هەیە، بۆیە خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەكەینو لێرەدا هەر بەكورتی ئەو شتانە دەنووسین كەپەكیان لەسەر دەستنوێژ كەوتوەو بەبێ هەركام لە لەش پاكی گەورەو گچكە دروست نیە ئەنجام بدرێن:

---

[٢٦٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٢٦٤] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج١ص٢٥٥، ٢٥٦.

[٢٦٥] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٢ص١٤٥٣، (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (هذا الحديثُ أَصْلٌ مِنْ أُصولِ الأُسلام وقاعِدةٌ عظيمةٌ من قواعِدِ الفِقْهِ وهي أَنَّ الأَشْياءَ يُحْكَمُ بِبقَائِها علىٰ أُصولِها حَتّىٰ يَتَيَقَّنَ خِلافَ ذٰلِكَ ولايَضُرُّ الشَّكُّ الطارِئُ عَلَيْها).

[٢٦٦] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم)ج٢ص١٤٥٣

١- نوێژکردن بەفەرزو سوننەتی‌یەوە، هەتا نوێژی سەر جەنازەش.
٢-طەوافی ماڵی خوا (طواف البيت).[٢٦٧]
٣-دەست لەقورئان دان (مس المصحف): بەڵام قورئان خوێندن بەبێ دەست لێدانی (مصحف) ئەوە وەك (نووي) گوتوویەتی:[٢٦٨] زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کەبابای بێدەستنوێژ بۆی هەیەو ئیشکالی تێدانیەو فەرموودەی ڕاستو ڕاشکاویش لەوبارەوە هەیە کە (احمد واصحاب السنن) لە (علي) یەوە هێناویانە.

شەش: دەستنوێژ بۆچیو چی سوننەتە؟
دەستنوێژگرتنو دەستنوێژ هەبوون لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا سوننەتە:
١-ذیکری خواکردن: چونکە (مُهاجِرُ بنُ قُنفذ) خوا لێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە لەکاتێك دا پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرتوە سەلامێ لێ کردوە بەڵام هەتا دەستنوێژەکەی تەواو نەکردوە وەڵامی نەداوەتەوە، ئنجا وەڵامی داوەتەوەو فەرموویەتی: (إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ إِلَّا أَنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللهَ إِلَّا عَلَىٰ طَهَارَةٍ) رواه أبوداود والنسائي وابن ماجه.
واتە: هیچ شتێك پێشگیری وەڵامدانەوەتی لێنەکردم مەگەر ئەوە کە حەزم نەکرد بەبێ لەش پاکی ناوی خوا بهێنمو یادی بکەم.

٢-خەوتن: پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إذا أتيتَ مَضْجَعَكَ فَتوضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاةِ ثم اضْطَجِعْ علىٰ شِقِّكَ الأيْمَن، ثم قُلْ..) رواه البخاري و مسلم عن البراء بن عازب.
واتە: کە چوویتە سەرجێ دەستنوێژ وەك ئی نوێژ بگرە، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕاکشێو بڵێ..

٣-کاتی لەش پیسی (جنابة) بۆ خواردنو خواردنەوەو خەوتنەوەو دووبارە کردنەوەی جیماع:
(عائشة) خوا لێیڕازی بێ گوتوویەتی: (كان النبيُّ ﷺ إذا كانَ جُنُباً فأرادَ أنْ يأكُلَ أوْ يَنامَ توضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاةِ) رواه مسلم والنسائي وابوداود.

---
[٢٦٧] بەڵام هەندێك لەزانایان دەستنوێژ هەبوون بۆ طەواف کردن بەس بەسوننەت دەزانن، بۆ وێنە (ابن تيمية) بڕوانە، (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ ص١٢٢، ١٧٦.
[٢٦٨] بڕوانە (المجموع) ج٢ص٨٧.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا أتى أحدكُم أهلهُ ثم أرادَ أنْ يعودَ فليتوضأ) رواه مسلم واصحاب السنن عن ابي سعيد.

واتە: ئەگەر یەکێکتان چووە لای خێزانی، پاشان ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەستنوێژ بگرێ.

٤-پێش خۆشۆردنی فەرز یان سوننەت: (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (كانَ رسولُ الله ﷺ اذا اغتسلَ مِنَ الجنابَةِ يَبْدأُ فيغسِلُ يَدَيْـهِ ثم يُفرِغُ بِيَمِينِهِ على شِمالِهِ فيغسِلُ فَرْجَهُ ثمَّ يتوضّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاة) رواه مسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات بەهۆی لەش پیسییەوە خۆی شۆردبایە بەشۆردنی هەردووك دەستی دەستی پێکرد، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی بەدەستی چەپی دادەکردو داوێنی دەشۆرد، ئنجا وەك هی نوێژ دەستنوێژی دەگرت.

٥-خواردنی گۆشت یان هەر شتێکی دیکەی بەئاگر سازکراو : چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تَوَضأوا مِمّا مَسَّتِ النّارُ) رواه مسلم والنسائي. کەپێشتریش باسمان کرد.

٦-بۆ بەرپارکردنی هەر نوێژێک: بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عن بريدةَ رضي الله عنه قال: كان النبيُّ ﷺ يَتَوَضّأُ عِندَ كُلِّ صَلاةٍ، فَلَمّا كانَ يَومَ الفَتْحِ تَوضّأَ ومَسَحَ على خُفَيْهِ وصَلّى الصّلواتِ بِوُضُوءٍ واحدٍ، فقال له عمرُ: يا رسولَ اللهِ إنّكَ فعلتَ شيئاً لَمْ تَكُنْ تفعلُهُ؟ فقال: عَمْداً فعلْتُهُ يا عُمَرُ) رواه مسلم واصحاب السنن الا ابن ماجة.

واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت، بەڵام ڕۆژی ئازادکردن -ی مەککە - دەستنوێژی گرت و مەسحی خوففەکانی کردو هەموو نوێژەکانی بەدەستنوێژێك کردن، جا عومەر پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکت کرد کە جاران نەتدەکرد؟ فەرمووی: بەئانقەست وام کرد ئەی عومەر! (واتە: بۆ ئەوەی بزانرێ کە هەرچەندە وا پەسەندە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژی نوێ بگیرێ، بەڵام دروستیشە هەموویان بەدەستنوێژێك بکرێن).

٧-بێ دەستنوێژ نەبوون لەهیچ کاتێک دا: کە لەچەند دەقێك وەردەگیرێ بەتایبەت لەو فەرموودەیەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (بلال)دا وتووێژێك دەکات لەبارەی ئەوەوە کەهۆی چییە پێغەمبەر ﷺ (بلال)ی لەبەهەشت بینیوە؟ ئەویش دەڵێ: (يارسول الله ما أذّنتُ قطُّ إلاّ صلّيتُ ركعتينِ، ولا أصابَني حَدَثٌ قطُّ إلاّ توضّأتُ عِنْدَهُ) رواه الترمذي وابن ماجة.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ کاتێك بانگت نەداوە مەگەر دوو ڕكاتم کردوون، وە هیچ کاتێك بێ دەستنوێژ نەبووم مەگەر دەستنوێژم گرتۆتەوە.

ئنجا پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی. (لهذا) ئەوە بۆیە.

٨-بەهۆی ڕشانەوەوە: چونکە (مَعْدان بن ابي طلحة) لە (ابوالدرداء) ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕشاوەتەوە ڕۆژوی شکاندوەو دەستنوێژی گرتوە، جا (معدان) گوتوویەتی: لەمزگەوتی دیمەشق گەیشتمە (ثُوْبان) و ئەوەم بۆ باس کرد، گوتی: ڕاست دەکات بۆ خۆم ئاوی دەستنوێژگرتنەکەم بۆ تێکرد.

وەك (ترمذي و ابوداود) بە (اسناد صحيح) گێڕاویانەتەوە، بەڵام لەلای (نسائي) وشەی (فَتَوَضَّأ)ی تێدا نیە[٢٦٩].

٩-بەهۆی هەڵگرتنی مردووەوە: چونکەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ غَسَّلَ مَيِّتاً فَلْيَغْتَسِلْ وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ) رواه الترمذي والبيهقي وابن حبان.

وەك پێشتریش باسمان کردو ڕوونمان کردەوە.

## حەوت: چەند وردە بابەتێك دەربارەی دەستنوێژ

١-کە شەرعزانان گوتوویانە پەسەندو سوننەتە شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ سێجار سێجار بێت، پێویستە ئەوە بزانرێ کە کاتێك جاری دووەم و سێیەم بەپەسەندو سوننەت دادەنرێن کە بەجاری یەکەم ئەو ئەندامە هەمووی تەڕبوو بێتو شۆرابێت، ئەگەرنا مادام بەهەرسێك جارەکە بەتەواوی بشۆرێ ئەوە بەهەرسێکیان هەر فەرزەکە هاتۆتەدی و هیچی دیکە، وەپێویستە ئەوەش بزانرێ کەهەروەك چۆن سێجار سێجار سوننەتە یەك جار یەك جار و دووجار دووجاریش پێچەوانەی سوننەت نیە - بەمەعنای حەقیقی سوننەت نەك بەمەعنا فیقهیو (اصولي) یەکەی - چونکە: (ابن عباس) خوالێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: ( تَوَضَّأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَرَّةً مَرَّةً) رواه البخاري واصحاب السنن، هەروەها (عبدالله بن زيد) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: (أَنَّ النبيَّ ﷺ توضأ مرتين مرتين) رواه احمد والبخاري.

٢- ئەو دوعا تایبەتیيانەی کە لەسەر یەك یەکی ئەندامەکانی دەستنوێژ دەخوێندرێن هیچ کامیان سوننەت نینو ئەسڵیان نیە، (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (أَمَّا الأَدْعِيَةُ الَّتِي تُقْرَأُ عَلَى أَعْضَاءِ الوُضُوءِ فَلَا أَصْلَ لَهَا)[٢٧٠].

---

[٢٦٩] بڕوانە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ص٤٠.

[٢٧٠] بڕوانە: (المنهاج) هەروەها بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٦.

٣- زانایـان تێکـڕا لەسـەر ئـەوە یـەکدەنگن کـە سـڕینەوەی ئـاوی دەسـتنوێژ (التَنشِيف) حەرام نیە - هـەروەها ئـاوی خۆشـۆردنیش -، بـەڵام لـەوبارەوە کە ئایـا چاکتر وایە بسڕرێتەوە یان نا، یان هەردووک لای وەك یەکن‌و موباحن ڕایان جیاوازە، بەڵام زۆربەی هـەرە زۆریـان ڕایـان وایـە کـە سڕینەوە (تنشیق) موباحـە، ئەمـە ڕای (اصحاب الرأي و مالك و شافعي و احمد اسحاق و ثوري و ابن المنذر) ە[271].

هەندێکیشیان بە ناپەسەند (مکروه)ی دەزانن‌و بێگومان ڕای زۆربەو جەماوەریش بەهێزترە چونکە هیچ دەقێکی ڕاست (صحیح) لەسەر بە ناپەسەند دانانی سڕینەوە نیـە، بـەڵام بەپێچەوانـەوە دەقـی (نـص) هەیـە لەسـەر سـڕینەوە، بەتایبـەت دوای خۆشۆردن.

*(عن قَيْسِ بن سَعْدٍ قال: زارَنا رسولُ الله ﷺ في مَنْزِلِنا فأمَرَ لَهُ سَعْدٌ بِغِسْلٍ، فَوُضِعَ لَهُ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ ناوَلَهُ مِلْحَفَةً مَصْبوغَةً بِزَعْفرانٍ أَوْ وَرْسٍ فَاشْتَمَلَ بِها) رواه احمد وابوداود وابن ماجة.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەوەمان سەردانی کردین (سعد)یش فەرمانی کرد کە ئاوی[272] خۆشۆردنی بۆ دابنێین، جا بۆی دانراو خۆی شۆرد، پاشان پەشتەماڵێکی وێدا کە بە زەعفەران یان وەرس ڕەنگ کرابوو، ئەویش لەخۆیەوە پێچا.

٤- زۆربـەی هـەرەزۆری[273] نزیـك بەیـەکدەنگی زانایـان لەسـەر ئـەوە کۆکـن کـە دروستەو بگرە جاری وایە پەسەندو سوننەتیشە کە لەدەستنوێژگرتن دا هاوکـاری یـەکتر بکـرێ، هـەندێکیش بـە ناپەسـەندیان زانیـوە، بـەڵام چـەندان دەقـی ڕاسـت‌و ڕاشکاوی سوننەت هـەن لەسـەر دروست بـوون - وەك زانایـان گوتوویانـەو - منیـش دەڵێم بەڵکو سوننەت‌و پەسەندبوونیشی چونکە بێگومان دەستنوێژگرتن لـەجوغزی چاکەکاری‌و پارێزکاری (البِرّ والتَّقْوىٰ)دایە کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ‌کردوون: (وتَعاوَنُوا على البِرِّ والتَّقْـوىٰ) المائدە -٢-، واتـە: وە لەسـەر چاکەو پارێزکاری هاوکاری یەکتری بکەن. ئەمەش دەقێکی سوننەت لەوبارەوە:

---

[271] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٥٢٢، ٥٢٣.

[272] وشەی (غِسْلٍ) بەمانای ئاوی خۆپێ‌شۆردن‌و بەمانای صابوون یان هەر شتێکی لەو جۆرەش هاتوە کە خۆی پێ‌دەشۆرێ بەڵام لێرەدا (ئاو) گونجاوترە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ٦٥٢.

[273] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٢١٩، وە (فقه السنة) ج١ص٦٧.

*(عن المُغيْرَةِ بنِ شُعْبةِ كُنْتُ مَعَ النبيِّ ﷺ في سَفَرٍ، فقال لي يامُغَيْرَةُ خُذ الأَدَاوَةَ فأخَذْتُها ثم خَرَجْتُ مَعَهُ وآنْطَلَقَ حتَّى تَوارىٰ عَنِّي حتَّى قَضىٰ حاجَتَهُ ثُمَّ جاءَ وعَلَيْهِ جُبَّةٌ شامِيَةٌ ضَيِّقَةُ الكُمَّيْنِ فَذَهَبَ يُخْرِجُ يَدَهُ مِنْ كُمِّها فَضاقَ فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ اسفلِها فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ فَتَوضَّأ وُضوءَهُ لِلصَّلاةِ ثم مَسَحَ علىٰ خُفَّيْهِ) متفق عليه.

واته: لەسەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، پێی فەرمووم ئەی موغەیرە ئەم قاپە ئاوە بگرە! منیش هەڵم گرت، پاشان لەگەڵی دەرچوم وە ئەویش ڕۆیشتو دوور کەوتەوە هەتا لێم ون بوو، پاشان تارەتی گرتو گەڕایەوەو چاکەت (جُبَّە)یەکی شامی دەبەربو قۆڵەکانی تەنگ بووْ، ئنجا ویستی دەستی لەقۆڵەکەیەوە بێنێتەدەر بەلام تەسك بوو، بۆیە لەژێرەوە دەستی هێنایە دەرێ، منیش ئاوم لەدەستیکرد تاکو وەك هی نوێژ دەستنوێژی گرت، دوایی مەسحی لەسەر دوو خوففەکەیشی کرد.

٥-هەروەك چۆن لەش پیسی گەورە (جنابة) هی گچکەش دەگرێتە نێو خۆی، خۆ پاککردنەوەش لەلەش پیسی گەورە ئەگەر نیازو مەبەست (نية) هەبێ، بێدەستنوێژی (الحدث الأُصغر) لادەبات، زۆربەی هەرە زۆری[٢٧٤] زانایان کە (ابوحنیفة و اصحاب و مالك و شافعي واحمد) یان لەنێودان لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕێك کەوتوون و، بەڵگەشیان ئەوەیە کە خوای کاربەجێ بۆ بابای لەش پیس (جُنُبٌ) تەنیا خۆشۆردنی بۆ کردۆتە مەرجی نوێژکردنو باسی دەستنوێژی نەکردوەو فەرموویەتی:

(یاأَیُّها الَّذین آمنوا لاتقربُوا الصَّلاة وأَنتم سُکاریٰ حتَّی تعلَمُوا ماتقولون و لاجُنُباً إِلاَّ عابِري سَبِیْلٍ حَتَّی تَغْتَسِلُوا..) النساء (٤٣)؛

واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کاتێك سەرخۆش بوون توخنی نوێژ مەکەون هەتا دەزانن چی دەڵێن، وە بەلەش پیسی مەگەر ڕێڕەوی - بەمزگەوت دا تێپەڕ - بن ئەگەرنا هەتا خۆتان نەشۆن نوێژمەکەن.

---

[٢٧٤] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ص٢١٧ الشرح الكبير، ٢١٨ المغني، بەلام (ابن تيمية) گوتوویەتی: نیەت هێنانی دەستنوێژگرتن پێویست نیە، تەنیا بەهۆی خۆشۆردنەوە بەبێ نیازو مەبەستی دەستنوێژگرتن بابای خۆشۆر (مُغْتَسِلْ) لەهەردووك لەش پیسی گەورەو گچکە پاك دەبێتەوە، بڕوانە: (مجموعة الفتاویٰ) ج٢١ص٢٢٥.

(ابنُ قُدامَة) لەوبارەوە گوتوویەتی[٢٧٥]: (وهو إجْماعٌ لاخِلافَ فيْهِ بيْنَ العُلَماءِ إلاّ أنّهُمْ أجْمَعوا علىٰ اَسْتِحْبابِ الوُضوءِ قَبْلَ الغُسْلِ تَأسِيّاً بِرَسُولِ اللهِ ﷺ ولأنـهُ أعْوَنُ علىٰ الغُسْلِ وأهْذَبُ فيْهِ)، واتە: ئەمەش یەکدەنگی زانایانەو لەنێو زانایان دا ڕا جیایی تێدا نیە، بەڵام یەکدەنگیشن لەسەر پەسەندی دەستنوێژگرتن پێش خۆشۆردن بەمەبەستی شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەبەرئەوەی بەوجۆرە خۆشۆردنەکە ئاسانتر دەبێ و ڕێك و پێك تر دەبێ.

٦-دەستی تەڕ پێداهێنان (مسح) ی خوفف و گۆرەوی زۆربەی[٢٧٥] هەرە زۆری زانایان لەسەر یەکدەنگ بوون کەشتێکی دروست و ڕەوایە، وە (الحسن البصري) گوتوویەتی:[٢٧٦] حەفتا (٧٠) کەس لەهاوەڵان (اصحاب) ی پێغەمبەر ﷺ بۆیان باس کردووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوففەکانی کردووە[٢٧٧].

وە لەوبارەوە فەرموودەی ڕاست و ڕاشکاو زۆرن بۆ وێنە:

*(عن جَريْرٍ رضي الله عنه أنّه بالَ ثُمّ توضّأ ومَسَحَ علىٰ خُفّيهِ فقيْلَ لهُ تَفعَلُ هكذا؟ قال: نَعَمْ رَأيتُ رسولَ اللهِ ﷺ بالَ ثم توضّأ ومَسَحَ علىٰ خُفّيهِ) متفق عليه.

واتە: (جریر) خوا لێی ڕازی بێ لێی گێڕراوەتەوە کەڕۆژێك میزی کردوە پاشان دەستنوێژی گرتوەو دەستی تەڕی بەدو خوففەکانی دا هێناوە، جا پێی گوترا ئاوا دەکەی؟! گوتوویەتی: بەڵێ پێغەمبەری خوام ﷺ بینی میزی کرد پاشان دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوففەکانی کرد.

هەروەها زۆربەی[٢٧٨] زانایان ڕایان وایە کە مەسح لەسەر گۆرەوی (جورب) یش هەر دروستە وەك خوفف، بەڵام زۆر لەزانایان هەم بۆ خوفف و هەم بۆ گۆرەویش ئەوەیان بەمەرج گرتوە کەئەستوور وپتەوبن و بگونجێ پێیان بڕۆی، وە دەبێ ئەو ئەندازەیەش

---

[٢٧٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٢٧٦] بڕوانە": (نيل الأوطار) ج١ص٢٢٢، وە (المفصّل) ج١ص١٤٢.

[٢٧٧] بڕوانە: (المُغْني) ج١ص٢٨٣

[٢٧٨] (نووي) گوتوویەتی: (أجْمَعَ مَنْ يعتدُّ بِهِ في الإجْماعِ علىٰ جَوازِ المَسْحِ علىٰ الخُفّيْنِ في السَّفَرِ والحَضَرِ سَواءً كانَ لِحاجَةٍ أوْ غَيْرِها..) بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٢ص ١٢٥٠. (خُفّ) گۆرەوییەکی لەچەرمی تەنگ دروست کراوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) وشەی: (خُفّ).

[٢٧٩] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٥٦٤، ٥٦٥، وە : (المغني) ج١ص٢٩٨، ٢٩٩.

کەفەرزە بشۆرێ لەپێیەکان و لاقەکانیش دای بپۆشن. بەزاراوەی شەرعزانان: (يَجِبُ أَنْ يكونا صَفِيْقَيْنِ (ثَخِيْنَيْنِ) يُمْكِن تَتابُعُ المَشْيِ عَلَيْهِما، وأَنْ يكونا ساتِرَيْنِ لِمَحَلِّ الفَرْضِ)[279].

بەڵگەی مەسح کردن لەسەر گۆرەویش چەند دەقێکن بۆ نموونە:

*(عن المغيره بن شعبة رضي الله عنه ان رسولَ الله ﷺ تَوَضَّا ومَسَحَ علىٰ الجَوْرَبَيْنِ والنَّعلَيْنِ) رواه احمد واصحاب السنن الا النسائي وصححه الترمذي.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و دەستی تەری بەگۆرەوی و بەنەعلەکان دا هێنا.

وە لەوبارەوە کەئایا ئەگەر خوفف و گۆرەوی دڕاوبن و پێیەکانیان تێڕا دیاربن دروستە مەسحیان لەسەر بکرێ یان نا؟ زانایان مشت و مڕیان زۆر بووە، بەڵام واپێدەچێ ڕای ئەوانە بەهێزتر بێت کەمەسح لەسەر ئەوجۆرە خوفف و گۆرەوییانەش بەدروست دەزانن، کەڕای (ابو حنيفة و مالك وابن المبارك و بعض اصحاب احمد) ە وەك (ابن تيمية) هێناویەتی و خۆیشی پەسەندی کردوە[280].

هەڵبەتە تێکڕای[281] زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە کاتێك دروستە مەسح لەسەر خوفف و گۆرەوی ئەستوور بکرێ لەجیاتی شۆردنی پێیەکان کە بابای مەسح کەر خوفف یان گۆرەوییەکانی بەپاکی و بەدەستنوێژەوە دەپێکردبن، بەڵگەشیان چەند دەقێکە بۆ وێنە:

*(عن المغيرة بن شعبة رضي الله عنه قال: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذاتَ لَيْلَةٍ في مَسِيْرٍ فَأَفرَغتُ عليهِ مِنَ الاداوةِ فغسل وَجهه وغسل ذِراعيهِ ومسح برأسِهِ ثم اهويت لِانزِعَ خُفَّيهِ، فقال: دَعْهُما فاني أَدْخَلْتُهما طاهِرَتَيْنِ) متفق عليه.

واتە: شەوێکیان لەڕێگایەك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، لەدەفری ئاوی دەستنوێژ ئاوم لەدەست کردو دەموچاوی شۆری و هەردووك باسکی شۆری و مەسحی سەری کرد، پاشان داهاتمەوە کە خوففەکانی دابکەنم فەرمووی: لێیان بگەڕێ چونکە پێیەکانم بەپاکی (بەدەستنوێژەوە) کردوونە نێویان.

---

[280] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٥٦٥، وە: (ونيل الاوطار) ج١ ص٢٢٦، ٢٢٧.

[281] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢ص١٠١.

[282] بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٨٤، کە گوتوویەتی: (لانعلم في اشتراط تقدم الطهارة لجواز المسح خلافاً).

شایانی باسیشە کەزۆربەی هەرەزۆری نیزیك بەیەکدەنگی زانایان گوتوویانە مەبەست لەپاکیو (أَدْخَلْتُهُما طاهِرَتَيْنِ) بەدەستنوێژ بوونە، بەلام (داود الظاهري) گوتوویەتی[282] مەبەست خاوێنییانەو پیسیی پێوە نەبوونیانە، رایەکەشی بێهێزو سەرکێلانەیە.

هەروەها سەرجەم[283] زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەبابای مەسح کەر لەسەر خوفف و گۆرەوی ئەگەر نیشتەجێ (مُقِيم) بێت بۆی هەیە ماوەی شەوو ڕۆژێك و ئەگەر ڕێبواریش بێت ماوەی سێشەوو سێڕۆژ لەجیاتی شۆردنی پێیەکانی دەستی تەڕ بەسەر خوفف و گۆرەوییەکانی‌دا بێنێ بەمەرجێك لەوماوەیەدا پێیەکانی لێیان نەهاتبنەدەر، لەوبارەشەوە چەندان فەرموودە هەن، بۆ وێنە:

*(عن شُرَيْحِ بنِ هانِئٍ قال: سَأَلْتُ عائِشَةَ رضي الله عنها عن المَسْحِ علی الخُفَّيْنِ، فقالَتْ: سَلْ عَلِيًّا فانَّهُ أَعْلَمُ بهذا مِنِّي كانَ يُسافِرُ مَعَ رَسولِ الله ﷺ، فَسَأَلْتُهُ فقالَ: قالَ رَسولُ اللهِ ﷺ لِلْمُسافِرِ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ وَلَيالِيهِنَّ وِلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ) رواه احمد ومسلم والنسائي وابن ماجة.

واتە: پرسیارم لە (عائشة) کرد دەربارەی مەسح لەسەر خوففەکان، گوتی: پرسیار لەعەلی بکە چونکە لەسۆنگەی ئەوەوە کەلەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەری دەکرد ئەو لەمن لەوبارەوە شارەزاترە، جا پرسیارم لێکرد گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێبوار سێ ڕۆژو سێ شەوی بۆ هەن و نیشتەجێش شەوو ڕۆژێك.

وە زۆبەی[284] زۆری زانایان کە: (حسن البصري و عروة بن الزبير و عطاء وشعبي و نخعي و اوزاعي و ثوري و اصحاب الرأي واحمد وابن المنذر) یان لەنێودان ڕایان وایە کەبەس پشتی خوفف و گۆرەوی مەسح دەکرێ، بەلام هەندێکیان[286] کە (عمر بن عبدالعزیزو مکحول و زهري و مالك وابن المبارك وشافعي واسحاق) یان لەنێودان دەڵێن هەرچەندە فەرز بەس پشتی خوفف و گۆرەوییە بەلام وا پەسەندە ژێرەکەشیان هەر مەسح بکرێ، دیارە ڕای جەماوەریش بەڵگەدارترە. چونکە:

---

[283] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج۱ص۲۳۲.

[284] بەلام (مالك ولَيْث) ڕایان وایە کەهەرکام لەنیشتەجێ و ڕێبوار ئەوەندەی بیانەوێ دەتوانن مەسح بکەن بەبێ سنوور، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج۱ص۲۲۸، ۲۲۹.

[285] بڕوانە: (المجموع) ج۱ص۵۸۷.

[286] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

أ- عەلی خوالێی ڕازی‌بێ گوتوویەتی: (لَوْكَانَ الدِّيْنُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلَ الخُفِّ أَوْلَىٰ بِالمَسْحِ مِنْ أَعْلَاهُ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَىٰ ظَاهِرِ خُفَّيْهِ) رواه ابوداود والبيهقي،

**واتە**: ئەگەر دینداری بەعەقڵ بووایە ئەوە ژێرەوەی خوفف لەپێشتر بوو بەمەسح کردن لەپشتەوەی، بەڵام من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کەپشتی خوففەکانی مەسح دەکرد.

ب- هەروەها موغەیرە خوالێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الخُفَّيْنِ عَلَىٰ ظَاهِرِهِمَا) رواه ابوداود والترمذي وقال: حديث حسن.

**واتە**: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لەسەر پشتی خوففەکانی مەسحی کرد. ئنجا ئەوانەش کە ڕایان وایە هەرکام لەپشت‌و ژێری خوفف مەسح دەکرێن، ئەم دەقە بەبەڵگە دێننەوە: (عن ثور بن يزيد عن رجاء ابن حياة عن ورّادٍ كاتب المُغِيْرَةِ بن شُعْبَةَ عن المغيرة بن شعبة ان النبيَّ ﷺ مَسَحَ اعلَىٰ الخُفِّ وأَسْفَلَهُ) رواه الخمسة الا النسائي وقال الترمذي: هذا حديث معدول.

**واتە**: پێغەمبەر ﷺ سەرەوەو ژێرەوەی خوففی مەسح کرد. بەڵام وەك پسپۆرانی سوننەت گوتوویانە: ئەو دەقە ڕاست نیەو بۆ بەڵگە پێ‌هێنانەوە ناشێت[287].

*کۆتایی باسی مەسح لەسەر خوففیش بەم دوو تێبینی‌یە دێنین:*

**یەکەم**: زانایان[288] سەرجەم لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەدەستی تەڕ بەپشتی خوفف دا هێنان تەنیا بێ‌دەستنوێژی (الحدث الاصغر)ی پێ‌یەکانی پێ‌لادەچێ، بەڵام لەش پیسی گەورە بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە بەبێ شۆردن (غُسْل)ی پێ‌یەکان تەواو نابێ، بەڵگەش زۆرن یەکێکیان ئەم فەرموودەیە (عن صَفْوان بن عَسَّال المُرادي قال كان رَسولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُنا إذا كُنّا مُسافِرِيْنَ أَوْ سَفْراً أَنْ لانَنْزِعَ خِفافَنا ثلاثَةَ أيامٍ ولَيالِيَهُنَّ إلّا مِنْ جِنابَةٍ، لَكِنْ مِنْ غائِطٍ وبَوْلٍ ونَوْمٍ) رواه احمد واصحاب السنن الا ابوداود وقال الترمذي: حسن صحيح، كە پێشتر مانامان کردوە.

**دووەم**: زانایان لەوبارەوە کەئایا مەسح کردن چاکترە یان شۆردنی پێ‌یەکان ڕایان جیاوازەو هەندێکیان شۆردن‌و هەندێکیان مەسح‌و هەندێکیشیان هەردووك لایان وەك یەك زانیون‌و (ابن المنذر)یش لەوانە[289] منیش ئەم ڕایەی سێیەمم بەلاوە پەسەندترە.

---

[287] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٢٣٢، ٢٣٣.

[288] بڕوانە: (المجموع) ج١ص٥٤٤، وە: (المغني) ج١ص٢٨٥، ٢٨٦.

[289] بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٨٣.

٧- مەسح كردنی شكستەی هەڵبەستراوەو برینی پێچراویش مەسەلەیەكە سەرجەم زانایانی ئیسلام لەسەری رێك كەوتوون، كە لەسەرچاوە شەرعی‌یەكان دا ئەو شتەی كەشكستەی پێ‌دەگیرێتەوە (جَبِيْرَة، ج: جَبَائِرْ) ی پێ‌دەڵێن‌و، ئەوەش كە بۆ برین پێچان بەكاردێت (عِصابَة، ج:عَصائِبْ) یان (لَصُوقْ)ی پێ‌دەڵێن[٢٩٠].

جا ئەگەر مەسح لەسەرخوفف‌و گۆرەوی مۆڵەت (رخصة) ە، ئەوە بێگومان دەستی تەڕ بەسەر شكستەو برینی داپێچراودا هێنان فەرزە[٢٩١].

دیسان مەسحی سەر خوفف‌و گۆرەوی بەس بۆ دەستنوێژی گچكەی پێ لادەچێ، بەڵام مەسحی سەر شكستەی هەڵبەستراوەو برینی پێچراو جێگای شۆردن دەگرێتەوە چ بۆ دەستنوێژ و چ بۆ خۆشۆردن[٢٩٢]. بەڵگەی دروست (جائز) بوون‌و ڕەوابوونی ئەو كارەش چەند شتێكە[٢٩٣]:

**أ-(عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه أنَّ رَجلاً أصابَهُ حَجرٌ فشَجَّهُ في رأْسِه ثم احْتَلَم فسَألَ أصْحابَهُ: هَلْ تَجِدونَ لي رُخْصَةً في التَّيَمُّمِ!! قالوا: مـانَجِدُ لَـكَ رُخْصَـةً وأنْتَ تَقْدِرُ علـىٰ المـاءِ فَاغْتَسَلَ فماتَ، فقال النبي ﷺ قَتَلوُهُ قَتَلَهُمُ اللهُ ألا سألُوا إذْ لَمْ يَعلَموا!! فَإنَّما شِفاءُ العَيِّ السُّؤالُ، إنَّما كانَ يَكْفيهِ أنْ يَتَيَمَّمَ ويَعْصِبَ علىٰ رأْسِهِ خِرْقَةً يَمْسَحُ عَلَيْهَا وَيَغْسِلَ سائِرَ جَسَدِهِ)** رواه ابوداود والبيهقي والأوزاعي عن عطاء عن ابن عباس.

واتە: پیاوێك بەردێكی بەسەری كەوت‌و سەری شكاند، پاشان ئیحتیلامی بوو، جا پرسیاری لەهاوەڵەكانی كرد: كە ئایا پێتان وایە مۆڵەتم هەیە تەیەمموم بكەم؟ گوتیان: پێمان وانیە مادام توانای بەكارهێنانی ئاوت هەیە مۆڵەتت هەبێ، ئەویش خۆی شۆردو مرد، جا پێغەمبەر ﷺ كە بیستی‌یەوە فەرمووی: كوشتیان خوا بیانكوژێ، دەبووایە كە نەیاندەزانی پرسیبایان، چونكە چارەی نەزانین پرسیاركردنە، هەر ئەوەندەی بەس بوو كە تەیەممومی كردبایەو سەری بەپەڕۆیەك پێچابایەو دەستی تەڕی پێداهێنابا‌و باقی جەستەی شۆردبایە.

---

[٢٩٠] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤١، وە: (المُغْني) ج١ص٢٨٠.

[٢٩١] چونكە بەبێ ئەوە لەبێ دەستنوێژی‌و لەش پیسی پاك نابێتەوەو هیچ چارەی نیە دەبێ هەروا بكات.

[٢٩٢] بڕوانە: (مجموعة الفتاوىٰ) ج٢١ ص١٠٣، وە: (المُفَصَّلْ) ج١ص١٤٠.

[٢٩٣] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص ٣٤٠، ٣٤١، وە پەراوێزی (محقِّق) هەر لەم دوو لاپەڕەیەدا.

ب-(عن نافع أنَّ ابنَ عُمَرَ رضي الله عنهما توضأ وكفه معصوبة فمسح عليها وعلى العِصابةِ وغَسَلَ ما سِوىٰ ذٰلِكَ) رواه البيهقي وصححه، ورواه عبدالرزاق وابن ابي شيبة.

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لەخۆی و بابی ڕازیبێ دەستنوێژی گرتوەو لەپە دەستی پێچراوە، دەستی تەڕی بەسەردا هێناوەو بەسەر پەڕۆیەکەش دا بەهەمان شێوە، وە ئەوەی دیکەی شۆردوە.

ج- (بیهقي) لەکۆمەڵێك لەزانایانی شوێن کەوتوو (تابعین) ەوە چەند شوێنەوار (اثر) ێکی هێناوە لەوبارەوە، بۆ وێنە:

* لە (عُبَيْد بن عُمَيْر) ەوە کە دەربارەی پیاوێك کە سینگی بریندار بووەو پێچاویەتیو گوتوویەتی: با خۆی بشواتو پەڕۆیەکەش یان سنگی مەسح بکات.

*لە (طاوس) کە دەربارەی برینێك کەپەڕۆیەکی لێپێچراوە گوتوویەتی: ئەگەر مەترسی هەیە بادەستی تەڕ بەپەڕۆیەکەدا بێنێ، ئەگەرنا با بیشوات.

* لە (الحسن البصري) یەوە کە دەربارەی پیاوێك کەڕانی یان لاقی شکاوەو لەشی پیس بووە، فەرمانی پێکردوە کە لەسەر هەڵبەستراو (جبرة) ەکە مەسح بکات.

*لە (عطا و مجاهد و طاوس) کە دەربارەی پیاوێك کەپەنجەی بریندار بووە گوتوویانە: با خوێنەکەی لێ بشواتەوە پاشان بیبەستێو لەسەر پێچراوییەکە مەسح بکات.

*ئێستاش با ئاماژەیەك بەچەند ڕا جیاییەکی زانایان بکەین دەربارەی ئەو مەسەلەیە:*

<u>یەکەم</u>: دەربارەی لابردنی (جَبِيْرَة) و (عِصابَة) بۆئەوەی لەکاتی دەستنوێژو خۆشۆردن دا ژێرەوەیان بشوات:

زانایان تێکڕا لەوبارەوە یەکدەنگن کە ئەگەر مەترسی هەبوو لەسەری پێویست نیە لایان بەرێ، بەڵام ئەگەر مەترسی نەبوو - لە تەشەنە کردنی شکستەو برینەکەی - ئەوە شافیعییەکان دەڵێن: پێویستە لایان بەرێ، بەڵام (ابوحنیفەو مالكو احمدو داود) دەڵێن: پێویست نیە[٢٩٤]، بێگومانیشم کەڕای زۆربە ڕاستترەو دەشڵێم: ئەگەر بابای ئێسقان هەڵبەستراوو برین پێچراو مەترسی هەبوو نەك هەر پێویست نیە تەختەو گەچی شکستییەکەیو پەڕۆ و لەفافی برینەکەی لابەرێ، بگرە پێویستە لایان نەبات!

---

[٢٩٤] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤٢.

دووەم: دەربارەی هەڵبەسترانەوەی شکستەو پێچرانی برین کە ئایا مەرجە لەسەر پاکی بن یان نا؟!

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەگەر بگونجێ چاکتر وایە لسەر پاکی بن، واتە بابای ئێسقان هەڵبەستراوو برین پێچراو لەش پاك و بەدەستنوێژ بن، لەبارەی فەرزو مەرج بوون یان نەبوونی پاکی‌یەوە ڕایان جیایە، زۆربەیان بەپێویستی نازانن وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی، بەلام (شافعي) بەپێویستی دەزانێ[295]، دڵنیاشم کەڕای زۆر بەڕاسترو چاکترەو ڕایەکەی (شافعي) زۆرجار زەحمەتی زۆری تێدایەو هەندێك جاریش هەر جێبەجێ نابێت.

سێیەم: هەروەها لەوبارەوە کە ئایا بابای مەسح کەر لەسەر شکستەو برین پێویستە دوایی نوێژەکانی بگێڕێتەوە یان نا؟ ڕایان جیاوازە:

زۆربەیان ڕایان وایە کەنەخێر گێڕانەوەی لەسەر نیەو نوێژەکانی تەواون[296]، بەلام شافیعی‌یەکان دیسان ڕایان جیاوازەو هەندێکیان دەڵێن: ئەگەر هەڵبەسترانو پێچرانەکە لەسەر پاکی بووبێت یان بێ نوێژی‌و دەستنوێژی هەردەبێ بیانگێڕێتەوە!

هەندێکیشیان ڕایان وەك زۆربەو جەماوەری زانایان وایەو، زۆربەشیان دەڵێن، ئەگەر لەسەر پاکی بووبن گێڕانەوەیان ناوێ، گەرنا پێویستە بیانگێڕێتەوە[297]، جا بێگومان ڕای زۆربەی زانایان ڕاستەو قسەیەکی واش لە (شافعي)یەوە هەیەو (المُزْني)یش گوتوویەتی[298]: (كُلُّ صَلاةٍ وَجَبَتْ فِي الوَقْتِ وَإِنْ كَانَتْ مَعَ خَلَلٍ لَمْ يَجِبْ قَضاءُها)

واتە: هەر نوێژێك لەکاتێك دا فەرز بووبێ - وکرابێ - ئەگەر بەکەمو کووڕیەوەش بووبێ گێڕانەوەی ناوێ، (نووي)یش هەر ئەم ڕایەی پەسەند کردوەو

[295] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤٢، وە: (مجموعە الفتاوی) ج٢١ص١٠٤.

[296] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤٥، وە بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٨٠، ٢٨١. وە ئەمە ڕای (ابوحنیفة و مالك و احمد)ە وەك (نووي) گوتوویەتی.

[297] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤٥

[298] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٤٨.

گوتوویەتی[299]:(وهذا الّذي قاله المُزني هُوَ المُخْتار لِأنه أدىّ وَظيْفَةَ الوَقْتِ وإنّما يَجِبُ القَضاءُ بِأمْرٍ جَديْدٍ، وَلَمْ يثْبُتْ فيْهِ شَيئ بَلْ ثَبَتَ خِلافُهُ)،

واتە: وە ئەوەی (المزني) گوتوویەتی: هەر ئەوە ڕای هەڵبژاردەیە، چونکە ئەو کەسە کە بەوجۆرە نوێژەکەی دەکات ئەرکی ئەوکاتەی بەجێهێناوە، وە گێڕانەوەش فەرمانێکی تازەی دەوێ، کە هیچ شتێك لەوبارەوە نیە، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە – کە نەگێڕانەوەیە – چەسپاوە.

چوارەم: هەروەها لەوبارەوە کە ئایا بابای مەسح کەر لەسەر شکستەو برین پێویستە وێڕای دەستی تەڕ پێداهێنان (مسح)ی تەختەو گەچی شکستەکەی و پەڕۆو لەفافی برینەکەی تەیەمومیش بکات یان نا؟ دیسان ڕایان جیاوازە:

جارێ زۆربەیان وەك (نووي) لە (العَبْدَري) یەوە نەقڵیکردوە ڕایان وایە کە مادام مەسحی کردوە تەیەمموم پێویست نیە، بەڵام شافیعییەکان لەوبارەوە لەنێو خۆیان دا ڕایان جیایەو هەندێکیان ڕایان وەك ڕای زۆربەیەو زۆربەشیان دەڵێن پێویستە تەیەممومیش هەر بکات[300].

بەڵام وەك (ابن تیمیة)ش گوتوویەتی[301]: (ڕای جەماوەر ڕاستترو چاکترو ئاسانتریشە)، ئەوەندە هەیە ئەو فەرموودەیەی (جابر) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە پشتگیری ڕای شافیعییەکان دەکات، چونکە هەرکام لەشۆردن و مەسح و تەیەمومی تێدا باس کراون، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە:

١–فەرموودەکە مشتومڕی لەسەرەو (بَیْهَقی) گوتوویەتی[302]: (ولايثْبُتُ في هٰذا الباب عَنِ النَبيِّ ﷺ شَيءٌ وأقْرَبُ شَيْءٍ فيْهِ حَديْثُ جابِرٍ الّذي سَبَقَ ولَيْسَ بِالقَويِّ)

واتە: لەو بارەوە هیچ شتێکی مسۆگەر لەپێغەمبەرەوە ﷺ نیە، وە نیزیکترین شت ئەو فەرمودەیەی (جابر) ە کە ڕابرد، بەڵام بەهێز نیە.

---

[299] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٤٨.

[300] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤٥.

[301] بڕوانە(مجموعة الفتاوىٰ) ج٢١ص١٠٤، ١٠٥.

[302] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٤١.

ب-هەموو ئەو شوێنەوارانەی دیکە کە لە (ابن عمر)و لەزانایانی (تابعین) یشەوە هاتون یەکدەنگن لەسەرئەوە کەتەیەمموم پێویست نیە[٣٠٣].

پێنجەم: بەڵام ئەگەر برین (جُرْح) نەپێچرابوو ئەوە زانایان بەگشتی دوو ڕایان لەبارەیەوە هەن[٣٠٤]:

ا-(شافعی و احمد) ڕایان وایە کە ئەوەی ساغە بشۆرێ و لەجیاتی ئەوەی برینداریشە تەیەمموم بکرێ، بەڵام (احمد)[٣٠٥] ڕایەکی دیکەش هەیە کەبریتیە لەوەی لەجیاتی تەیەمموم برینەکە دەستی تەڕی پێدابهێنرێ.

ب-(ابوحنیفة و مالك )یش ڕایان وایە کە ئەگەر زۆربەی جەستەی ساغ بوو ئەوە دەیشوات و تەیەمومی ناوێ، بەڵام ئەگەر زۆربەی بریندار بوو، ئەوە بەس تەیەمموم دەکات و شۆردنی ناوێ، منیش وای تێدەگەم هەرکام لەو دوو ڕایە وەك یەك پەسەندن و هەرکامێکیشیان حاڵەتی تایبەتی خۆی دەبێ.



[٣٠٣] (شَمْسُ الحقّ) له (عَوْنُ المَعْبودِ فِي شَرْحِ سُنَنِ أَبِي داود) ج١ص٥٣٥ دا گوتوویەتی: (رِوايَةُ الجَمْعِ بَيْنَ التَّيَمُّمِ والغُسْلِ ما رواها غَيْرُ (زبير بن خريق) وهو مع كونِهِ غير قوي في الحديث، قد خالَفَ سائِرَ مَنْ رَوَىٰ عن عطاء بن ابي رباح، فرواية (الجَمْعِ بين التيمم والغُسْلِ رواية ضعيفة لاتَثْبُتُ بها الأَحْكامُ)، بڕوانە: (الوجيز في الفقه السنة والكتاب العزيز) ص٤٩.

[٣٠٤] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣١٦.

[٣٠٥] بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٨٢.

# تـەيـەمـموم ( التَيَمُّمْ )

خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین لەم پێنج خاڵەی خوارەوەدا بـەکورتیو گوشـراوی باسـی تەیەمموم بکەین کە برگەی حەوتەمو کۆتاییە لەبابەت (موضوع) ی پاکو خاوێنیدا:

یەك: تەیەمموم چییەو چۆنە؟!

دوو: تەیەمموم بەچی دەکرێ؟!

سێ:ئەندامەکانی تەیەمموم کامانەن؟

چوار: کەسێك نە ئاوی دەست بکەوێ نەتەیەممومی بۆ بلوێ حوکمی چییە؟!

پێنج: چەند ووردە بابەتێك دەربارەی تەیەمموم.

یەك: تەیەمموم چییەو چۆنەو بۆچی دەکرێ[٣٠٦]؟!

وشەی (تَيَمَّمْ) بەمانای مەبەست (قَصْـد) دێ، دەگوتـرێ: (تَيَمَّمْتُ فُلانـاً ويَمَّمْتُـهُ وتَأمَّمْتُهُ وأمَّمْتُهُ أيْ قَصَدْتُهُ) واتە: ڕووم کردە فلانە کەس.

پاشان لـەزاراوەی شـەرعزانانو عورفی زانایـانی ئیسلام دا بەگشتی بۆتـە نـاوی تایبەت بۆ مەسح کردنی دەموچاوو هەردووك دەست بەخاك یان ڕوو (صعید)ی زەوی.

خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: (يا أَيُّها الذين آمنوا اذا قمتم الى الصلاة فَٱغْسِلوا وجوهكم وأيديكم الى المرافِقِ وٱمسحوا برؤسكم وأَرجلَكُمْ الى الكعبين، وان كنتم جنباً فَٱطَّهَّروا وان كنتم مَرْضىٰ او على سفرٍ او جاء احد منكم من الغائِطِ اولا مَسْتُمُ النِّساءَ فلم تجدوا ماءً فتيمَّموا صَعِيْداً طيباً فَٱمْسَحوا بوجوهكم وأيديكم مِنْهُ مايريد الله لِيَجْعَلَ عليكم مِنْ حَرجٍ ولكنْ يريدُ ليطهِّرَكُمْ ولِيتِمَّ نِعْمَتَهُ عليكم لعلكم تشكرون) المائدة(٦).

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە هـەرکاتێك بـۆ نوێـژ هەڵسـان ڕووتـان و دەستەکانتان هەتا ئانیشکان بشۆن وەسـەرتان مەسح بکەنو لاقەکانیشتان هـەتا دو گوێزینگەکان بشۆن، وە ئەگـەر لەشتان پیس بوو خۆتـان پـاك بکەنـەوە، جـا ئەگـەر نـەخۆش بـوون یـان لەسـەفەرێ بـوون یـان یـەکێکتان لـەتارەت گرتـن هاتـەوە،

[٣٠٦] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٣٧، وە بڕوانە (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص١٩٩.

یان لەگەڵ ژنەکانتان دا جووت بوون وە ئاوتان چنگ نەکەوت ئەوە ڕووبکەنە ڕووی[٢٠٧] (یان خاکی) پـاکی زەوی‌و دەم‌وچـاوو دەسـتەکانی خۆتـانی پـێ مەسـح بکـەن خـوا نایەوێ کە سەغڵەتتان بکات، بەڵکو دەیەوێ کەپاکتان بکاتەوە، وە بۆئەوەی چاکەی خۆیتان لەسەر تەواو بکات بۆئەوەی سوپاسگوزار بن.

وەك لـەم ئایەتـە بەپێزەدا دەبینین خـوای بەبەزەیی و کاربـەجێ ڕووکردنـە خـاك‌و ڕووی زەوی‌و دەست‌و دەم‌وچاو پێ مەسح کردن (تیمم)ی کردووە بەجێدار (بدیل)ی ئاو بۆ کەسێك کە ئاوی چنگ ناکەوێ یان بۆی نالوێ بەکاری بهێنێ، کە خۆی پـێ پاك بکاتەوە، لەهەرکام لەدوو لەش پیسی‌یەکانی گەورە و گچکە.

شـایانی باسـە کـە ڕەوا بوونـی تەیـەمومیش وێـرای قورئـان‌و سـوننەت - کـە هەرکامیان بەتەنیا بەسن بۆ ئیسپاتی هەر حوکمێك - یەکدەنگی زانایانیشی لەسەرە، وەك (نووي) گوتوویەتی[٢٠٨] هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە تەیەممومم تایبەتە بەدەم‌وچاوو هـەردووك دەستەکانەوە چ بۆ لابردنـی بێ‌دەسـتنوێژی (الحدث الاصغر) بێت چ بۆ لەش پیسی (الحدث الاکبر)[٢٠٩].

هـەروەها تەیـەمموم یەکێکـە لەتایبەتمەندی‌یـەکان[٢١٠] (خصـائص)ی ئۆممـەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ ، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی:

*(أُعْطِيتُ خَمْساً لَمْ يُعطَهُنَّ نَبِيٌّ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وطَهُوراً، فأَيُّما رَجُلٍ مِنْ أمتي أدركتهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ، وأُحِلَّتْ لِيَ الغَنَـائِمُ ولَمْ تَحِـلَّ لِأَحَـدٍ قَبْلِـي، وأُعْطِيتُ الشَّفاعَةَ، وكانَ النَبِيّ يُبْعَثُ الىٰ قَوْمِهِ خاصَّةً وبُعِثْتُ الىٰ الناسِ عامّةً) متفق عليه عن جابر بن عبدالله وهذا لفظ البخاري.

واتە: پێنج شتم پێ‌بەخشراون کە هیچ پێغەمبەرێك لەپێش مندا پێی نەدراون:

---

[٢٠٧] دوایی ماناو چەمکی وشەی (صَعيْد) ڕوون دەکەینەوە کە هەم گڵ (تُراب) هەم ڕووی زەوی (وَجْهُ الأرض) دەگەیەنێ.

[٢٠٨] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٣٧، وە بڕوانە: (المفصل) ج١ص١٢٨

[٢٠٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٢١٠] بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢١ص١٩٩

١-مانگەڕێیەك بەهۆی ترس و بیم - خرانە دڵی دوژمن - ەوە سەرخراوم، ٢-وە زەویم بۆ کراوە بەنوێژگەو پاك و پاککەرەوە: جا هەر پیاوێك لەئوممەتم لەهەر جێیەك نوێژی بەسەردا هات با بیکات، ٣-دەستکەوتەکان - ی جەنگی - م بۆ حەڵاڵ کراون و بەر لەمن بۆ هیچ کەس حەڵاڵ نەبوون، ٤-وە پلەو پایەی تکاکردن - ی مەزن (الشفاعة العظمى)-م پێ بەخشراوە. ٥-وە هەرکام لەپێغەمبەرانی دیکە بەتایبەت بۆ کۆمەڵەکەی نێرراوە، بەڵام من بۆ تێکڕای خەڵکی نێرراوم.

جێی سەرنجە کە هەم خوای پەروەردگار و هەم پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بەڕاشکاوی فەرموویانە کە خاك (تراب) یان ڕووی زەوی پاکەو پاککەرەوەشە لە لەش پیسی گەورەو گچکە!

خوای بەرزو مەزن پاش ئەوەی باسی تەیەممومی کردوە فەرمویەتی: (مايريد الله ليجعل عليكمْ من حرج ولكن يريد ليطهركم..)!

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **(وجعلت لي الأرض مسجداً وطهوراً)**.

هەروەها فەرمویەتی: **(انَّ الصَّعِيْدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ وانْ لَمْ يَجِدِ الماءَ عَشْرَ سِنِيْنَ، فَـإذا وَجَدَ الماءَ فَلْيَمسَّهُ بَشْرَتَهُ فَـأنَّ ذلِكَ خَيْرٌ)** رواه احمد واصحاب السنن الا ابن ماجة عن ابي ذر الغفاري رضي الله عنه.

واتە: ڕووی پاکی زەوی پاککەرەوەی مسوڵمانە ئەگەر هەتا دەساڵیش ئاوی چنگ نەکەوێ، جا هەرکات ئاوی دەست کەوت با خۆی پێ تەڕ بکات بێگومان ئەوە چاکترە. "دیارە مەبەست لە (طهور) - پاککەرەوە - یی ڕووی زەوی لێرەدا پاککەرەوەیی‌یەتی لە لەش پیسی گچکەو گەورە".

ئنجا زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە تەیەمموم مۆڵەت (رخصة) ێکەو جێدار (بديل)ی ئاوە، کەواتە تەنیا کەسێك بۆی هەیە ئەو مۆڵەتە وەربگرێ کە یان ئاوی چنگ نەکەوێ یان چنگی بکەوێ بەڵام بۆی نەلوێ بەکاری‌بێنێ، جا بەزۆری ئاو چنگ نەکەوتن (فَقْدُ الماءِ) لەسەفەرێ‌یەو نەخۆشیی (مَرَضْ)یش لەماڵێ‌یە، ئەگەرنا لەهەر حاڵێك دا مسوڵمان ئاوی چنگ نەکەوت بۆ دەستنوێژگرتن یان خۆشۆردن، یان لەبەر نەخۆشیی نەیتوانی بەکاری بێنێ، ئەوە هەم دەقی قورئان و سوننەت و هەم یەکدەنگی[٣١١] زانایانیشی لەسەرە کە بۆی هەیە لەجیاتی هەردووکیان تەیەمموم بکات.

---

[٣١١] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج١ص٣٢٢، وە بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٣٣.

هەروەها ئەگەر لەبەر ساردی ئاوو سەرما بوونیش نەتوانێ ئاو بەکاربێنێ، وە بۆشی نەلوێ گەرمی بکات، ئەوە دیسان بەڕای زۆربەی زۆری زانایان بۆی هەیە تەیەمموم بکات[٣١٢]، ئەمەش چەند دەقێك لەسوننەت لەوبارەوە وێڕای دەقەکانی پێشوو بەتایبەت ئایەتی ژمارە (٦)ی سوورەتی (المائدة) !

*(عن عمران بن حُصَيْن رضي الله عنه قال: كنا مع رَسولِ الله ﷺ في سَفَرٍ، فَصلَّ بالناسِ فاذا هو بِرَجُلٍ مُعْتَزِلٍ، فقال: ما مَنَعكَ أنْ تُصَلِّيَ؟ قال: أَصَابَتْني جنابَةٌ ولا ماءَ، فقال: عَلَيْكَ بالصَّعيْدِ فانَّهُ يَكْفيكَ) متفق عليه.

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەفەرێك بووین، نوێژی بەخەڵکەکە کرد، بەڵام بینی پیاوێك خۆی دوور گرتوە، فەرمووی: بۆچی نوێژت نەکرد؟ گوتی: لەشم پیس بووەو ئاویش نیە، فەرمووی: دەست بەڕووی زەوی‌دا بێنە بەستە.

*بەسەرهاتی ئەو پیاوەی کە لە سەفەرێك سەری‌شکابوو وەئیحتلامیش بوو بوو، جا پرسی بەهاوەڵەکانی کرد کە ئایا مۆڵەتی تەیەممومی هەیە؟ ئەوانیش بەنەزانی گوتیان: نەء، هەردەبێ خۆت بشۆی، پاشان خۆی شۆردو مرد، پێغەمبەریش ﷺ کەبیستی گلەیی لەهاوەڵەکانی کردو فەرمووی: (انَّما كانَ يَكْفيهِ أنْ يَتَيَمَّمَ) رواه ابوداود، کەپێشتر هێناومانە.

*(عن عمرو بن العاص رضي الله عنه انه لَمّا بُعِثَ في غَزْوَةِ ذاتِ السَّلاسلِ قال: إحْتَلَمْتُ في لَيْلَةٍ باردةٍ شَديدَةِ البَرْدِ، فَاَشْفَقْتُ إنْ اغْتَسَلْتُ أنْ أَهْلَكَ، فَتيمَّمْتُ ثمَّ صلَّيْتُ بأصْحابي صَلاةَ الصُّبْحِ، فلمَّا قَدِمْنا على رسول الله ﷺ ذَكَروا ذلك لَهُ، فقال: يا عَمْرو صَلَّيْتَ بأصْحابِكَ وأنْتَ جُنُبٌ؟ فَقُلْتُ: ذَكَرْتُ قَوْلَ الله تعالى: (ولا تَقْتُلوا أنْفُسَكُمْ انَّ اللهَ كانَ بِكُمْ رَحيْماً) فتيَمَّمْتُ ثم صَلَّيْتُ فَضَحِكَ رسولُ الله ﷺ ولَمْ يَقُلْ شَيْئاً) رواه احمد وابوداود والحاكم.

واتە: عەمری کوڕی عاص خوا لێی ڕازی‌بێ دەگێڕێتەوە کە لەکاتێك دا بۆ غەزای (ذات السلاسل) نێرراوە، دەڵێ: لەشەوێکی سەرمای زۆر سارددا ئیحتیلامم بوو، وە ترسام کە ئەگەر بێت خۆم بشۆم بفەوتێم، بۆیە تەیەمموم کردو نوێژم بۆ هاوەڵەکانم کرد، جا کاتێك چووینەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئەی عەمر چۆن نوێژت بەهاوەڵەکانت کردو لەش پیسیش بووی؟ منیش گوتم:

---

[٣١٢] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٢٤، ٣٢٥، وە بڕوانە: (المغني) ج١ص٢٦٥، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٤٣٦

فەرموودەی خوای بەرزم هاتە یاد (وە خۆتان مەکوژن چونکە بێگومان خوا لەگەڵتان بەبەزەییە) بۆیە تەیەمموم کردو نوێژم کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێکەنیو هیچی نەفەرموو.

وەك پێشتریش گوتمان زۆربەی هەرەزۆری زانایان ڕایان وایە کە دروستەو مۆڵەتە لەترسو بیمی سەرماو سوڵە لەجیاتی خۆشۆردن تەیەمموم بکرێ، پاشان کە ئەو حاڵەتە تایبەتە بەسەرچوو، پێویستە لەنیزیکترین دەرفەتی ڕەخساودا خۆی بشوات، ئەم ڕایە جگە لە (ابوحنیفة و مالك و ثوري و ابن المنذر)[٣١٣] ڕای (شافعییەکان)[٣١٤] و (احمد)یشەو[٣١٥] (ابن تیمیة)[٣١٦]ش پەسندی کردوە.

## دوو: تەیەمموم بەچی دەکرێ؟!

هەم لەقورئانی بەپێزو هەم لەسوونەتی پێغەمبەری بەڕێزدا ﷺ ڕاگەیەنراوە کە ماددەی تەیەمموم پێکردن (صعید) ە (فتیمموا صعیداً طیباً) وە (علیك بالصعید فانه یکفیك) متفق علیه.

بەڵام ئایا (صعید) چییە؟! ئەوە زانایان تێیدا جیاوازن:

جارێ هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە گڵ (تراب) لەبازنەی (صعید) دایەو چاکترینو گرنگترین جۆریەتی، چونکە لەچەندان دەق دا هاتوە کە گڵو خاك پاککەرەوەیەو تەیەممومی پێدەکرێ، بۆ وێنە: (عن حذیفة بن الیمان رضي الله عنه ان النبي ﷺ قال: فُضِّلْنا علی الناس بِثَلاثٍ: جُعِلَتْ لَنا الأَرْضُ مَسْجِداً، وجُعِلَتْ تُرْبَتُها لَنا طَهُوراً إذا لَمْ نَجِدِ الماءَ وجُعِلَتْ صُفوفُنا كَصُفوفِ المَلائِكَةِ) رواه مسلم.

واتە: بەسێ شتان بەسەر خەڵکی دیکەدا بەرزکراوینەوە: زەویمان بۆ گێڕراوە بەمزگەوت، وە گڵەکەیمان ئەگەر ئاومان چنگ نەکەوت بۆ گێڕراوە بەپاککەرەوە، وە ڕیزەکانمان وەك ڕیزەکانی فریشتان دانراون.

---

[٣١٣] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج١ص٣٢٥.

[٣١٤] بڕوانە المجموع ج٢ص٣٠٩، بەڵام هەندێکیان بە دروست (جائز) یان نەزانیوە، بڕوانە (الروضة الندیة)ج١ص١٠٠

[٣١٥] بڕوانە (المغني) ج١ص٢٦٥.

[٣١٦] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢١ص٢٢٦.

بەلام ئایا (صعید) بەس گڵو خۆڵ (تراب) دەگەیەنێ یان نا؟ ئەوە زانایان رایان جیا جیایە:

جارێ (شافعي و احمدو داود وابن المنذر)[217] دەڵێن جگە لە گڵ تەیەمموم بەهیچ شتێکی دیکە ناکرێ، بەلام (ابوحنیفە و مالك) دەڵێن[218]: بەهەموو بەش و پێکهێنەرەکانی[219] زەوی جگە لەکانزایەکانی وەك زێرو زیو.. دروستە تەیەمموم بکرێ، وە (اوزاعي و ثوري)و هەندێك لەمالیکیەکان دەڵێن هەرشتێك لەسەر رووی زەوی بێت تەنانەت بەفرو سەهۆڵ بەندانو بەستەڵەکی سەر دەریاکانیش دروستە تەیەممومی پێبکرێ[220].

جا هەرچەندە لایەنگرانی رای یەکەم دەقەکانی سوننەت زۆر پشتگیری رایەکەیان دەکەن، وە هەموو لایەکیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەگڵ (تراب) و خاك چاکترینو لەپێشترین جۆری (صعید) ە، بۆ تەیەمموم، بەلام پێم وایە رای ئەوانە بەهێزترە – هەروەها لەگەڵ رووحی گشتی واقیع بینیو ئاسانکاری ئیسلامیش گونجاوترە – کە دەڵێن هەرچی لەسەر رووی زەوی بێت بە (صعید) دادەنرێو بەکەڵکی تەیەمموم پێکردن دێت، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

ا–وشەی (صعید) زۆربەی هەرەزۆری بگرە تێکرای فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەم خاكو گڵ (تراب)و هەم رووی زەوی (وجه الارض)یش بەگشتی دەگرێتەوە، هەرکام لە: (القاموس المحیط) و (المصباح المنیر) و (لسان العرب)و(فقه اللغة)و (المعجم الوسیط) ئەوەیان گوتووە، وە (الزَّجَّاجْ) گوتوویەتی: (الصَّعیْدُ وَجْهُ الأرْضِ تُراباً كان أو غَیْرُهُ لا أعْلَمُ اخْتِلافاً بَیْنَ اَهْلِ اللُّغَةِ في ذلك)[221] واتە (صعید) بەرووی زەوی دەگوترێ گڵ بێ یان غەیری گڵ، نەمزانیوە شارەزایانی زمان لەوبارەوە جیاوازییان هەبێ.

---

[217] بروانە: (المجموع) ج٢ص ٢٤٥، ٢٤٦،، وەبروانە: (شرح صحیح مسلم) ج٢

[218] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[219] ئەمە رای (ابن تیمیة)، بروانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢١ص٢٠٩. ص١٤٧٠.

[220] بروانە: (المجموع) ج٢ص٢٤٥، وە: (الفقه الاسلامي) ج١ص٥٨٨ تا ٥٩١.

[221] بروانە: (الروضة الندية) ج١ص٩٧، ٩٨.

ب- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وطَهُوراً) منفق عليه، ئاشکراشە کە ئەو زەوی‌یەی نوێژی لەسەر دەکرێ بەمەرج نەگیراوە کە دەبێ گڵ بێت، وە وشەی (طهور)یش کە لەئەسڵدا مانای پاکی‌و پاککەرەوەیی دەگەیەنێ[٣٢٢]، لێرەدا زیاتر مانای پاککەرەوەی هەیە، چونکە وشەی پێشوو (مسجداً) پاکێتی (طهارة) دەگەیەنێ، لەسۆنگەی ئەوەوە کە شوێنی پاك نەبێ نوێژی لێ‌ناکرێ، جا بۆئەوەی دووبارە (تکرار) دروست نەبێ کە بەبێ سوودو کەڵك پێچەوانەی رەوانبێژی (بلاغة)یە و لەپێغەمبەری خوا ﷺ ناوەشێتەوە، ناچارین بڵێین (طهور) لێرەدا پاککەرەوەیە، کە ئەمیش سیفەتی هەموو زەوی‌یە نەك بەتەنیا گڵ (تراب)، چونکە فەرموویەتی: (وجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ).

ج- لەو فەرموودەیەداکە (بخاري ومسلم) لە (عبدالله بن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك پێ‌ی‌گەیشتووە‌و سەلامی لێ‌ی کردوە بەڵام ئەو وەڵامی نەداوەتەوە (حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الجِدارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ) هەتا چووە لای دیوارێك‌و دەم‌وچاوو هەردووك دەستی مەسح کرد، پاشان وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

*پوختەی قسان:* هەرچەندە ووشەی (صعید) بەر لەهەر شتێك - بەهۆی دەقەکانی سوننەتەوە -، گڵ (تراب) دەگرێتەوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نیە کەغەیری (گڵ) نەگرێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەڵگە زۆرن کەغەیری (گڵ) یش دەگرێتەوە، ئنجا لەڕاستی‌دا ئەگەر سەرنجی دنیاو رووی زەویش بدەین دەبینین کەزۆر جێگای دەشت‌و بیابانەو لە لم (رَمْل) زیاتری لێ نیە؛ هەروەها سەروو و خوارووی گۆی زەوی لەچوار کەشەکانی ساڵداو زۆر شوێنی کوێستان لەزستانان دا بە بەستەڵەك و بەفر دادەپۆشرێ‌و تۆزە گڵێکت بۆ دەرمانیش چنگ ناکەوێ‌و، ئەگەر بەس گڵ بۆ تەیەممومم بشێ خەڵکی ئەو شوێنانە دووچاری سەغڵەتی‌و گرفتاری‌یەکی زۆر دەبن.

---

[٣٢٢] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٥٦٩، کە گوتویەتی: (الطَّهُورُ: الطَّاهِرُ في نَفْسِهِ المُطَهِّرُ لِغَيْرِهِ، فَكلُّ طَهُورٍ طاهِرٌ ولا عَكْسَ).

سێ: ئەندامەکانی تەیەمموم کامانەن؟!

زانایانی ئیسلام لەو بارەوە کەئەندامەکانی تەیەمموم بەس دەموچاوو هەردووك دەستەکانن یەکدەنگن[٣٢٣]، چونکە خوای پەروەردگارو پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ بەڕاشکاوی ئەوەیان فەرمووەو ڕوونیان کردۆتەوە، وەك لەخاڵی یەکەم دا باسمان کردو دەقەکانمان خستەڕوو، بەڵام لەو بارەوە کە ئایا دەستەکانی وەك دەستنوێژ دەبێ هەتا ئانیشکەکانیان بن، یان بەس لەپە دەستەکان هەتا مەچەکەکانیان؟ ڕایان جیاوازە:

هەرچی (عطاء و مکحول و اوزاعي و اسحاق و داود و احمد وابن المنذر)[٣٢٤]ن و (ابن حزم[٣٢٥] و ابن تیمیة[٣٢٦] و شوکانی[٣٢٧] و قنوجي[٣٢٨]یش، ڕایەکەیانیان پەسەند کردووە، دەڵێن: ئەندامەکانی تەیەمموم بەس دەموچاو (وجه) و هەردووك لەپە دەستن بە بەرو پشتەوە هەتا بازنەو مەچەك (رُسْغ).

بەڵام: (مالك و اصحاب الراي وشافعي و لیث وثوري) و لەپێش ئەمانیشەوە (الحسن البصري و الشعبي وسالم بن عبدالله بن عمر) ڕایان وایە کە دەبێ هەردووك دەستەکان هەتا ئانیشکەکانیان مەسح بکرێن[٣٢٩].

ئنجا شایانی باسیشە کە (نووي)یش ڕای یەکەمی پەسەند کردووە کە (ابوثور) لەشافیعیەوە گێڕاویەتەوە وەك ڕای پێشوو (القول القدیم)ی و گوتوویەتی[٣٣٠]:

(وهذا القَوْلُ وانْ کان قَدیْماً مَرْجوحاً عِنْدَ الأَصْحابِ فهو القَوِيُّ في الدَّلیْلِ وهو الأَقْرَبُ الیٰ ظاهِرِ السُّنةِ الصَّحِیْحَة)

---

[٣٢٣] بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج٢ص١٤٦٨.

[٣٢٤] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٤٢.

[٣٢٥] بڕوانە: (المحلَّی شرح المُجلَّی) ج٢ص٩٣، مسالة: ٢٥٠.

[٣٢٦] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢١ص

[٣٢٧] بڕوانە: (الأُدلة الرضیة شرح الدرر البهیة) ص٤١.

[٣٢٨] بڕوانە: (الروضة الندیة) ج١ص ١٠١، ١٠٢.

[٣٢٩] بڕوانە/ (المجموع) ج٢ص٢٤٢.

[٣٣٠] هەمان سەرچاوە بەرگ، ص٢٤١، ٢٤٢.

واتە: وە ئەو ڕایە هەرچەندە لەلای هاوەڵان - ی مەزهەبی شافیعی - قسەی کۆن و بێهێز - ی شافیعیـ - ە، بەڵام لـەڕووی بەڵگـەوە هـەر ئـەو بـەهێزەو لەڕواڵـەتی سوننەتی ڕاست (صحیح)یش نزیکترە.

ئنجا لەڕاستیدا ڕای یەکەم - کە دەڵێ ئەندامەکانی تەیەمموم ڕوو و هەردووك لەپە دەستەکانن هەتا مەچەکەکانیان - ڕاست ترو بەڵگەدارترەو لەچەندان دەقی سوننەت دا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەو ئەندازەیەی لە دەستەکان دیاریکردوە بۆ تەیەمموم، بۆ وێنە[٢٣١]:

*(عن عَمَّار بن ياسر رضي الله عنهما قال: أَجْنَبْتُ فَتَمعَّكْتُ في التُّرَاب وَصَلَّيْتُ، فقال النبيُّ ﷺ: إِنَّما يَكْفِيكَ هٰكذا: فَضَرَب النَبِيُّ ﷺ بِكَفَّيْهِ الأَرْضَ فَنَفَخَ فِيهِما، ثُمَّ مَسَحَ بِهِما وَجْهَهُ وكَفَّيْهِ) متفق عليه.

واتـە: تووشـی لـەش پیسـی بـووم بۆیـە خۆمـم لـەخۆڵێ وەردا وە نوێـژم کـرد. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئا ئەوەندەت بەس بوو: ئنجا پێغەمبـەر ﷺ هـەردووك لەپە دەستی لە زەویدان و پاشان فووی لێکردن، ئنجا دەموچاو و هـەردووك لەپەدەستی پێ مەسح کردن.

وە لەڕاستیدا ئەو ڕایەی دەڵێ دەبێ هەتا ئانیشکەکان مەسح بکرێ هیچ دەقێکی ڕاست (صحیح)ی سوننەتی لەسەر نیەو بەڵگەیان وەك (نووي) گوتوویەتی[٢٣٢]: تەنیا ڕواڵەتی ئایەتەکەیە، بەڵام مادام سوننەت ڕوونی کردۆتەوە کە مەبەست لە (فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيدِيْكُمْ) دەموچاوو هەردووك دەستە تا مەچەکەکانیان، ڕواڵەتی ئایەتەکە بە بەڵگە ناشێ.

هەڵبەتە مەبەستیشمان ئەوە نیە کە تەیەممومەکـەی دروسـت نیـە، بـەڵام دەڵێین بەڵگە لەسەر ئەوە نیە کەهەتا ئانیشکەکان مەسح کردنی پێویست بێ.

---

[٢٣١] بڕوانە: (فتح الباري) ج١ص٥٨٨، وە: (شرح صحيح مسلم) ج٢ص١٤٦٥.

[٢٣٢] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٤٢، ٢٤٣.

چوار: کەسێك نەئاوی دەست بکەوێو نە تەیەمومی بۆ بلوێ حوکمی چییە؟!

زانایان لەوبارەوە رایان جیاجیایەو وەك (نووي) گوتوویەتیو[333] هەرکام لە (الحافظ ابن حجر العسقلاني)[334] و (شوکاني)[335] لێیەوە نەقڵیان کردوە، سەرجەم پێنج رایان هەن:

١-کە رای (اوزاعي و سفيان الثوري واصحابالراي)[336] و رایەکی (ابوثور)یشە[337]، دەڵێ: نابێ نوێژ بکاتو دەبێ چاوەڕێ بکات هەتا ئاو یان ماددەی تەیەمموی لێ هەڵدەکەوێ، هەرکام لە فەرموودەی: (لايَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيْرِ طَهُورٍ) رواه مسلم، وە فەرموودەی: (مِفْتاحُ الصَّلاةِ الطُّهورُ) رواه ابوداود والترمذي وقال: حديث حسن، بە بەڵگە دێنەوە؛ دیارە لایەنگرانی ئەم رایە دەڵێن دەبێ دوایی بیگێڕێتەوە.

٢و٣- کە رای (اكثر اصحاب مالك و شافعي احمد و جمهور المحدثين)ە[338]، دەڵێ: پێویستە لەکاتی خۆیدا نوێژەکەی بکات، بەڵام زۆربەی شافیعییەکان دەڵێن دەبێ دوایی بیگێڕێتەوە، (احمد و المزني و سحنون و ابن المنذر)[339]یش دەڵێن گێڕانەوەی ناوێ. بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە[340]:

*( عن عائشة انها اسْتَعارَتْ مِنْ أَسماءَ قِلادةً فَهلَكَتْ، فأَرسَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ ناساً مِنْ أُصحابِهِ في طَلَبِها، فأدْرَكَتْهُمُ الصَّلاةُ فَصَلّوا بِغَيْرِ وضوءٍ، فَلمّا أَتَوا النبيَّ ﷺ شَكَوْا ذلك اليْهِ، فَنَزلَتْ آيةُ التيمم، فقال أُسَيدُ بنُ حُضَيْرٍ: جَزاكِ اللهُ خَيْراً، فوالله مانَزَلَ بِكِ أَمْرٌ قَطُّ إلاّ جَعَلَ اللهُ لَكِ مِنْهُ مَخْرَجاً، وَجَعَلَ لِلمُسْلمينَ فيهِ بَرَكَةً) متفق عليه، مع اختلاف يسير في بعض الالفاظ.

واتە: عائیشە ملوانکەیەکی لە ئەسماء خواستبوو کەچی لێی بزربوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك لەهاوەڵەکانی بۆ دۆزینەوەی نارد، وە لەرێگا نوێژیان

---

[333] بروانە: (شرح صحيح مسلم) ج٢ص١٤٧٢، ١٤٧٣، وە: (المجموع) ج٢ص٣٠٥، ٣٠٦.

[334] بروانە: (فتح الباري) ج١ص ٥٨٤، ٥٨٥.

[335] بروانە: (نيل الاوطار) ج١ص٣٢٨.

[336] بروانە: (المجموع) ج٢ص٣٠٥، مەبەست لە (اصحاب الراي)، (ابوحنيفة)و هاوەڵەکانییەتی .

[337] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[338] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

[339] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

[340] بروانە: (فتح الباري) ج١ص٥٨٤، وە (شرح صحيح مسلم) ج٢ص١٤٦٥.

بەسەرداهات و بەبێ دەستنوێژ نوێژیان کرد، جا کاتێك چوونەوە لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای ئەو مەسەلەیان لەلاکرد، وە ئایەتی تەیەمموم هاتەخوار، جا (اسید بن حضیر) بە عائیشەی گوت – خوالێیان ڕازیبێ –:

خوا پاداشتی چاکت بداتەوە، بەخوا هیچ گرفتارییەکت تووش نەبووە، مەگەر خوا دەرووی لەتۆ کردۆتەوەو بۆ مسوڵمانانیش بۆتە مایەی بەرەکەت وپێز.

٤- کە ڕای (داود الظاهري) و ڕایەکی (ابوثور)ە[٣٤١]، کە دەڵێ: نابێ نوێژ بکات و پێویستیش نیە بگێڕێتەوە، بەڵگەشیان ئەو فەرموودانەن کە لایەنگرانی ڕای یەکەم بە بەڵگەیان هێناونەوە.

٥-کە ڕایەکی کۆنی شافیعییە ئەوەیە کە سوننەتە نوێژەکەی بکات، بەڵام فەرزە دوایی بیگێڕێتەوە[٣٤٢].

واش پێدەچێ کە ئەو ڕایەی دەڵێ: پێویستە نوێژەکەی لەکاتی خۆیدا بکات، بەڵام پێویست ناکات بیگێڕێتەوە کەڕای (احمد و المزني وسحنون وابن المنذر)ەو(ابن حزم الأندلسي)[٣٤٣]یش هەڵی بژاردوە، لەهەموو ڕایەکانی دیکە ڕاست تر بێت، چونکە سەرەڕای ئەو فەرموودەیەی باسی ملوانکە (قِلادة)کەی عائیشەی تێدایە، چەند دەقێکی دیکەش بەڵگەینی، وەك:

(فاتّقوا الله ما اسْتَطَعْتُمْ) التغابن -١٦-

(لايُكَلِّفُ الله نَفْساً اِلاّ وُسْعَها) البقرة -١٨٦-

**(ما نَهيتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبوُهُ، وما أمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلوا مِنْهُ ما اسْتَطَعْتُمْ)** رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة ﷺ

(نووي)یش هەمان ڕای پەسەندکردوەو لەبارەیەوە گوتوویەتی:[٣٤٤] (.. يَجِبُ الصَّلاةُ ولايَجِبُ الإعادَةُ وهذا مَذْهَبُ المُزْني وهو أقْوى الأقوالِ دَليْلاً ويَعْضُدُهُ هذا الحديثُ و أمْثالُهُ، فأنَّهُ لَمْ يُنْقَلْ عن النبيِّ ﷺ إيجابُ إعادَةِ مِثْلِ هذِهِ الصَّلاةِ، والمُخْتارُ أنَّ القَضاءَ إنَّما يَجِبُ بِأمْرٍ جَديْدٍ ولَمْ يَثْبُتْ الأمْرُ فَلا يَجِبُ..)

---

[٣٤١] بروانە (المجموع) ج٢ص٣٠٥.

[٣٤٢] بروانە: (فتح الباري) ج١ص٥٨٥.

[٣٤٣] بروانە: (المحلى) ج٢ص٨٨، مسالە: ٢٤٧.

[٣٤٤] بروانە: (شرح صحيح مسلم) ج٢ص١٤٧٢، ١٤٧٣.

واته: – ئەو ڕایەی دەڵێ – کردنی نوێژەکە فەرزەو گێڕانەوەی پێویست نیە، وە ئەمە ڕای موزنیـیە وە بـەهێزترین ڕایـە لـەڕووی بەڵگـەوەو ئـەم فەرموودەیـە (واتـە فەرموودەکـەی عائیشـە) و هـاو وێنـەکانی پشـتگیری دەکـەن، چونکـە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ نـەهاتووە کـە گێڕانـەوەی ئـەوجۆرە نوێـژەی فـەرز کردبـێ، وە ڕای پەسەند ئەوەیە کە بە فەرمانێکی نوێ نەبێ گێڕانەوە پێویست نابێ و فەرمانی واش ئیسپات نەبووە کەواتە پێویست نیە.

هەرچـەندە بـەگوێرەی ئـەو ڕاوبۆچوونـەی کـە پەسـەندمان کـرد دەربـارەی ئـەو ماددانەی تەیەممومیان پێ دروستە، چنگ نەکەوتنی مادەی تەیـەممومی زۆر دەگمەنەو پێم وایە تەنیا لەحاڵەتێك دا دێتەدی کە ئینسانی مسوڵمان لەشوێنێکی پیس (نَجِسْ) حەپس بکرێ کە نەئاوو نـەهیچ شـتێکی پـاکی تەیـەممووم پـێکراوی لـێنەبێ، یـان لەشوێنێك کە هەمووی قوڕو قاڵ بێت!

## پێنج: چەند وردە بابەتێك دەربارەی تەیەمموم

١-ئایا تەیـەمموم بەلابـەری بێدەستنوێژی و لـەش پیسی دادەنرێ بەشـێوەیەکی کاتـیی، یان بـەس ڕێگـادەری ئـەنجام دانـی نوێـژو ئەو خواپەرستـییانەیە کە بەلەش پاکی نەبێ ناکرێن؟!

زانایان لـەوبارەوە ڕایان جیاجیایەو (نـووي) گوتوویـەتی:[٢٤٥] زۆربـەو جـەماوەری زانایان ڕایان وایە کە تەیـەمموم لـەش پیسـی گـەورەو گچکە لانابات (لایرفع الحدث) بەڵکو تەنیا ڕێ و مۆڵەتی نوێژو خواپەرستیی دەدات!

بـەڵام لەڕاستـیدا ئەگـەر سـەرنجی دەقـەکانی قورئـانو سـوننەت بدەیـن زۆر چـاك دڵنیـادەبین کـەڕای جـەماوەرو زۆربـە نـەپێکاوەو هەڵەیـە، چونکـە[٢٤٦]:

---

[٢٤٥] بڕوانە ( المجموع) ج٢ص٢٥٣، بەڵام (داود الظاهري و الکرخي الحنفي وبعض المالکیة) بەپاککەرەوەی دەزانن.

[٢٤٦] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢١ص٢٢٨، ٢٢٩.

**یەکەم**: لەچەندان دەقی قورئان‌و سوننەت دا هاتووە کە تەیەمموم پاککەرەوەیەو لابەری لەش پیسی (حَدَث) یە، بۆ وێنە:

أ-(فَتَيَمَّموا صَعيداً طَيِّباً فَامْسَحوا بِوجُوهِكُمْ وأيْديكُمْ مِنْهُ مايريدُ اللهُ لِيَجْعَلَ عَليكُمْ مِنْ حَرَجٍ ولكِنْ يُريدُ لِيُطَهِّرَكُمْ)المائدة -٦-، وەك دەبینین خوای کاربەجێ بەڕوون ڕاشکاوی دەفەرمووێ: خوا دەیەوێ کە پاکتان بکاتەوە، ئنجا دیارە کە تەیەممومیش جێدار (بدیل)ی دەستنوێژو خۆشۆردنە، کەواتە: بەدەقی قورئان تەیەمموم پاککەرەوەیە لە لەش پیسی گەورەو گچکە.

ب-(وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وطَهُوراً) متفق عليه، کەپێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە.

ج- (إنَّ الصَعيْدَ الطيِّبَ طَهُورُ المُسْلِم..) رواه احمد واصحاب السنن الا ابن ماجة، کە ئەمیشمان پێشتر هێناوە.

د- وەك پێشتر لەبڕگەی دووەم داو لەبارەی چۆنیەتی لابردنی پیسییەکانەوە هێنامان پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خاوێن کردنەوەی نەعل‌و پێڵاو بەزەوی‌و خاك فەرموویەتی:(...فَإنَّ التُّرابَ لَهُما طَهُورٌ) رواه ابوداود، وە دەربارەی تەشك‌و دامێنی کراسی درێژو لەزەوی خشاوی ئافرەتیش فەرموویەتی: (يُطَهِّرُهُ مابَعْدَهُ) رواه احمد واصحاب السنن الا النسائي.

**دووەم**: ئەو دەقەی کە بە بەڵگەش دەیهێننەوە کە گوایە بابای تەیەمموم کەر هەر بەلەش پیس (جُنُب) دادەنرێ، وەك لە بەسەرهاتەکەی (عمرو بن العاص)دا هاتوە کە پێشتر هێنامان‌و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: (أَصَلَّيْتَ بِأَصْحابِكَ وأنْتَ جُنُبٌ؟!) رواه احمد وابوداود، ئەوە لە ڕاستیدا بەڵگەیە لەسەریان چونکە:

یەك: پێغەمبەر ﷺ بەرەخنەو گلەیی‌یەوە فەرموویەتی: چۆن بەلەش پیسی نوێژت بۆ هاوەڵەکانت کرد؟ کەواتە دیارە بەلەش پیسی دروست نیە نوێژبکرێ‌و ئەگەر بابای تەیەمموم کەر بەلەش پیسی دانرابایە ڕێی نوێژکردنی نەدەبوو!،

دوو: دوای ئەوەی عەمر گوتوویەتی: (فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ) پێغەمبەر ﷺ بەزەردەخەنە کردن‌و بێدەنگ بوونی ڕەزامەندی دەربڕیوە (فَضَحِكَ رَسولُ اللهِ ﷺ ولَمْ يَقُلْ شَيْئاً).

٣-تەیەممومیش وەك هەر خواپەرستی‌یەکی دیکە نیەت هێنان فەرزی یەکەمیەتی‌و زانایان لەو بارەوە کێشەو مشت‌ومڕیان نیە، بەڵام ئەوانەی کەپێیان وایە تەیەمموم لەش پیسی (حدث) لانابات، گوتوویانە: نابێ نیەتی لابردنی لەش پیسی بهێنێ،

بەڵکو دەبێ نیەتی ڕێگاپێدرانی نوێژ (نیة إِسْتِباحَةِ الصَّلاة) بهێنێ![247] بەڵام ڕوونمان کردەوە کە ئەو بۆچونە هەڵەیە، کەواتە ئەم ئەنجامگیرییەش کە لەو بۆچوونە هەڵەیەوە کراوە هەر هەڵەیەو، تەیەمموم بەشێوەیەکی کاتی ئینسان لەلەش پیسی گەورەو گچکە پاك دەکاتەوەو دەبێ نیەتەکەش هەروابێت.

٣-زانایان لەو بارەشەوە کە ئایا تەیەمموم بەیەك جار دەست بەگڵ یان ڕووی زەویدا هێنان دێتەدی یان دووجاری پێویستە دیسان ڕایان جیایەو، زۆربەیان دەڵێن یەك جار (ضَرْبَةٌ واحِدَةٌ) بەسە بۆ دەموچاوو دەستەکان ئەمە ڕای: (عطاء و مکحول و أوزاعي واحمد و داود واسحاق وابن المُنْذِر وعامة أَصْحابِ الحَدِيث)ە[248] و فەرموودە ڕاست (صحیح)ەکانیش هەر ئەمە دەگەیەنێ، وەك پێشتر هێنامانن[249].

٤-ئایا یەك جار تەیەمموم وەك خۆشۆردن جێگای خۆشۆردنو دەستنوێژیش دەگرێ، یان بۆ هەرکامێکیان تەیەممومێك پێویستە؟! زانایان لەوبارەشەوە ڕایان جیاوازە، بەڵام ڕای ئەوانە ڕاستەو سوننەت پشتگیری دەکات کە یەك تەیەمموم بۆ هەردووکیان (خۆشۆردنو دەستنوێژ) دەشێ، چونکە:

ا-تەیەمموم جێدار (بدیل) ی ئاوە بۆ لابردنی لەش پیسی (حَدَث) و ئەو تەیەممومەش کە لەجیاتی خۆشۆردن دەکرێو ئەوەش کە لەجیاتی دەستنوێژ هەروەك یەکن، جا هەروەك چۆن خۆشۆردن دەستنوێژیشی لەخۆی دەگرت، تەیەممومیش کە لەجیاتی‌یەتی بەهەمان شێوە.

ب-لەبەسەرهاتەکەی (عَمّار)دا خوا لێی ڕازیبێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (إِنَّما يَكْفِيكَ هٰكذا، فَضَرَبَ النَبِيِّ ﷺ بِكَفَّيْهِ الأَرْضَ فَنَفَخَ فِيهِما ثُمَّ مَسَحَ بِهِما وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ) متفق علیه، وەك پێشتر هێنامان، دیارە کەفەرموشیەتی: (انما یکفیك هكذا) تەنیا ئا ئەوەت بەس بوو، مەبەستی پاکبوونەوەیەتی لە لەش پیسی گەورەو گچکەو ئامادەبوونی بۆ نوێژکردن[250].

---

[247] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٥٣تا٢٥٨.

[248] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٤٢.

[249] بڕوانە (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٢٤٧

[250] بڕوانە: پەراوێزی (المُحلّى) ج٢ص٨٨، کە (مُحَقِّق)ـە لە (شمس الدین الذهبي)یەوە هێناویەتی.

شایانی باسە کە (ابن حزم)یش[351] لەم مەسەلەیەدا هەر ڕای زۆربەی پەسەندکردوە، بەڵام وەك ڕوونمان کردەوە ڕایەکەیان بێهێزە.

٥-هەموو ئەو شتانەی کە دەستنوێژیان پێدەشکێ تەیەمومیشیان پێدەشکێ بەبێ جیاوازی، سەربارەش پەیدابوونی ئاو یان بۆ لوانو بۆ گونجانی بەکارهێنانی (الحَصُولُ علىٰ الماءِ (لِفاقِدِهِ) أَوْ إِمْكانُ إِسْتِعْمالِهِ (لِمَنْ لَمْ يُمْكِنْهُ) ) ش تەیەموم بەتاڵ دەکاتەوەو زانایان لەوبارەوە یەکدەنگن[352].

٦-دروستە کۆمەڵێك لەیەك شوێن - واتە بەماددەی یەك شوێن - تەیەموم بکەن، ئەمەش مشتو مڕی لەسەر نیە[353].

٧-هەرشتێك تۆزو غوباری هەبێ - مادام ڕووی زەوی نەبێ[354] - دروستە تەیەمومی پێبکرێ، وەك سەرین و بەڕەو حەسیرو تەنانەت پشتی ئاژەڵیش و بگرە زۆربەیان دەڵێن: پشتی سەگو بەرازیش مادام تەڕ نەبن[355]!

٨- زۆربەی زانایان ڕایان وایە کەدەبێ بۆ هەر نوێژێکی فەرز تەیەمومێکی تایبەت بکرێ، ئەمە ڕای: (الشعبي و النخعي و قتادة و ربيعة و مالك و لَيْث و احمد و إِسحاق و شافعي)،یە، بەشێکیشیان کە: (ابن المُسَيِّب والحسن البصري و الزُّهري و ابوحنيفة و يزيد بن هارون وابو جعفرو أُبوثَوْر وداود والمُزْني وأُحمد)یش لەڕای باو (مشهور)ی‌دا لەنێویان دان ڕایان وایە کە تەیەمومیش وەك دەستنوێژ، هەتا دەشکێ هەموو جۆرە نوێژەکانی پێوە ئەنجام دەدات بەفەرزو سوننەتەوە[356]،جا وادێتە بەرچاو ئەوانەی ڕای یەکەمیان هەڵبژاردوە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەبێ، بەپێچەوانەی لایەنگرانی ڕای دووەم کە ئەم بەڵگانەیان هەیە:

أ-وەك چەند جاری دیکەش گوتومانە: تەیەموم جێدار (بديل)ی ئاوە بەدەقی فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ پاکبوونەوە لە لەش پیسیو مادام وابێ مەگەر بەبەڵگەیەکی شەرعی ڕوون ئەگەرنا دروست نیە هیچ شتێك لە شایستەیی (صلاحية) ی کەم بکەینەوە.

---

[351] بڕوانە: (المُحَلّى) ج٢ص٨٨، مساله: ٢٤٥.

[352] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص١٠٢.

[353] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٥١.

[354] چونکە ئەگەر ڕووی زەوی (صعيد) بوو، هەبوونی تۆزو غوبار مەرج نیە.

[355] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٥١، ٢٥٢.

[356] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣١٨، ٣١٩.

ب-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الصَّعِيدُ الطيبُ طهور المُسلِمِ..) کە ئەمە موتڵەقەو بەهیچ بەند (قید)ێکەوە نەبەستراوەتەوە.

ج- مەسحی سەر خوفـف و گـۆرەوی مـادام دەسـتنوێژ نەشـکابێ نوێکردنـەوەی ناوێ، ئەمیش هەروایە.

د- پێشتر ڕوونمان کردەوە کە بابای تەیەممومکەر بە تەیەممومەکەی پاك بۆتەوە بەدەقی قورئان و سوننەت - بەشێوەیەکی کاتی -،کەواتە پاککردنەوەی دیکەی ناوێ.

٩- زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بەر لەکاتی نوێژ دروست نیە تەیەممـوم بکرێ، بەڵام (ابوحنیفة) و(احمد)یش لەڕیوایەتێکیدا ڕایان وایە کە دروستە، جا لەڕاستیدا بە لە بەرچاوگرتنی ئەو خاڵانەی ڕابردن دەردەکەوێ کەڕای دووەم ڕاستەو ڕای یەکەم هیچ بەڵگەیەکی ئیقناع کەریان بەدەستەوە نیە[٣٥٧].

١٠- هـەرکات بابـای تەیـەممـوم کـەر ئـاوی دەسـت کـەوت (ئەگـەر لەبـەر بێئـاوی تەیەممومی کردبێ) ئەوە لەدوو حاڵن بەدەرنیە: یان نیشتەجێ (مقیم) یە، یان ڕێبوار (مُسافِرْ)، جارێ ئەگەر بەر لەنوێژکردنەکەی ئاوی چنگ کەوت ئەوە چ لە ماڵ بێ چ لەسەفەر بەیـەکدەنگی زانایان تەیەممومەکەی بەتاڵەو دەبێ ئاوەکـە بەکاربـهێنێ[٣٥٨]، بەڵام ئەگەر لەسەفەرێ بوووەپاش نوێژکردنەکەی ئاوی چنگ کەوت،ئەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە (ابوحنیفة و مالك و شافعي و ثوري و اوزاعي احمـد و اسـحاق و المزني و ابن المنذر) یان لەنێودان، دەڵێن کردنەوەی ناوێ،کەمێکیش لەزانایان دەڵێن مادام کاتیکردنی نوێژەکە مابێ دەبێ ئاو بەکاربهێنێ و بیکاتـەوە، بەڵام ئەگەر کـاتی نەمابوو ئەوە یەکدەنگن لەسەر نەکردنـەوەی[٣٥٩]. بەڵگەی ڕای جەماوەریش کە گومـان لەڕاستیی دا نیە، ئەم فەرموودەیە:

*(عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: خَرَجَ رَجُلانِ في سَفرٍ فَحضَـرَتِ الصَّـلاةُ ولَيْـس مَعَهُمَا ماءٌ، فَتَيَمَّما صَعِيْداً طَيِّباً وَصَلَّيا، ثم وَجَدا الماءَ في الوَقتِ فأعَادَ أُحَدُهُمَـا الصَّـلاةَ والوُضُوءَ، ولَمْ يُعِدِ الآخَرُ، ثم أتَيَا رسولَ الله ﷺ فَذَكَـرا ذلِـكَ لَـهُ، فقـال لِلَّـذي لَمْ يُعِـدْ: أصَبْتَ السُّـنَّةَ وأجْزأتْكَ صَلاتُكَ وقال لِلَّذي توَضأ وأعاد: لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ) رواه ابوداود والنسائي والبيهقي وغيرهم.

---

[٣٥٧] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ ص٢٤٦، وە: (الروضة الندية) ج١ص٩٩.

[٣٥٨] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٢٥، وەك (ابن المنذر) لەکتێبی (الاجماع)دا هێناویەتی.

[٣٥٩] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٢٩، دیسان (ابن المنذر) ئەو یەکدەنگییەی نەقڵ کردوە.

واتە: دوو پیاو بە سەفەر چوون، جا نوێژبوو و ئاویشیان پێنەبوو، بۆیە بەڕووی پاکی زەوی تەیەمومیان کردو نوێژیان کرد، پاشان ئاویان چنگ کەوت لەکاتی نوێژەکەدا (واتە جارێ نوێژەکە کاتی مابوو)، جا یەکێکیان نوێژەکەی بەدەستنوێژ گێڕایەوەو ئەوی دیکەشیان نەیگێڕایەوە، دوایی چوونەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو مەسەلەیان بۆ باس کرد، ئەویش بەوەیانی فەرمووکە نوێژەکەی دووبارە نەکردبۆوە: ڕێبازی منت پێکاوەو نوێژەکەت بەرکەوتوە، وە بەوەشیانی فەرموو کە دەستنوێژی گرتبوو و دووبارەی کردبۆوە: دوو کەڕەت پاداشتت هەیە.

ئاشکراشە کە گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ هەمیشە چاکترو بەرەکەت دارترە و پاداشتی زیاترە، بۆیە هەندێك لەزانایان گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ لەبەر دڵدانەوەو دڵخۆشکردن بەدووەمیانی فەرمووە: دووجار پاداشتت هەیە[٣٦٠].

بەڵام ئەگەر نیشتەجێ بێ و لەماڵێ بێت ئەوە زانایان بەگشتی دوو ڕایان هەن[٣٦١]:

أ-بەشێکیان کە (شافعی) یان لەنێودایەو هەرکام لە (ابوحنیفەو احمد)یش یەکی لەڕایەکیان دا، دەڵێن دەبێ نوێژەکەی بەتەیەموم بکات، بەڵام دوایی دەبێ دووبارە نوێژەکەی بکاتەوەو ئەوەی یەکەمیان بەس لەبەر ڕێزو حورمەتی کاتی نوێژەکە بووە.

ب-کە (مالكو ثوري و اوزاعي و المزني و الطحاوي) یان لەنێودانو (احمد)یش لەڕایەکیدا دەڵێن: دەبێ نوێژەکەی بەتەیەموم بکاتو دووبارەکردنەوەشی ناوێت، بەسەرنج دانی خاڵەکانی پێشووش دەردەکەوێ کەڕای دووەم ڕاست ترە، چونکە خوا لەیەك کاتدا بەس نوێژێکی فەرز کردوەو خۆشی فەرموویەتی ئەگەر ئاو نەبوو ئاوا بیکەن (تەیەموم بکەن)و هیچ بەڵگەیەکیش نیە باسی گێڕانەوەو دووبارەکردنەوە بکات.

١٢-هەرکەسێك درەنگ لەخەو هەڵساو کاتەکەی درەنگ بوو، ئەگەر خۆی شۆردبایە فریای نوێژەکەی نەدەکەوت، ئایا چاکتر وایە تەیەموم بکاتو نوێژەکەی لەکاتی خۆیدا بکات، یان هەرچۆن بووە خۆی بشوات ئەگەر نوێژەکەیشی بچێو دوایی بیکاتو بیگێڕێتەوە؟! زانایان دوو ڕایان هەنو ئەوەندەی لەم مەسەلەیەش ڕامامو بیرم کردەوە هیچ کامیانم بۆ بەچاکتر دانەنراو پێم وایە وەك یەکن[٣٦٢].

---

[٣٦٠] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص١٠٢، ١٠٣.

[٣٦١] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٣٢٨، ٣٢٩.

[٣٦٢] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ص٢٦٤، ٢٦٥.

١٣- وەك چەند جار گوتمان تەیەمموم جێدار (بدیـل)ی ئـاوەو هەركەسێك بـۆی بلوێ ئاو بەكاربهێنێ ڕێگای تەیەممومی نیەو لەكوردەواری خۆشمان دا باوە ((ئەگەر ئاو هەبوو تەیەمموم بەتاڵە))، جا هۆیەكانی تەیەمموم بەگشتی دوانن:

*یەكەم: نەبوونی ئاو.*

*دووەم: نەگونجانی بەكارهێنانی.*

جا لەبارەی نەبوونی ئاوەوە هەرچەندە بەزۆری حاڵەتی سەفەر ڕەچاو كراوە، بەڵام دەگونجێ ئینسان لەسەفەریش نەبێ و ئاویشی چنگ نەكەوێ، بۆ وێنە لەحەپسخانە (سجن) دا بێ، یان هەر لەماڵی خۆیان بێ و ئاویان نەبێ و ئاویشیان لێ نزیك نەبێ و پارەش نەبێ بیكڕێ، یان پارەی هەبێ بەڵام پارەكـەی بـۆ نـان و مەسـرەفی خـۆی و خێزانی پێویست بێ[٣٦٣].

هەروەها ئەگەر لەسەفەریش بێ دەگونجێ ئاوی پێ بێ بەڵام بۆ خواردنەوەی خۆی و وڵاخەكەی پێویستی بێت، یان بتوانێ بەدوای‌دا بچێ و پەیدای بكـات بـەڵام ئەگـەر وابكات لەهاوەڵەكانی بەجێ بمێنێ و داببڕێ، ئەوە لەهـەموو ئـەو حاڵەتانـەدا زانایـان لەسەر ڕەوابوونی تەیەمموم یەكدەنگن[٣٦٤].

بەڵام ئەوەی كەزانایان تێیدا مشت‌ومڕیان هەیە ئەوەیە كەئایا بابـای ئـاو چنـگ نەكەوتوو تا چ ڕادەیەك لەسەری فەرزە بەدوای ئاودا بگەڕێ و بسووڕێ؟!

هەندێكیان كە (ابوحنیفة) یان لەنێودایە ڕایان وایە كە ئەگـەر گومـانی وابـوو لـە نزیكی‌یەوە هەیە پێویستە بەدوای‌دا بگەڕێ، بـەڵام ئەگـەر گومـانی نـەبوو پێویـست ناكات و با تەیەممومەكەی بكات، بەڵام زۆربەی زانایان كە: (مالك و داود الظـاهري و شـافعي) و (احمـد)یـش لەقسـەیەكی‌دا، لـەنێویان دان دەڵێـن مەگـەر تـەواو مسـۆگەر دڵنیابێ كەئاو لەو دەوروبەرە نیە، ئەگەرنا هـەر لەسـەری فـەرزە كە بـەدوای‌دا بگـەڕێ هەتا بێ هیوا دەبێ[٣٦٥]، دیارە هەردووك لاشیان ئایەتی: (...فَلَمْ تَجِدوا ماءً فَتَيَمَّمُوا: صَعِيْداً طَيِّباً) المائدة -٦- ، بە بەڵگە دەهێننەوە، بەڵام پێـم وایـە هـەق ئەوەیـە كـە بگوتـرێ:

---

[٣٦٣] بڕوانە: (المجموع) ج٢ص٢٨٤تا ٢٨٦، وە ص٢٨٣.

[٣٦٤] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٧٣تا ٢٧٥.

[٣٦٥] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٨١.

چنگ نەکەوتنی ئاو (عَدَمُ وِجْدانِ الماءِ) بەوە دێتەدی کە ئینسان قەناعەتی بۆ پەیدابێ کە نیەو گەڕان و سوڕان و پشکنین بەمەرج نەگیراوە[٣٦٦].

بۆ نەگونجانی بەکارهێنانیشی دوو حاڵەتی هەیە:

ا-یان هەر لەواقیع دا کابرا نەخۆشە، نەخۆشی یەکی وا کە دوو کەسی عاقڵ و دادگەر یان پزیشکێکی پسپۆڕ بڵێ: ئاو زیانت لێدەدات و نەخۆشی یەکەت تەشەنە دەکات یان کاریگەری خراپ دەکاتە سەر جەستەت.

ب-یان نەخۆش نیە بەڵام قەناعەتی وایە کە ئەگەر خۆی بەو ئاوە بشوات دووچاری نەخۆشی و دەردی دەکات، ئەوە زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بۆی هەیە تەیەممومم بکات[٣٦٧] و ڕستەی (.. ومايُرِيْدُ اللهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ..) ئایەتی تەیەممومم (المائدة -٦-)یش چاکترین بەڵگەیە، چونکە بێگومان کەسێك بەهۆی خۆشۆردن بەئاوی ساردەوە دووچاری دەردو نەخۆشی بێت، کەوتۆتە سەغڵەتی (حرج)یەوە، خوای میهرەبانیش بەڕاشکاوی فەرموویەتی کە بۆیە تەیەممومم بۆ لەجیاتی ئاو داناوین کە لەوجۆرە حاڵەتانەدا نەکەونە ناڕەحەتی و سەغڵەتی یەوە.

ئاشکراشە کە پێویستە ئینسان وریا بێت و لەوجۆرە حاڵەتانەدا نەفس و شەیطان فریوی نەدەن و بەهۆی تەنبەڵی و تۆزێك خۆئەزیەت دانەوە دووچاری گوناح و هەڵەی نەکەن و نەیخەنە خانەی بەزایەدان (تَفْرِيط)ەوە.

هەروەها بەلای دیکەش دا دیسان وریا بێت و لەبەر خوتخوتەی نەفس و شەیطان و ڕووحی ئیشکە تەقوایی و تێپەڕاندن (إِفراط)و خۆئەزیەت دان (تَكَلُّفْ) تووشی ئەوەی نەکەن کەئایەتی: (ولاتَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ..) النساء -٢٩- بیگرێتەوەو بکەوێتە بەر حوکمی ئایەتی: (ولاتُلْقُوا بِأَيْدِيْكُمْ إِلىٰ التهلُكَةِ) البقرة -١٩٥-.

---

[٣٦٦] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٩٦.

[٣٦٧] (ابن تيمية) لەوبارەوە گوتوویەتی: (والذي عليه الجمهور: انه لايُشْتَرطُ فيه خَوْفُ الهَلاكِ بَلْ مَنْ كان الوضوءُ يَزِيدُ مَرَضَهُ او يُؤَخِّر بُرْءَهُ يَتَيَمَّمُ، وكذلك في الصِّيام والأُحْرام، وَمَنْ يَتَضَرَّرُ بالماءِ لِبَرْدٍ فهو كالمَرِيْضِ عِنْدَ الجُمهورِ، لكن الله ذَكَرَ الضَّرَرَ العامَ، وهو المَرَضُ بِخِلافِ البَرْدِ فانّه إِنَّما يكونُ في بَعْضِ البِلادِ لِبَعْضِ الناس الذِيْنَ لايَقْدِرونَ علىٰ الماءِ الحارِّ..) بڕوانە:(مجموعة الفتاوى) ج٢١ص ٢٢٦.

ئا لێرەشدا کۆتایی بەم باسی پاك‌و خاوێنی‌یە دێنین، خوا هیدایەتمان بدات کە هەرچی زیاترو چاکتر دەرو دەروونی خۆمان پاك‌و چاك بکەین.

وە ئـەمجار پـاش دەرگاکردنـەوە بـەرەو خواپەرسـتی‌یە تایبەتی‌یـەکان، بـەهۆی ڕوونکردنەوەو توێژینـەوەی خەسـت‌و خـۆڵ‌و گووشـراو لـەبارەی پاك‌وخاوێنی‌یـەوە کـەوەك لەسـەرەتاوە گوتمـان پێشـەکی‌و زەمینەسـازێنەری چـەند جۆرێـك لەخواپەرسـتی‌یەکانە، بەتایبـەتی نوێـژ (مِفْتَـاحُ الصَّـلاةِ الطُّـهُورُ)، بـەڵێ ئـەمجار ڕاستەوخۆ دەچینە سەر باسی بابەتی چوارەم (پێنج درووشمەکانی خواپەرستیی) و لە یەکەمین‌و گەورەترین‌و کاریگەرترینیانەوە دەست پێ دەکەین کە نوێژبەرپاکردن (اقامة الصلاة)ەو لە ئێمە هـەوڵ‌و حەرەکـەت‌و لـەخوای پـەروەردگاریش هیدایـەت‌و بەرەکەت.

# بابەتی چوارەم
# پێنج درووشمەكانی خوا پەرستیی

١- نوێژ بەرپا كردن

٢- ماڵ بەخشین

٣- ڕۆژوو گرتن

٤- حەج و عومرەكردن

٥- زیكری خواكردن

## دروشمی یەکەم: نوێژ بەرپاکردن (إِقَامَةُ الصَّلاة)

**خاڵی یەکەم: نوێژ چی‌یە؟**
**خاڵی دووەم: پلەو پایەی نوێژ.**
**خاڵی سێیەم: مەبەستی بەرپارکردنی نوێژ.**
**خاڵی چوارەم: حوکمی کردن و نەکردنی نوێژ.**
**خاڵی پێنجەم: بەرپاکردنی نوێژ چی‌یەو چۆنە؟!**
**خاڵی شەشەم: چۆن نوێژ بەرپادەکەی؟!**
**خاڵی حەوتەم: چەند کورتە باسێك دەربارەی نوێژ.**
**خاڵی هەشتەم: بەرهەمی نوێژ بەرپارکردن.**

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری مسوڵمانی خۆشەویست !

هەرچەندە لەدوو توێی ئەو هەشت (٨) خاڵەدا کەلەبارەی نوێژەوە نووسیومانن هەرچی بەپێویستمان زانیوە دەربارەی نوێژ گوتوومانە، بەڵام بەپەسەندم زانی ئەم چەند ئاگاداری‌یەت ئاڕاستە بکەم:

١)وەك دەبینی توێژینەوەی درووشمی‌یەکەمی خواپەرستی‌و پایەی دووەمی ئیسلامەتی (نوێژ)، لەتوێژینەوەی هەموو درووشمەکانی دیکە پتر بایەخی پێدراوەو وردەکاری تێداکراوە، جا هیوادارم تۆش وەك شایستەی ئەو درووشمەو پایە گەورەو گرنگەیە ئەمیەت‌و بایەخ بەخەرج بدەی بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتن‌و هەزم کردنی ئەم توێژینەوەیەو پاشان کارو ڕەفتار پێ‌کردنی.

٢)زۆربەی زانایان کردن و نەکردنی نوێژ بەسنوورو نێوانی کوفرو ئیمان دادەنێن، جا بێگومان — وەك لەئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریش دا ﷺ ئاماژەی پێکراوە — ئینسانی مسوڵمان هەتا نوێژ بەرپاکردنی تێدا تۆختر بێت لەئیسلام دا ڕۆچووترو لەکوفرو نیفاق دوورتر دەبێت و، تۆخ بوونەوەی سیفەتی نوێژکردنیش پەیوەندی ڕاستەوانەی بەقووڵترو چاکتر شارەزابوونی پایەو فەڕزو سوننەت و ئەدەبە ڕواڵەتی و پەنهانەکانی‌یەوە هەیە، بۆیە ئێمەش هەوڵی چاکمان لەوبارەوە داوەو ڕەنجی باشمان کێشاوە.

٣)هەرچەندە مەگەر چۆن دەنا هەر مەسەلەیەکم باس کردبێت — ئەگەر جێگای ڕاجیایی (اختلاف)ی زاناو شەرعزانانی تێدابووبێ — هەوڵم داوە کام ڕایە بەهێزترو پەسەندترە دیاری بکەم، بەڵام وەك چۆن ڕاوبۆچوون و ئیجتیهادی زاناو پێشەوایانمان لەگەڵ ڕێزو حورمەتی زۆرمان بۆیان بەتێگەیشتنی ئەوان دەربارەی ئایین و شەرع دەزانین نەك خودی ئایین و شەرع، بێگومان بیروبۆچوونەکانی خۆشمان کەقوتابی‌یەکی ئەو زاناو پێشەوا بەرزو بەڕێزانەین (بِطَرِيقِ الأَوْلَى) هەروا دادەنێین و، تکاشم لەخوێنەرە بەڕێزەکان ئەوەیە کەلەوبارەوە وریاو هۆشیاربن و چوار ئاگاداری و بنچینە گەورەو گرنگەکانی (هەڵس‌وکەوتی شەرعی‌یانەو ژیرانە) یان — کە لەبابەتی دووەم دا هاتوون — هەر لەبەرچاوبن.

# خاڵی یەکەم: نوێژ چی‌یە؟!

وشەی "نوێژ" لەزمانی کوردی‌دا کەلەبەرانبەر (صَلاة)ی عارەبی‌دا دانراوە، واپێ‌دەچێ وشەیەکی زۆر لەمێژینەو کۆن بێت، چونکە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نوێژ (صَلاة) یەکێکە لەو خواپەرستی‌یانەی کەلەئایین‌و بەرنامەی سەرجەم پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوادا هەبووە، جاوا دیارە گەلی کوردیش وەك تێکڕای گەلانی دنیا بەر لەهاتنی ئیسلامیش بۆ کوردستان جۆرێك یان زیاتریش ئایین‌و بەرنامەی خوایی لەنێودا بووەو گەلێکی خواپەرست‌و دیندار بووەو خواپەرستی‌یەکانی وەك نوێژو ڕۆژوو (صَوْم)ی هەر ئەنجام داون!

وشەی (صلاة)یش زمانزانان‌و شەرعزانان ئاوا مانایان کردوە:

أ- راغب الأصفهاني، گوتوویەتی:

(والصلاة: قال كثيرٌ مِنْ أَهْلِ اللُّغَةِ هِيَ: الدُّعاءُ والتَّبْرِيكُ والتَّمْجِيدُ، يُقالُ: صَلَّيْتُ عَلَيْهِ أَيْ دَعَوْتُ لَهُ..) [1].

واتە: زۆر لەشارەزایانی زمان گوتوویانە: نوێژ بریتیە لەپاڕانەوەو بەپیرۆزگرتن‌و بەپایەبەرز دانان، دەگوترێ. (صَلَّيْتُ عَلَيْهِ) واتە بۆی پاڕامەوە..

ب- (نووي)یش لەپێناسەی (صَلاة) دا گوتوویەتی:

(الصلاة في اللغة: الدعاءُ، وسُمِّيَتِ الصلاةُ الشَّرعيةُ صلاةً لِاشْتِمالِها عَلَيْهِ هذا هو الصَّحيحُ وبِهِ قال الجُمْهُورُ مِنْ أَهلِ اللغةِ وغيرُهُمْ مِنْ أَهلِ التحقيقِ..) [2].

واتە: (صلاة) لەزمان دا پاڕانەوەیە، وە بۆیە نوێژی شەرعی بەوناوە ناونراوە چونکە نوێژیش پاڕانەوەی لەنێو خۆیەوە گرتوە، ئەمە قسەی ڕاست‌و دروستەو جەماوەری زمانزانان‌و باقی لێکۆڵەرەوانی دیکەش هەر وایان گوتوە.

ج-(ابن منظور)یش بەهەمان شێوە دەڵێ:

(وقد تكرّر في الحديثِ ذِكْرُ الصَّلاةِ وهي العِبادَةُ المَخْصوصَةُ وأَصْلُها الدُّعاءُ في اللُّغَةِ فَسُمِّيَتْ بِبَعْضِ أَجْزائِها وقِيلَ أَصْلُها في اللُّغَةِ التَّعْظِيمُ. وسُمِّيَتِ الصَّلاة المَخْصوصَةُ صَلاةً لِمافِيْها مِنْ تعظيمِ الربِّ تعالى وتَقَدَّسَ). [3]

---

١ (مفردات الفاظ القران) ص ٢٨٥. وەبڕوانە: (سبل السلام) ج١ ص ١٤٠.

٢ (المجموع شَرْحُ المُهَذَّب) ج٣ ص٣، هەروەها بڕوانە (نيل الأَوْطار) للشوكاني ج١ ص ٣٦٠.

واتە: وە باسی (صلاة) لەفەرموودان دا زۆر هاتوە کەخواپەرستی‌یە تایبەتی‌یەکەیە ئەسڵی واتایەکەی لەزمان[3](پارانەوە)یە، جا نوێژ بەهەندێك لەبەشەکانی‌یەوە کەپارانەوەیە ناونراوە. وەگوتراویشە کە (صلاة) لەئەسڵی زمان دا یانی بەمەزن گرتن (التعظیم). وەنوێژ - ئەو خواپەرستی‌یە تایبەتی‌یە - بۆیە ناوی لێنراوە، (صلاة) چونکە بەگەورە گرتنی پەروەردگاری بەرزو بێگەردی تێدایە.

ئەوە سەبارەت بەوشەی (صلاة) لەزمان دا،لەزاراوەی شەرعیش دا تێکڕای زانایانی شەرعزان ئاوا پێناسەی دەکەن.

(الصَّلاةُ عِبادَةٌ تَتَضَمَّنُ أَقْوالاً وأَفْعالاً مَخْصوصةً مُفْتَتَحةً بِتَكْبِيرِ اللهِ تَعالىٰ مُخْتَتَمةً بِالتَّسْلِيمِ) واتە: نوێژ خواپەرستیی‌یەکە چەند قسەو کردەوەیەکی تایبەتی تێدان، کە بە(الله اکبر) گوتن دەست پێدەکاتو بەسەلام دانەوە کۆتایی پێدێ.

## خاڵی دووەم: پلەو پایەی نوێژ:

١-نوێژ گەورەترین درووشمو بنچینەی ئیسلامەو بەرزترینو مەزنترین جۆرە خواپەرستی‌یە، وە وشەی (صلاة) بەهەموو صیغەکانی‌یەوە (٩٩) جاران لەقورئانی‌دا هاتوە.

٢-وەنوێژ تاقە خواپەرستی‌یەکە کە لەهیچ حاڵێك دا چواندنو نەکردنی دروست نیە؛ بەساغیو بەنەخۆشی، بەدەوڵەمەندیو بەنەداری، لەکاتی جەنگو ئاشتی‌دا، لەسەفەرێ بێ یان لەماڵێ، سەرمابێ یان گەرما، سواربێ یان پیادە... هتد.

٣-وە خوای پەروەردگاری پەنهان بین نوێژی لەگەڵ هەرکام لە: زیکرو زەکاتو صەبرو قوربانی سەربڕین دا باس کردووە:

(وذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ) الأعلى – ١٥ – ، (وأَقِيمُوا الصَّلاةَ وآتُوا الزَّكاةَ) البقره – ١١٠ –، (واسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ و الصَّلاةِ) البقره –٤٥–، (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وانْحَرْ) الكوثر –٢–.

٤-وە خوای زاناو وردبین حوکمی خۆڕانەگریو هەڵپەیی بەسەر تێکڕای ئینسانەکان دا داوە بێجگە لەنوێژکەران: (اِنَّ الانْسانَ خُلِقَ هَلوعاً. إذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزوعاً. واذا مَسَّهُ الخَيْرُ مَنوعاً. إلاَّ المُصَلِّين) المعارج –١٩– تا ٢٢–.

---

[3] (لسان العرب) ج١٤ ص ٤٦٦.

[4] بۆ وێنە بڕوانە (فقه السنه)ی (سیدسابق) ج١ص ٩٠.

٥- وەلەپێناسەکردنی بڕواداران دا لەسەرەتاو کۆتایی خەسڵەتەکانیان دا نوێژی باس کردوە: (قَدْ أَفْلَحَ المؤمنون. الَّذِيْنَ هم في صَلاتِهِمْ خاشِعون... والَّذين هُمْ علىٰ صَلَواتِهِمْ يُحافِظُونَ) المؤمنون -١ تا٩-.

٦-وە خوای دادگەر هەڕەشەی زۆر توندی لەو نوێژکەرانە کردوە کە لەنوێژەکانیان دا کەمتەرخەمن: (فَوَيْلٌ لِلمُصَلِّيْن. الَّذِيْنَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ ساهُوْن ) الماعون -٤، ٥ -.

٧-نوێژنەکردن و بەزایەدانی بەیەکەمین خەسڵەتی خراپی ئەو پاشین (خَلْف)ە بەدە دانراوە کە لەدوای پێغەمبەران عليهم من الله افضل الصلوات واتم التسليمات واز لەڕێبازەکەیان دێنن و دەکەونە دوای هەواو ئارەزووەکانیان: (فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضاعوا الصَّلاةَ واتَّبعوا الشَّهَواتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيّاً ) مريم - ٥٩-.

٨-وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەکۆڵەکەی ئیسلامەتی داناوە: (وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ..) رواه الترمذي وابن ماجه واحمد وصححه كل من الترمذي وابن القيم والألباني.

٩-وە فەرموویەتی کەنوێژ یەکەمین شتە کەبەندەکان لەسەری دادگایی دەکرێن لەڕۆژی دواییدا جا ئەگەر نوێژەکەی چاك بێت ئەوە سەرجەم کردەوەکانی دیکەشی باش دەبن و ئەگەر خراپیش بێ کردەوەکانی دیکەشی خراپ دەبن: (أَوَّلُ مايُحاسَبُ عَلَيْهِ العَبْدُ يومَ القيامَةِ الصَّلاةُ، فَإِنْ صَلَحَتْ صَلَحَ سائِرُ عَمَلِهِ وانْ فَسَدَتْ فَسَدَ سائِرُ عَمَلِهِ) رواه الطبراني.

١٠-وە نوێژ دوایین دیاردەی ئیسلامە کە لەنێو دەچێ و نامێنێ* ، واتە کاتێك نوێژکردن نامێنێ کەئاین هیچی لێ نەمابێ و بن بڕکرابێ. وەك پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (لَتُنْقَضَنَّ عُرا الأَسْلامِ عُرْوَةً عُرْوَةً فكُلَّما انْتَقَضَتْ عُروَةٌ تَشَبَّثَ النّاسُ بِالَّتِي تَلِيْها وأَوَّلُهُنَّ نَقْضاً الحُكْمُ وآخِرُهُنَّ الصَّلاةُ) رواه ابن حبان والطبراني باسناد صحيح.

١١-وەنوێژ یەکەمین خواپەرستییە کەلەسەر مسوڵمانان پێویست کراوەو تەنها خواپەرستییەکیشە کەلەئاسمانی و لەشەوی شەوڕەوی و بەرزبوونەوە (الأَسْراء والمِعْراج)ی پێغەمبەری کۆتاییدا ﷺ فەرزکراوە:(فُرِضَتِ الصلاةُ علىٰ النَّبِيِّ ﷺ لَيلَةَ أُسْرِيَ بِهِ.. ) رواه احمد والنسائي والترمذي.

---

*پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَوَّلُ ماتَفْقِدُونَ مِنْ دِيْنِكُمْ الأَمانَةُ وآخِرُ ماتَفْقِدونَ مِنْهُ الصَّلاةُ) رواه احمد وصحّحه الألباني في (الصحيحة) ژمارە(١٧٣٩).

١٢- وه دۆزەخی‌یەكان لەوەڵامی بڕواداران دا كەلێیان دەپرسن چ شتێك بوو بەمایەی هاتنە نێو دۆزەختان دەڵێن: (قالوا: لَمْ نَكُ مِنَ المُصَلِّيْنَ. وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ المِسْكِينَ، وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الخائِضِيْنَ. وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ) المدثر -٤٣تا ٤٦-.

وەك دەبینین تاوانباران (مجرمین) نوێژنەكردن بەیەكەمین هۆی چوونە دۆزەخیان دادەنێن! كەواتە دیارە بەپێچەوانەوەش نوێژكردن یەكەمین و سەرەكی‌ترین هۆی چوونە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوای میهرەبانە.

١٣-وه لەچەندان دەقی قورئان و سوننەت دا لەدوای ئیمان و خوا بەیەكگرتن ڕاستەوخۆ باسی بەرپاركردنی نوێژكراوە بۆ وێنە: (قَدْ أَفْلَحَ المُؤْمِنون. الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خاشِعون) المؤمنون -٢،١-. (.. فَإِنْ تابُوا وَأَقامُوا الصَّلاةَ..) التوبة -٥-، پێغەمبەریش لەكاتێكا نوێنەرەكانی خۆی بەملاولادا دەناردن بۆ بانگەواز كردنی خەڵكی بۆ ئیسلام پێی دەفەرموون كە لەدوای ئیمان و شایەتمان بانگیان بكەن بۆ ئەنجام دانی پێنج نوێژە فەرزەكان بۆ وێنە: (سَتَأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتابٍ فَلْيَكُنْ أَوَّلَ ماتَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ: شَهادَةُ أَلاّ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ اللهِ، وَأَنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ..) متفق عليه.

١٤-وەنوێژ تاقە خواپەرستی‌یەكە كەخواو پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرمانیان بەئینسانی مسوڵمان كردوە كەهاوسەرو منداڵەكانی وادار بكات بەئەنجام دانی: (وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْها) طه -١٣٢-، (مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أَبْناءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْها وَهُمْ أَبْناءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي المَضاجِعِ) رواه ابوداود بإسناد حسن،

واتە: فەرمان بەمنداڵەكانتان بكەن كەنوێژبكەن هەركات گەیشتنە تەمەنی حەوت ساڵان، وە ئەگەر گەیشتنە دەساڵان و هەرنەیان كرد لێیان بدەن، وە جێگای خەوتنیشیان لەیەك جیابكەنەوە.

١٥-وەنوێژ بەدرووشم و نیشانەی مسوڵمانەتی و سنووری نێوان ئینسان و كافربوون دانراوە، وەك پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاةِ) رواه احمد ومسلم وابوداود والترمذي.

١٦-وه هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خواليان ڕازیبێ هيچ كردەوەيەكيان بەكوفر نەدەزانی بێجگە لەوازهێنان لەنوێژ (كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ لايَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلاةِ) رواه الترمذي باسناد صحيح عن شقيق بن عبدالله العقيلي التابعين المتفق على جلالته.[٦]

١٧- وەلەنوێژیدا گەورەترين و ئەوپەڕی شێوەی بەندايەتی و گەردن كەچی ئەنجام دەدرێ كەچوونە ڕكووع و كڕنووش بردنن، كەخوای دادگەر لەبارەی يەكەميانەوە لەميانەی باسكردنی هۆی كەوتنە نێو دۆزەخی تاوانبارانەوە فەرموويەتی: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لا يَرْكَعُونَ. وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ) المرسلات ٤٨-٤٩، وە لەبارەی دووەميشيانەوە- واتە كڕنووش بردن — كەديسان بەهۆكاری چوونە نێو ئاگری دۆزەخ و زەبوون بوونی كافرەكانی داناوە فەرموويەتی: (..وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلا يَسْتَطِيعُونَ. خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ) القلم -٤٢،٤٣-.

١٨-وە لەكۆتاييدا: لەنوێژدا گەورەترين سوورەتی قورئان كە فاتيحەيە دەخوێندرێ، چونكە (ابو سعيد رافع بن المعلى) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئايا بەرلەوەی لەمزگەوتێ بچيە دەرێ مەزنترين سوورەتی قورئانت فێربكەم؟ پاشان دەستی گرتم جا كاتێك ويستمان بچينەدەرێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت كەمەزنترين سوورەتی قورئانت فێردەكەم! فەرمووی: (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالمين (أي الفاتحة) هي السَّبعُ المَثَاني والقُرآنُ العَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ) رواه البخاري، واتە: سوورەتی فاتيحە كەبريتيە لەحەوت ئايەتە دووبارەكراوەكان و قورئانی مەزن كەپێم بەخشراون.

---

٦ بروانە: (المجموع شرح المهذب) النووي ج٣ص١٨.

# خاڵی سێیەم: مەبەستی بەرپارکردنی نوێژ

خوێنەری بەڕێز! وەك لەپێشەوە گوتمان نوێژ جۆرێکە لەجۆرە بنەڕەتی‌یەکانی خواپەرستی. کەواتە مەبەست و ئامانجی خواپەرستی بەگشتی چی‌یە مەبەست و ئامانجی بەرپارکردنی نوێژیش هەر ئەوەیە، جا ئەگەر لەیادت بێ ئێمە لەباسی دووەم (گرنگی و پلەو پایەی خواپەرستی لە ئیسلام)دا، ئامانج و مەبەستی خواپەرستی مان لەچوار خاڵ دا خستەڕوو کەئەمانەن:

١-خواپەرستی تاقە ئامانجی دورست کرانی مرۆڤە.

٢-بەبێ بەندایەتی و خواپەرستی ئینسان لەئینسانەتی دەشۆرێ.

٣-تێکڕای پێغەمبەرانی خوا ﷺ بۆئەوە نێرراون خەڵکی فێری بەندایەتی و خواپەرستی بکەن.

٤-بەبێ بەندایەتی بۆ خواو پەرستنی، شەیطان زەفەرمان پێدەبات و پێی ناوێرین.

جا مادام نوێژیش یەکێك بێ لەجۆرەکانی خواپەرستی و گەورەترین و بەرزترین جۆریش بێت دیارە ئامانج و مەبەستی ئەنجام درانی ویش هەر هەمان ئامانجی خواپەرستیی‌یە.

ئەوەتا خوای پەروەردگار بەپێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەك مووسا (علیه السلام)ی فەرمووە: (إِنَّنِي أَنَا اللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي) طه -١٤- ، واتە: بێگومان بەس من خوام جگە لەمن پەرستراوی‌ترنین جا بمپەرستەو نوێژ بۆ یادکردنی من بەرپابکە.

بەڵی بابای نوێژکەر ئامانج و مەبەستی لەنوێژکردنەکەی‌دا پێشاندان و ئیسپات کردنی ملکەچی و بەندایەتی خۆیەتی بۆ خواو سەلماندنی وەفاداریی و پابەندی‌یەتی بەبەڵێن و پەیمانی بەندایەتی‌یەوە کە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بەستوویەتی.

دیسان خوای بەرزو مەزن بەپێغەمبەری سەروەرو بەرێزمانی فەرمووە: (قُلْ إِنَّنِي هَدانِي رَبِّي الىٰ صِراطٍ مُسْتَقيمٍ دِيْناً قِيَماً مِلَّةَ اِبْراهِيمَ حَنيفاً وما أَنا مِنَ الْمُشْرِكينِ. قُلْ اِنَّ صَلاتِي

ونُسُكي ومَحْيايَ ومَماتِيَ لِلهِ رَبِّ العالمين. لاشَرِيْكَ لَهُ وبِذٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ المُسْلِمِيْنَ) الانعام –١٦١تا١٦٣–،

واتــه: بڵێ: بێگومـان مـن پـەروەردگارم بـەرەو ڕاسـتەڕێ ڕێڕوونـی کـردووم، بەرنامەیەکی ڕاست و ڕاوەستاوە ڕێبازی بێخەوشی ئیبراهیمە وەمن لەهاوبەش دانەران –بۆ خوا– نیم. بڵێ بێگومان نوێژم و قوربانی سەربڕینم و ژیانم و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە. هیچ هاوبەشی نین و هەر بەوەش فەرمانم پێکراوە وەمن یەکەمینی مسوڵمانانم.

مەبەستیشم لەنووسینی ئەم خاڵە ئەوەبوو کەهیچ کەس بەهەڵەدا نەچێ لەوەدا کە ئامانج و مەبەستی نوێژ بەرپارکردن لەگەڵ بەرهەم و سوودەکانیدا تێکەڵ بکات کەدواتر لەخاڵێکی سەربەخۆدا باسیان دەکەین. چونکە نوێژو هەموو جۆرەکانی دیکەی خواپەرستی ئەگەر بێت و جگە لەبەندایەتی بۆ خواو ڕازیکردنی هیچ شتێکی دیکەیان تێدا ڕەچاو بکات و بیکاتە ئامانج و مەبەست، ئەوە بێگومان ڕەنج بەخەسارەو لەڕۆژی دوایی‌دا دەبێتە مایە پووچ و سەپانی پووشێ، چونکە لەپەرستن و بەندایەتی‌یەکەی‌دا غەیری خوای مەبەست بووەو شتێکی دیکەی لەدڵ گرتوە، یان لانی کەم وێڕای خواو ڕازیکردنی شتی دیکەشی مەبەست بووە کەئەمەش هاوبەش بۆ خوا دانان (الشِّرْكُ بِاللهِ)ە کە گەورەترین تاوانەو خوای میهرەبان و کاربەجێ لەنێو هەموو گوناحان دا جیای کردۆتەوەو فەرموویەتی قەڵەمی عەفووی بەسەردا نایەت: (انَّ اللهَ لايَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مادُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشاءُ)النساء –٤٨–، وەفەرموویەتی هەرکەس بەهیواو ئومێدی دیداری پەروەردگارو ڕەزامەندی و بەخششیەتی باکردەوەی باش ئەنجام بدات و هیچ کەسێکیش لەپەرستنی پەروەردگاری‌دا بەشدارنەکات و خۆی و خواپەرستی‌یەکەی بۆ خوا ساغ و پاک و یەکلا بکاتەوە: (فَمَنْ كانَ يَرْجو لِقاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صالِحاً ولايُشْرِكْ بِعِبادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) الكهف –١١٠–.

# خاڵی چوارەم: حوکمی کردن و نەکردنی نوێژ

خوێنەری سەنگین و شیرین‌قسەکردن لەبارەی حوکمی کردن و نەکردنی نوێژەوە — مەبەست پێنج نوێژە فەرزەکانە — هەویرێکە ئاوی زۆر دەوێ. وە مەسەلەیەکی گەورەو گرنگیشە. بۆیە بەپێویستی دەزانم بەپشوو درێژییەوە بیتوێژینەوەو لێی‌بدوێین. بەڵام بۆ ئاسانکردنی توێژینەوەکەمان سەرەتا ئەو خاڵانە پێش دەخەم کەزاناو پێشەوایانمان لەسەریان پێك هاتوون و جێگای مشت‌ومڕ نین، پاشان دەچینە سەر باس و توێژینەوەی ئەو مەسەلانەی کەزانایان تێیان دا کەوتوونە کێشەو مشت و مڕەوە:

١-سەرجەم زاناو پێشەوایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەنوێژکردن — واتە پێنج فەرزەکان — لەسەر هەر مسوڵمانێکی عاقڵ و باڵغ نێربێ یان مێ فەرزی عەینە[٧] و هیچ عوزرو بیانوویەك بۆ چواندنی قبووڵ ناکرێ و پێویستە لەهەموو حاڵەت و هەل‌ومەرجێکدا بەگوێرەی توانا هەر ئەنجام بدرێ، دەقی قورئان و سوننەتیش لەوبارەوە زۆرن بۆ وێنە:

ا- (.. حافِظوا على الصَّلَواتِ والصَّلاةِ الوُسْطىٰ وقُوموا لِلّٰهِ قانِتيْن) البقرة -٢٣٨-

واتە: پارێزگاری لەئەنجام دانی نوێژەکان بکەن و لەنوێژی نێوەڕاست، وەبەگەردن کەچی‌یەوە بۆ خوا بوەستن.

ب- (.. فَأَقيْموا الصَّلاةَ إِنَّ الصَّلاةَ كانَتْ علىٰ المُؤْمِنينَ كِتاباً مَوْقُوتاً) النساء -١٠٣-.

واتە: .. نوێژ بەرپا بکەن چونکە بێگومان نوێژ لەسەر بڕواداران لەچەند کاتێکی دیاری‌کراودا پێویست کراوە.

ج- (أُمِرْتُ أَنْ أُقاتِل الناسَ حتَّى يَشْهَدوا أَنْ لا إِلٰهَ إلا الله وأَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ اللهِ، ويُقيْموا الصَّلاة ويُؤْتوا الزَّكاةَ فَإذا فعلوا ذٰلِكَ عَصَموا مِنّي دِماءَهُمْ وأَمْوالَهُمْ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: فەرمانم پێ‌کراوە کە لەگەڵ خەڵکی دا بجەنگم هەتا شایەدی دەدەن کە جگە لەخوا پەرستراوێکی دیکە نیەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، وە نوێژ بەرپادەکەن و زەکاتێ دەدەن، جا ئەگەر ئەوانەیان کرد ئەوە خوێن و سامانی خۆیانیان لەمن پاراستوە. (واتە: هەر کاتێك ئەوانەی لەگەڵیان دەجەنگم مسوڵمان بوون

---

[٧] (فَرضُ العَيْن) ئەو جۆرە فەرزانەن کەپێویستە هەرکام لەمسوڵمانان بەشەخسی ئەنجامیان بدەن و کەس لەجیاتی کەس نایانکات، بەپێچەوانەی فەرزی کیفایەوە.

کەمسوڵمانەتی‌یەکەتان لەشایەتمان هێنان و نوێژکردن و زەکات دان دا خۆی دەنوێنێ، یان سەرانە (جزیة)یان دا کە لەفەرموودەی تردا هاتوە، ئەوە جەنگ و کوشتاریان دروست نیەو خوێنیان نارێژرێ وماڵیان ناکرێتە غەنیمەت).

د- بەڵگەی ئەوەش کەنابێ لەهیچ حاڵەت و هەل و مەرجێك دا نوێژ بچوێنرێ و دەبێ چۆن دەلوێ هەرئەنجام بدرێ چەند دەقێکی قورئان و سوننەتە بۆ وێنە: (فَاتقوا اللهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ واسْمَعُوا وأَطِيْعُوا...) التغابن -١٦-،

واتە: ئەوەندەی لەتواناتان دایە پارێز لەخوا بکەن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەربن...، پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: (.. فَإذا نَهيتكُم عَنْ شَيْئٍ فَاجْتَنِبوهُ، وإذا أَمَرتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأتُوا مِنْهُ ما اسْتطعتُمْ) متفق عليه،

واتـە: جا هـەرکات شـتێکم لـێ‌قەدەغەکردن خۆتـانی لـێ‌دووربگرن، وە هـەرکات فەرمانم بەشتێك پێ‌کردن ئەوەندەی بۆتان دەلوێ ئەنجامی بدەن.

٢- وەسەرجەم زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەهەر کاتێك ئینسان بەهۆی: لەبیرچوون یان خەوتن یان بێ‌هۆشی [٨] یەوە نوێژێك یان زیاتری بچێ، گوناهبار نابێ، بەڵام دەبێ دوایی بیگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی (إنَّهُ لَيْس في النَّوْمِ تَفْرِيطُ إنَّما التَفْرِيطُ في اليَقَظَةِ فإذا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلاةً أَوْ نامَ عَنْها فَلْيُصلِّها إذا ذَكَرَها) رواه النسائي والترمذي وصححه،

واتە: کەمتەرخەمی لەخەوتن دا نیە بەڵکو کەمتەرخەمی لەبێداری‌دایە، جا هەرکات یەکێکتان نوێژێکی لەبیرچوو یان لەبەر خەوتن لێی فەوتا باهەرکات هاتەوە یادی بیکات، هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّهَا إذا ذَكَرَها لاكَفّارَةَ لَها إلاّ ذلِكَ) رواه البخاري ومسلم،

واتە: هەرکەس نوێژێکی لەبیرچوو با کەهاتەوە یادی بیکات جگە لەوە سڕینەوە (کفارة)ی دیکەی نیە.

٣-وە تێکڕا لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کەهەر کەسێك لەڕووی:

ا-خۆبەزلگری (الكِبْر)و، ب- بەسووك سەیرکردن (الأسْتِخْفاف)و بێ‌حورمەتی پێ‌کردن (الأهانة)و، ج - بڕوا پێ‌نەبوون (الجُحُود)و، د- پشت گوێ خستن و ئەمیەت پێ‌نەدان (الأعْراض والأهْمال)ەوە نوێژی نەکرد یان دەیکردو وازی لێ‌هێنا، ئەوە بەهەرکام لەو ڕەفتارانەو لەهەرکام لەو حاڵەتانەدا کافر دەبێت و لەئایین دەردەچێ،

---

[٨] بەڵام هەندێك لەزانایان ڕایان وایە کەئەگەر کاتی ئەو نوێژە یان ئەو نوێژانەی کە لە کاتەکەیان دا لەهۆش خۆی چووە تێپەڕ بوو بوو گێڕانەوەی لەسەر نیە.

چونکە هەرکام لەو ڕەفتارانە بەتەنهاو لەزاتی خۆیان دا ئینسانیان پێ کافر دەبێت چ جای نوێژنەکردنیشیان ئاوێتە ببێ و ببێتە سەربارییان، ئەمەش چەند دەقێکی قورئانی پڕ پیت و پێزو بەڕێز بۆ بەڵگەی ئیسپاتی کافربوونی ئینسان بەهەرکام لەو ڕەفتارو خەسڵەتانە:

أ- خوای پەروەردگار دادگەر دەربارەی هۆی کڕنووش نەبردنی ئیبلیس و یاخیبوون و نەفرین لێکرانی فەرموویەتی: (وإذْ قُلْنا لِلْملائِكةِ اسْجدوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إلاّ إِبليسَ أَبىٰ واسْتكبَر وكانَ مِنَ الكافِرِيْنَ) البقرة -١٣٤-

واتە: وە کاتێك بەفریشتەکانمان گوت کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، یەکسەر کڕنووش -ی ڕێزگرتن - یان برد جگە لەئیبلیس سەرپێچیکردو خۆی بەزلگرت و چووە ڕیزی کافرانەوە.

ب- دەربارەی کافربوونی ئینسانیش بەهۆی بەسووك سەیرکردن و گاڵتەپێکردنی ئایین بەگشتی و بەتایبەتی نوێژ فەرموویەتی: (یا أَیُّها الَّذین آمنوا لاتتخذوا الذین اتَّخذوا دِینَكُمْ هُزُواً ولَعِباً مِنَ الَّذین أُوتوا الكِتابَ مِنْ قَبْلِكُمْ والكُفّارَ أَوْلِیاءَ واتَّقوا الله إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنینَ. وإِذا نادَیْتُمْ الَىٰ الصَّلاةِ اتَّخذوها هُزُواً ولَعِباً ذٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَومٌ لایَعْقِلون) المائدة -٥٧،٥٨-،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەوانەی کە گاڵتەو یاری بەئایینەکەتان دەکەن لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێدراوەو لەکافرەکان مەگرن بەدۆست وەپارێز لەخوا بکەن ئەگەر بڕوادارن. وە کاتێك - خەڵکی - بۆ نوێژێ بانگ دەکەن گاڵتەو گەمەی پێدەکەن، لەسۆنگەی ئەوەوە کەکۆمەڵێکی نەفامن. وەك دەبینین خوای پەروەردگار گاڵتەو یاریکردن بەئایین و نوێژی بەڕەفتارو پیشەی ئەهلی کیتاب و باقی کافرەکان داناوە.

ج- دەربارەی دان بەهەق دانەهێنان (جحود)یش کەخەسڵەتی کافرو بێبڕوایانە خوای دادگەر سەبارەت بەفیرعەون و دەست و پێوەندەکانی فەرموویەتی: (فَلَمَّا جاءَتْهُمْ آیاتنا قالوا هٰذا سِحْرٌ مُبِیْن. وجَحَدوا بِها واسْتیقَنَتْها أَنْفُسُهُمْ ظُلْماً وعُلُوّاً فانْظُرْ كَیفَ كان عاقِبَةُ المُفْسِدِین) النمل -١٣-١٤-،

واتە: جا کاتێك فیرعەون و فرعەونییەکان نیشانە ڕۆشنەکانمانیان بۆ هاتن گوتیان ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە. وە نکوولییان لەنیشانەو بەڵگەکان کرد هەرچەندە دڵنیابوون کەڕاستن بەهۆی ستەم و لووت بەرزییەوە، دەجا سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بوو!!

د-دەربارەی ئـەوەش کەپشت گـوێ خسـتن و ئەمیـەت و گرنگـی پێ نـەدانی هـەق نیشانەی کافرانەو ئینسانی پـێ لـەدین دەردەچـێ و کـافر دەبـێ خـوای زانـاو توانـا فەرمووویەتی:

(لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْـدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ. فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُمْ بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْـطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِنْ سِدْرٍ قَلِيلٍ. ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ!) سبأ -١٥- تا ١٧.

واتە: بێگومان بۆ خەڵکی سەبەء لەنیشتمانەکەیان دا نیشانەیەك هەبوو: دوو باخ لەلای ڕاست و چەپ، لەڕۆزی پەروەردگارتان بخۆن و شوکری بۆ ئەنجام بدەن، وڵاتێکی بەپیت و پێزو پەروەردگارێکی لێبوردە، کەچی ئەوان پشتیان هەڵکرد بۆیە ئێمەش لافاوی (عەریم) [9] مان بۆ ناردن و دووباخەکانیشیانمان گۆڕی بەدوو باخی خاوەن میوەی تاڵ و تفت وە درەختی ئەثل و شتێکی کەم لەدرەختی سیدر. ئەوەش سزادانی ئێمەبوو بۆیان لەبەرئەوەی کافربوون، جا ئایا بێجگە لەبابای زۆر کافرو سپڵە کەس بەوجۆرە سزا دەدەین!!

(دیارە مەبەستیش لەوشەی (إِعْراض وإِهْمال) گوێ پێ نەدان و بەهێند هەڵنەگرتنەو هەڵوێست لەبەرانبەردا وەرنەگرتنە، چ بەچاکە کەبڕوا پێ هێنـان و قبووڵکردنـەو، چ بەخراپە کەبڕوا پێ نەهێنان و ڕەدکردنەوەیە، کەبێگومان ئەمەش جۆرو شێوەیەکە لەجۆرو شێوەکانی کوفرو بێ بڕوایی).

٤-هـەروەها تێکڕای زانـاو پێشەوایان لەسـەر ئـەوە یـەکدەنگن کەپێویستـە بابـای نوێژنەکـەر یـان نوێـژ چوێنـەر سـزا بـدرێ، بـەڵام لەچۆنیـەتی سـزادانەکەدا ڕایـان جیاجیایە، (دوای ئەوەی لەسـەر ئـەوە پێکهاتوون کـەبابای نوێژنەکـەر ئەگـەر نوێـژ نەکردنەکەی بەجۆرێك بێ کەپێی لەئایین دەربچێ پێویستە سزای کافربوون و لەدین هەڵگەڕانـەوە (الأرْتِـدادُ عَـنِ الدِّيْـنْ)ی بەسـەردا بچەسـپێنرێ)، هـەرکام لـە(مـالك)و (شافعي)و(أحمد) دەڵێن ئەگەر بەهۆی تەنبەڵی و تەوەزەلی‌یەوە بوو دەبێ پاش داوای پەشێمان بوونەوە لـێکردن (الأسْتِتابة) بکوژرێ، جا (مالك)و(شـافعي) دەڵێـن دەبـێ نوێژی لەسەربکرێ و لەگۆڕستانی مسوڵمانان دا بنێژرێ، بەڵام (احمد) دەڵێ: چونکە

---

[9] (عريم) یان سیفەتی لافاو (سَیْل)ە یان ناوی ئەو سەددەیە کەلەئەنجامی لێزماوو لافاودا هەرەسی هێناوەو بۆتە هۆی تێکچوونی ژیان و گوزەرانی گەلی سەبەء.

بەموتڵەقی بە نوێژنەکردن کافردەبێ نابێ نوێژی لەسەربکرێ و لەگۆڕستانی مسوڵمانان دا بنێژرێ، (ابوحنیفە) ش دەڵێ: نابێ بکوژرێ بەڵکو حەپس دەکرێ و ئەشکەنجە دەدرێ هەتا دێتە ژێر باری شەرع و نوێژەکانی دەکات [10].

ئەم چوار خاڵە جێگای یەکدەنگی زاناو پێشەوایانن لەبارەی پێنج نوێژە فەرزەکانەوە بەڵام ئەوەی کەتێیدا کەوتوونەتە کێشەو مشتومڕەوەو پێویستی بەتوێژینەوەی تێرو تەسەل هەیە مەسەلەی نەکردن و چواندنی نوێژە بەبیانووی تەنبەڵی و قالب گرانی و سستییەوە، کەزانایان لەدێر زەمانەوەو ئێستاش بەگشتی دوو هەڵوێستیان لەوبارەوە نواندوون:

یەکەم: دەڵێن: نوێژنەکەر بەهۆی تەنبەڵی و تەوەزەلییەوە کافرەو لەئایین دەرچووەو هەروەك ئەوانە وایە کەبەهۆی بڕواپێنەبوونی و خۆ بەزلگری و .. هتدەوە نەیاندەکرد.

دووەم: دەڵێن: نوێژنەکەر مادام بەس لەبەر قاڵب گرانی و تەنبەڵی و کەمتەرخەمی نوێژەکانی نەکات و هۆکارێکی کافرکەری ئاوێتەی نوێژنەکردنەکەی نەکردبێ بەکافر دانانرێ، ئەوەندە هەیە بەلادەر (فاسِق) دادەنرێ و شایستەی توندترین سزایە کەکوشتن یان گرتن و ئازارو ئەشکەنجەدانە.

جالێرەدا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کەلایەنگرانی هەرکام لەم دوو ڕایە لافی ئەوەیان لێداوە کەجەماوەری زانایان لەسەر ڕایەکەی ئەوان!! [11]

بەڵام بائێمە سەرنجی ئەو بەڵگانە بدەین کەلایەنگرانی هەرکام لەم دوو ڕاو هەڵوێستە بۆ سەلماندن و پشتگیری ڕاو هەڵوێستەکەیان هێناویاننەوە داخوا کامیان پێکاویەتی و کامیان نەیپێکاوە، یان بەلای کەمەوە کامیان بەڵگەی بەهێزتری بەدەستەوە هەن!

---

[10] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب)ج٣ص١٧.

[11] بۆ وێنە (محمد بن نصر المروزي) دەربارەی ڕای یەکەم گوتوویەتی: (وهذا مذهب جمهور أَصْحابِ الحَديث) بڕوانە: (نواقض الايمان القولية والعملية) ص ٤٥٦، وە (ابن تيمية) هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: "..وأَكْثَرُ السَّلَفِ علىٰ أنَّه يُقتَلُ كافِراً...) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢٨ ص٣٠٨، (ابن قدامة)ش دەربارەی ڕای دووەم گوتوویەتی: (..والرواية الثانية: يُقْتَلُ حَدّاً مَعَ الحُكْمِ بِإسْلامِهِ كالزّاني المُحْصَنِ... وهذا قَوْلُ أكْثَرِ الفُقَهاءِ..) بڕوانە: (المغني) ج٢ص٢٢٩، (نووي)یش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (..فَمَنْ تَرَكَ الصَّلاةَ تَكاسُلاً.. إنَّهُ يُقْتَلُ حَدّاً ولايَكْفُرُ و بِهِ قالَ مالِكٌ والأكْثَرونَ مِنَ السَّلَفِ والخَلَفِ. وقالَتْ طائِفَةٌ يَكْفُرُ ويَجْري عَلَيْهِ أَحْكامِ المُرْتَدّينَ في كُلِّ شَيْءٍ...) بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٣ص١٧.

*ڕای یەکەم: کەدەڵێن نوێژنەکەر بەبیانووی تەنبەڵی‌یەوە کافرە.

لایەنگران‌و شوێن کەوتووانی ئەم ڕایە بەسێ (٣) جۆرە بەڵگان هەوڵی سەلماندنی ڕاستیی ڕایەکەی خۆیانیان داوە ١-بەڵگەی قورئان٢- بەڵگەی سوننەت ٣- بەڵگەی عەقڵ، ئەمەش پوختەیەکی بەڵگەکانیان:

١-بەڵگەی قورئانی لەسەرئەوە کەنوێژنەکەر هەرچۆن بێ کافرە:

ا-(أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِيْنَ كَالْمُجْرِمِين! مَالَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُون! .. يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَيُدْعَـوْنَ اِلَىٰ السُّجودِ فَلَا يَسْتَطِيْعُون. خاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ اِلَىٰ السُّجودِ وَهُمْ سالِمُون) القلم -٣٥تا٤٣-. (ابن القَيِّم) دەربارەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم ئایەتانە لەسەر کافربوونی بابای نوێژنەکەر بەهەر هۆیەکەوە بێ دەڵێ: خوای پاك‌وبەرز ڕای‌گەیاندوە کەمسوڵمانان‌و تاوانباران وەك یەك دانانێ، پاشان وەسفێ حاڵ‌وباڵی تاوان بارانی کردوە بەوە کە لەڕۆژی دواییدا بانگ دەکرێن، کڕنووش بۆ خوابەرن بەلام بۆیان ناکرێ‌و ئەوەش سزاو تۆڵەی ئەوەیە کەلەدنیادا ساغ‌و سەلامەت بوون‌و کڕنوشیان نەدەبرد بۆیە لەدوارۆژیشدا ناتوانن وەك مسوڵمانان کڕنووش بەرن‌و لەگەڵ کافرو مونافیقەکان دا پشتیان وەك قۆچی مانگا ڕەق دەبێ‌و سەجدەیان بۆ نابردرێ.[١٢]

ب- (كُلُّ نَفْسٍ بِما كَسَبَتْ رَهِيْنَةٌ. اِلَّا اَصْحَابَ الْيَمِيْنِ. فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُون عَنِ الْمُجْرِمِين: مَـا سَلَكَكُمْ فِي سَقَر؟ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّيْنَ..) المدثر -٣٨تا٤٧-، لەم ئایەتانەش دا دەبینین کەدۆزەخی‌یە تاوانبارەکان لەوەڵامی پرسیاری بەهەشتی‌یەکان دا کەلێیان دەپرسن: چ شتێك ئێوەی خستۆتە دۆزەخەوە؟ زۆر ڕاشکاوانە دەڵێن لەسۆنگەی ئەوەوە کەنوێژکەر نەبووین‌و.. هتد، کەواتە موتڵەقی نوێژنەکردن مایەی چوونە دۆزەخ‌و مۆری تاوانباری بەنێوچاوانەوە نرانە!

ج-(فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا)مريم -٥٩-، لەم ئایەتەش دا خوای کاربەجێ پێناسەی پاشینەی‌بەد (الخلف السوء)ی دوای پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) بەوە دەکات کەنوێژیان زایەکردوە[١٣] و کەتوونە شوێن ئارەزووەکان، پاشان فەرموویەتی کەدەچنە نێو (غَيّ)یەوە کەوەك لەفەرموودەی

---

[١٢] بڕوانە: (كتاب الصلاة) ص٣٧،٣٨، ابن القيم الجوزية.

[١٣] هەرکام لە(طبري)و(ابن كثير)و(شوكاني)ڕستەی: (أَضَاعُوا الصَّلَاةَ) یان بەواز لێ‌هێنانی نوێژ تەفسیرکردوە، بڕوانە: تفسير الطبري ج١٦ ص٦٦، تفسير ابن كثير ج٣ص١٢٥، فتح القدير ج٣ص٣٣٩.

پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە فەرموویەتی: (غَيّ وأَثَامْ) دوو چاڵن لەبنی دۆزەخ دا کێمو زووخاوی دۆزەخی یەکانیان تێدا خڕدەبێتەوە، وەك (طبراني)و (بیهقي) گێڕاویانەتەوە[14] ، ئنجا گومانیشی تێدانیە کەهەر کەسێك بچێتە خانەکانی ژێرەوەی دۆزەخ دیارە کافرە یان موونافیقە چونکە مسوڵمانانی گوناهبار کەدەچنە دۆزەخەوە لەچینەکانی سەرەوەیدا دەبن و پاش سزاو جەزرەبە دیتن و پاك بوونەوەیان قوتاریان دەبێت.

د- (فَإِنْ تابُوا وأَقامُوا الصَّلاةَ وآتَوُا الزكاةَ فَإِخْوانُكُمْ في الدِّيْنِ)التوبة -١١-، لەم ئایەتەش دا دەردەکەوێ کەهاوبەش پەیداکەرەکان (المشركين) ئەگەر واز لەشیرك و کوفر نەهێنن و نوێژ نەکەن و زەکات نەدەن ئەوە بەبرای بڕواداران دانانرێن، دیارە هەرکەسێکیش لەگەڵ بڕواداران دا برا نەبوو دیارە بڕوادار نیەو کافرە چونکە خوا فەرموویەتی: (إِنَّمَا المؤْمنون إِخْوَةٌ)الحجرات -١٠- ، ئنجا برایەتی ئیمانییش بەگوناحان لاناچێ و هەڵناوەشێتەوە هەرچەندە زۆرو زلیش بن، کەواتە دیارە نوێژنەکردن کوفری گەورەیە بۆیە ئیمانی لابردوەو برایەتی ئیمانیی هەڵوەشاندۆتەوە.

ه-(فلا صَدَّقَ ولا صَلَّى. ولكِنْ كَذَّبَ وتَوَلّى) القيامة -٣١، ٣٢-، ئەم ئایەتەش کەبڕوانەهێنان و نوێژنەکردن و بەدرۆدانان و پشت تێکردنی پێکەوەو وەك دووتای تەرازوویەك باسی کردوون، ئەو ڕاستی یەی لێ دەفامرێتەوە کەهەروەك چۆن ئایین بەڕاست زانین (تصديق)و ئایین بەدرۆ زانین (تكذيب) دژو پێچەوانەی یەکترن بەهەمان شێوەش نوێژکردن و پشت لەخواکردنیش لەگەڵ یەکتردا دژن و هەرکامێکیان هەبێ ئەوی دیکە نیەو لاچووە.

و- (كُلُوا وتَمَتَّعُوا قَلِيْلاً إِنَّكُمْ مُجْرِمُوْن. وَيْلٌ يومَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِيْنَ. واذا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لا يَرْكَعُون. وَيْلٌ يومَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِيْنَ) المرسلات -٤٦تا٤٩-، لەم ئایەتانەش دا دەبینین کەخوای دادگەر ڕکووع نەبردنی تاوانبارانی لەگەڵ مسوڵمانانی نوێژکەرو ڕکووع بەردا بەمایەی شایستەبوونی کەوتنەبەر هەڕەشەی (وَيْل)و هۆکاری بەبێ بڕوا (مُكَذِّب) لەقەڵەم درانیان داناوە، کەواتە: نوێژنەکردن خەسڵەتی کافران و مایەی کەوتنە بەر هەڕەشەی سەختی خوایە کە (ویل)ە[15] !!

---

[14] بڕوانە (سلسلة الأحاديث الصحيحة)الشيخ ناصرالدين الألباني ج٤ص١٤٥تا١٤٨.

[15] وشەی (وَيْل) لەزمانی عارەبیدا یانی: (الهَلاكُ والدَّمارُ والخَسار) بەڵام (ابو جعفر الطبري) بەشیوو دۆڵێك [illegible] داوەتەوە. بڕوانە: (مختصر تفسير الطبري) اختصار وتحقيق: الشيخ محمد علي الصابوني والدكتور محمد صالح رضا ،

ز- (مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ ولاتكونُوا مِنَ الْمُشْرِكِين) الروم -٣١-، لەم ئایەتەش دا نەگەڕانەوە لای خواو پارێزنەکردنو نوێژ بەرپارنەکردن بەهۆکارو مایەی بوونە هاوبەش دانەر (مُشْرِكْ) دانراون، کەواتە نوێژنەکردن خەسڵەتی موشریکەکانەو نوێژکردنیش دروشمو نیشانەی مسوڵمانان!!

٢- بەڵگەی سوننەت لەسەر کافر بوونی بابای نوێژنەکەر بەهۆی تەنبەڵی‌یەوە:

أ- (إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاةِ) رواه مسلم عن جابر بن عبدالله.

واتە: بێگومان لەنێوان ئینسانو شیركو كوفردا واز لەنوێژ هێنان هەیە.

(بَيْهَقي) گوتوویەتی: "لەدوای ئەو ئیمانەی کەلابەری کوفرە،خوا هیچ کام لەخواپەرستی‌یەکانی بەئیمان[16] ناو نەبردووەو، پێغەمبەریش ﷺ وازلێ‌هێنانی بەکوفر دانەناوە بێجگە لەنوێژ" [17]

وەك دەبینن پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیەدا زۆر ڕاشکاوانەو بێ‌پێچو پەنا نوێژکردنی بەسنوورو دیوارێك داناوە کەناهێڵێ ئینسان بچێتە نێو بازنەی شیركو کوفرەوە، کەواتە هەرکەسێك نوێژی نەبوو هیچ پەرچو لەمپەرێکی لەپێش نیە کەبچێتە خانەی موشریكو کافرانەوە.

ب- (الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ) اخرجه احمد والنسائي والترمذي وقال: حسن صحيح وصححه الحاكم والالباني،

واتە ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمەو ئەوان - واتە کافرەکان _ دایە نوێژە، جا هەرکەسێك وازی لێ‌بهێنێ ئەوە کافربووە.

ج- (عن عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما عن النبيّ ﷺ انه ذَكَرَ الصَّلاةَ يَوْماً فقال: مَنْ حافَظَ عَلَيْها كانَتْ لَهُ نُوراً وَبُرْهاناً وَنَجاةً يَوْمَ القِيامَةِ وَمَنْ لَمْ يُحافِظْ عَلَيْها، لَمْ تَكُنْ لَهُ نُوراً ولابُرْهاناً ولانَجاةً وكانَ يَوْمَ القِيامَةِ مَعَ قارونَ وفِرْعَوْنَ وهامانَ وأُبَيِّ بنِ خَلَفٍ) اخرجه احمد وابن حبان والطبراني.

---

ص٥١٠.

[16] (طبري) لەتەفسیری ڕستەی: (...وماكانَ اللهُ لِيُضيعَ إيمانَكُمْ)دا گوتوویەتی: (وماكانَ اللهُ لِيُضيعَ صَلاتَكُمْ الَّتي صَلَّيْتُموها الى بَيْتِ المقْدِس) بڕوانە: (مختصر تفسير الطبري) ج١ ص٤٨.

[17] بڕوانە: (شعب الايمان) للبيهقي ج٣ ص٣٢.

وەك دەبينين پێغەمبەری سەرومان ﷺ مژدەی ئەوە بەنوێژکەران دەدات کە لەڕۆژی دواییدا بۆیان دەبێتە مایەی ڕۆشنایی و بەڵگەو ڕزگاری بەمەرجێك پارێزگاری لەنوێژەکانیان بکەن لەهەمو ڕوویەکەوە، وەبەپێچەوانەوەش هەرەشە لەنوێژنەکەران و نوێژ بەزایەدەران دەکات کەلەڕۆژی دواییدا ڕووناکی و بەڵگەو ڕزگارییان نابێ و لەگەڵ سەرانی کوفرو شیرك و نیفاق: قارونو فیرعەونو هامانو ئوبەییەی کوڕی خەلەف دا حەشریان دەکرێ.

د- (.. رَأْسُ الأَمْرِ الأِسْلامُ وعَمُودُهُ الصَّلاةُ وذِرْوَةُ سَنامِهِ الجِهادُ) اخرجه احمد والترمذي وقال: حسن صحيح وابن ماجه وصححه ابن القيم والالباني.

واتە: سەری ئایین ئیسلامەو کۆڵەکەکەی نوێژەو دوندی هەرەبەرزی جیهادە. ئنجا ئاشکراشە کەهیچ خانوویەك و هیچ خێوەت و ڕەشماڵێك بەبێ پایەو کۆڵەکە ڕاناوەستێ و بەنەمانو لاچوونی پایەو کۆڵەکەکەی دەڕووخێ و هەرەس دێنێ.

هـ- (مَنْ صَلَّى صَلاتَنا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنا، وأَكَلَ ذَبِيحَتَنا، فَهُوَ المُسْلِمُ، لَهُ مالَنا وَعَلَيْهِ ماعَلَيْنا) رواه البخاري،

واتە/ هەر کەسێك وەك ئێمە نوێژی کردو ڕووی کردە قیبلەمانو سەربڕاوی ئێمەی خوارد ئائەوە مسوڵمانە چ مافێکمان هەیە هەیەتی و چ ئەرکێکمان لەسەرشانە ئەویش لەسەر شانیەتی.

(ابن القيم) دەربارەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم فەرموودەیە لەسەر مسوڵمان نەبوونی بابای نوێژنەکەر گوتوویەتی: (ئەم فەرموودەیە لەدوو ڕووەوە بەڵگەیە – لەسەر ئیسپاتی کافربوونی ئینسانی نوێژنەکەر – یەکەم: کە بەوسێ خەسڵەتە بەمسوڵمانی داناوە کەواتە بەبێ ئەوانە مسوڵمان نیە، دووەم: ئەگەر کەسێك بەرەو ڕۆژهەڵات نوێژ بکات بەمسوڵمان دانانرێ هەتا بەرەو قیبلە نوێژ نەکات، ئەدی ئەگەر هەر ڕوو لەقیبلە نەکات!!) [١٨]

و- (عَنْ مِحْجَنٍ الدِّيلي رضي الله عنه انه كان في مجلس مع رسول الله ﷺ فَأُذِّنَ بِالصَّلاةِ، فقام رسولُ الله ﷺ فصلَّى، ثم رَجَعَ ومِحْجَنٌ في مجلسه، فقال رسولُ الله ﷺ: ما مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ مع الناسِ؟ أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ؟! قال: بَلى يارسولَ الله ولكِنِّي قَدْ صَلَّيْتُ في أَهْلي، فقالَ لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ اذا جِئْتَ فَصَلِّ مَعَ النّاسِ وإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ) رواه احمد ومالك والنسائي والحاكم وصححه الالباني.

---

١٨ بڕوانە: (كتاب الصلاة) ص٤٨،٤٩.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرسوورمانەوە ڕوو لەیەکێ: لەهاوەڵانی - میحجەن خوالێی ڕازیبێ - دەکات کەدیتوویەتی لەگەڵ مسوڵمانان نوێژەکەی نەکردووەو پێی دەفەرموێ: چ شتێك ڕێی لێگرتی کەلەگەڵ خەڵکیدا نوێژ نەکەی! ئەدی تۆ پیاوێکی مسوڵمان نی؟!

لەمەوە دەردەکەوێ کەناگونجێ ئینسان مسوڵمان بێ و نوێژ نەکات، کەواتە هەرکەسێك نوێژی نەکرد مانای وایە مسوڵمان نیە.

ز- (إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثارِ الوضوءِ) متفق عليه.

واتە: بێگومان ئۆممەتی من لەڕۆژی قیامەت دا بەنێوچاوانو دەستوپێ بازوو - واتە - سپی: - بانگ دەکرێن بەهۆی دەست نوێژەوە.

(ابن تیمیة) لەبارەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم فەرموودەیە لەسەر ئەوە کە نوێژنەکەر کافرە گوتوویەتی: (ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کەهەر کەسێك - بەهۆی نوێژو دەست نوێژەوە - نێوچاوانو دەستو پێ بازوو نەبێ پێغەمبەر ﷺ نایناسێتەوە کەواتە لەئۆممەتی ئەویش نابێ) [١٩]

ح- (إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَراءُ فَتَعْرِفُونَ وتُنْكِرونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، ولٰكِنْ مَنْ رَضِيَ وتابَعَ، قالوا: أَفَلا نُقاتِلُهُمْ؟ قال: لا، ماصَلَّوا) رواه مسلم والترمذي.

واتە: چەند کار بەدەستێکتان بەسەرەوە دەکرێنە حوکمڕان شتی باشیشیان لێدەبینن و شتی خراپیش، جا ئەوەی خراپەکەیان ببوغزێنێ ئەوە لێیان بەری دەبێ - و بەهۆی ناشەرعیەکانیانەوە گوناهبار نابێ و نابێتە هاوبەشیان - ، وە ئەوەی هەوڵی گۆڕین و لابردنی خراپەکانیان بدات ئەوە سەلامەت دەبێ و سەربەرز دەردەچێ، بەڵام ئەو کەسەی لێیان ڕازیبێ و شوێنیان بکەوێ - ئەوە بەر هەڕەشەی خوای دادگەر دەکەوێ - گوتیان: ئایا لەگەڵیان بجەنگین؟ فەرمووی: نەء، هەتا نوێژ بکەن - لەگەڵیان مەجەنگن.

ئنجا با سەرنجی ئەم فەرموودەیەش بدەین:

(عن عُبادَةَ بنِ الصّامِتِ رضيَ الله عنه قال: دَعانا النَّبيُّ ﷺ فَبايَعْناهُ، فقالَ فيما أَخَذَ عَلَيْنا أَنْ بايَعَنا علىٰ السَّمْعِ والطّاعَةِ في مَنْشَطِنا ومَكْرَهِنا، وعُسْرِنا ويُسْرِنا، وأَثَرَةٍ عَلَيْنا، وأَنْ لا نُنازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، إِلاّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَواحاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فيهِ بُرْهانٌ) متفق عليه.

---

١٩ بڕوانە: (مجموع الفتاویٰ) ج٧ص٦١٢.

واتـه: (عبادة) خـوا لێـیڕازی بـێ دەگێڕێتـەوە کەپێغەمبـەر ﷺ بـانگی کردیـن‌و پەیمانی لەگەڵ بەستین جا لەو بـەڵێن‌و پەیمانـەدا کـەلێی وەرگرتـین فـەرمووی: کـە پـەیمانتان لەگـەڵ دەبەسـتم لەسـەرئەوە کەگوێڕایـەڵ‌و فەرمانبـەر بـن لـەکاتی پێخۆشبوون‌و پێناخۆشبوون‌و تەنگانەو فـەڕحانی‌و بەشـخوراوی‌دا، وە کـە لەگـەڵ حوکمڕان دا کێشمەکێش نەکەین مەگەر کوفری ئاشکرا ببینن کەلەلایەن ئایینی خواوە بەڵگەی ڕوونتان لەسەری هەبێ.

جا ئێستا باڕامێنین:

لەفەرموودەی یەکەم دا پێغەمبـەر ﷺ لەوەڵامی ئەوانەدا کەپرسیاریان کردووە کە ئایا ئەو جۆرە کاربەدەستە لارو ستەمکارانەی خراپەو ناشەرعی‌یان لـێ‌دەپشکوێتەوە دروستە بەهێزو چەك بەرهەڵستی‌یان بکرێ‌و لاببرێن؟! فەرموویەتی: هەتا بەردەوام بن لەسەر نوێژکردن، نەخێر!

وە لەفـەرموودەی دووەم فەرموویـەتی: کێشـەی وەرگرتنـی جڵـەوی حوکـم‌و دەستەڵات لەگەڵ کاربەدەستانتان دا مەکەن‌و ئارام بگرن، مەگەر لەحاڵێك‌دا کوفری بێ پێـچ‌و پـەنایان لـێ‌ببینن! کەواتـــە: لـەکوێ ئـەم دوو فەرموودەیـە وەردەرگـیرێ کەنوێژنەکەر کافرەو نوێژنەکردن کوفـری ئاشـکراو ڕوونـە! چونکـە مـادام ڕەوانـەبێ بەچەك‌و هێز لەگەڵ حوکمڕان‌و کاربەدەستانی مسوڵمان دا ڕووبەڕوو ببینەوە هـەتا کوفری ئاشـکرایان لـێ‌دەبینن‌و، لـەکاتێکیش دا نوێژیـان واز لـێ‌هێنا کوشـتاریان ڕەوابـێ کەواتـە نوێژنـەکردن کوفـری ڕوون‌و ئاشـکرایە لەهەرکەسێك دابـێ‌و لەهـەر ئاستێك دابێ!

ط- (عن أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: كانَ أَصْحابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ لايَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأَعْمـالِ تَرْكُـهُ كُفْرٌ غيرُ الصَّلاةِ) اخرجه الحاكم وقال الذهبي اسناده صالح.

هەروەها هەمان دەق لە(عبدالله بن شقيق العقيلي) گێڕ راوەتـەوە [20]، (شوكاني) دەربارەی ئەو دەقەی سەرێ کە لەهـەرکام لـە (ابوهريـرة) و(عبـدالله بـن شـقيق) دوە گێڕڕراوەتـەوە، دەڵـێ: (لەو جۆرە تـەعبيرە ئـەوە دەفامرێتـەوە کـەهاوەڵانی پێغەمبـەر خوالێیان ڕازی بێ لەسەری کۆبوونەتەوە..) [21]، (اسحاق بن راهويه)ش گوتوویەتی: (لەفەرمودەی ڕاست (صحيح)ی پێغەمبـەردا ﷺ هاتوە کە ئەو کەسەی بەئانقەست

---

[20] أخرجه الترمذي وقال النووي في المجموع اسناده صحيح، بڕوانە: (المجموع) ج٣ص١٨.

[21] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص١٦.

نوێژ واز لێدێنێ کافره، هەروەها ڕای زانایان هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئەمڕۆ هەروا بووە، کەهەر کەسێك بەئانقەستو بەبێ هۆ نوێژ بچوێنێ هەتا کاتەکەی تێدەپەڕێ ئەوە کافرە) [٢٢].

تێبینی: دەگونجێ ئەو دەقانەی لە (أبوهریرة)و (عبدالله بن شقیق)و(اسحاق بن راهویە) وە نەقڵمان کردون بەئیجماع یان جۆرێك لەئیجماع لەقەڵەم بدرێن بۆ ئیسپاتی ئەو ڕایە کەنوێژنەکەر بەبیانووی نەتوانینو تەنبەڵییەوە کافرەو فڕی بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ.

ئێستاش بابچینە سەر جۆری سێیەم لەبەڵگەکانی ئیسپاتی کافرێتی بابای نوێژنەکەر:

## ٣-بەڵگەی عەقڵی لەسەر کافرێتی بابای نوێژنەکەر:

هیچ ماقووڵ نیەو شتێکی مەحاڵە کەسێك بڕوای بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺو ئاینو بەرنامەی خوا هەبێو، ئاگاداری ئەو هەموو هەڕەشە توندوتیژانە بێ کە لە نوێژنەکەران کراون، کەچی لەگەڵ هەڕەشەی قیامەتیو سزاو تۆڵەو جەزرەبەی دنیایش دا مووی لێنەلەخشێو بەرەو قیبلە ڕانەوەستێو کڕنووشی بەندایەتی بۆ خوای خۆی نەباتو فەرمانی جەختی لەسەرکراوی خواو پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ نەکات!

بەڵێ لەڕاستیدا بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ ئینسان ئیمان و بڕوای لەدڵ دا هەبێو خۆشویستنو لێترسانو شەرم و شکۆو سامو هەیبەتی بەرانبەر بەخوای بێوێنەو پاكو تاك لەدڵو دەروون دا هەبێتو دڵنیابێ کەخوا لەسەر نوێژنەکردن سزاو جەزرەبەی دەدات، کەچی فەرمانی خوا پشت گوێ بخاتو ئەمیەتی پێنەدات، وەبێگومان ئەوجۆرە تێڕوانینە بۆ ئیمانو عەقیدە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەقەکانی قورئانو سوننەت دا دانووی ناکوڵێو تەنهاو تەنهاش لەفیکرو بۆچوونی مورجیئەکانەوە [٢٣] هەڵقوڵاوەو بەهیچ کلۆجێك لەگەڵ تێگەیشتنی پێشینەی چاك (السَّلَفَ الصَّالِح) مانو ئەهلی سوننەتو جەماعەت دا بۆ ئیمانو ئیسلام ناگونجێ، چونکە پێشینەی چاكو ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەپێناسەی ئیمان دا گوتوویانە:

---

[٢٢] بڕوانە: (نواقض الأيمان القَوْلية والعملية) ص٤٧٢.

[٢٣] (المُرْجئة) کۆمەڵێکی داهێنەر (مبتدع) بوون دژی فیکری (خوارج) کە خاوەن گوناحەکانیان بەکافر دادەنا، (مرجئة)ش دەڵێن ئیمان بەس بەڕاست دانان (التصديق)ی نێودڵەو پەیوەندی بەکردەوەی دڵو ئەندامەکانەوە نیە.

(الأيمانُ قَوْلٌ وعَمَلٌ يزيدُ وينقصُ: قَوْلُ القلْبِ واللِّسانِ وعَمَلُ القلْبِ والجَوارِحِ، يَزِيْدُ بِالطَّاعةِ وَينْقُصُ بِالمَعْصِيَةِ) [24]

واته: ئیمان قسەو کردەوەیەو زیادو کەم دەکات، قسەی دڵو زمانو کردەوەی دڵو ئەندامەکانە، بەفەرمانبەری زیاد دەکاتو بەسەرپێچی کەم دەکات.

★ڕای دووەم: کەدەڵێن نوێژنەکەر بەهۆی تەنبەڵیەوە کافر نابێ بەڵکو مسوڵمانێکی گوناهبارە.

خاوەنی ئەم ڕاو هەڵوێستەش بەسێ جۆرە بەڵگان پشتگیری ڕاو هەڵوێستەکەی خۆیانیان کردوە کەئەمە پوختەو گوشراوی بەڵگەکانیانە:

١- بەڵگەی قورئانی:

(إِنَّ اللهَ لايَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مادُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشاءُ) النساء -٤٨-،

واتە: بێگومان خوا لەوە نابووڕێ کەهاوبەشی بۆ دابنرێ، بەڵام لەغەیری ئەوە بۆ هەر کەسێك بیەوێ دەبووڕێ.

وەك دەبینین بێجگە لەهاوبەش بۆ خوا دانان (الأَشْراكُ بِاللهِ) خوای تاوانپۆشو لێبوردە سەرجەم گوناحو تاوانەکانی خستوونەتە بازنەی لێبوردنەوە هەرکاتێك حەزبکاتو بیەوێ.

٢-بەڵگەی سوننەت:

١-(خَمْسُ صَلَواتٍ إِفْتَرَضَهُنَّ اللهُ، مَنْ أَحْسَنَ وَضُوْءَهُنَّ وَصَلاهُنَّ لِوقْتِهِنَّ، وأَتَمَّ رُكوعَهُنَّ وَخُشُوعَهُنَّ، كانَ لَهُ عَلىٰ اللهِ عَهْدٌ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ، وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلَيْسَ لَهُ عَلىٰ اللهِ عَهْدٌ إِنْ شاءَ غَفَرَ لَهُ وإنْ شاءَ عَذَّبَهُ) اخرجه احمد ومالك في الموطأ وابوداود وصححه النووي في المجموع وصححه العراقي والألباني، وفي رواية: (..مَنْ حافَظَ عَلَيْهِنَّ.. وَمَنْ لَمْ يُحافِظْ عَلَيْهِنَّ..)،

واتە: ئەو پێنج نوێژەی کەخوا پێویستی کردوون، هەرکەسێك باش دەستنوێژیان بۆ بگرێو لەکاتی خۆیان دا بیانکاتو ڕکووع - و کڕنووش - و گەردن کەچییەکەی

---

[24] بۆ وێنە سەرنجی کتێبی (شرح اصول اعتقاد اهل السنه والجماعه) بدە، نووسراوی (الشيخ الامام العالم الحافظ أبي القاسم هبة الله ابن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي)، کە لەپێنج بەرگ دا چاپ کراوەو (د. احمد بن سعد بن حمدان الغامدي) (تحقيق)ی کردوە.

تێرو تەواو بن، ئەوە لەلایەن خواوە بەڵێنی پێدراوە کەلێی ببورێ، بەڵام هەرکەسێك وانەکات ئەوە بەڵێنی لەسەر خوا نیە، جا ئەگەر حەزی کرد لێی دەبووریۆ ئەگەر حەزیشی کرد - سزای بدات - ئەوە ئەشکەنجەی دەدات.

(ابن عبدالبر) دەربارەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم فەرموودەیە لەسەر کافر نەبوونی بابای نوێژنەکەر مادام دانی پێدا بهێنێ، گوتوویەتی (بەڵگەی لەسەر ئەوە تێدایە کەهەرکەسێك لەمسوڵمانان هەرچەندە نوێژیش نەکات مادام خوابەیەکگرو بڕوادار بێت بەوەی کە (مُحَمَّدٌ) ﷺ هێناویەتی ئەوە لەژێر سێبەری ویستو حەزی خوادایە، با بەرکردەوەش جێبەجێ نەکات)[٢٥].

ب- (عن حُذَيْفةِ بن اليَمان ﷺ مرفوعاً: يَدْرُسُ الأُسلامُ كما يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْب، حتى لايُدْرىٰ ماصيامُ ولاصلاةُ ولانُسُكُ ولاصَدَقَةُ، ولَيُسْرى علىٰ كتابِ الله عزَّ وجلَّ في ليلةٍ فلا يَبْقىٰ في الأرض مِنْهُ آيةٌ، وتَبْقىٰ طَوائِفُ مِنَ الناسِ الشيخُ الكبيرُ والعَجوزُ، يقولون:أدْرَكْنا آباءَنا علىٰ هذهِ الكَلِمةِ (لااله الا الله)، فَنَحْنُ نَقولُها. قال (صِلَةُ بن زُفَر) لحذيفةَ: ماتُغْني عنهم لا اله الا الله وهُمْ لايَدْرون ماصلاةُ ولا صيامُ ولانسُكُ ولاصدقةُ؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثم رَدَّها عليه ثلاثاً كُلَّ ذٰلِكَ يُعْرِض عنه حذَيفةُ، ثم أَقْبَلَ عليه في الثالثةِ، فقال: ياصِلَةُ تُنَجّيهِم مِنَ النارِ ثلاثاً) اخرجه ابن ماجه وصححه كل من البوصيري والحاكم والذهبي وقال الحافظ ابن حجر في الفتح اسناده قوي وصَحَّحَهُ الألبانيُ[٢٦].

واتە/ وەك چۆن نەخشو ڕەنگی پۆشاك دەچێتەوە ئیسلامیش - لەکۆتایی ڕۆژگاردا - ئاوا دەپووکێتەوە، هەتا وای لێدێ نازانرێ ڕۆژوو گرتنو نوێژو قوربانی سەربڕینو ماڵ بەخشین چییە! وە لەیەك شەودا کتێبی خوا هەمووی دەسڕێتەوە هەتا یەك ئایەتی لەسەر زەوی نامێنێ، وەچەند کۆمەڵێك لەخەڵکی دەمێنن پیرەمێردو پیرەژن، دەڵێن: باوو باپیرانمان لەسەر وشەی (لا اله الا الله) دیوەو ئێمەش ئەو وشەیە دەڵێین، (صلة بن زفر) بە (حذیفة)ی گوت: مادام نەزانن نوێژو ڕۆژوو گرتنو قوربانی سەربڕینو ماڵ بەخشین چییە گوتنی: (لا اله الا الله) چ دادێکیان دەدات؟! سێجاران دووبارەی کردەوە (حذیفة) هەر گوێی نەدایەو وەڵامی نەدایەوە، جاری سێیەم (حذیفة) سێجاران گوتی: ئەی (صلة) لەئاگر قوتاریان دەکات!

---

[٢٥] بڕوانە: (التمهید) ج٢٣ص٢٩٠، لە: (نواقض الایمان القولیة والعملیة) ص٤٧٣.

[٢٦] بڕوانە: (سلسلة الأحادیث الصحیحة) ج١ ژمارە ٨٧.

دیاره ئەم فەرموودەیە زۆر ڕوونەو پێویستی بەوە ناکات چۆنیەتی دەلالەت کردنەکەی شی بکەینەوە.

ج- (..ثم يقول اللهُ: شَفَعَتِ المَلائِكَةُ، وشَفَعَتِ الأَنْبياءُ، وشَفَعَ المؤمنون وبَقِيَ أَرْحَمُ الرّاحمين، قال: فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النّارِ - أوقال قَبْضَتَيْنِ - ناساً لَمْ يَعْمَلُوا لِلهِ خَيْراً قَطُّ، قَدِ احْتَرَقُوا حتّى صارِوا حِمَماً، قال: فَيُؤْتَى بِهِمْ الى ماءٍ يُقالُ لَهُ: الحياة، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ- فيَقالُ لهُمْ، أُدْخُلوا الجَنَّةَ..) رواه احمد والنسائي وابن ماجه وقال الألباني: إِسنادُهُ صحيح على شرط الشيخين.

واتە: - پاشان خوا دەفەرموێ: فریشتەکان تکایان کردو پێغەمبەران تکایان کردو بڕواداران تکایان کرد، ماوەتەوە بەبەزەیی‌ترینی خاوەن بەزەیی‌یان، فەرمووی[٢٧] : ئەوجار چەنگێك لەئەهلی ئاگری دۆزەخ دادەگرێ - یان فەرمووی دوو چەنگ - خەڵکێك کەهەرگیز کارێکی چاکیان بۆ خوا ئەنجام نەداوە، لەحاڵێك دا کەهێندە سووتاون بوونە خەڵووز، فەرمووی : ئەوجار دەهێنرێن بۆلای ئاوێك کەپێی دەگوترێ-ئاوی - ژیان، وە لەو ئاوەیان بەسەردا دەڕێژرێ.. دوایی پێیان دەبێژرێ بچنە بەهەشتەوە.

(ناصر الدين الألباني) لەباری ئەم فەرموودەیەوە گوتوویەتی:

(ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەوە کەبابای نوێژنەکەر ئەگەر بەمسوڵمانەتی بمرێو شایەدی بدا کەجگە لەخواپەرستراوێکی دیکە نیە، ئەوە لەگەڵ هاوبەشی بۆ خوا دانەرەکان لەئاگری دۆزەخ دا نامێنێتەوە..)[٢٨] .

د- (مَنْ شَهِدَ أَنْ لاّ اله الا الله وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وأَنَّ محمداً عبدُهُ ورسولُهُ، وأَنَّ عيْسى عَبْدُالله ورَسولُه، وكَلِمتُهُ أَلْقاها الىٰ مَرْيَمَ وروحٌ مِنْهُ، والجَنَّةَ حَقٌ والنّارَ حَقٌ أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ علىٰ ماكانَ مِنْ العَمَلِ) متفق عليه.

واتە/ هەرکەسێك شایەدی بدات کەجگە لەخوا پەرستراوێکی دیکە نیە، تاکەو هاوبەشی نیە، وە - شایەدی دا- کەموحەمەد بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، وە - شایەدی‌دا - کە عیسا بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، وە بەوشەی خوا دروست بووەو خستوویەتە نێو منداڵدانی مەریەمەوەو ڕووحێك بووە لەخواوە، وە -شایەدی‌دا - کە بەهەشت ڕاستەو ئاگری دۆزەخ ڕاستە، کردەوەی هەرچۆنێك بێت خوا دەیخاتە بەهەشتەوە.

---

[٢٧] ئەو (فەرمووی) یانە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێنەوە.

[٢٨] بڕوانە: (حكم تارك الصلاة) ص٣٥، نووسراوی: الشيخ ناصرالدين الألباني.

٥- (أَسْعَدُ النّاسِ بِشَفاعَتي مَنْ قالَ: لا اله الا الله خالِصاً مِنْ قَلْبه) رواه البخاري.

واتە: بەختەوەرترین کەس بەهۆی تکای منەوە - لەڕۆژی دواییدا - کەسێکە کە بەساغی لەدڵییەوە گوتبی: بێجگە لەخوا هیچ پەرستراوێك نیە.

وەك دەبینن هەم لەفەرموودەی پێشوو و هەم لەم فەرموودەیەش دا پێغەمبەری خوا ﷺ چوونە بەهەشت و بەختەوەربوونی تەنها بەوەوە پەیوەست کردوە کەئینسان بەڕاستی ئیمان و بڕوای هەبێ و بەدڵ و دەروونێکی ساغەوە بڵێ: لا اله الا الله، کەواتە بۆچوونە بەهەشت و بەهرەمەندبوون لەشەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ ئیمان و عەقیدە بەسەو پەك لەسەر نوێژکردن نەکەوتوەو، بەکورتی بەبێ نوێژکردنیش ئینسان هەر مسوڵمانەو سەرەنجام هەر دەچێتە بەهەشت ئەگەر ماوەیەکیش لەدۆزەخ دا دووچاری ئازارونەشکەنجە ببێ و بەئەندازەی خراپەو گوناحەکانی سزا بدرێ.

٣-بەڵگەی ئیجماع:

دەڵێن: ئەمان زانیوە لەهیچ چاخ و سەردەمێك دا نوێژنەکەران کە مردوون نەشۆرابن و نوێژیان لەسەر نەکرابێ و لەگۆڕستانی مسوڵمانان دا نەنێژرابن. وە میراتیان لەخزم و کەسی خۆیان نەگرتبێ و میراتیان لێنەگیرابێ، هەروەها هیچ کاتێك ژن و مێرد لەیەکتر جیانەکراونەوە لەسەر نوێژنەکردنی یەکێکیان، دیارە ئەگەر ڕاست بایەو نوێژنەکەر بەکافر دانرابایە دەبوو ئەو حوکم و یاسایانە هەموویان چەسپێنرابان، هەروەها نەمانزانیوە مسوڵمانان لەوەدا مشت ومڕو جیاوازییان بووبێ کەدەبێ بابای نوێژنەکەر نوێژە چوێنراوەکانی بگێڕێتەوە، جا دیارە ئەگەر بەهۆی نوێژنەکردنەکەیەوە بەهەڵگەڕاوە (مُرْتَدّ) و کافر دانرابایە لەسەری پێویست نەدەبوو کەنوێژو ڕۆژووەکانی بگێڕێتەوە.

ئنجا شوێن کەوتوو و لایەنگرانی ئەم ڕای دووەمە ئاواش وەڵامی بەڵگەکانی کۆمەڵی یەکەم - کەنوێژنەکەر بەکافر دادەنێن - دەدەنەوە:

یەك: دەڵێن: مەبەست لەوشەی کوفر لەو فەرموودانەدا کەباسی کوفری نوێژنەکەر دەکەن کوفری نیعمەتە (کفران النعمة) وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ تَعَلَّم الرَّمْيَ ثم تَرَكَهُ، فَهِيَ نِعْمَةٌ كَفَرَها)رواه ابوداود والنسائي وصححه الالباني.

واتە: هەرکەسێك فێری تیرەندازەی ببێ و پاشان وازی لێبهێنێ ئەوە بەرانبەر بەچاکەیەك سپڵەیی کردوە.

دوو: هەندێکیشیان بۆ وێنە (شوکاني) و (ابن الوزیر) [29] دەڵێن: کوفری نوێژنەکەر کوفری گچکەیە (الکفر الأصغر) و کوفرێکە لەخوار کوفری گەورەوە (کفر دون کفر)، ئنجا هیچ پەرچێك نیە لەبەرانبەر ئەوەدا کەهەندێك لەجۆرەکانی کوفر بکەونەبەر لوتف و لێبوردنی خواو تکای پێغەمبەر ﷺ بۆ وێنەش ئەم دوو فەرموودەیە دێنینەوە: (سِبابُ المُسْلِمِ فُسوقٌ وقِتالُهُ كُفْرٌ) متفق علیه عن ابن مسعود.

واتە: جنێودان بەمسوڵمان لەڕێ دەرچوونەو جەنگ لەدژکردنی کوفرە.

(مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ) رواه الترمذي وابوداود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

واتە: هەر کەسێك سوێندی بەغەیری خوا خوارد ئەوە کوفری کردوە.

سێ: وە دەڵێن: ئەو فەرموودانەی کەباسی کافربوونی نوێژنەکەر دەکەن ئەوە زیاتر مەبەست پێیان هەڕەشەو ترساندن و سڵەماندنەوەیە نەك حەقیقەتی کافربوون و لەئایین دەرچوون [30].

چوار: وە دەڵێن: مەبەست لەو دەقانە کەنوێژنەکەر بەکافر دادەنێن ئەوەیە کە بابای نوێژ نەکەر لەهەندێك لەحوکمەکانی کافران دا بەشداره کەحەڵاڵ بوونی خوێنی و فەرزبوونی کوژرانیەتی، (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (وهذا التأويلُ مُتعيّنٌ لِلجَمْعِ بَيْنَ نُصوصِ الشّرْعِ وقَواعِدِهِ) [31]، واتە: وە ئەم تەئویل کردنە پێویستە بۆئەوەی بتوانین هەموو دەقە شەرعی یەکان و بنچینەکانی پێکەوە کۆبکەینەوە.

پێنج: وە لەکۆتاییدا دەڵێن: مەبەست لەوجۆرە فەرموودانە کەسێکە کەنوێژنەکردن بەحەڵاڵ بزانێ، یان بڕوای بەفەرزبوونی نوێژنەبێ [32].

---

[29] بروانە: (نیل الأوطار) ج٢ص٢٠، هەروەها بروانە: (العَواصِمُ والقَواصِمُ في الذَّبِّ عَنْ سُنَّةِ أَبي القاسِمْ) ج٩ص٧٩، الأمام النَّظّار المُجْتَهِدْ محمد بن ابراهيم الوزیر الیماني.

[30] بروانە: (المغني) لابن قدامة ج٢ص ٣٠١،٣٠٢ وە (فتح الباري) لابن حجر العسقلاني ج٢ ص٣٢، وە (احکام القرآن) لابن العربي ج١ ص٤١.

[31] بروانە: (المجموع شرح المهذب) للنووي ج٣ص٢٠.

[32] بروانە: (التمهید) لابن عبدالبر ج٤ص ٢٣٦، وە (شرح صحیح مسلم) للنووي ج٢ص٧١.

**وەڵامی بەکافر دانەرانی نوێژنەکەر بۆنەوانەی نوێژنەکەر بەمسوڵمان دەزانن:**

خوا پشتیوان بێ لەدوو بڕگەدا وەڵامی کۆمەڵی یەکەم بۆ بەڵگەو ڕەخنەکانی کۆمەڵی دووەم دەخەینەڕوو، لەبڕگەی یەکەم دا وەڵامی بەڵگەکانیانو لەبڕگەی دووەمیش دا وەڵامو بەرپەرچ دانەوەی ڕەخنەو تەئویلەکانیان.

## بڕگەی یەکەم: وەڵامی بەڵگەکانیان:

**یەك**: ئایەتی: (إِنَّ اللهَ لاَيَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مادونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشــاءُ..) النساء -٤٨-، دوو وەڵامی هەن: یەکەم: مەبەست لە(مادُونَ ذٰلِكَ) ئەو گوناحو تاوانانەن کەلەخوار شیرکەوەنو نەشگەیشتوونە سنوورو ڕاددەی کوفرو نیفاقی گەورە، چونکە بێگومان هەروەك چۆن (شیرك) نابەخشرێ و هاوبەش دانەر (مُشْرِك) ناچێتە بەهەشت، کوفرو نیفاقی گەورەش وەبەر لێبوردن ناکەوێو کافرو مونافیقیش چاویان بەبەهەشت ناکەوێ.

بەکورتی: پەرچو ڕێگر (مانع)ی لەدۆزەخ قوتاربوون تەنها شیرك نیە، بەڵکو هەرکام لەکوفرو نیفاقیش بەهەمان شێوە ڕێگری چوونە بەهەشتو قوتاربوونن لەدۆزەخ، وەك لەچەندان دەقی بێ پێچو پەنای قورئانو سوننەت دا هاتوە، بۆ وێنە: (إِنَّ اللهَ لَعَــنَ الكافِرِيْنَ وأَعَدَّ لَهُمْ سَعيْراً. خالِدِينَ فِيها أَبداً لايَجِدونَ وَلِيّاً ولانَصيْراً) الاحزاب -٦٣-، ٦٤-

واتە: بێگومان خوا نەفرینی لەکافران کردوەو کڵپەی دۆزەخی بۆ سازکردوون. بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوەو هیچ دۆستو پشتیوانێك شك نابەن، دەربارەی مونافیقەکانیش فەرموویەتی: (إِنَّ المُنافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُـمْ نَصِـيْراً) النساء -١٤٥-، واتە: بێگومان مونافیقەکان لەتەختی بنی ئاگری -دۆزەخ- دانو هیچ پشتیوانێکیان بۆ پەیدا ناکەی.

ئنجا کەدەرکەوت ئینسان بەکوفرو نیفاقیش وەك شیرك لەبەهەشت بێبەش دەبێو لەدۆزەخ دا بەهەمیشەیی دەمێنێتەوەو بەبەڵگەی نکووڵی لێنەکراویش سەلمێنرا کەنوێژنەکردن کوفرە، کەواتە نوێژنەکەریش وەك هەر کافرو هاوبەش دانەرێکی دیکە ناچێتە بەهەشتو جێگای هەمیشەیی دۆزەخە.

دووەم: ئایەتەکە دەفەرموێ کەشیرك نابەخشرێو بەفەرموودەی ڕاست (صحیح) یش ئیسپات بووە کەنوێژنەکردن شیرکە: **(إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ والكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاةِ)** رواه مسلم، کەواتە نوێژنەکردنیش جۆرێکە لەجۆرەکانی شیركو لێبوردن خاوەنەکەی ناگرێتەوە.

**دوو**: فـەرمووده‌ی: (خَمْسُ صَلَواتٍ إفْتَرَضَهُنَّ الله ..) وەك لـەدەقی فەرموودەكـەدا بەگشتیو بەتایبەت لەریوایەتەكەیتر: (مَنْ حافَظَ عَلَيْهِنَّ..) دەردەكەوێ ئەو گفتو بەڵێنەی كەتێیدایە بەرمـەجی بـەجێهێنانی نوێژەكـان بـەتێرو تـەواویو پارێزگـاری لێكردنیان (المحافظة علیهن) پەیوەست كراوەو موتڵەق نیە: كەواتە: ئەو كەسەی پێنج نوێژەكانی بەتێرو تەواویو بێ كەموكووڕی بەجێدێنێ، ئەوە بەڵێنو پـەیمانی لـەلای خوا پێدراوە كەبیباتە بەهەشتێ، بەڵام ئەوەی بەنارێكیو كەموكوڕی‌یـەوە بیانكات ئەوە لەبازنەی ویستو حەز (دائِرَةُ الأرادَة والمَشْيئَة)ی خوادایەو شێمانە (احتمال)ی بەخشرانو ئەشكەنجەدرانی هەیە، بەڵام ئەوەی بەموتڵەقی نوێژەكانی نەكات ئەوە لەم فەرموودەیـەدا هیـچ نـاوی نیـەو هیچـی لـەبارەوە نـەگوتراوە، چونكـە زۆر بـەڕوونی لەوشەكانو جەووی فەرموودەكەدا دەبینرێ كەقسە لەنوێژكـەرو نوێژنەكـەر ناكـات، بەڵكو لەنوێژكـەری خـاوەن نوێـژی كـامڵ و تـەواوو نوێژكـەرێك كەبەكـەمو كـووڕیو ساردوسڕی نوێژەكانی دەكات، دەدوێ، كەیەكەمیان خوا موژدەو بەڵێنی لێبوردنو بردنە بەهەشتو ئازارو ئەشكەنجە نەدرانی پێداوە، دووەمیشیان خراوەتە نێـوان هیـــواو ئومێـــدی بـــەزەییو لێبوردنـــی خـــواو، تـــرسو بیمـــی تووڕەیـــیو ئەشكەنجەدانییەوە.

**سێ**: ئەو فەرموودەیەش كە(حذیفة بن الیمان) خوا لێـی ڕازی بـێ دەیگێڕێتـەوەو لەكۆتاییی‌یەكەیدا (حذیفة) دەڵێ: (تُنْجِيهِمْ مِنَ النَّارِ) واتە: ئەو خەڵكەی ئـەو ڕۆژگـارە تەنها بـەگوتنی (لا الـه الا الله) لـەئاگری دۆزەخ قوتـار دەبنہناگونجـێ بكرێتـە بەڵگـەی مسـوڵمان بوونـی بابـای نوێژنەكـەر،چونكـە فـەرموودەی گۆڕیـن دەربـارەی ڕۆژگـارو قۆنـاغێكی تایبـەتی دەدوێ كەئیسلامەتی گەیشتۆتە ئاخرو ئۆخری تەمەنی خـۆیو فەسڵی پاییزو گەڵاڕێزانیو، بێگومان حوكمو یاساكانی شەرعیش ڕەچاوی گۆڕانو جیاوازی چاخو سەردەمەكانیان كردوەو بەپێی حوكمی: (لاَيُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إلاَّ وُسْعَهَا) البقرة -٢٨٦- وە حوكمی: (.. فَاتَّقُوا اللهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ..) التغابن -١٦-، ئینسانی مسوڵمان چـەندەی بـۆی بلـوێو لـەتواناو برستـیدا هـەبێ پێویسـتە دینـداری خـۆی بكـاتو ئەركەكانی ئیسلامەتی جێبەجێ بكاتو، ئـەوەی بـۆی نـەگونجێو لـەتواناىدا نـەبێ گلەیی نایەتەسەرو لەسەری تووشی لێپرسرانەوەو ئەشكەنجەو ئازار نابێ.

**چوار**: ئەو فەرموودەیەش کەباسی (شفاعة) دەکات، دیسان ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی مسوڵمان بوونی بابای نوێژنەکەر، چونکە:

یەکەم: (ابن خُزَیْمَة) لەکتێبی (کتاب التوحید)[٣٣] دا باسێکی بەم ناوونیشانە نووسیوە: (بابُ ذِكْرِ الدَّليلِ أنَّ جَميعَ الأخْبارِ الَّتي تَقدَّمَ ذِكْري لَها الىٰ هذا المَوْضِعِ في شَفاعَةِ النَبيِّ ﷺ في إخْراجِ أهْلِ التَّوْحيدِ مِنَ النّارِ إنَّما هِيَ ألْفاظٌ عامَّةٌ مُرادُها خاصٌ)

واتە: (بابەتێك دەربارەی خستنەڕووی بەڵگەو ئیسپات لەسەر ئەوە کە هەموو ئەو فەرموودانەی هەتا ئێرە باسم کردوون لەبارەی تکاکردنی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ لەئاگری دۆزەخ هێنانەدەرو قوتارکردنی ئەهلی ئیمان، سەرجەم ئەو فەرموودانە وشەی گشتین، بەڵام مەبەست پێیان خەڵکێکی تایبەتی‌یە). دیارە مەبەست لەو خەڵکە تایبەتی‌یەش ئەو جۆرە مسوڵمانانەن کەگوناح و تاوانیان هەن، بەڵام شیرك و کوفرو نیفاقیان تێدا نیە، کەببێتە پەرچی شەفاعەت بۆ نەکرانیان، پێشتریش ڕوونمان کردەوە کەنوێژنەکردن هەرچۆنێکی‌بێ شیرك و کوفرە بەدەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

دووەم: بەڵکو هەندێك لەو فەرموودانەی کەباسی (شفاعة) دەکەن بەڵگەن لەسەر ئەوە کە نوێژنەکەر کافرە بۆ وێنە: (..حتّى إذا فَرَغَ اللهُ مِنَ القَضاءِ بَيْنَ عِبادِهِ وأرادَ أنْ يُخْرِجَ مِنَ النّارِ مَنْ أرادَ أنْ يُخْرِجَ مِمَّنْ كانَ يَشْهَدُ أنْ لا اله الاّ الله، أمَرَ المَلائِكَةَ أنْ يُخْرِجوهُمْ فَيَعْرِفونَهُمْ بِعلامَةِ آثارِ السُّجودِ، وحَرَّمَ اللهُ علىٰ النّارِ أنْ تأكُلَ مِنْ ابْنِ آدَمَ أثَرَ السُّجودِ) رواه البخاري.

واتە: هەتا کاتێك کەخوا لەدادگایی لەنێوان بەندەکانەی‌دا تەواوبوو، وە ویستی کە ئەوانەی ویستوویەتی لەئاگر – ی دۆزەخ – قوتاریان بکات لەئاگر بچنەدەرێ لەوانەی کەشایەدی دەدەن کەبێجگە لەخوا پەرستراوێکی‌دیکە نی‌یە، فەرمان بەفریشتەکان دەکات کەقوتاریان بکەن. ئەوانیش بەنیشانەی شوێنەواری کڕنووش بردن دەیاننانسنەوە، وە خوا لەئاگر –ی دۆزەخ – ی قەدەغەکردوە کەشوێنەواری کڕنووش لەئادەمیزاد دا – بسووتێنێ و – بخوات.

کەواتە: لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ کەهەر کەسێك نوێژکەر نەبووبێ و کڕنووشی بۆ خوا نەبردبێ ئاگری دۆزەخ هیچ بەشێك لەجەستەی جەب نادات و هەمووی دەخوات.

---

[٣٣] بڕوانە: (کتاب التوحید) ج٢ کە لەص٧٢٧تا٧٣٤ باسی بەڵگەکانی خۆی کردوە بۆ سەلماندنی ئەو قسەیەی کە کردوویەتە ناوونیشانی ئەو بابەتە.

هەروەها وەك (ابنُ أَبي جَمْرَة) دەڵێ: لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ كە.ـركەسێك نوێژی نەكردبێ هەرچەندە مسوڵمانیش بووبێ لەئاگری دۆزەخ قوتار نابێ چونكە هیچ نیشانەیەكی نیە كەپێی بناسرێتەوە[٣٤] – و پێی لەكافرەكان جیابكرێتەوە –.

سێیەم: ڕستەی: (لَمْ يَعْمَلوا خَيْراً قَطُّ)ش نابێتە بەڵگەی كافر نەبوونی بابای نوێژنەكەر، چونكە:

أ–وەك (ابن خزيمة) دەڵێ: عارەب عادەتیان وایە ئەگەر بیانەوێ كاملی و تێرو تەواوی لەشتێك لابەرن ئەم شێوازی زیادەڕۆیی (مبالغة)یە بەكاردێنن، كەواتە (لم يعملوا خيراً قط) واتە: هیچ خێرو چاكیەكیان بەتەواوی نەكردووە[٣٥].

ب– هەروەك چۆن لەبەر كۆمەڵێك دەقی قوڕئانو سوننەت ناتوانین بڵێین: ئەو چاكە لابراوە (الخَيْرُ المَنْفيّ)یە شایەتمانیش دەگرێتەوە كە ئەوكاتە ئەوانەی كە خوا بەیەكگر (مُوَحِّدْ)یش نین وەبەر شەفاعەت دەكەون. بەهەمان شێوەش كۆمەڵێك دەقی دیكەی قوڕئانو سوننەت هەن ناچارمان دەكەن كەبڵێین: ئەو چاكە نەفیكراوە غەیری شایەتمانو نوێژە فەرزەكانە، چونكە ئەو دەقانەی كەئیمانو شایەتمان هێنان دەكەنە مەرجی بەر تكای پێغەمبەر ﷺ كەوتنو قوتاربوون لەئاگری دۆزەخ، لەگەڵ ئەو دەقانەی كەنوێژكردن دەكەنە مەرج، هیچ جیاوازییان لەنێوان دا نیەو هەر لەیەك سەرچاوەوە هاتوون، كەقوڕئانو سوننەتن.

**پێنجو شەش**: ئەو دوو فەرموودەیەش: (مَنْ شَهِدَ ان لا اله الا الله وحده لاشريك له، وان محمداً عبده ورسولُهُ.. أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ..)، وە (أَسْعَدُ النّاسِ بِشَفاعَتي مَنْ قـال: لا اله الا الله خالِصاً مِنْ قَلْبِه) دیسان نابنە بەڵگەی پێویست نەبوونی نوێژ بۆ بە مسوڵمان لەقەڵەم دانی ئینسان، چونكە:

١– بێگومان ئەم دوو فەرموودەیە – كەفەرموودەی دیكەش لەوبارەوە زۆرن – لەدەقەكانی موژدە (وَعْد)ن كەپێویستە بڕوامان پێیان بێ، بەڵام دەبێ دەقەكانی هەڕەشە (نُصوصُ الوَعيدْ) یشیان بخەینەپاڵ، جا هەروەك چۆن هەڕەشەكانی خوا تەنها بەسەر كەسانێك دا دەچەسپێن كە تۆبە نەكەنو دەستبەرداری خراپەو تاوان

---

[٣٤] بڕوانە/ (فتح الباری) ج١١ص٤٥٧.

[٣٥] بڕوانە: (كتاب التوحيد) ج٢ص٧٣٢.

نەبن، بەهەمان شێوەش موژدەو بەڵێنەکانیشی تایبەتن بەکەسانێکەوە کەئیمانو شایەتمانەکەیان ڕاستەقینەیەو بەس قسەی سەرزارو وتاری بێکردار نیە خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (.. ورحمتي وَسِعَتْ كُلَّ شَيٍ فَسَأَكْتُبُها لِلَّذين يَتَّقونَ ويُؤتُونَ الزكاةَ والَّذينَ هُمْ بِآياتِنا يُؤْمِنون. الَّذِيْنَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النبيَّ الأُمِّيّ..)[٣٦] الاعراف: ١٥٦،١٥٧.

٢- بێگومان مەبەست لەگوتنی: (لا اله الا الله)و شایەتمان هێنان وەك لەهەندێك فەرمووداندا هاتوە (لا اله الا الله) گوتنێکی ساغو ڕاستو بەدڵو شایەتمان هێنانو ئیمانو عەقیدەیەکی ڕاستەقینەی قووڵو دامەزراوە، کەمەرجەکانی هاتبنەدیو هەڵوەشێنەرەوەکان (النواقض)ی نەهاتبنەسەر، ئنجا بێگومان ئیمانو عەقیدەیەکی ئەوتۆش مەحاڵە خاوەنەکەی بەرەو کردەوان نەجووڵێنێ، بەتایبەت نوێژ کە گەورەترین چاکەیە دوای شایەتمان هێنانو سنوورو پەرژینی نێوان ئیمانو شیركو کوفریشە وەك پێشتر باس کراو سەلمێنراش.

**هەوت**: دەعوای هەبوونی یەکدەنگی زانایان (إِجْماعُ العُلَماء)یش ئەگەر گریمان ڕاست بێ هەشبێ ئەوە بەیەکدەنگی هاوەڵان (اجماع الصحابة) خوالێیان ڕازیبێ بەرپەرچ دەدرێتەوەو هەڵدەوەشێتەوە، وەك پێشتر لەهەرکام لە (ابو هريرة)و(عبدالله بن شقيق)ە نەقڵمان کرد، دیارەئیجماعیش چەند پلەیەکە کەبەرزترین پلەیان ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە خوالێیان ڕازیبێ.

کە دەشڵێن: (نەمانزانیوە لەنێو مسوڵمانان دا لەسەر ئەوە کەنوێژنەکەر بەمسوڵمان دادەنرێ. جیاوازی و کێشە هەبووبێ)، ئەوە بێگومان ئەم قسەیە بەئیجماع دانانرێ چونکە: (عَدَمُ العِلْمِ لايَسْتَلْزِمُ عِلْمَ العَدَم) زانیاری نەبوون بەبوونی شتێك نابێتە بەڵگە لەسەر نەبوونی ئەو شتە.

ئنجا بێگومان ئەسڵ لەبابای مسوڵمان دا – لەسەر بناغەی گومانی باش پێبردنی – ئەوەیە کەنوێژکەر بێتو هەتا بەبەڵگەی حاشا هەڵنەگرو ڕوون پێچەوانەی ئەوە نەچەسپێ، هەر حوکم بەو ڕواڵەتە باشەی دەکرێ، دیسان لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەگەر

---

[٣٦] واتە: وە بەزەیيم هەموو شتێکی گرتۆتەوە بەڵام بەتەئکید تایبەتی دەکەم بەوانەوە کەپارێزکاری دەکەنو خۆیان تەزکیە دەکەنو ئەوانەی بڕوایان بەئایەتەکانمان هەیە، ئەوانەی بەشوێن ڕەوانەکراوو پێغەمبەری نەخوێنەدەوار دەکەون.

کەسێك لەمزگەوتیش لەگەڵ مسوڵمانان دا نوێژ نەکات، هەرکاتێك گوتی لەماڵەوە نوێژم کردووە قسەکەی وەردەگیرێ، وەك ئەو فەرموودەیەی (مِحْجَن) گێراویەتەوەو ڕابرد دەیگەیەنێ، وە لەبەرئەوەی تەنها ئەو جۆرە نوێژنەکەرانە بەکافر دادەنرێن کەهیچ کام لەنوێژەکان ناکەن، ئەگەرنا ئەوانەی یەکجاری وازیان لێنەهێناوەو هەندێك جار دەیکەن‌و هەندێك جاریش نایکەن، ئەوە ئەوانە وەك (ابن تيمية) و زانایانی دیکە گوتوویانە: (هەر بەمسوڵمان ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ‌و یاساکانی ئیسلامیان بەسەردا جێبەجێدەکرێن لەمیراتگرتن‌و میرات لێگیران‌و ئەوجۆرە یاسایانەدا)[٢٧] ، بەڵێ لەبەر ئەو هۆیانە کەڕابردن دەعوای هەبوونی ئیجماع لەسەرئەوە کەنوێژنەکەران بەگەشتی وەك مسوڵمان هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ کراوە، پاشان دروست کردنی بەڵگە لەسەر بناغەی ئەو دەعوای ئیجماعە بۆ ئیسپاتی مسوڵمانەتی بابای نوێژنەکەر، قسەو دەعوایەکی لەرزۆك‌و بێهێزو پێزەو، لەوە کەمترە کەبتوانێ دادی بابای نوێژنەکەر بدات‌و دەفریای بێت بۆ ئیسپاتی مسوڵمانەتی خۆی!!

ئەوەش کەدەڵێن: نوێژنەکەر لەسەری پێویستە نوێژەکانی بگێڕێتەوەو ئەگەر بەکافرو هەڵگەڕاوە (مرتد) دانرابایە نوێژو ڕۆژوو گێڕانەوەی نەدەکەوتە ئەستۆ! ئاوا وەڵام دەدرێتەوە:

یەکەم: ئەو کافرەی کەداوای گێڕانەوەی نوێژو ڕۆژووی لێناکرێ کافری ئەسڵی‌یە، کە بۆ یەکەم جار دێتە نێو ئیسلامەوە، ئەمە ئیجماعی لەسەرە کە ئەوەی لەسەردەمی کافرێتی‌دا چواندوویەتی نایگێڕێتەوە، چونکە کەسێك بڕوای بەئەسڵی ئاینی نەبێ داوای جێبەجێکردنی لق‌و پۆپەکانی لێناکرێ (لايُكَلَّفُ بِفُروعِ الدِّيْنِ مَنْ لَمْ يُؤْمِنْ بِأَصْلِهِ)، بەڵام ئەو کەسەی بڕوادێنێ یان دێتە نێو ئیسلامەوەو پاشان لێی هەڵدەگەڕێتەوە، ئەوە زانایان ڕای جیاوازیان هەن لەبارەیەوە، هەندێکیان – وەك شافیعی – دەڵێن: هەرچی چواندوویەتی لەنوێژو ڕۆژوو زەکات دەبێ هەمووی بگێڕێتەوە، هەندێکیشیان دەڵێن لەسەری پێویست نیە بیگێڕێتەوە[٢٨] .

---

[٢٧] بڕوانە: (مجموع الفتاوی) ج٧ص٧١٦، ج٦ص٤٢٩، ج٢٤ص٢٨٧.

[٢٨] بڕوانە: (تعظ[illegible] الصلاة) [illegible] المروزي، ج[illegible]

**دووەم**: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەهەر کەسێك نوێژێك بچوێنێ لەسەری پێویستە بیگێڕێتەوە، جا ئەوانەی بەنەکردنو چواندنی نوێژەکە کابرا کافر دەکەن، ئەوە کردنەوەو گێڕانەوەی نوێژەکەی بەپەشێمان بوونەوەیو گەڕانەوەی بۆ ئیسلام دادەنێن، بەڵام ئەوانەی کەبەکافری دانانێن دەڵێن گوناحبارەو لەسەریشی پێویست دەکەن کەبیگێڕێتەوە[39].

(أبوالوَفاء ابن عَقِيْل) لەوبارەوە گوتوویەتی: (مَنْ كانَ كُفْرُهُ بِتَرْكِ الصَّلاةِ لابِتَرْكِ كَلِمَةِ الإِسْلامِ، فهو اذا عاوَدَ فِعْلَ الصَّلاةِ صارَتْ مُعاوَدَتُهُ لِلصَّلاةِ إِسْلاماً)[40].

**واتە**: هەر کەسێك بەوازهێنان لەنوێژ کافربووبێ نەك بەوازهێنان لەوشەی ئیسلام – شایەتمان – ئەوە هەرکاتێك گەڕایەوە بۆ نوێژکردن دەستت کردنەوەکەی بەنوێژ بەمسوڵمان بوونەوە دادەنرێ.

(ابن تيمية)ش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (مَنْ كَفَرَ بِتَرْكِ الصَّلاة، الأَصْوَبُ أَنْ يَصِيْرَ مُسْلِماً بِفِعْلِها مِنْ غَيْرِ إِعادَةِ الشَّهادَتَيْنِ، لِأَنَّهُ كُفْرُهُ بِالأَمْتِناعِ كَأبليس)[41]

**واتە**: هەرکەسێك بەنوێژنەکردن کافربووبێ، ڕای ڕاست تر ئەوەیە کەبەنوێژکردن بەبێ شایەتمان هێنانەوە مسوڵمان دەبێتەوە، چونکە کوفرەکەی بەهۆی سەرپێچیو نەکردنەوە بووە وەك ئیبلیس.

**خوێنەری سەنگین!**

ئێستاکە یەك یەکی ئەو حەوت بەڵگانەمان هەڵسەنگاندو لەمەحەك دا کەبەدەست ئەوانەوەن کەنوێژنەکەر لەڕووی ئیهمالیو تەنبەڵی‌یەوە بەکافر دانانێن، دەچینە سەر برگەی دووەمی ئەو باسەو ڕەخنەو تەئویلەکانی کۆمەڵی ناوبراویش دەتوێژینەوەو هەڵدەسەنگێنین بۆئەوەی وردە وردە لەکۆتایی ئەم خاڵی چوارەمە (حوکمی کردنو نەکردنی نوێژ) نزیك ببینەوە:

---

[39] بروانە: (سەرچاوەی پێشوو ج٢ص٩٩٦.

[40] بروانە: (بدائع الفوائد) لابن القيم ج٣ص٢١٢.

[41] بروانە: (الاختيارات الفقهية) لابن تيمية ص ٣٢.

## بڕگەی دووەم: وەڵامی ڕەخنەو تەئویلەکانیان:

**یەك:** ئەوە کەدەڵێن: (مەبەست لەوشەی کوفر لەو فەرموودانەدا کەباسی کوفری نوێژنەکەر دەکەن کوفری نیعمەتە "کفران النعمة"!!) قسەیەکی هەڵەیە، چونکە کوفری نیعمەت کە لەزمانی کوردیدا چەند وشەیەکی وەك/: سپڵەیی، بێنمەکی، بێوەفایی، بێسفەتی، پێنەزانی، بۆ بەکاردێنن، دوو جۆرە:

ا-لەنێوان بەندەو خوای پەروەردگاردا، وەك ئەوەی خوای بەخشەر لەش ساغی، یان ماڵو سامان، یان عەقڵو دانایی، یان زانست بەکەسێك ببەخشێ کەچی ئەوکەسە لەجیاتی سوپاسو ستایشی خوای لەسەربکاتو لەخوای بزانێ، پێی لەخۆی بایی بێتو شانازی پێوە بکاتو هیچ حیساب بۆ خوا نەکات!

بۆ وێنە: (قارون) کەخوا ماڵو سامانێکی زۆری بەمەبەستی تاقیکردنەوە پێبەخشیبوو لەوەڵامی گەلەکەیدا کەئامۆژگارییان کرد پێیان گوت: (لاتَفْرَحْ! انَّ الله لايُحِبُّ الفَرِحِيْنَ. وَٱبْتَغِ فِيْمَا آتاكَ الله الدَّارَ الآخِرَةَ ولاتَنْسَ نَصِيْبَكَ مِنَ الدُّنْيا وأَحْسِنْ كَما أَحْسَنَ الله اِلَيْكَ، ولاتَبْغِ الفَسَادَ في الأَرْضِ انَّ الله لايُحِبُّ المُفْسِدِيْنَ) القصص -٧٦،٧٧-،

**واتە:** لەخۆت بایی مەبە خوا لەخوابایی بووانی خۆش ناوێن، وە بەوە کەخوا پێی بەخشیوی مەنزڵی دواڕۆژ وەدەست بێنەو بەشی - ژیان و گوزەرانی - خۆشت لەدنیا فەرامۆش مەکە وە وەك چۆن خوا چاکەی لەگەڵ کردوی تۆش چاکەکاری - لەگەڵ خەڵکیدا - بکە، وە بەدوای خراپەکاری مەکەوە لەزەویدا چونکە بێگومان خوا حەز بەچارەی بەدکاران ناکات! بەڵێ قارونی سەرکەشو لەخۆبایی زۆر سپڵەو بێئەمەکانە لەبەرانبەر خوادا گوتی:

(.. اِنَّما أُوتِيْتُهُ عَلىٰ عِلْمٍ عِنْدِي..) القصص -٧٨-،

**واتە:** بێگومان - ئەو ماڵو سامانەی کەهەمە - تەنها بەهۆی زانیاریو شارەزایی خۆمەوە هاتۆتە دەستم..

ئەوە جۆری یەکەمی سپڵەییو کوفری نیعمەت کەقارون نموونەی هەرە زەقی ئەوجۆرە سپڵەییو بێوەفایییە.

ب-جۆری دووەمی سپڵەییو کوفری نیعمەت بریتییە لە سپڵەییو بێوەفاییو چاکە لەبەرچاو نەبوونی ئینسانەکان لەگەڵ یەکترو لەنێو خۆیان دا، پێغەمبەری خوا

ﷺ دەربارەی گرنگیی و گەورەیی وەفاداریی ئەمەکی بەندەکان لەبەرانبەر چاکەکاری یەکتردا فەرموویەتی: (لايَشْكُرُ اللهَ مَنْ لايَشْكُرِ النّاسَ) اخرجه البيهقي[42]

واتە: ئەوەی بەرانبەر بەچاکەی خەڵکی وەفای نەبێ وەفای بۆ چاکەی خواش نیە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەربارەی سپڵەیی زۆربەی ژنان بەرانبەر بەمێردەکانیان وەك بێدارکردنەوەیان پێی فەرموو ون: (إنَّكُنَّ تكْثِرْنَ اللَّعْنَ وتَكْفُرْنَ العَشِيْرَ وذلِكَ أنْ تَغضَبَ إحْداكُنَّ فتَقولَ: مارَأيْتُ مِنكَ خَيْراً قَطّ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: ئێوە - ئەی ژنینە! - زۆر نەفرین لەشت دەکەن و سپڵەیی بەرانبەر بەمێرد دەکەن ئەویش ئەوەیە کەئەگەر یەکێکتان قەڵس بوو دەڵێ: هەرگیز خێرو خۆشیم لەتۆ نەدیوە!

بەڵێ کوفری نیعمەت ئەمەیەو ئاوایە، بەڵام بەهیچ ڕەنگێك ئەو فەرموودانەی باسی کوفرو شیرکی نوێژنەکەر دەکەن ناکرێ و ڕێی تێناچێ کەبەسپڵەیی و کوفری نیعمەت مانا بکرێن، بۆ وێنە فەرموودەی: (انَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وبَيْنَ الشِّرْكِ والكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاةِ) رواه مسلم،

چ پەیوەندیەکی بەکوفری نیعمەتەوە هەیە؟!!

دوو: وە ئەوە کە: {کوفری نوێژنەکەر کوفری گچکەیەو کوفرێکە لەخوار کوفری گەورەوە}، دیسان قسەیەکی بێهێزو پێزە، چونکە وشەی (کفر) لەو فەرموودەیەدا کە بەبەڵگە هێنراوەتەوە لەسەر ئیسپاتی کافرێتی نوێژنەکەر (مُعَرَّفٌ) ە - واتە ئەلیف و لامی لەسەرە - کەئەوش دەلالەت لەسەر تایبەتمەندێتی و زانراوێتی (التَّخَصُّص والعَهْد) دەکات و ڕێ لەوەدەگرێ کەجگە لەکوفری ڕاستەقینەو تەواوو زانراو جۆرێکی تر مەبەست بێت.

وە وێڕای ئەوەش فەرموودەی: (العَهْدُ الَّذي بَيْنَنا وبَيْنَهم الصَّلاةُ فَمَنْ تَرَكَها فقَدْ كَفَرَ)ش نوێژی کردوە بەدیوارو سنووری نێوان مسوڵمانان و غەیری خۆیان و بێجگە لەکوفری گەورەش هیچ جۆرە کوفرێکی تر - مەبەست کوفری گچەکەو کوفری نیعمەتە - ناگونجێ بکرێتە سنوورو نێوانی بەینی مسوڵمانان و غەیری خۆیان، چونکە دەگونجێ ئینسان مسوڵمانیش بێت و ئەوجۆە کوفرانەشی تێدابن، کە ئەم فەرموودانە باس لەوجۆرە کوفرانە دەکەن: (سبابُ المُسْلِمِ فُسوقٌ وقِتالُهُ كُفْرٌ) وە (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ)، وە (إثْنَتانِ في النّاسِ هُما بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ في النَّسَبِ والنِّياحَةُ علىٰ المَيِّتِ) رواه مسلم.

---

[42] بڕوانە: (الآداب) للبيهقي ص٧٨.

**سێ:** وه ئەو قسەیەیان کەدەڵێ (ئەو فەرموودانەی کەباسی کافربوونی نوێژنەکەر دەکەن ئەوە زیاتر مەبەست پێیان هەڕەشەو ترساندنو سڵەماندنەوەیە نەك حەقیقەتی کافربوونو لەئایین دەرچوون)، قسەیەکی هەڵەو ناقۆڵایەو وادیارە ئەوانەی دەیکەن باش لێیورد نەبوونەوە چونکە سەرەنجامێکی زۆر خراپو مەترسیداری هەیە، بابزانین چۆن؟:

ا- هیچ گومانی تێدا نیە کە گەلێك لەدەقەکانی قورئانو سوننەت هەڕەشەو ترساندنیان تێدایە، بەڵام بەتەئکید هەرچی خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانە لەسەداسەد (١٠٠/١٠٠) راستو دروستەو بێ پێچو پەنایە، خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی:

(وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقاً وعَدْلاً..) الانعام -١١٥-،

**واتە:** وە فەرمایشتی پەروەردگارت لەڕاستیو دادگەریدا تەواوی کردوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (.. إِنِّي لا أَقُولُ إِلاّ حَقّاً) رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، **واتە:** بێگومان من بێجگە لەهەق نابێژم.

ب- ئاشکرایە بڕواهێنان بەدەقە شەرعییەکان - کەدەقەکانی موژدەو ترساندن (النصوص الوعد والوعيد) بەشێکیانن - وا داخواز دەکات کەبەمل کەچیو تەسلیم بوونو بەگەورەگرتنو ڕێزلێگرتنەوە ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ، پێشینی چاکمان (سلفنا الصالح) ئەوە عادەتیان بووە، بۆ وێنە: "(جارێکیان پیاوێك بە"زهري" گوت: ئایا ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ: (لَيْسَ مِنّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ..) رواه الخاري، وە (لَيْسَ مِنّا مَنْ لَمْ يُوَقِّرْ كَبِيْرَنا..) رواه الترمذي وابن ماجه، وە وێنەی ئەمانە چۆنن؟! زوهریش ماوەیەك ڕاماو پاشان سەری بەرز کردەوەو گوتی: (مِنَ اللهِ عَزَّ وجَلَّ العِلْمُ، وعلى الرَّسُولِ البَلاغُ، وعَلَيْنا التَّسْلِيْمُ)."[٤٢]

**واتە:** لەخوای زاڵو پایەبەرزەوە زانیاری -فێرکردن - و لەسەر پێغەمبەر ڕاگەیاندنو لەسەر ئێمەش - وەرگرتنو - تەسلیم بوون.

ج- ئنجا لەڕاستیدا هەرکەسێك بڵێ فڵانە ئایەت یان فڵانە فەرموودە تەنها بۆ هەڕەشەو ترساندن (التغليظ والتخويف)ەو حەقیقەتی نیەو لەدونیای واقیع دا

---

[٤٢] بڕوانە: (السنة) للخلال ج٣ص٥٧٩

نایەتـەدی! ئـەوە جگـە لـەوەی کەتـەنـها بـەدوای گومـان کـەوتوەو بێجگـە لەخـەیاڵو عاتیفەی خۆی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە: (إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وما تَهْوَى الأَنْفُسُ..) النجم -٢٣- بەڵێ وێڕای ئەوە خۆیشی گیرۆدەی دەردێکی زۆر بێرەزاو کوشندە کردوە، کەبریتیە لەپووکاندنەوەو لەبەین بردنی شەریعەت !! چونکە ئەگەر هەڕەشە لێکردنی مسوڵمانان دروست بێ هەڕەشە لێکردنی کافرو مونافیقانیش دروستەو، ئنجا ئەگەر هەڕەشـەو ترسـاندنی نـاواقیعیو بـۆش دروسـت و ڕەوابـێ. دیـارە گفـتو بـەڵێنو موژدەش بەهەمان شێوە دروستە! دیارە ئەمەش سەرەڕای ناماقووڵ بوونی مایـەی لەئایین دەرچوونیشە، چونکە بەدرۆزانین (تکذیب)ی فەرموودەی خوا - و پێغەمبەری خـوا - یـە، وەك (ابـن حـزم الظـاهري) گوتوویـەتی[٤٤] ، هـەروەها (ابـن تیمیـە)ش گوتوویەتی:

(.. بەهەرحاڵ خۆشل کردنو ڕۆیشتن لەگەڵ قسەی ئەو کەسەدا کەدەڵێ ئەمە هەر هەڕەشەیە بۆ ترساندنو حەقیقەتی نیە، سەردەکێشێ بۆ کارپێنەکردنی شـەریعەتو هەڵوەشاندنەوەی تۆڵەو سزا..)[٤٥] .

دیارە ناقۆڵاییو ناماقووڵی ئەوجۆرە قسانەش کەڕەنگە کەسانێکی کەم شارەزاو قووڵ نەبووەوە لەقورئانو سوننەت دا، یان خوانەکردە ئیمان کزو دڵنەخۆش کردبیانن بۆتە هـۆی تووڕەیـیو نارەزاییو بێزاری زۆر لـەزاناو پێشـەوایانی ڕۆچـوو و خـاوەن جورئەت وێڕای (ابن حزمو ابن تیمیة) خوا لەهەموویان خۆش بێ بۆ وێنە:

هەر کام لە: (أبو عُبَيْد القاسم بن سَلاَمْ)[٤٦] و (فُضَيْل بن عِياضْ)[٤٧] و(قاسمي)[٤٨] زۆر بەتوندی بەگژ ئەو کەسانەدا چوونو ڕەخنەیان لـێگرتوون کە ئـەوجۆرە بۆچوونـەیان دەربارەی دەقەکانی هەڕەشە (نصوص الوعید) هەیە.

---

[٤٤] بڕوانە: (الأُحكام)ی ابن حزم ج١ص٢٨٣

[٤٥] بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج١٩ص١٥٠.

[٤٦] بڕوانە: (الایمان) لابي عبيد ص٨٨.

[٤٧] بڕوانە: (السنة) لعبدالله بن احمد بن حنبل ج١ص٢٧٧.

[٤٨] بڕوانە: (تفسير القاسمي المسمّى بـ(محاسن التأويل) ج٣ص٥٣٦، ٥٣٧.

**چوار:** ئەو قسەیەشیان کەدەڵێ: (مەبەست لەو دەقانە کەنوێژنەکەر بەکافر دادەنێن ئەوەیە کەبابای نوێژنەکەر لەهەندێك لەحوکمەکانی کافران دا بەشدارە کەحەڵاڵ بوونی خوێنی و فەرزبوونی کوژرانیەتی) وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئایا بەڵگەتان چی یە لەسەر ڕەوابوونی کوژرانی بابای نوێژنەکەر لەحاڵێك دا کەبەکافری دانانێن؟! مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە: (**لايَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ الا بِاحْدَى ثَلاثٍ: (الثَّيِّبُ الزَّاني، والنَّفْسُ بالنَّفْسِ، والتَّارِكُ لِدِيْنِهِ المُفارِقُ لِلْجَمَاعَة**)رواه البخاري ومسلم.

**واتە:** خوێنی هیچ ئینسانێکی مسوڵمان مەگەر بەیەکێك لەم سێیانە ئەگەرنا حەڵاڵ نیە - و نابێ بکوژرێ - : هاوسەردارێکی زیناکەر، تۆڵەی نەفسێك، وازهێنەرێك لەئایینەکەی و جیابووەوەیەك لەکۆمەڵی مسوڵمانان.

(ابن حزم الاندلسی) لەو بارەوە گوتوویەتی: (.. بەڵام مالیكو شافیعی ئەوان ڕایان وایە کەنوێژنەکەر مسوڵمانە چونکە ماڵەکەی دەکەنە میراتی منداڵەکانیو نوێژی لەسەر دەکەنو لەگۆڕستانی مسوڵمانان دا دەینێژنو لەهاوسەرەکەی جیای ناکەنەوەو وەصیەتەکەی جێبەجێ دەکەنو میراتی ئەو خزمانەی پێدەدەن کەبەرلەوی مردوون، جا ئەگەر ئەوە وابێ ئەوە ئەو قسەیان کەدەڵێن دەبێ بکوژرێ بۆش دەرچوو چونکە خوێنی هیچ ئینسانێکی مسوڵمان بەیەکێك لەسێ شتان نەبێ حەڵاڵ نابێ: کافربوونی دوای ئیمان یان زیناکردنی دوای هاوسەرداری، یان نەفس بەنەفس، جادیارە ئەو نوێژنەکەرەش کە بەئانقەست نوێژەکانی ناکات، لەدوو حاڵ بەدەرنیە، یان بەنوێژنەکردنەکەی کافربووە، یان کافرنەبووە، جا ئەگەر کافربێ ئەوە ئەوان - مالیكو شافیعی - ڕایان وانیە چونکە ئەگەر ڕایان وابووایە دەبوو لەهەموو شتێك دا حوکمی هەڵگەڕاوە (مرتد) یان بەسەردا چەسپاندبایە، لەجیاکردنەوەی لەهاوسەرەکەیو باقی شتەکانی دیکە، ئنجا مادام کافرنەبێو، کوژەر نەبێو، زیناکەرێکی هاوسەردار نەبێو، شەڕکەر (محارب) نەبێو، سێجاران سزای مەیخۆری بەسەردا نەچەسپێنرابێ، ئەوە بەدەق - ی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ - خوێنی حەرامە، کەواتە: قسەکەیان بەتەئکیدێك کەگومانی تێدا نیە، هەڵە دەرچوو)[49].

---

[49] بڕوانه: (المحلّى) لابن حزم، ج١١، ص٣٧٦-٣٧٧.

پێنج: قسەی کۆتاییشیان کەدەڵێ: (مەبەست لەوجۆرە فەرموودانە کەسێکە کە نوێژنەکردن بەحەڵاڵ بزانێ، یان بڕوای بەفەڕزبوونی نوێژ نەبێ)، لەوەڵامیدا دەڵێین:

أ-فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کافربوونی بابای نوێژنەکەریان بەخودی نوێژنەکردن (ترك الصلاة)ەکەوە بەستۆتەوە، کەواتە هۆکاری کافربوونەکە نوێژنەکردنە جا کەیفی خۆیەتی ئەو نوێژنەکردنە لەڕووی بڕواپێنەبوون و دان پێدانەهێنانەوەیە، یان لەڕووی گوێ‌پێنەدان و تەنبەڵییەوە کەواتە ئەو کەسەی کەدەڵێ نوێژنەکەر تەنها کاتێك کافردەبێ کەبڕوای بەفەڕزبوونی نوێژ نەبێ یان بڕوای پێبێ بەڵام دانی پێدانە هێنێ، ئەوە بەبێ بەڵگە دەستکاری فەرموودەی پێغەمبەری کردوەو شتێکی کردوە بەهۆکاری کافربوونی نوێژنەکەر کەپێغەمبەر ﷺ کوفری بابای نوێژنەکەری بەوەوە تایبەت نەکردوە.

ب-ئنجا ئەگەر بێت و ئاوا ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ تەئویل بکەین ئەوکاتە هیچ جیاوازییەك لەنێوان نوێژو غەیری نوێژدا نامێنێ و، ئەوکاتە نوێژکردن ئەو سنوورو پەیمان و درووشمە نابێ کەپێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی بەناسێنەری مسوڵمانان و جیاکەرەوەی دیندارو بێدینان لەیەکتر.

بەڵێ هەرکەسێك درووشمێك لەدرووشمەکانی ئیسلام یان یەکێك لەفەڕزە ئاشکرایەکانی بەدرۆ دابنێ، یان دان پێدا نەهێنێ ئەوە بەیەکدەنگی زانایان (اجماع العلماء) کافر دەبێ، کەواتە بڕواپێنەبوون و دان پێدانەهێنان تایبەت نیە بەنوێژەوە، بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ خودی نوێژنەکردنیان بەکوفر داناوە، وەك (ابوهريرة)و(عبدالله بن شقيق العقيلي) خوالێیان ڕازیبێ لێیان گێڕاوەنەوەو پێشتریش باسمان کرد.

خوێنەری بەڕێز! ئێستاش لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوە [°] پشوو درێژانەیەدا کەدەربارەی حوکمی‌کردن و نەکردنی نوێژ کردنمان، بەپێویستی دەزانم بیروڕای کۆتایی خۆم دەربارەی ئەم مەسەلە گرنگە لەسێ (٣) بڕگاندا بەگوشراوی بخەمەڕوو:

---

[°] بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودێکی باشم لەکتێبی: (نواقض الأيمان القوليّة والعمليّة) وەرگرتووە، کەنووسراوی: (د. عبدالعزيز بن محمد بن علي العبداللطيف)ە، بڕوانە باسی (ترك الصلاة) لەلاپەڕە (٤٥٠) تا (٤٩٨) [illegible]

أ) لەئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بەڕوونی دەبینرێ کەئەو ڕایە زۆر بەهێزترو بەڵگەدارترە کەدەڵێ نوێژنەکەری گوێپێنەدەرو تەنبەڵ کافرە، لەو ڕایەی دیکە کەبەمسوڵمانێکی گوناحباری دەزانێ، بەڵام کۆمەڵێك دەقیش لەقورئان و سوننەت ڕێگامان نادەن کەهەموو نوێژنەکەرێك تێکڕاو بەموتڵەقی بەکافر دابنێین، بەڵکو ناچارمان دەکەن بڵێین: تەنها ئەو نوێژنەکەرانە کافرن کەبەموتڵەقی و لەبنەڕەتدا نوێژناکەن، یان لەزۆربەی حاڵان دا نایکەن، یان سوورن لەسەر نەکردنی، نەك هەرکەسێك نوێژێك یان چەند نوێژێکی نەکردن کافر بێت، بەکورتی: موتڵەقی نوێژنەکردن مسوڵمانی پێکافر نابێ، بەڵکو نوێژنەکردنی بەموتڵەقییە یان نزیك لەو حاڵەتەوە کەئینسانی پێ لەئاینی دەردەچێ، ئەمەش چەند دەقێك کە پاڵپشتی ئەم ڕایە دەکەن و، دەشگونجێ هەموو دەقەکان لەسەر ئەم ڕایە پێك بگەن:

ا-(فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا) مريم -٥٩-، کەهەرکام لە (محمد کعب القرظي)و(زیدبن اسلم)و(سدي)و(ابن جریر الطبري)و(ابن کثیر) دەڵێن مەبەست لەنوێژبەزایەدا (تضیع الصلاة) لێرەدا نەکردنیەتی بەموتڵەقی و یەکجارەکی[٥١]، نەك چواندن و نەکردنی جاروبار.

ب-(خَمْسُ صَلَوَاتٍ إِفْتَرَضَهُنَّ اللهُ مَنْ أَحْسَنَ وُضُوْءَهُنَّ وَصَلاهُنَّ لِوَقْتِهِنَّ وَأَتَمَّ رُكُوعَهُنَّ وَخُشُوعَهُنَّ كَانَ لَهُ عَلَى اللهِ عَهْدٌ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلَيْسَ لَهُ عَلَى اللهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ)رواه احمد وابوداود والنسائي ومالك وابن ماجه وابن حبان.

کەدیارە مەبەست لەڕستەی: (ومن لم یفعل) هەرکەسێك وای نەکرد، یانی هەرکەسێك نوێژەکانی بەتێرو تەواوی نەکردن و کەم و کووڕییان تێدا هەبوو، چونکە فەرموودەکە باسی نوێژکردنی کامڵ و تەواو دەکات کە لەڕووی دەست نوێژو کات و ڕکووع و گەردن کەچییەوە تێرو تەواوە، جادیارە لەبەرانبەر (نوێژکردنی کامڵ)دا (نوێژنەکردنی ناتەواو) هەیە نەك (نوێژنەکردنی موتڵەق و یەکجارەکی)!! ئنجا ئاشکراشە کەنوێژکردنی کرچ و کاڵ و ناتەواو دەگونجێ ناتەواوییەکە لەخودی نوێژەکان دابێ و دەشگونجێ لەژمارەو کاتەکانیان دابێ، واتە هەندێکیان نەکات و بچوێنێ، یان لەکۆتایی کاتەکانیان دا بیانکات.

---

[٥١] بڕوانە: (جامع البیان) للطبري ج١٦ ص٦٦، و(تفسیر القرآن العظیم) لابن کثیر ج٣ص١٢٥.

ج- (إنّ أوّلَ مايُحَاسَبُ به العَبْدُ صلاتُهُ، فإنْ أتمّها، والاّ نُظِرَ هلْ لَهُ مِنْ تطوّعٍ فإنْ كانَ لَهُ تَطوّعٌ أُكْمِلَتِ الفَرِيْضَةُ مِنْ تَطوّعِه، ثُمّ تُرفَعُ سائِرُ الأعْمالِ علىٰ ذٰلِكَ) رواه احمد وابن ماجه والبغوي وصححه الالباني[52].

واته: بێگومان یەكەمین شت كەبەندە لەسەری دادگایی دەكرێ نوێژەكەیەتی، جا ئەگەر بەتەواوی كردبێتی، ئەگەرنا تەماشا دەكرێ ئایا سوننەتی هەن، جا ئەگەر - نوێژی - سوننەتی هەبن ئەوەنوێژە فەرزە - ناتەواوە - كانی بەنوێژە سوننەتەكانی تەواو دەكرێن، پاشان كردەوەكانی دیكەش هەر بەوجۆرە لێپرسینەوەیان لەسەردەكرێ.

(شوكاني) دەربارەی ئەم فەرموودەیە گوتوویەتی: (ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ كە ئەگەر ناتەواوی لەنویژە فەرزەكان دا هەبێ سوننەتەكان پڕی دەكەنەوە، وە دانەریش واتە خاوەنی كتێبی (المُنْتَقىٰ) كە باپیری (ابن تیمیة) یە - لەریزی بەڵگەكانی ئەوانەدا ئەم فەرموودەیەی هێناوە كەدەڵێن نوێژنەكەر كافر نیە، چونكە كەمو كووڕی نوێژە فەرزەكان، دەگونجێ لەخودی نوێژەكان دابێ كەبریتیە لەچواندنی هەندێكیان، وە دەشگونجێ لەسیفەتەكانیان دابێ كەتەواونەكردنی زیكرەكانیان یان فەرزەكانیانە، ئنجا قەرەبووكرانەوەو كامڵ كرانیان بەسوننەتەكان ئەوەی لێدەفامرێتەوە كە ئەو جۆرە نوێژانە وەردەگیرێن و پاداشتیان لەسەر دەدرێتەوەو ئەمەش لەگەڵ كوفردا ناگونجێ).[53]

أ) دروست نیە حوكمی كوفر بەسەر ئەو نوێژنەكەرانەدا بدرێ كەلەوجۆرە كەسانەبن بگونجێ بەپاساوی نەزانی (العُذْرُ بِالجَهْلِ) بپەرنەوە، جا ئەو نوێژنەكەرانە چ لەوانە بن كەزانایان لەسەر كافربوونیان یەكدەنگن، وەچ لەوانەبن كەلەسەر كافربونو كافرنەبوونیان جیاوازیان لەنێوان دا هەیە، ئنجا بێگومان ئەو دووربینی (احتیاط) یەش لەبەكافردانان (تكفیر)ی ئەوانەدا كەهۆیەكی كافركەر (مُكَفِّر)یان تێدا دەبینرێ، تایبەت نیە بەنوێژنەكردنەوە بەڵكو ئەمە بنچینەیەكی گشتی (قاعدة عامة) یەو سەرجەم زانایان بەبێ جیاوازی لەسەری ڕێك كەوتوون، بۆ وێنە (ابن تیمیة) لەوبارەوە

[52] بڕوانە: (سلسلة الاحادیث الصحیحة) ج٣ ژمارە: (١٣٥٨).
[53] بڕوانە: (نیل الاوطار) ...٣٧٥...

گوتوویەتی: (وَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُكَفِّرَ أحداً مِنَ المُسْلِمِيْنَ وإِنْ أَخْطَأَ وغَلطَ حتّى تُقَامَ عليهِ الحُجّةُ وتُبَيَّنَ لَهُ المَحَجّةُ وَمَنْ ثَبَتَ إِسْلامُهُ بِيَقيْنٍ، لَمْ يَزَلْ ذلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ، بَلْ لايَزولُ الاّ بَعْدَ اِقامَةِ الحُجَّةِ وإزالَةِ الشُّبْهَةِ)[٥٤] .

**واتە**: وەهیچ کەس بۆی نیە کەیەکێك لەمسوڵمانان بەکافر دابنێ هەرچەندە هەڵەو پەڵەشی هەبن، هەتا بیانووبڕ دەکرێ و ڕێبازی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، وەهەرکەسێك مسوڵمانەتی‌یەکەی بەمسۆگەری دامەزرابێ بەگومان لێی لاناچێ، بەڵکو هەتا بەتەواوی بەڵگەی نەخرێتە بەرچاوو شوبهەکانی لانەبرێن هەر بەمسوڵمان دادەنرێ.

هەروەها (محمد بن عبدالوهاب) گوتوویەتی: (ومسألة تكفير المُعَيَّن مَسْأَلَةٌ مَعْرُوفَةٌ إِذا قال قَوْلاً يكونُ القَوْلُ به كُفْراً، فَيُقالُ: مَنْ قال بهذا القَوْلِ فَهُوَ كافِرٌ، ولٰكِنْ الشَّخْصُ المُعَيَّنُ اذا قال ذلِكَ لايُحْكَمُ بِكُفْرِهِ حتّى تَقُومَ عَلَيْهِ الحُجَّةُ الّتي يُكَفَّرُ تارِكُها)[٥٥]

**واتە**: وە مەسەلەی بەکافردانانی کەسێکی دیاریکراو مەسەلەیەکی زانراوە، ئەگەر قسەیەکی کرد (یان ڕەفتارێکی کرد وەك نوێژ نەکردن)[٥٦] کەپێی کافر بێت، دەگوترێ: هەرکەسێك ئەم قسەیە بکات ئەوە کافرە، بەڵام کەسێکی دیاریکراو ئەگەر هەمان قسەی‌کرد یەکسەر حوکمی کوفری بەسەردا نادرێ، هەتا بیانووی نەبڕرێ و بەڵگەیەکی وای نەخرێتە سەر کەهەر کەسێك ملی بۆ نەدات بەکافر دابنرێ.

**٣**)مادام بەکافر دانرانی نوێژنەکەری کەمتەرخەمو تەنبەڵ (التاركُ الصلاة المُهْمِلُ والكَسْلان) لەنێو زانایانی پێشین و پاشین (علماء السلف والخلف) کەم‌وزۆر کێشەو مشت‌ومڕی لەسەربووبێ و ئێستاش لەسەری بێ، مەگەر لەولاتێك دا کەسەرجەم زانایەکانی ئەو ڕاو بۆچوونەیان هەڵبژاردبێ و (تَبَنّي) کردبێ کە ئەوجۆرە کەسانە بەکافر دادەنێ و خەڵکیشیان لێ‌تێ‌گەیاندبێ و جوان بۆیان ڕوون کردبنەوە، ئەگەرنا، دروست نیە بەگشتی لەسەر بناغەی ئەو ڕاوبۆچوونە هەڵس‌وکەوت لەگەڵ نوێژنەکەران دا بکرێ و حوکمی کوفریان بەسەردا بدرێ و هەموو ئەو یاسایانەی کەلەسەر ئەو حوکمە بنیات دەنرێن بەسەریان دا جێ‌بەجێ بکرێن چونکە وەك پێشتر

---

[٥٤] بڕوانە: (مجموع الفتاوىٰ) ج١٢ ص٤٦٦.

[٥٥] بڕوانە: (الدُّرَرُ السنية) ج٨ص٢٤٤.

[٥٦] ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردووە

باسکراو ڕوون کرایەوە مەسەلەی کافربوون یان نەبوونی نوێژنەکەری کەمتەرخەم مەسەلەیەکی خیلافی‌یەو، لەمەسەلە خیلافی‌یەکانیش دا مەگەر لەڕووی دواندن‌و قەناعەت پێ‌هێنانەوە ئەگەرنا کەس بۆی نیە یەکێکی دیکە سەرکۆنە بکات لەسەرئەوە کەڕای زانایەکی دیکەی پەسەند کردووەو، هەمان بۆچوون کە ئەو زانایەی ئەو پەیڕەوی لێ‌دەکات قبووڵ ناکات‌و هەڵنابژێرێ !

هەڵبەتە تا تەرازوویەکیش کەپێشەواو زانایانی وەك: (ابو حنيفه و مالك و شافعي) تێیدابن[٥٧] ، کە پێشەواو سەرمەزەبی سێ مەزهەب لەچوار مەزهەبە فیقهی‌یە نووسراوەکەی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتن (المذاهب الأَربعة الفقهية المُدَوَّنة لأَهْل السنة والجماعة)[٥٨] وەچەندان زاناو پێشەوای دیکەی وەك: (ابن حزم الاندلسي)[٥٩] و (محمد علي الشوكاني)[٦٠] تێدابن، هیچ کەس ناتوانێ بەکەمی بگرێ‌و حیسابی بۆ نەکات!

پێشم وایە ئەوەی کە لەم سێ‌خاڵەدا بەگوشراوی نووسیم سەرەنجامێکە کەڵکی ئەوە دەگرێ کەمسوڵمانان بەگشتی - شوێن کەوتووی هەر مەزهەبێك‌و پەیڕەوی هەر زانایەکی جێی ئیعتبار بن - لەسەری پێك بێن‌و ڕێك بکەون.

ئەلێرەش دا کۆتایی بەتوێژینەوەی ئەم خاڵی چوارەمە (حوکمی کردن‌و نەکردنی نوێژ) دێنین‌و دەچینە سەر خاڵی پێنجەم:

---

[٥٧] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) للنووي ج٣ص٣٧.

[٥٨] مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامییش کەبەمەزهەبی جەعفەری خۆیان ناودەبەن، دەربارەی حوکمی نوێژنەکەری کەمتەرخەم (مُهْمِلْ) دەڵێن: (هەر کەسێك فەرزێکی وەك نوێژو زەکات‌و پێنج یەك (خُمْس)و ڕۆژوو حەج نەکات، حاکم بەئیجتیهادی خۆی تەمبێی دەکات، جا ئەگەر وازی‌هێنا ئەگەرنا بۆ جاری دووەم تەمبێ دەکرێ، ئەگەر باش بوو و گەڕایەوە، ئەگەرنا بۆ جاری سێیەم و ئەگەر هەر بەردەوام بوو جاری چوارەم دەکوژرێ). بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) ص٧٧، محمد جواد مغنية.

[٥٩] بڕوانە: (المُحَلَّى) ج٢ص٢٢٦.

[٦٠] بڕوانە: (نَيْلُ الأَوْ[illegible]) ج١ص٣٧

# خاڵی پێنجەم: بەرپاکردنی نوێژ (اقامة الصلاة)

# چی‌یەو چۆنە؟!

خوای زاناو شارەزا بەپەنهان و ئاشکرا هەرجارێك باسی نوێژکردنی کردبێ تەنیا یەك جۆرە تەعبیری بۆ بەکارهێناوە کەبریتیە لەبەرپارکردن (اقامة)! وشەی ناوبراویش زیاتر لە(٥٠) جار لەقورئانێدا هاتوە بەهەموو شێوەکانی‌یەوە.

جا باپێشەکی بزانین نوێژبەرپاکردن (اقامة الصلاة) یانی چی‌و، بۆچی ئەم شێوە تەعبیرە هەڵبژێرراوە؟! پاشان دەچینە سەر باسی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەرپاکردنی نوێژ.

(راغب الاصفهاني) لەبارەی وشەی (اقامة الصلاة) ەوە گوتوویەتی[٦١]:

(واقامة الشي تَوْفيَةُ حَقِّهِ، وقال: "قُلْ ياأَهْلَ الكِتابِ لَسْتُمْ علىٰ شَيْءٍ حَتَّى تُقيمُوا التَّوْراةَ والأِنْجِيلَ" أي تُوَفُّونَ حُقُوقَهُما بالعِلْمِ والعَمَلِ.. ولَمْ يَأمُرْ تعالىٰ بالصَّلاةِ حَيْثُما أَمَرَ ولامَدَحَ بِهِ حَيْثُما مَدَحَ اِلاّ بِلَفْظِ الأقامةِ تَنْبيهاً أَنَّ المَقْصُودَ مِنْها تَوْفِيَةُ شَرائِطِها لا الأِتْيانُ بِهَيْآتِها..)،

واتە: وەبەرپاکردنی شتێك ئەوەیە کەهەقی خۆی بدەیە. خوا فەرموویەتی: (بڵێ ئەی خاوەن کتێبینە! هەتا تەورات و ئینجیل بەرپانەکەن لەسەر هیچ شتێك نین) واتە مافی خۆیانیان بدەنێ لەڕووی زانین و کارپێکردنەوە - وەخوای بەرز فەرمانی بەنوێژ نەکردوە لەهەر جێیەك فەرمانی پێکردبێ و مەدحی نەکردوە لەهەرجێیەك مەدحی‌کردبێ، مەگەر بەوشەی بەرپاکردن! تاکو ئاگادارمان بکاتەوە کەمەبەست لەنوێژکردن تەواوکردن و هێنانەدی مەرجەکانیەتی نەك بەس بەجێ‌هێنانی شێوەو دیمەنەکانی.

کەواتە: بەرپاکردنی نوێژ (اقامة الصلاة)یانی بەجێ‌هێنانی بەشێوەیەکی وا کەخوا فەرمانی پێ‌کردووەو پێی ڕازی‌یەو ئەو ئامانج و مەبەستانەی تێیدا ڕەچاوکراون بێنەدی، دیارە ئەوەش بەبێ هێنانەدی ماف و مەرجە ڕواڵەتی و دەروونی‌یەکانی مسۆگەر نابێ.

---

[٦١] بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٤٠٠

ئنجا باسەرنج بدەین داخوا حیکمەتی بەکارهێنانی ئەوجۆرە تەعبیرە چی‌یە؟

بێگومان تێرو تەواوترین حاڵەتی هەرشتێك حاڵـەتی ڕاوەسـتانیەتی و لەحاڵـەتی وەستان دا لە هەمووی زیاترو چاکتر حەقیقەت و سیمای شت دەردەکەوێ و دەبینرێ،

بۆ وێنە: جەسـتەی ئینسـان لـەکاتی ڕاوەسـتان (قیـام)دا هـەرکام لەئەندامـەکانی لەشوێنی سروشتی خۆیان دا جێگیر دەبن و هەرکامێکیان چاکتر دەتوانێ ئەو ئەرکەی پـێ‌ی سـپێرراوە ئـەنجامی بـدات، وەخۆیـان چۆنن ئاوا دەردەکـەون و دەبیـنرێن: سـەر لەسـەرووی جەسـتەوەو جەسـتە لەسـەر بڕگـەکانی پشـت و هەمووشـیان لەسـەر دوولاقەکان ڕادەوەستن، وە دەمارەکانی هەست کردن و جووڵاندن بەئاسانی فـەرمان وەردەگـرن و هـەواڵ دەنـێرن، چـاوو گـوێ و دەسـت و لاق بـۆ هەرجێ‌یـەکی بیانـەوێ بەئاسانی ڕووی تێ‌دەکەن.. وە ئنیسان لەکاتی ڕاوەستان دا لەتـەواوترین دیمـەن دا خۆی دەنوێنێ، چونکە عەقڵ و هۆش کەمەزنترین و بـەرزترین شـتە لەمرۆڤ دا لـەکاتی ڕاوەستان دا لەسـەرووی لەشـەوە دەبـێ، ئنجا دوای عـەقڵ دڵ دێ کە کانگای سـۆزو عاتیفەیەو لەخوار عەقڵەوە قەرار دەگرێ، وە لەسەرووی گەدەوە کەعەمباری خۆراك و بژێوە، ورگ و گەدەش لەسەرووی داوێنەوە کەکانگای ئارەزووی جنسی‌یە، جا دیارە پێویستە ئینسان لەحاڵەتی وەستان دا ئەندام و هێزە دەروونی‌یەکانی چۆن ڕیز دەبن لەهەڵس وکەوتی ژیانیشـی‌دا هـەروابن، عـەقڵ و هـۆش دەمڕاستی بێ و بەدڵ و دەروون پاڵپشتی بڕیارو نەخشەکانی عەقڵ بکات و، گەدەی لەخزمەت مێشك و دڵ و دەروونی‌دا بێ نەك بەپێچەوانەوە وەهێزی جینسیشـی کـارێك نـەکات کەپێچەوانـەی عـەقڵ و دڵ و بەرژەوەندی گەدەو جەستەی بێت!

ئنجا هەروەك چۆن تێروتـەواوی‌ی جەسـتە لەکاتی ڕاوەستانی‌دا دەردەکـەوێ واتـە لـەحاڵێك دا کەلـەباری سروشـتی خواکـردی‌دا قـەرار دەگـرێ، نوێـژی تـێرو تـەواوو کـامڵیش ئـەو نوێژەیـە کەڕاسـت ڕابگـیرێ و بـەو شـێوەو چۆنیەتی‌یـە شـەرعی‌یە بەڕێوەببرێ کەخوای کاربەجێ و دادگەر فەرمانی پێ‌کردوە[٦٢].

ئێستاش کەزانیمان بەرپاکردنی نوێژ یانی چی و بۆچی ئەو تـەعبیرە هـەڵبژێرراوە با ئەوجار بزانین بەرپاکردنی نوێژ چۆنەو دەقە شەرعی‌یەکان چۆن لـەوبارەوە دواون؟!

---

[٦٢] ئەو چەند دێڕەم بەتۆزێك دەستکاری‌یەوە لە (پرتوي ازقرآن) ی سید محمود طالقانی وەرگرتوە، ج١ص٥٨.

جادیاره دەقی قورئان‌و سوننەت لەو بوارەدا زۆرن، بەڵام ئێمە بەس بۆ نموونە چەند دانەیەکیان لێ‌دەخەینەڕوو:

١-(عن أبي هريرة ﷺ أَنَّ رسولَ الله ﷺ دَخَلَ المَسْجِدَ فدخل رَجُلٌ فصلّى ثم جاءَ فَسَلَّم علـى النبيِّ ﷺ فقال: إرْجِعْ فَصَلِّ فَاِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَرَجَعَ فصلّى كما صلّى ثم جاءَ فسـلّم علـى النـبيِّ ﷺ، فقال: إرجِعْ فَصَلِّ فانك لَمْ تَصلِّ فرَجَعَ فصلّى كما صلّـى ثـم جـاء فسلّم علـى النـبيِّ ﷺ فقال: اِرْجِعْ فَصَلِّ فانَّكَ لَمْ تَصَلِّ ثلاثاً، فقال: والَّذي بَعَثَك بالحَقِّ ماأُحْسِنُ غَيْرَه فَعَلِّمْني! فقـال: اذا قُمْتَ الى الصَّلاةِ فَكَبِّرْ ثم اَقْرَأْ ماتيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ القُرآنِ ثم اَرْكَعْ حتّى تَطْمَئِنَّ راكِعاً، ثم اَرْفَعْ حتّى تَعْتَدِلَ قائِماً، ثم اَسْجُدْ حتّى تَطْمَئِنَّ ساجداً، ثم اَرفَعْ حتى تَطْمَئِنَّ جالِساً، ثم اَسْجُدْ حتـى تَطْمَئِنَّ ساجداً، ثم اَفْعلْ ذلِكَ في الصَّلاةِ كُلِّـها)متفق عليه لكن ليس لـ(مسلم) فيه ذكر السجدة الثانية، وفي رواية لمسلم: (اذا قمت الى الصلاة فأَسْبِغِ الوضُوءَ ثُمَّ اَسْتَقبِلِ القِبْلَةَ فكَبِّرْ ).

واتە: (ابوهريرة) دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی‌بێ، کەڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ چووە مزگەوتێ، پیاوێك هاتەژوورێ‌و نوێژی‌کرد، پاشان هات سەلامی لەپێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: بگەڕێوە نوێژ بکە چونکە نوێژت نەکرد، کابرا گەڕایەوەو وەك چۆن پێشتر کردبووی نوێژی‌کردو پاشان هات سەلامی لەپێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: بگەڕێوە نوێژبکە چونکە نوێژت نەکرد، دیسان کابرا گەڕایەوەو وەك لەپێشەوە نوێژی کردبوو نوێژی‌کرد دوایی هات‌و سەلامی لەپێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش بۆ جاری سێیەم فەرمووی: بگەڕێوە نوێژبکە چونکە نوێژت نەکرد! کابراش گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەهەق ڕەوانەکردوە لەوە چاکتر نازانم، جا فێرمبکە! فەرمووی: هەرکات بۆ نوێژێ هەستای - نیەت بهێنەو - (الله اکبر) بکە، دوایی ئەوەی بۆت ئاسانە لەقورئان - مەبەست سووڕەتی فاتیحەیە - بیخوێنە، ئنجا بچۆ ڕکووع هەتا تەواو ئارام دەگری بمێنەوە پاشان هەڵسەوە هەتا بەپێوە ئارام دەگری، دوایی کڕنووش بەرەو بمێنەوە هەتا ئارام دەگری، ئنجا هەڵسەوە هەتا بەدانیشتنەوە ئارام دەگری، دوایی کڕنووش بەرە هەتا ئارام دەگری، ئنجا لەهەموو نوێژەکەت دا هەر ئاوابکە.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ مانەوەو ئارام گرتن لەچوونە ڕکووع‌و هەستانەوە لەڕکووع‌و کڕنووش بردن‌و دانیشتنی نێوان دوو کڕنووش بردنەکان بەمەرجی[٦٣]

---

[٦٣] چونکە زانایان دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیەدا بەس ئەو شتانەی فێری ئەو نوێژکەرە کردوە کەفەرزن

دروست (جائز) بوونی نوێژو وەبەرکەوتنی دادەنێ، کەواتە هەر نوێژێك وانەبێ دروست نیەو وەرناگیرێ.

٢-(اذا قامَ أَحدُكُمْ في الصَّلاةِ فَلا يَمْسَحِ الحَصى..)رواه الخمسة.

واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی دابەست با دەست بەبەردو چەو دانەهێنێ..

(واتە بابەغەیری نوێژەکەیەوە سەرقاڵ نەبێ).

٣- (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوامٌ يرفعون أَبْصارَهُمْ الى السَّماءِ في الصَّلاة أَوْلا تَرْجِعُ إِلَيْهِمْ) رواه مسلم.

واتە: بەتەئکید کەسانێك کەلەنوێژیدا چاویان بەرەو سەرێ بەرزدەکەنەوە ئەگەر دەست لەو ڕەفتارە هەڵنەگرن چاویان ناگەڕێتەوەلایان. (واتە کوێر دەبن، یان سزایەکی هێندەی کوێرییان هەیە).

٤-وە لەوەڵامی کەسێك دا کەدەرباری ئاوڕدانەوە لەنوێژیدا پرسیاری لێکردوە، فەرموویەتی: (هو اخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطانُ مِنْ صَلاةِ العَبْدِ) رواه البخاري.

واتە: ئەوە دزییەکە کەشەیتان لەنوێژی بەندە دەیکات.

دیارە ئەو چوار دەقەی ڕابردن زیاتر پەیوەندییان بەدیوی ڕواڵەتی نوێژەوە هەیە، ئنجا باچەند دەقێکی دیکەش دەربارەی دیوی پەنهان و نێوەوەی نوێژ بخەینەبەرچاو.

٥- (قَدْ أَفْلَحَ المؤمنون. الَّذِيْنَ هُمْ في صَلاتِهِمْ خاشِعُونَ) المؤمنون -٢٦١-.

واتە:بەڕاستی بڕواداران سەرکەوتوو و بەمراد گەیشتوون. ئەوانەی کەلەنوێژەکەیان دا گەردن کەچ و دڵ بێدارن.

(ابن منظور) دەربارەی مانای وشەی (خشوع) گوتوویەتی:[٦٤] (بریتیە لەوەی کەمرۆڤ سەری نەوی بکات و چاو ببڕێتە زەوی و دەنگی نزم بکات)، دیارە بەسەرنج دانی دەقە شەرعییەکانیش دەردەکەوێ کە(خشوع) هەم پەیوەندی بەدڵ و دەروون و هەم بەجەستەو ڕواڵەتیشەوە هەیە، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (اللهم اني أعوذُبكَ مِنْ قَلْبٍ لايَخْشَعُ..)رواه الترمذي والنسائي، ورواه مسلم بلفظ قريب منه، واتە: ئەی خوایە من پەنات دێنمەبەر لەدڵێکی بێخشوع! هەروەها فەرموویەتی: (لَوْخَشَعَ قَلْبُ هذا خَشَعَتْ جَوارِحُهُ)[٦٥]، واتە: ئەگەر دڵی ئەمە -کابرایەك کەپێغەمبەر ﷺ بەبێ خشووع بینیویەتی - خشوعی ببوایە ئەندامەکانیشی دەیانبوو!

---

[٦٤] (لسان العرب) ج٨ص٧١.

[٦٥] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٢ص[illegible]

لەم فەرموودانەوە دەزانرێ کەکانگای خشووع دڵە، بەڵام شوێنەواری خشووع لەسەر ئەندامە ڕواڵەتی‌یەکانی جەستەش دەردەکەوێ.

کەواتە: دەتوانین لەبەر تیشکی ئەو دەقانەدا کەڕابردن ئاوا پێناسەی (خشوع) بکەین و بڵێین: "( خشوع) گەردن کەچی و بەئارامی ڕاوەستان و دڵنەرمی و بێداری و چاودێری‌کردنی خواو بیرکردنەوەو تێکەڵ بوون و تەفاعول کردن لەگەڵ وشەو تەعبیرو جموجۆڵەکانی نوێژدایە).

٦- (فَوَيْلٌ للمصلِّين. الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِـهِمْ ساهُون) الماعون -٤،٥-،

واتە: جا سزای زۆر سەخت بۆ نوێژکەرانێك. کە لەنوێژەکەیان بێ‌ئاگان.

٧- (ياأيها الذين آمنوا لاتَقْرَبوا الصَّلاةَ وأَنْتُمْ سُكارىٰ حتّىٰ تَعْلَمُوا ماتقولون..) النساء -٤٣-

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەحاڵێکدا کەسەرخۆش بن توخنی نوێژ مەکەون، هەتا دەزانن - لەنوێژەکەتان دا - چی دەڵێن..

وەك دەبینین لەئایەتی ژمارە (٤،٥)ی سوورەتی (الماعون) هەڕەشەی زۆر بێڕەزا لەکەسانێك کراوە کەنوێژ دەکەن بەڵام نوێژەکەیان ڕووحی خشووع و کاکڵی ئاگا لەخوابوون و لەخۆ وریابوونی تێدانیەو هەر توێکڵێکی بۆش و بێ‌جەوهەرو نێوەڕۆکە وە لەئایەتی ژمارە (٤٣)ی سوورەتی (النساء)یش دا ئامۆژگاری مسوڵمانانی نوێژکەر کراوە کەلەحاڵێك دا سەرخۆش و بێ‌هۆشن نزیکی نوێژ نەکەون، جا شایەنی باسە کەهەرچەندە لەئایەتەکەدا تەنیا باسی حاڵەتی سەرخۆشی کراوە بەڵام بێگومان هەرجۆرە بێ‌ئاگایی و بێ‌هۆشی‌یەك کەوا لەئینسان بکات نەزانێ لەنوێژەکەی‌دا چی دەڵێ و چی دەکات، چ بەهۆی مەیخۆری‌یەوەبێ کەلەئایەتەکەدا باس کراوە، وە چ بەهۆی تووڕەیی و ئارەزووپەرستی و نەزانی و.. هتدوەبێ، پێویستە ئینسان هەتا ئەو حاڵەتە لەخۆی دوور نەخاتەوەو دڵ و مێشکی لێ‌پاك نەکاتەوە نوێژەکەی نەکات، بۆئەوەی نوێژەکەی لەو حیکمەت و ئامانجە کە بۆ دابین کردنی پێویست کراوە خاڵی نەبێ، مەگەر خوای کاربەجێ نەیفەرمووە: (وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي) طه -١٤-،؟!

٨- (لا صَلاةَ بِحَضْرةِ الطَّعامِ ولا وهُوَ يُدافِعُهُ الأَخْبَثانِ) رواه مسلم.

واتە: نابێ نوێژ لەدەمی ئامادەبوونی خواردن دا، وە لەکاتێك دا کەمیزو پیسایی سەغڵەتی دەکەن بکرێ.

چونکە وەك لەخاڵی پێشووش دا باسمان کرد لەکاتی برسیەتی و تەنگاوی و.. هتددا ئینسان کاکڵ و نێوەڕۆکی نوێژەکەی وەك پێویست بۆ نایەتەدی و نوێژەکەی زیاتر دەبێتە جموجۆڵێکی ڕواڵەتی و ڕووکەش.

٩- (إِنَّما الصَّلاةُ تَمَسْكُنٌ ودُعاءٌ وتَضَرُّعٌ، وتَضَعُ يَدَيكَ فتقولُ: اَللّهُمَّ اللّهُمَّ فَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَهِيَ خِداجٌ) رواه الترمذي والنسائي وابن خزيمة.

واتە: بێگومان نوێژ بەس مل کەچی دەربڕین و پاڕانەوەو لالانەوەیە، وە دەستەکانت لەسەریەك دادەنێی و دەڵێی: ئەی خوایە! ئەی خوایە! جا هەرکەسێك وانەکات ئەوە نوێژەکەی ناتەواوو کرچ و کاڵە.

١٠- (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ... وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ) المؤمنون -٩،١-،

واتە: بەڕاستی بڕواداران بەکام و مراد گەیشتوون.. وەئەوانەی کەنوێژەکانیان دەپارێزن. دیارە ئەم دەقەی کۆتاییش پاراستنی نوێژ لەهەموو لایەکەوە دەگرێتەوە بەدەروون و دەرو وردو درشتەوە.

کەواتە: بەرپاکرنی نوێژ (اقامة الصلاة) ئەوەیە کەبابای نوێژکەر زۆر بەوردی ئاگادارو چاودێری نوێژەکەی بێ، چ لەلایەنی دیمەن و ڕواڵەت و چ لەلایەنی دەروون و نێوەڕۆکیەوە وەبەشێوەیەك ئەنجامی بدات کەخوای پەروەرگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویانەو ویستوویانە، چونکە کەوایکرد مانای وایە نوێژی ڕاستەقینەی کردوەو شێوەو حەقیقەتی داواکراوی بەنوێژەکەی بەخشیوەو ڕاستیکردۆتەوەو بەرپای کردوەو لەسەر ماهیەتی خۆی ڕای گرتوە.

ئێستاش ئەتۆو باسێك بەناوی: (چۆن نوێژ بەرپادەکەی؟!) کە بەوردی و هەنگاو بەهەنگاو لەبەر تیشکی دەقەکانی سوننەت دا باسی چۆنیەتی بەرپارکردنی نوێژ دەکات:

## خاڵی شەشەم: چۆن نوێژ بەرپا دەکەی؟!

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست! خوا یاربێ لەم باسەدا هەوڵ دەدەین بەوردی‌و هەنگاو بەهەنگاو لەبەرتیشکی فەرموودەکانی پێغەمبەری بەڕێز ﷺ و سوننەتی بەپێزیدا چۆنیەتی نوێژ بەرپارکردن ڕوون بکەینەوە، بەڵکو بتوانین فەرمانی پێغەمبەری خوا: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي) متفق عليه، واتە: (نوێژ بکەن وەك چۆن بینیتانم نوێژم کرد)، جێبەجێ بکەین.

شیاوی گوتنیشە کەئێمە لەم لێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەیەش دا ناتوانین پابەندی مەزهەبێکی دیاریکراو بین، چونکە ئاشکرایە کە مەزەبەکان‌و قسەو بۆچوونی زاناو پێشەوایانمان تەفسیرو لێکدانەوەی ئەوانە بۆ ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئێمە دەمانەوێ لەبەر ڕۆشنایی خودی سوننەت دا باسی چۆنیەتی نوێژ بەرپارکردن بکەین، ئنجا دیارە کەمەرجیش نیە هیچ کام لەزاناو پێشەوایانی سەرمەزەب‌و ئەوانەی دیکەش لەهەموو شتێك دا قسەو بۆچوون‌و تێگەیشتنەکەی پێکابیەتی! بۆیە هەرکەسێك لەهەموو مەسەلەکان دا تەنیا پابەندی ئیجتهادی پێشەواو زانایەك یان مەزەبێکی دیاریکراو بێت‌و، لێی لانەدات، حەتمەن دووچاری پابەندی بە هەندێك بیروڕاو بۆچوونی لاوازو (مرجوح)ەوە دەبێ جا ئەگەر ئەمەش بۆ خەڵکی عەوام دروست (جائز) بێت‌و چاوپۆشی لێ‌بکرێ، ئەوە بێگومان بۆ کەسانێك کەتواناو بڕستی جۆرێك لەجۆرەکانی ئیجتیهاد یان لانی کەم تەتەڵەو لەبێژنگ دان‌و هەڵسەنگادنیشیان هەبێ ئەوە ئەوجۆرە پابەندی‌و خۆبەستنەوەیان بۆ دروست نیەو، لەسەریان پێویستە بەدوای قسەی بەهێزترو ڕای بەڵگەدارتردا بگەڕێن‌و هەرکاتێکیش دەستیان لێی گیربوو پێیەوە پابەندبن‌و ڕووحی تەسکی تەقلیدو پێوەڕاهاتن لەپێشیان نەبێتە کۆسپ‌و پەرچ و دەست‌و پێیان نەبەستێ!

بەڵام لێرەش دا دیسان دەبێ وریابین‌و هەر لەخۆوەو بەبێ لێوەشاوەیی‌و توانا لافی زل زل لێ‌نەدەین‌و بەمستەئاوێك نەکەوینە مەلەو بەتۆزە زانیارییەك خۆمانمان لێ‌نەگۆڕێ، تاکو خوانەکردە دوایی لەبەردەم زاناو پێشەوایان دا ئارەقی شەرمەزاری‌و پەشێمانیمان لێ‌نەچۆڕێ، وە (رَحِمَ اللهُ أمْرَئًا عَرَفَ قَدْرَ نَفْسِهِ فَوَقَفَ عِنْدَ حَدِّهِ)، ئنجا لەپەڕاوێزیش دا بەپێی بۆلوان‌و بەئەندازەی بەپێویست زانرانیش ئاماژە بۆ بیروڕای زاناو پێشەوایان‌و مەزهەبەکانیش دەکەین‌و، دیارە هەندێك جاریش واپێویست دەکات هەر لە مەتنی باسەکان دا بخرێنەڕوو.

## بڕگەی یەکەم: نیەت هێنان

پایەو بنچینەی هەر خواپەرستی‌یەك لەئیسلام دا نیازو مەبەست لەدڵ گرتنە، واتـە ئاگاداربوون‌و بێداربوونی ئینسان سەبارەت بەوکارەی پێ‌ی هەڵدەستێ، ئایا چی‌یەو چۆنەو بۆ کێ‌یە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ وإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَانَوَى..) متفق عليه،

واتـە: بێگومان کردەوە – چاکە – کان تەنیا بەپێ‌ی نیەت – وەردەگیرێ – ن، وە بێگومان بۆ هەر کەسێك تەنیا بەگوێرەی نیەتەکەی پاداشت هەیە... دەربـاری پێناسەی (نية)یش سەرجەم[٦٦] زانایان لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون، کەبریتیە لـەنیاز (قَصْد)ی نێودڵ‌و، جووڵانی دڵ بۆ ئەنجام دانی کـارێك، وەهەمووشیان لەسـەرئەوە یەکدەنگن کەشوێنی نیازو مەبەست دڵە، ڕستەی: (وَمَحَلُّ النِّيَّةِ القَلْبُ) لەزۆربەی یان سەرجەم کتێب‌و سەرچاوە فیقهی‌یەکان دا هاتوە.

کەواتە: ئەی مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست! دوای تارەت گرتن‌و دەست نوێژو بانگ‌و قامەت، بەدڵێکی پاك‌و پۆشاکێکی خاوێنەوە لەسەر شوێنێکی پاك‌و تـەمیز بـەرەو قیبلـە بوەستەو نیـەتی نوێژکـردن بهێنـە، واتـە ئـەو نوێـژەی کەخـەریکی بەرپاکردنی‌ی لەدڵی خۆت دا ئامادەی بکەو بزانە چ نوێژێکەو چەند ڕکاتەو بەتەنیایە یان بەکۆمەڵ‌و فەرزە یان سوننەت و ... هتد؟!

بەڵام بزانە کەبەسەر زاردا هێنان‌و گۆکردن (تَلَفُّظ)ی وشەکانی نیەت نەك هەر فەرز بگرە سوننەتیش نیەو، زۆربەی زانایانیش بەداهێنراو (بدعة)ی دەزانن، چونکە وەك گوتمان نیەت کاری دڵەو هەر لەوێشـەوە پـەیدادەبێ‌و هیـچ پەیوەندی‌یـەکی بـەزارو زمانەوە نیە[٦٧].

---

[٦٦] بۆ وێنە: بڕوانە (نيل الاوطار) ج١ص١٤٦، کەقسەی هەرکام لە(نووي)و (كَرْماني)و (بَيْضاوي) لەوبارەوە هێناوە.

[٦٧] (ابن قيم الجوزية) لەوبارەوە گوتوویەتی: (نیەت نیازو مەبەستێکی تایبەتی‌یە بۆ کردنی کارێك وەشوێنەکەی دڵەو هیچ پەیوەندی‌یەکی بەزمانەوە نیە، بۆیە نەلە پێغەمبەر ﷺ و نە لەهاوەڵانی‌یەوە هیچ قسەیەك دەربارەی نیەت نەهاتوە، وە ئەو قسانە کە بۆ خۆشـۆردن‌و دەست نوێژو نوێژ... داهێنراون شەیتان کردوونی بەزەوی‌یەکی بەپیت بۆ تێداچاندنی تۆوی وەسوەسە.) بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص١٣٣، [illegible]

## بڕگەی دووەم: گوتنی (أَللّه أَكبر).

ئنجا دوای ئەوەی بەوجۆرەی گوتمان نیازو مەبەستی بەرپاکردنی نوێژەکەتت لەدڵو مێشکت دا ئامادەکرد، نوێژەکەت بەگوتنی (الله اکبر) دەست پێبکە کەپێی دەگوترێ (الله اکبر)ی (تحریم) چونکە دوای گوتنی وی هەموو ئەو شتانەی کە لەحاڵەتی ئاسایی‌دا حەڵاڵن لێت قەدەغە دەکرێن، وەك خواردنو خواردنەوەو خەوتنو جموجوڵی زۆرو قسەکردنو.. هتد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (مِفْتاحُ الصَّلاةِ الطُّهورُ، وَتَحْريمُها التكبيرُ، وتَحْليلُها التَّسْليمُ) رواه ابوداود والترمذي والحاكم،

**واتە**: پاكو خاوێنی (تارەت گرتنو دەست نوێژگرتن) کلیلی نوێژەو، (الله اکبر) گوتن حەرام کەری غەیری خۆیەتی (واتە هەرشتێك کەلەنوێژەکە جیایە) وە سەلام دانەوەش تەواو بوونیەتیو مایەی حەڵاڵ بوونەوەی ئەو شتانەیە کەلێی قەدەغەکرابوون.

---

ئنجا شایەنی باسە کەبەندە دوای موتاڵاو لێکۆڵینەوەی زۆریش لەبارەی گۆکردنی نیەتەوە بۆم ڕوون بۆتەوە کەتەنیا هەندێك لەزانایانی مەزهەبی شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ بەسوننەتیان داناوەو هیچ بەڵگەیەکیشم نەدی لەسەری هێنرابێتەوە! ئنجا دیارە شافیعی‌یەکانیش هەر گوتوویانە کەشوێنی نیەت دڵە، **واتە** بەس بەدڵ دا هاتنو لەدڵ دا ئامادەبوونی فەرزە، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: واباشە بەزاریش بگوترێ، بڕوانە، (السراج الوهاج) ص٤١،

(نووي)یش دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو ڕایە لەمەزهەبی شافیعی‌دا گوتوویەتی: (وَمَحَلُّ النيةِ القلبُ فان نوىٰ بقلبه دون لسانِه اَجْزاهُ، ومِنْ اصحابِنا مَنْ قال: "يَنْوي بِالقَلْبِ ويَتَلفظُ بِاللِّسانِ" ولَيْسَ بِشَيٍ لِاَنَّ النيةَ هي القَصْدُ بِالقَلْبِ)

**واتــە**: وەجێگای نیەت دڵە. هەرکات بەدڵ نیەتی هێنا بێئەوەی بەزمان بیڵێ بەردەکەوێ، هەندێك لەهاوەڵانیشمان گوتوویانە: (بەدڵ نیەت دێنێو بەزمان دەیبێژێ) بەڵام ئەو ڕایە هیچ نیە، چونکە نیەت بریتیە لەمەبەستی نێو د ڵ، پاشان (نووي) دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو ڕایە هەڵەیە کەخۆی گوتوویەتی: (هیچ نیە) دەڵێ: (.. وقال صاحب الحاوي: هو قول ابي عبدالله الزبيري: انه لايُجْزِئُهُ حتَّى يَجْمَعَ بَيْنَ نيةِ القلبِ وتلفظ اللسانِ، لان الشافعي رحمة الله قال في الحج: اذا نوىٰ حَجّاً او عُمْرة اَجْزَاَ وانْ لم يتلفظ، ولَيْسَ كالصلاةِ لاتَصِحُ الا بالنطقِ، قال اصحابُنا: غَلَطَ هذا القائِلُ ولَيْسَ مرادُ الشافعيِ بالنطقِ في الصلاةِ هذا، بَلْ مُرادُهُ التكبير..)

**واتە**: وەخاوەنی کتێبی (الحاوي) گوتوویەتی ئەمە قسەی (ابي عبدالله الزبيري)یە، کەنیەتەکەی بەناکەوێ هەتا نیازی دڵو دەربڕینی زمان کۆنەکاتەوە، چونکە شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ دەربارەی حەج گوتوویەتی: ئەگەر نیەتی حەجو عومرەی هێنا هەرچەندە نەشی بێژێ بۆی وەبەردەکەوێ، بەپێچەوانەی نوێژەوە کەبەدەربڕنی زمان نەبێ نیەتەکەی دروست نابێ هاوەڵانمان – **واتە** زانایانی شافیعی مەزهەب – گوتوویانە: خاوەنی ئەو قسەیە بەهەڵەداچووە چونکە مەبەستی شافیعی بەوشەی (بێژتنی زمان) لەنوێژدا گوتنی: (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنە نەك نیەت هێنان بەزمانو گۆکردنی، بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٣ص٢٣٢، ٢٣٣.

## بڕگەی سێیەم: بەرزرزکردنەوەی هەردووك دەست

بەرزکردنەوەی هەردووك دەستەکانیش دەگونجێ لەگەڵ گوتنی (الله اکبر) دابێ و، دەشگونجێ پێش یان دوای گوتنی بێ، وەك لە (صحیح البخاري)[٦٨] دا هاتوە، ئنجا لەکاتی دەست بەرزکردنەوەت دا پەنجەکانت نەپێکەوە نووساوبن و نەزۆریش بڵاوبن، بەڵکو ئاسایی بن، وەك (حاکم وابوداود)[٦٩] گێڕاویانەتەوە، وە دەستەکانت هەتا ئاقاری شانەکانت بەرزبکەوە، دەشتوانی لەنەرمەی گوێیەکانتیان نزیك بخەیەوە هەردووك سوننەتو دروستن، وەك (بخاري وابوداود)[٧٠] گێڕاویانەتەوە.

## بڕگەی چوارەم: ڕۆنانی دەستی ڕاست لەسەر هی چەپ

پاشان ئەی مسوڵمانی بەڕێزو شیرین هەردووك دەستەکانت بێنەخوارێو دەستی ڕاستت لەسەر ئی چەپت دابنێ، چونکە وەك (مسلم وابوداود) گێڕاویانەتەوە پێغەمبەرمان ﷺ وای کردوە، جا بۆت هەیە دەسی ڕاستت لەسەر پشتی دەستی چەپت دانێی، وەبۆت هەیە لەسەر جومگەو بازنەی دەستی چەپت، یان باسکی دەستی چەپت دابنێی، وەك (ابوداود ونسائي وابن خزیمة) بۆمان دەگێڕنەوە. شوێنی دەست لەسەر ڕۆنانیش تەنها شوێنێکی تایبەت نیە، بەڵکو دەگونجێ لەسەر سینگ بێ[٧١] وەك (ابوداود واحمد وابن خزیمة) گێڕاویانەتەوە، وە دەشگونجێ لەخوار سینگەوە بێ[٧٢] ، بەڵام خوار نێوك بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە[٧٣] .

---

[٦٨] بڕوانە: (صفة صلاة النبي ﷺ)ی ناصرالدین الالباني ص٧٧ الطبعة٦.

[٦٩] بڕوانە: (صفة صلاة النبي..) ص٧٨.

[٧٠] بڕوانە: (صفة صلاة النبي..) ص٧٨.

[٧١] لەفەرموودەکان دا وشەی (صَدْر) هاتوە نەك (نَحْر). و دیارە (صدر) سینگە بەڵام (نحر) سەرووی سینگە لای گەردن و گەروو، کەواتە دەست زۆر بەرزگرتن واتە لەسەرووی سینگەوە پێچەوانەی سوننەتە، هەرچەندە بەداخەوە هەندێك کەس لەڕوی نەزانییەوە هەر ئەوە بەسوونەت دەزانن!! بۆ مانای وشەی (نحر) بڕوانە : (المعجم الوسیط) ص٩٠٦، وشەی (نحر).

[٧٢] بڕوانە: (سبل السلام) ج١ص٢٢٥، وەبڕوانە: (الروضة الندیة شرح الدرر البهیة) ج١ص٩٦، ٩٧، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص١٤٥.

[٧٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو

## بڕگەی پێنجەم: چاوبڕینە شوێنی کڕنووش و ڕاوەستان بەمل کەچی یەوە

ئنجا تۆزێك سەرت نزم بکەو چاوت ببڕە ئەو شوێنەی کەکڕنووشی لەسەر دەبەی و نێوچاوانتی دەخەیەسەر، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ وای کردوە، وەك (حاکم وبیهقي) گێڕاویانەتەوە. وە ئاگاداربە کەزۆر سەربەرزکردنەوەو تەماشاکردنی ئاسمان حەرامە وەك (بخاري وابوداود) گێڕاویانەتەوە، هەروەها ئاوڕدانەوەو ڕوو وەرچەرخاندنیش – بەبێ هۆ – بەهەمان شێوە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەڵامی پرسیاری (عائشە)دا خوالێی ڕازی‌بێ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إِخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاةِ العَبْدِ) رواه البخاري وابوداود، هەروەها ئاگاداربە کەلەکاتی وەستان دا ڕێك و پێك ڕابوەستی و خۆت بەملاولادا لاسەنگ و خوارنەکەی و دەستیشت بەکەلەکەت نەگری. چونکە (ابوهريرة) خوالێی ڕازی‌بێ گوتوویەتی: (دەست بەکەلەکە گرتن لەکاتی نوێژدا پێشگیری لێ‌کراوە) وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە[٧٤].

## بڕگەی شەشەم: خوێندنی دووعای (استفتاح)

ئنجا بەئارامی یەکێك لەجۆرەکانی دووعای دەست پێ‌کردنی نوێژ (استفتاح) بخوێنە، کە پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا دەیخوێندن و چاکتریش وایە هەرجارە یەکێکیان بخوێنی – وەك پێشتر باسمان کردو ڕوونمان کردەوە – ئەمەش چەند وێنەیەك لەو دووعایانە:

---

[٧٤] ڕای چوار مەزهەبەکانیش لەباری چۆنیەتی دەست گرتنەوە ئاوایە: شافیعی‌یەکان سەر سینگ و خوارەوەی سینگ و، مالیکی‌یەکان پشت نێوك و حەنبەلی‌یەکان سەر سینگ و، حەنەفی‌یەکانیش خوار نێوکیان دیاری‌کردوە بۆ دەست لەسەر ڕۆنان، هەندێك لەمالیکی‌یەکان و شیعەی دوازدە ئیمامیش دەست گرتن بەسوننەت نازانن، بەڵام بێگومان بەهەڵەداچوون چونکە وەك پێشتر ئاماژەمان پێ‌کرد لەوبارەوە چەند فەرموویەکی ڕاست و ڕاشکاو (صحيح وصريح) هەن، هەرچەندە هەرچۆنیش بێ دەست گرتن هەر سوننەتەو فەرز نیە، بۆ شارەزایی زیاتریش لەباری ڕای زانایان و چوار مەزهەبەکانیشەوە، بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص١٥٨، ١٥٩، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) د.وهبة الزحيلي ج٢ص٨٧٣، ٨٧٤ط٤ هەروەها بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) محمد جواد مغنيه، ص١٠٩تا١١١.

١-(وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّمٰواتِ والأَرْضَ حَنِيْفاً مُسْلِماً وماأَنا مِنَ المُشْرِكين. إِنَّ صَلاتي ونُسُكي ومَحْيايَ ومَماتي للهِ رَبِّ العالَمين. لاشَرِيْكَ لَهُ وبِذلِكَ أُمِـرْتُ وأَنـا مِـنَ المُسْـلِمين)رواه احمد ومسلم والترمذي وغيرهم.

واتە: ڕووی — دڵی — خۆمم کردە ئەو زاتەی کەئاسمانەکان‌و زەوی هێناونەدی، ڕاستەڕێم گرتوەو مسوڵمانم، وەمن لەهاوبەش بۆ خوا دانەران نیم، بێگومان نوێژو پەرستنم‌و ژیان‌و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، هیچ هاوبەشی نین، وەهەر بەوەش فەرمانم پێکراوە. وەمن لەمسوڵمانانم.

٢- (سُبْحانَكَ اللهُمَّ وبِحَمْـدِكَ، وتَبـارَكَ اسْمُـكَ، وتَعـالىٰ جِـدُّكَ، ولاالـه غَـيْرُكَ)رواه ابوداود والحاكم،

واتە: ئەی خوایە بەپاکت دەگرم‌و سوپاست دەکەم، وەناوت بەرزو پڕپیت‌و پیرۆزەو، پایەت گەلێك بڵندو بەرێزەو، جگە لەتۆ هیچ پەرستراو نینە.

٣- (اللهُ أكبر كبيراً، والحَمْدُللهِ كثيراً، وسُبْحانَ اللهِ بُكْرَةً وأَصِيْلاً) رواه مسم وغيره.

واتـە: خـوا گـەورەترە بەگەورەییـەکی بێوێنـە، وەسوپاسـێکی زۆر بـۆ خـوا. وەبەیانیان‌و ئێواران خوا بەپاك دەگرم.

٤- (اللهمَّ باعِدْ بَيْني وبَيْنَ خَطايايَ كما باعَدْتَ بَـيْنَ المَشْـرِقِ والمَغْرِبِ، اللـهم نَقِّـني مِـنَ الخَطايا كَما يُنَقّى الثَّوْبُ الأَبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللهمَّ اغْسِلْ خَطايايَ بِالماءِ والثلـجِ والـبَرَدِ) متفق عليه.

واتە: ئەی خوایە من‌و هەڵەکانم لەیەك وە دووربخە وەك چۆن ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوات لەیەك دوور خستوونەوە، ئەی خوایە، لەگوناحەکانم پاکم بکەوە وەك چۆن پۆشاکی سپی لەچڵکێ خاوێن دەکرێتەوە، ئەی خوایە خراپەکانم بـەئاوو بـەفرو تـەرزە — ی ڕەحمەتت — بشۆ.

## بڕگەی حەوتەم: (إِسْتِعاذَة) کردن

پاشان کەیەکێك لەدووعایەکانی (استفتاح)ت خوێند، (استعاذة) بکە چونکە لەلای زۆربەی[٧٥] زانایان لەڕکاتی یەکەم لەپێش خوێندنی فاتیحەدا سوننەتە، (استعاذة)ش بەچەند شێوەیەك لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە:

---

[٧٥] شافیعی خوالێی‌خۆش بێ لەهەموو ڕکاتەکان دا بەسوننەتی دەزانێ. بەڵام ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترو بەڵگەدارترە. بڕوانە: (نيل الأوطار: ج٢، ص٢٠٥) و(فقه السنة: ج١، ص١٣٣)

١-(أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيْمِ) رواه ابن المنذر، واته پەنا بەخوا دەگرم لەشەیتانی نەفرین کراو.

٢-(أَعوذُ بِاللهِ السَّميعِ العَلِيْمِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيْمِ) رواه ابوداود والترمذي.

واته: پەنا بەخوای بیسەرو زانا دەگرم لەشەیتانی نەفرین کراو.

٣-(أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيْمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ)رواه ابوداود وابن ماجه والحاكم والدارقطني،

واتە: پەنا بەخوا دەگرم لەشەیتانی نەفرین کراو، لەخوتخوتەی و فووی خۆبەزلگری بەبەرداکردنی و شیعری خراپ فێرکردنی.

دیاره لەو نوێژانەدا کە(سِرِّي)ین و فاتیحەیان بەدەنگی نزم تێدا دەخوێندرێ ئەوە (استعاذة)ش بەهەمان شێوە، بەلام لەو نوێژانەدا کە (جهري)ین و بەدەنگی بەرز دەخوێندرێن، ئەوە زۆربەی زانایان رایان وایە کە(استعاذة) هەر بەدەنگی نزم دەخوێندرێ، بەلام شافیعی رای وایە کەهەردووك لا یەکسانن بەلام بێگومان رای جەماوەریزانایان بەهێزترە[٧٦] .

## بڕگەی هەشتەم: خوێندنی سوورەتی فاتیحە

ئنجا – ئەی مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست: – سوورەتی فاتیحە بخوێنە چونکە جەماوەری زانایان رایان وایە کەخوێندنی فاتیحە لەهەموو ڕکاتێك دا مەرجی دروست بوونی نوێژە، لەوبارەشەوە فەرمووده زۆرن، بۆ وێنە:

١-(لاصَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفاتِحَةِ الكِتابِ) متفق عليه، واته: هەر کەسێك فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی بەرناکەوێ.

٢- (لاتُجْزِئُ صَلاةٌ لايَقْرَأُ الرَّجُلُ فِيْها بِفاتِحَةِ الكِتابِ)متفق عليه، واتە: نوێژێك کەکابرا سوورەتی سەرەتای قورئانی تێدا ناخوێنێ بەرناکەوێ.

٣- (مَنْ صَلّى صَلاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيْها بِفاتِحَةِ الكِتابِ فَهِيَ خِداجٌ..) رواه مسلم،

واته: هەرکەسێك نوێژێك بکات فاتیحەی کتێبی – خوای – تێدا نەخوێنێ ئەوە ناتەواوە.

---

[٧٦] (ابن قدامة المقدسي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (وَيُسِرُّ الأَسْتِعاذَةَ ولايَجْهَرُبِها لاأَعْلَمُ فِيْهِ خِلافاً) بڕوانە: (المغني) ج١ص٤٧٦، واته: وە دەبێ (استعاذة)بەپەنهانی بکات و دەنگی پێ بەرز نەکاتەوە، لەوبارەوە جیاوازی (خلاف)م پێشان نییە

بەلاّم (أبوحنيفة) خوالێی خۆش بێ رای وایە کەخوێندنی فاتیحە بەمەرج نەگیراوەو هەر شوێنێکی دیکەی قورئـان بخوێنـێ هـەر دروسـتە[77] ، هەندێکیشـیان خوێندنـی فاتیحەیان تەنیا لەدوو یا زۆربەی ڕکاتان دا بەمەرج زانیوە[78] .

کەسێکیش نەیتوانی (فاتیحە) فێربێت، با بەئـەندازەی وی لەسـوورەتێکی دیکـە بخوێنـێ ئەگەر ئەوەشـی بـۆ نـەکرا، بـا بەئـەندازەی سـوورەتی فاتیحـە ئـەم زیکرانـە بخوێنێ: (سُبْحانَ اللهِ والحَمْدُ للهِ ولا إِلَهَ الاّ الله وَالله أَكْبَر ولاحَوْلَ ولا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ) وەك ابوداود و ابن خزيمة والحاكم وطبراني گێڕاویانەتەوە.

## چۆنیەتی خوێندنی فاتیحەش ئاوایە:

هەموو ئایەتەکانی بەجیاجیا بخوێنەبەیەکیانەوە مەلکێنە، واتە بلێ: (بسم الله الرحمن الرحيـم) ئنجا هەڵوەستیەکی کـورت بکـەو بلـێ: (الحمـــدالله رب العـــالمين) پاشـان دوای هەڵوێستەیەك بلێ: (الرحمن الرحيم)و دوایی بوەستەو بلێ: (مالك يوم الديــــن)... ئاوا بەم شێوەیە هـەتا کۆتـایی سـوورەتەکە، چونکـە أبـوداود وسـهمي وأبوعُمَر و الدانـي ئاوایان لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوەو (حاكِم و ذَهَبِي) یش بە فەرموودەیەکی ڕاست (صحيح) یان داناوە[79] .

شایەنی باسیشە ئەگەر ئایەتەکانیش پێکەوە بلکێنێ بەشێوەیەك کەمەعنایان تێك نەدات هەر دروستە، بەلاّم بەوجۆرەی گوتمان چاکترەو سوننەت ترە.

## کورتە باسێك دەرباری (بسم الله الرحمن الرحيم)

زانایـان هـەموویان لەسـەر ئەو هیەکدەنگن کە (بسـم الله الرحمـن الرحيـــم) بەشـێکی ئایەتێکە لەسوورەتی (النَّمْل)دا، بەلاّم لـەبارەی ئایـەت بوونـی لەسـەرەتای فاتیحـەو سوورەتەکانی دیکەی قورئان دا، ئەوە بوونە سێ دەستە:

١-دەڵێن: (بســـم الله الرحمـــن الرحيـــم) ئایەتێکـە لەسـوورەتی فاتیحـەو لەهـەموو سوورەتەکانی دیکەش، بۆیە پێویستە لەگەڵ فاتیحـەدا بخوێندرێ، جا لـەو نوێژانـەدا کـەدەنگیان تێـدا بەرزدەکرێتـەوە بـەدەنگی بـەرزو، لەوانـەش دا کەبـەدەنگی نـەرم

---

[77] بروانە: (بداية المجتهد) ج١ص١٢٢، وە بروانە: (المجموع/ شرح المهذب) ج٣ص٣١٣.

[78] بروانە: (المغني) ج١ص٤٨٥، هەروەها بروانە: (المجموع/ شرح المهذب) ج٣ص٣٠٧.

[79] بروانە: (صفة صلاة النبي ﷺ) محمد ناصرالدين الالباني ص٩٠، الطبعة السادسة.

دەخوێندرێن بەدەنگی نزم، بەهێزترین بەڵگەی ئەم ڕایەش ئەم فەرموودەیەیە کە (ابن حجر العسقلاني) گوتوویەتی: (لەوبارەوە لەم فەرموودەیە ڕاست (صحیح)تر نییە)، (عن نُعَيْم المُجَمِّر قال: صَلَّيْتُ وراءَ أَبي هريرة فقرأ: "بسم الله الرحمن الرحيم" ثم قَرَأَ بِأُمِّ القُرآنِ، وفي آخِرِه قال: والَّذي نَفْسي بِيَدِهِ إِنِّي لأَشْبَهُكُم صَلاةً بِرَسُولِ اللهِ ﷺ) رواه النسائي وابن خزيمة وابن حبان.

واتە: (نعیم المجمر) دەڵێ لەپشت (ابوهریرة) وە نوێژم کرد، (بسم الله الرحمن الرحیم)ی خوێند پاشان فاتیحەی خوێند، وە لەکۆتاییەکەیدا (ابوهریرة) گوتی: سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە نوێژی من لەئی هەمووتان زیاتر بەئی پێغەمبەری خواﷺ دەچێ.

٢- دەڵێن: ئایەتێکی سەربەخۆیەو بۆ موبارەکیی و لەیەك جیاکردنەوەی سوورەتەکان هاتۆتە خوارو خوێندنیشی لەفاتیحەدا سوننەتە بەڵام بەدەنگی نزم، ئەم ڕایەش چەند فەرموودەیەك پشتگیری دەکەن کە باوترینیان ئەمەیە: (عن أنس قال: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسولِ اللهِ وخَلْفَ أَبي بَكْرٍ وعُمَرَ وعُثْمانَ وكانوا لايَجْهَرونَ بِبِسْمِ اللهِ الرحمن الرحيم)رواه النسائي وابن حبان.

واتە: ئەنەس دەڵێ: لەپشت پێغەمبەری خواو ئەبووبەکرو عومەر وعوثمانەوە نوێژم کردوە، وە (بسم الله الرحمن الرحیم) یان بەدەنگی بەرز نەدەگوت.

٣-دەڵێن: نە لەفاتیحەو نەلەهیچ سوورەتێکی دیکەدا ئایەت نیەو نابێ نەبەدەنگی بەرز نەنزم بخوێندرێ لەنوێژە فەرزەکان دا، بەڵام لەنوێژە سوننەتەکاندا قەیدێ ناکات، دیارە ئەم ڕایەی سێیەم زۆر لاوازەو بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە.

(ابن القیم الجوزیة)ش هەردووك ڕای یەکەم و دووەمی کۆکردوونەوەو گوتوویەتی: (پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە کە (بسم الله الرحمن الرحیم)ی بەدەنگی بەرز خوێندوە بەڵام بەزۆری بەدەنگی نزم خوێندوویەتی)[80] شایانی باسیشە کەمنیش خۆم پاش لێکۆڵینەوەو پشکنینی زۆر بۆم دەرکەوتوە کەئەم ڕایەی (ابن القیم) دەربارەی (بسم الله الرحمن الرحیم) باشترین و بەهێزترین ڕایەو سەرجەم بەڵگەکانیش لەسەری پێك دەگەن.

ئنجا تەنیا بۆئەوەی کەهیچ کەس گومانی وانەبێ کەئەو زانایانانەی ڕای یەکەمیان پەسەند کردوە، بەڵگەیەکی ئەو تۆیان بەدەستەوە نیە، کەیەکێك لەو زانایە پایەبەرزانە

---

[80] بڕوانە: (مختصر زاد المَعاد في هَدْيِ خير العِباد)ی محمد بن عبدالوهاب، ص١٥، دیارە (زاد المعاد.. )کتێبی ابن القیم (...) [illegible]

(شافیعی)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەچاکی دەزانم ئەم چەند قسەیە لەیەکێك لەزانایانەوە نەقڵ بکەم:

(والحاصِلُ: إنَّ الحَقَّ بثُبوتُ قِراءَتِها وأَنَّها آيةٌ مِنْ كلِّ سُورَةٍ وأنَّها تُقْرأ في الصلاةِ جَهْراً في الجهرية وسرّاً في السرِّيَّة، وأحاديثُ عَدَمُ سَماعِ جَهْرِه ﷺ بها، وانْ كانتْ صحيحة، فالجَمْعُ بَيْنَها وبَيْنَ أحاديثِ الجَهْرِ مُمْكِنٌ، بأن يُحْمَلَ نَفْيُ مَنْ نَفِيَ على أنَّه عَرَضَ لهُ مانِعٌ عَنْ سَماعِها فأنَّ وقْتَ قِراءَةِ الإمامِ لها وَقْتُ اشْتِغالِ المُؤتَمِّ بالدخولِ في الصلاةِ والأحْرامِ والتَوجُّهِ وتَكْبيرِ القائمين الى الصَّلاة، ورُواةُ الأسْرارِ هُمْ مِثْلُ أنَس وعبدالله بن مُغَفَّل وهُمْ اذْ ذاك مِنْ صِغارِ الصَّحابَةِ قَدْ لايَقِفُونَ في الصُّفوفِ المُتَقَدِّمَة لأنَّها مَوْقِفُ كِبارِ الصَّحابَةِ، كما وَرَدَ الدَّليلُ بذلِكَ، وعلى كُلِّ تقْديرٍ فَالمُثْبتُ مُقَدَّمٌ على النّافي، وأحاديثُ الجَهْرِ وانْ كانَتْ غَيْرُ سَليْمَةٍ مِنَ المَقالِ فَهِيَ قَدْ بَلَغَتْ مِنَ الكَثْرَةِ الى حَدٍّ يَشْهدُ بَعْضُها لِبَعْضٍ مَعَ كَوْنِها مُعْتَضَدَةً بالرَّسْمِ في المَصاحِفِ، وهو دَليْلٌ عِلْمِيٌّ كما قالَهُ العَضُدُ وغَيْرُهُ، فَقَدْ وافَقَتْ سائِرَ الآياتِ القرآنية في ذلِك، فالظّاهر مع مَنْ قال: بأنَّ صِفَتَها وصِفَةَ سائِرِ الآيات متفقة..)[81]

وەك دەبینین ئەم بەڵگانە پشتگیری ڕای یەکەم دەکەن:

**یەك**: هەرچەندە ئەو فەرموودانەی دەڵێن پێغەمبەر ﷺ (بسم الله الرحمن الرحيم)ی بەدەنگی بەرز نەخوێندوە ڕاست (صحيح)ن. بەڵام لەگەڵ ئەو فەرموودانەی تردا کەدەڵێن بەدەنگی بەرز خوێندوویەتی تێك ناگیرێن، چونکە واپێدەچێ، ئەوانەی ئەوجۆرە فەرموودانەیان گێڕاونەوە پەرچێك هاتۆتە ڕێیان و گوێبیست نەبوون، چونکە لەکاتێك دا کەئیمام (بسم الله الرحمن الرحيم) دەخوێنێ نوێژکەرەکان سەرقاڵی نیەت هێنان و نوێژ دابەستن و (الله اكبر)گوتنن.

**دوو**: ئەو کەسانەی ئەو فەرموودانەیان گێڕاونەوە باباى وەك (انس بن مالك) و (عبدالله بن مغفل) خوا لێیان ڕازی بێ، دیارە ئەمانەش ئەوکاتە لەهاوەڵانی گچکەو کەم تەمەن بوون و لەڕیزەکانی پێشەوە نەوەستاون، کەوەك بەڵگەکان دەلالەت دەکەن ڕیزەکانی پێشەوە زیاتر شوێنی وەستانی هاوەڵە گەورەو تەمەندارەکان بوون، خوا لەهەموویان ڕازیبێ.

---

[81] بڕوانە: (الروضة الندية [illegible] البهية) [illegible] علي [illegible]) ج١

**سێ**: دیاره بەپێی بنچینەی شەرعی، (المُثْبِتُ مُقَدَّمٌ علىٰ النَّافِي) ئیسپاتکەر پێش رەتکەرەوە دەخرێ، ئەو فەرموودانەی دەنگ پێبەرزکردنەوەی (بسم الله..) دەگەیەنن پێش ئەوانی دیکە دەخرێن، چونکە (عَدَمُ العِلْمِ لایَسْتَلْزِمُ عِلْمَ العَدَمِ)، واتە: زانیاری نەبوون بەبوونی شتێك بەڵگەی نەبوونی نیە.

**چوار**: ئەو فەرموودانەی کە دەنگ بەرزکردنەوە بە(بسم الله..) دەگەیەنن، هەرچەندە قسەیان لەسەر کراوە، بەڵام چونکە زۆر زۆرن وە رەسمی (مُصْحَفْ) یش پاڵپشتیانە، هەر بە بەڵگەی بەهێز دادەنرێن.

ئنجا با کۆتایی ئەم مەسەلە بەچەند قسەیەکی بەنرخ و حەکیمانەی (ابن تیمیة) بێنین کەهەرچەندە پشتگیری رای دووەم دەکات و پێی وایە کەبەلای کەمەوە پێغەمبەر ﷺ لەهەموو نوێژە (جهري)یەکان دا (بسم الله الرحمن الرحیم) ی بەدەنگی بەرز نەخوێندوە، بەڵام وەك هەندێك کەسی سادەو کەم شارەزاو دەمارگیر مەسەلەکە ناخاتە نێوان هەق و ناهەق و سوننەت و بیدعەتەوە بەڵکو دەیخاتە نێو بازنەی فراوانی باشترو باش (أَحْسَن وحَسَن)ەوەو دەڵێ:

(... ومع هذا فالصَّواب أَنَّ مالایُجهربِهِ قَدْ یشْرَعُ الجهْرُ به لِمَصْلحةٍ راجِحَةٍ، فیشْرعُ لِلْأُمام أَحْیاناً لِمِثْلِ تَعْلیمِ المَأْمومین، ویَسُوغُ للمصلِّین أَنْ یَجْهَروا بالکَلِماتِ الیَسْیِرَةِ أَحْیاناً، ویَسُوغُ أَیضاً أَنْ یترکَ الأِنْسانُ الأَفْضَلَ لِتَأْلیْفِ القلوبِ واْجْتماع الکلِمَةِ خَوْفاً مِنَ التَّنْفِیْرِ عَمَّا یَصْلُحُ، کما تَرَكَ النبيُّ ﷺ بناءَ البَیْتِ علىٰ قواعِدِ اِبْراهیمَ لِکَوْنِ قُرَیْش کانُوا حَدَیثي عَهْدٍ بالجاهِلیَّةِ وخَشِيَ تَنْفیرَهُمْ بِذٰلِكَ، ورأىٰ أَنَّ مَصْلَحَةَ الأجْتماعِ والأِئْتلافِ مُقَدَّمَةٌ علىٰ مَصْلَحَةِ البناءِ علىٰ قواعِدِ اِبْراهیْمَ..)[82].

جا بێگومان لەنێوان ئەم جۆرە لەقورئان و سوننەت تێگەیشتنەو تێگەیشتنی سادەو سەرکێڵانەی کەسانێك کەپێیان وایە ئەگەر دنیا کاول بێت و کۆمەڵگا تێك بچێ و ئایین لەبەین بچێ نابێ بەهیچ رەنگێك دەستبەرداری ئەنجام دانی نەك سوننەتێك بگرە بیروڕایەکی — بەبۆچوونی وان — ڕاست تر (أَرْجَح)یش بن، چونکە ئەو جۆرە چاوپۆشی (مساهمة)یە نیشانەی کەم تەقوایی و ئیمان کزییە!! جیاوازییەکی گەورە هەیە، کەیەکەمیان تێگەیشتنێکی قووڵ و ڕاست و زانایانەو دووەمیشیان حاڵی بوونێکی سەرکێڵ و هەڵەو نەزانانەیە[83].

---

[82] بڕوانە: (الفتاوىٰ الکُبْرىٰ) لابن تیمیة ج١ (مسألة ٦١) لەلاپەڕە (٨٨)وە تاکو لاپەڕە (١٠٤).

[83] تێبینی: مەسەلەی (بسم الله الرحمن الرحیم) چ لەڕووی بەئایەت دانان یان دانەنان، چ لەڕووی خوێندن و نەخوێندنی لەگەڵ فاتیحەو سورەتەکان دا، و چ لەڕووی دەنگ پێبەرزکردن یان

## بڕگەی نۆیەم: گوتنی ئامین

ئنجا کە لەخوێندنی فاتیحە بوویەوە بڵێ (آمین) ، چونکە (بخاري وابوداود) وایان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، ئنجا (إمام) بێ یان (مأموم) یەکسانە، ئەوەندە هەیە گوتنی ئامین لەنوێژە (جهري)یەکاندا بەدەنگی بەرزو لە (سِرِّي) یەکان دا بەدەنگی پەنهان دەگوترێ، وەهەر کات بەدەنگی بەرز گوترا دەبێ دەنگی پێدرێژ بکرێتەوە، وەك (بخاري وابوداود) گێڕاویانەتەوە.

## بڕگەی دەیەم: هەڵوەستەکرنی ئیمام دوای گوتنی ئامین

ئنجا ئەگەر ئیمام بووی لەدوای گوتنی ئامین ئەگەر نوێژەکە (جهري) بوو هەڵوەستە (سكتة) یەك بکە، بۆئەوەی شوێن کەوتوو (مأموم)ەکانت فریای خوێندنی فاتیحە بکەون، چونکە وەك پێشتر گوتمان زۆربەو جەماوەری زانایان خوێندنی سوورەتی فاتیحە لەهەر ڕکاتێکی هەر نوێژێك دا چ ئیمام بێ چ (مأموم)و چ بەتەنیا بیکات بەمەرج یان فەرز دادەنێن وەك پاش تۆزێکیتر باسی دەکەین، بەڵگەی فەرزبوون یان لانی کەم سوننەت بوونی ئەو هەڵوەستەکردنەش بۆ ئیمام چەند فەرموودەیەکە بۆ وێنە:

١- (عن الحسن البصري أَنَّ سَمُرَةَ بن جُنْدُب وعِمْران بن حُصَيْن تَذاكرا، فَحدَّثَ سَمُرَةُ أنه: حَفِظَ مِنْ رَسولِ اللهِ ﷺ سَكْتَتَيْنِ: سَكْتَةً إذا كَبَّر، وَسَكْتَةً إذا فَرَغَ مِنْ قِراءَةِ "غَيْرِ المَغْضوبِ

---

بەرزکردنەوەی، لەنێو زانایان دا مشتومڕی زۆری لەسەرکراوەو ئێمە بەوەندەی باسمان کرد وازی لێدێنین، بەلام بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتری هەرکەسێك کەبیەوێ لەوبارەوە چاکترو زیاتر لێبکۆڵێتەوە، ئاماژە بەو سەرچاوانە دەکەم کەبەتێرو تەسەلی باسی ئەو مەسەلەیەیان کردوەو، لەڕاستی‌دا حەزیش دەکەم خوێنەرانی بەڕێز بەسەرنج دانو تێوەڕامانی ئەو جۆرە سەرچاوانە ڕابێنو بەخوێندنەوەی نامیلکەیەكو کتێبێك بۆ حاڵیبوون لەمسەلەو بابەتێك واز نەهێنن، بۆئەوەی هەم قەدرو حورمەتی زانایانی پێشینمان زیاترو چاکتر بزانن‌و، خۆشیان زیاتر بچنە حاڵەتی خۆناسینو خۆبەکەمگرتن (تواضع)ەوە:

١- (المَجْمُوع شَرْحُ المُهَذَّب) للنووي كە لەلاپەڕە (٨٨) هەتا (٣٠٢)ی بەرگی سێیەم بەتێرو تەسەلی باسی مەسەلەی (بسم الله...) و لایەنە جۆراوجۆرەکانی کردوەو ڕای (شافیعی) یشی پەسندکردوەو موناقەشەیەکی وردو قووڵی ڕایەکانی دیکەشی کردوە.

٢- (الفتاوى الكبرى) ج١ص٨٨تا١٠٤. ٣- (بداية المجتهد) ج١ص١١٩، ١٢٠.

٤- (المُغْني) ج١ص٤٧٨تا٤٨٢. ٥- (الروضة الندية) ج١ص١٠٠،١٠١.

٦- (نَيْل الأوطار) ج٢ص[illegible] ٧- (فقه [illegible]) ج١ص١٧٢.

عليهم ولا الضّالّين" فَحَفِظَ ذٰلِكَ سَمُرَةُ وأَنْكَرَ عَلَيْهِ عِمْران وكَتَبا في ذٰلِكَ الىٰ أُبَيِّ بنِ كَعْبٍ ﷺ فكانَ في كِتابِهِ إِلَيْهِما: أَنَّ سَمُرَةَ قَدْ حَفِظَ) رواه ابوداود والترمذي وقال: حديث حسن وهذا فظ ابي داود ولفظ الترمذي بمعناه.

واتـه: حەسـەنی بەصرِایی خوا لێـی خـۆش بـێ دەگێڕێتـەوە کـە (سمـرة بـن جندب)و(عمران بن حصين) خواڵێیان ڕازی‌بێ مشت‌ومڕیان بـوو، (سمـرة) گوتـی: کەدوو هەڵوەستەکردنی لەنوێژدا لەپێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگرتوون یەکیان دوای (الله اکبر) کردن و نوێژ دابەستن، ئەوی دیکەشیان پاش خوێندنی فاتیحە، جا (سمرة) ئەوەی لەیادبوو، بەڵام (عمران) نکووڵی لـێ‌کرد، لـەوبارەوە نامـەیان بـۆ (ابـي بـن کعب)نارد، ئەویش لەوەڵام دا بۆی نووسیبوون: کەسەمورە لەبیری ماوە.

٢- (عن عُرْوَةَ بنِ الزُّبَيْـرِ ﷺ انه قال: يابُنَيَّ: إِقْرَأُوا إِذا سَكَتَ الأَمامُ، وأَسْكُتُوا إِذا جَـهَرَ، فَأَنَّهُ لاصَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفاتِحَةِ الكِتابِ) رواه البخاري.

واتە: ئەی ڕۆڵەکانم هەرکاتێك ئمام بی‌دەنگ بوو – فاتیحە – بخوێنن، وەئەگەر دەنگی بەرزکردەوە بێدەنـگ بن، چونکـە بێگومـان هەرکەسـێك فاتیحـە نـەخوێنێ نوێژەکەی بەرناکەوێ.

جا پاش ئەوەی زۆربەو جەماوەری‌زانایان لەسەر هەبوونی ئەو هەڵوەستە کردنەی ئیمام یەکدەنگ بوون کەهەیانە بەفەرزو[٨٤] هەشیانە بەسوننەتی دادەنێ[٨٥] ، لەوبارەوە کە ئایا لەکاتی هەڵوەستە کردنەکەی‌دا هەر بێدەنگ بێ یان سـەرگەرمی زیکر یـان قورئان خوێندن بێ، زانایان دووڕایان هەن هەندێکیان دەڵێن واباشە بێدەنگ نەبێ و یـان زیکرێك بخوێنێ یـان قورئـان بخوێنێ، بۆ وێنـە ئەم زیکرە پێشـنیار دەکـەن[٨٦] : (اللهم باعِدْ بَيْني وبَيْنَ خطايايَ كما باعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ والمَغْرِب،اللهم نَقِّني مِنَ الخَطايا، كمـا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللهم اغْسِلْ خَطايايَ بالماءِ والثلجِ والبَرَدِ) متفق عليه (پێشتر مانامان کرد).

هەندێکیشیان دەڵێن واباشە هـەر بێدەنـگ بـێ و چاوەڕێی شـوێن کـەوتووەکان (مأمومين) ی بکات تا لەخوێندنی فاتیحە دەبنەوە[٨٧] .

---

[٨٤] بڕوانە: (فتح الباري) ج٢ص٤٨٧.
[٨٥] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ص٥٣٢، کەدەڵێ: (ويُسْتَحَبُّ أَنْ يَسْكُتَ الأُمامُ عُقَيْب قِراءَةِ الفاتحةِ سَكْتَةً يستريح فيها ويقرأ فيها مَنْ خَلْفَهُ الفاتحة كَيْلا يُنازَعَ فيها..).
[٨٦] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٣ص٣١٢.
[٨٧] بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) [illegible]

## کورتە باسێك دەربارەی فاتیحە خوێندنی (مأموم) لەپشت ئیمامەوە

زاناو پێشەوایانمان — ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێ و چاكترین پاداشتیان بداتەوە — دەربارەی خوێنران و نەخوێنرانی فاتیحە لەلایەن (مأموم)ەوە مشت ومڕێكی زۆریان بووەو بیروڕای جیاجیایان لەوبارەوە هەن، كەخوا یاربێ ئێمە زۆر بەگوشراوی دەیانخەینەڕوو، وە ئەوەیان كە لە هەموویان لەڕووی بەڵگەوە بەبەهێزتر بزانین هەڵیدەبژێرین، كەپێشتریش ئاماژەمان پێكردوە:

١-جارێ ئەگەر نوێژەكە (سري) بێت، ئەوە جگە لە (ابوحنیفة) تێكڕای زانایان دەڵێن: پێویستە نوێژكەر لەهەموو ڕكاتەكان دا فاتیحە بخوێنێ[88] .

٢- بەڵام ئەوەی زانایان تێیدا كەوتوونە جیاوازیو مشت ومڕەوە نوێژە (جهري)یەكانن كەڕایان بەم جۆرەیە:

ا-زۆربەو جەماوەری[89] زانایان دەڵێن دەبێ (مأموم) فاتیحە هەر بخوێنێ و هەربۆیەش هەڵوەستە (سكتة)كردنی ئیمام بەفەرزیان بەلای كەمەوە بەسوننەت دانراوە[90] ، بۆئەوەی (مأموم) فریای خوێندنی فاتیحە بكەوێ، وە ئەگەر ئیمام هەڵوەستەی نەكرد لەدوای خوێندنی فاتیحە، ئەوە پێویستە هاوكات لەگەڵ فاتیحە خوێندنی ئیمام دا ئەویش بیخوێنێ، یان لەكاتی قورئان خوێندنی دوای فاتیحەدا بیخوێنێ[91] .

ب- هەندێكیشیان تەنیا بەسوننەتی دەزانن و دەڵێن لەسەری فەرز نیە چونكە خوێندنی ئیمام لەجیاتی (مأموم)ەكانیشیەتی[92] .

ج- هەندێكیشیان دەڵێن هەر دروست نیە بیخوێنێ[93] .

---

[88] بڕوانە: (المجموع) ج٣ص٣١٢، ٣١٣.

[89] بڕوانە (المجموع) ج٣ص٣١٢، وە (نیل الأوطار) للشوكاني ج٢ص٢٣٢، هەروەها بۆ بەرچاو ڕوونی چاكترو زیاتر بڕوانە: (فتح الباري شرح صحیح البخاري) ج٢ص٤٧٩تا٤٨٨، كە(بخاري) بابەتێكی سەربەخۆی لەوبارەوە هێناوە بەناونیشانی: (باب وجوب القراءة للأمام والمأموم في الصلوات كلها في الحضر والسفر ومايُجْهَرفيها ومايُخافِت)، هەروەها (الحافظ ابن حجر العسقلاني)یش هەمان ڕای سەرخستوەو بەڕای جەماوەرو زۆربەی هەرەزۆری زانایانیشی لەقەڵەم داوە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ص٤٨٨.

[90] خاوەنی (فتح الباري) دەڵێ ئەو هەڵوەستەیە فەرزە، بڕوانە: ج٢ص٤٨٧.

[91] بڕوانە (نیل الأوطار) ج٢ص٢٣٧، ٢٣٨.

[92] بڕوانە (المجموع) ج٣ص٣١٣.

[93] بڕوانە (المجموع) ج٣ص٣٣١، وە بڕوانە (المحلى لابن حزم) ج٣ص٢٣٨.

د- هـی واشـیان هەیـە کـەپێی وایـە کـاتی خـۆی (مـأموم)ەکـان لـەنوێژە (جهري)یەکانیش دا فاتیحەیان هەر خوێندوە، بەڵام دوایی نەسخ کراوەتەوە[94].

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەبەڕای بەندە — کەدوای لێکۆڵینەوەو پشکنینی زۆر پێی گەیشـتووم ڕای جـەماوەری زانایـان زۆر لەڕایـەکانی دیکـە بـەهێزترو بەڵگـەدارترە بەوەندە وازدێنین کە سەرنجی بەڵگەکانی ئەوان بدەین، پاشان سەرنجی وەڵامی ئەوان بۆ ئەو شتانەی کەخاوەن ڕایەکانی دیکە بەبەڵگەیان هێناونەوە دەدەین:

یەک: (لاصَـلاةَ لِمَـنْ لَمْ يَقْـرَأْ بِفاتِحَـةِ الكِتـابِ) متفق عليه، دیارە ئەم دەقەش — وەك "نـووي گوتوویـەتی — حوکمێکـی گشـتی‌یە بـۆ هـەموو نوێژکـەرێكو بەبەڵگەیـەکی بێ‌پێچو پەناش تایبەت نەکراوە بەغەیری (مأموم)ە وە[95].

دوو: (عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه أنَّ النبيَّ ﷺ قَرأَ في صَلاةِ الصُّبحِ فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ القِراءَةُ، فلما فَرغَ قالَ: لَعلكُم تَقرأونَ وراءَ إِمامِكُم" قُلْنا نَعَمْ هَذاً يارَسُولَ اللهِ، قـالَ: "لاتَفْعَلوا إلاّ بِفاتِحةِ الكِتابِ، فانَّه لاصَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرأْبِها) رواه ابوداود والترمذي والدارقطني وغيرهم وقال الترمذي والدارقطني: حسن.

واتـە: پێغەمبەر ﷺ نوێـژی بەیانی کرد، بەقورسـی قورئانەکەی بۆ خوێنـدرا، جا کەتەواو بوو فەرمووی: ڕەنگە لەپشت ئیمامتانەوە قورئان بخوێنن! گوتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بەخێرایی، فـەرمووی: وامەکـەن مەگـەر سـوورەتی فاتیحـە، چونکـە هەرکەسێك فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نیە.

سێ: (عن عبادة بن الصامت ﷺ قال: صَلّى بِنا رَسولُ ﷺ بَعْضَ الصَّلاةِ الَّتي يُجْهَرُ فِيها بالقِراءَةِ، فقالَ: لايَقْرأَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إذا جَهَرْتُ بِالقِراءَةِ إلاّ بِأُمِّ القُرآنِ) رواه ابوداود والدارقطني والبيهقي وقال البيهقي: والحديث صحيح عن عبادة عن النبي ﷺ: (وەك دەبینین پێغەمبـەر ﷺ فاتیحەی لەنەخوێنران هەڵاواردوە).

چوار: (عن أبي هريرة أَنَّ النبيَّ ﷺ قال: مَنْ صَلّى صَلاةً لَمْ يَقْـرَأْ فِيـْها بِـأُمِّ القُـرآنِ فَهِيَ خِداجٌ) متفق عليه، (فَقيلَ لأَبي هُرَيْرَةَ: وانّا نَكونُ وراءَ الأمامِ! فقالَ: إقْرَأْ بِها فِيْ نَفْسِكَ)

واتە: بە (ابوهريرة) گوترا: جاری وایە ئێمە لەپشت ئیمامەوە دەبین! گوتـی: لەبەر خۆتەوە بیخوێنە.

---

[94] بڕوانە (صفة صلاة النبي) محمد ناصر الدين الألباني ص٩٣تا٩٥.
[95] بڕوانە (المجموع) ج٣ص٣١٥.

## بەرپەرچ دانەوەی قسەی ئەوانە کەدەڵێن نابێ (مأموم) فاتیحە بخوێنێ

هەرچەندە زۆر لەو زانایانە کەڕای جەماوەری زانایانیان پەسندکردوە وەڵامی ئەو بەڵگەو قسانەیان داوەتەوە کەئەوانەی دەڵێن نابێ (مأموم) فاتیحە بخوێنێ خستوویاننەڕوو[96]، بەڵام – ئەوەندەی من ئاگادارېم – هیچ کامیان وەك (ابن حزم) بەرپەرچی قسەکانیان نەداوەتەوە، بۆیە بەگوشراوی چەند قسەیەکی لێدەخوازینەوە، خواپاداشتی بداتەوە:

١–لەوەڵامی ئەو بەڵگەیان دا کە: (فَاقْرَأُوا مَاتَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ) المزمل –٢٠ – وە فەرموودەی: (إِقْرَأْ مَاتَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ) متفق علیه ، بەڵگەن لەسەر فەرزنەبوونی فاتیحە، چونکە هەم قورئانو هەم سوننەتیش فەرمانیان کردوە بەخوێندنی ئەو ئەندازەیە لەقورئان کەئاسانەو بەسێنایی لەبەردەکرێ بۆ نوێژکردن، (ابن حزم) گوتوویەتی (ئەو فەرموودەیەی کە (عبادة) گێڕاویەتەوە – واتە: (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفاتِحَةِ الكِتابِ) – ئەو فەرموودەیەی دیکە ڕوون دەکاتەوەو دەریدەخات کەمەبەست لەوە کەپێویستە ئەو ئەندازەیەی ئاسانە لەقورئان بیخوێنێ بەس سوورەتی فاتیحەیە، جا کەسێك فەرموودەکەی (عبادة) بکاتە بناغە ئەوە هەم ئایەتەکەو هەم سەرجەم فەرموودەکانی گرتوون، چونکە فاتیحە بریتیە لە (ماتیسر من القرآن)، بەڵام کەسێك فەرموودەی : (إِقْرَأْ مَاتيسَّر مَعَكَ مِنَ القرآن) بکاتە بنچینەی قسەکانی، ئەوە سەرپێچی لەفەرموودەکەی (عبادة) کردوەو نوێژێکی بەدروست داناوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ بەنادروستی داناوە، دیارە ئەمەش دروست نیە).

٢– وە لەوەڵامی ئەو قسەیەدا کەدەڵێ فەرموودەی خوا: (وَاذا قُرِئَ القُرْآنُ فَاسْتَمِعوا لَهُ وَأَنْصِتُوا) بەڵگەیە لەسەر فاتیحە نەخوێندنی (مأموم) لەدوای ئیمامێکەوە کەدەنگ بەرز دەکاتەوە گوتوویەتی: (ئەگەر ئایەتەکان تەواو بکرێن بەڵگە لەسەر خۆیان چونکە

---

[96] بۆ وێنە بڕوانە: (المجموع) ج٣ص٣١ تا ٣١٧، کە موناقەشەیەکی وردی قسەو بەڵگەکانیانی کردوە، هەروەها بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٢ (باب وجوب قراءة الفاتحة) وە (باب ماجاء في قراءة المأموم وانصاته اذا سَمِعَ إمامَهُ) ص٢٢٩ تا ٢٤٤. کەزۆر بەوردو قووڵی موناقەشەی ڕای گۆڕینی کردوەو سەرەنجام ئەویش ڕای جەماوەری ڕاست داناوە، هەروەها بڕوانە: (روائع البیان، تفسیر آیات الاحکام من القرآن) محمد علي الصابوني. (والحکم الثالث هل تجب قراءة الفاتحة في الصلاة؟)، وە (الحکم الرابع هل یقرأ المأموم خلف الامام؟) ج١ لە ص٥٤تا٥٩.

خوا فەرموویەتی: (واذا قُرِئَ القرآنُ فاسْتَمِعوا لَهُ وأَنْصِتوا لعلكُمْ تُرْحَمون. واذْكُرْ رَبَّكَ في نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وخِيفَةً وَدُونَ الجَهْرِ مِنَ القَوْلِ بِالغُدُوِّ والآصالِ ولاتَكُنْ مِنَ الغافِلِيْنَ) الاعراف - ٢٠٤، ٢٠٥ -، واتە: وە ئەگەر قورئان خوێنرا گوێی بۆ ڕاگرن و بێدەنگ بن بەڵکو ڕوحمتان پێ بکرێ. وە بەلاڵانەوەو ترسان و بێ دەنگ هەڵێنان لەبەر خۆتەوە بەیانیان و ئێواران یادی پەروەردگارت بکەو لەبێئاگایان مەبە!

- ابن حزم گوتوویەتی-(جا ئەگەر ئایەتی یەکەم دەربارەی نوێژ بێ ئەوە ئەوی دیکەشیان هەر لەبارەی نوێژەوەیەو، ئەگەر دووەمیشیان دەربارەی نوێژ نەبێ ئەوە بێگومان یەکەمیشیان هەر لەبارەی نوێژەوە نیە، دیارە دووەمیشیان جگە لەفەرمان کردن بەزیکر بەپەنهانی و دەنگ هەڵنەهێنان هیچی دیکەی تێدا نیەو ئێمەش هەر ڕامان وایە)! واتە ئێمەش ڕامان وایە کە (مأموم) بەدەنگی نزم و لەبەخۆیەوە فاتیحە بخوێنێ-

٣-دەربارەی بەڵگەی سێیەمیشیان دەڵێ: وە فەرموودەی[٩٧] (ابن أُكَيْمَة) یان بەبەڵگە هێناوەتەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (.. مالي أُنازَعُ القُرْآنَ..) واتە: "ئەوە بۆچی لەقورئان خوێندن دا کێشمەکێشم لەگەڵ دەکەن و لێم تێک دەدەن!!؟ وەهەر لەو فەرموودەیەدا قسەی (الزهري) تێدایە کەگوتوویەتی: (فانْتَهَى النَّاسُ عَنِ القِراءَةِ فِيْما جَهَرَ فِيْهِ رَسولُ اللهِ ﷺ مِنَ القِراءَةِ)

واتە: "لەوکاتەوە خەڵك وازیان لەقورئان خوێندن هێنا لەو نوێژانەدا کەپێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بەدەنگی بەرز تێدا دەخوێندن"، ... جا ئەگەر ئەم فەرموودەیە ڕاست (صحیح) یش بێ هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەوان تێدان نیە، چونکە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پێویستە بخرێنە پاڵ یەك نەك بەیەکتردا بدرێن، لەبەرەئەوەی کەهەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی هەموو هەقەو هەندێکی ئەوی دیکە بەڕاست دادەنێ و هیچی پێچەوانەی یەکتر نیە، جا پێویستە فەرمایشتی وی هەمووی وەك خۆی وەربگیرێ و کەم و زیادی تێدا نەکرێ، هەرکەسێك فاتیحە نەخوێنێ نوێژی بەرناکەوێ و ناشبێ - بەهۆی دەنگ هەڵێنانی "مأوم" وە قورئان خوێندنی ئیمام بشێوێنرێ..)

---

[٩٧] دەقی فەرموودەکە ئاوایە: (انِ رسول الله ﷺ انْصَرَفَ مِنَ صَلاةٍ جَهَرَ فيها بِالقِراءَةِ، فقال: هَلْ قَرأَ مَعِيَ أحَدٌ مِنكُمْ آنِفاً؟! فقال رَجلٌ: نَعَمْ يا رسولَ الله، قال: فانّي أقولُ: مالي أُنازَعُ القُرآنَ!!..) رواه ابوداود والنسائي والترمذي وقال: حديث حسن، واخرجه ايضا مالك في الموطا والشافعي واحمد وابن ماجه وابن حبان عن ابي هريرة عن ابن اكيمة عن الزهري، وقوله: (فانتهى الناس عن القراءة) مدرج في الخبر... وقال النووي: هذا مما لاخلاف فيه بينهم. بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٢ ص٢٣٨.

(شوكاني) یش ئاوا وەڵامی بەبەڵگەهێنانەوەی ئەم فەرموودەیە دەداتەوە: (ئەوانەی ڕایان وایە کە (مأموم) نابێ لەنوێژی (جهری)دا لەدوای ئیمامەوە هیچ بخوێنێ ئەم فەرموودەیەیان بەبەڵگەهێناوەتەوە، بەڵام ئەم فەرموودەیە هیچ پەیوەندی بەشوێنی کێشەوە نیە چونکە ئێمە دەڵێین: (مأموم) بۆی هەیە بەپەنهانی و لەبەر خۆیەوە لەپشت ئیمامەوە فاتیحە بخوێنێ و تەنیا لەکاتێك دا کێشمەکێش و لێشێواندن (منازعة)یش دێتەدی کە (مأموم) دەنگ بەرز بکاتەوە، نەك بەپەنهانی و لەبەر خۆیەوە..[98] )

٤-لەبارەی بەڵگەی چوارەمیشیانەوە گوتوویەتی: (هەروەها فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح)یان هێناوەتەوە.. کەدەفەرموێ: (إِنَّمَا جُعِلَ الأُمَامُ لِيُؤتَمَّ بِهِ فاذا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا واذا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا )[99] رواه الخمسة الا الترمذي وقال مسلم هو صحيح.

واتە: "ئیمام تەنیا بۆئەوە دانراوە کەبکرێتە سەرمەشق، جا هەرکات (الله اكبر)ی کرد ئێوەش (الله اكبر) بکەن، وەهەرکات قوڕئانی خوێند ئێوەش گوێبگرن و بێدەنگ بن"... (ابن حزم) پاش چەند قسەیەك دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (واذا قرأ فأنصتوا) وە فەرمووشیەتی: (لا صلاة لمن لم يقرأ بأم القرآن)، جا بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم ئەم فەرمانانە بەس دوو ڕێمان لەپێشن کەسێیەمیان نیە:

ا-یان دەبێ بڵێین: مەبەستی ئەوەیە کەهەرکاتێك ئیمام قوڕئانی خوێند – لەنوێژدا – بێدەنگ بن مەگەر بۆ خوێندنی فاتیحە، وەك ئێمە گوتمان.

ب- وەیان دەبێ بڵێین، مەبەستی ئەوەیە کەهەر کەسێك لەنوێژەکەیدا فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی بەرناکەوێ مەگەر بەهۆی ئەوەوە نەیخوێنێ کەئیمام دەیخوێنێ یان ئیمام بەدەنگی بەرز قوڕئان دەخوێنێ، وەك ئەوانی دیکە دەڵێن، .. پاشان دەڵێ: بەڵام کەسەرنجمان دا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان ﷺ بینی کە: (جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانی بۆوە – کەنوێژێکی "جهری"یە فەرمووی: ئایا لەدوای منەوە دەخوێنن؟! گوتیان بەڵێ بەخێرایی دەیخوێنین ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی وامەکەن مەگەر سوورەتی فاتیحە، چونکە نوێژ بەبێ وی بەرناکەوێ)، جا ئەم فەرموودەیە بەسە بۆ کۆکردنەوەو پێکەوە گونجاندنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ...).

---

[98] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٢ص٢٣٨.

[99] هەرچەندە (ابن حزم) فەرموودەکەی هێناوە بەڵام (تخريج)ی نەکردوە بۆیە فەرموودەکەم لە (نيل الاوطار)ەوە نەقڵ کرد بڕوانە (ج٢ص٢٣٦).

٤-پاشان دەربارەی بەڵگەی پێنجەمیشیان گوتوویەتی: (وە هەندێکیان گوتوویانە: مانای فەرمایشتی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ""لا صلاة لمن لم یقرأ بام القرآن" یانی: نوێژی تەواوی بەرناکەوی — واتە نوێژەکەی ناتەواوە -، بەڵام لەم قسەیەدا هیچ شتێکیان بەدەستەوە نیە، چونکە ئەگەر نوێژەکەی تەواوو کامڵ نەبوبێ مانای وایە هەر لەئەسڵ دا نوێژەکەیان بەرنەکەتوە، چونکە هەندێکی نوێژ وەبری هەمووی ناکەوێ..).

منیش دەڵێم: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ سیفەتو (قید)ێکی نەخستۆتە سەر نوێژە نەفی کراوەکە بۆ وێنە نەیفەرموو: (لاصَلاةَ کامِلةً) کە بێگومان ئەگەر مەبەستی ئەوە بووایە وای دەفەرموو، مادام وابێ ئێمە بۆمان نیە لەخۆمانەوە سیفەتو (قَیْد) بخەینە سەر فەرموودەی پێغەمبەری داناو قسە لەجێ ﷺ.

ئنجا ئەگەر گریمان ئەوجۆرە تەئویلو (قَیْد) خستنەسەر ڕاستیش بێت، خۆ هەر دەبێتە بەڵگە لەسەر پێویست بوون یان لانی کەم پەسەندو سوننەت بوونی خوێندنی فاتیحە لەنوێژدا، چونکە مادام نوێژ بەهۆی تێدا نەخوێنرانی فاتیحەوە کەلێنی تێدا پەیدابێتو ناتەواو دەربچێ کەواتە بۆ خۆپاراستن لەنوێژی ناتەواوو کەلێن تێدا پەیدا نەبوونی پێویستە یان لانی کەم سوننەتە فاتیحە بخوێنرێ.

٦- ئنجا دەربارەی بەڵگەی‌شەشەمیشیان گوتوویەتی: (هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە مەبەست لەفەرمایشتی: (لا صلاة لمن لم یقرأ بأم القرآن) تەنها ترساندنو هەڕەشەیە! بەڵام ئەمە بەدرۆ دانانی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ و هەرکەسێکیش قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرۆ بزانێ ئەوە کوفری کردوە، کوفری کەسیش لەکوفری ئەو کەسە زلتر نیە کەدەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم قسەیەی بەس بۆ ترساندنو سڵەماندنەوە فەرمووەو ڕاست نیە!!).

٧- وە لەکۆتایی وەڵامو بەرپەرچدانەوەکانیدا گوتوویەتی: (وە چەند فەرموودەیەکی لەمەحەك دەرنەچوو هەن کەهەموویان ڕستەی: (مَنْ کانَ لَهُ إمامُ فَأنّ قِراءَةَ الأمامِ لَهُ قِراءَة) وە لەهەندێکیان ڕستەی: (ماأریٰ الأمامَ إلّا قَدْ کَفاهُ) یان تێدایە، بەڵام سەرجەمیان یان (مُرْسَل)ن یان لە(جابر الجعفي) درۆزن گێڕراونەوە، یان لەگێڕەرەوەیەکی نەناسراو (راو مجهول)ەوە، وەئەگەر گریمان ڕاستیش بن فەرموودەی

پێغەمبەر ﷺ: (لا تَفْعلوا اِلاّ بِاُمِّ القُرْآنِ) بەسە بۆ ئەوەی هەموویان پێکەوە ڕێك بخاتو بیانگونجێنێ[100] — وەك پێشتر ئەوە ڕوون کرایەوە —).

ئێستاش بەرلەوەی باسی فاتیحە بەجێبهێڵین بەپێویستی دەزانم — سەرنجێکی وردی لێبدەینو هەندێك لەڕاستی‌یە مەزنەکانی بەگوشراوی بخەینەڕوو، بۆ ئەو مەبەستەش بەپەسندی دەزانم بگەڕێمەوە بۆ بەرهەمێکی (١٧) ساڵ لەمەوپێشم[101] کەبەناوی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) کەتەفسیرو لێکدانەوەیەکی تێرو تەسەلی سوورەتی فاتیحەیە:

## ڕاستی‌یە مەزنەکانی سوورەتی فاتیحە

لەکتێبی ناوبراودا سوورەتی فاتیحەم وەك دەریایەکی پڕ گەوهەرو مرواری تەماشاکردوەو لەهەر ئایەتێك لەحەوت ئایەتە بەپێزەکانی چەند دانە گەوهەرێكو سەرجەم (٣٣) دانە گەوهەرمان لێدەرهێناوە، کەبێگومان ئەو دەریا بێسنوورە زۆر لەوە زیاتریش گەوهەری لەکرین نەهاتووی تێدا هەن، جا ئەوە ئێمە لێرەدا بەپێی ڕیزی ئایەتەکانی سوورەتی فاتیحە ئەو سی‌وسێ (٣٣) گەوهەرە کە هەرکامێکیان ڕاستی (حقیقة)یەکی بەرزو مەزنە، دەنووسین، بەلام خوێنەری بەڕێز حەواڵەی کتێبی ناوبراو دەکەین بۆ درێژەی وەسفو پێناسەی گەورهەرەکانو چۆنیەتی وەرگیرانیشیان لەدەریای بێسنووری ئایەتە بەهێزو پێزەکانی سوورەتی بەرزو بەڕێزی فاتیحە:

**ئایەتی یەکەم: (بسم الله الرحمن الرحیم) بەناوی خوای بەبەزەییو بەخشندە.**

**١-خواناسینو خواپەرستی شتێکی خوارسكو سروشتی‌یە لەدڵو دەروونی مرۆڤدا.**

**٢-دەبێ لە سەرەتای ئەنجام دانی هەر کارو چالاکی‌یەکی شەرعی‌یانەدا ناوی خوا بهێنرێو بەناوی وی دەست پێبکرێ.**

---

[100] بڕوانە: (المُحَلّی) ج٣ص٣٦، تا ٢٣٤، المسالة: ٣٦٠ (ولايَجُوزُ لِلمأْموم اَنْ يَقْرَأ خَلْفَ الأُمامِ شَيْئاً غَيْرَ أُمِّ القرآن): هەروەها بڕوانە: (المجموع) ج٣ ص٣١٥تا٣١١، کەئەمیش دەربارەی ئەو فەرموودانەی (ابن حزم) بە (لەمەحەك دەرنەچوو) یان دادەنێ، گوتوویەتی: (كُلُّها ضَعيفَةٌ ولَيْس فِيْها شَيْءٌ صَحِيْحٌ عن النبيِّ ﷺ ..).

[101] کتێبی (پوختەیەك...) لەساڵی (١٩٨٣، نووسراوەو لە١٩٨٤) چاپ کراوە.

٣-خوا خاوەنی هەموو ناوێکی بەرزو سیفەتێکی چاکو پەسندە، بەڵام بەزەیی و بەخشندەیی یەکەی لەهەمووان زیاتر لەبوونەوەرو دەروبەرو ژیانو گوزەرانی ئینسان دا دەدرەوشێتەوە.

**ئایەتی دووەم: (الحمدلله رب العالمين) سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.**

١-پەروەردگارێتی خوا (ربوبية الله) هەم بەدیهێنەرایەتی و هەم بەرنامە دانەرێتی و فەرمانڕەوایەتیشی دەگەیەنێ.

٢-ستایشو مەدحی ڕاستەقینە تەنیا شایستەی خوایە، چونکە بەس ئەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو سەرچاوەی هەموو چاکەو نیعمەتێکیشە.

٣-پەروەردەکردنو مشوورخواردن چ لەڕووی ماددی و چ لەڕووی مەعنەوی یەوە چاکەو منەتێکی یەکجار گەورەو قورسە لەچاوی پەروەردە کراوانو مشوور لێخوراوان دا.

٤-ئینسان هەتا زانیاری دەربارەی بوونەوەرو سروشت زیاتر بێتو پێی شارەزاتربێ ئیمانو عەقیدەی پتەوتر ودامەزراوتر دەبێ و گەشەکردنو پەرەستاندنی زانیاری یە سروشتی یەکان بەگشتی لەخزمەت ئایینو چاکتر ئاشکرابوونو درەوشانەوەی ڕاستی یەکانی دان.

٥-پەیوەندی نێوان خوای پەروەردگارو بەندەی پەرستار لەڕوانگەی ئیسلامەوە، پەیوندی یەکی زیندووی جووڵاوو گەرمو گوڕە، نەك مردوو و ئیشك و ساردوسڕ وەك بیری فەلسەفی و زۆرێك لەکتێبو بەرهەمەکانی (عِلْمُ الكَلَامْ) پێشانی دەدەن.

**ئایەتی سێیەم: (الرحمن الرحيم) بەبەزەیی بەخشندەیە.**

١-بەزەیی و کەرەمو بەخششی خوای بەخشەرو میهرەبان لەهەموو بوونەوەرو سەرجەم دروستکراوەکانی دا دەدرەوشێتەوە لەگەردیلەوە هەتا کەهکەشان.

٢-خوا لەڕووی چاکەکاری و بەخششەوە کائینات بەگشتی و ئنیسانەکانی بەتایبەتی خوڵقاندوە بۆئەوەی چاکەمان لەگەڵ بکاتو لەنازو نیعمەتەکانی خۆی لەدنیاو قیامەت دا بەهرەمەندمان بکات.

٣-پەیوەندی نێوان خواو ئینسان لەئیسلام لەسەر بناغەی بەندایەتی کردنی مرۆڤو پەرستراوێتی خواو ڕێزو خۆشەویستی دووسەرە بنیات نراوە (يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ).

ئایەتی چوارەم: (مالك يوم الدين) خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە.

١-ڕۆژی دوایی دوای هەڵگێرانو پێچرانەوەی بازاڕی ژیانی دنیاو تێکچوونی بوونەوەر (ئاسمانەکانو زەوی) دێتە پێشو کارەساتە مەزنەکانی یەك لەدوای یەكو بەزنجیرە ڕوودەدەن.

٢-ئەنجامی ڕۆژی قیامەت لێك هەڵاوێررانی پاكو پیسانو پۆلێن کردن (تصنیف)ی ئینسانەکانە لەسەر بناغەی دادگەری موتڵەقی خواو لەبەر تیشکی پەرێزو بەرهەمیان دا.

٣-هەر کام لەشەرعو عەقڵو ویژدانی ساغ هەبوونو هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت کە دادگەری خوای تێدا بەرجەستە دەبێ - بەجوانترینو باشترین شێوەی - و هەرکەسە لەشوێنی شایستەو پڕ بەپێستی خۆیدا نیشتەجێ دەکرێ،دەکەنە شتێکی مسۆگەرو حەتمیو چاوەڕوان کراوو نکووڵی لێنەکراو.

٤-بەهۆی بڕوابوون بەڕۆژی دواییەوە ئینسان:

ا-ئارامیو ئۆخژنی لەدڵو دەروون دا پەیدادەبێو لەدڵەڕاوکێ قوتاری دەبێ.

ب-عیززەتو جورئەتو جوامێریو فیداکاری لەئینسان دا پەیدادەبێو ئنیسان لەژیانو مردنی دنیا بێمنەتو بێباك دەبێ.

ج- کۆمەڵگا پێکەوە جۆشدراوو تەباو گونجاو دەبێو بەرژەوەندییە گشتییەکانی تێدا پارێزراو دەبن.

## ئایەتی پێنجەم: (اياك نعبد واياك نستعين) تەنیا تۆ دەپەرستینو بەس لەتۆ یارمەتی دەخوازین.

١-خواپەرستیی بریتیە لە: ئەوپەڕی گەردن کەچی بۆ خوا وێڕای ئەوپەڕی بەگەورەو مەزن گرتنو خۆشویستنی، بەمەعنای فراوانو هەمەلایەنەی گەردن کەچیو بەگەورەگرتنو خۆشویستن.

٢-بنكو ڕیشەی بەندایەتیو پەرستن (عبادة) بریتیە لە: لەهەموو شتێكو هەموو کەسێك زیاترو چاکترو قووڵتر خۆشویستنی خوای بێوێنەو هاوەڵ.

٣-خواپەرستیو بەندایەتی بۆ خواکردنو لێنزیك بوونەوەی بێجگە لەدوو مەرجی سەرەکی بەپێی شەرعی خوابوونو بەس بۆ خوابوون، دەبێ بەپلە پلەیی (تَدَرُّج) یش بێتو کەس لەپڕ نابێ بەکوڕ.

٤-هەركات بەندە ئەركی خۆی بەرانبەر بەخوا ئەنجام داو بەتەنها بە پەروەردگارو پەرستراوی خۆی داینا، خـوای بەخشـەریش یەکسـەرو بێ‌درەنگ بەدەنگیـەوە دێ‌و دەستی دەگرێ‌و ڕێزی دەگرێ.

٥-خـوا بەیـەکگرتن (التوحیـد) کـاکڵ‌و جەوهــەری خواپەرسـتی‌و دینداری‌یـە بەهەرسێك بەشی:

تـەنیا خوا بەبەدیهێنـەرو پـەروەردگار گرتـن‌و، بـەس خواپەرسـتن‌و، هیـچ کـەس‌و شتێك بەشدارنەکردن لەناوو سیفەتە بەرزو پەسندو بێ‌وێنەکانی خوادا.

٦-کردەوەی چـاك‌و ڕەفتـاری جـوان زادەو بەرهـەمی ئیمـان‌و عـەقیدەن‌و مەحاڵـە لەیەك جیابنـەوەو لێك بـترازێن مەگـەر بەشـێوەیەکی جوزئـی‌و لەحاڵـەتێکی ڕیزپـەڕو زووتێپەڕدا.

٧-ئیسلام گرنگی‌و بایەخێکی زۆری بەیەکبوون‌و برایـەتی‌و یـەکڕیزی مسـوڵمانان داوەو، یەکڕیزی‌و یەکدەنگ‌و ڕەنگی مسوڵمانانیش بەرهـەمی سروشـتی‌ی دینداری‌و خوا بەیەکگرتنیانەو، بەم پێ‌یە هەر کەموکوڕی‌و ناتەواوی (خَلَل)ێك لەبرایـەتی‌یان دا هەبێ دەگەڕێتـەوە بۆ ئیمان‌و دینـداری‌و خوا بەیەکگرتنەکەیان، چونکە سـەرچاوەی ڕوون‌و سازگار، ئاوی ئەو جۆگەلانەش کەلێیەوە هەڵدەبەسترێن لەقەدەر خۆی دەبن.

٨-لەسۆنگەی ئەوەوە کەکۆمـەڵگای ئیسـلامی لەسـەر بناغـەی مەحکـەم‌و پتـەوی ئیمان بنیات دەنرێ‌و ئەندام‌و تاکـەکانی خۆی لەبازنـەی فراوانـی ئیمـان دا پێکـەوە پەیوەسـت دەکـات، کۆمـەڵگای ئیسـلامی – ئەگـەر بەمـەعنای وشـە ئیسـلامی‌بێ – هەمیشە پتەوترین‌و پێکەوە جۆشداوترین‌و یـەکدەنگ‌و ڕەنگ‌و سـەنگترین کۆمـەڵگاو فراوانترین کۆمەڵگا دەبێ‌و، هیچ شتێك درزی تێ‌ناکات‌و هیچ کەسێك زەفەری پێ‌نابات.

**ئایەتی شەشەم: (اهدنا الصراط المستقیم) ڕێروونیمان بکە بۆ ڕاستەڕێ.**

١-بەرنامەو ڕێبازی ژیان‌و گوزەران دەبێ تەنیا لەلایەن خواوە دابنرێ‌و هەرکەس‌و هەر لایەنێك لافی بەرنامە دانان بۆ خەڵکی لێ‌بدات ئەوە دەیەوێ خوایەتی‌یان بەسەردا بکات‌و گیرۆدەی داوی کۆیلایەتی‌یان بکات.

٢-بێجگە لەئایین‌و بەرنامەی خوا هیچ ڕێبازێکی دیکەی ڕاست‌و دروست بۆ ژیانی تاکی‌و کۆمەڵی ئینسان نیەو، سـەرجەم ئـایین‌و ڕێبازەکـانی‌تر بەرێچکەو کوێرەڕێ دادەنرێن.

٣-بۆیە تەنیا ئیسلام بەڕێگای ڕاست دانراوە چونکە تاقە بەرنامەو پەیڕەوێکە پڕ بەپێستی ئینسان بێتو وەڵامگۆی هەموو پرسیارو داخوازیەکانی فیطرەتی بێت، ئاشکرایە کەهەر ئەمەش لەئایینێك چاوەڕوان دەکرێ کەلەلایەن خوایەکی پەروەردگارو زاناو تواناو کاربەجێو بەبەزەییو پەنهان بینو.. هتدوە نێررابێت!

**ئایەتی حەوتەم: (صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين ڕێبازی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردوون نەك لێتووڕەبووان وەنەك ڕێ لێون بووان.**

١-هەمیشە ئایینو بەرنامەی خوای کاربەجێ (الصراط المستقيم) بوونی لەسەر زەوی واقیع پەیوەستە بەبوونی کۆمەڵی مسوڵمان (الذين أنعمت عليهم)ەوە.

٢- ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت گرتنو خۆشویستنو شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەران بەگشتیو بەتایبەت پێغەمبەری کۆتایی ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی خوالێیان ڕازیبێ ئەرکی سەرشانی هەر مسوڵمانێکە.

٣-ئیمان گەورەترینو چاکترین نیعمەتە کەخوا بەئینسانی دەبەخشێو بەبێ ئەو نیعمەتە هەرە چاكو بەرزە، ئینسان نەك لەنیعمەتەکانی تر بەهرەمەند نابێت بگرە بۆیشی دەبنە بەڵاو (نِقْمَة) و نەگبەتیو لەسەریشیان قەرزدار دەبێتەوە.

٤-پێویستە مسوڵمان وێڕای خۆشویستنو دۆستایەتی ئەهلی ئیمان و ئیسلام، بوغزاندنو دوژمنایەتی ئەهلی کوفرو نیفاقیشی هەبێ، هەر بۆیەش دۆستایەتی کردنو دوژمنایەتیکردن لەپێناوی خوادا (المُوالاة والمُعاداة في الله) هێندە پایەیەکی بەرزی هەیە لەئایینی خوادا.

٥-بۆیە کۆمەڵی مسوڵمان بەیەك سیفەت (الذين أنعمت عليهم) وەسف کراونو بێبڕوایان بەدوو سیفەت (المغضوب عليهم، الضالين) پێناسەکراون، چونکە هەق هەر یەکەو یەکڕیزیو یەکڕەنگیش لەشوێن کەوتووانیدا دێنێتەدی، بەڵام (باطل) جۆراوجۆرەو جیاجیاییش لەشوێن کەوتووانیدا پەیدا دەکات.

٦-سەرچاوەی زۆربەی هەرە زۆری لادانەکان (انحرافات)ی ئینسانەکان زیادەڕۆییو بەزایەدان (إفْراط وتَفْريط)و نەپاراستنی هاوسەنگییە لەنێوان جێبەجێکردنی داخوازییەکانی ڕووحو جەستەو دواڕۆژو دنیاداو، گەورەیی ئیسلامیش لەبەر قەرارکردنی ئەو هاوسەنگی (توازن)یەدا بەجوانترین شێوەی دەدرەوشێتەوە.

٧-سەرسەخت ترینی دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و مسوڵمانان جوولەکە هەقنەویستەکان و نەصرانییە سەرلێشێواوەکانن، کەبەدرێژایی مێژووی ئیسلام هەر سەرگەمی نەخشەو پیلان و فێڵ و تەڵەکە بوو ون لەبەرانبەر ئیسلام داو، مەگەر چۆن دەنا تێکرای ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردەکانیش هەر نەمامی زۆری دەستنێژی ئەو دوو تاقم و پێرە بێخێرەن.

## بڕگەی یازدەیەم: قورئان خوێندنی پاش فاتیحە

ئنجا دوای خوێندنی فاتیحە سوننەتە سوورەتێك یان سێ ئایەت و زیاتریش بخوێنی، جا ئێستا بۆئەوەی بزانین ئەندازەی ئەو سوورەتانەو ژمارەی ئەو ئایەتانەی کەلەدوای فاتیحە دەخوێندرێن چەندە، باسەرنجی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بدەین داخوا چۆن چۆنی باسی یەك یەکی نوێژە فەرزەکان دەکەن لەوبارەوە:

١- نوێژی بەیانی: پێغەمبەر ﷺ هەندێك جاران سوورەتی (الواقعة) و هاووێنەکانی لەدوو ڕکاتەکانیدا دەخوێند - واتە بەهەردووك ڕکاتەکانی سوورەتەکەی تەواو دەکرد - وەك (احمد وابن خزيمة) دەگێڕنەوە، هەندێك جاریش وەك (مسلم) دەگێڕێتەوە سوورەتی (ق. والقرآن المجيد)ی لەیەك ڕکات دا دەخوێند، جاریش بووە کە ئەندازەی شەست (٦٠) ئایەتی لەهەر ڕکاتێك یان بەرهەەدووکیان دەخوێند، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە، جارێکیش سوورەتی (اذا زلزلت)ی لەهەردووك ڕکاتەکان دا خوێندوە وەك (ابوداودو البيهقي) گێڕاویانەتەوە، کەرەتێکیش هەردووك سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و(قل أعوذ برب الناس)ی لەدوو ڕکاتەکان دا خوێندوە، وەك (ابوداود و ابن خزيمة) دەگێڕنەوە، جاری واش بووە سوورەتی (الروم) یان (يس) ی خوێندوە، وەك (احمد) گێڕاویەتەوە.

وەلەبەیانیانی ڕۆژی جومعەدا لەڕکاتی یەکەم دا (الم تنزيل "السجدة") و لەڕکاتی دووەم دا (هَلْ أتَىٰ على الأنسان)ی دەخوێند، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

وە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لەڕکاتی یەکەم دا پتری دەخوێند لەئی دووەم وەك هەرکام لەدوو پێشەوای مەزنی فەرموودەناسیی (بخاري ومسلم) لە (صحيح)ەکانی خۆیان دا گێڕاویانەتەوە.

٢- **نوێژی نیوەڕۆ:** پێغەمبەر ﷺ لەدوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا پاش فاتیحە دوو سوورەتی دەخوێندن، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە، وە لەڕکاتی یەکەم دا زیاتری دەخوێند لەئی دووەم، جاری واش بووە وەك (مسلم واحمد) گێڕاویانەتەوە لەهەر کام لەو دووڕکاتانەدا ئەندازەی سی (٣٠) ئایەتی خوێندوە، هەندێك جاریش سوورەتەکانی وەك : (والسماء والطارق) و(والسماء ذات البروج)و(والليل اذا يغشى) و هاووێنەکانیانی خوێندوە، وەك (ابوداود و ترمذي وابن خزيمة) دەگێڕنەوە، وە جاری وابووە — وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە — کەپێغەمبەر ﷺ هێندە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژکردۆتەوەو قورئانی زۆری تێدا خوێندوە کە دوای قامەت کران یەکێك هاتوەو چووە بۆ بەقیع بۆ تارەت گرتن، پاشان چۆتەوە ماڵی خۆی بۆ دەست نوێژگرتنو دوایی کەهاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەڕکاتی یەکەم دا بووە!، وە زانیویانە کەمەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەوەدا ئەوەبووە کەخەڵکی فریای ڕکاتی یەکەم بکەون. وەك (ابوداود) دەگێڕێتەوە.

**دیارە هەندێك جاریش پێغەمبەر ﷺ لەڕکاتی سێیەمو چوارەمیشدا پاش فاتیحە قورئانی خوێندوە، بەڵام هێندەی نیوەی دووڕکاتی یەکەمو دووەمی تێدا دەخوێندن، وەك (مسلم واحمد) گێڕاویانەتەوە[١٠٢].**

٣-**نوێژی عەسر (العصر):** پێغەمبەر ﷺ لەدوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی ئێوارەدا پاش فاتیحە دوو سوورەتی خوێندوونو یەکەمیشی درێژتر کردۆتەوە لەیەکەم، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە، مەبەستیشی لەدرێژکردنەوەی یەکەم فریاکەوتنی خەڵکی بووە وەك (ابوداودو ابن خزيمه) دەگێڕنەوە وەبەئەندازەی پازدە (١٥) ئایەت، واتە نیوەی ئەوە کە لەدوو ڕکاتی یەکەمی نیوەڕۆدا دەیخوێند، قورئانی تێدا دەخوێندنو، دوو ڕکاتی کۆتاییشی هێندەی نیوەی دوو ڕکاتی یەکەم درێژدەکردنەوە، وەك (مسلم واحمد) دەگێڕنەوە، وە لەدوو ڕکاتی کۆتاییدا سوورەتی فاتیحەی خوێندوە، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

---

[١٠٢] کەواتە سوننەتە جاروبار — نەك بەبەردەوامی — لەدوو ڕکاتی سێیەمو چوارەمیش دا جگە لەفاتیحە چەند ئایەتێك بخوێندرێن، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص٢٣٥، هەروەها: (المجموع) ج٣ص٢٤١.

٤- **نوێژی شێوان (مَغْرِب)**: (نَسائي واحمد) گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ هەندێك جاران سوورەتە کورتەکانی لەنوێژی شێوان دا دەخوێندن، وە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە کەجاری وابووە سوورەتی (محمد)ی لەنوێژی شێوان دا خوێندوە، وە (بخاري واحمد وابوداود) گێڕاویانەتەوە کەهەندێك جاران سوورەتی (الاعراف)ی لەدوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی شێوان دا دەخوێند، وەدوایین نوێژی شێوان کەکردوویەتی سوورەتی (المرسلات)ی تێدا خوێندوە، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە، جاری واش بووە کەسوورەتی (الانفال)ی لەهەردووك ڕکاتەکان دا خوێندوە، وەك (طبراني) دەڵێ.

٥- **نوێژی خەوتنان (العِشاء)**: پێغەمبەر ﷺ لەدوو ڕکاتی یەکەمیدا سوورەتە نێوەنجیـیە کورتەکان (وَسَط المُفَصَّل)ی دەخوێند، وەك (نسائي واحمد) گێڕاویانەتەوە، جا جاری وابووە (والشمس وضحاها) و سوورەتە هاوێنەکانی تێدا دەخوێندن. وەك (احمد وترمذي) دەگێڕنەوە، وە (بخاري مسلم) دەگێڕنەوە کەجاری وابووە (اذا السماءُ انْشَقَّتْ)ی خوێندوەوسوجدەشی بردوە. وە (بخاري ومسلم) دەگێڕنەوە کەجارێکیان لەسەفەرێ سوورەتی (والتين والزيتون)ی لەڕکاتی یەکەم دا خوێندوە.

وە جارێکیان وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە (معاذ بن جبل) نوێژی خەوتنانی بەهاوەڵەکانی کردو نوێژەکەی درێژکردەوە، کابرایەك لەئەنصاریـیەکان جیابۆوەو نوێژەکەی خۆی بەتەنیا کرد، جا کاتێك (مُعاذ) هەواڵی کابرای پێدرا، گوتی: بێگومان ئەوە مونافیقە! جا کاتێك کابرا ئەوەی پێگەیشتەوە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەئەوەی (مُعاذ) گوتبووی پێی ڕاگەیاند، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو ئەی (مُعاذ) ئایا دەتەوێ خەڵکی بسڵەمێنیەوە!! هەرکات پێش نوێژیت بۆ خەڵکی کرد (والشمس وضحاها) و(سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَىٰ) و (إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ) و (واللَّيلِ اذا يَغْشَىٰ).. بخوێنە چونکە بابای بەساڵاچوو و لاوازو خاوەن ئیش نوێژت لەدواوە دەکەن — و پێویستە ئاگات لێیان بێ — [١٠٣].

[١٠٢] ئەو فەرموودانەی کە لەبەندی یازدەیەم دا هێناومنەوە لەم سەرچاوانەی خوارەوەم وەرگرتوون دەتوانی بۆ زن[illegible]یان:

## برگەی دوازدەیەم: ڕکووع بردن

پاشان — ئەی مسوڵمانی بەڕێز! — کە لەخوێندنی سوورەتی دوای فاتیحە بوویەوە هەڵوەستەیەك بکە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك (ابوداود وحاکم) گێڕاویانەتەوە وای کردوە، دوایی وەك کاتی نوێژ دابەستن هەردووك دەستەکانت بەرز بکەوەو بڵێ (الله اکبر)و بچۆ ڕکووع چونکە (بخاري ومسلم) بەوشێوەیە چوونە ڕکووعی پێغەمبەریان ﷺ بۆ گێڕاوینەوە.

**چۆنیەتی ڕکووع بردن:** پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕکووع بردن دا هەردووك لەپە دەستی لەسەر هەردووك ئەژنۆی دادەنان وەك (بخاري وابوداود) گێڕاویانەتەوە، وە هەرئەوان گێڕاویانەتەوە کەرهەدووك دەستی لەسەر هەردووك ئەژنۆی دەچەسپاندن وەك ئەوەی توند بیانگرێ، وە (ترمذي) گێڕاویەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ هەردووك ئانیشکی لەهەردووك لاتەنیشتی دوور دەخستنەوەو بەخۆیەوە نەیدەچەسپاندن، وە (بخاري) گێڕاویەتەوە کە پشتی درێژو تەخت و یەکسان دەکرد، بەجۆرێك — کەوەك (ابن ماجە و طبراني) دەگێڕنەوە ئەگەر ئاوی ڕژێنرابایەسەر لەسەری دەوەستا!! وە (بخاري وابوداود) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری پێشەوامان لەدەمی ڕکووع بردن دا نەسەری خۆی زۆر نەوی دەکرد، وە نە لەڕێکایی پشتی پتری بەرز دەکردەوە.

**ئارام گرتن (الأطمئنان) لەڕکووع دا:** ئنجا کەبەو جۆرەی لەبەر تیشکی فەرموودەکان دا ڕوون بۆوە ڕکووعت برد بەوجۆرە ماوەیەك بمێنەوەو ئارام بگرە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**(أَسْوَأُ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ مِنْ صَلاتِهِ، قالوا يارسولَ الله وكَيْفَ يَسْرِقُ مِنْ صَلاتِهِ؟ قال: لايُتِمُّ رُكُوعَها وسُجُودَها)** اخرجه الطبراني والحاكم وصححه و وافقه الذهبي.

**واتە:** خراپترین جۆرە دز لەنێو خەڵکیدا ئەو کەسەیە کەدزی لەنوێژەکەی دەکات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چاچۆن دزی لەنوێژەکەی دەکات؟! فەرمووی: ڕکووعو سوجدەکانی تەواو ناکات. (بێگومان لێرەدا مەبەست ئارام نەگرتن و بەئەندازەی پێویست نەمانەوەیە لەڕکووعو سوجدەدا).

---

أ-(صفة صلاة النبي) ﷺ نووسینی: ناصر الدين الألباني لە (ض١٠٦تا١١٧).

ب-(المَجْموع) ج٣ص٣٢٢تا٣٣٩، ج- (نَيْل الأُوطار) ج٢ص٢٤٦تا٢٦١.

د- (المُحَلّى) ج٤ص٩٨تا[illegible] هـ- (المغني و الشرح الكبير) ج[illegible]

لەڕكووع دا چ دەڵێ؟! سوننەتە لەڕكووع دا یەكێك لەم زیكرانەی خوارێ بڵێ:

أ- (سُبْحَانَ رَبِّي العَظِيْم) بەلای كەمەوە سێ جاران، رواه احمد وابن ماجه وابوداود والطبراني. واته: پەروەردگاری مەزنم بەپاك دەگرم.

ب- (سُبْحَانَ رَبِّي العظيم وبِحَمْدِهِ) رواه احمد وابودادو والطبراني والبيهقي.

واته: پەروەردگاری مەزنم بەپاك دەگرم و ستایشی دەكەم، ئەمیش سوننەتە سێ جار یان زیاتریش دووبارە بكرێتەوە.

ج- (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ المَلائِكَةِ والرُّوحِ) رواه البخاري ومسلم، واته: - خوا - زۆر پاك و بێگەردو بێ هەڵەو پەڵەیە، پەروەردگاری فریشتەكان و جوبرائیلە.

د- (اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، أَنْتَ رَبِّي، خَشَعَ سَمْعِي وَبَصَري ودَمِي وَلَحْمِي وعَظْمِي وعَصَبِي للهِ رَبِّ العالَمِيْنَ) رواه النسائي بسند صحيح،

واته: ئەی خوایە! ڕكووعم بۆ تۆ بردو بڕوام بەتۆ هێناوەو گەردن كەچی تۆم و پشتم بەس بەتۆ بەستوە، تۆ پەروەردگارمی، بیستنم و دیتنم و خوێنم و گۆشتم و ئێسقانم و مۆخ و دەمارم گەردن كەچە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكان.

هـ- (سُبْحَان ذِي الجَبَروتِ والملَكوتِ والكِبْرِياءِ والعَظَمَةِ) رواه ابوداود والنسائي بسند صحيح،

واته: پاكی بۆ - خوای - خاوەنی باڵادەستی و خاوەندارێتی و ئەوپەڕی گەورەیی و مەزنایەتی.

و-(سُبْحانَك اللهمَّ رَبَّنا وبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْلي) متفق عليه، واته: ئەی خوایە بەپاكت دەگرم پەروەردگارمان ستایشت دەكەم. ئەی خوایە لێم ببوورە.

ز- (سُبْحانَكَ وبِحَمْدِكَ لا إِلٰهَ الا أَنْتَ) رواه مسلم.

بەڵام دروست نیە لەهیچ كام لەڕكووع و سوجدەدا قورئان بخوێنێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردوە: (كانَ -ﷺ- يَنْهَى عن قِراءَةِ القُرآنِ في الرُّكُوعِ والسُّجودِ) رواه مسلم.

وەپەسەندیش نیە كە لەیەك كات دا - لەڕكووع و سوجدەدا - دوو جۆر یان زیاتر لەزیكرەكانی ڕكووع و سوجدە پێكەوە كۆبكاتەوە، بەڵكو وەك لەباسی: (چەند ئاگاداری‌یەكی گرنگ...)دا ڕوونمان كردەوە باشترو بگرە سوننەت وایە كەهەرجارە یەكێك لەو زیكرانە بخوێنێ وەهەرچەندە ڕێزی زۆرم بۆ (نَوَوي) هەیە - ڕەحمەتی

خوای لێبێ – بەڵام ئەو ڕایەی کە لە هەرکام لە(المجموع)[١٠٤] و (الأذكار)ە کەیدا هەڵیبژاردوە – کە چاکتر وایە چەند زیکرێك پێوەکە کۆبکاتەوە – هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە بۆ ئیسپاتی نەك چاکتر بوون بگرە پەسندو چاکبوونی ڕایەکەیشی!

## بڕگەی سێزدەیەم: هەستانەوە لەڕکووع (الاعتدال)

ئنجا کە بەوجۆرەی باسمان کرد چوویە ڕکووعو تەواوبووی، ئاوا لەڕکووع هەڵسەوەو بچۆوە حاڵەتی ڕێك ڕاوەستان (الاعْتِدال):

پشت ڕاست بکەوەو بەدەم پشت ڕاست کردنەوەوە بڵێ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)

واتە: هەرکەسێك ستایشی خوا بکات خوا دەیبیستێ و لێیوەردەگرێ، چونکە (بخاري ومسلم) دەگێڕنەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوەو وای فەرمووە، ئنجا کەتەواو پشتت ڕاست کردەوە بڵێ: (رَبَّنا وَلَكَ الحَمْدُ) یان (رَبَّنا لَكَ الحَمْدُ) واتە: وە ئەی پەروەردگارمان سوپاس بۆ تۆیە، ئەمەش (بخاري) لەپێغەمبەری پێشەوامانی گێڕاوەتەوە، وەجاری واش بووە ئەمەشی خستۆتە پاڵ ئەوەی ڕابرد: (مِلْأَ السَّمٰواتِ و مِلْأَ الأرْضِ و مِلْأَ ماشِئْتَ مِنْ شَيْئٍ بَعْدُ) متفق عليه.

واتە: .. پڕی ئاسمانەکانو پڕی زەویو پڕی هەرشتێکی دیکە کەتۆ حەزبکەی، دیارە بەدەم هەستانەوەوە سوننەتە هەردووك دەستەکانیشت بەرزبکەیەوە، وەك چۆن لەکاتی چوونە ڕکووع دا بەرزت کردنەوە، ئەمەش (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

دەشتوانی دوای گوتنی: (سمع الله لمن حمده) ئەمە بڵێی: (رَبَّنا وَلَكَ الحَمْدُ حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فيْهِ) رواه البخاري وابوداود، واتە: وە پەروەردگارمان ستایش هەر لایەقی تۆیە ستایشێکی زۆرو پاكو چاكو پیتو پیرۆزدار، یان دەتوانی ئەمە بڵێی: (رَبَّنا لَكَ الحَمْدُ مِلْأَ السَّمٰواتِ والأرض ومِلْأَ ماشِئْتَ مِنْ شَيْئٍ بَعْدُ أهْلَ الثَّناءِ والمَجْدِ أحَقُّ ماقال العَبْدُ وكُلُّنا لَكَ عَبْدٌ، اللّٰهم لامانِعَ لِما أعْطَيْتَ ولامُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ ولايَنْفَعُ ذَالجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ) رواه مسلم.

واتە: ئەی پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆیە پڕی ئاسمانەکانو زەویو پڕی هەر شتێکی دیکە کەحەزبکەی، ئەی خاوەنی مەدحو سەناو پایەی بەرز، شایستەترین قسە کەبەندە گوتوویەتیو هەمووشمان بەندەی تۆین: ئەی خوایە هیچ پەرچو ڕێگرێك لەبەردەم بەخشینت دا نیەو هیچ کەسێکیش ناتوانێ شتێك ببەخشێ کەتۆ ناتەوێ، وە ماڵو سامانی هیچ خاوەن ماڵێك لەبەرانبەر دەستەڵاتی تۆدا دادی نادات و لەفریای نایەت.

---

[١٠٤] بڕوانە: (المجموع) ج٣ ص٣٧٠ تا ٣٧٢.

دیاره شتێکی ڕوونیشه کەمانەوەو ئارامگرتنی (الأُطمئنان) لەڕاوەستانی دوای ڕکووع بردن دا فەڕزە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو کەسەی فەرموو کەنوێژەکەی ناتەواو بووە وە لەکتێبەکانی سوننەت بە (المُسيئ صَلاتَهُ) ناسراوە:

(ثم ارْفَعْ رأْسَكَ حتَّى تَعْتَدِلَ قائِماً فَيَأْخُذَ كُلُّ عَظْمٍ مَأْخَذَهُ) متفق عليه، واتە: پاشان سەرت بەرزبکەوە هەتا ڕێك ڕادەوەستیو هەموو ئێسقانێك دەچێتەوە شوێنی خۆی. (جادیارە بەبێ ئارامگرتنو مانەوە بەوەستاوی ئێسقانو جومگەکانی جەستە لەشوێنی سروشتیو ئاسایی خۆیان دا سەقامگیر نابنەوە).

## بڕگەی چواردەیەم: کڕنووش بردن (السُّجود).

ئنجا (الله اکبر) بکەو بچۆ کڕنووش، چونکە (بخاري ومسلم) وایان لەپێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە.

**چۆنیەتی کڕنووش بردن:** پاش گوتنی (الله اکبر) هەردووك دەستەکانت لەتەنیشتەکانت دووربخەوەو ئەوجار سوجدە ببە چونکە (ابن خزيمة وابويعلى) وامان بۆ دەگێڕنەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ، ئنجا سەرەتا هەردووك ئەژنۆتو پاشان هەردووك لەپە دەستت بخەسەرزەوی کەئەمە ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانی لەسەرە، یاخود هەردووك لەپە دەستت و پاشان ئەژنۆیەکانت لەسەر زەوی دابنێ کەئەمەش ڕای هەندێکیانەو دواتر زیاتر تیشکی دەخەینەسەر، دیارە هەرکام لەم دوو ڕایەش کۆمەڵێك فەرموودە دەلالەتیان لەسەر دەکەن وەك دوایی دەیخەینەڕوو.

دوایی سەنگو قورسایی خۆت بخەسەر هەردووك لەپە دەستتو قامکەکانت پێکەوە بنووسێنەو ڕوویان پێبکە قیبلە، چونکە (بیهقي) وای گێڕاوەتەوە، وە دەتوانی دەستەکانت لەئاست هەردووك شانەکانت یان لەئاست گوێیەکانت دابنێی وەك (أُبوداود) بۆمان دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ، ئنجا نێو چاوان (تەوێڵ)و لووت لەسەر عەرزێ بچەسپێنە چونکە (أُبوداود و تِرمُذي) وایان گێڕاوەتەوە هەروەها هەردووك ئەژنۆتو هەردووك سینگو پەنجەی پێیەکانت لەسەر زەوی بچەسپێنە، چونکە (بَيْهقي) وای گێڕ اوەتەوەو (حاکم)یش بەڕاست (صحيح) ی داناوە.

کەواتە: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئینسان لەکاتی کڕنووش بردن دا حەوت (٧) ئەندامی لەسەر زەوی دەبن، نێوچاوانو ڕووی، هەردووك لەپی دەستیو هەردووك ئەژنۆیو هەردووك پێی: (إذا سَجَدَ العَبْدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبْعةُ آراب، وَجْهُهُ وكَفّاهُ ورُكْبَتاه وقَدَماهُ) رواه مسلم وابن حبان.

بەڵام وریابە لەکاتی کڕنووش بردن دا باسکەکانت لەسەر زەوی ڕانەخەی‌و بەخۆشتیانەوە نەنووسێنی، چونکە (بخاري) لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە: (كانَ ﷺ لايفتَرِشُ ذِراعَيْهِ.. كانَ يَرْفَعُهُما عَنِ الأَرْضِ وَيُباعِدُهُما عَنْ جَنْبَيْهِ حَتّى يَبْدُوَ بَياضُ ابطيه من وراءه) واتە: پێغەمبەر ﷺ باسکەکانی خۆی ڕانەدەخستن.. لەسەرزەوی بەرزی دەکردنەوەو لەهەردووك تەنیشتی دووری دەخستنەوە هەتا سپیایی بن هەنگڵەکانی لەپشتەوەی ڕا دیاردەبوو.

**ئارام گرتن لەکڕنووش بردن دا:** دیارە ئارام گرتن (اطمئنان)یش لەکڕنووش بردن دا فەرزە وەك پێشتریش باس کرا، بۆیە پێویستە ماوەیەك تێیدا بمێنیەوەو ئارام بگری بۆئەوەی نەکەویە بەر ئەو هەڕەشەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دزیکردن لەنوێژ بەخراپترین جۆری دزی دادەنێ‌و لەباسی ئارام گرتن لەکڕووع دا هێنامانەوە.

**زیکرەکانی کاتی کڕنووش بردن:** ئنجا کە بەوشێوەیەی باس کرا چوویە سوجدە یەکێك لەم زیکرانە بخوێنەو ئەگەر وەك پێشتریش باسمان کرد، هەرجارەش یەکێکیان بێ چاکترە:

أ-(سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى) رواه ابوداود وابن ماجه والطبراني، واتە: پەروەردگاری هەرەبەرزم بەپاك‌و بێگەرد دەگرم – لەهەموو هەڵەو پەڵەیەك – (لانی کەم سێجاران دووبارە بکرێتەوە).

ب-(سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى وَبِحَمْدِهِ) رواه ابوداود واحمد والطبراني والدارقطني، (ئەمیش بەلانی کەمەوە سێجار دووبارە بکرێتەوە).

ج- (سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْلِي) متفق عليه، (پێشتر ماناکراوە).

د- (اللَّهُمَّ اغْفِرْلِيْ ذَنْبِي كُلَّهُ، وَدِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلانِيَتَهُ وَسِرَّهُ) رواه مسلم.

واتە: ئەی خوایە لەهەموو گوناحەکانم ببوورە، وە لەوردو درشتی‌و، لەئی پێشێ‌و دوایەو، لەئاشکراو پەنهانی.

هـ- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعوذُ بِرِضاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعوذُ بِمُعافاتِكَ مِنْ عُقوبَتِكَ، وَأَعوذُ بِكَ مِنْكَ لاأُحْصي ثَناءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَما أَثْنَيْتَ عَلى نَفْسِكَ) رواه مسلم،

واتە: ئەی خوایە! من پەنا دەگرم بەڕەزامەندیت لەتووڕەییت، وە پەنا دەگرم بەسەلامەت کردنت لەسزاو جەزرەبەت، وەپەنا دەگرم بەتۆ لەتۆ! من مەدح‌و سەنات ناژمێرم، هەر خۆت دەتوانی ستایشی خۆت بکەی.

و- (اللّهم لك سَجَدْتُ وبك آمَنْتُ ولَكَ أَسْلَمْتُ وأَنْتَ رَبّي، سَجَدَ وَجْهي لِلَّذِيْ خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُوَرَهُ، وشَقّ سَمْعَهُ وبَصَرَهُ فتبارَكَ الله أَحْسَنُ الخالِقِيْنَ) رواه مسلم واحمد.

واته: ئەی خوایە ! کڕنووشم بۆ تۆبرد، وەبڕوام بەتۆ هێناو گەردن کەچی تۆبووم، وە تۆ پەروەردگارمی، ڕووی من کڕنووشی برد بۆ ئەو کەسەی کە دروستی کردوەو وێنەی کێشاوە، وەزۆرباش نەخش و نیگارەکانی کێشاوە، وەبیستن و دیتنی تێدا ڕەخساندوون، بەرزو پایەدارە خوای چاکترین بەدیهێنەر.

ز- (سُبّوحٌ قُدّوسٌ رَبُّ المَلائِكَةِ والرُّوحِ) متفق عليه، (پێشتر مانا کراوە).

دیارە دووعاو پاڕانەوەش لەسوجدەدا لەهەموو حالاَن چاکتر وەردەگیرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أَقْرَبُ مايكونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وهُوَ ساجِدٌ فَـأَكْثِروا الدُّعاءَ فِيْهِ) رواه مسلم والبيهقي، واتە: بەندە لەدەمی کڕنووش بردندا لەهەموو حالێك لەخوا نزیکترە، جا زۆر تێیدا بپاڕێنەوە.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی چۆنیەتی کڕنووش بردن

مەسەلەی چۆنیەتی سوجدەبردن و پێش خستنی ئەژنۆیەکان بۆ لەسەر زەوی ڕۆنان یان لەپە دەستەکان، وەك گەلێك مەسەلەی فیقهی جوزئی دیکە لەنێو زانایان دا مشت ومڕی زۆر لەسەرکراوە کەئەمەی خوارەوە گوشراوی ئەو مشت ومڕەیە لەگەڵ ئەو ڕایەدا کەبەندە بەپەسندی دەزانێ:

جەماوەری زانایان و زۆربەیان[١٠٥] ڕایان وایە کەچاکتروایە ئەژنۆیەکان پێش بخرێن بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە: (عن وائل بن حجر قال: رَأَيْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ اذا سَجَدَ وَضَعَ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ، واذا نَهَضَ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ)رواه الترمذي والنسائي وابوداود وابن ماجه،

واتە: پێغەمبەری خوام -ﷺ- بینی کاتێك سوجدەی برد ئەژنۆیەکانی پێش دەستەکانی خستنە سەرزەوی، وەکاتێك هەستایەوە پێش ئەژنۆیەکانی دەستەکانی لەزەوی بەرزکردنەوە.

هەندێکیشان وەك (مالك) و (اوزاعي) و(ابن حزم) خوالێیان خۆش بێ دەڵێن وا باشترە دەستەکانی پێش ئەژنۆیەکانی بخات، ئەم فەرموودەیەش بەبەڵگەی ڕایەکەیان

---

[١٠٥] بڕوانە: (المجموع) ج٣ص٣٨٠، هەروەها بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص٢٨١تا٢٨٤. وەبڕوانە: (فقه السنة) ج١ص١٤٦.

دێننەوە: (عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رَسولُ الله ﷺ: إذا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلا يَبْرُكْ كما يَبْرُكُ البَعيْرُ وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ ثُمَّ رُكْبَتَيْهِ) رواه أحمد وابوداود والنسائي، وقال الخطابي: حديث وائل بن حجر اثبت من هذا.

واتە: ئەگەر یەکێکتان کڕنووشی برد بایەخ نەبێ وەك یەخ بوونی حوشتر، وەبا دەستانی دابنێ پاشا ئەژنۆیانی.

جا دیارە وەك چەندان جار دووپاتمان کردۆتەوە ئەوجۆرە وردە بابەتە خیلافییانە مشتومڕو شەڕە دەندووکەیان تێدا ڕەوانییەو مەگەر چۆن دەنا هەر بارێکیان بگری هەر لەبازنەی فراوانی سوننەت دایە، بەڵام من ڕای جەماوەرم پێ بەهێزترو پەسەندترە چونکە:

١-زانایانی فەرمووودەناس فەرمووودەکەی (وائل بن حجر)یان بەبەهێزتر داناوە لەوەی (ابوهريرة)[١٠٦].

٢-هەندێك لەزانایان بۆ وێنە (ابن القیم الجوزیة) دەڵێن: ڕێی تێدەچێ کە یەکێك لە (راوي)یەکانی ئەو فەرموودەیە دەق (مَتْن)ەکەی لێ تێکچووبێ و لەئەسڵ دا ئاوا بووبێ: (وَلْيَضَعْ رُكْبَتَيْهِ ثُمَّ يَدَيْهِ)[١٠٧]، چونکە ئاشکراو ڕوونە کە حوشتر لەکاتی یەخ بوون و وەرکەوتن دا دوو لاقی پێشەوەی کەلەجێی دەستانن پێش دەخات.

٣- وە ئەوە کەهەندێك لەزانایان دوولاقی پشتەوەی حوشتر بەدوو دەستی دادەنێن، تاکو لەگەڵ فەرموودەکەدا بگونجێن، شتێکی سەیرو سەمەرەیە! چونکە بێگومان ڕاست کردنەوەی (لاری)ی فەرمووودەکە کەبەهۆی لێ تێکچوونی (راوي)یەکەیەوە دووچاری بووە، لەگۆڕین و دەستکاری کردنی حوشترەکە ئاسانترەو ماقووڵترە، بەتایبەتیش کەفەرمووودەکەی (وائل بن حجر)مان بەدەستەوە هەیە.

٤- لەچەندان فەرمووودەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کە لەکردەوەکانی نوێژدا وەك گیانداران بکەین، (ابن القیم) لەوبارەوە گوتوویەتی: (... وكانَ ﷺ يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ ثم يَدَيْهِ بَعْدَهُما ثمَّ جَبْهَتَهُ وأَنْفَهُ هذا هو الصحيح، فكان أَوَّلُ مايقَعُ مِنْهُ على الأَرْضِ الأقْرَبَ إلَيْها فالأقْرَبَ، وأولُ مايَرْتَفِعُ الأَعْلى فالأعْلى، واذا رَفَعَ رَفَعَ رَأْسَهُ أوَّلاً ثمَّ يَدَيْهِ ثم رُكْبَتَيْهِ وهذا عَكْسُ فِعْلِ البَعْيْرِ، وقد نَهى عن التَشَبُّهِ بالحَيْوانات في الصَّلاةِ

---

[١٠٦] بڕوانە: (المجموع) ج٣ص٣٨٠.

[١٠٧] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج١ص٢٦٣.

فَنَهىٰ عَنْ بُرُوكٍ كَبُروكِ البَعِيْر، والْتِفاتٍ كالْتِفاتِ الثَّعْلَب، وافتِراشٍ كافْتِراشِ السَّبُع، واِقْعاءٍ كَأقعاءِ الكَلْب، ونَقْرٍ كنقْرِ الغُراب..)[108].

واتــه: وه پێغهمبـهر ﷺ ئهژنۆیـهکانی پێـش دهخسـتن ئنـجا دوای ئـهوان دوو دهستهکانی، پاشان نێو چهوانیو لووتی، ئا ئهوه ڕاسته، ئنجا بهوپێیه کام ئهندامهی لهزهویيهوه نیزیکتره سهرهتا ئهویانی دهخسته سهر زهویو ئنجـا ئـهوهی نزیکـترو نزیك، وه بۆ ههستانهوهش سهرهتا ئهو ئهندامهی کـه لهزهوییـهوه دوورتـرهو ئنجـا ئـهویترو ئـهویتر، سـهری بـهر لهھـهموو ئهندامـهکانی بـهرزدهکردهوه پاشـان دوو دهستیو دوایی ئهژنۆیهکانی. کهئهمهش پێچهوانهی کردهوهی حوشتره (که فهرمانمان پــێکراوه پێچهوانــهی بجووڵێینــهوه)، وه بێگومــان پێغهمبــهر ﷺ نــههی کــردوه کهلـهنوێژدا وهك گیانداران بکهین، بۆیه نههیکردوه لهیهخ بوونو کهوتنهسهر زهوی وهك يهخ بوونی حوشتر، وه لهئاوڕدانهوه وهك ئاوڕدانهوهی ڕێوی، وهلهدهست ڕاخستن وهك دهست ڕاخستنی دڕنده، وه لهههڵترووشکان وهك ههڵتووتانی سهگ، وه لهبهپهله سهرخستنه سهرزهویو بهرزکردنهوهی، وهك دهندووك لهزهوی دانی قهله ڕهشه..

بۆیهش ئهم بهڵگانهم بۆ ئیسپات کردنی بـههێزتربوونی ڕای جـهماوهری زانایـان هێنانهوه چونکه ههندێك کهسی کهم شارهزام دیون کهپێیان وایه ههرکهسێك لـهکاتی سـوجده بـردن دا دهسـتهکانی پێـش ئهژنۆیـهکانی نـهخات پێچهوانـهی سـوننهتی پێغهمبهر ﷺ ڕهفتاری کردوه کهوهك ڕوونمان کردوه ڕهنگه پێچهوانهی ئهو ڕایه زۆر لهههقو ڕاستی نزیکتربێ!!.

## بڕگهی پازدهیهم: ههستانهوه لهکڕنووشی یهکهمو دانیشتنی نێوان کڕنووشی یهکهمو دووهم.

ئنجـا ئـهی مسـوڵمانی بـهڕێزو خۆشهویسـتإدوای ئـهوهی بـهوجۆرهی بـاس کـرا کڕنووشی یهکهمت برد، بهدهم (الله اکبر) گوتنهوه سهرت لهزهوی بهرز بکهوه، چونکه (بخاري ومسلم) وایان لهپێغهمبهر ﷺ گێڕاوهتهوه.

وه (أحمد وأبوداود) گێڕاویانهتهوه کهپێغهمبـهری خوا ﷺ هـهندێك جاران لهگـهڵ گوتنی (الله اكبر)دا دهستهکانیشی بهرزدهکرنهوه[109].

[108] بڕوانه: (مُختَصر زادِ المَعاد في هَدْيِ خَيْرِ العِباد) ص19، که (محمد بن عبد الوهاب)دایناوه، واته (مختصر)هکه، چونکه ئهسڵی کتێبهکه هی (ابن القيم الجوزية) يه.

ئنجا لاقی چەپت ڕابخەو لەسەری دابنیشە، وەپێی ڕاستت لەسەر عەرزێ بچەقێنە چونکە (بخاري) وای لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە؟

وە (مسلم) گێڕاویەتەوە کەهەندێك جاریش پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەردووك پاژنەو سنگی پێیەکانی دادەنیشت.

ئنجا ئارام بگرە هەتا هەموو جومگەو ئێسکەکانت دەچنەوە شوێنی خۆیان، چونکە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ وای کردوە، وەك (ابوداود وبیهقي) لێیان گێڕاوەتەوە.

ئنجا کەبەو شێوەیەی گوترا دانیشتنی، ئەم زیکرە بخوێنە:

(اللَّهُمَّ (يان رَبِّ) اغْفِرْلي وارْحَمْني واجْبُرني وارْفَعْني واهْدني وعافِني وارْزُقْني) رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه والحاكم وصحّحهُ ووافقه الذّهَبيُّ.

واتە: ئەی خوایە (یان پەروەردگارم) لێم ببوورەو بەزەییت پێم دابێ و پشتم بگرەو بەرزمبکەوەو ڕێڕوونیم بکەو سەلامەتم بکەو ڕۆزیم بدە.

دەشتوانی لەجیاتی ئەوە بلێی: (رَبِّ اغْفِرْلي رَبِّ اغْفِرْلي) رواه ابن ماجه بسند حسن.

واتە: پەروەردگارم لێم بوورە، پەروەرگارم لێم ببوورە. کە دیارە مەرجیش نیە تەنیا دووجار بێت بەڵکو بەپێی حاڵ و مەقام دەتوانێ دووبارەی بکاتەوە[110].

## بڕگەی شازدەیەم: کڕنووش بردنی دووەم

ئنجا (الله أكبر) بکەو سەجدەی دووەم ببە، چونکە (بخاري ومسلم)و غەیری ئەوانیش گێڕاویانەتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە، وەجاری واش بووە وەك (أبوداود وأبوعوانة) گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر ﷺ هاوکات لەگەڵ (الله اكبر) گوتنەکەدا هەردووك دەستیشی بەرز دەکردنەوە، بەلام وەك پێشتریش گوتمان ڕای دەست بەرزنەکردنەوە بەهێزترە؛ دیارە زیکرو دووعایەکانی سەجدەی دووەمیش کت ومت وەك هی یەکەم وان بەبێ جیاوازی.

---

[109] دەست بەرزکردنەوە لەکاتی چوونە ڕکووع و هەستانەوە لەڕکووع دا ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانی لەسەرە. بەلام لەکاتی کڕنووش بردن و سەربەرزکردنەوە لەکڕنووش دا زانایان بەڕایەکی بێهێزیان داناوە. بڕوانە: (بِدايَةُ المُجْتَهِدْ) ج١ص١٣٦، وەبڕوانە: (فقه السنة) ج١ص١٤٢.

[110] بڕوانە: (صِفَةُ صَلاة النَبيِّ ﷺ) ناصرالدين الألباني ص١٦٤.

## بڕگەی حەڤدەیەم: هەستانەوە دوای کڕنووشی دووەم:

ئنجا پاش تەواوکردنی سەجدەی دووەم (الله أَكبر) بکەو سەرت بەرز بکەوە، چونکە (بخاري ومسلم) وای لەپێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕنەوە.

دیارە لەدوای هەستانەوەش لەکڕنووشی دووەم بەڕای بەشێك لەزانایان دانیشتنێك هەیە کەپێی دەگوترێ دانیشتنی پشوودان (جِلسَةُ الأُسْتِراحَة) کەپێویستی بەکورتە باسێکی سەربەخۆ دەکات.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی دانیشتنی پشوودان (جِلْسَة الأُسْتِراحَة):

دەربارەی ئەو دانیشتنە شەرعزانەکان بەگشتی سێ ڕایان هەن:

١-دەڵێن: ئەو دانیشتنە سوننەت نیە، ئەم ڕایەش لە (عمر وعلي وابن مسعود وابن عمر وابن عباس) خوالێیان ڕازیبێ گێڕراوەتەوە، وە هەرکام لە: (مالك و ثوري واسحاق واصحاب الراي)هەڵیان بژاردوەو (احمد) گوتوویەتی: زۆربەی فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن‌و (ترمذي)یش گوتوویەتی: هەموو زانایان کاریان بەمەکردوە، (أُبوالزّناد) یش گوتوویەتی: هەر ئەمە – واتە دانەنیشتن – سوننەتە[111].

٢-دەڵێن ئەو جۆرە دانیشتنە سوننەتەو بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە:

(عَنْ مالِكِ بِنِ حُوَيْرِث أَنّ النبيّ ﷺ كانَ يَجْلِسَ إِذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجودِ قَبْلَ أَنْ يَنْهَضَ) متفق عليه.

**واتە:** پێغەمبەر ﷺ کاتێك سەری لەسەجدە بەرزدەکردەوە پێش ئەوەی ڕاست بێتەوە دادەنیشت.

٣-دەڵێن: ئەگەر بابای نوێژکەر بێهێزو توانابوو بۆی هەیە دابنیشێ، بەڵام ئەگەر بەهێزبوو پێویستی پێی نیە بادانەنیشێ، وە دەڵێن دانیشتنی پێغەمبەریش ﷺ لەدوا دوای تەمەنی داو لەکاتی بێهێزی‌و بەساڵداچوونی‌دا بووە، ئنجا شایانی باسە کە ئەم ڕایە هەردووك ڕای پێشووی‌و هەموو ئەو فەرموودەو شوێنەوار (أَثَـر)انەش کۆدەکاتەوە کە لەوبارەوە هاتوون، (إِبْنُ القَيِّمِ الجَوْزِيَّة)ش یەکێکە لەو زانایانەی کە ئەم

---

[111] (شَوکاني) یش دەڵێ: زۆربەی زانایان ئەم دانیشتنە بەسوننەت نازانن، بڕوانە (نَيْلُ الأَوْطـار) ج٢ص٢٨٠، وە بڕوانە: (إِحْكام الأَحْكام شَرْحُ عُمْدَةِ الأَحْكام) ج١ص٢٤٨، ٢٤٩، نووسینی (تقی‌الدين ابن دقيق العيد)

ڕایەی سێیەمی هەڵبژاردووە[112]، واش پێدەچێ ئەم ڕایە لەوانی دیکە بەهێزتربێت، چونکە وەك گوتمان هەموو فەرموودەکان لەنێو خۆیەوە دەگرێ.

وە دەربارەی چۆنیەتی هەستانەوەش بۆ ڕکاتی دووەم دیسان زانایان ڕایان جیا جیایە، هەرچی زۆربە[113] و جەماوەرن دەڵێن: دەبێ نوێژکەر هەردووك لەپە دەستی بخاتە سەر هەردووك ڕانەکانی لەسەر سینگی هەردووك پێیانی ڕاست بێتەوە، بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم ڕایەش چەند بەڵگەیەکیان هەیە کەیەکێکیان ئەم فەرموودەیەیە: (عن وائِل بن حُجَر أَنَّ النبيَّ ﷺ لَمَّا سَجَدَ وَقَعَتْ رُكْبَتاهُ إِلى الأَرْضِ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ كَفّاهُ، فَلَمَّا سَجَدَ وَضَعَ جَبْهَتَهُ بَيْنَ كَفَّيْهِ وجافىٰ عَنْ إِبْطَيْهِ، واذا نَهَضَ نَهَضَ علىٰ رُكْبَتَيْهِ وَاعْتَمَدَ علىٰ فَخِذَيْهِ) رواه ابوداود.

واتە: پێغەمبەر ﷺ کەچووە سەجدە پێش دوو لەپە دەستی هەردووك ئەژنۆی کەوتنە سەر زەوی، وە لەکاتی کڕنووش بردن دا نێوچاوانی لەنێوان هەردووك لەپە دەستیدا دەنا وەبن هەنگەڵەکانی لەخۆی دوورخستنەوە، وەکاتێك هەستایەوە لەسەر ئەژنۆیەکانی هەڵسایەوەو سەنگی خۆی خستەسەر هەردووك ڕانەکانی.

هەندێکیشیان دەڵێن:بۆ هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم دەبێ سەنگو قورسایی خۆی بخاتەسەر هەردووك دەستیو سەرزەویو ئەوجار بەرزبێتەوە، دیارە لەم حاڵەتەش دا بەدوو شێوە دەتوانێ هەڵسێتەوە، یان هەردووك دەستی بەرزبکاتەوە پاشان هەردووك ئەژنۆی، یان بەپێچەوانەوە ئەژنۆیەکانی پێش بخاتو دوایی هەردووك دەستی، دیارە چەند بەڵگەیەکیان بەدەستەوە هەن کەئەم فەرموودەیە یەکێکیانە:

(عن أيوب عن أبي قِلابَةَ قال: جاءَنا مالك بن الحُوَيْرِث فَصَلّىٰ بنا في مَسْجِدنا هذا، فقال: إِنّي لَأُصَلّي بِكُمْ وما أُرِيْدُ الصَّلاةَ، ولٰكِنْ أُرِيْدُ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ رَأَيْتُ النبيَّ ﷺ يُصَلّي، قال أَيُّوب: فَقُلْتُ لِأَبي قلابة وكيف كان صَلاتُهُ؟ قال: مِثْلُ صَلاةِ شَيْخِنا هذا – يعني عمر بن سلمة – قال ايوب: وكان ذٰلِكَ الشيخ يُتِمُّ التَّكْبير، واذا رَفَعَ رَأْسَهُ عَنِ السَّجْدَةِ الثانيةِ جَلَسَ وَاعْتَمَدَ علىٰ الأَرْضِ ثُمَّ قامَ) رواه البخاري. والشافعي في (الأُم)[114].

---

[112] بڕوانە: (زاد المَعاد في هَدْيِ خَيْرِ العِباد) ابن القَيِّم الجوزية ج١ص٦١.

[113] بڕوانە: (المُغْني)ج١ص٥٣٠، وەبڕوانە: (فقه السنة)، ج١ص١٥٠.

[114] بڕوانە: (الوَجيز في [illegible] الكتاب [illegible]) [illegible] ص٩٤.

واتە: (ایوب) لە (ابي قلابة) وە دەگێڕێتەوە دەڵێ: (مالك بن الحويرث) هاتە لامانو لەم مزگەوتەمان دا نوێژی بۆکردین، وە گوتی من نوێژتان پێدەکەم بەڵام مەبەستم نوێژکردن نیە، بەڵکو دەمەوێ پێشانتان بدەم کەچۆن پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی کردوە، (ایوب) دەڵێ بە(ابي قلابة)م گوت: جا نوێژەکەی چۆن بوو؟! گوتی: وەك نوێژی ئەم پیرەمان — واتە (عمر بن سلمة) (ایوب) گوتی: وە ئەو پیرە — نوێژەکەی ئاوابوو — پاش تەواوکردنی (الله اکبر) وە دوای سەربەرزکردنەوە لەسەجدەی دووەم، دادەنیشت، وەسەنگی خۆی دەدایە سەرزەویو پاشان هەڵدەستایەوە[١١٥].

دیارە هەرکام لەم شێوانەش دروست و ڕەوانو لەبازنەی سوننەت دانو کەس بۆی نیە — وەك پێشتریش گوتمان — لەسەر ئەو جۆرە مەسەلانە کێشەو هەرا بەرپابکاتو ئەگەر کەسێکیش وابکات، ئەوە شایەدی لەسەر نەزانیو بیرتەسکی خۆی دەدات.

## بڕگەی هەژدەیەم: ڕکاتی دووەم

ئنجا کەهەستایەوە بۆ ڕکاتی دووەم یەکسەر فاتیحە بخوێنە چونکە (مسلم) گێڕاویەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ وای کردوە، ئنجا ڕکاتی دووەمیش کتومت وەك ڕکاتی یەکەم وایە بێجگە لەچەند شتێکی گچکە، وەك نەخوێندنی دووعای (استفتاح) و کەمتر قورئان خوێندنی دوای فاتیحە، وەبێگومان لەڕکاتی دووەم دا (الله اکبر)ی هەستانەوە هەیە، نەك هی (تَحَرُّم) کەتایبەتە بەیەکەمەوە، وە دەستەکانیشی لەگەڵ بەرزناکاتەوە.

## بڕگەی نۆزدەیەم: تەحییاتی یەکەم

ئنجا کەڕکاتی دووەمیشت تەواوکرد بەوشێوەیەی کەباسی دەکەین بۆ خوێندنی تەحییاتی یەکەم دابنیشە:

لەپی دەستی ڕاستت لەسەر ڕان یان ئەژنۆی ڕاستت دابنێ، وە لەپی دەستی چەپت لەسەر ڕان یان ئەژنۆی چەپت دابنێ، (مسلم) وای گێڕاوەتەوە، وە لاقی چەپت

---

[١١٥] دیارە هەرکات نوێژکەر (جِلْسَةَ الأُسْتِرَاحَةِ)ی هەبوو، ناگونجێ لەسەرەتای سەر لەسەجدە بەرزکردنەوە (الله اکبر) بکاتو هەتا ڕاست دەبێتەوە درێژەی پێبدات!! بەڵکو دەبێ دوای تەواوکردنی دانیشتنەکە دەستی پێبکات بۆئەوەی زۆر نەخایەنێو- نوێژکەرەکان (مامومین) یش — ئەگەر ئیمام بوو — سەریان لێتێك نەچێو پێش ئیمامەکەیان نەکەونەوەو دووچاری شتێکی قەدەغەکراو نەبن، کەبەداخەوە ئەم[illegible]

ڕابخەو لەسەری دابنیشە وە – سینگی پێی – لاقی ڕاستت لەعەرزێ بچەقێنە، (بخاري) وایگێڕاوەتەوە، وە لەپی دەستی چەپت لەسەر ئەژنۆی چەپت پان بکەوە، وە هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستت پێکەوە بنووسێنە وەبە پەنجەی شادە (المُسَبِّحَة) کە لەدوای پەنجە گەورەوە دێ ئیشارە بۆلای قیبلە بکەو چاوی تێبڕە، چونکە (مسلم وابن خزيمة وابوعوانة) وایان لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

دەشتوانی لەپەنجەکانی دەستی ڕاستت ژمارەی پەنجاو سێ (٥٣) دروست بکەیو بەقامکی شایەتمان ئاماژەی بکەی وەك (مسلم) گێڕاویەتەوە، شێوەکەشی ئاوایە: هەموو پەنجەکانت پێکەوە بنووسێنەو پەنجە گەورەت لەسەر جومگەی نێوەڕاستی قامکی شادەت دابنێ، وەدەشتوانی پەنجە گەورەت لەسەر پەنجە درێژە "دۆشاومژە"ت دابنێی، وەك (مسلم) گێڕاویەتەوە.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی چۆنیەتی ئاماژەپێکردنو جووڵاندنی پەنجەی شایەتمان

***مسوڵمانی بەڕێزو شیرین!*** پاش لێکۆڵینەوەو موتالا بۆم ساغ بۆوە کەزۆربەی هەرە زۆری زانایانی فەرمووده ناس (مُحَدِّث) و شەرعزان (فقیە) لەسەر ئەوەن کەسوننەتە لەکاتی شایەتمان هێنان دا بەپەنجەی شادە ڕووەو قیبلە ئیشارە بکرێو یەکجار پەنجە بەرزبکرێتەوەو بجووڵێنرێ، دیارە ئەمەش ڕای هەرسێك پێشەوا (ابوحنيفة، شافعي، أحمد) یشە خوالێیان خۆش بێ، وە ئەو ڕایەی کەدەڵێ سوننەتە پەنجەی شایەتمان هەتا کۆتایی تەحییات بجووڵێنرێ کەڕای (مالك)ە خوالێی خۆش بێ، لەچاو ڕای جەماوەری زانایان ڕایەکی بێهێزو (مرجوح)ەو بەڵگەکەی لەچاو بەڵگەی ڕای زۆربەی زانایان دا بێهێزە.

ئەم ڕاستییەشم بۆیە خستەڕوو تاکو بزانرێ کەمەرج نیە هەر مەسەلەیەك بووبە (باو)و ڕەواجی کەوتە سەر ڕاستو تەواو یان ڕاست ترو تەواو تر بێت! مەسەلەی پەنجە جووڵاندنی بەردەوامیش لەتەحییات دا کە کەسانێك زۆر جەختی لەسەر دەکەنو خەریکن بیکەنە بناغەی دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الوَلاءْ والبَراء) و گەورەترین نیشانەو درووشمی شوێن کەوتنی سەلەفی صالح! یەکێکە لەو مەسەلانە کەبەهەر هۆیەکەوەبێ بۆتە باوو ڕەواجی پێدراوە، ئەگەرنا وەنەبێ لەڕووی بەڵگەی شەرعیەوە هێندە پشت ئەستوورێ کەشیاوی ئەوەبێ ئەو هەموو پێداگیرییەی

لەسەربکرێ‌و ئەو هەموو مشت‌ومڕو هەرایەی لەسەربکرێ، هەرچەندە وەك چەندان جار دووپاتمان کردۆتەوە ئەو جۆرە مەسەلانە هەر لەئەسڵ دا بەشێوەیەك هەڵخراون کە ڕاجیایی (إختِلاف) هەڵبگرن‌و شەڕە دەندووکەو سەخت گیری‌و دەمارگیری تێدا کردنیشیان شتێکی هەڵەو ناڕەوایە.

جائێستا باسەرنج بدەین داخوا بەڵگەی هەرکام لەو دوو ڕایە چی‌یەو چۆنە!

ڕای یەکەم: کەوەك گوتمان ڕای جەماوەری زانایانە، ئەم فەرمایشتانە بەبەڵگە دێننەوە:

١- (عن ابن الزُّبَيْرِ ﷺ كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إذا قَعَدَ في الصَّلاةِ جَعَلَ قَدَمَهُ اليُسْرىٰ بَيْنَ فَخِذِهِ وساقِهِ وفَرَشَ قَدَمَهُ اليُمْنىٰ ووَضَعَ يَدَهُ اليُسْرىٰ علىٰ رُكْبَتِه اليُسْرىٰ ووَضَعَ يَدَهُ اليُمْنىٰ علىٰ فَخِذِهِ اليُمْنىٰ وأَشارَ بإُصْبُعِهِ، - وفي رواية - أَشارَ بإُصْبُعِهِ السَّبّابَةِ) رواه مسلم وابوداود.

وەك دەبینین لەم فەرموودەیەدا بەئاشکرا ڕاگەیەنراوە کەپێغەمبەری خوا تەنیا ئیشارەتی بەپەنجەی شایەتمانی کردوەو باسی جووڵاندنی بەردەوامی تێدانیە.

٢- (عن ابن الزبير ﷺ .. كانَ ﷺ يُشيرُ بالسَّبّابَةِ ولايُحَرِّكُها ولايُجاوِزُ بَصَرُهُ إِشارَتَهُ) رواه احمد وأبوداود والنسائي وابن حبان.

لەم فەرموودەیەش دا دیسان ئاماژەکردن بەپەنجەی شایەتمان‌و نەجووڵاندنیشی ڕاگەیەنراوە کەدیارە مەبەست نەجووڵاندنی بەردەوامە، چونکە بەبێ یەك جار جووڵاندن ئاماژەکردن نایەتەدی.

٣- (عن عبدالله بن عمر ﷺ أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ كانَ إذا جَلَسَ في الصلاةِ وَضَعَ يَدَهُ اليُمْنىٰ علىٰ رُكْبَتِهِ اليُمْنىٰ وعَقَدَ ثَلاثَةً وخَمْسِينَ وأَشارَ بالسَّبّابَةِ) رواه مسلم.

دیارە ئەم فەرموودەیەش وەك ئەوانی پێشوو ئاماژەکردن بەپەنجەی شایەتمان تەئکید دەکاتەوە بێ‌ئەوەی باسی جووڵاندن بکات.

ڕای دووەم: کەڕای (مالك)ە لەنێو چوار پێشەوا سەرمەزهەبەکان دا، ئەم فەرموودەیە بەبەڵگە دێننەوە:

(عن وائل بن حجر انه قال في صفةِ صَلاةِ رَسولِ اللهِ ﷺ.. ثم قَبَضَ ثِنْتَيْنِ مِنْ أَصابِعِهِ وحَلَّقَ حَلْقَةً ثم رَفَعَ إِصْبَعَهُ فرأيْتُهُ يُحَرِّكُها يَدْعُو بِها) رواه احمد والنسائي وابوداود وابن ماجه.

دیارە ئەم فەرموودەیەش پەنجە بەرزکردنەوەو جووڵاندنی‌و دووعاپێ‌کردنی ڕاگەیاندوە، بەڵام ئایا ئەم فەرموودەیە دەگونجێ بکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی پەنجەی شایەتمان بەردەوام جووڵاندن، چ جای کورت هەڵێنانی سوننەت لەو ڕەفتارەدا؟!

لەوەڵام دا دەڵێین نەخێر، چونکە:

یەکـەم: مـادام ئامـاژە پـێکردنی پەنجـەی شـایەتمان و بەرزکردنـەوەی و یـەکجار جووڵاندنی بۆ ئیشارەکردن هەموو فەرموودەکان کۆدەکەنەوە.

دووەم: وە مـادام جووڵاندن و دووعاپـێکردنی کـە لەفـەرموودەی (وائـل بـن حُجـر)دا هـاتوە هیـچ جـۆرە تێـك گیرانێکی لەگـەڵ فـەرموودەکانی تـردا نابـێ ئەگـەر بێـت و جووڵاندنەکـە بەیـەك جـار جووڵانـدن دابنـرێ، وەك "بَیْـهقي" گوتوویـەتی و هـەرکام لەخاوەنی (المُغْني)[116] و (نَیلُ الأَوْطار)[117] و (سُبُلُ السَّلام)[118] و (بِدایَـةُ المُجْتَـهِد)[119] یش پشتگیری‌یان کردوە.

سـێیەم: وەمـادام ئـەو فەرموودەیـەی (یُحَرِّکُـها)ی تێدایـە (أبـوداود)و(نَسـائي) گێڕاویانەتـەوەو هـەر ئـەوانیش ئـەو فەرموودەیـەیان گێڕاوەتـەوە کـە (ولایُحَرِّکُـها)ی تێدایە، کەبۆئەوەی تێکیش نەگیرێن ناچارین بڵێین: ئەو جووڵاندنەی ئیسپات کراوە جیایـە لـەوەی کەنـەفی‌کراوە، کەئیسـپات کراوەکـە یـەك جـارەو نەفی‌کراوەکـەش جووڵاندنی بەردەوامە بـەڵێ مـادام ئاوایـە دەتوانـین بەڕاشـکاوی بڵێـین: جووڵاندنـی پەنجەی شایەتمان لەکاتی خوێندنی تەحییات دا بەبـەردەوامی، نەك هـەر بەڵگەیەکی وای لەسـەر نیە کەسوننەت تر بوون و پەسـندتربوونی بسـەلمێنێ، بـەڵکو ئیسـپاتی سـوننەت بوونیشـی دەعوایـەکی بەهێزنیـەو (مرجـوح)ە، بـەڵام لـێرەدا مەبەستیشـم ئەوەنیە کە ئەگەر یـەکێك بینرا پەنجەی جووڵاند تۆمەتی لەسوننەت لادانی بدەینـە پاڵ، چونکە هەرچۆن بێ پەنجە جووڵاندن هەر لەبازنەی سوننەت دایە، بابەڵگەکەشی بەهێزنەبێ، وە بێگومـان ڕێشی تێدەچێ کەپێغەمبـەری خوا ﷺ چەند جارێکی کـەم بەردەوامیش پەنجەی جووڵاندبێ، بەڵام ئاشکرایە کەبەزۆری هەر ئامـاژەی پێکردوەو نەیجووڵاندوە وەك لەفەرموودەکان دا دەردەکەوێ و زۆربەی هەرەزۆری فەرموودەناس و شەرعزانانیش پەسندیان کردوە.

---

[116] بڕوانە: (المغني) ج1ص534.

[117] بڕوانە: (نیل الاوطار) ج2ص293، 294.

[118] بڕوانە: (سبل السلام) ج1ص188، 189.

[119] بڕوانە: (بدایة المجتهد) ج1ص132، کە گوتوویەتی: (وَاخْتَلَفوا في تَحْرِیكِ الأُصْبُعِ لاِخْتِلافِ الأَثَرِ في ذٰلِكَ والثّابِتُ أَنَّهُ کانَ ﷺ یُشِیرُ فَقَط)

ئنجا مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست! دوای ئەوەی کەبەوشێوەیە دانیشتی کەپێی دەگوترێ (إفتِراش)و لەبەر تیشکی چەند فەرموودەیەك دا ڕوون کرایەوە، یەکسەر دەست بەخوێندنی تەحییاتی یەکەم بکە، جۆرەکانی تەحییاتیش زۆرن کە ئەم سێیە باوترینیانو بەهێزترینیشیانن لەڕووی (سند)ەوە:

١-(التَّحِيَّاتُ لِلهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ، السَّلامُ عليكَ أيُّها النَّبيُّ ورحمةُ الله وبركاتُه، السَّلامُ عَلَيْنا وعلىٰ عِبادِاللهِ الصَّالِحين، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلاّ الله وأَشْهَدُ أنَّ محمَّداً عبدُه ورسُولُه) متفق عليه.

٢-(التَّحِيّاتُ المُبارَكاتُ الصَّلواتُ الطيِّباتُ لِلهِ، السَّلامُ عليكَ أيُّها النَّبيُّ ﷺ ورحْمَةُ الله وبَركاتُه، السَّلامُ عَلَيْنا وعلىٰ عِبادِاللهِ الصّالحين، أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلاّ الله وَأَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ) رواه مسلم والنسائي والشافعي.

٣-(التَّحِيّاتُ الطيِّباتُ والصَّلواتُ لِلهِ، السَّلامُ عَليكَ أيُّها النبيُّ ورحْمَةُ الله وبَركاتُهُ، السلام علينا وعلىٰ عِبادِاللهِ الصّالِحين، أَشْهَدُ أنَّ لا إِلٰهَ إلا الله وحْدَه لاشَرِيْكَ لَهُ وأَشْهَدُ أنّ محمَّداً عبدُهُ ورَسُولُهُ) رواه مسلم وابوعوانه.

کەواتە: یەکێك لەم تەحییاتانە یان هەر جۆرێکیتر کەبە(سَنَد)ێکی ڕاست (صحیح)ەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕرابێتەوە بخوێنە، بەڵام وریابەو تێکەڵیان مەکە، وەچاکترو پەسەندتریش وایە، وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە کەهەرجارە جۆرێکیان بخوێندرێو هیچ کامیان دەوامی لەسەر نەکرێو جۆرەکانیتر فەرامۆش بکرێن.

## ڕوونکردنەوەی مانای وشەکانی تەحییات

(راغب الاصفهاني) گوتوویەتی: (فَالتحيةُ أَنْ يقالَ: حَيّاكَ الله، أيّ جَعَلَ لَكَ حَياةً وذلِكَ إخْبارٌ ثمّ يُجْعَلُ دُعاءً.. وأَصْلُ التَّحيَّةِ مِنَ الحَياةِ ثمّ جُعِلَ ذلِكَ دُعاءً تَحِيَّةٍ لِكَوْنِ جَميْعِه غَيْرَ خارِجٍ عَنْ حُصولِ الحَياةِ أو سَبَبِ حَياةٍ إمّا في الدُّنْيا وإمّا في الآخِرَةِ، ومِنْهُ: (التَّحيّاتُ لِلهِ).)[١٢٠]

---

[١٢٠] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) ص١٤٠

وەك دەبینین وشەی (تَحِیَّة) كەكۆیەكی (تَحِیّات)ە، لەئەسڵ دا لە(حَیّاكَ اللە)ەوە هاتوە، ئەمیش كردارێكی ڕابردوویە (خوا تۆی ژیاند)، بەڵام مەبەست پێی دووعاكردنەو ماناكەی ئاوای لێدێ: (خوا بت ژیەنێ). زانایەكی دیكەش لەبارەی مەبەستی وشەی (تَحِیّات)ەوە گوتوویەتی:

(التَّحِیّاتُ جَمْعُ تَحِیَّةٍ وهِيَ ما یُحَیّٰی بِهِ مِنْ قَوْلٍ أوْ فِعْلٍ، وجُمِعَتْ لأنَّ كُلَّ مَلِكٍ كانَ لَهُ تَحِیَّةٌ مَعْرُوفَةٌ یُحَیّٰی بِها.،. والقَصْدُ مِنْ ذٰلِكَ الثَّناءُ علیٰ اللهِ بِأنَّهُ مالِكٌ لِجَمیعِ التَّحِیّاتِ الصّادِرَةِ عَنِ الخَلْقِ لِلمُلُوكِ)[121] .

واتە: وە (تحیات) كۆی (تَحِیَّة)یە،ئەمیش هەر قسەو كردەوەیەكە كەسڵاوی پێدەكرێ، هۆی كۆكردنەوەشی ئەوەیە كەهەر پادشایەك (سڵاو)ێكی تایبەتی هەبووە كەسڵاوی پێلێكراوە.. وەمەبەستیش لەو (تَحِیّات)ە مەدح و ستایشی خوایە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستی‌یەیە كەخاوەنی موتڵەقی هەموو ئەو سڵاوو ڕێز لێنانەیە كەلەلایەن خەڵكی‌یەوە ئاڕاستەی پادشاو سەرۆكەكان كراون.

كەواتە: (التَّحِیّاتُ لِلّٰهِ) یانی هەموو ئەو وشانەی كە بۆ سڵاو لێكردن‌و ڕێزلێنان بەكاردێن شایستەی خودان، (والصَّلَواتُ) یانی ئەو دووعایانە كە بۆ گەورەگرتنی خوا بەكاردەهێنرێن هەر شایەنی وین، (والطَّیِّباتُ) یانی هەموو ئەو وشە پەسندو چاكانەی كە بۆ ستایش‌و پێهەڵگوتن دەشێن هی خودان.

(السَّلامُ عَلَیْكَ أیُّها النَّبِیُّ ورَحْمَةُ اللهِ وبَرَكاتُهُ) یانی: سەلامەتی و خێرو خۆشیت لەسەربێ ئەی پێغەمبەر ﷺ وەبەزەیی‌و پیێزی خوات بڕژێتەسەر.

(أشْهَدُ أنْ لا إلٰهَ إلاّ الله) واتە: شایەدی دەدەم كەبێجگە لەخوا هیچ پەرستراونین.

(وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ) واتە: وەشایەتی دەدەم كەموحەممەد پێغەمبەری خوایە.

---

[121] بڕوانە: (إعانة الطّالبین) ج١ص١٦٩، هەروەها بۆ ماناى یەك یەكی وشەكانی تەحییات بڕوانە: (فتح الباري شرح صحیح البخاري) ج٢ص[illegible]

## چەند تێبینییەك دەربارەی تەحییاتی یەكەم

**یەكەم: حوكمی خوێندنی تەحییاتی یەكەم:**

جەماوەری زانایان كە لەنێوانیاندا حەنەفییەكان و مالیكییەكان و شافیعییەكان هەن، تەحییاتی یەكەم بەسوننەت دەزانن، بەڵام (أحمد)بەفەڕزی دەزانێ[122].

**دووەم: چۆنیەتی دانیشتن لەتەحییاتی یەكەم دا:**

(ابوحنیفة) ڕای وایە كە لەتەحییاتی یەكەم و دووەم دا سوننەتە بەشێوەی (إِفْتِراش) دابنیشێ، بەڵام (مالك) ڕای وایە كەلە هەردووكیان دا بەشێوەی (تَوَرُّك) دابنیشێ، (شافعي)یش ڕای وایە كە لەتەحییاتی یەكەم دا بەشێوەی (افتراش) و لەتەحییاتی كۆتایی هەر نوێژێكیش دا بەشێوەی (تَوَرُّك) بێ، (أُحمد)یش ڕای وایە كەهەر نوێژێك دوو تەحییاتی هەبن لەئی یەكەمیان دا بەشێوەی (إِفْتِراش)و لەدووەمیاندا بە(تَوَرُّك) دادەنیشێ، بەڵام ئەگەر هەریەك تەحییاتی هەبێ، ئەوە هەر بەشێوەی (إِفْتِراش) دادەنیشێ[123].

**سێیەم: كەم مانەوە لەتەحییاتی یەكەم دا:**

(أُحمد ونَسائي وأَبوداود وترمذي وابن ماجه)گێڕاویانەتەوە كەپێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ كاتێك لەدوای دوو ڕكاتی یەكەم - تەحییاتی یەكەم - دادەنیشت وەك لەسەر بەردی گەرم دانیشتبێ وازوو هەڵدەستایەوە.

(ترمذي) گوتوویەتی: زانایان ئیشیان بەم فەرموودەیە كردوەو وای بەپەسند دەزانن كەنوێژكەر دانیشتنی تەحییاتی یەكەم درێژنەكاتەوەو لەتەحییات (التشهد) بەولاوە چیدی نەخوێنێ[124] (ابن القَيِّم) لەوبارەوە گوتوویەتی: لەپێغەمبەری خواوە ﷺ

---

[122] بڕوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد) جزءص١٢١، وەبڕوانە: (زادُ المَعاد) ج١، وەبڕوانە: (الأذكار) للنووي ص٦٠، وە (فقه السنة) ج١ص١٧٠، ١٧١.

[123] بڕوانە: (زاد المعاد) ج١ص٦١.

[124] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص١٧٢. (نووي)یش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی كۆتاییدا فەڕزە، وە ڕای ئاشكراتر (أَظْهَر) ئەوەیە كە لەئی یەكەمیش دا سوننەتە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە كەسەڵەوات لەسەر (آل) لەتەحییاتی یەكەم دا سوننەت نیە. بڕوانە: (السراج الوهاج شرح المنهاج) ص٤٩، بەڵام (شافعي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (والتشهد في الأولىٰ والثانية لفظُ واحدُ لايختلف، ومعنى قولي (التشهد)

نەگێڕاوەتەوە کە لەتەحییاتی یەکەم دا سەڵەواتی لەخۆی و (آل)ی دابێ،، وە پەنای نەبردۆتە بەر خوا لەئازاری گۆڕو ئازاری ئاگری دۆزەخ و بەڵای ژیان و مردن و بەڵای مەسیحی دەججاڵ، وەهەر کەسێك ئەوەی بەباش زانیبێ ئەوە لەچەمك و واتای گشتی و موتڵەقی فەرموودان ئەوەی وەرگرتوە، کەواتە بێ پێچ و پەنا ئاشکرایە کەجێگای سەڵەوات و دووعاکردن بەس تەحییاتی کۆتاییە. (مەبەست لە (تَشَهُّد) هەتا کۆتایی شایەتمانە و سەڵەواتی تێدا نیە).

**چوارەم: کاتی بەرزکردنەوەی پەنجەی شایەتمان و ئاماژەپێکردنی:**

حەنەفی‌یەکان دەڵێن سوننەتە لەدەمی گوتنی (لا إِلـٰهَ) دا بەرزی بکاتەوە و کە گەیشتە سەر (إلاّ الله) دای بنێتەوە.

بەڵام مالیکی‌یەکان دەڵێن سوننەتە هەتا نوێژەکەی تەواو دەکات بەلای ڕاست و چەپ دا بیجووڵێنێ.

شافیعی‌یەکانیش دەڵێن لەکاتی گوتنی (إلاّ الله) بەرزی دەکاتەوە و ئاماژەی پێدەکات. حەنبەلی‌یەکانیش دەڵێن تەنیا لەکاتی باسکرانی ناوی خوا (الله)دا دەیجووڵێنێ، جا چەند جاران دووبارە بێتەوە جووڵاندنی پەنجەش بەهەمان شێوە[125].

---

التَّشَهُّد والصَّلاة علىٰ النَّبِيِّ ﷺ لايُجْزِئُه أَحَدُهُما عَنِ الآخَر) بڕوانە: (الأُمّ) ج١ص١٠٢.

واتە: وە تەحییاتی یەکەم و دووەم یەك جۆرەو جیاوازنین مەبەستیشم لەتەحییات: تەحییات و صەڵەوات دانە لەسەر پێغەمبەر ﷺ هیچیان وەبری ئەوی دیکەیان ناکەون.

بەڵام بێگومان ڕای جەماوەری بەهێزترو پەسندترە، (تَشَهُّد)یش سەڵەوات ناگرێتەوە چونکە هیچ کام لەو فەرموودانەی باسی (تشهد) دەکەن سەڵەواتیان تێدا نیە. بۆ وێنە ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم وابوداودو وترمذي واحمد و نسائي وابن ماجه وشافعي) لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە کەپێشتر دەقەکەیمان نووسیوە، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص٢٩٢، دیارە خواپەرستی‌یە تایبەتی‌یەکان (العِبادات المَحْضَة)ش، وەك: نوێژو ڕۆژوو حەج و.. هتد بەبێ دەق (نص) هیچ کەس بۆی نیە لەسەر بناغەی هەڵهێنجان و قیاس قسەیان دەربارە بکات، چونکە وەك زانایان گوتوویانە و لەسەریشی ڕێك کەوتوون: ئەسڵ لەوجۆرە خواپەرستی‌یانەدا (تَوقيف)ەو مەودای ئیجتیهادیان تێدا نیە.

[125] بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص١٨٦، ١٨٧، بەڵام، خاوەنی (الفقه الاسلامي..) ج٢ص٩٠٣، ٩٠٤ ط٤، دەڵێ: حەنبەلی‌یەکانیش لەمەسەلەی نەجووڵاندن و ئاماژەپێکردنی پەنجەی شایەتمان دا لەکاتی گوتنی (إلاّ الله)دا ڕایان وەك شافیعی‌یەکان وایە.

## بڕگەی بیستەم: هەستانەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و چوارەم

ئنجا دوای ئەوەی کەبەوشێوەیەی باسمان کرد تەحییاتی یەکەمت خوێند بەدەم (الله اکبر) گوتنەوە هەستەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و دواییش چوارەم، چونکە (بخاري ومسلم) وایان لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە (دیارە ئەوە لەکاتێك دایە کەنوێژەکە سێ یان چوار ڕکاتی بێ).

شایانی باسە کە لەکاتی دەست کردن بەخوێندنی فاتیحە پاش تەحییاتی یەکەم سوننەتە وەك کاتی (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن، هەردووك دەستت هەتا ئاقاری شانەکانت بەرزبکەیتەوە، وەك (بخاري وابوداود ونسائي) گێڕاویانەتەوە.

تێبینی: لەڕکاتی یەکەم و دووەم دا نەبێ سوننەت نیە لەدوای فاتیحە قورئان بخوێنرێ، ئەوەندە هەیە جاری وابووە پێغەمبەر ﷺ لەڕکاتی سێیەم و چوارەمی نیوەڕۆدا پاش فاتیحە چەند ئایەتێکی خوێندوون، وەك (مسلم و أحمد) گێڕاویانەتەوە.

## بڕگەی بیست و یەکەم: تەحییاتی کۆتایی

پاشان ئەی مسوڵمانی بەڕێز! کاتێك هەموو ڕکاتەکانی نوێژەکەت تەواوکرد، جا دوو ڕکاتی بێ یان سێیی یان چواریی، دوای ئەوە دابنیشە بۆ خوێندنی تەحییاتی کۆتایی.

تەحییاتی کۆتاییش ئەم جیاوازییانەی لەگەڵ تەحییاتی یەکەم دا هەن:

یەکەم: لەتەحییاتی یەکەم دا جگە لە (مالك) جەماوەرو زۆرینەی زانایان ڕایان وایە کەسوننەتە نوێژکەر لەسەر شێوەی (إفْتِراش) دابنیشێ، - کەبریتیە لەڕاخستن و لەسەر دانیشتنی پێی چەپ و لەعەرزێ چەقاندنی سینگی پێی ڕاست -، بەڵام لەتەحیاتی دووەم دا جگە لە (أبوحنیفة) سەرجەم زانایان ڕایان وایە کە لەسەر شێوەی (تَوَرُّك) دابنیشێ، ئەمیش وەك (بخاری) گێڕاویەتەوە ئەوەیە کە پێی چەپی لەلای ڕاستی‌یەوە تێپەڕێنێ و ئەوی دیکەیان بچەقێنێ و لەسەر سمتان دابنیشێ، یان وەك (أبوداود وبَیْهقی) گێڕاویانەتەوە: کوڵمتی چەپی بخاتە سەر زەوی و هەردووك پێ‌یەکانی لەلایەکەوە - کەلای ڕاستە - بێنێتەدەرێ.

وە وەك (مسلم) گێڕاویەتەوە لەم جۆرە دانیشتنەدا دەبێ نوێژکەر بەلەپی دەستی چەپی ئەژنۆی چەپی لەچەنگ بگرێ و خۆی بداتەسەری.

دووەم: جەماوەری زانایان ڕایان وایە کەسەڵەوات دان لەپێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی یەکەم دا سوننەت نیە، وەشافیعی‌یەکانیش وەك پێشتر لە (نووي) نەقڵمان کرد تەنیا (اَللّٰهُمَّ صَلِّ علىٰ مُحَمَّدٍ) بەسوننەت دادەنێن جگە لەهەندێکیان کە سەڵەوات لەسەر (آل)یش بەسوننەت دەزانن، بەڵام جەماوەرو زۆرینەی زانایان ڕایان وایە کەسەڵەوات لەسەر (آل)ی پێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی دووەمدا سوننەتەو (شافیعی)یش بەفەڕزی دەزانێ[126]، هەروەها (أحمد)و چەند زانایەکی دیکەش هەمان ڕایان هەیە، بەڵام هەرکەسێك بەوردی سەرنجی ئەو بەڵگانە بدات کەبۆ سەلماندنی فەڕزبوونی (سەڵەوات دان) هێنراونەوە دڵنیا دەبێ کەڕای جەماوەر بەهێزترەو بەڵگەی باشترو زیاتریان بەدەستەوەن، وەك (شَوْکاني) دوای لێکۆڵینەوەیەکی باش لەوبارەوە گوتوویەتی: (والحاصِلُ أنَّهُ لَمْ يَثْبُتْ عِنْدي مِنَ الأَدِلَّةِ مايدلُّ علىٰ مَطْلوبِ القائِلِيْنَ بِالوُجوبِ.. وبَعْدَ هذا فَنَحْنُ لاننْكِرُ أَنَّ الصَّلاةَ عَلَيْهِ ﷺ مِنْ أَجَلِّ الطاعاتِ الَّتي يَتَقَرَّبُ بِها الخَلْقُ الىٰ الخالِقِ، وانَّما نازَعْنا في إِثْباتِ واجِبٍ مِنْ واجِباتِ الصَّلاةِ بِغَيْرِ دَلِيْلٍ يَقْتَضِيْهِ مَخافَةً مِنَ التَقَوُّلِ علىٰ اللهِ بِما لَمْ يَقُلْ..)[127].

سەڵەوات دانیش چەند جۆرێکی هەن کە ئەمانە گرنگترینیانن:

**یەك**: (اَللّٰهُمَّ صَلِّ علىٰ مُحَمَّدٍ وعلىٰ آلِ مُحَمَّدٍ كَما صَلَّيْتَ علىٰ آلِ ابراهيمَ انَّكَ حَميْدٌ مَجيْدٌ، اَللّٰهُمَّ بارِكْ علىٰ مُحَمَّدٍ وعلىٰ آلِ مُحَمَّدٍ كَما بارَكْتَ علىٰ آلِ ابراهيْمَ إِنَّكَ حَميْدٌ مَجيْدٌ) رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي وابن ماجه.

**دوو**: (اللهم صَلِّ علىٰ محمدِ النبيِّ الأُمِّيِّ وعلىٰ آلِ محمد كما صليت على آل ابراهيم، وبارِكْ علىٰ محمد النبيِّ الأُمِّيِّ وعلىٰ آلِ محمدٍ كَما باركت علىٰ آل ابراهيم في العالمين انَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ) رواه مسلم وابوداود وصححه الحاكم.

**سێ**: (اللهم صَلِّ علىٰ محمد وعلىٰ آلِ محمدٍ كَما صلَّيت علىٰ آل ابراهيم، وبارِكْ علىٰ محمدٍ وعلىٰ آلِ محمدٍ كما بارَكْتَ علىٰ آل[128] ابراهيم انَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ) رواه احمد ومسلم والنسائي والترمذي وصححه.

---

[126] بەڵام شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ قسەی دیکەشی هەیە هەر بەسوننەتی دەزانێ، وە (نووی)یش گوتوویەتی: ئیجماع هەیە لەسەر فەڕزنەبوونی، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص٣٠٠.

[127] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ص٢٩٧تا٢٩٩، وە (المغني) ج١ص٥٤٢.

[128] هەرکام لە(ابن تيمية) و(ابن القيم الجوزية) یەکەمیان لە (مجموع الفتاوى) ج١٦ص١و دووەمیان لە (جِلاءُ الافهام في الص[illegible] ٱ[illegible] حديثٌ صحيحٌ

لێکدانەوەی مەعنای صەڵەوات

**اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد:** ئەی خوایە بەزەیی و ڕێزگرتن و مەدحت بڕێژە سەر موحەممەدو سەر نزیکانی موحەممەد.

**کما صلیت علی آل ابراهیم:** هەروەك چۆن بەزەیی و ڕێزگرتن و مەدحت ڕژاندۆتە سەر نزیکانی ئیبراهیم.

**انك حمید مجید:** بێگومان تۆ سوپاسکراو وپایەبەرزی.

**اللهم بارك علی محمد وعلی آل محمد:** ئەی خوایە پیت و پێز بڕژێنە سەر موحەممەدو سەر نزیکانی موحەممەد.

**کما بارکت علی آل ابراهیم:** هەروەك چۆن پیت و پێزت ڕژاندۆتە سەر نزیکانی ئیبراهیم.

**انك حمید مجید:** (پێشتر لێکدرایەوە).

## چەند تێبینییەك دەربارەی صەڵەوات

١-بۆیە ڕستەی: (اللهم صل علی محمد) مان ئاوا مەعنا کردووە:(ئەی خوایە بەزەیی و ڕێزگرتن و مەدحت بڕژێنەسەر موحەممەد) چونکە زانایان دەربارەی واتای صەلات لەسەر پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە:

(صَلاةُ اللهِ علىٰ نَبِيِّهِ ثَناؤهُ عَلَيْهِ وتَعْظِيْمُهُ، وصَلاةُ المَلائِكَةِ وغَيْرِهِمْ عَلَيْهِ: طَلَبُ ذٰلِكَ لَهُ مِنَ اللهِ تعالىٰ، والمُرادُ طَلَبُ الزِّيادَةِ لا طَلَبُ أَصْلِ الصَّلاةِ)[129]

واتە: صەڵاتی خوا لەسەر پێغەمبەرەکەی مەدح و سەناو ڕێزلێگرتنیەتی، وەصەڵاتی فریشتان و غەیری ئەوانیش لەسەری بریتییە لە: داواکردنی ئەوە لەخوای بەرز بۆی، مەبەستیش داواکردنی زیادکردنیەتی نەك ئەسڵی صەڵەواتەکە.

---

فیهِ لَفْظُ: (ابراهیم وآل ابراهیم) مَعاً..)!! بەڵام (ناصرالدین الألباني) فەرموودە ناسی ناوداری هاوچەرخ ئیسپاتی کردوە کە ئەو ڕایەی ئەو دوو کەڵەزانایە هەڵەیەو چەند فەرموودەیەکی (صحیح)ی هێناوە کەهەردووك بێژەی ناوبراویان تێدان، بڕوانە: (صفة صلاة النبي ﷺ) ص١٧٩تا١٨١، هەر بۆیەش (مالك) گوتوویەتی: (كُلٌ يُؤْخَذُ مِنْهُ ويُرَدُّ عَلَيْهِ إلاّ صاحِبَ هذا القَبْرِ).

[129] ئەم قەسەیە (الحافظ ابن حجر العسقلاني) لە (فتح الباري شرح صحیح البخاري)دا هێناویەتی، بڕوانە: (صفة صلاة النبي ﷺ ص...

هەندێکیشـیان گوتوویانـە: (صَـلِّ: أَيْ إِرْحَمْـهُ رَحْمَـةً مَقْرُونَـةً بِـالتَّعْظِيْمِ)[١٣٠] واتە صەڵەواتی لێبدە یانی بەزەییت پێیدا بێت بەزەیی‌یەك كە ڕێزگرتن‌و بەگەورە گرتنی لەگەڵ بێت.

جـا ئێمـە هـەردووك ڕایـەكانمان كردوونـە یـەك‌و مانـا لێدانەوەكـە بەوشـێوەیەی لێ‌هاتوە كەنووسیومانە.

٢-بۆیە وشەی (آل)مان بە (نیزیكان) لێكداوەتەوە چونكە ڕای بەهێزترو بەڵگەدارتر (أُرْجَـح)ی زانایـان - بـەبۆچوونی بـەندە - دەربـارەی واتـای وشـەی (آل) ئەوەیـە كەمەبەست شوێن كەوتووانی دانسقەو تایبەتی - هەندێكیش دەڵێن: شوێن كەوتووان بەموتڵـەقی - پێغەمبەری خوایە ﷺ جا چ خزم بن، وەك هـەندێك لـەزانایان (آل) تایبـەت دەكەن بەوانەوە، وە چ خەڵكی دیكە، جا دیارە وشەی (نیزیكان) یش هـەموو ئەوانە دەگرێتـەوە كـە زیـاتر لـەو زاتـە بـەڕێزو پایـە بـەرزەوە نـیزیكن‌و چاكـتر پـەیڕەوی لەبەرنامەی خواو ڕێبازی وی دەكەن[١٣١].

---

[١٣٠] بڕوانە: (إِعانَةُ الطّالِبين) ج١ص١٧١.

[١٣١] دوای لێكۆڵینـەوەو موتاڵا گەیشتوومە ئەو قەناعەتە كەوشەی (آل) یانی: شوێن كەوتووو نیزیكان نـەك خزم‌و بنەماڵە، چونكە:

یەكەم: هەر جارێك وشەی (آل) لەقورئانیدا هاتبێ مەبەست پێی (أَتْبَاع)ە، بۆ وێنە: (وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ) غافر - ٤٦-، جا بێگومان لێرەدا مەبەست بەس خزم و بنەماڵەی فیرعەون نیە بەڵكو سەرجەم دارو دەستەو شوێن كەوتووانی بەخزم‌و بێگانەوە!

وە ئەم دێڕە شیعرەی (عَبْدُالمطلِب)ی باپیری پێغەمبەریش ﷺ هەر ئەوە دەگەیەنێ كەگووتویەتی: (وَانْصُرْ علىٰ آلِ الصَّليـ بِ وعابِدِيْهِ اليَوْمَ آلَكَ). هەروەها (نشوان الحَمْيَري)یش كە بە (إِمام اللغَة) دانراوە هەمان ڕای هەیەو لەو بارەشەوە لەشیعرێكی دا گوتوویەتی:

آلُ النبيِّ هُمُ أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ مِنَ الأَعاجِمِ والسُّودانِ والعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إِلاّ قَرَابَتُهُ صَلَّى المُصَلِّي علىٰ الطّاغِي أَبي لَهَبِ

واتـە: (آل)ی پێغەمبەر ﷺ بریتین لەشوێن كەوتووانی ڕێبازەكەی لەعەجەم‌و ڕەش پێست‌و عارەب، چونكـە ئەگەر تەنیا خزمەكانی (آل) بووانایە بابای صەڵەوات دەر صەڵەواتی لەسەر ئەبوو لەهەبی طاغووت دەدا - واتـە صەڵەواتەكەی ئەویشی دەگرتـەوە - ، دیسـان لەفەرهەنگەكانی زمـان دا گوتـراوە: (الآلُ: أَهْلُ الرَّجُلِ وأَتْبَاعُهُ)

واتە: (آل): بنەماڵەی ئی[illegible] كەوتووانی

سێیەم: جیاوازی سێیەمی نێوان تەحییاتی یەکەم و دووەم -کۆتایی- ئەوەیە کە لەتەحییاتی کۆتایی‌دا تێکڕای زانایان ڕایان وایە کەسوننەتە چەند دووعایەکی تێدا بخوێنرێن پاشان سەلام بدرێتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوەو لەوبارەوە چەندان فەرموودەی لێ‌گێڕراونەوە، بۆ وێنە: (عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رَسولُ الله ﷺ: إذا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التشهد الأخير فَلْيَتَعوَّذْ باللهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذابِ جَهَنَّمَ ومِنْ عَذابِ القَبْرِ ومِنْ فِتْنَةِ المَحْيا والمَماتِ ومِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسيحِ الدَّجّالِ) رواه الجماعة الا البخاري والترمذي.

واتە: ئەگەر یەکێکتان تەحییاتی کۆتایی تەواو کرد باپەنا بەخوا بگرێ لەچوار شتان: لەئازاری دۆزەخ و لەئەشکەنجەی گۆڕو لەبەلای ژیان‌و مردن‌و لەخراپەی بەلای مەسیحی دەججاڵ.

دیارە بێجگە لەو دووعایە کەلەچەندان فەرموودەدا داکۆکی لەسەر کراوەو تەنانەت هەندێك لەزانایان بەفەرزی دەزانن کەلەتەحییاتی کۆتایی بگوترێ، چەند دووعایەکی دیکەش هەن، بەلام مەرج نیە نوێژکەر هەموویان لەیەك کات دا پێکەوە کۆبکاتەوە چونکە تەحییاتەکە زۆر درێژ دەبێتەوە، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو دووعایانە:

---

دووەم: پێغەمبەریش ﷺ کاتێك دەربارەی (آل) پرسیاری لێ‌کراوە فەرموویەتی: (آلُ مُحَمَّدٍ كلُ تَقِيٍّ) أخرجه الطبراني، واتە: (آل)ی موحەممەد هەموو ئینسانێکی پارێزکارە، ئنجا ئەگەر لەهەندێك فەرموودانیش دا (آل)ی موحەممەد تایبەت کرابێ بەبنەماڵەو خزمانی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەوە لەگەڵ ئەوەی گوتمان تێك ناگیرێن چونکە بێگومان (اهل البيت)یش هەر لەڕیزو بگرە لەپێشەوەی (آل)ن!

سێیەم: وە لەقورئانێ بەس دوو جاران وشەی (أَهْلُ البَيْتِ) هاتوە لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی ژمارە (٣٣)و لەسورەتی (هود) ئایەتی ژمارە (٧٣) کە لەهەردووکیشیان دا ڕووی دواندن (خِطابْ) لەهاوسەرو خێزانە، ئەوەی (الأحزاب) ڕووی دواندنی لەخێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەرە ﷺ خوالێیان ڕازی بێ، ئەوەی (هود)یش ڕووی لەهاوسەری بەڕێزی ابراهیم (سارا خاتوون)ە خوالێی ڕازی‌بێ، کەواتە وشەی (اهل البيت) چەمك‌و واتایەکەی تەسکەو تەنیا هاوسەرو وەچە (الزوجة والذرية) دەگرێتەوە، بەلام (آل) وشەیەکی گشتی‌یەو وەك هەندێك دەڵێن لەگەڵ (اهل البيت)دا هاو واتا (مترادف) نین، وە وەك (شيعة)ش دەڵێن: (اهل البيت) تەنیا وەچە (ذرية) ناگرێتەوەو هاوسەریش دەگرێتەوە بگرە زیاتر هاوسەر (زوجة) دەگرێتەوە وەك لەسیاقی ئایەتەکانی (الاحزاب)و (هود)دا بەئاشکرا دەبینرێ.

چوارەم: لەسەرجەم دەقەکانی قورئان‌و سوننەت دا ئەو ڕاستی‌یە دەدرەوشێتەوە کە جگە لە کردوکۆش (السَّعْيُ والأجْتِهاد)ی ئینسان کە بەپارێزکاری (التقوىٰ) تەعبیرکراوەو جگە لەخودی ئینسان‌و کردەوەو پەرێزو بەرهەمی، هیچ فاکتەرێکی دیکەی دەرەکی دەوری نیە لەبەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی ئینسان دا، کەواتە تایبەت کرانی خزم‌و بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ بەصەڵەوات لەگەڵ ئەو ڕووحە گشتی‌یەو ئەو دادگەری‌یە موتڵەقەش دا ناگونجێ کەدەقەکانی قورئان‌و سوننەت جەختیان لەسەر کردوە، بەڵێ: (ان اكرمكم عند الله اتقاكم) الحجرات -١٢- ، وە (أَنْ لَيْسَ للانْسانِ الاّ ماسعىٰ) النجم -٣٩-، وە (مَنْ بَطّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ) رواه مسلم، و اتە: هەر کەسێك کردەوەکانی دوای بخەن ڕەچەڵەکی پێشی ناخات.

بڕوانە: (صحيح [illegible]) [illegible]

١-(اَللّهم إِنّي أَعوذُبِكَ مِنْ عَذابِ القَبْرِ، وأَعوذُبِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيْحِ الدَّجّالِ وأَعوذُبِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَحْيا والمَماتِ، اَللّهم إِنّي أَعوذبِكَ مِنَ المَغْرَمِ والمَأْثَمِ) رواه الجماعة الا ابن ماجة.

پێشتر ئەو فەرموودەیەمان ماناکردووەو مەبەست لە (المَغْرَمِ والمَأْثَمْ)یش قەرزداریو گوناحباری‌یە.

٢-(اَللهم إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسي ظُلْماً كثيراً ولايَغْفِرُ الذُّنوبَ اِلاّ اَنْتَ فَاغْفِرْلي مَغْفِرةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْني إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيْمُ) متفق عليه.

واتە: ئەی خوایە من ستەمێکی زۆرم لەخۆم کردوە، جگە لەتۆش هیچ کەس تاوانان ناپۆشێ، جالێم ببوورە بەلێبوردنێکی تایبەت لەلایەن خۆتەوە، وەبەزەییت پێم دابێ بێگومان هەرتۆی لێبوردەی بەبەزەیی.

٣-(اَللهم اغْفِرْلي ماقَدَّمْتُ وماأَخَّرْتُ، وماأَسْرَرْتُ وماأَعْلَنْتُ، وما أَسْرَفْتُ وماأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنّي، أَنْتَ المُقَدِّمُ وأَنْتَ المُؤَخِّرُ لا اِلهَ اِلاّ اَنْتَ) رواه مسلم.

واتە: ئەی خوایە لێم خۆش بە لەوەی پێشم خستوە - لەگوناحان - و لەوەی دوام خستوە - لەفەرمانبەری‌یەکان - ، وە لەوەی پەنهانم کردووەو ئاشکرام کردوە، وەلەوەی بەزیادەڕۆیی کردوومە، وە لەوەی تۆ لەخۆم پێی زاناتری، تۆی پێشخەرو تۆی دواخەر، جگە لەتۆ هیچ پەرستراو نین.

٤-(اَللهم إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّباتَ في الأَمْرِ والعَزِيْمَةَ علىٰ الرُّشْدِ، وأَسْأَلُكَ شُكْرَ نِعْمَتِكَ وحُسْنَ عِبادَتِكَ، وأَسْأَلُكَ قَلْباً سَلِيْماً ولِساناً صادِقاً (وخُلُقاً مُسْتَقِيْماً)، وأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ ماتَعْلَمُ وأَعوذُبِكَ مِنْ شَرِّ ماتَعْلَمُ وأَسْتَغْفِرُكَ لِما تَعْلَمُ) رواه النسائي الاّ (وخلقاً مستقيماً) فقد اخرجه الطبراني.

واتە: ئەی خوایە من داوات لێ‌دەکەم کە لەکاروبار - ی دینداری - م دامەزراو بمو لەسەر ڕێی ڕاست دڵقایم بم، وەسوپاسگوزای چاکەتو چاك پەرستنمت لێ‌داوا دەکەم، وە دڵێکی ساغو زمانێکی ڕاستو ڕەوشتێکی ڕێكو پێکت لێ‌داوادەکەم، وەسوودو چاکەی هەرشتێکت لێ‌داوا دەکەم کە -بەس تۆ - دەیزانیو، پەنات دێنمەبەر لەزیانو خراپەی هەر شتێك کە - هەر تۆ- دەیزانی، وە داوای لێبووردنم هەیە بۆ هەموو ئەو گوناحانەی کەتۆ پێیان ئاگاداری.

دوو تێبینی: یەکێ: دەبێ تەحییات بەدەنگی نزم بخوێندرێ وەك (ترمذي وابوداود و بيهقي) گێڕاویانەتەوە.

دوو: لەهیچ کام لەو فەرموودانەدا کەچۆنیەتی سەڵەوات دان باس دەکەن وشەی (سَيِّدنا) نیە، بۆیە لەنێو زانایان دا سەبارەت بەگونجانو نەگونجانی وشەی (سَيِّدنا)

لەنوێژدا مشت ومڕیان هەبووە، زۆربەو جەماوەر یان ڕایان وایە کە نە وشەی ناوبراوو نە هیچ وشەیەی دیکەش زیادنەکرێ، بۆ وێنە (ابن حجر العسقلاني) کە تەعبیر لەبیروڕای جەماوەری زانایان دەکات لەمەسەلەی ناوبراودا، گوتوویەتی:

(نَعَمْ إِتِّباعُ الألْفاظِ المَأثُورَةِ أرْجَحُ، ولايُقالُ لَعَلَّهُ تَرَكَ ذلِكَ تَواضُعاً مِنْهُ ﷺ كما لَمْ يَكُنْ يَقولُ عِنْدَ ذِكْرِهِ ﷺ "ﷺ" وأُمَّتُهُ مَنْدوبَةٌ الىٰ أنْ تَقُولَ ذٰلِكَ كُلَّما ذُكِرَ، لأنّا نَقولُ لَوْكانَ ذٰلِكَ راجِحاً لَجاءَ عَنِ الصَّحابَةِ ثُمَّ عَنِ التّابِعينَ، ولَمْ نَقِفْ في شَيْئٍ مِنَ الآثارِ عَنْ أحَدٍ مِنَ الصَّحابَةِ ولا التّابِعينَ لَهُمْ قالَ ذٰلِكَ مَعَ كَثْرَةِ ماوَرَدَ عَنْهُمْ مِنْ ذٰلِكَ...)[132]

واتە: بەڵێ شوێن کەوتنی بێژەگێڕراوەکان چاکترە، ناشبێ بگوترێ ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ لەڕووی خۆبەکەمگرتنەوە ئەو وشەیەی نەگوتبێ، هەروەك چۆن لەکاتی ناوبردنی خۆیدا نەیفەرمووە " ﷺ" لەحالێك دا کەئۆممەتەکەی فەرمانی پێ‌کراوە – وەك سوننەت – کە هەرکاتێك ناوی هێنرا بڵێ: " ﷺ" چونکە ئێمە – لەوەڵام دا – دەڵێین: ئەگەر چاکتر بووایە ئەوە لەهاوەڵانەوەو پاشان لەشوێن کەوتووانیانەوە دەهات، بەڵام هیچ شتێکی وا لەهیچ کام لەهاوەڵان و شوێن کەوتووانیانەوە نەهاتوە، هەرچەند لەوبارەوە زۆر شتیان لێ‌گێڕراوەتەوە.

هەندێکیشیان نەك هەر بەدروست (جائز) بگرە بەپەسندیشی دەزانن کەلەبەر ئەدەب و ڕێزگرتن لەپێغەمبەر ﷺ وشەی (سَیِّدنا) زیاد بکرێ، بۆ وێنە هەرکام لە (العِزُّ بنُ عَبْدالسَّلام) کە بە(سُلْطانُ العُلَماء) ناسراوەو (شَوْکاني) ڕایان وایە[133]، منیش ڕای جەماوەرم پێ‌چاکترو بەهێزترو سەلامەت ترە، بەڵام بەڕەواشی نازانم کە هەراوکێشە لەگەڵ ئەوانەدا بەرپابکرێ کەوشەی (سَیِّدنا) لەتەحییات دا بەکاردێنن، چونکە یەکەم: وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە پێویستە بەسینگ فراوانی‌یەوە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافی‌یەکان دا مامەڵە بکرێ، چونکە شەرع لەڕووی حیکمەتەوە وای هەڵخستوون کەچەند (ڕووێك) یان هەبێ و بەچەند جۆرێك ئەنجام بدرێن، دووەم: ئەوانەش کەوشەی ناوبراو لەتەحییات دا بۆ پێغەمبەر ﷺ بەکاردێنن دەتوانن تاڕادەیەك بەرگری لەڕایەکەی خۆیان بکەن[134].

---

[132] بڕوانە: (صفة صلاة النبي ﷺ) ص١٨٨، ١٨٩.

[132] بڕوانە: (نيل الأُوطار) ج٢ص٣٠٤.

[134] بۆ وێنە (شوکانی) بۆ پشتگیریکردنی لەڕای ناوبراو گوتوویەتی: لە (ابن عبدالسلام) گێڕراوەتەوە کەبەکارهێنانی وشەی (سَیِّدنا) ی خستۆتە نێو بازنەی مەسەلەی ڕێزو ئەدەبەوە بەرانبەر بەپێغەمبەر ﷺ ئەویش لەسەر [illegible] کەڕێز لەدەب دەخرێتە پێش فەرمان

## بڕگەی بیستو دووەم: خوێندنی دووعای قونووت

دەربارەی خوێندنو نەخوێندنی دووعای قونووت زانایان سێ دەستەن:

١-دەڵێن: دروست (جائز) نیە بخوێنرێ، چونکە هەرچەندە کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ خوێندووویەتی بەڵام دوایی وازی لێهێناوە، کەواتە نەسخ کراوەتەوە، ئەمە ڕای (أبو حنيفە)و ژمارەیەکی دیکەیە لەزانایانی عێراق.

٢-دەڵێن: سوننەتە لەنوێژی بەیانیدا بخوێندرێ لەکاتی ئاسایی‌داو، لەکاتی نائاسایی‌دا وەك جەنگ یان هەر بەڵاو گرفتاری‌یەکی دیکەی گشتی‌دا لەکۆتایی هەموو پێنج نوێژە فەرزەکان دا سوننەتە، ئەمەش ڕای مالیکی‌یەکانو شافیعی‌یەکانە، ئەوەندە هەیە مالیکی‌یەکان دەڵێن سوننەتە پێش چوونە ڕکووع بێ‌و شافیعی‌یەکانیش دوای هەڵسانەوە لەڕکووعیان دیاری کردووە، بەڵام هەردووك لاشیان پێش خستنیو دواخستنی بەدروست دەزانن.

٣-دەڵێن: تەنیا لەکاتی ڕوودانی بەڵاو گرفتاری‌یەکی گشتی‌دا سوننەتەو ئەویش لەکۆتایی هەر پێنج نوێژە فەرزەکاندا (سەبارەت بەخوێندنی قونووتیش لەنوێژی وەتردا لەکاتی باس کردنی نوێژی وەتردا باسی دەکەین.)

شایەنی باسیشە کەئەم ڕایەی سێیەم لەهەردووك ڕایەکانی پێشووی بەهێزترو بەڵگەدارترە، ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیەکی بێ‌پێچو پەنایە بۆ سەلماندنی بەهێزتربوونو بەڵگەدارتر بوونی:

(عن أبي مالك الأَشْجَعي قال: قُلْتُ لِأَبِي إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وأَبِي بَكْرٍ وعُمَرَ وعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ هٰهُنَا بِالكُوفَةِ قَرِيْباً مِنْ خَمْسِ سِنِيْنَ، أَكَانُوا يَقْنُتُونَ؟! قال: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ)رواه احمد والترمذي وصححه وابن ماجه، وفي رواية (أَكَانُوا يَقْنُتُونَ في الفَجْرِ) رواه النسائي بلفظ قريب منه.

وەك دەبینین یەکێك لەهاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کەبابی (ابومالك الأشجعي)یەو لەپشت هەرکام لەپێغەمبەر ﷺ و هەر چوار خەلیفەکانی‌یەوە نوێژی بەیانی کردوە، شایەدی دەدات کەهیچ کامیان لەنوێژی بەیانی‌دا دووعای قونووتیان نەخوێندوەو

---

بەجێ‌هێنان (إِمْتِثَالُ الأَمْر)ەوە، وەك ئەبووبەکری صدیق خوالێی ڕازی‌بێ کەهەرچەندە پێغەمبەر پێی فەرموو ئامادەنەبوو پێشی بکەوێ، هەروەها عەلی خوا لێی ڕازی‌بێ کەئامادەنەبوو ناوی پێغەمبەر ﷺ بسڕێتەوە لەکاتی ڕێککەوتن نامەی حودەیبییەدا، هەرکام لەم دوو ڕووداوەش لەسوونەتی (صحیح [illegible] ج٢/ص٣٠.

دوای ئـەوان داهێـنراوە! دیـارە هەربۆیـەش هـەندێك لـەزانایان خوێنـدنـی دووعـای قونووتیان لەنوێژی بەیانیدا بەبیدعەت داناوە.

ئنجا ئەوانەش کەئەم فەرموودەیە بەبەڵگە دێننەوە بۆ ئیسپاتی سوننەت بوونی خوێندنی قونووت لەنوێژی بەیانیدا، : (عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَنَتَ شَهْراً يَدْعو علىٰ قاتِلي أَصْحابِهِ بِبِئْرِ مَعُونَةَ ثُمَّ تَرَكَ، فأَمّا الصبحُ فلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ حَتّىٰ فارَقَ الدُّنْيا) رواه احمد والدارقطني والبيهقي والحاكم وصححه.

قسـەکەیان جێنـاگرێ، چونکـە سـەرەڕای ئـەوەی کـەزانایانی فـەرموودەناس لەسۆنگەی هەبوونی (ابوجعفر الرازي) لەنێو ڕاوییەکانی ئەم فەرموودەیەداو بەپێی یاسـاکانی (الجَـرْحْ والتَّعْدِيْـل) ڕەخنـەیان لـێی هەیـە، بـەڵێ وێـڕای ئـەوە چـەند فەرموودەیەکیش لە(أَنَس)ەوە - خوا لێی ڕازیبێ - گێڕراونەوە کەپێچەوانەی ئەوەی لەم فەرموودەیەدا گێڕاویەتەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە:

أ-(خطيب) گێڕاویەتەوە کەپرسیار لە (أَنَس)کرا: (إِنَّ قَوْماً يَزْعُمـونَ أَنَّ النَّـبِيَّ ﷺ لَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ في الفَجْرِ! فقال: كَذَبُوا إِنَّما قَنَتَ شَهْراً واحِداً يَدْعو علىٰ حَيٍّ مِنْ أَحْياءِ المُشْرِكِيْنَ).

ب-هـەروەها (ابن خزيمة) هەر لە (انس)ەوە گێڕاویەتەوە: (إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَقْنُتْ إِلاّ إِذا دَعا لِقَوْمٍ أَوْ دَعا علىٰ قَـوْمٍ)، وەك دەبینین لەهـەر کام لـەم دوو فەرموودەیەدا (أَنَس) خوالێیڕازیبێ داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کەپێغەمبەر ﷺ لەنوێژیبەیانیدا قونووتی نەخوێندوە مەگەر لەکاتی نائاسایی و کاتی گرفتاریو بەڵاو ناڕەحەتی گشتیدا.

(ابن القَيِّـم الجَوْزِيَّـة)ش خـوا پاداشـتی بداتـەوە بـۆ لابردنـی ئـەو ئیشـکالەی کـە لەڕواڵـەتی ئـەو فەرموودانـەوە پـەیدا دەبێـت کـە لـە(أَنَـس) ەوە گێڕراونـەوە، ڕوونکردنەوەیەکی جوانی نووسیوەو گوتوویەتی:

(ئەو فەرموودانەی کە لە (أَنس)ەوە گێڕراونەوە هەموویان تەواونو هەموویان یەکتر بەڕاسـت دەزانـن، ئـەوە کەدەفـەرموێ: پێغەمبـەر ﷺ هـەتا لـەدنیا دەرچوو قونووتـی لەنوێژی بەیانیدا هەرخوێند، ئەوە مەبەستی زۆر قوڕئان خوێندنە لەنوێژی بەیانیداو زۆر ڕاوەستانە لەدوای ڕکووع بۆ مەدح و سەنای خوا، چونکە وشەی قونووت چەمكو واتا گشتییەکەی زۆر مانەوەیە بەپێوە لەخزمەت خوادا، پاشان لەعورفی زانایان دا ئەو چەمکە زاراوەیی و تایبەتییەی بۆ پەیدابووە کەئێستا بۆی بۆتە باو، جا کەزانایان بینوویانە هاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ وشەی (قُنُوت)یان بەچەمكو واتا

گشتیو بنەڕەتییەکەی خۆی بەکارهێناوە، ئەوان - واتە زانایان - وایان زانیوە مەبەستی هاوەڵان لەوشەی ناوبراو هەر ئەو واتاو چەمکە تایبەتییەی ئەوانە! ئیدی لەوەوە ئەنجام گیرییان کردوە کە وادیارە پێغەمبەر ﷺ هەموو نوێژی بەیانییەک دووعای قونووتی خوێندوە!!)[١٣٥]

لەم برە توێژینەوەیەش - کەمەودای زیاترمان نەبوو - دەرکەوت کەڕای زۆربەو جەماوەری زانایان بەهێزترو جێی متمانەترە[١٣٦]، کەدەڵێن خوێندنی دووعای قونووت تەنیا بۆ کاتی ڕوودانی بەڵاو گرفتاری گشتییە ئەویش لەکۆتایی هەموو نوێژە فەرزەکان.

## دەقی دووعای قونووت

بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان چاکترین جۆری دووعای قونووت - بەتایبەت بۆ نوێژی وەتر - ئەم دووعایەیە کە لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

(عن الحَسَن بن عَليّ بن أَبي طالب ﷺ قال: عَلَّمَني رَسولُ ﷺ كَلماتٍ أَقُولُهُنَّ في الوَتْر: اللهُمَّ اهْدني فيْمَنْ هَدَيْتَ، وعافِني فيْمَنْ عافَيْتَ، وتَوَلَّني فيْمَنْ تَوَلَّيْتَ، وبارِكْ لي فيْما أَعْطَيْتَ، وقِني شَرَّ ماقَضَيْتَ، فَإنَّكَ تَقْضي ولايُقْضى عَليْكَ وانَّهُ لايَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ ولايَعِزُّ مَنْ عادَيْتَ، تَبارَكْتَ رَبَّنا وتَعالَيْتَ وصلَّى اللهُ علىٰ النَّبِيّ) رواه أحمد واصحاب السنن وغيرهم. لكن لفظ (وصلَّى الله علىٰ النَّبيّ) في رواية النسائي.

## مانای دووعای قونووتیش ئاوایە:

ئەی خوایە ڕێڕوونیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کەڕێڕوونیت کردوون، وەسەلامەتو بێ بەڵام بکە لەگەڵ ئەوانەدا کەسەلامەتت کردوون، وەمشوورم لێبخۆو سەرپەرشتیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کەمشوورت لێخواردوون، وەپیتو پێزم بۆبخە نێو ئەوەوە کە پێت بەخشیوم، وە لەزیانو خراپەی ئەوە کەبڕیارت داوە بم پارێزە، چونکە هەرتۆ بڕیار دەدەیو بڕیارت بەسەردا نادرێ، وەبێگومان هەرکەسێك تۆ پشتی بگری زەبون نابێ، وە هەرکەسێك تۆ دژایەتی بکەی زاڵ نابێ،هەر تۆی پایەدارو بەرز ئەی پەروەردگارمان، صەڵەواتی خوا لەسەر پێغەمبەر بێت.

---

[١٣٥] بڕوانە: (زادُ المَعادْ في هَدْي خَيْرِ العِباد) ج١ص٧٢، ٧٣.

[١٣٦] بڕوانە: (سبل السلام) ج١ص١٨٥، وە (نيل الأوطار) ج٢ص٣٥٠تا٣٦٧، وە بڕوانە: (الفتاوىٰ الكبرى) لابن تيمية ج١ص٢٢٣تا٢٣٠، وە (فقه السنة) ج١ص١٧٣تا١٧٦، وە بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٣ص٤٥٦تا٤٧٢، هەرچەندە (نووي) ڕای بەپێی مەزهەبی شافیعییەو قونووت لەنوێژی بەیانیدا بەسوننەت دەزانێ.

## چۆنیەتی خوێندنی دووعای قونووت

یەک: (بخاري واحمد) گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ لەکاتی پاڕانەوەی قونووت دا دەنگی هەڵدەبڕی.

دوو: (احمد وطبراني) یش گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەدەمی خوێندنی قونووت دا دەستی بەرز دەکردنەوە.

سێ: (أبوداود)یش گێڕاویەتەوە کەئەوانەی لەدوایەوە بوون (آمین)یان دەگوت.

چوار: (نسائي)یش گێڕاویەتەوە کەسوننەتە لەکۆتایی قونووت دا بگوترێ: (وَصَلَّى اللهُ علىٰ النَّبِيِّ)یان (اَللّٰهُمَّ صَلِّ علىٰ محَمَّدٍ وآلِ محَمَّدٍ وَسَلَّمْ).

پێنج: (نسائي واحمد)یش گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ کە لەخوێندنی قونووت دەبۆوە (الله اکبر)ی دەکرد و یەکسەر کڕنووشی دەبرد.

شەش: وە دەبێ (ئیمام) ڕاناو (ضمیر)ی دووعایەکان بکاتە کۆ (جَمْع)، ئاوا: (اَللّٰهُمَّ اهْدِنا...)چونکە بۆ خۆی و بۆ مسوڵمانان دەپاڕێتەوە.

## بڕگەی بیست و سێیەم: سەلام دانەوە

ئنجا ئەی مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست! کاتێك بەوشێوەیەی باسمان کرد نوێژەکەتت تەواوکرد، بەهۆی سەلام دانەوەوە لەلای ڕاست و پاشان لای چەپ لەنوێژەکەت بچۆ دەرێ، ئەمەش چەند فەرموودەیەك دەربارەی سەلام دانەوەی نوێژ:

١-(عن أبن مسعود أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِيْنِهِ وَعَنْ يَسارِهِ: السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، السَّلامُ عليكم وَرَحْمَةُ اللهِ حتّى يُرىٰ بَياضُ خَدِّهِ) رواه الخمسة وصححه الترمذي.

واتە: پێغەمبەر ﷺ بەلای ڕاستی و بەلای چەپیدا سەلامی دەدایەوە، هەتا لەملاولا ڕا سپێتی ڕوومەتی دەبنیرا - واتە تەواو گەردنی پیرۆزی دەسووڕاند - و دەیفەرموو: السلام علیکم ورحمه الله، السلام علیکم ورحمه الله.

٢-(وعن عامر بن سعید عن أبیه قال: (كُنْتُ أَرىٰ النبيَّ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وعَنْ يَسارِهِ حتّى يُرىٰ بَياضُ خَدِّهِ) رواه احمد ومسلم والنسائي وابن ماجه.

٣-(ابوداود و ابن خزیمة) دەڵێن: جاری وابوو لەسەلام دانەوەی یەکەم دا وشەی: (وبرکاتُه)ی زیاد دەکرد، واتە دەیفەرموو: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته).

٤-(عن أبي هريرة عن النَّبيِّ ﷺ قال: (حَذْفُ التَّسْلِيمِ سُنَّةٌ) رواه احمد وابوداود ورواه الترمذي موقوفاً وصححه.

واتــه: كـورت كردنــەوەی ســەلام ســوننەتە، مەبەسـتیش ئەوەیــە وەك زانایــان فەرموویانە بۆ وێنە (عبدالله بن المبارك وابن سيد الناس) كە وشەكانی (السـلام عليكـم ورحمة الله) بەكورتو خێرایی بگوترێنو درێژنەكرێنەوەو لێك نەكێشرێنەوە[١٣٧].

٥- وە (أحمد وبيهقي وابن خزيمة وطبراني وحاكم) گێراویانەتەوە كەپێغەمبەری خوا ﷺ جاری وابووە بەس یەك سەلامی دەدایەوەو دەیفەرموو: (السلام عليكم) وە تۆزێك ملی بەلای ڕاست دا خوار دەكردەوە، دەنا ڕووی لەپێش خۆی دەكرد.

بۆیە زۆر لەزانایان فەرموویانە ئەگەر نوێژكەر تەنیا یەك سەلامیش بداتـەوە بەس بڵێ: (السلام عليكم) ئەوە سەلامەكەی هەر دروستە .

شایەنی باسە كەسەلام دانەوەی نوێژیش وەك (نووي) گوتوویەتی: لەلای زۆربەو جەماوەری زانایان كە (مالك وشافعي واحمد) یشیان لەنێودان فەرز و پایە (ركن)ی نوێژە، بەڵام تەنیا سەلام دانەوەی لای ڕاست یان یەك سەلام لەپێش خۆیەوە، ئەگەرنا سەلامی دووەمی لای چەپ سوننەتە[١٣٨] .

دیارە هەندێكیش لەزانایان سەلام دانەوەی نوێژ بەپایەو فەرز نازانن، بۆ وێنە (ابوحنيفه واسحاق بن راهويه) وە ئەو فەرموودەیەش بەبەڵگە دێننەوە كەلەنێو زانایانی فەرموودەناسو شەرعزان دا بەفەرموودەی (المسيء صلاته) ناسـراوە[١٣٩]، چونكە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەی ناوبراودا تـەنیا پایـەو فـەرزەكانی نوێژی فێری كابرای نوێژنەزان كردووە، كەچی باسی سەلام دانەوەی نەكردووە، كەواتە فەرز نیە، بەڵام جەماوەری زانایان وێڕای ئەوەی كەبەڵگەی دیكەشیان بەدەستەوە هـەن، وەڵامی ئەو قسەیەش دەدەنەوە كەفەرموودەی گۆڕین بەبەڵگە دێنێتەوەو دەڵێن: لەو فەرموودەیەدا تـەنیا (سەلام دانەوە) نیە كەباس نـەكرابێ، بەڵكو سێ شتی دیكەش كەبەیەكدەنگی زانایان فەرزو پایەن باس نەكراون كە: (نیەت هێنان)و (دانیشتن

---

[١٣٧] بڕوانە: (نيل الأوطار، شرح منتقى الأخبار) ج٢ص٣١٤، ٣١٥.

[١٣٨] بڕوانە: (الاذكار) ص٦٦.

[١٣٩] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٤ص١٠٦،١٠٧، وە لـە(خاڵی پێنجەم: بەرپاكردنی نوێژ چی‌یەو چۆنە؟!) دا ئەو فەرموودەیەمان هێناوەو ڕوونمان كردۆتەوە.

بۆ تەحییاتی کۆتایی)و(ڕیزکردنی پایەو فەرزەکانی نوێژ)ن، هەروەها سێ شتی دیکەش کەزانایان جیاوازی‌یان لەبارەی فەرزبوون و نەبوونیانەوە هەیە دیسان باس نەکراون کە"خوێندنی تەحییاتی کۆتایی"و"سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر"و"سەلام دانەوە"ن! هۆی ئەمەش ئەوەیە کەپێغەمبەری کاربەجێ ﷺ لەو فەرموودەیەدا تەنیا ئەو پایەو فەرزانەی فێری کابرای نوێژنەزان کردوون کەنەیزانیون و ئەوانەی کەزانیویەتی دەیانزانێ بەپێویستی نەزانیوە بۆی ڕوون بکاتەوە[140].

جا بێگومان ئەم بەڵگەو وەڵامەی جەماوەری زانایان - خوا لەهەموویان خۆش بێ - زۆر بەهێزەو پێم وایە بەڵگەو بیانوویەکی وا بەدەست ئەوانەوە ناهێڵێ کە (سەلام دانەوە) بەپایە وفەرز نازانن، بەڵام وەك زۆرجاری دیکەش گوتوومانە مادام مەسەلەیەکی جوزئی و خیلافی‌یە ڕێگای هەر تێدایە[141].

## بڕگەی بیست و چوارەم: زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان

پاشان ئەی مسوڵمانی سەنگین و شیرین! کەسەلامەت دایەوەو نوێژەکەت تەواو کرد سوننەتە چەند زیکرو دووعایەك بخوێنی، بەر لەوەی شوێنی خۆت بەجێ بهێڵی کە ئەوە لەخوارەوە گرنگترینیان و بەڵگەدارترینیان دەنووسین:

یەك: سەرەتا یەکسەر[142] دوای سەلام دانەوە سێ جاران بڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ)

،واتە: داوای لێبوردن لەخوا دەکەم، ئنجا بڵێ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ وَمِنْكَ السَّلامُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الجَلالِ وَالْاِكْرَام) واتە: ئەی خوایە تۆی سەلامەتی و ئاشتی و سەلامەتی و ئاشتی لەتۆوەوەیە، پایەبەرزی ئەی خاوەنی شکۆو ڕێزگرتن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ: (عَنْ ثَوْبَانَ قَال: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاتِهِ اسْتَغفَرَ ثَلاثاً، وقال: اَللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ ومِنْكَ السَّلامُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الجَلالِ والْاِكْرَام) رواه الجماعة إِلّا البخاري.

---

[140] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٤ص١٠٧،١٠٨.

[141] بۆ وێنە: (شوكاني) ڕای وایە کەسەلام دانەوەی نوێژ نەپایەیە نەفەرز، بڕوانە: (نَيْلُ الأَوطار) ج٢ص٣١٨.

[142] دەشگونجێ دوای سەلام دانەوە (الله اكبر) بکرێ، پاشان (استغفرالله) بگوترێ، چونکە (ابن عباس) خوا لێی‌ڕازی بێ گوتوویەتی: (كُنْتُ أَعْرِفُ انْقِضاءَ صَلاةِ النبيِّ ﷺ بِالتَّكْبِيرِ) رواه البخاري، واتە: من نوێژ تەواو بوونی پێغەمبەرم ﷺ بەهۆی بیستنی (اللهُ أَكبر)ەوە دەزانی، بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري ج٢ ص٣٩١).

دوو: ئنجا ئەگەر (مأموم) بووی لەشوێنی خۆت مەجوولێ، وەئەگەر ئیمام بووی بەرەو نوێژکەرەکان ڕوو وەربسوڕێنە، چونکە پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابووە، وەك (عائشە) خوا لێی ڕازیبێ بۆمان دەگێڕێتەوە:
(كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ إذا سَلَّمَ لَمْ يَقْعُدْ إلاَّ مِقْدارَ مايَقولُ: اللهم انْتَ السَّلامُ ومِنْكَ السَّلامُ تَبارَكْتَ يَاذا الجَلالِ والاكْرام) رواه احمد ومسلم والترمذي وابن ماجه.

دیارە لێرەدا مەبەست لە (لَمْ يَقْعُدْ) واتە دوای سەلام دانەوە ڕووەو قیبلە هەر هێندە دانیشتوەو ماوەتەوە هەتا زیکری ناوبراوی خوێندوە -بێجگە لەسێ جار (اسْتَغْفِرُالله) کردن -، بەپێی ئەوەی کە لەفەرمودەکانی دیکەدا دەردەکەوێ، بۆ وێنە: (عَنْ سَمُرَةَ قال: كانَ النَّبيُّ ﷺ إذا صَلَّى صَلاةً أقْبَلَ علَينا بِوَجْهِهِ) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کەنوێژی تەواودەکرد ڕووی بۆلای ئێمە وەردەسووڕاند.

ئنجا ئەو ڕوو وەرسووڕاندنەش فەرقی نیە چ بەلای ڕاست دابێ چ بەلای چەپ دا، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ بەهەردووك لایان دا ڕووی خۆی بەرەو نوێژکەرەکان وەردەگێڕا، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ: (عن ابن مسعود قال: لايَجْعَلَنَّ أحَدُكُمْ لِلشيطانِ شَيْئاً مِنْ صَلاتِهِ، يَرىٰ أنَّ حَقاً عليهِ أنْ لايَنْصَرِفَ إلاَّ عَنْ يَمِيْنِهِ، لَقَدْ رأيْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ كَثِيْراً يَنْصَرِفُ عَنْ يَسارِهِ) رواه الجماعة الا الترمذي.

دیارە مەبەستی (ابن مسعود) خوا لێی ڕازیبێ ئەوەیە کەبابای نوێژکەر ڕوو وەرسووڕاندنی بەلای ڕاست دا بەفەرز نەزانێ و بزانێ کەپێغەمبەر ﷺ بەلای ڕاست و چەپ دا ڕووی وەرسووڕاندوە، هەڵبەتە ئەگەر لەبەر پیرۆزی لای ڕاستیش زیاتر بەلای ڕاست دا خۆی بسووڕێنێ باشترە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەفەرزی نەزانێ، چونکە (أنَسْ) گوتوویەتی: (بەزۆری پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە بەلای ڕاست دا ڕووی وەردەسووڕاند) وەك (مسلم ونَسائي) گێڕاویانەتەوە.

سێ: پاشان ئەم زیکرانە یان زۆربەیان یان بەلای کەمەوە هەندێکیان بخوێنە، چونکە دوای گەڕان و پکشنین نەگەیشتوومە ئەنجام لەوەدا کەئایا پێغەمبەر ﷺ هەموویانی پێکەوە خوێندوون یان هەرجارە بەشێکیان، کەواتە هەردووك حاڵیان تێدا دروستن و سوننەتن:

١-(اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلىٰ ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبادَتِكَ) رواه احمد وابوداود والنسائي وابن خزيمة وابن حبان والحاكم.

واتــه: ئـەی خوایـه یـاریدەم بـده لەسـەر یـادکردنتو سـوپاس کردنـتو چـاك پەرستنت.

٢- (لاإلهَ إلاّ الله وَحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمْدُ وهو علىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ، ولاحَولَ ولاقُوةَ إلاّ باللهِ العَليِّ العَظيمِ، وَلانَعْبُدُ إلاّ إيّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ ولَهُ الفضْلُ ولَهُ الثَّناءُ الحَسَنُ، لا إلهَ إلاّ الله مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّيْنَ ولَوْ كَرِهَ الكافِرُونَ) رواه احمد ومسلم وابوداود والنسائي.

واته: جگە لەخوا هیچ پەرستراونین تاکەو هیچ هاوبەشی نین، موڵك هەر ئیویەو ستایش هەر ئی ویە وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، وە لادان - لەخراپە - و توانا - بۆچاکەکردن - تەنیا بەخوای بەرزی مەزن هەیە، وە جگە لەوی ناپەرستین، چاکەو بەخشش هەر ئیویەو مەدحو سەنای باش شایستەی ویە، جگە لەخوا هیچ پەرستراو نین، گەردن کەچیمانی بۆ ساغو یەکلادەکەینەوە هەرچەندە کافرەکان پێیان ناخۆش بێ. (ابن الزبير) خوا لەخۆیو بابی ڕازیبێ گوتوویەتی: (يُهَلِّلُ بِهِنَّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ) واتــه: پێغەمبەری خــوا ﷺ پـاش هــەر نوێژێـك دەنگـی بـەم ڕستانە بەرزدەکردەوەو بەدەنگی بڵند دەیفەرموون، وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (مسلم وابوداود ونسائي) گێڕاویانەتەوە.

٣-(لا إلهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمْدُ وهو علـىٰ كُـلِّ شَيْءٍ قَديـر، اللّهُمَّ لامانِعَ لِما أَعْطَيْتَ، ولامُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ، ولايَنفعُ ذالجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ) متفق عليه.

واته: جگە لەخوا هیچ پەرستراونین تاکەو بێهاوبەشە، موڵكو ستایش بەس هی ویە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، ئەی خوایە! پێشگر نیە بۆئـەوەی تـۆ بیبەخشیو بەخشەر نیە بۆ شتێك تۆنە هێڵی بێتە دەست، وە هیچ خاوەن بـەشو سامانو دەستەڵاتێك، بەشو سامانو دەستەڵاتەکەی لەبەرانبەر سزاو تۆڵـەی تـۆدا دادی نادات.

٤-خوێندنی هەر کام لەسـوورەتی: (الفَلَق)و(النّاس) چونکـه (عُقْبَةُ بـن عـامر) خوالێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (أَمَرني رَسولُ اللهِ ﷺ أَنْ أَقْرأَ بِالمُعَوِّذَتَيْنِ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ) رواه البخاري ومسلم واحمد وابوداود، ولفظ احمد وابي داود (بِالمُعَوِّذاتِ) کـەدیارە سـوورەتی (الأُخْلاص)یش دەگرێتەوە.

٥-خوێندنی (آية الكُرْسيِّ) کە گەورەترین ئایەتی قورئانی بەرێزو خاوەن پێزە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قَرَأَ آيةَ الكُرْسيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الجَنَّةِ الاَّ أَنْ يَمُوتَ) رواه النسائي والطبراني.

٦-گوتنی: (٣٣)جار (سُبْحانَ اللهِ)و (٣٣) جار (الحَمْدُ لِلهِ)و (٣٣) جار (اللهُ اكْبَرُ) وە جاری سەدەمین (لا إِلهَ الا الله وحْدَه لاشريكَ لَهُ لَهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمْدُ وهو علىٰ كُلِّ شَيٍ قَـدير) چونکە (بخاري ومسلم واحمد ونسائي) گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك دوای هەر نوێژێك - مەبەستی پێنج نوێژە فەرزەکانە-ئەم زیکرانە بخوێنێ، گوناحەکانی ئەگەر هێندەی کەفی دەریاش بن دەپۆشرێن.

٧-خوێندنی زیکری: (لا اله الا الله وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ يُحْيِ وَيُمِيْتُ وهُوَ علىٰ كُلِّ شَيٍ قَديْر) "١٠" دە جاران لەدوای هەرکام لەنوێژی شێوان و بەیانی بەر لەوەی نوێژکەر جێگای خۆی بگۆڕێ و لاقی بنوشتێنێتەوە - واتە بەرلەوەی شێوەی دانیشتنی تەحییاتی کۆتایی بگۆڕێ - ، وەك (احمد وترمذي) گێڕاویانەتەوە.ئەمانە دووعاو زیکرە سەرەکی یەکانی دوای نوێژە فەرزەکانن، ئەگەرنا ئی دیکەش هەن [١٤٣]، بەڵام لەهیچ فەرموودەیەك دا نەهاتوە کەپێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەرێزی ﷺ پێکەوەو بەکۆمەڵ لەدوای نوێژەکان زیکرو دووعایان کردبێ، بەڵکو هەرکەسە بۆخۆی و لەبەرخۆیەوە زیکرو دووعای خۆی کردوە، کەواتە بابزانرێ کەئەوەی لەهەندێك شوێنان کراوەتە عادەت و (باو) ، کەئیمام و شوێن کەوتووان (مَأْمُومِيْن)ی پێکەوە بەکۆمەڵ و بەدەنگی بەرز[١٤٤] چەند زیکرو دووعایەکی تایبەتی - وەك (لا اله الا الله) یان

---

[١٤٣] بۆ وێنە (نَسائي وابن خزيمة وابن حبان) لە (زيد بن ثابت) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوون هەرکام لە (سُبْحانَ اللهِ) و(الحَمْدُلله) و (اللهُ اكبر) و (لا اله الا الله) یەکی (٢٥) بیست و پێنج جار بڵێن، کەدەکاتە (١٠٠) سەد.

هەروەها هەرکام لە(احمد ونسائي وابوداود وترمذي) گێڕاویانەتەوە کە هەرکام لە: (سبحان الله)و (الحمدالله) و(الله اكبر)یەکی دە (١٠) جار بگوترێ، بڕوانە: (فتح الباري) ج٢ص٥٩٨.

[١٤٤] بەڵام پێویستە بزانرێ کەلەچەند دەقێك دا هاتوە کەلەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پاش نوێژە فەرزەکان دەنگ بەزیکری خوا بەرزکراوەتەوە، بۆ وێنە ئەم دەقە، (عن ابن عباس ﷺ إِنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ - حِيْنَ يَنْصَرِفُ النّاسُ مِنَ المَكْتُوبَةِ - كانَ علىٰ عَهْدِ النَّبيِّ ﷺ )رواه البخاري، بەڵام ئەو دەقانە ئەوە ناگەیەن کەبەکۆمەڵ و وەك کۆڕسێك ئەوەیان کردبێ، بەڵکو وەك (شافعي) گوتوویەتی: ماوەیەکی کەم ئەوەیان کردوە بەمە[illegible] کەوتووانی

صەڵـەوات دان لەپێغەمبـەر ﷺ – دەکـەن، ئـەوە بەوشـێوەو چۆنیەتی‌یـە نـەك هـەر سوننەت نیە، بگرە هەرچەندە ئەو جـۆرە زیکـرو دووعایانـە لەئەسـڵ دا شـەرعیین‌و سوننەتن، بەڵام بەو چۆنیەتی‌یە داهێنراوە (الْكَيْفِيَّة الْمُبْتَدَعَة) دەچنە خانەی جۆرێك لەجۆرەکانی داهێنان لـەئایین (الْإِبْتِدَاعُ فِي الدِّين)دا، کـەزانایان پـێ‌ی دەڵێـن (بیدعـەتی خستنەپاڵ – الْبِدْعَةُ الْإِضَافِيَّة – )، چونکە ئەو جۆرە بیدعەتە ئەوەیە کەشتێك لەئەسڵ دا شـەرعی بێـت بـەڵام لەشـێوەو چۆنیـەتی شـەرعی‌یانەی خـۆی لابـدرێ‌و بەشـێوەو چۆنیەتی‌یەکی داهێنراو ئەنجام بدرێ.

هەڵبەتە لێرەدا نامەوێ هیچ کەسیش واتێبگات کەنکووڵیمان لەزیکرو دووعـای بەکۆمـەڵ‌و بـەدەنگی بـەرز هەیە کەلەچەندان فەرموودەدا هـاتوە! نـەء، بـەڵام دەڵێـین، لـەدوای نوێـژە فەرزەکانـەوە پێغەمبـەری پێشـەوامان ﷺ ئـەو زیکـرو دووعایانـەی بەوشێوەیە کردوە کـە لەفەرمایشـتەکان دا دەرکـەوت، نـەك بەوشـێوەیەی کەهـەندێك کەس پەیدایان کردوەو دایان هێناوە، ئەگەرنا جاروبار کۆبوونەوەی مسـوڵمانان بـۆ زیکری خواو دووعای خێر بەدەنگی بەرز یان نزم، بەپێ‌ی حاڵ‌و بۆ گونجان‌و بەبێ تایبـەت کردنـی بـەکات‌و شـوێنێکی دیاری‌کراوەوە، ئـەوە لـەڕیزی طاعەتـە گـەورەو بەرزەکان دەژمێردرێ‌و هیچ زانـاو پێشـەوایەکی متمانـە پـێ‌کراوی پێشـین‌و پاشـین (سَلَفْ وخَلَفْ)یش نکووڵی لـێ‌ی نەبووە.[145]

---

سوننەت وایە کەبەدەنگی نزم‌و لەبەرخۆیانەوە ئەو زیکرانە بکەن، بڕوانە: (فَتْح الباري) ج٢ص٥٩٢، ٥٩٣.

[145] لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەم دەقەی خوارێ لەزانای پایەبەرز (ابن تيمية) – خوا لێی‌خۆش بێ – بخوازمەوە کەلەبارەی زیکرکردنی بەکۆمەڵ گوتوویەتی: بەڵام یەکسەر وەری‌دەگێڕمە سەرکوردی‌و تۆزێکیش کورت‌و پوختی دەکەمەوە بەبێ زیان گەیاندن بەنێوەڕۆکی‌و دەستکارکردنی:

(پرسیاری -١٧٢-) دەربارەی پیاوێك کەڕەخنە لەوانە دەگرێ کەزیکر دەکەن‌و دەڵێ: (ئەم زیکرە بیدعەتەو دەنگ بەرزکردنەوەتان بەزیکر بیدعەتە) لەحاڵێك دا ئەوان زیکرەکەیان بەقورئان خوێندن دەست پێ‌دەکەن‌و هەر بەویش کۆتایی پێ‌دێنن، پاشان بۆ مسوڵمانانی زیندوو و مردوو دەپاڕێنەوە وە (سبحان الله) و(الحمدالله)و(لا اله الا الله)و (الله اكبر)و (لاحول ولاقوة الا بالله) دەکەن‌و صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەن...، ئەویش – واتە ابن تيمية – لەوەڵام دا دەڵێ:

کۆبوونەوە بۆ زیکری خواو گوێ‌گرتن لەکتێبەکەی‌و پاڕانەوە کردەوەی باشن، بگرە ئەوە لەچاکترین جۆری خواپەرستی [illegible] فەرموودەی ڕاست

## ئایا پاڕانەوە لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکان سوننەتە؟!

هەرچەندە دووعاکردنو لەخوا پاڕانەوە لەگەورەترین جۆرەکانی خواپەرستی یە، بەڵام ئایا وەك هەندێك کەس عادەتیان پێوەگرتوە لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکان سوننەتە، وەك چۆن خوێندنی ئەو زیکرو دووعایانەی باسمان کردن سوونەت بوون؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە چەند قسەیەکی (ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ دێنین کەلەوەڵامی پرسیارێکی ئاوادا گوتوونی، نووسیویەتی[١٤٦] : (الحَمْدُلله، لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعو هُوَ والمَأْمُومونَ عُقَيْبَ الصَّلَواتِ الخَمْسِ، كما يَفْعلهُ بعضُ النَّاسِ عُقَيْبَ الفَجْرِ والعَصْرِ، ولانُقِلَ ذٰلِكَ عَنْ أَحَدٍ ولا ٱسْتَحَبَّ ذٰلِكَ أَحَدٌ مِنَ الأَئِمَّةِ، وَمَنْ نَقَلَ عَنِ الشافعيِّ أنَّهُ ٱسْتَحَبَّ ذٰلِكَ فَقَدْ غَلطَ عَلَيْهِ، ولَفْظُهُ المُوجودُ في كُتُبِهِ يُنافِي ذٰلِك، وكَذٰلِكَ أَحْمَدُ وغَيْرُهُ مِنَ الأَئِمَّةِ لَمْ يَسْتَحِبّوا ذٰلِكَ)[١٤٧].

واتە: سوپاس بۆ خوا، پێغەمبەر ﷺ و شوێن کەوتووەکانی لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکان دووعایان نەدەکرد،وەك ئێستا هەندێك کەس دوای نوێژی بەیانیو ئێوارە

---

(صحیح) هەیە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "خوا چەند فریشتەیەکی هەن کەلەزەوی‌دا دەگەڕێن، جا هەرکاتێك بەلای کۆمەڵێك دا ڕەت بوون کەیادی خوا دەکەن، یەکتر بانگ دەکەن: وەرن بۆئەوەی کەبەدوای‌دا دەگەڕان.."، بەڵام پێویستە ئەو زیکرو دووعایە لەهەندێك کاتو شوێن دا بێتو نەکرێتە دابو سوننەتێکی عادەت پێوەگیراو، مەگەر ئەوەی کەپێغەمبەر ﷺ بەسوننەتی داناوە دەوامی لەسەر بکرێ لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکانو لەڕۆژانی جومعەو جەژنەکانو وێنەی ئەمانەدا.. هەروەك چۆن جار جار هاوەڵانی بەڕێز خوالێیان ڕازی‌بێ کۆدەبوونەوەو یەکێکیان قورئانی دەخوێندو ئەوانی دیکەش گوێیان دەگرت.. وە ئەو حاڵەتانەی کەلەکاتی زیکری شەرعی‌یانەو گوێگرتن دا پەیدادەبن، وەك دڵ ڕاچڵەکینو فرمێسك بەچاوداهاتنو بەدەن ڕێك هاتنو لەرزین، ئەوە چاکترین حاڵەتە کەقورئانو سوننەت باسیان کردوە، بەڵام داچڵەکینو لەرزی توندو لەخۆچوونو هاوارو چریکەو مردن، ئەوە ئەگەر خاوەنەکەی خۆی پێ مەرزەم نەکرێ، لۆمەو سەرکۆنەی ناکرێ، وەك چۆن لەنێو (تابعین)و ئەوانەی دوای وان ڕووی داوە... هتد). بڕوانە: (الفَتاوىٰ الكُبْرىٰ) ج١ص٢٢٠، ٢٢١.

[١٤٦] بڕوانە (فقه الصلاة) للامام ابن تیمیة ص ٣٣٩، شایانی باسە ئەم کتێبە کورتەو پوختەی چوار (٤) بەرگە لە (مجموع الفتاوىٰ)ی (ابن تیمیة) کەبەرگی: (٢١،٢٢،٢٣،٢٤)ەو دکتۆر (السید الجمیلي) ئامادەی کردوە، چاپی یەکەم ١٤٠٨ك.

[١٤٧] بڕوانە: (فقه الصلاة) [illegible]

دەیکەن، وەئەوە لەهیچ کەسێکەوە نەقڵ نەکراوە، وە هیچ کام لەپێشەوایان بەسوننەتیان نەزانیوە، وەهەرکەسێك ئەوە لەشافیعییەوە نەقڵ بکات ئەوە لەبارەیەوە بەهەڵەدا چووە، چونکە ئەوەی لەکتێبەکانی دایە پێچەوانەی ئەوەیە، هەروەها ئەحمەدو غەیری ویش لەپێشەوایان ئەوەیان - واتە دووعاکردن دوای نوێژە فەڕزەکان - بەپەسەند دانەناوە.

پاشان گوتوویەتی: (وَلَوْ دَعا الأُمامُ والمَأْموم أَحْياناً عُقَيْبَ الصَّلاةِ لِأَمْرٍ عارِضٍ لَمْ يُعَد هذا مُخالِفاً لِلسُّنَّةِ كالَّذي يُداوِمُ علىٰ ذلِكَ)[١٤٨].

واتە: وەئەگەر ئیمامو نوێژکەر لەهەندێك کاتان دا پاش نوێژ - ی فەڕز - لەبەر حاڵەتێکی نائاسایی دووعا بکەن، ئەوە بەپێچەوانەی سوننەت دانانرێ، وەك ئەو کەسەی کەلەسەر ئەوە بەردەوام دەبێ.

پاشان گوتوویەتی: (.. و بِالجُمْلَةِ فَهُنا شَيْئانِ؛ أَحَدُهُما: دُعاءُ المُصَلّي المُنْفَرِد كَدُعاءِ المُصَلّي صَلاةَ الأَسْتِخارَةِ وغَيْرِها مِنَ الصَّلَوات، ودُعاءُ المُصَلّي وَحْدَهُ إماماً كانَ أَو مَأْموماً، والثّاني: دُعاءُ الأُمام والمَأْمومينَ جَمْيعاً فَهٰذا الثاني لارَيْبَ أَنَّ النبيَّ ﷺ لَمْ يَفْعَلْه فِي أَعقابِ المَكْتوباتِ، كَما كانَ يَفْعَلُ الأَذْكارَ المَأْثورَةَ عَنْهُ، إِذْ لَوْ فَعَلَ ذلِكَ لَنَقَلَه عَنْهُ أَصْحابُهُ، ثُمَّ التابِعون ثم العُلَماءُ، كما نَقَلوا ماهُوَ دُونَ ذلِكَ...)[١٤٩].

واتە: پوختەی قسان لێرەدا دوو حاڵەت هەن؛ یەکیان: پاڕانەوەی نوێژکەری تەنیایە وەك پاڕانەوەی کەسێك کەنوێژی (إِسْتِخارَة) دەکات وەغەیری وی لەنوێژەکانی دیکە، وەپاڕانەوەی نوێژکەر بۆ خۆی بەتەنیا جا چ ئیمام بێ چ (مأموم)، دووەم: پاڕانەوەی ئیمامو شوێن کەوتووەکانی وێکڕا، جا ئەمەی دووەم هیچ گومانی تێدانیە کەپێغەمبەر ﷺ لەدوای نوێژە فەڕزەکان نەیکردوە، وەك چۆن ئەو زیکرانەی لێی گێڕراونەوە کردوونی، چونکە ئەگەر کردبای ئەوە بێگومان هاوەڵەکانی - خوا لێیان ڕازی بێ - لێیان دەگێڕایەوە، پاشان شوێن کەوتوانیانو پاشان زانایان، هەروەك چۆن شتی لەوە کەمترو گچکە تریان لێوە نەقڵ کردوەو گێڕاویانەتەوە.

جاخوێنەری بەڕێزو مسوڵمانی سەنگین! لەم قسانەوە کە لە (ابن تیمیة) نەقڵمان کردن چەند شتێکمان دەستگیر دەبێ:

---

[١٤٨] هەمان سەرچاوە.

[١٤٩] بڕوانە (فقه الصلاة ص ٣٤٢) وە بڕوانە (مجموع الفتاوى ج ٢٢ [illegible]

أ-پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی خوالێیان ڕازیبێ لەدوای نوێژە فەرزەکان بەکۆمەڵو وێکڕا دووعایان نەکردوە، بۆیە بەوجۆرە دووعاکردنو دەوام کردنیش لەسەری سوننەت نیەو بیدعەتە.

ب-بەڵام لەهەندێك حاڵەتی نائاسایی و ڕیزپەڕدا بەوجۆرە دووعاکردنو پاڕانەوە بەپێچەوانەی سوننەت دانانرێ.

ج- ئەگەر هەرکەسە لەبەرخۆیەوەو بەتەنیا بپاڕێتەوە - لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکان - بەمەرجێك نەیکاتە عادەتێکی بەردەوام دیسان ئیشکالی تێدا نیە، چونکە هەرچەندە فەرموودەی: (قيل يارَسُولَ اللهِ أيُّ الدُّعاءِ أسْمَع؟ قال: جوفُ اللّيلِ الآخِرِ ودُبُرَ الصلوات المكتوبات) رواه الترمذي وصححه،

زۆربەی زانایان ڕستەی: (دبر الصلوات المكتوبات) یان بەکۆتایی نوێژە فەرزەکان لێك داوەتەوە کەبەشی کۆتایی تەحییاتی کۆتایی نوێژەکانە، بەڵام هەندێکیش لەزانایان بەپاش نوێژە فەرزەکانیش مانایان کردوە.

د- ئیمام بەمەبەستی فێرکردن (تعليم)ی نوێژکەران بۆی هەیە دەنگ بەهەندێك زیکرو دووعا بەرزبکاتەوە کەلەئەسڵ دا دەنگ پێ بەرزکردنەوەیان سوننەت نیە، چونکە لەفەرموودەی (صحيح) دا هاتوە کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازیبێ هەندێك جاران دەنگی بەدووعای (استفتاح) بەرزدەکردەوە[150]، هەروەها لەفەرموودەی (صحيح)دا هاتوە کەجارێکیان دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) کابرایەك کە لەپشتیەوە نوێژی دەکرد گوتی: (رَبَّنا ولَكَ الحَمْدُ حَمْداً كَثِيْراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيْهِ) پێغەمبەریش ﷺ پەسەندیو خۆشحاڵی خۆی دەربڕی وەك (بخاري) گێڕاویەتەوە[151].

دیارە ئەوە کە لە (ابن تيمية) وە نەقڵمان کرد، سەرجەم زانایان لەئەصڵی مەبەستدا لەگەڵی یەکدەنگن، بۆ وێنە: (نووي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی[152]: (إنَّ الذِّكْرَ والدُّعاءَ بَعْدَ الصَّلاةِ يُسْتَحَبُّ أنْ يُسِرَّ بِهما، إلّا أنْ يكونَ إماماً يُرِيْدُ تعليمَ النّاسِ فَيَجْهَرُ

[150] بڕوانە: (فقه الصلاة) ص٣٤٠.

[151] بڕوانە: (فتح الباري) ج٢ص٥٤١.

[152] بڕوانە: (المجموع) ج٣ص٤...

لِيتَعَلّمُوا، فَاذا تَعلموا وكانُوا عالِمِيْنَ اَسَرّه) واته: سوننەته کەبەدەنگی نزم دوای نوێژ زیکرو دووعا بکات، مەگەر ئیمام بێتو بیەوێ خەڵکی فێر بکات، دەنگی بەرز دەکاتەوە تاکو فێربن، جا هەرکات فێربوونو شارەزابوون، دەنگی نزم دەکاتەوە.

پاشان ئەو فەرموودەیەی (ابو موسى الاشعري) خوا لێی ڕازی بێ بە بەڵگە دێنێتەوە لەسەر دەنگی نزم کردنەوە بەزیکرو پاڕانەوە کەدەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، جا هەرکات لەدۆڵو شیوێك سەردەکەوتین (لا اله الا الله) و (الله اكبر) مان دەکرد، وە دەنگمان بەرز دەبۆوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (يَاأَيُّهَا النَّاسُ أَرْبِعُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لاتَدعُونَ أَصَمَّ وَلاغائِباً إِنَّهُ مَعَكُمْ سَمِيعٌ قَرِيبٌ)متفق عليه، واته: ئەی خەڵکینە! خۆتان ئەزیەت مەدەن چونکە ئێوە نە لە – خوایەکی – کەڕ دەپاڕێنەوە نە نادیارو بێئاگا، ئەو لەگەڵتانەو بیسەرو نزیکە.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کەژمارەیەك لەزانایان کەیەکێکیان (نووي)یە ڕایان وایە کەوەك چۆن زیکر لەدوای نوێژە فەرزەکان سوننەتە پاڕانەوە (دعاء)ش هەر سوننەتە، (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (قَدْ ذَكَرْنَا اَسْتِحْبابَ الذِّكْرِ والدُّعاءِ لِلأِمامِ والمَأْمومِ وِالمُنْفَرِدِ، وهُوَ مُسْتَحَبٌ عَقِبَ كُلِّ الصَّلَواتِ بِلا خِلافٍ )[١٥٣]، جا بێگومان بۆ زیکرکردن ئەوە ڕاستە ڕاجیایی (إِخْتِلاف) ی تێدا نیەو، هەموو زانایان لەسەری یەکدەنگن کە لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە سوننەتە، بەڵام بۆ پاڕانەوە بەتایبەت ئەگەر بکرێتە عادەتێکی بەردەوام ئەوە بێگومان، زانایان تێیدا جیاوازن، وە پێشم وایە – وەك "ابنُ تَيْمِيَّة" گوتوویەتی – ئەو ڕایەش بەهێزترو بەڵگەدارترە کە سوننەت نەبێ لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکان بە بەردەوامی پاڕانەوە بکرێ، دیارە لەبەرخۆەوو بەپەنهانی، چونکە پێشتر گوتمان کە پاڕانەوە – هەروەها زیکریش – بەدەنگی بەرزو بەکۆمەڵ لەدوای نوێژە فەرزەکان سوننەت نیەو بیدعەتە.

دەشگونجێ مەبەستی (نَوَوي) کە لەوە کەدەڵێ، ڕا جیایی تێدا نیە (بِلا خِلافٍ) لەنێو زانایان شافیعی مەزەب دا بێت، کەئەوەیان ڕاستەو وایە.

---

[١٥٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣، ص٤٥٢.

## فەرزو سوننەتەکانی نوێژ بەگوشراوی و ڕیزکراوی.

خوێنەری بەڕێز: هەرچەندە بەو کورتە باسانەی لە(٢٤) برگەی پێشوودا رابردن، کەموزۆر ڕوون بۆتەوە کام لەو شتانەی باس کران فەرزو پایەن‌و، بەنەبوونی هەرکامێکیان نوێژەکە ناتەواو دەبێ‌و بەرناکەوێ‌و، ئەگەر بابای نوێژکەر زوو پێ‌ی بزانێ دەبێ بیکات‌و پاشان پێش یان پاش سەلام دانەوە سەجدەی سەهوو ببات، وەئەگەر درەنگیش پێ‌ی بزانێ پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، وەکامیشیان سوننەتن‌و بەنەکردنیان بابای نوێژکەر خێرو پاداشتێکی لەدەست دەچێ، بەلام نوێژەکەی هەر بەردەکەوێ، بەلام بەپەسندم زانی لێرەش دا بەکورتی ڕیزیان بکەم‌و بیانخەمەوە بەرچاو:

### أ-پایەو فەرزەکانی نوێژ:

لەلای سەرجەم یان لانی کەم زۆربەی هەرە زۆری زانایان پایەو فەرزەکانی نوێژ ئەمانەن:

١-نیەت هێنان، کەوەك پێشتر باسمان کرد بەس بەدڵەو بەزار نابێژرێ.

٢-گوتنی (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن.

٣- بەپێوە ڕاوەستان لەنوێژی فەرزدا بۆ خوێندنی فاتیحە.

٤- خوێندنی سوورەتی فاتیحە لەهەر ڕکاتێك دا.

٥-ڕکووع بردن‌و ئارام تێداگرتنی.

٦-هەستانەوەی دوای ڕکووع‌و ڕاست بوونەوەو ئارام گرتن.

٧-کڕنووش بردن‌و ئارام تێداگرتنی.

٨-دانیشتنی نێوان دوو کڕنووشەکان‌و ئارام تێداگرتنی.

٩-دانیشتن بۆ خوێندنی تەحییاتی کۆتایی.

١٠-سەلام دانەوەی یەکەم.

١١-ڕیزکردنی پایەو فەرزەکان بەوجۆرەی باس کراون.

ئنجا هەرچەندە شەرعزانان (فقهاء) وەك پایەو فەرزێك باسیان نەکردووە، بەلام وەك پێشتریش باسمان کردوە، بەتەئکید یادی خوا کردن‌و گەردن کەچی‌و دڵ بێداری‌و هۆشیاری کە بزانێ چی دەڵێ گرنگترین‌و گەورەترین فەرزو پایەی نوێژە، بگرە هەوێن‌و هەناوو ڕووح‌و گیان‌و کاکڵەو جەوهەرەکەیەتی .

## ب-سوننەتەکانی نوێژ:

دیارە جگە لەپایەو فەرزەکان کەلەبڕگەی (أ)دا ڕیزمان کردن، هەرچی ماوە لەنوێژدا بەسوننەت دادەنرێ لەلای سەرجەم یان زۆربەی زانایان، کەئەمانەن:

١-دەست بەرزکردنەوە لەکاتی نوێژدابەستنو چوونە ڕکووعو هەڵسانەوە لەڕکووعو هەستانەوە دوای تەحییاتی یەکەم بۆ ڕکاتی سێیەم.

٢-خوێندنی دووعای (استفتاح).

٣-(استعاذة) کردن، بەتایبەت لەڕکاتی یەکەم داپێش خوێندنی فاتیحە.

٤-دەست گرتن، دەستی ڕاست خستنە سەر مەچەكو باسکی دەستی چەپو گرتنی.

٥-گوتنی (آمین) پاش تەواوکردنی خوێندنی فاتیحە.

٦-قورئان خوێندنی پاش فاتیحە.

٧-دەنگ بەرزکردنو نزم کردن لەشوێنو کاتەکانی خۆیان دا.

٨-(الله اکبر) گوتنەکانی گواستنەوە بۆ پایەو فەرزەکان (تکبیرات الأُنْتِقال).

٩-خوێندنی زیکرەکانی ڕکووعو سەجدەکانو هەڵسانەوە لەڕکووعو نێوان سەجدەکان.

١٠-دانیشتنی پشودان (جِلْسَةُ الأُسْتِراحَة)، کەئێمە ئەو ڕایەمان پەسند کردو لەلامان بەهێزتربوو کەسوننەت نیە، تەنیا مۆڵەت (رُخْصَة)ە.

١١-خوێندنی تەحییاتی یەکەم، ئەگەر نوێژەکە لەدوو ڕکات زیاتربوو.

١٢-دانیشتن بۆ خوێندنی تەحییاتی یەکەم بەپێی سوننەت کەشێوەی (إِفْتِراش)ەو پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە کە چۆنە.

١٣-صەڵەوات دان لەپێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی دووەم دا، دیارە هەندێك لەزانایان بۆ وێنە (شافعي) صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەتەحییاتی دووەم دا بەفەرزو لەئی یەکەمیش دا بەسوننەت دەزانن، بەڵام ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترە.

١٤-دووعایەکانی دوای تەحییاتی کۆتاییو پێش سەلام دانەوە.

١٥-دانیشتن بۆ تەحییاتی دووەم بەشێوەی (تَوَرُّك) کەپێشتر ڕوونمان کردۆتەوە.

١٦-خوێندنی دووعای (قنووت) لەلای (مالكو شافعي) لەڕکاتی دووەمی نوێژی بەیانیدا پێش ڕکووع یان پاش ڕکووع، بەڵام ڕای نەخوێندنی بەهێزترە.

١٧-سەلام دانەوەی دووەم.

١٨-خوێندنی چەند زیکرێك دوای سەلام دانەوەو لەلای هەندێکیان دووعاکردنیش.

هەڵبەتە لەکاتی توێژینەوەی هەرکام لەو پایەو فەرزو سوننەتانەدا بەدرێژی باسمان کردوونو بەڵگەمان لەسەر فەرزبوون یان سوننەت بوونیان هێناوەتەوە، بۆیە لێرەدا هەر ئەوەندەم بەپێویست زانی کەڕیزیان بکەینو لەیەکیان جیابکەینەوە.

# خاڵی حەوتەم: چەند کورتە باسێك دەربارەی نوێژ:

خوێنەری بەڕێز! خوا پشتیوان بێ لەم خاڵی حەوتەدا هەوڵ دەدەین بەکورتیی و گوشراوی هەرکام لەو بابەتانەی خوارێ بتوێژینەوە، بۆئەوەی چاکتر وزیاتر تیشك بخەینە سەر هەموو لایەنەکانی نوێژو سەرجەم جۆرو شێوەکانی:

١-بانگو قامەت

٢-کورت کردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژە فەرەکان

٣-نوێژی ترس (صلاة الخوف).

٤-نوێژی بابای نەخۆش (صلاة المريض).

٥-نوێژی جومعە.

٦-کاتی پێنج نوێژە فەرزەکان.

٧-نوێژی بەکۆمەڵ (صلاة الجماعة)

٨-نوێژ گێڕانەوە (قضاء الصلاة).

٩-بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ (مبطلات الصلاة).

١٠-ئەو شتانەی لەنوێژدا ناپەسەندن (مكروهات الصلاة).

١١-ئەو شتانەی لەنوێژدا دروستو ڕەوان.

١٢-مەرجەکانی نوێژ (شروط الصلاة).

١٣-نوێژکردن لەسەر مردوو (صلاة الميت).

١٤-نوێژە سوننەتەکان (الصلوات المسنونات).

١٥-سوترەی بەردەمی نوێژکەر (سترة المصلي).

١٦-کڕنووش بردنی هەڵەکردن (سجدة السهو).

١٧-سەجدەکانی قوڕئان خوێندن (سجدات التلاوة).

١٨-سەجدەی سوپاسگوزاری (سجدة الشكر).

بەڵام وەك لەپێشەوەش ئاماژەمان پێکرد هەرکام لەم بابەتانە بەکورتیی و گوشراوی دەخەینەڕوو، هەرچەندە خوا پشتیوان بێ هەموو ئەو مەسەلانەی کە گرنگو جەوهەریین دەیان توێژینەوە، بەڵام بێگومان زۆر مەودای شیکردنەوەو پێداچوونە

خواری هەموو جوزئیاتو لقو پۆپەکانیانمان نابێ، بۆیە وێڕای داکۆکیکردن لەسەر ئەوە کە پشوودرێژانەو وردبینانە ئەم کورتە باسانە بخوێنیەوە، دەشڵێم:

ئەگەر ویستت دەربارەی هەرکام لەو بابەتانە شارەزاتربی، سەرنجی ئەو کتێبو سەرچاوانە بدە کە لەپەراوێزدا ئاماژەیان پێدەکەین، دیارە شێوەی توێژینەوەشمان بۆ ئەو بابەتانە - وەك عادەتی خۆمان لەم کتێبەدا - بەوشێوەیە دەبێ کەهەوڵ دەدەین بەهێزترینو بەڵگەدارترین ڕایان لەسەر بخەینەڕوو، وەبەگوێرەی بەپێویست زانرانیش ئاماژە بۆ ڕاو بۆچوونەکانی دیکەش دەکەین:

## ١-بانگ و قامەت (الأَذان والإِقامة).

لەچەند بڕگەیەك دا باسی بانگ دانو قامەت کردن دەکەین:

### یەك: پێناسەی بانگو قامەت:

بانگ (أُذان) لەئەسڵی زمان دا بەمانای ئاگادارکردنەوە (إعلام) دێ، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (وأَذانٌ مِنَ اللهِ ورَسُولِهِ الىٰ النّاسِ يَوْمَ الحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللهَ بَرِيءٌ مِنَ المُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ..) التوبة -٣-.

وە لەزاراوەی شەرع دا ئاوا پێناسە کراوە: "هو الإِعْلامُ بِوَقْتِ الصَّلاةِ المَفْرُوضَةِ بِأَلْفاظٍ مَخْصُوصَةٍ" واتە: ئاگادارکردنەوەیە لەکاتی نوێژی فەرز بەچەند وشەیەکی تایبەت.

قامەت (الإِقامة) یش بریتیە لەئاگادارکردنەوەی نوێژکەران بەدەست پێکردنی نوێژ[١٥٤] .

### دوو: حوکمی بانگو قامەت:

زانایان دەربارەی حوکمی بانگو قامەت بەگشتی دوو ڕایان هەن، بەشێکیان بەفەرزی دەزانن کە ظاهیریەکانو زەیدیەکانو حەنەفیەکانو زۆر لەحەنبەلیەکانن، وە بەشێکیشیان بەسوننەتێکی داکۆکی لەسەر کراوی دەزانن، کەمالیکیەکانو شافیعیەکانو هەندێك لەحەنبەلیەکانن[١٥٥] .

---

[١٥٤] بڕوانە: (المُفَصَّل في أَحكام المَرْأَةِ والأُسْرَة) ج١ص١٩٩، ٢٠٠، وەبڕوانە: (الفِقْهُ الإِسْلامي وأَدِلَّتِهِ) ج١ص٦٩٣، ٦٩٤، وە: (فقه السنة) ج١ص١٢٢.

[١٥٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

واش پێدەچێ ڕای بەفەرز دانانیان بەهێزتربێت[156] ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەدوو کەسی فەرموو کە بۆ شوێنێك بەڕێی دەکردن: (إذا خَرَجْتُما فَأَذِّنا، ثُمَّ أَقِيما، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُما أَكْبَرُكُما) رواه البخاري عن مالك بن حُوَيْرِث.

واتە: هەرکاتێك لەماڵ دەرچوون و بەسەفەرچوون – و کاتی نوێژ هات – بانگ بڵێن، پاشان قامەت بکەن، دوایی باکامەتان گەورەترە پێش نوێژتان بۆ بکات.

## سێ: چۆنیەتی بانگ و قامەت:

هەرکام لەبانگ و قامەت یەکی بەسێ جۆر گێڕ راونەوە، کەبەم شێوەیەن:

### یەکەم: بانگ

**جۆری یەکەم:**[157]

الله أكبر الله أكبر الله أكبر الله أكبر

أشهد ان لا اله الا الله

أشهد أن لا اله الا الله

أشهد أن محمداً رسول الله

أشهد أن محمداً رسول الله

حي على الصلاة حي على الصلاة

حي على الفلاح حي على الفلاح

الله أكبر الله أكبر

لا اله الا الله

کە دەبێتە پازدە (١٥) ڕستە.

کە ئەم جۆرەیان (احمد و ابوداود و ابن ماجه و ابن خزيمه و ترمذي) لە (عبدالله بن زيد بن عبدربه) گێڕاویانەتەوە و (ترمذي) بە (صحيح) ی داناوە.

---

[156] بڕوانە: (المُحَلّى) ج٣ص٧٩، مسألة (٣١٥)، وە: (الشرح الكبير) ج١ص٣٩٠، وە: (الروضة الندية) ج١ص١٢٣.

[157] ئەم جۆرەیان حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان هەڵیان بژاردووە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي...) ج ١ ص ٧٠٢ ، ط ٤.

<u>جۆری دووەم:</u>[١٥٨] کە هەر وەك ئەوەی یەکەمە بەڵام هەردووك شایەتمانەکان بەرلەوەی بە دەنگی بەرز بگوترێن بە دەنگی نزم دەگوترێن، کە ئەمەش (ترجیع) ی پێدەڵێن، واتە ئەو جۆرە بانگە ئاوای لێ دێ:

الله أكبر   الله أكبر  الله اكبر الله أكبر

(أشهد أن لا اله الا الله   أشهد أن لا اله الا الله   أشهد أن محمداً رسول الله
أشهد أن محمداً رسول الله)

أشهد أن لا اله الا الله   أشهد أن لا اله الا الله   أشهد أن محمداً رسول الله
أشهد ان محمداً رسول الله

حي على الصلاة  حي على الصلاة   حي على الفلاح  حي على الفلاح

الله أكبر   الله أكبر

لا اله الا الله.

کە دەبێتە نۆزدە (١٩) ڕستە.

ئەم جۆرەشیان هەرکام لە (احمد و ابوداود و نسائي و ابن ماجة و ترمذي) لە (ابي محذورة) گێڕاویانەتەوە، وە (ترمذي) گوتویەتی: (حسن صحيح).

<u>جۆری سێیەم:</u> کە هەر وەك ئەوەی دووەمە بەڵام (الله اكبر)ەکان لەجیاتی چوار، دوانن، بەم شێوەیە:

الله أكبر   الله أكبر

أشهد ان لا اله الا الله   أشهد ان لا اله الا الله   اشهد أن محمداً رسول الله
اشهد أن محمداً رسول الله

اشهد أن لا اله الا الله   اشهد أن لا اله الا الله   أشهد أن محمداً رسول الله
اشهد ان محمد رسول الله

حي على الصلاة  حي على الصلاة   حي على الفلاح  حي على الفلاح

الله أكبر   الله أكبر

کە دەبێتە حەڤدە (١٧) ڕستە.

ئەمیشیان (مسلم) لە (ابي محذورة) ی گێڕاوەتەوە، خوا لێی ڕازی بێ.

---

[١٥٨] ئەم جۆرەشیان مالیکی یەکان و شافیعی یەکان پەسەندیان کردووە بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

تێبینی: دەربارەی (ترجیع) زانایان بەشێکیان کە (حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان) یان لەنێودان ڕایان وایە کە سوننەت نیە لەگەڵ بانگ دا بگوترێ، بەڵام بەشێکی دیکەیان کە (مالیکی‌یەکان و شافعی‌یەکان) یان لەنێودان، دەڵێن: سوونەتە لەگەڵی بگوترێ.[159]

بەڵام دەربارەی گوتنی: (الصَّلاةُ خيرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصلاةُ خيرٌ مِنَ النَّوْم) لە بانگی بەیانی‌دا بەتایبەت کە (تَثْوِیب) ی پێ‌دەڵێن، هەموویان یەکدەنگن، چونکە هەم (ابوداود و أحمد) وایان لە (ابو محذورة) خوا لێی‌ڕازی بێ گێڕاوەتەوە هەم لە سوونەتیش دا چەسپاوە کە (بلال) خوالێی ڕازی بێ وای بانگ داوە، وەك (طبراني" گێڕاویەتەوە.[160]

دووەم: قامەت

جۆری یەکەم:[161]

الله أكبر الله أكبر الله أكبر الله أكبر

أشهد أن لا اله الا الله اشهد أن لا اله الا الله

اشهد أن محمداً رسول الله أشهد أن محمداً رسول الله

حي على الصلاة حي على الصلاة حي على الفلاح حي على الفلاح

قَدْ قامَتِ الصلاةُ قَدْ قامَتِ الصلاةُ

الله أكبر الله أكبر

لا اله الا الله

کە ئەم جۆرەیان ( (أحمد وأبوداواد و نسائي وابن ماجة و ترمذي) لە (ابو محذورة) ەوە گێڕاویانەتەوە و (ترمذي ) بە (صحيح) ی داناوە .

---

[159] بڕوانە: ( الفقة الأسلامي وادلته) ج ١ ص (٧٠١ - ٧٠٣، ط ٤ وە بڕوانە : المفصل) ج١ ص ٢٠٤.

[160] سەرچاوەی پێشوو.

[161] ئەم جۆرەیان حەنەفی‌یەکان [illegible] بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج١ ص ٧١٦

جۆری دووەم:[١٦٢]

الله أكبر الله أكبر

أشهد أن لا الا الله    أشهد أن محمداًرسول الله

حي على الصلاةِ   حي على الصلاةِ

قَدْ قامَتِ الصَّلاةُ  قَدْ قامَتِ الصَّلاةُ

الله أكبر   الله أكبر

لا اله الا الله

ئەمیشیان هەر لە هەمان فەرموودەدا هاتوە کە پێشتر دەربارەی بانگ هێنامان و (احمد و ابو داود و ابن ماجة و ترمذي و ابن خزيمة) لە (عبدالله زيد بن عبدُ ربّه) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویانەتەوە.

جۆری سێیەم:[١٦٣]

کە کت و مت وەك جۆری دووەمە ئەوەندە نەبێ کە لەجیاتی دووجار (قد قامت الصلاة) تەنیا جارێك دەگوترێ، وە (مالك) ئەم جۆرەیانی هەڵبژاردوە لەبەرئەوەی کردەوەی خەڵکی مەدینەی لەسەر بووە، بەڵام (ابن عبدالبر) و (ابن القيم) گوتوویانە لە ڕێیەکی ڕاست (صحيح) ەوە یەك جار (قد قامت الصلاة) گوتران لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەگێڕدراوەتەوە و هەر دووجارە.[١٦٤]

## چوار: خێر و پاداشتی بانگدان و بەرزی پلەو پایەی بانگ بێژان:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَوْ يَعلَمُ الناسُ ما في الأَذانِ والصَّفِّ الأَولِ ثم لَمْ يَجِدوا الا أَنْ يَستَهِموا عليهِ لاستَهموا ..) رواه البخاري عن ابی هريره.

واتە: ئەگەر خەڵکی دەیانزانی چ خێرو پاداشتێك لە بانگ دان و لە ڕیزی یەکەم دا هەیە پاشان هیچ چاریان نەبووایە مەگەر پشکی لەسەر بکەن، پشك (قرعة) یان لەسەر دەکرد. هەروەها فەرموویەتی: (إِنَّ الله و مَلائِكَتَهُ يُصَلّونَ علـىٰ الصَّفِّ المُقَدَّمِ، والمُؤَذِّنُ يُغفَرُ لَهُ مَدَّ صَوتِهِ ويُصَدِّقُهُ مَنْ سَمِعَهُ مِنْ رَطْبٍ ويابِسٍ، و لَهُ مِثلُ أَجْرِ مَنْ صَلّىٰ مَعَهُ) رواه أحمد والنسائي باسناد جيد.

---

[١٦٢] ئەمیش شافعییەکان و حەنبەلییەکان پەسەندیان کردوە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ص ٧١٧.
[١٦٣] بڕوانە: (الفقة الاسلامي) ج ١ ص ٧١٧.
[١٦٤] بڕوانە: (فقه السنة) ج ١ ص ١٢٢

واتــه: بێگومـان خـواو فریشـتەکانی صەڵـەوات لـە ڕیــزی پێشـەوە دەدەن، وە بانگبێژیش بەئەندازەی دەنگ ڕۆیشتنی خوا لێی دەبووریٚ، وە هـەر تەڕو ئیشـکێك دەنگی ببیستێ بە ڕاستی دادەنێ، وە بە ئەندازەی پاداشتی ئەوانە کە نوێژی لەگەڵ دەکەن پاداشتی دەبێ.

## پێنج: کاتی بانگ و قامەت:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەبێ بانگ لە سـەرەتای کـاتی هـاتنی نوێـژە فەرزەکانەوە بدرێ، نابێ نە لێێ پێش بکەوێ، نـە لێی دوا بکەوێ، بێجگە لـە نوێـژی بەیانی کە دروستە دوو بانگی بۆ بدرێن بەمەرجێك لە یەك جیابکرێنەوە، یەکەمیان پێش هـاتنی کاتەکـەی و ئـەوی دیکـەیان لـە سـەرەتای- کاتەکەیـەوە، هەربۆیــەش پێغەمبـەری خوا ﷺ دوو کەسی جیای بۆئەو دوو بانگە تەرخـان کردبـوون، وەك لـەو فەرموودەیەدا دەبینرێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی: (**إِنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيلٍ، فَكلوا وَاشْرَبوا حتّى يُؤَذِّنَ ابنُ أُمِّ مكتومٍ**) متفق عليه.

واتـه: دڵنیابن کە بیلال لە شەوێ دا بانگ دەدات، جـا بخـۆن و بخۆنـەوە – و لـە ڕۆژووەکانتان مەترسن –، تاکو (ابن ام مكتوم) بانگ دەدات.

ئینجـا پێویسـتە بـانگ و قامـەت هێندەیـان نێـوان هـەبێ کـە خـەڵکی فریـای خۆئامادەکردن و هاتن بکەون، چونکە حیکمەتی بانگ هەر ئەوەیە.

وە زانایان [١٦٥] گوتوویانە ئەندازەیەکی دیاریکراو لەو بارەوە لە دەقەکانی سوننەت دا نەهاتوە مەرج ئەوەیە کە هێندە بکەوێتە نێوان بـانگ و قامەتـەوە کـە نوێژکـەران فریای خۆئامادەکردن و هاتن بکەون، لەو بارەشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە:

*(**عن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: كانَ مُؤَذِّنُ رَسولِ اللهِ ﷺ يُؤَذِّنُ ثم يمهِل فلا يُقيمُ حتّى اذا رأى رَسولَ الله ﷺ قَدْ خَرَجَ، أَقامَ الصَّلاةَ حِينَ يَراهُ**) رواه احمد و مسلم وابوداود والترمذي.

واتــه: بـانگبێژی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـانگی دەدا پاشـان ڕادەوەسـتا و قامـەتی نەدەخوێند هـەتا پێغەمبـەری خـوای ﷺ دەدی دەهاتە دەرێ، ئەوجار کـە دەیـدی قامـەتی دەکرد.

---

[١٦٥] بڕوانە: (المفصل) ج١ ص ٢٠٥، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي..) ج١ ص ٧٠٧، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣١.

## شەش: مەرجەکانی بانگ دان و قامەت کردن[166]

زانایان چەند مەرجێکیان بۆ بانگبێژ و قامەت خوێن، دیاریکردوون، بەتایبەت بۆ بانگبێژ.

١)دەبێ بانگدەر مسوڵمانێکی نێری خاوەن عەقڵ و تەمیز بێت.

٢)دەبێ بانگەکە – هەروەها قامەتیش – بە زمانی عەرەبی بێت.

٣)دەبێ وابێ کە هەندێك لە خەڵکی گوێبیستی ببن، ئەگەر بە تەنیاش بوو خۆی گوێی لێ بێ.

٤)دەبێ ڕەچاوی ڕیز (ترتیب) و بەدوای‌یەکدا هاتن (موالاة) ی وشەکانی بکرێ، بەو جۆرەی کە لە دەقەکانی سوننەت دا هاتوە.

٥)دەبێ بانگەکە یان قامەتەکە هەمووی لەلایەن یەك کەسەوە بێت، نەك دوو کەس یان زیاتر تێیدا بەشداربن و هەریەکەیان بەشێکی لێ بڵێ.

## حەوت: سوننەتەکانی بانگ و قامەت:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەم شتانەی خوارەوە بۆ بانگ و قامەت کردن بە سوننەت دەزانن، هەشیانە هەندێکیان بە مەرج و فەرز دەزانێ:

١)سوننەتە بابای بانگبێژ یان قامەت خوێن، دەنگی خۆش و بەرزبێت، بەبەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەری ﷺ بە (عبدالله بن زيد) ی فەرموو، دوای ئەوەی کە ئەو خەونەی بۆ گێڕایەوە، کە تێیدا بانگیان فێرکردبوو: (إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللهُ، فَقُمْ مَعَ بِلالٍ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مارَأَيْتَ، فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتاً مِنْكَ) رواه احمد و اصحاب السنن الا ابن ماجة.

واتە: ان شاء الله – ئەم خەونە ڕاستە، دە هەستە چیت دیوە فێری بیلالی بکە با پێی بانگ بدات، چونکە دەنگی وی بەرز و خۆشترە.

٢)وە جەماوەری زانایان دەڵێن وا پەسندە کە بانگبێژ پارێزکار و چاکەکار بێت، بەڵام مالیکی‌یەکان بە فەرزو مەرجی دەزانن، لە فەرمودەی: (لِيُؤَذِّنْ لَكُمْ خِيارُكُمْ وَيَؤُمَّكُمْ قُرّاؤُكُمْ) رواه أبوداود وابن ماجة والطبراني. واتە: با چاکەکانتان بانگتان بۆ بدەن و زاناکانتان پێش نوێژی (امامة) یتان بۆ بکەن.[167]

---

[166] بڕوانە: (الفقه الاسلامي..) ج١ ص ٦٩٧ تا ٦٩٩.

[167] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج١ ص ٧٠٥، وە: (المفصل) ج١ ص ٢٠٦.

٣)سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە کۆن کە سوننەتە بانگ و قامەت بەپێوە ئەنجام بدرێن، (ابن المنذر) گوتوویەتی: (أَجْمع كُلّ مَنْ أحفَظُ عَنْهُ مِنْ اهلِ العلمِ ان السنة ان يؤذن قائماً).[168]

٤)سوننەتە هەرکام لە بابای بانگبێژ و قامەت خوێن، لەش پاك و بەدەست نوێژبن، چونکە بێگومان هەردووکیان – واتە بانگ دان و قامەت کردن – دووجۆرە خواپەرستی و زیکری هەرە بەرزن، دە جا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك (مهاجر بن قنفذ) خوالێی ڕازیبێ سەلامی لێکرد وەڵامی نەدایەوە و پێی فەرموو کە ئەوەی ڕێی لێگرتوە وەڵامی سەلامەکەی بداتەوە ئەوەبووە کە حەزی نەکردووە زیکری خوا بکات مەگەر بەپاکی: (الاّ أَنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللهَ الاّ علىٰ طَهارَةٍ) رواه احمد وابوداود والنسائي وابن ماجة وصححه ابن خزيمة. جا ئەگەر بانگبێژ بەبێ دەست نوێــژی بانگیدا ئەوە لەلای شافیعییەکان ناپەسەندە، بەڵام (احمد) و (حەنەفییەکان) دەڵێن: ناپەسند (مکروه) نیە.[169]

٥) هەروەها سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر فەرزیش نەبێ سوننەتە بابای بانگبێژ لەڕێیخوادا بانگەکەی بڵێو کرێی لە بەرانبەردا وەرنەگرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عن عثمان بن إبي العاص قال: قلتُ يا رسول الله إجْعلْني إمامَ قَوْمي! قال: أَنْتَ إمامهمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ وَاتَّخِذْ مؤذناً لا يأخذُ علىٰ أذانِهِ أَجْراً) رواه ابوداود والنسائي وابن ماجة والترمذي بلفظ اخر.

واتە: (عثمان بن ابي العاص) گوتوویەتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بمکە بە ئیمامی گەلەکەم، فەرمووی: تۆ ئیمامیانی و بەگوێرەی توانای بێهێزتریان نوێژەکەت بکە، وە با بانگبێژێکتان هەبێ کە لەسەر بانگدانەکەی کرێ وەرنەگرێ.

٦)وە سوننەتە بانگدان و قامەت کردنیش ڕووبە قیبلە بن، چونکە بانگبێژەکانی پێغەمبەر ﷺ وایان بانگ داوەو قامەت کردوە،[170] پێغەمبەریش ﷺ بە بیلالی فەرموو ە: (قُمْ فَأَذِّنْ) متفق علية.

---

[168] بڕوانە: (المفصل) ج١ ص ٢٠٦، وە : (الفقة الأسلامي..) ج١ ص ٧٠٥.

[169] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٢٩، وە : (الفقه الأسلامي..) ج١ ص ٧٠٥.

[170] بڕوانە/ (الفقة الأسلامي...) ج١ ص ٧٠٥، ط٤.

٧)وە سوونەتە بابای بانگبێژ لە کاتی بانگ دان دا هەردووك پەنجەی بخاتە گوێیەکانی‌یەوە، وە لە کاتی گوتنی: (حي علی الصلاة) و (حي علی الفلاح) دا لە یەکەمیان دا ڕووبەلای ڕاست داو، لە دووەمیان دا ڕووبەلای چەپ دا بسووڕێنێ، بێئەوەی پێیەکانی بجوڵێن، چونکە (بلال) خوا لێی ڕازی بێ وای بانگ داوە، وەك (ابو جحیفة) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (و أَذَّنَ بِلالٌ، فَجعلْتُ أَتتبَّعُ فاهُ هَهُنا وهَهُنا يميناً و شِمالاً" يقول: حي علی الصلاة، حي علی الفلاح...) متفق علية.

واتە:... وە بیلال بانگی‌داو منیش سەرنجی زاریم دەدا لەملاولاوە، بەلای ڕاست و چەپ دا، دەیگوت: وەرن بۆ نوێژ، وەرن بۆ سەرفرازی.

وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا کە (ابو داود) هێناویەتی، (ابو جحیفة) گوتوویەتی: (رأَيتُ بِلالاً يؤذنُ، ويَدورُ و أَتتبَّعُ فاهُ ههنا و ههنا وأُصْبعاهُ في أُذنيه). واتە: بیلالم بینی بانگی دەدا و خۆی دەسووڕاند و منیش بەملاولادا سەرنجی زاریم دەدا، وەهەردووك پەنجەکانی خستبوونە گوێیەکانی‌یەوە.[171]

٨)وە سوننەتە لە کاتی بانگ دا بانگدەر دەنگی زیاتر، بەرزبکاتەوە لە قامەت خوێندن، وە لە نێوان هەردوو وشەی بانگ دا تۆزێ بوەستێ، بەڵام قامەتەکە بەدەنگی نزمتر و بەخێرایی بخوێنێ، لەو بارەشەوە ئەم دەقە گێڕراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بە بیلالی فەرمووە: (اذا أذَّنتَ فَترَسَّلْ، وَإذا أَقمْتَ فاحْدُرْ) رواه ابوداود والترمذي.

واتە: ئەگەر بانگت دا پەلەمەکە، بەڵام ئەگەر قامەتت کرد دەست و برد بکە.

٩)سەرجەم زانایان کە ئەهلی چوار مەزەبەکانیان لەنێودان دەڵێن سوننەتە بانگبێژ هەر خۆیشی قامەت بکات، بەڵام هەموویشیان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر غەیری بانگدەریش قامەتی کرد هەر دروست (جائز) ە.[172]

١٠)وە سوننەتە بانگدەر و قامەت خوێن، دەنگیان خۆش بکەن بەڵام بە جۆرە ئاوازێك نەبێ کە وەك گۆرانی بچن، وە هێندە وشەکانیان لەیەك نەکێشێتەوە، کە ماناکانیان بگۆڕێن. دیارە ڕۆیشتن و قسەکردنیش لە دەمی بانگدان و قامەت کردن دا ئەگەر حەرامیش نەبن ناپەسند (مکروه) ن، واتە بابای بانگبێژ و قامەتکەر دەبێ بەڕێزو ویقارەوە بوەستن لە کاتی بانگدان و قامەت کردن دا.[173]

---

[171] بروانە: (نیل الاوطار) ج٢ ص ٢٨ تا ٣١.

[172] بروانە: : (الفقة الأسلامي...) ج١ ص ٧١٨، ط٤.

[173] سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٧١٨، ... بروانە (فقة السنة) ج١ ص ...

هەشت: نوێژکەران لە کاتی قامەت کردن دا کەی هەڵدەستنە پێ بۆ نوێژ ؟!

زانایان دوای ئەوەی لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون کە وا باشە نوێژکەران هەڵنەستنە پێ هەتا ئیمام نەیەت و نەیبینن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا أُقيمَتِ الصّلاةُ فلا تقُوموا حتّى تروني) متفق عليه، واتە: ئەگەر قامەت بۆ نوێژ کرا هەتا من نەبینن هەڵمەستنەپێ، لەسەر دیاریکردنی کاتی هەستانەپێ ڕایان جیاوازە، هەرچی مالیکی‌یەکانن دەڵێن: لە سەرەتای قامەتەوە یان لە میانەی دا یان دوای تەواوبوونی، هەرچۆن بێ دروستە و کاتێك دیاری‌نەکراوە. بەڵام حەنەفی‌یەکان دەڵێن: پاش هەستانی ئیمام و لە کاتی گوترانی: (حي على الفلاح) دا هەڵدەستن، حەنبەلی‌یەکانیش دەڵێن: لە کاتی گوتنی: (قد قامت الصلاة) داو، شافیعی‌یەکانیش دەڵێن: ئەگەر بزانێ فریای (الله اكبر) ی نوێژ دابەستنی ئیمام دەکەوێ وا باشە پاش تەواوبوونی قامەتەکە هەستێتە پێ، ئەگەرنا چۆن بزانێ فریا دەکەوێ دەبێ وا بکات. [١٧٤] منیش پێم وایە ڕای مالیکی‌یەکان و شافعی‌یەکان لەوانی دیکە پەسندترن، چونکە مادام دەق نەبێ، بۆمان نیە دەمێکی تایبەت دیاری‌بکەین بۆ هەڵسانەپێ.

نۆ: بانگ و قامەت بۆ نوێژی فەوتا و لە کاتی گێڕانەوەی‌دا:

زۆربەی زانایان کە (ابو حنيفه و احمد و ابو ثور و شافعي لە یەکێك لە دوو قسەکانی‌دا) یان لەنێودان، ڕایان وایە کە سوننەتە بابای نوێژگێڕەرەوە، هەم بانگیش بدات و هەم قامەتیش بکات بۆ نوێژێك کە دەیگێڕێتەوە، بەڵام (مالك و أوزاعی و شافعی لە قسەیەکی‌دا،) تەنیا قامەت بە سوننەت دەزانن و بانگ دان بۆ نوێژی گێڕاوە بە ناپەسند (مكروه) دەزانن[١٧٥]، ظاهری‌یەکانیش هەرکام لە بانگ و قامەت بۆ هەرکام لە نوێژە فەڕزەکان چ لە کاتی خۆیان دا بکرێن چ بگێڕرێنەوە، وە نوێژکەرەکان چ نیشتەجێ بن چ ڕێبوار، مادام بە کۆمەڵ بکرێن بە فەڕز دەزانن[١٧٦]، بەڵام ئەگەر نوێژکەر تەنیا بێت بە فەڕزیان نازانن[١٧٧]

---

[١٧٤] بڕوانە: (الفقة الأسلامي ..) ج١ ص ٧١٩، وە : (فقه السنة) ج١ ص ١٣٢.
[١٧٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ ص ٤٥.
[١٧٦] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ ص ٤٥.
[١٧٧] بڕوانە: (المحلّى) ج٣ ص ٧٩، مسألة (٣١٥) وە (ص٨١) مسألة (٣١٦).

به سەرنج دانی ئەو دەقانەش کە لەو بارەوە هاتوون دەردەکەوێ کە ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترە، ئینجا شایانی باسیشە کە سەرجەم زانایان ڕایان وایە کە ئەگەر بابای نوێژکەر چ تەنیابێ چ بە کۆمەڵ بیکەن، ئەگەر دوو نوێژ یان زیاتریان پێکەوە گێڕانەوە سوننەت وایە بۆ یەکەمیان هەم بانگ بدرێ و هەم قامەتیش بکرێ، بەلاّم بۆئەوانی دیکە قامەت بەسە، بەلاّم حەنەفییەکان دەڵێن باشتر وایە بانگیش بۆ هەمویان بدرێ.[178]

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

*عن ابي قتادة رضي الله عنه قال: أنهم كانوا مَعَ النبيِّ ﷺ فنامُوا حتّى طلعتِ الشّمْسُ فقال النبيُّ ﷺ : يا بلالُ قُمْ فأذِّنْ الناسَ بالصّلاةِ) متفق عليه.

وە لەو ڕیوایەتەدا کە (عمران بن حصين) خوا لێی ڕازیبێ هێناویەتی، ئاوایە: (فأمَرَ بلالاً فأذَّنَ فصلّيْنا ركعتينِ، ثم أمَرَهُ فأقامَ فصلّيْنا) متفق عليه.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بیلال خوالێی ڕازیبێ کردوە کە بۆ ئەو نوێژە فەوتاوەی بەیانی هەم بانگ بڵێ و هەم قامەتیش بکات.

*(عن أبي عبيدة بن عبد الله بن مسعود عن أبيه أن المشركين شَغَلوا النبيَّ ﷺ يومَ الخَنْدَقِ عن أربعِ صَلواتٍ حتّى ذهَبَ منَ الليلِ ماشاءَ الله. فأمَرَ بلالاً فاذن ثم أقامَ فصلّى الظُهرَ، ثم أقامَ فصلّى العَصْرَ، ثم أقام فصلى المَغْرِبَ، ثم أقام فصلّى العِشاءَ) رواه احمد والنسائي والترمذي و قال: ليس باسناده بأس الا ان ابا عبيدة لم يسمع من عبدالله.

لەم دەقەش دا دەبینین کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا بۆ نوێژی یەکەم لە نوێژە چووەکان فەرمانی کردووە[179] بانگ بدرێ و بۆئەوانی دیکە بەس قامەت کراوە.

## دە: ئایا ئافرەتان بانگ و قامەتیان بۆ هەیە؟!

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون کە ئافرەتان لەسەریان پێویست نیە بانگ بدەن و قامەت بکەن[180]، بگرە زۆربەیان هەر بە حەرامیشی دەزانن ئافرەت بانگ بدات مادام پیاوان گوێیان لێبێ، لەوبارەوە کە ئایا ئەگەر هەر بۆ خۆیان بن

---

[178] بڕوانە: (المفصل) ج١ ص ٢٠١، وە: (نيل الأوطار) ج٢ ص ٤، وە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣٢، ١٣٣.

[179] زۆربەی زانایان لە وشەی (امر بلالا) هەڵیان هێنجاوە کە بەبێ ئیزنی ئیمام نابێ قامەت بکرێ.

[180] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣٣، کە ئەم دەقەی هێناوە: (قال ابن عمر رضي الله عنهما: لَيْسَ على النساءِ أذانٌ ولا إقامةٌ) رواه البيهقي بسند صحيح.

بۆیان هەیە بانگ بدەن و قامەت بکەن یان نا؟ ڕایان جیاوازە، هەرچی (شافعی و اسحاق و احمد و ابن حزم) ن دەڵێن: بۆیان هەیە، بەڵام ئەگەر نەشیان کردن قەیناکات[181]، مالیکیەکانیش دەڵێن: سوننەتە قامەت بکەن بەڵام بانگ دان سوننەت نیە[182]، بەڵگەی ئەمانەش کە دەڵێن ئافرەتان بۆیان هەیە بۆ نوێژە فەرزەکانیان بانگ بدەن و قامەت بکەن چەند شتێکە، یەکێکیان ئەوەیە کە لە (عائشة) وە خوا لێی ڕازیبێ گێڕراوەتەوە: (أنها كانَتْ تُؤَذِّن و تُقِيمُ و تَؤُمُّ النِّسَاءَ و تَقِفُ وَسَطَهُنَّ) رواه البيهقي، هەروەها لە (طاوس) گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی: (كانت عائشة تُؤَذِّنُ و تُقِيمُ)[183] واتە: ئافرەت بانگ و قامەت بۆ خۆی دەکات، بەڵام (ثوری و ابو ثور و حەنەفیەکان) بە دروستی نازانن ئافرەتان بانگ و قامەتیان هەبێ، بۆ نوێژەکانیان[184].

واش پێدەچێ ئەو ڕایە بەهێزتربێت کە دەڵێ ئافرەتان بۆیان هەیە بانگ بدەن و قامەتیش بکەن مادام هەر خۆیان بن[185].

## یازدە: کەسێك گوێبیستی بانگ و قامەت ببێ سوننەتە چی بڵێ؟!

لەو بارەوە چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوون کە ئەمانەن:

١)(عن سعد بن ابي وقاص رضى الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: (مَنْ قال حِينَ يَسْمَعُ المُؤَذِّنَ: و أَنا أَشْهدُ أن لا اله الا الله وحْدَهُ لا شريكَ لَهُ وأَن محمداً عَبْدُهُ و رَسولُهُ، رَضِيتُ بالله رَبّاً و بِمحَمَّدٍ رَسولاً وبِالأسْلام دِيْناً غُفِرَ ذَنْبُهُ) رواه مسلم والنسائي والترمذي و ابن ماجة.

واتە: هەرکەسێك کاتێك گوێی لە بانگبێژ دەبێ بڵێ: وە منیش شایەدی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین بەس خۆیەتی و هاوبەشی نین، وە کە موحەممەد بەندە و ڕەوانەکراوی ویەیە، خوام بە پەروەردگار و موحەممەدم بە پێغەمبەر و ئیسلامم بە بەرنامە پەسەند و قبووڵ کردوون، گوناحی دەبوردرێ.

٢)(عن ابي سعيد الخدري رضى الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ قال: اذا سَمِعْتُمْ المُؤَذِّنَ فقُولوا مِثْلَ ما يَقُولُ المُؤَذِّنُ) رواه الجماعة. واتە: هەرکات گوێتان لە بانگدەر بوو، بانگبێژ چی دەڵێ ئێوەش وا بڵێن.

---

[181] بڕوانە: (المفصل) ج١ ص٢٠٢، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص١٣٣.

[182] سەرچاوەی پێشوو.

[183] ئەو دەقانە (ابن حزم) هێناونی، بڕوانە: (المحلّى) ج٣ ٨٣، مسالة (٣٢٠).

[184] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣٣.

[185] بەڵکو خاوەنی "الروضة الندية" ج١ ص ... [illegible]

٣) (عن عمر بن خطاب رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: اذا قـال المـؤَذِّنُ: الله أكـبر الله أكبر، فقال أحدكم الله اكبر ألله أكبر، ثم قال اشهد أن لا اله الا الله، قال: أشهد أن لا الـه الا الله، ثم قال: اشهد أن محمداً رسول الله، قال: أشهد أن محمداً رسول الله، ثم قال: حي على الصلاة، قال: لا حول ولا قوة الا بالله، ثم قال: حي على الفلاح، قال: لا حول ولا قوة الا بـالله، ثم قال: الله أكبر الله اكبر، قال: الله أكبر الله أكبر، ثم قال: لا اله الا الله، قـال: لا الـه الا الله، مِنْ قَلْبِه دَخَلَ الجَنَّةَ) رواه مسلم و ابوداود و رواه البخاري بنحوه عن معاوية.

واته: هەركات بانگبێژ گوتی: خوا گەورەترە - لە هەموو كەس و هەموو شتێك - خوا گەورەترە، یەكێكیشتان گوتی: خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، دوایی - بانگدەر - گوتی: شایەدی دەدەم كە جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، - ئەویش - گوتی: شایەدی دەدەم كە جگە لەخوا هیچ پەرستراونین، پاشان گوتی: شایەدی دەدەم كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، گووتی: شایەدی دەدەم كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئینجا گوتی: وەرن بۆ نوێژ، گوتی: جووڵە و[١٨٦] توانا نیە مەگەر بە خوا، پاشان گوتی: وەرن بۆ سەرفرازی، گوتی: خۆلادان لە هەڵەو زیان و[١٨٧] توانا بۆ چاكە و قازانج نیە مەگەر بەخوا، دوایی گوتی: خوا گەورەترە خوا گەورەترە، گوتی: خوا گەورەترە خوا گەورەترە، دوایی گوتی: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراونین، گوتی: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراونین، لە ناخی دڵییەوە - ئاوا وەڵامی بانگی دایەوە - ئەوە دەچێتە بەهەشتی.

٤)(عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما أنه سَمِعَ النَبيَّ ﷺ يقول: اذا سَمِعتُمْ المـؤَذِّن فقولـوا مثلَ ما يقولَ، ثم صَلُّوا عليَّ، فانه مَنْ صَلَّى عليَّ صَلاةً صلى الله بها عَليه عَشْراً، ثم سَـلُوا الله لِيَ الوَسيلَة، فانَّها مَنْزِلَةُ في الجنَّة لا تَنبغِي الاّ لِعَبْدٍ مِنْ عبادِ الله وأَرْجُو أَنْ أَكونَ أنا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ الله لِيَ الوَسيلَةَ حَلَّتْ عَليهِ الشَفاعَة) رواه الجماعة الا البخاري وابن ماجة.

واته: هەركات گوێتان لە بانگدەربوو، ئێوەش وەك وی بڵێن بێجگە لە (حي على الصلاة، حي على الفلاح) وەك لە فەرموودەی دیكەدا هاتوە)، پاشان صەڵەواتم لەسەر

---

[١٨٦] بۆیە ڕستەی (لا حول ولا قوة الا بالله ) م بە دوو جۆر ماناكردووە، چونكە زانایان بە هەردووك جۆرەكان مانایان كردوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) للنووي، ج٢ ص ١٥١٤، ١٥١٥ ، وە بڕوانە (نيل الأوطار) ج٢ ص ٣٧، كە (شوكاني) یش هەر لە (نووي) وەرگرتووە.

[١٨٧] وەك پێشوو

بدەن، چونکە هەرکەسێك یەك جار صەڵەواتم لەسەر بدات، خوا بەهۆی ئەوەوە دە جار صەڵـەواتی بـۆ دەنـێرێ، ئینجـا وەسـیلەم بـۆ لـەخوا داوابکـەن، چونکـە وەسـیلە پلەوپایەیەکە لە بەهەشتێ بەس بۆ یـەك بـەندە لـە بـەندەکانی خـوا دەشـێ، وە مـن هیـوادارم کـە ئـەو بەندەیـە بم، جـا هـەر کەسـێك داوای وەسـیلەم بـۆ لـەخوا بکـات، شەفاعەتی بۆ شایستە و ڕەوا دەبێ.

٥)(عن جابر رضی الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: مَنْ قال حينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: أللهم رَبَّ هٰذِهِ الدعوةِ التامةِ والصلاةِ القائِمَةِ آتِ محمداً الوسيلةَ والفَضِيْلَةَ، وابْعَثْهُ مَقاماً مَحموداً الَّـذي وَعَدْتَـه" حَلَّتْ لَهُ شفاعَتِي يَوْمَ القيامَةِ) رواه الجماعة الا مسلماً.

واتـە: هەرکەسێك لـە کـاتی بیستنی بـانگ دا بڵـێ: "ئـەی خوایـە خـاوەنی ئـەم بانگـەوازە تـەواو و نوێـژە بـەرپاکراوە! وەسـیلە و پلـەو ئیمتیـازی هـەرە بـەرز بـە موحەممەد ببەخشە، وە ئەو پایە و مەقامە[١٨٨] تێدا ستایش کراوەی کە گفتت پێداوە پێ ی بدە" ، ئەوە تکاکردنی منی لە ڕۆژی قیامەت دا بۆ ڕەوا دەبێ.

٦)وە سوننەتە کە لە کۆتایی بانگ داو پێش قامەت کردن، واتـە لـەنێوان بـانگ و قامەت دا دووعا و پاڕانەوە بکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (الدعاءُ لا يُرَدُّ بيْنَ الأذانِ والأقامَةِ) رواه احمد وابو داود والترمذي، واتـە: پاڕانەوەی نێوان بـانگ و قامەت ڕەد ناکرێتـەوە، ئینجا (ترمذي) کـە ئـەم فەرموودەیـەی بـە (صحیح) دانـاوە، ئەمەشی لـێ زیاد کردوە: (قالوا: ماذا نقول يا رسول الله" قال: سَلُوا الله العَفْـوَ والعافِيَـةَ في الدُّنيا والأخِرَةِ) واتە: گوتیان: جا ئەی پێغەمبـەری خوا - لە کاتی ئەو پاڕانەوەیـەدا - چی بڵێین؟ فەرمووی: لێبوردن و سەلامەتی لە دونیا و دواڕۆژدا لە خوا داوابکەن.

ئەوەی ڕابرد هەمووی دەربارەی وەڵامدانەوەی بانگ بوو بۆ کەسێك کە گوێبیستی بانگ دەبێ، بۆ قامەتیش زۆربەی زۆری زانایان ڕایان وایە کە ئەویش وەك بانگ وەڵام دەدرێتەوە، بەڵام لە وەڵامی: (قد قامت الصلاه، قد قامت الصلاه) دا دەگوترێ: اقامها الله وادامها) واتـە: خـوا - ئـەم نوێـژ بەرپاکردنـە - هـەر ڕاوەسـتاو و بـەردەوام بکـات. چونکە لەو بارەوە ( ابو داود) لە هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە

---

[١٨٨] زانایان گوتوویانە مەبەست لە (مقاماً محموداً) یان (المقام المحمود) وەك لە ڕیوایـەتی دیکـەدا هـاتوە، پلەوپایـەی تکاکردنی مـەزن (مقام الشفاعة العظمیٰ) ە کە لـە فـەموودەکان هـاتوە و خـوای پەروەردگایش بەئاماژە (عسى أن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقاماً مَحْموداً) الأسراء - ٧٩ - ئاماژەی پێکردوە.

کاتێك "بلال" دەستی بە قامەت کردن کردو گوتی: (قد قامت الصلاه) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَقامَها اللهُ وأَدامَها)[189] بەڵام ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە و بە داهێنراو (بدعة) دادەنرێ لەو شتانە کە لەگەڵ بانگ و قامەت دا دەگوترێن ئەمانەن:

ا- گوتنی: (مَرْحباً بِحَبيبي وقُرَّةِ عَيْني محمدِ بنِ عَبْدِالله ﷺ) وە ماچ کردنی هەردووك پەنجە گەورە ی دەست و بە هەردووك چاودا هێنانیان، لە کاتی بیستنی: (اشهد ان محمداً رسول الله) دا، کە گوایە بۆ کوێری و چاوئێشە چاکە! بەڵام (الشیخ اسماعیل العجلونی) لە کتێبی: (كَشْفُ الخَفا و مُزِيلُ الإِلْباسِ عَمّا اشْتَهَر مِنَ الأَحاديث على أَلْسِنَةِ النّاسِ) دا گوتوویەتی: ئەسڵی نیە[190]

ب- لە پێش بانگی نوێژەکان دا بەتایبەت بەیانی بەدەنگی بەرز زیکرکردن و قورئان خوێندن کە ئەمیش هیچ زانایەك نەیگووتوە و دانی پێدا نەهێناوە کە سوونەتە بەڵکو بیدعەتە[191].

ج- بە دەنگی بەرز پاش بانگ صەڵەوات دان لە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەمەیش دیسان داهێنراوەو ئەسڵێکی شەرعی نیە، هەرچەندە صەڵەوات دان لە پێغەمبەر ﷺ دوای بانگ سوننەتە بەڵام نەك بە دەنگی بەرز[192]

د- لە دوای قامەت، خوێندنی دووعای (اللهم رب هذه الدعوة التامة..الخ)، کە بێگومان ئەم دووعایە تایبەتە بە بانگەوە و لە هیچ دەقێك دا نەهاتوە کە دوای قامەتیش خوێنرانی هەر سوننەت بێت، ئەوانەش کە دەڵێن بە قیاس لەسەر بانگ سوننەتە! قسەکەیان هەڵەیە چونکە (قیاس) لەو جۆرە خواپەرستییانەدا کە بە خواپەرستییە ڕووتەکان (العبادات المَحْضَة) ناسراون دروست نیە، وەك زانایانی ڕۆچوو لەسەری یەکدەنگ بوون.[193]

---

[189] بڕوانە: (الشرح الكبير) ج١ ص ٤١٦، ٤١٧، وە : (المغني) ج١ ص ٤٤١، وە: (فقه السنة) ج١ ص ١٢٨ ، ١٢٩ وە : (نيل الأوطار) ج٢ ص ٣٨، وە : (الفقه الأسلامي..) ج١ ص ٧١٢، ٧١٣، ط ٢.

[190] بڕوانە: ج٢ ص ٢٦٩ تا ٢٧١، کە گوتوویەتی: ( ولم يصبح في المرفوع من كل هذا شيء، هەروەها گوتنی: (مرحباً بالقائلين عدلاً، و بالصلاة مرحباً واهلاً) ئەسڵی نیە، بڕوانە : (ج٢ ٢٦٤).

[191] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣٥.

[192] سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ١٣٥، ١٣٦.

[193] بڕوانە : (القواعد النورانية الفقهية) ص ١١٢، تاليف (ابن تيمية) .

**دوازده: له کۆتاییش دا دەڵێم:**

بەڕاستی ئینسان هەتا زیاتر و چاکتر له وشه و ڕسته بەهێزو بە بڕستەکانی بانگ و قامەت ڕابمێنێ و وردبێتەوە زیاتر حیکمەت و هۆی هەڵبژێررانی بانگ و قامەتی بۆ ئاشکرادەبێ، کە خوای کاربەجێ کردوونی بە دروشم و شیعاری بانگ کردن و کۆکردنەوەی مسوڵمانان بۆ گەورەترین جۆری خواپەرستی کە نوێژە، چونکە لە بانگ و قامەت دا هەرکام لە:

١)بە گەورەگرتنی خوا بە موتڵەقی و بەبێ دیاریکردنی بەرامبەر (مقابل) ێك، کە بێگومان ئاوا بە موتڵەقی بە گەورە و مەزن دانانی خوای پەروەردگار، هەم بوون (وجود) ی و هەم تەواوی (کمال) ی و بێهەڵەو پەڵەیی دەگرێتە خۆی، چونکە زاتێك بە هەموو شێوەکانی گەورەیی لەزات و سیفەتەکان دا لە هەموو کەس و هەموو شتێك گەورەو بەرزو مەزنتر بێت بێگومان لە ئەوپەڕی تێر و تەواوی دایە و هیچ جۆرە لە کەو پەڵەیەکی نیە، : (الله اکبر الله اکبر، الله اکبر الله اکبر).

٢)بە یەکگرتنی خوا لە پەرستراوێتی (معبودیة) ی داو ڕاگەیاندنی نەبوونی هیچ هاوبەش و هاوەڵێك بۆی: (اشهد أن لا اله الا الله، اشهد أن لا الـه الا الله)، پێشتریش ماناو چەمکی خواپەرستی (عبادة) مان ڕوون کردۆتەوە لە بابەتی یەکەم دا.

٣)بە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوا زانینی موحەممەد ﷺ ، کە بێگومان دان هێنان بە پێغەمبەرایەتی وی‌دا دان هێنانیشە بەوەدا کە ئیسلام ئایین و بەرنامەی خوایە: (اشهد ان محمدا رسول الله، اشهد ان محمداً رسول الله).

٤)بانگ کردن بۆ گەورەترین و چاکترین جۆری بەندایەتی و فەرمانبەری (العبودیة والطاعة) بۆ خوای پەروەردگار کە نوێژە: (حي على الصلاة، حي على الصلاة).

٥)بانگ کردن بۆ بەختەوەری و سەرفرازی موتڵەق کە هەموو جۆرەکانی بەختوەری لە دنیا و دواڕۆژدا دەگرێتەوە، هەرچەندە بەختەوەری و بە مرادگەیشتنی ڕاستەقینە بەس لە دواڕۆژدا دەبێ بەهۆی چوونە بە هەشتەوە، کە وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: [١٩٤] (بَقَاءٌ بِلا فَنَاءٍ، غِنِيٌّ بِلا فَقْرٍ، عِزٌّ بِلا ذُلٍّ، عِلْمٌ بِلا جَهْلٍ) واتە: (مانەوەی بێ لەنێو چوون، دەوڵەمەندی بێ ئاتاجی، هێز و باڵادەستی بێ زەبوونی، زانیاری بێ نەزانی) یە. (حي على الفلاح، حي على الفلاح) ئینجا کە لە دوای نوێژەوە باسی بەختەوەری و بە کام و مراد گەیشتن هاتوە، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە

---

[١٩٤] بڕوانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن) [illegible]

تەنها ڕێگای بە کام و مراد گەیشتن بریتیە لە بەندایەتی و فەرمانبەریکردن بۆ خوا، کە نوێژ بەرپاکردن گەورەترین جۆریەتی.

٦)وە لە کۆتایی‌دا دووبارەکردنەوەی هەرکام لە : (بە گەورەگرتنی خوا) و (بە یەکگرتنی لەپەرستراوێتی‌دا) چونکە ئەو دوانە هەموو ڕاستی‌یەکانی دیکەی نێو بانگ، بگرە سەرجەم دینداری و مسوڵمانەتی دەگرنە نێو خۆیان: (الله أكبر الله أكبر، لا اله الا الله).

**بەڵێ خوێنەری بەڕێزو سەنگین:** خوای کاربەجێ وەك هەر کارێکی دیکەی لە ڕووی حیکمەتێکی بەرزو مەزنەوە بانگ و قامەتی کردوون بە دروشم و بانگەوازی کۆکردنەوەی مسوڵمانان بۆ گەورەترین و گرنگترین جۆرو شێوەی خواپەرستی.

## ٢- کورت کردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژە فەرزەکان:

خوای میهرەبان و کاربەجێ و پەنهان بین هەرچەندە بە هیچ ڕێیەك مەودای نەداوە پێنج نوێژە فەرزەکان بچوێنرێن بەڵام لە چەند حاڵەتێك دا مۆڵەتی کورت کردنەوە و کۆکردنەوەیانی داوە، جا هەرچەندە زۆر کەس وادەزانێ کە کورت کردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژە فەرزەکان پێکەوە پەیوەستن و هەردووکیان تایبەتن بە سەفەرەوە، بەڵام لەڕاستی‌دا وا نیە و ئەوە لەم چەند خاڵەدا ئەو دوو مەسەلەیە بە کورتی ڕوون دەکەینەوە:

**یەك:** کورت کردنەوەی نوێژ (قصر الصلاة) مەبەست نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکانە (نیوەڕۆ و ئێوارە و خەوتنان) تایبەتە بە سەفەرەوە، وەك خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿و اذا ضَرَبْتُمْ في الأَرضِ فَلَيْسَ عَلَيكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاةِ ...﴾ النساء - ١٠١ -، واتە: وە هەر کاتێك سەفەرتان کرد گوناحتان ناگاتێ کە لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە...

(ابن القيم الجوزية) لەو بارەیەوە گوتوویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەوە کە لە مەدینە دەردەچوو هەتا دەگەڕایەوە نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکانی کورت دەکردنەوە و دەیکردنە دوو ڕکات، وە لە سەفەرێ‌دا نوێژەکانی تەواو نەدەکردن[195].

[195] بڕوانە: (زاد المعاد في هَدْيِ خَيْرِ العباد) ج٢ ص١١٨ ط٢

ئینجا شایانی باسە کە تێکڕای [196] زانایان - کە ئەهلی چوار مەزهەبەکان هەندێکیانن - کورت کردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکان لە سەفەریدا بە ڕەوا دەزانن، بەڵام هەرچی زۆربەن کە (شافعي و مالك) یان لە نێواندان دەڵێن: مۆڵەت (رخصة) ە بەڵام کورت کردنەوە خێرترە، [197] مالیکییەکانیش دەڵێن: کورت کردنەوە سوننەتێکی داکۆکی لەسەرکراو (مؤكّدة) [198]، وە (ابو حنفية) و ژمارەیەکیش لە زانایان ڕایان وایە کە کورت کردنەوە فەرزە [199]، هەرچەندە هیچ کامیشیان ناڵێن ئەگەر نوێژەکانی کورت نەکردنەوە دروست نین و بەرناکەون [200] واش پێ دەچێ ئەو ڕایە ڕاست تر بێ کە کورت کردنەوە (قَصْر) بە سوننەت دەزانێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِها عليكُمْ فاقْبَلوا صَدَقَتَهُ) رواه مسلم، واتە: خێرێکە خوا پێی کردوون و خێرپێکردنی خوا وەربگرن.

دیسان - وەك "نَوَوي" گوتوویەتی: [201] هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوالێیان ڕازیبێ لە خزمەت پێغەمبەردا سەفەریان کردوە و هەیانبووە نوێژی کورت کردۆتەوە و هەشیانبووە بە تەواوی کردوویەتی، وە هەیانبووە ڕۆژووی گرتوە و هەشبووە بە ڕۆژوو نەبووە و، هیچ کامیان سەرکۆنەی ئەوانی دیکەیان نەکردوە، هەروەها هەرکام لە (عثمان) و (عائشة) خوا لێیان ڕازیبێ لە سەفەریدا نوێژیان تەواو کردوە، عائیشە لەو بارەوە گێڕاویەتەوە: (خَرَجْتُ مَعَ النبيِّ ﷺ في عُمْرَةٍ في رمضانَ فأفطرَ وصُمْتُ، و قَصَرَ وأتممتُ، فقلتُ: بأبي وأُمّي أفطرتَ و صُمْتُ، و قَصَرْتَ و أتممْتُ فقال: أحْسَنْتِ يا عائِشَةُ) رواه الدارقطني و قال: هذا اسناد حسن.

**دوو:** ئنجا زانایان دەربارەی ئەو سەفەرەی کە نوێژەکانی تێدا کورت دەکرێنەوە، جیاوازی و مشت و مڕی زۆریان لەنێوان دا هەیە، هەم لەبارەی ماوە (مسافة) ی سەفەرەکەوە و هەم لە بارەی کاتی مانەوەی بابای ڕێبوارەوە.

---

[196] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم للنووي) ج٣ ص ٢١١٥، ٢١١٦، ، وە (الفقه الأسلامي. ج٢ ص ١٣٤.

[197] بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج٢ ص ١٣٣٧ط٤

[198] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٢ ص ١٣٤٠.

[199] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص ٢١١٦.

[200] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الأربعة) ج١ ص ٤٧١، بەڵام (شيعة) ی دوازدە ئیمامی دەڵێن ئەگەر بە ئانقەست نوێژەکانی لە سەفەریدا تەواوکردبێ بەتاڵن و دەبێ بیان گێڕێتەوە، بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) ص ١٤٢، ١٤٣. محمد جواد مغنية.

[201] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص ٢١١٦

جا هەرچەندە لەبارەی دووری و نزیکی سەفەرەکەوە زۆربەی [202] زانایان دەڵێن: دەبێ دەوری چوار بەرید - کە دەکاتە شازدە (١٦) فەرسەخ - دووربێ کە بە کیلۆمەتر دەکاتە هەشتا و هەشت کیلۆمەتر و حەوسەد و چوار مەتر (٧٠٤و٨٨) [203]، بەلاّم بە سەرنج دان و لێوردبوونەوەی زۆر لەو شتانەی کە بە بەڵگەیان هێناونەوە بۆ ئیسپاتی دەعوایەکەیان، دەردەکەوێ، کە دیاریکردنی ئەندازەیەکی تایبەت بە سەفەری نوێژ تێدا کورت کرانەوە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی متمانەپێکراوی لەسەر نیە، بۆیە واپێدەچێ ئەو ڕایەی کە دەڵێ: کورت کردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتییەکان لە موتڵەقی سەفەردا دروستە، لە ڕایەکەی دیکە - هەرچەندە زۆربەش لەسەرنی - بەهێزتر بێت، بۆ پشتگیری ئەو ڕایەش ئەم دەقە دێنینەوە کە (الحافظ ابن حجر) لەبارێیەوە گوتوویەتی: [204] (ئەو فەرموودەیە ڕاست ترین و ڕاشکاوترین فەرموودەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستە):

**(عن يَحْيَىٰ بن يزيد قال: سَأَلْتُ أَنَسَ بن مالكٍ عَنْ قَصْرِ الصَّلاةِ؟ فقال أَنَسٌ: كان النَّبِيُّ ﷺ إذا خَرَجَ ثلاثَةَ أَمْيالٍ أو فَراسِخَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ)** رواه مسلم وأحمد وأبوداود والبيهقي، وەك دەبینین (انس) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بۆ ماوەی سێ میل یان سێ فەرسەخ سەفەری کردبایە نوێژەکانی کورت دەکردنەوە.

جا هەرچەندە ئەو دەقەی کە (ابو سعيد الخدري) خوا لێی ڕازیبێ هێناویەتی کە دەڵێ: **(كان رَسولُ اللهِ ﷺ اذا سافَرَ فَرْسَخاً يَقْصُرُ الصَّلاةَ)** رواه سعيد بن منصور واقره الحافظ بن حجر بسكوته عنه، ئەو دوودڵییەی کە لە دەقەکەی پێشوودا دەبینرێ لەنێوان میل و فەرسەخ دا، لای دەبات، بەلاّم بەهەرحاڵ دەکرێ بۆ ئیحتیات لە سەفەری کورت تر لە نۆ (٩) میل دا نوێژ کورت نەکرێتەوە کە بە کیلۆمەتر دەکاتە:

٩×١٨٤٨= ١٦,٦٣٢ (شازدە کیلۆمەتر و شەشسەدوو سی و دوو مەتر).

---

[202] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٣٤٢، ١٣٤٣.

[203] چونکە (برید) یەك چوار فەرسەخە و (فرسخ) یش سێ میلە و (میل) یش (٨٤٨و ١) مەترە، کەواتە، ٤×٤ = ١٦ فەرسەخ× ٣= ٤٨ میل × ١٨٤٨ = ٧٤٠ و ٨٨ مەتر، بڕوانە: (الأدلة الرضيَّة) ص ٩٠، دیارە هەر (برید) یەك چوار فەرسەخە.

[204] بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٢٧٩.

هەندێك لە زانایانیش – بۆ وێنە (ابن حزم الأندلسي) – ڕایان وایە کە مادام سەفەرەکە یەك (میل) یش دووربێ، پێویستە نوێژەکانی تێدا کورت بکاتەوە، چونکە ئەو – واتە ابن حزم – ڕای وایە کە نوێژ کورت کردنەوە لەسەفەرێدا فەرزە [205]

هەڵبەتە ڕایەکەی (ابن حزم) یش هێز و پێزێکی وای نیە، چونکە وەك گوتمان نوێژ کورت کردنەوە تایبەتە بە سەفەرەوە و یەك میل ڕێکردن و لە ماڵ دەرچوونیش بەسەفەر دانانرێ!

بۆیە وەك زانایانی لێکۆڵەرەوە – بۆ وێنە (ابن تیمیة) و (شوکاني) – گوتوویانە: مادام لە شەرع و زمان (لغة) دا سنوور و ئەندازەی سەفەر دیارینەکراوە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ عورف و باوی خەڵکی و هەر شتێك لەنێو خەڵکیدا بە سەفەر بزانرێ ئەوە لە ڕووی شەرعیشەوە سەفەرەو حوکمەکانی سەفەری بەسەردا دەچەسپێن.

(ابن تیمیة) لەو بارەوە پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژی (٦٠-٧٠) لاپەڕەیی وەك ئەنجامگیری کۆتایی (الأستنتاج النهائي) گوتوویەتی: [206]

(سەفەر بەهۆی کردەوەیەکەوە کە لەبەر خاتری وی ناوی سەفەری لێنراوە، بۆتە سەفەر، ئەو کردەوەیەش پێویستی بە کات دەکات، جا ئەگەر هەم کردەوەکە و هەم کاتەکەی هێندە درێژەیان کێشا کە سەفەرەکە پێویستی بەوە بێت کە ڕێبوار پێویستیەتی لە توێشوو و توێشەبەرە (الزَّاد والمَزاد) ئەوە بەو کەسە دەگوترێ ڕێبوار (مسافر)، بەڵام ئەگەر ماوەکە دوور نەبوو، یان کردەوە و کاتەکە هێندە کورت بوون کە پێویستییان بە نان و ناندێن نەبوو، ئەوە پێی ناگوترێ سەفەر هەرچەندە ماوەکەشی دوور بێت، کەواتە ئەسڵ ئەو کردەوەیە کە پێی دەگوترێ سەفەر، دیارە ئەو کردەوەیەش لە کات دا نەبێ نابێ.. وە ئەوەش حەتمەن دەبێ لە شوێنێکەوە بێ کە لێیەوە دەگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، ئەمەش خەڵك بەپێی عورف و باوی خۆیان دەیزانن، ئەگەرنا لە شەرع و زمان دا سنوورێکی نیە و هەرچی ئەوان بە سەفەریان ناوبرد ئەوە سەفەرە).

---

[205] بڕوانە: (المُحَلّى شرح المُجَلّى) ج٥ ص٥، مسألة (٥١٣).

[206] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٤ ص ١٠ تا ٧٦، دیارە دەقاودەق نووسینەکەی ویمان کردووە بە کوردی بەبێ هیچ دەستکاریەك.

**جا خوێنەری بەڕێز:** بێگومان ئەو مەسەلەیە - لە ماوەی چەند دا نوێژ کورت دەکرێتەوە - مەسەلەیەکە زانایان زۆری لە بارەوە دواون و بیروڕای زۆر و جۆراوجۆریان لەسەری هەن، کە (شوکاني) دەڵێ[٢٠٧]: هەتا بیست قسە (عشرون قولاً) ڕۆیشتوون، بەڵام ئەوەی هەڵمان بژارد پێم وایە بەهێزترینیانە بەتایبەت بەو مەرجانەوە کە (ابن تیمیة) هێناونی، وە لە ڕاستیدا وەك سنوورێکی نێوەڕاست (حدود وسط) یشە لەنێوان چل و هەشت (٤٨) میلی جەماوەر و یەك میلی ظاهیرییەکانیش دا.[٢٠٨]

*سێ:* لە بارەی ئەندازەی مانەوەش لە سەفەردا کە مەرجی ڕەوابوونی کورت کردنەوەی نوێژەکانە، زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە بابای ڕێبوار مادام نیازی مانەوە و نیشتەجێبوونی نەبێ‌و، هەر ئەمڕۆ ئەمڕۆی بێ بۆ گەڕانەوە، ئەوە هەرچەندە زۆری پێ‌بچێ نوێژەکانی هەر کورت دەکاتەوە، چونکە هەر بە ڕێبوار دادەنرێ، تەنیا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا ڕای وایە کە تەنیا هەتا (١٧ ، ١٨) ڕۆژ بۆی هەیە.[٢٠٩]

بەڵام ئەگەر بە تەمای مانەوە بوو ئەوە ڕای زانایان جیاجیایە، هەرچی (ابو حنیفە) و (سفیان الثوري) ین دەڵێن: مادام نیازی مانەوە کەمتر لە پازدە (١٥) ڕۆژی هەبێ بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، بەڵام شافعییەکان‌و مالیکییەکان دەڵێن: بەمەرجێك ڕێی دەدرێ کورتیان بکاتەوە کە بە تەمانەبێ لە سێ (٣) ڕۆژان پتر

---

[٢٠٧] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٣ ص ٢٥٢.

[٢٠٨] چونکە هەرکام لە مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلیەکان دەڵێن: دەبێ سەفەرەکە چوار بەرید یان (١٦) فەرسەخ ببێ، کە دەکاتە (٤٨) میل و ئەویش دەکاتە (٨٨) کم و (٧٠٤) م، بەڵام حەنەفییەکان بە کات دیارییان کردووە و دەڵێن: دەبێ ماوەکەی سێ ڕۆژ ڕێ‌بێ بە ڕۆیشتنی وڵاخ و بار لە کورت ترین ڕۆژەکانی ساڵدا لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ ، بڕوانە: (بدایة المجهد) ج١ ص ١٧١، ظاهرییەکانیش دەڵێن: لە ماوەی یەك میل دا بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، ئینجا شایانی باسیشە کە ئەو ڕایەی هەڵمان بژاردوە پەسند کراوی زۆر لە زانایانی لێکۆڵەرەوەی دیکەشە بێجگە لە (ابن تیمیە) و (شوکاني) و (ابن حزم) یش - لەگەڵ تۆزە جیاوازییەك دا -، بۆ وێنە: هەرکام لە (ابن قدامە) خاوەنی (المغني)، ج٢ ص ٩٤ ، ٩٥ ، وە (صدیق بن حسن القنوجی) خاوەنی (الروضة الندیة) ج١ ص ٢٢٨، وە (صنعاني) خاوەنی (العدة علی احکام الأحکام شرح عمدة الأحکام) ج٢ ص ٤٩١، وە (د. وهبة الزحیلي) خاوەنی: (الفقه الأسلامي) ج٢ ص ١٣٤٤، کە هەرچەندە بە ڕاشکاوی نەیگووتوە بەڵام وا هەست دەکرێ ئەویش ڕای ناوبراوی لەلا پەسەند بێ.

[٢٠٩] بڕوانە: (الفقه [illegible]) ج١ ص [illegible]

بمێنێتەوە،[210] (احمد و داود الظاهري وابن تيمية)ش دەڵێن: مادام نیازی مانەوەی لە چوار (٤) ڕۆژان زیاتری نەبێ، بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە.[211]

دیارە هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە کە بابای ڕێبوار هەتا لە سەفەرێ بێ بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە و، دەشڵێن: ئەوانەی ئەو ماوە جیاجیایانەیان دیاریکردوون و کردوونە مەرج بۆ موباح بوونی نوێژ کورت کردنەوە هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نیە کە بۆ ئیسپاتی حوکمێکی شەرعی لەو جۆرە بشێ[212].

**چوار:** کۆکردنەوەی نوێژەکان: وەك باسمان کرد کورت کردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتیەکان تایبەتە بە سەفەرەوە، بەڵام کۆکردنەوەی نوێژەکان کە مەبەست (نیوەڕۆ و ئێوارە) و (شێوان و خەوتنان)ە، وا نیە و تایبەت نیە بە سەفەر و بە بابای ڕێبوارەوە، بەڵکو لەگەڵ پێویستی[213] و ناچاری و تێگیران دایە، جا ئێستا با سەرنج بدەین داخوا لە چ کات و حاڵێکدا دروستە چوار نوێژەکان پێکەوە کۆبکرێنەوە:

١)لە عەرەفات و لە موزدەلیفە: سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بابای نوێژکەر ئەگەر لەسەریشی فەرز نەبێ، بۆی هەیە و سوننەتە کە نوێژەکانی نیوەڕۆ و ئێوارە لە دەشتی عەرەفات پێکەوە بکات، هەروەها شێوان و خەوتنانیش لە موزدەلیفە پێکەوە کۆبکاتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە.

٢)لە سەفەرێ: بابای ڕێبواریش لە سەفەرێدا چ لە حاڵەتی ڕۆیشتن دا بێ، چ لە حاڵەتی بارگەو بنەخستن و دابەز ین دا بۆی هەیە نوێژەکانی پێکەوە کۆبکاتەوە، هەرچەندە زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە کۆکردنەوەی نوێژەکان تەنیا مۆڵەت (رخصة)تێکە و زیاتر بۆ حاڵەت و کاتی پێویستی و ناچاریەو، ئەگەر بگونجێ نوێژەکان هەر لەکاتی خۆیان دا بکرێن چاکترە، ئەگەر بە کورت کراوەییش بن، پێشتریش گوتمان کە کورت کردنەوە و کۆکردنەوە (قصر و جمع) ی نوێژەکان پێکەوە پەیوەست نین[214].

---

[210] بڕوانە: ( الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٣٤٨، ط٤، وە ئەمە ڕای (شوكانی) یشە، (الأدلة الرضية) ص ٩٠.

[211] بڕوانە (بداية المجتهد) ج ١ ١٧٣، وە (مجموعة الفتاوى) ج ٢٤ ص ١٣ ، ١٤.

[212] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٠٩ ، ٣١٠.

[213] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ ص ٢٤٤.

[214] بڕوانە: (مجموع [illegible]

٣)بەهۆی باران بارینەوە: کەسانێك کە نوێژەکانیان بە کۆمەڵ و لە مزگەوتێ دەکەن دروستە کە لە کاتی بارانی زۆردا نیوەڕۆ و ئێوارە و، شێوان و خەوتنان پێکەوە بکەن، ئەمەش ڕای زۆربەی زانا و پێشەوایانە[٢١٥].

٤)بەهۆی نەخۆشی و لە کاتی پێویستی و هەبوونی عوزرێکی شەرعیدا: ژمارەیەکی زۆر لە زانایان ڕایان وایە - کە (نووي) لە بارەی ئەم ڕایەوە گوتوویەتی: (و هذا الوَجْهُ قَوِيٌّ جداً)[٢١٦] - دروستە چوار نوێژەکان لەبەر نەخۆشی و کاری پێویست و لە کاتی تێگیراویدا، بە پێش خستن و دواخستن (تقديماً و تأخيراً) پێکەوە کۆبکرێنەوە، (نووي) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (ذَهَبَ جماعةٌ مِنَ الأَئمة الىٰ جَوازِ الجَمْعِ فِي الحَضَرِ لِلْحاجَةِ لِمَنْ لَمْ يَتَّخِذْهُ عادةً)[٢١٧]، واتە: (کۆمەڵێك لە پێشەوایان ڕایان وایە کە دروستە لە حاڵەتی ئاسایی و نیشتەجێ بوونیش دا، لەبەر پێویستی نوێژەکان - واتە نیوەڕۆ و عەصر و شێوان و خەوتنان - پێکەوە کۆبکرێنەوە، بەڵام بۆ کەسێك نەیکاتە عادەت و لەسەری بەردەوام نەبێ)، دیارە کۆمەڵێك فەرموودەش لەو بارەوە هەن، کە ئەمە یەکێکیانە:

**(عن ابن عباس رضى الله عنهما قال: جَمَعَ رسولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهرِ والعَصْرِ والمَغْرِب والعِشاءِ بِالمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ ولا مَطَرٍ، قيل لأبن عباس: ماذا أَرادَ بِذلِكَ؟! قال: أَرادَ أَلّا يُحَرِّجَ أُمَّتَهُ)** رواه مسلم، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەینەدا بێئەوەی ترس و باران هەبێ نیوەڕۆ و ئێوارە و شێوان و خەوتنانی پێکەوە کۆکردەوە، پرسیار لە (ابن عباس ) کرا مەبەستی لەوە چیبوو؟! گوتی: ویستی ئۆممەتەکەی سەغڵەت نەکات.

**پێنج:** هەروەك چۆن کورت کردنەوەی نوێژەکان تایبەت بوو بە نوێژە چوار ڕکاتییەکانەوە، کۆکردنەوەشیان تایبەتە بە نیوەڕۆ و ئێوارە (الظهر والعصر) لەلایەك و شێوان و خەوتنان (المغرب والعشاء) لە لایەکی دیکەوە، واتە نوێژی بەیانی دەبێ هەر لە کاتی خۆیدا بکرێ و لەگەڵ هیچ کام لە نوێژەکانی دیکەدا کۆناکرێتەوە، وە

---

[٢١٥] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣١٢، وە (الفقه الأسلامي) ج٢ ص ١٣٧٤، دەڵێ: ئەمە ڕای مالیکییەکان و شافعییەکان و حەنبەلییەکانە.

[٢١٦] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٤ ص ٣٢١.

[٢١٧] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) [illegible]، وە: (المجموع) ج٤ [illegible]

کۆکردنەوەی نوێژەکان دەگونجێ بە پێش خستن (تقدیم) بێ یان بە (داوخستن - تأخیر)، واتە: دەگونجێ ئێوارە بهێنرێتە لای نیوەڕۆ و شێوان بهێنرێتە لای خەوتنان یان بە پێچەوانەوە.

ئاشکراشە کە نیوەڕۆ و عەصر تەنیا لەگەڵ یەکتر و شێوان و خەوتنانیش بەس پێکەوە کۆدەکرێنەوە و بۆ وێنە دروست نیە ئێوارە و شێوان پێکەوە کۆبکرێنەوە، ئەم شتانە هەموو زانایان لەسەریان یەکدەنگن.

**شەش:** بەپێی ڕای زۆربەی زانایان نە نیەت هێنان و نە بە دوای یەك دا هاتن (الموالاة) بۆ کورت کردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکان مەرج نیە و ئەوانەی کە بە مەرجیان گرتوون بەڵگەیەکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نیە، دیارە مەبەستمان لە نیەت نیەتی کۆکردنەوەی دوو نوێژەکەیە نەك نیەت هێنان بۆ کردنی هەر کامێکیان کە ئەمە پایەی یەکەمی نوێژە، وە مەبەستیشمان لە بەدوای‌یەکدا هاتن (موالاة) واتە قسە و کردەوە نەکەوتنە نێوانی دوو نوێژە پێکەوە کۆکراوەکەیە کە هەندێك لە زانایان بە مەرجیان داناوە بۆ دروست بوونی کۆکردنەوەی نوێژەکان[218]، بەڵام ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترە، چونکە دروست نیە هیچ شتێك لە عیبادات دا زیاد بکرێ بەبێ بەڵگە و بەڵگەش نیە.

## ٣- نوێژی ترس (صلاة الخوف)

نوێژی بەکۆمەڵ (جماعة) هێندە گرنگ و مەزنە و خواو پێغەمبەری خوا هێندەیان بایەخ پێداوە کە تەنانەت لە کاتی جەنگ و گەرمەی کوشتاریش دا فەرامۆش نەکراوە و ڕێ و شوێنی تایبەتی بۆ دانراوە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو حاڵەت و بارودۆخانەی کە سوپای ئیسلام تێیان دا لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕوودەبێتەوە زۆرن، بۆیە دەبینین شێوەکانی نوێژی ترسیش جۆراوجۆرن، کە (أحمد بن حنبل) ڕحمەتی خوای لێبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (ئەو فەرموودانەی لەو بارەوە گێڕاونەوە هەموویان ڕاستن وە هەموویان دەگونجێ و دروستە ئیشیان پێبکرێ)[219]، (نووي) یش ڕەحمەتی

---

[218] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢١ ص ٢٥٧ ، ٢٥٨، وە بڕوانە: ( فقه السنة) ج١ ص ٣١٤ ، ٣١٥.

[219] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص٢.

خوای لێبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (ئەو جۆر و چۆنیەتی‌یانەی کە لەبارەی نوێژی ترسەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراونەوە سەرجەم دەگەنە (١٦) شازدە جۆر وە هەمووشیان دروستن)[٢٢٠]، ئینجا بێجگە لە (ابو یوسف) و (مزني) تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نوێژی ترس لە هەموو سەردەمێك دروستە و تایبەت نیە بە ڕۆژگاری پێغەمبەری خواوە ﷺ.

*ئەمەش بە کورتی چەند جۆرێك لە نوێژی ترس:*

یەك: ئیمام شوێن کەوتووەکانی بکاتە دووبەش و بە هەر کۆمەڵێکیان دوو ڕکات بکات و سەلام بدەنەوە، واتە ئیمام چوار ڕکات بکات و ئەوان یەکی دوو ڕکات، ئەم جۆرەیان (بخاري و مسلم) لە (جابر) یان گێڕاوەتەوە[٢٢١]،

دوو: ئیمام نوێژکەرەکان بکاتە دوو کۆمەڵ و بە هەر کامێکیان یەك ڕکات بکات و پاشان هەرکامێکیان سەرو ڕکاتی دیکە بۆ خۆیان بکەن، واتە: ئیمام بە کۆمەڵێکیان ڕکاتێك بکات و ئەو کۆمەڵە بچنە بەرانبەر دوژمن و کۆمەڵی دووەم بێن ڕکاتێکیش بەوان بکات و خۆی سەلام بداتەوە و ئەوانیش بە نۆرە ڕکاتەکەی دیکەیان بکەن و سەلام بدەنەوە، ئەم جۆرەشیان (بخاري و مسلم) لە (ابن عمر)ەوە گێڕاویانەتەوە[٢٢٢].

سێ: ئیمام شوێن کەوتووەکانی دەکاتە دوو کۆمەڵ و پێکەوە نوێژدادەبەستن و پێکەوە ڕکووع دەبەن، پاشان کە لە ڕکووع هەستانەوە، ئەو کۆمەڵ و ڕیزەی کە لە ئیمامەوە نزیکە لەگەڵ ئیمام دا سەجدە بەرن و کۆمەڵ و ڕیزەکەی دیکە بەپێوە لە بەرانبەر دوژمن دا بمێننەوە، ئینجا کە ئیمام هەستایەوە لە سەجدە و کۆمەڵی یەکەمیش لەگەڵی هەستانەوە، کۆمەڵی دووەم سەجدە بەرن و هەڵسنەوە و ئەمان بێنە نزیك ئیمام و کۆمەڵی یەکەم بچنە دواوە و پاشان کە ئیمام چووە ڕکووع هەردووك کۆمەڵەکە لەگەڵی بچنە ڕکووع، ئینجا کە ئیمام سەجدەی برد کۆمەڵی دووەم کە جاری یەکەم لە سەجدە بردن دواکەوتبوون لەگەڵ ئیمام سەجدە ببەن و کۆمەڵی یەکەم بەپێوە لە بەرانبەر دوژمن دا بمێننەوە، پاشان کە ئیمام و ئەو ڕیزو کۆمەڵەی لەگەڵی

---

[٢٢٠] سەرچاوەی پێشوو.

[٢٢١] بڕوانە: (پەراوێزی – الأدلة الرضية–) ص ٨٧.

[٢٢٢] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ص ٨٧، ٨٨.

چوو بوونە سەجدە سەجدەیان تەواو کرد کۆمەڵی دواکەوتووش. بچنە سەجدە و پاشان - دوای خوێندنی تەحییات - پێکەوە سەلام بدەنەوە[223].

چوار: دیسان ئیمام نوێژکەرە موجاهیدەکان دەکاتە دوو کۆمەڵ - کە ئەمە لە کاتێك دایە دوژمن لە ڕووی قیبلەوە نەبێ - کۆمەڵێکیان لەگەڵ ئیمام ڕووە و قیبلە ڕادەوەستن و کۆمەڵەکەی دیکەش ڕووە و دوژمن و پشت لە قیبلە، ئینجا هەموویان لەگەڵ ئیمام نوێژ دادەبەستن، ئیمام دوای ئەوەی ڕکاتێك بەو کۆمەڵە دەکات کە لەگەڵی ڕووە و قیبلە وەستاون، ئەو کۆمەڵەی یەکەم دەچنە شوێنی کۆمەڵی دووەم و بەرانبەر بە دوژمن دەوەستن و، کۆمەڵی دووەمیش دێن ڕکاتێك دەکەن و ئیمامیش هەر بەپێوەیە و چاوەڕێیان دەکات، پاشان پێکەوە ڕکاتی دووەم دەخوێنن و ڕکووع دەبەن و دەچنە سەجدە و کە دەستیان بە تەحییات کرد، کۆمەڵی یەکەمیش دێن ئەو ڕکاتەی ماویانە دەیکەن و پاشان تەحییات دەخوێنن و ئیمام و هەردوو کۆمەڵی یەکەم و دووەم پێکەوە سەلام دەدەنەوە، بەو جۆرە هەر کام لە ئیمام و هەردووك کۆمەڵەکە یەکی دوو ڕکات دەکەن[224].

### چوار تێبینی دەربارەی نوێژی ترس:

یەکەم: زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نوێژی شێوان کورت ناکرێتەوە، ئینجا لەوەدا کە ئایا ئیمام دوو ڕکات بە کۆمەڵی یەکەم بکات و ڕکاتێك بە هی دووەم، یان بە پێچەوانەوە زانایان ڕایان جیا جیایە و هیچ فەرموودەش لەو بارەوە نین.

دووەم: ئەو فەرموودانەی کە باسی چۆنیەتی نوێژی ترسێ دەکەن هەموویان بەس باسی نوێژی دوو ڕکاتی دەکەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەرپاکردنی ئەو نوێژانەدا لە سەفەرێ بووە و لە سەفەریش نوێژە چوار ڕکاتییەکان کورت دەکرێنەوە، کەواتە ئەگەر بێت و ئەوانەی نوێژی ترس دەکەن نیشتەجێ بن پێویستە ئیمام لە جیاتی دوو ڕکات چوار و لە جیاتی ڕکاتێکیش دووان بە هەر کام لە دوو کۆمەڵەکە بکات.

سێیەم: نوێژکردن لە کاتی ترسێکی زۆر یان گەرمەی شەڕو تێك ڕژان دا: زۆربەی هەر زۆری زانا و پێشەوایان دەڵێن لە کاتی گەرم بوونی جەنگ و تێك ڕژانی سوپای

---

[223] بڕوانە: (الادلة الرضية) ص ٨٧

[224] بڕوانە: (الادلة الرضية) ص٨٨، هەروەها بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢، ص٢٦٠ تا ٢٧٠.

ئیسلام و کوفردا جەنگاوەرانی ئیسلام هەرچۆنێکی بۆیان ئاسان و گونجاو بێ نوێژەکەیان دەکەن و ڕووکردنە قیبلە و ڕکووع و سەجدە و تەحییات و باقی فەرزەکانی نوێژ بەپێی توانایان ئەنجام دەدەن لەگەڵ جەنگ کردن دا، بەڵگەی ئەم ڕایەش کە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانا و پێشەوایانە ئەم ئایەتەیە: ﴿و حافِظوا علی الصَّلَوات والصلاةِ الوُسْطیٰ وقُوموا لِلّهِ قانِتِينَ, فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجالاً أو رُكْباناً..﴾ البقرة – ٢٣٨، ٢٣٩.

هەروها ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە: (عن ابن عمر رَضِيَ الله عنهما ان النبی ﷺ وصَفَ صَلاةَ الخَوْفِ و قال: فَإنْ كانَ خوفاً أَشَدَّ مِنْ ذٰلِكَ فَرِجالاً و رُكْباناً) رواه ابن ماجه، واتە: پێغەمبەر ﷺ باسی نوێژی ترسی کرد، وە فەرمووی: جا ئەگەر ترسەکە لەوە توندتربوو – کە بگونجێ بەو جۆرانەی ڕابرد نوێژ بکرێ – ئەوە بەپێوە و بە سواری – هەرچۆنێکی گونجا – با بکرێ.[٢٢٥]

<u>چوارەم:</u> زۆربەی زانایان بە سوونەتی دەزانن و هەندێکیشیان بە فەرز کە بابای نوێژکەری جەنگاوەر لە کاتی نوێژەکەی‌دا چەکەکەی هەڵبگرێ، (نووي) لەو بارەوە گوتوویەتی: (فرع: في مَذاهِبِ العُلَماء في حَمْلِ السِّلاح: الأَصَحُّ عِنْدَنا أنّهُ لا يَجِبُ، لٰكِنْ يُسْتَحَبُّ، و بِهِ قال مالك وابو حنيفة واحمد و داود، واَحْتَجَّ مَنْ أوْجَبَهُ بِقولهِ تعالى: ﴿وَلْيَأْخُذوا أَسْلِحَتَهُمْ﴾ النساء – ١٠٢ – و بقوله تعالى: ﴿ولا جُناحَ عَلَيْكُمْ إنْ كانَ بِكُمْ أذًىً مِنْ مَطَرٍ أو كُنتُمْ مَرْضىٰ أَنْ تَضَعوا أَسْلِحَتَكُمْ...﴾ النساء – ١٠٢ – وأَجابَ الأَصْحابُ بِأَن الأَمْرَ هُنا مَحْمولٌ علىٰ النَّدْبِ، و رَفْعَ الجُناحِ لا يَلْزَمُ مِنْهُ الوجوبُ بل مَعْناهُ رَفْعُ الكَراهَةِ..)[٢٢٦]

واتە:باسێك: دەربارەی بیروڕای زانایان سەبارەت بە هەڵگرتنی چەك – لە نوێژی ترسێ‌دا – قسەی ڕاست تر لەلای ئێمە – واتە لە مەزهەبی شافیعی‌دا – ئەوەیە کە فەرز نیە بەڵکو سوونەتە، وە ئەمە ڕای مالیك و ئەبوو حەنیفە و ئەحمەد و داودیشە، ئەوانەش کە دەڵێن فەرزە ئەم ئایەتە بەبەڵگە دێننەوە: ( وە با چەکەکانیان بەدەستەوە بگرن) هەروەها ئەم ئایەتەش: (وە ئەگەر ئازارێکتان هەبوو بەهۆی بارانەوە یان نەخۆش بوون گوناحتان ناگاتێ کە – لە نوێژی ترسێ‌دا – چەکەکانتان دابنێن ...

---

[٢٢٥] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ ص ٢٧٠ تا ٢٧٢، وە بڕوانە: ( نيل الأوطار) ج٤ ص ١٠ تا ١٢. وە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر دەربارەی نوێژی ترس وا باشە سەرنجی ئەم سەرچاوانەش بدرێ: أ– (المجموع شرح المهذب) ج٤ ص ٣٤٧ تا ٣٧٦، ب– (سبل السلام) ج٢ ص٧٨ تا ٨٣، ج– (بداية المجتهد) ج١ ص ١٧٨ تا ١٨٢، د– (الروضة الندية) ج١ ص ٢٢١ تا ٢٢٥، ه– (السراج الوهاج) ج١ ص ٩٢ تا ٩٤.

[٢٢٦] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) [illegible]

هاوەڵانیشمان – مەبەستی زانایانی شافیعی مەزهەبە – وا وەڵامیان داوەتەوە کە فەرمان لێرەدا بۆ سوننەت (ندب) ە نەك بۆ پێویست بوون. وە لاچوونی گوناحیش مەرج نیە بەس بۆ کردنی شتی فەرز بێت بەڵکو مەبەست لاچوونی ناپەسندی (کراهة) یە، – کەواتە چەك هەڵگرتنەکە سوننەتە و دانانیشی بەبێ عوزر کارێکی ناپەسندە –.

### ٤- نوێژی بابای نەساغ (صلاة المريض):

بێگومان ڕاوەستان (قیام) و ڕکووع بردن و سەجدە بردن بەو شێوە و چۆنیەتی‌یەی کە پێشتر ڕوون کرایەوە بە پایەی نوێژ دادەنرێن، بەڵام بەپێی ئایەتی، ﴿ لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إلاّ وُسْـعَها ﴾ البقرة: ٢٨٦، خوا لە هیچ کەس شتی لە توانابەدەر داوا ناکات و لەسەری پێویست ناکات، وە بەپێی فەرموودەی: (وإذا أمرتكـم بـأمرٍ فَافْعلـوا مِنـهُ مـا استطعتم) رواه البخاري و مسلم، ئەگەر فەرمانم بە شتێك پێکردن بەپێی تواناتان لێی جێبەجێ بکەن، وە فەرموودەی: ( إذا مَرِضَ العَبْدُ أَوْ سافَرَ كُتِبَ لَهُ ماكـانَ يَعْمَـلُ صَحِيْحـاً مُقيماً ) رواه البخاري، واتە: ئەگەر بەندە نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد ئەوە ئەوەی بە ساغی و نیشتەجێیی کردوویەتی بۆی دەنووسرێ، بەڵێ بەپێی ئەم دەقانە دەردەکەوێ کە بابای نەساغ نەساغی‌یەکەی هەرچۆنێك و هەرجۆرێکی بێت، مادام نەتوانێ بەپێوە نوێژەکەی بکات بۆی هەیە بەدانیشتنەوە بیکات، ئەگەر بەدانیشتنەوەش نەیتوانی لەسەر تەنیشت یان لەسەر پشت، بۆ ڕکووع و سەجدەش ئەگەر نەیتوانی بۆی هەیە بە ئاماژەکردن بیانکات و ئاماژەی کڕوونشەکەی لە ئی ڕکووعەکەی نزمتربێ.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (صَلِّ قائِماً فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقاعِداً فَـإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبِكَ) رواه الجماعة الا مسلماً و زاد النسائي: ( فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَمُسْتَلْقِياً). واتـە: بەپێوە نوێژێ بکە، ئەگەر نەتتوانی بەدانیشتنەوە ئەگەر نەتتوانی لەسەر تەنیشتت، (نَسائي) ئەمەشی هێناوە: (ئەگەر هەر نەتتوانی لەسەر پشت).

دەربارەی ڕکووع و سەجدەش فەرموویەتی: (صَـلِّ علـى الأرضِ إنْ اسْـتَطَعْتَ، وإلاّ فَأَوْمِيء إيماءً واجْعَلْ سُجودَكَ أخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ) رواه البيهقي، واتە: ئەگەر توانیت لەسەر زەوی نوێژ بکە – مەبەست ڕکووع و سەجدە بردنە – ئەگەرنا بە ئاماژەکردن ئاماژە بکە – بۆ ڕکووع و سەجدە – وە با کڕنووشەکەت لە ڕکووعت نزمتربێت[٢٢٧].

---

[٢٢٧] بڕوانە: (المجموع) ج[illegible] ص٢٦٦ – ٢٧٢ (باب صلاة المريض) وە بڕوانە (فقه السنة) ج١ ص٣٠٠ – ٣٠١.

٥- نوێــژی جومعــە: خوا یاربێ لەژێر چوار سەرباس دا باسی ڕۆژی جومعە و نوێژو وتاری جومعە دەکەین:

## یەك: گەورەیی ڕۆژی جومعە و ئادابەکانی جومعەکردن:

أ- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خَيْرُ يومٍ طلعَتْ فيه الشَّمْسُ يومُ الجمعةِ فيه خُلِقَ ادمُ عليه السلام، و فيهِ أُدْخِلَ الجنةَ، و فيهِ أُخْرِجَ منها، ولا تقومُ السـاعَةُ الاّ في يَـوْمِ الجُمُعَـةِ) رواه مسلم وابوداود و النسائي والترمذي وصححه، واتـه: چاکترین ڕۆژ کەخۆر تێیدا هەڵهاتوە ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا ئادەم علیه السلام دروست کراو، هەر لەویش دا خرایە بەهەشتەوە و لەویش دا لە بەهەشت وەدەرنرا، وە قیامەتیش بەس لەو ڕۆژەدا بەرپا دەبێ.

ب-وە سوونەتە لە شەو و ڕۆژی جومعەدا زۆر صەڵەوات و سەلام بۆ پێغەمبەر ﷺ بنێردرێ و سوورەتی (الکهف) یش بخوێندرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مِنْ أفضلِ أيّامِكُمْ يوم الجُمُعَةِ فيه خُلِقَ آدَمُ و فيهِ قُبِضَ وفيهِ الصَّعْقَةُ فأكْثِروا علـيَّ مِـنَ الصَّـلاةِ فيهِ فَإنَّ صَلاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ...) رواه الخمسة الا الترمذي، واته: لە چاکترین ڕۆژانتان ڕۆژی جومعەیە ئادەمی تێدا دروست کراوە و تێیدا گیانی کێشراوە و لە هۆش خۆچوون - ی دوای فووی یەکەم - یش هەر لەودا دەبێ، جا لەو ڕۆژەدا زۆرم صەڵەوات بۆ بنێرن چونکە صەڵەواتی ئێوە دەگاتە من.

هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ قرأ سـورةَ الكَـهْفِ في يـومِ الجُمُعَـةِ أَضـاءَ لَـهُ النُّـورُ مـابَيْنَ الجُمعتَيْنِ) رواه النسائي والبهقي والحاكم، واتـە: هەرکەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سوورەتی (الکهف) بخوێنێ ئەوە ڕووناکی نێوان هەردووك جومعەکانی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە. (دیارە مەبەست ڕووناکی ئیمان و چاکە و طاعەت و پاداشتە).

ج- خۆشـۆردن و بـەرگ و پۆشـاکی چـاك و پـاك پۆشـین و خۆپاککردنـەوە و خـۆ بۆنخۆشکردن و سیواك کردنیش لە ئاداب و سوننەتە بەرزەکانی ڕۆژی جومعەن بۆ هەرکەسێك کە جومعەبکات، فەرموودەش لەو بارەوە زۆرن بۆ وێنە: *(علـىٰ كُـلِّ مُسْـلِمٍ الغُسْلُ يومَ الجُمُعَةِ و يَلْبَسُ مِنْ صالحِ ثِيابه، وانْ كانَ لَهُ طيبٌ مَـسَّ مِنْـهُ) رواه احمد والشيخان، واته: خۆشۆردنی ڕۆژی جومعە لەسەر هەر مسوڵمانێك پێویستە، وە دەبێ لە پۆشاکی چاکی خۆی بپۆشێ و ئەگەر بۆنی خۆشیشی هەبێ دەستی بگەیەنێتێ.

*(حَقٌّ علىٰ كُلِّ مسلم الغُسْلُ والطِيبُ والسِّواكُ يومَ الجمعةِ) رواه احمد بسند صحيح.

واته: خۆشۆردن و بۆنی خۆش و سیواك كردن لەسەر هەر مسوڵمانێك پێویستە لە ڕۆژی جومعەدا.

د-وە بێجگە لە ئیمام بۆ نوێژکەران سوننەتە کە ڕۆژی جومعە زوو بچنە مزگەوت، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (هەرکەسێك ڕۆژی جومعە وەك خۆشۆردنی لەش پیسی لە خۆدەرکردن خۆی بشوات و پاشان بچێتە مزگەوت وەك ئەوە وایە حوشترێکی کردبێتە قوربانی، وەهەر کەسێك لە سەعاتی دووەم دا بچێتە مزگەوت وەك ئەوە وایە مانگایەکی کردبێتە قوربانی، وە هەرکەسێك لەسەعاتی سێیەم دا بچێ وەك ئەوە وایە بەرانێکی قۆچداری کردبێتە خێر، وە ئەوەی لە سەعاتی چوارەم دا بچێ وە مریشکێکی کردبێتە خێرو سەری‌بڕی بێ وە ئەوەی لەسەعاتی پێنجەم دا بچێ وەك ئەوەیە کە هێلکەیەکی کردبێتە خێر، دوای ئەوەش کە ئیمام - بەرەو مزگەوت - دەرچوو فریشتەکان ئامادە دەبن و گوێ‌لە زیکر دەگرن) رواه الجماعة الا ابن ماجة.

هـ- وە زانایان بە حەرام یان لانی کەم بە ناپەسند (مكروه) یان زانیوە کە ئینسان لە ڕۆژی جومعەدا بەسەر شان و ملی خەڵکی هەنگاو بنێ و بەرەو ڕیزەکانی پێشەوە بچێ، (عبدالله بن بسر) خوا لێی ڕازی دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژی جومعەدا لە کاتێك دا هەنگاوی دەنا. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (إِجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ وَآنَيْتَ) رواه ابوداود والنسائي واحمد و صححه ابن خزيمة، واتە: دانیشە چونکە بێگومان خەڵکت ئازارداو دواش کەوتووی!.

بەڵام ئیمام لەو حوکمە هەڵاوێردراوە، چونکە (بخاري و نَسائي) گێڕاویانەتەوە کە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بۆ کارێکی پێویست بەسەر ملی خەڵکی‌دا هەنگاوی هەڵێناوە و چووە بۆ ژووری یەکێك لە هاوسەرەکانی[٢٢٨].

## دوو: حوکمی نوێژی جومعە و کات و شوێنی عوزرەکانی نەکردنی و ژمارەی بەرپاکەرانی:

ا-حوکمی نوێژی جومعە: خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿يا أيها الذين آمنوا اذا نُودِيَ للصَّلاةِ مِنْ يومِ الجمعةِ فَاسْعَوْا الىٰ ذِكْرِ اللهِ و ذَرُوا البَيْعَ ذٰلكُمْ خيرٌ لكُمْ اِنْ كنتم تعلمُونَ﴾ الجمعة - ٩ - واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەر کات لە ڕۆژی جومعەدا بانگ کرا

---

[٢٢٨] بڕوانە: (فقه السنة ج١ ص٣٢٦)

بۆ نوێژ دەست و برد بەرەو زیکری خوا بچن و دەست لە کرین و فرۆشتن هەڵگرن، ئەگەر بزانن ئا ئەوەتان بۆتان باشترە. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ) رواه مسلم واحمد والنسائي، واته: بە تەئکید کۆمەڵانێك -کە نوێژی جومعە ناکەن بەبێ عوزر- ئەگەر واز لە نەکردنی نوێژی جومعان نەهێنن خوا دڵیان مۆردەکات و پاشان دەچنە ریزی بێئاگایانەوە.

ب-نوێژی جومعە لەسەر کێ پێویستە؟ زانایان سەرجەم یەکدەنگن کە نوێژی جومعە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی نێرینەی ئازادی عاقڵ و باڵغ و نیشتەجێ و توانادار لەسەر رۆیشتن بۆ مزگەوت کە هیچ کام لەو عوزرانەی نەبێ کە نەچوونە جومعە موباح دەکەن، فەرزە و چواندنی نوێژی جومعە بەبێ هۆ یەکێکە لە تاوانە زلەکان، بەڵێ نوێژی جومعە کە دوو رکاتە فەرزی عەینە لەسەر هەر مسوڵمانێك کە ئەو سیفەتانەی سەرەوەی تێدابن.

ج- ئەوانەی نوێژی جومعەیان لەسەر پێویست نیە:

یەکەم: ئافرەت (المرأة).

دووەم: منداڵ (الصبى).

سێیەم: نەخۆش

چوارەم: ئەو کەسەی کە نەخۆش یەکی لەسەری کەوتوە کە لەلای بێت بۆ خزمەت کردن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلَّا أَرْبَعَةً:عَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَوْ إِمْرَأَةٌ أَوْ صَبِيٌّ أَوْ مَرِيضٌ) قال النووي اسناده صحيح على شرط الشيخين و قال الحافظ ابن حجر : صححه غير واحد.

پێنجەم: رێبوار (المسافر) هەرچەندە لە کاتی بەرپاکردنی نوێژەکەش دا دابەزیبێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە راشیدەکانیش هیچ کاتێك لە سەفەرێدا نوێژی جومعەیان نەکردوە، تەنانەت لەحەجیماڵئاوایی (حجه الوداع)ش دا کە رۆژی جومعە و راوەستان لە عەرەفات یەکیان گرتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەرۆ و عەصری بە کورت کراوەیی و پێش خستن پێکەوە کرد و جومعەی نەکرد، وەك لە هەموو کتێبەکانی (سيرة) دا هاتووە.

شەشەم: قەرزدارێک کە توانای قەرزدانەوەی نەبێ و لە حەپس کران بترسێ[٢٢٩].

حەوتەم: کەسێک کە لە کاربەدەستێکی ستەمکار خۆی حەشار دابێ[٢٣٠].

هەشتەم: هەموو ئەوانەی کە مۆڵەت دەدرێن نەیەن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ لەبەر باران و سەرما و قوڕو چڵپاو، چونکە وەك (ابوداود وابن ماجه) گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە.[٢٣١]

<u>تێبینی:</u> هەموو ئەوانەی کە نوێژی جومعەیان لەسەر فەرز نیە هەرکاتێك کردیان ئەوە بۆیان بەردەکەوێ و پاداشتیان هەیە، بەڵام لەسەر نەکردنی گوناحبار نابن، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیش دا ئافرەتان و منداڵان هەر هاتوون بۆ مزگەوت و نوێژی جومعەیان کردوە.

د- کاتی کردنی جومعە: زۆربەی جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە کاتی جومعەکردن هەرکاتی نوێژی نیوەڕۆیە بەبێ جیاوازی چونکە (انس) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە: (كَانَ ﷺ يُصَلِّي الجُمُعَةَ إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ) رواه البخاري وابو داود والترمذي واحمد والبيهقي، واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك نوێژی جومعەی دەکرد کە ڕۆژ - لە نێوەڕاستی ئاسمان - لای دەدا.

بەڵام (اسحاق) و حەنبەلیەکان دەڵێن: کاتی جومعەکردن بریتیە لە سەرەتای کاتی نوێژی جەژن هەتا کۆتایی کاتی نوێژی نیوەڕۆ بەڵام بێگومان ڕای جەماوەر چاکتر و بەهێزترە.

هـ- شوێنی تێداکردنی جومعە: جومعە لە هەموو ئاوەدانیەك دا کە دانیشتوانی نیشتەجێن چ گوند چ شار دروستە بکرێ، چ لە مزگەوت دا کە بێگومان باشترە و چ لە دەشت و سارایەکی سەر بەو ئاوەدانی یەدا، چونکە (عمر بن الخطاب)

---

[٢٢٩] چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْهُ فلا صلاةَ لَهُ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ، قالوا يا رسولَ اللهِ وما العُذْرُ؟! قال: خَوْفٌ أَوْ مَرَضٌ) رواه ابوداود باسناد صحيح.

[٢٣٠] وەك پێشوو.

[٢٣١] (عن ابي مليح عن أبيه أنه شهد النبي ﷺ في يوم جمعة وأصابهم مَطَرٌ لم تَبْتَلَّ أَسْفَلَ نِعَالِهِمْ فأَمَرَهُمْ أَنْ يُصَلُّوا في رِحَالِهِمْ) رواه ابوداود و ابن ماجة، بروانە (فقه السنة) ج١ ص ٣٢٩

خوا لێی ڕازی‌بێ لە نامەیەك دا كە بۆ خەڵكی (بحرين) ی نووسیوە نووسیویەتی: (أَنْ جَمِّعُوا حَيْثُمَا كُنْتُمْ) رواه ابن ابي شيبة و قال احمد: اسناده جيد: واتە: لە هەرجێیەكی هەن جومعە بكەن. هەروەها (بخاري وابوداود) لە (ابن عباس) خوا لێی ڕازی‌بێ دەگێڕنەوە: (أَنَّ أَوَّلَ جُمْعَةٍ جُمِعَتْ فِي الأَسْلامِ بَعْدَ جمعةٍ جُمِعَتْ في مَسْجِدِ رسولِ الله ﷺ بالمدينةِ لجمعة جُمِعَتْ بـ "جُوائي". (قرية من قرى البحرين)، واتە: یەكەمین جومعەیەك كە لە ئیسلام دا كرابێ لە دوای جومعەیەك كە لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینەدا كرا، ئەو جومعەیە بوو كە لە (جەوائی) كرا، جەوائیش ئاوەدانیەكە لە ئاوەدانی‌یەكانی بەحڕێن.

و- ئەو ژمارەیەی كە نوێژی جومعەیان پێ‌دەكرێ: زانایان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كە بە كۆمەڵ كران مەرجی جومعەیە، بەڵام لەسەر ئەوە كە دەبێ ژمارەی ئەوانەی جومعە دەكەن چەند بێ زانایان كەوتوونەتە جیاوازی بیروڕاوە، تەنانەت (ابن حجر) لە كتێبی: (فتح الباري: شرح صحيح البخاري) دا پازدە (١٥) مەزەب و بیروڕای زانایانی لەو بارەوە هێناون، بەڵام ئەوەی پێ‌دەچێ لە هەموویان ڕاست تر بێت ئەوەیە كە جومعەش وەك باقی نوێژەكانی دیكە كە بە كۆمەڵ دەكرێن بە دوو كەس بەرەو سەر دەكرێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی نوێژی جومعە فەرموویەتی: (الجُمُعَةُ حَقٌّ واجِبٌ علَى كل مسلم في جَمَاعَةٍ) وەك پێشتر باسمان كرد، ئینجا هەر ئەویش واتە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو كەس و زیاتری بە كۆمەڵ (جماعة) داناوە بۆ نوێژەكانی دیكە.

كەواتە: جومعەش بە دوو كەس و زیاتر ئەنجام دەدرێ، وە هیچ فەرموودەیەكی (صحيح) و بگرە (حسن) یش لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتوە كە ژمارەیەكی دیاریكراوی وەك (٧٠ ، ٤٠ ، ٣٠ ، ... هتد) كردبێتە مەرجی جومعەكردن[٢٣٢]. دیارە ئەم ڕایەش ژمارەیەكی زۆر لە زاناو پێشەوایان لەسەری یەكدەنگن بۆ وێنە: ( طبري و داود و نخعي و ابن حزم و ابن تيمية و ابن القيم و سيوطي و شوكاني و قنوجي[٢٣٣].

---

[٢٣٢] سیوطی لەو بارەوە گوتوویەتی: (لَمْ يَثْبُتْ في شَيْءٍ مِنَ الأَحادِيثِ تَعْيِينُ عَدَدٍ مَخْصُوصٍ) بڕوانە (فقه السنة) ج١ ص ٢٣١.

[٢٣٣] بڕوانە (المحلى [illegible] ٤٢ [illegible] ٢٢٧.

## سێ: وتارەکانی ڕۆژی جومعە:

ا-حوکمی وتاری جومعە: زۆربە و جەماوەری زانایان وتاری جومعە بە فەڕز دەزانن و بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەك لە چەندان فەرموودەی (صحیح) دا هاتوە بەردەوام لە هەموو ڕۆژانی جومعەدا - ئەگەر جومعەی کردبێ - وتاری داوە، هەروەها ئایەتی: ﴿ يا ايها الذين أمنوا اذا نودي للصلاة من يوم الجمعة فاسعوا الى ذكر الله..﴾ ش بە بەڵگە دێننەوە و دەڵێن مەبەست لە (ذكرا لله) وتاری جومعەیە چونکە یادی خوای هەر تێدایە، هەندێکیش لە زانایان وەك (ابن حزم) و (داود الظاهري) و( جويني) و (شوكاني) بە سوننەتی دەزانن[٢٣٤].

ب-وتاری جومعەو چۆنیەتی و نێوەڕۆکی:

١)سەرەتا پێویستە ئیمام کە سەرکەوتە سەر مینبەر ڕوو بکاتە خەڵکەکە و سەلامیان لێبکات، ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:

*(عن جابر رضی الله عنه أن النبيَّ ﷺ اِذا صَعِدَ المِنْبَرَ سَلَّمَ) رواه ابن ماجه.

*( وفي مراسيل عطاء و غيره أنه ﷺ كان اذا صَعِدَ المِنْبَر أقْبَلَ بِوَجْهِهِ على الناس ثم قال: السلام عليكم. قال الشعبي: كان ابوبكر و عمر يَفْعَلانِ ذلك).

*(النداء يوم الجمعة أوله اذا جلس الأمام على المنبر، علـى عَهْدِ رسول الله ﷺ وأبوبكر و عمر، فلمّا كانَ عثمان و كَثُرَ الناسُ زادَ النِّداءَ الثالِثَ على الزَّوْراءِ، ولم يَكُنْ للنبيِّ ﷺ مؤذِنٌ غير واحدٍ) رواه البخاري والنسائي وابو داود، واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خواو ﷺ ئەبووبەکر و عومەردا سەرەتای بانگ ڕۆژی جومعە ئەو کاتە بوو کە ئیمام لەسەر دوانگە دادەنیشت، بەڵام لە سەردەمی عوسمان دا کە خەڵك زۆر بوو بانگی سێیەمی لەسەر زەوراء زیاد کرد. وە پێغەمبەر ﷺ بەس یەك بانگ بێژی هەبوو. (مەبەست لەو سێ بانگە بانگی یەکەم و دووەم و قامەت کردنە).

*(كان بِلالُ يُؤَذِّنُ اذا جَلَسَ النَبيُّ ﷺ علىُ المِنْبَرِ ويُقِيمُ اِذا نَزَلَ) رواه احمد والنسائي، واتە: بیلال کاتێك بانگی دەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە دادەنیشت و کە دەهاتە خوار قامەتی دەکرد.

---

[٢٣٤] بڕوانە: (فقه السنه ج١ ص٢٣١، و بڕوانە [illegible] الندية ج١ ص[illegible]).

٢)دیارە وتاری جومعەش دوانن[٢٣٥] و بەپێوە دەدرێن و ئیمام لە نێوانیان دا سووکە دانیشتنێك دەکات، ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:

*(عن ابن عمر رضی الله عنهما: قال : كانَ النَبيُّ ﷺ يَخْطُبُ يومَ الجُمُعَةِ قائِماً ثم يَجْلِسُ ثُمَّ يَقومُ كما يفعلونَ اليَوْمَ) رواه الجماعة، واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جومعە بەپێوە وتاری دەدا پاشان دادەنیشت، دوایی هەڵدەستایەوە، وەك چۆن ئەمڕۆ دەیکەن.

*(عن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: كانَ النَبيُّ ﷺ يَخْطُبُ قائِماً ثُمّ يَجْلِسُ ثم يَقُومُ فيخطبُ قائِماً، فمَنْ قال أنه يخْطُبُ جالِساً فقَدْ كَذَبَ..) رواه احمد و مسلم وابوداود.

*(وروى ابن أبي شيبة عن طاوس قال: خَطَبَ رسولُ اللهِ ﷺ قائِماً وابوبكر و عمر و عثمان، وأولُ مَنْ جَلَسَ علىٰ المِنبَرِ معاوِيةُ) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە وتاریدا، هەروەها ئەبووبەکر و عومەر و عوسمانیش – خوا لێیان ڕازیبێ – وە یەکەمین کەس کە لەسەر مینبەر دانیشت – بۆ وتاردان – موعاویە بوو.

٣)ئینجا هەرچەندە حیکمەتی دانرانی وتارەکانی جومعە ئامۆژگاری کردنی مسوڵمانان و بیرخستنەوەیان و بەرچاو ڕوون کردنەوەیانە بەهۆی قورئان بە سەردا خوێندنەوەیان و زیکری خوای پەروەردگارەوە، بەڵام سوننەتە و پەسندە کە سوپاس و ستایشی خواو صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ و مەدح کردنی خۆی و هاوەڵانی و بنەماڵەی و شوێن کەوتووانی ڕاستەقینەیشی نێواخن بکات، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت دەربارەی حەقیقەت و نێوەڕۆکی وتارەکانی جومعە:

*(عن جابرِ بن سمرةَ رضي الله عنه قال: كان رسولُ اللهِ ﷺ يَخْطُبُ قائِماً و يَجْلِسُ بَيْنَ الخطبتينِ ويقرأُ اياتٍ ويذكِّرُ الناسَ) رواه الجماعة الا البخاري والترمذي.

*(كُلُّ كَلامٍ لا يُبْدَأُ فيها بِالحَمْدِ للهِ فَهُوَ أَجْذَمُ) رواه ابوداود، واتە: هەر قسەیەك بە ستایشی خوا دەستیپێنەکرێ ئەوە قسەیەکی گول – گەڕ – ە.

*(الخُطبةُ التي لَيْسَ فيها شَهادَةٌ كالْيَدِ الجذماءِ) رواه احمد وابوداود والترمذي و قال: (تشهد) بدل (الشهادة)، واتە: ئەو وتارەی کە شایەتمانی تێدا نیە وەك دەستی گول بوو وایە:(دیارە مەبەست لە شایەتمان (أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) یە.

---

[٢٣٥] ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە وەك (نووي) دەڵێ لە (المجموع) دا بڕوانە (ج٤ ص ٤٣٣). بەڵام لە (المغني والشرح الكبير) ج٢ ص – ١٥١ – دا دەڵێ ئەوە مەزهەبی شافیعی یە بەڵام (مالك و ئەوزاعی و اسحاق و ابوثور و ابن المنذر و اصحاب الرأي) [illegible]

*( عن ام هشام بنت حارثة بن النعمان رضي الله عنهما قالت: ما أَخَذْتُ "ق والقرآن المجيد) إِلّا عَنْ لِسانِ رسولِ الله ﷺ يَقْرأُها كُلَّ جُمُعَةٍ علىٰ المِنْبَرِ اذا خَطَبَ النّاسَ) رواه احمد و مسلم والنسائي وابوداود.

* (عن أبي بن كعب رضي الله عنه أن الرسول ﷺ قرأ يوم الجمعة "تبارك" وهو قائم يُذَكِّرُ بأيّامِ الله) رواه ابن ماجة.

وەك دەبينين هەركام لە (ام هشام) و (اُبَيّ بن كعب) خوا لێيان ڕازیبێ شایەدی دەدەن کە پێغەمبەری مەزن ﷺ لە وتارەکانیدا بەزۆری قورئانی خوێندوە و بۆ مسولمانانی ڕوون کردۆتەوە و لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئان دا ئامۆژگاری کردوون و بێداری کردوونەوەو بەرچاوی ڕوون کردوونەوە[٢٣٦].

٤)شێوازی وتاردانیش وەك لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەوێ ئەوەیە کە کورت و پوخت و پڕ مەعنابێت و، دواندەر (خطیب) یش بە گرنگی پێدان و دەنگی بەرز و بە جیددییەوە بیخوێنێتەوە، نەك بە ساردوسڕی و مردەلۆخەیی و بە منجە منج و قسەکانی بکاتە ڕیس و گوریس و سەروبنیان دیار نەبێ و هەر تیرە لە کەندالێك بدات، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەو بارەوە:

*(إِنَّ طِولَ صَلاةِ الرَّجُلِ و قِصَرَ خُطبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ فَأَطِيلُوا الصَّلاةَ وأَقْصِروا الخُطْبَةَ) رواه احمد و مسلم، واتە: بێگومان نوێژی درێژی پیاو و وتاری کورتی نیشانەی شارەزایی و تێگەیشتنن، دەجا نوێژتان درێژبکەنەوە و وتارتان کورت بێت: (ئاشکرایە کە مەبەست لە درێژکردنەوەی نوێژ ئەندازەیەکی ماقوولە کە لە دەقە شەرعییەکان دا دیاریکراوە نەك بەشێوەیەك کە ببێتە مایەی بێزارکردنی خەڵکی)

*(عن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: كانَتْ صَلاةُ رسولِ اللهِ ﷺ قَصْداً و خُطبتُهُ قَصْداً) رواه أحمد و مسلم والترمذي والنسائي، واتە: نوێژ و وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ ئاسایی و میانەبوون.

---

[٢٣٦] (نووي): لە (المجموع) دا دەڵێ: فەڕزەکانی وتار (خطبة) پێنجن: ١- ستایشی خوا کردن و، ٢- صەڵات لەسەر پێغەمبەر ﷺ و، ٣- ڕاسپاردن بە پارێزکاری (الوصية بالتقوى) و، ٤- قورئان خوێندن و، ٥- پاڕانەوە (الدعاء)، وە دەربارەی (الوَصِيَّة بالتقوى) گووتوویەتی: (الصحيح الذي نصَّ عليه الشافعي وقطعَ به الأصحاب والجمهور: لايَتَعَيَّنُ (اي لفظ الوصية بالتقوىٰ) بل يقوم مقامَهُ أيّ وَعْظٍ كانَ) بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٤٣٨. وە دەربارەی ڕای زانایانی دیکە سەبارەت بە فەڕزەکانی وتاری جومعە گووتویەتی: (و قال الأوزاعي واسحاق وابوثور و ابن القاسم المالكي وابو يوسف و محمد و داود، الواجب ما يقع عليه (اسم الخطبة) و قال ابو حنيفة يكفيه ان يقول: سبحان الله او بسم الله او الله أكبر أو نحو ذلك) (المجموع) ج[illegible] ص [illegible])

*(عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه قال: كَـانَ رَسُولُ الله ﷺ إذا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَ عَلاصَوتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُـولُ صَبَّحَكُمْ وَ مَسَّاكُمْ) رواه مسلم و ابن ماجه، واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە وتـاری دەدا چاوەکـانی سـوور هەڵدەگـەڕان و دەنگـی بەرزدەبۆوە و زۆر تووڕەدەبوو بەراددەیەك کە دەتگوت ورياکەرەوەی سوپايەکە پێيـان دەڵێ: ئەها بەرەبەيان دوژمن هاتە سەرتان و شەبەيخوونتان کرايە سەر.

٥)وە لـە کـاتی وتـاردان دا قسـەکردن حەرامـە و بـێدەنگی و گوێڕاگرتـن فـەرزە بـەپێی ڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانايـان، تەنانـەت فـەرمان بـە چاکـە و ڕێگـری لـە خراپەش لە کاتی وتارداندا دروست نيە، ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:

*(مَنْ تَكَلَّمَ يَومَ الجُمُعَةِ والإمامُ يَخْطُبُ فَهُوَ كَالحِمارِ يَحْمِلُ أَسْفاراً، والَّذي يَقُولُ لَهُ أَنْصِتْ! لا جُمُعَةَ لَهُ) رواه احمد وابن ابي شيبة والبزار والطبراني، قال الحافظ في بلوغ المرام: اسناده لا بأس به، واته: هەرکەسێك لە کاتێك کە ئیمام وتاردەدات قسە بکات ئەوە وەك کەرێکە کە بـارێك کتێبـی هـەڵگرتوون، ئـەو کەسـەش کـە پـێی دەڵـێ: بـێدەنگ بـە! ئـەويش جومعەکەی بەرناکەوێ!!

*(إذا قُلْتَ لِصاحِبِكَ يومَ الجُمُعَةِ والإمامُ يَخْطُبُ أَنْصِتْ فَقَدْ لَغَوْتَ) متفق عليه، واتـە: ئەگەر ڕۆژی جومعە لە کاتێك ئیمام وتار دەدات بە هاوەڵەکەتت گوت بێدەنگ بە! ئەوە قسەی پوچت کردوە!

تێبينی: شافيعی و ئەحمەد جياوازیيان خستۆتە نێوان حاڵێکەوە کە دەنگی وانـدەری تێدا دەبيسترێ و حاڵێك کە دەنگی نابيسـترێ و گوتوويانـە، لـە حاڵـەتی يەکەم دا قسەکردن حەرامـە بـەڵام لـە ئـی دووەم حـەرام نيـە هەرچـەندە بـێدەنگی و قسەنەکردن هـەر سوننەت و پەسندە، هـەروەها ژمارەيـەك لـە زانـاو پێشـەوايان وەك شافيعی و ئەحمەد و ئیسحاق مۆڵەتيان داوە کە وەڵامی سەلام بدرێتـەوە (تشميت) ی بابای پژميو بکرێ – واتـە دوای ئەوەی گوتـی: الحمد لله) پـێی بگوتـرێ: (يرحمـك الله)[٢٣٧]، ئینجا شايانی باسيشە کە لە غەيری کاتی وتاردان دا قسەکردنی پێويست دروستە. هەرچەندە هەرچۆن بێ بێدەنگی و ئارامی هەر چاکتر و پەسندترە.

---

[٢٣٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١، [illegible] ٣٤٧، هەروەها بڕوانە: (المجموع) ج٤، [illegible]

## چوار: چەند مەسەلەیەکی دیکەی پەیوەست بە جومعەوە:

أ-هەرکەسێك فریای ڕکاتێك لە نوێژی جومعە بکەوێ ئەوە پێویستە دوای سەلام دانەوەی ئیمام ڕکاتێکی دیکە بکات و نوێژی جومعەکەی تەواو دەبێ و بۆی بەردەکەوێ، بەڵام ئەگەر فریای کەمتر لە ڕکاتێك کەوت، ئەوە فریای نوێژی جومعە نەکەوتوە و پێویستە چوار ڕکاتی نیوەڕۆ بکات[238]، ئینجا سنووری نێوان فریاکەوتنی ڕکات و فریانەکەوتنیشی فریاکەوتنی ڕکووعە یان فریانەکەوتنیەتی[239]، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەو بارەوە:

*( عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النبيِّ ﷺ قال: "مَنْ أدرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلاةِ الجمُعَةِ فَلْيضِفْ إليها أُخْرى وقَدْ تمَّتْ صلاتُهُ) رواه النسائي وا بن ماجة والدارقطني.

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه أنَّ النبيَّ ﷺ قال: "مَنْ أدْرَكَ مِنَ الصَّلاةِ رَكْعة فقد أدرَكَها كلَّها) رواه الجماعة، واتە: هەرکەسێك بە ڕکاتێکی نوێژ ڕاگەیشت ئەوە بە هەمووی ڕاگەیشتووە.

ب-لە کاتی قەڵەباڵغی زۆردا دروستە نوێژکەران لەسەر پشتی یەکتر سەجدە بەرن، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە[240]، هەندێکیشیان دەڵێن: دەبێ بابای نوێژکەر چاوەڕێبکات هەتا قەڵەباڵغییەکە نامێنێ ئەوجار کڕنووش بەرێو، ئەگەر لەسەر پشتی یەکێکی دیکە سەجدە ببات بۆی بەرناکەوێ[241]، بەڵام بێگومان ڕای زۆربە بەهێزترە و ئەم دەقانەش بەبەڵگە دێننەوە:

*(اذا أمرتكم بأمْرٍ فأتوا منْهُ ما استطعتم) متفق عليه.

*(عن سيار قال: سَمِعتُ عمر وهو يخطُبُ يقول: إنَّ رسولَ الله ﷺ بَنَى هذا المَسْجِدَ و نَحْنُ معَهُ المهاجرونَ والأنصار، فإذا اشتدَّ الزحامُ فليَسْجُدِ الرجلُ منكُمْ علـى ظَهْرِ أخيه) رواه احمد والبيهقي باسناد صحيح[242]،

---

[238] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ١٨٦ تا ١٨٨، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٤٢.

[239] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٤٧٦ ، ٤٧٧، (نووي) دەڵێ: ئەمە ڕای (مالك و اوزاعي و ثوري و ابو يوسف و احمد و اسحاق و ابو ثور) ە وێڕای (شافعي)، بەڵام (ابو حنيفة) ڕای وایە مادام فریای تەحییات بکەوێ نوێژەکەی بەرکەوتوە - واتە نوێژی جومعە -.

[240] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٤٨٦ ، ٤٨٧، (نووي) دەڵێ: ئەمە جگە لە (شافعي) ڕای (ابو حنيفة و ثوري واحمد واسحاق و ابو ثور و داود و ابن منذر ) یشە.

[241] ئەمە ڕای (مالك) و ژمارەیەك لە زانایانە؛ بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٤٨٦ ، ٤٨٧.

[242] بڕوانە: (المجموع) [illegible] ص ٤٨[illegible] [illegible] (فقه [illegible]) [illegible] ص ٤٣٢

واتە: گوێم لە عومەر - خوا لێی ڕازیبێ - بوو وتاری دەدا دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم مزگەوتەی دروست کردو ئێمەش کۆچکەران و پشتیوانان لە خزمەتی بووین، جا هەرکات قەڵەباڵغی زۆر بوو با یەکێکتان لەسەر پشتی برایەکەی سەجدە بەرێ.

ج- نوێژی سوننەتی بەرو دوای جومعە: سەبارەت بە دوای جومعە سوننەتە دوو ڕکات یان چوار ڕکات بکرێن، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن ئەگەر لە مزگەوتی سوننەتی دوای جومعەی کرد وا باشە چوار ڕکاتان بکات، بەڵام ئەگەر لە ماڵێ کردی وا باشە دوو ڕکات بکات، ئەمەش دوو فەرموودە لەو بارەوە:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رَسولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ كانَ مِنكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ أرْبَعًا") رواه مسلم وابوداود والترمذي، واتە: هەرکامێکتان لە دوای جومعە نوێژی کرد با چوار ڕکاتان بکات.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي يَوْمَ الجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ في بَيْتِهِ) متفق عليه، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو ڕۆژی جومعە دوو ڕکات نوێژی لە ماڵێ دەکردن.

بەڵام لە پێش نوێژی جومعەدا بەرلەوەی ئیمام بچێتە سەر مینبەر ئەوە سوننەتێکی دیاریکراو نیە بەڵام بێگومان سوننەتی دەست نوێژ و سڵاوی مزگەوت (تحِيَّة المَسْجِد) ئەوە هەموو دەمێ هەر هەن و، ئەوەندەی بشتوانێ نوێژی سوننەت بکات یان قورئان بخوێنێ و یادی خوا بکات با بیکات و شتێکی چاك و پەسندە، بەڵام دوای ئەوەی ئیمام چووە سەر مینبەر و دەستی بە وتار کرد ئەوە زانایان بۆ مەسەلەی سوننەتی سڵاوی مزگەوت ڕایان جیاجیایە، زۆربەیان وەك: شافیعی و سفیان بن عیینة و ابو ثور و احمد و اسحاق و ابن منذر و داود .. دەڵێن: هەر سوننەت و پەسندە بکرێ، بەڵام مالك و لَيْث و ثَوْرِي و ابو حنیفة دەڵێن نابێ بیکات[٢٤٣]، دیارە ڕای زۆربەش بەهێزترە کە بە چەندان فەرموودەی (صحيح) ڕایەکەیان پشت قایم دەکەن، بۆ وێنە:

*(إذا جاءَ أحَدُكُمْ والأمامُ يَخْطُبُ فلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ) متفق عليه. واتە: هەرکات یەکێکتان هات -ە مزگەوت - و ئیمام وتاری دەدا با دوو ڕکاتان بکات - بەرلەوەی دابنیشێ - .

---

[٢٤٣] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) [illegible]

*(إذا دَخَلَ أَحَدُكُم المَسْجِدَ فلا يَجْلِسْ حَتّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ) متفق عليه، واتـه: هـەركات یەکێکتان هاتە ژووری مزگەوت با هەتا دوو ڕکات نوێژ نەکات دانەنیشێ .

<u>تێبینی</u>/ کەواتە: هەموو ئەو شتانەی کە بەر لە چوونە سەر مینبەری ئیمام و دەست بە وتارکردنی دەگوترێن و دەکرێن بۆ وێنە: کە دەگوترێ: (صَلُّوا سُنَّةَ الجُمُعَةِ) ئەوە هەموو شتی داهێنراون و پێچەوانەی سوننەتن[٢٤٤].

د- سـوننەتە لـە نوێـژی جومعـەدا لـە ڕکـاتی یەکـەم دا دوای فاتیحـە سـوورەتی (الجمعة) و لە ڕکاتی دووەمیش دا دوای فاتیحە (المنافقون) بخوێنێ، یان لـەجیاتی ئەم دوو سورەتە سورەتی (الأعْلىٰ) و (الغاشِية) بخوێنـێ. لـە چـەند فەرموودەیـەکی (صحيح) دا ئەمـە بـاس کـراوە کـە (مسـلم و أحمـد و أبـو داود و ترمـذي و نسـائي) گێڕاویاننەوە[٢٤٥].

هـ- سوننەتە ئیمام لەسەر دوانگە (منبر) یان هـەر شتێك و شوێنێکی دیکەی بڵند وتار بدات، چونکە ئاوا دەنگی زاڵتر دەبێ و چاکتر دەگاتە گوێگران، دیارە وتاردانی پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەندان فەرموودەی (صحيح) دا هاتوە[٢٤٦] بەوجۆرە بووە .

و- هـەرکات نوێـژی جومعە و نوێـژی یەکێك لـە دوو جەژنـەکان کـەوتنـە ڕۆژێکـەوە ژمارەیەك لە زاناو پێشەوایان ڕایان وایە کە نوێـژی جەژن دەکەوێتە بری جومعەش بێجگە لە ئیمام کە ئەو هەر دەبێ نوێژی جومعەش بکات بۆئەوەی ئەوانەی لـەنوێژی جەژن دواکەوتوون جومعەکەیان نەچێ، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە نوێـژی جەژن بەدیلی جومعە نییەو دەبێ جومعە هـەربکرێ[٢٤٧]، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە فەرموودەیـەکی (صحيـح) پشـتگیری ڕای یەکـەم دەکـەن، ئـەو ڕایـە پەسـند تـر و وێچووترە، یەکێك لەو فەرموودانەش ئەمەیە: (عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ أنه قال: قَدْ اجْتَمَعَ في يَوْمِكُمْ هذا عِيدانِ فَمَنْ شاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الجُمُعَةِ وإنّا مُجَمِّعُونَ) رواه ابو داود و ابن ماجه، واتـه: لـەم ڕۆژەتـان دا دوو جـەژن کۆبوونەتـەوە، جا هـەر کەسـێك

---

[٢٤٤] دیارە شت لە ئایین دا داهێنان (الإبْتِداع في الدِّين) یش بە زۆری لە بوارەکانی عەقیدە و عیبادەت دایە، چونکە هەر شتێ: لەو دوو بوارەدا زیاد بکرێ، هەر بیدعەتە و بیدعەتیش هەمووی خراپە.

[٢٤٥] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٤٥٠ ، ٤٥١، وە : (المغني والشرح الكبير) ج٢ ص ١٥٧ ، ١٥٨.

[٢٤٦] بۆ وێنە ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري و ابو داود) لە (السائب بن يزيد) یان گێڕاوەتەوە.

[٢٤٧] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ ص٢١٢، وە بڕوانە (نيل الأوطار) ج٣ ص٣٤٧.

حەزدەکات - نوێژی جومعە نەکات - ئەوە نوێژی جەژنی بۆ وەبری جومعەش دەکەوێ، بەلاّم ئێمە خۆمان جومعەش دەکەین.

ز- دروستە کە ئیمام لەکاتی وتاردان دا لەبەر پێویستی وتارەکەی ببڕێ و قسەی دیکە بکات، یان وەلاّمی بابای پرسیارکەر بداتەوە، تەنانەت دروستە لەسەر دوانگەش بێتە خوارێ، بەڵگەی ئەمەش چەند دەقێکی (صحیح) ی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ،بۆ وێنە:

*(ابو بريدة) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی وتاردان دا لە مینبەر هاتۆتە خوارێ و (حَسَن و حُسَيْن) ی کچەزای بە باوەش هەڵگرتووە و لەلای خۆی داینـاون، ئەم فەرموودەیە (مسلم و أبو داود و نسائي و ترمذي و ابن ماجة) گێڕاویانەتەوە.

*(ابو رفاعة العدوي) یش خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە کە لە دەمی وتاردان دا چۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێکردوە، ئەویش دابەزیوە و لەسەر کورسییەك دانیشتوە و وەلاّمی داوەتەوە، پاشان وتارەکەی تەواوکردوە، وەك (مسلم و نَسائي) لێیەوە گێڕاویانەتەوە.

## ٦- کاتی پێنج نوێژە فەڕزەکان:

خوای زاناو پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿حافِظوا علىٰ الصَّلَواتِ والصَّلاةِ الوُسْطى وقُومُوا لِلهِ قـانِتينَ﴾ البقرة - ٢٣٨ - واتە: پارێزگاری لە نوێژەکانتان بکەن وە - بەتایبەت - نوێژی نێوەڕاست، وەبە مل کەچی بۆ خوا بوەستن. توێژەرەوانی قورئان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە مەبەست لە (الصلوات) پێنج نوێژە فەڕزەکانن و زۆربەشیان دەڵێن: مەبەست لە (الصلاة الوُسْطىٰ) نوێژی ئێوارەیە[٢٤٨].

هەروەها خوای کاربەجێ و پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿إنَّ الصلاةَ كانَتْ علىٰ المُؤمِنِينَ كِتاباً مَوْقوتـاً﴾ النساء - ١٠٣ - ، واتە: بێگومان نوێژ لە چەند کاتێکی دیاریکراودا لەسەر بڕواداران پێویست کراوە.

جا ئێمە لێرەدا دوو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کاتی پێنج نوێژەکان بە نموونە دێنینەوە بەلاّم یەکسەر وەریان دەگێڕینە سەر کوردی:

---

[٢٤٨] عن ابن مسعود رضى الله عنه قال: حَبَسَ المُشْرِكون رسولَ اللهِ عَنْ صَلاةِ العَصْرِ حتَّى احْمَرَّتِ الشَّمْسُ وَاصْفَرَّتْ، فقال رسولُ الله ﷺ: (شَغَلونا عنِ الصلاةِ الوسْطىٰ، صَلاةِ العَصْرِ، مَلأَ اللهُ أجْوافَهُمْ، و قُبُورَهُمْ نـاراً) رواه احمد و مسلم و ابن ماجة.

أ-(کاتی نوێـژی نیـوەڕۆ دوای لادانـی خـۆرە - لـە نێوەڕاسـتی ئاسمـان - وە دەخایەنێ هەتا سێبەری پیاو هێندەی خۆی لـێدێ و هـەتا کاتی نوێـژی ئێوارە دێ، وە کاتی نوێژی ئێوارە دەمێنێ - مادام ڕۆژ زەردهەڵنەگەڕابێ، وە کاتی نوێژی شێوان - دوای ڕۆژئاوابوون - هەتا نەمانی سوورایی ئاسۆیە، وە کاتی نوێژی خەوتنان هەتا نیوەی یەکەمی شەوە، وە کاتی نوێژی بەیانی لە سپێدەی بەرەبـەیان هـەتا هەڵهاتنی ڕۆژە، جا هەرکات ڕۆژ هەڵهات واز لە نوێژکردن بێنە، چونکە لەنێوان دوو شاخ - قۆچ - ی شەیتانەوە هەڵدێ). مسلم گێڕاویەتەوە.

ب-(جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە کە (جبريل) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: هەڵسە نوێژ بکە: ئەویش نوێژی نیوەڕۆی کرد لە کاتێك کە ڕۆژ لای دابوو، پاشان ئێوارە هاتە لای و پـێی فەرموو: هەسـتە نوێـژ بکـە! ئـەویش نوێـژی عەصری کرد لە کاتێکدا کە سێبەری هەر شتێك هێندەی خۆی لـێهاتبوو، ئینجا کاتی شێوان هاتە لای و پێی گوت: هەستە نوێژ بکە! ئەویش نوێژی شێوانی کرد لە کاتێك دا کە ڕۆژ ئاوابوو بوو، دوایی کاتی عیشا هاتە لای و پێی فەرموو: هەستە نوێژ بکە! ئەویش نوێژی خەوتنانی کرد لە کاتێك دا کە سوورایی ئاسۆ نەمابوو، پاشان بەیانی هاتەلای کاتێك سپێدەی بەیانی دابوو - یان گوتی: شەبەقی بەیانی دابوو -، ئینجا بۆ سبەینێ کاتی نیوەڕۆ هاتـە لای و پـێی گـوت: هەسـتە نوێـژ بکـە! ئـەویش نوێـژی نیوەڕۆی کرد کاتێك سێبەری هـەر شـتێك هێنـدەی خـۆی لـێهاتبوو، دوایـی کـاتی عەصر هاتە لای و پـێی فەرموو: هەستە نوێـژێ بکە ئەویش نوێـژی عـەصری کـرد کاتێك کە سێبەری هەر شتێك دوو هێندەی خۆی لێهاتبوو، دوایی شێوان هاتە لای و بەس یەك کات بوو لـێی لانەدا، ئینجا عیشا هاتە لای کاتێك کە نیـوەی شـەوگار ڕابردبوو، یان گوتی سێیەکی شەو، ئەویش - ئەوکاتە - نوێژی خەوتنانی کرد، دوایی کاتێك هاتە لای کە بەتەواوی بەرەبەیان ڕۆشن بووبوو، فەرمووی: هەستە نوێـژ بکـە ئەویش نوێژی بەیانی کرد دوایی - جبريل - فەرمووی: (ئەوەی دەکەوێتە نێوان ئەم دوو کاتەوە کاتی نوێژکردنە) . (أحمد و نسائي و ترمذي) گێڕاویانەتەوە، وە (بخاري) گوتوویەتی: (ئەم فەرموودەیە ڕاست ترین شتە لەبارەی کاتی کردنی نوێژەکانەوە).

وەك دەبینین پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لەم دوو دەقە گوتەیی و کردەییەیدا سەرەتا و کۆتایی کاتی هەڵبژاردە (وَقْتُ الاخْتِيار) و کاتی دروست بوون (وَقْتُ الجَواز) ی هەر پێنج نوێژە فەرزەکانی زۆر بە وردی بۆ ئۆمەتەکەی دیاریکردوە و، هیچ تـەم و مژێکی بەسەر ئەو بابەتەوە نەهێشتوە.

## ٧- نوێژی بەکۆمەڵ (صلاة الجماعة)

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست ! خوا یاربێ لەژێر سێبەری سێ (٣) سەرباس دا بابەتی نوێژی بەکۆمەڵ بەکورتی لە هەموو ڕوویەکەوە دەتوێژینەوە، بەم جۆرە:

**یەك**: پلەوپایەو حوکمی نوێژی بەکۆمەڵ: فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی گەورەیی پلەوپایەی بەرزی نوێژی بەکۆمەڵ زۆرن. بۆ نموونە:

*(**صَلَاةُ الجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَ عِشْرِينَ دَرَجَةً**) رواه البخاري و مسلم عن ابن عمر رضی الله عنهما، **واتە**: نوێژی بەکۆمەڵ لە نوێژی تاك بە بیست و حەوت پلە چاکترە.

*(**مَنْ صَلَّى العِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَ مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ**) رواه احمد و ملسم وابو داود والبيهقي، **واتە**: هەرکەسێك نوێژی خەوتنان بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە نیوەی شەو شەونوێژی کردبێ، وە هەرکەسێك نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە هەمووشەوێ شەونوێژی کردبێ. دەربارەی حوکمی نوێژی بەکۆمەڵیش زانایان ڕای جیاجیایان هەن بەڵام بەگشتی سێ ڕایان هەن:

زۆربەیان[٢٤٩] بە سوووننەتێکی داکۆکی لێکراو (سنە مؤكدة) ی دەزانن، هەندێکیشیان بە فەرزی کیفایەی دەزانن و[٢٥٠]، هەندێکی دیکەش بە فەرزی عەین[٢٥١]، پێم وایە ئەو ڕایەش کە نوێژی بەکۆمەڵ بە فەرزی کیفایە دەزانێ لە ڕووی بەڵگەوە لەوانی دیکە بەهێزترە، کە ئەم دەقانە هەندێکن لە بەڵگەکانیان:

* خوای زانا فەرموویەتی: (... **وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ**) البقرة - ٤٣ .، **واتە**: وە لەگەڵ ڕکووع بەران دا ڕکووع بەرن.

---

[٢٤٩] کە حەنەفیەکان و مالیکی‌یەکان و هەندێك لە شافیعی‌یەکانن، بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٤٩، د. وهبة الزجيلي.

[٢٥٠] (نووي) گوتویەتی: (والصَّحيح أَنَّها فَرْضُ كِفَايَةٍ وهو الَّذي نَصَّ عَلَيه الشافعيُّ .. وهو قولي شيخي المذهب: ابن سريج، وابي اسحاق و جمهور أَصْحابِنا المتقدِّمين، وصَحَّحَهُ اكثرُ المُصَنِّفين وهو الَّذي تَقْتَضِيهِ الأَحاديثُ الصَّحِيحةُ (المجموع) ج٤ ص ١٦١.

[٢٥١] ئەمەش ڕای (أوزاعي و واحمد و ابو ثور و ابن المنذ) ە بەڵام بەمەرجی بەرکەوتن (صحة)ی دانانێن (داود) یش بە فەرزی عەینی دەزانێ و بە مەرجی دروست بوون و بەرکەوتنیشی دەزانێ. بڕوانە (المجموع [illegible]) وە بڕوانە (الفقه الاسلامي [illegible]) ج[illegible]

* پیاوێکی کوێر هاته لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسم نیە بەرەو مزگەوت دەستم بکێشێ، جا داوای لە پێغەمبەری خوا کرد کە مۆڵەتی بدات لە ماڵی خۆی نوێژ بکات و ئەویش مۆڵەتیدا، بەڵام کە ڕۆیشت بانگی کردەوە پێی فەرموو: (هَلْ تَسْمَعُ النِّداءَ بِالصَّلاةِ؟!) ئایا گوێت لە بانگی نوێژ دەبێ؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: (فَأَجِبْ) مادام وایە وەڵام بدەوە واتە: وەرە بۆ مزگەوت -، ئەم فەرموودەیە (مسلم) لە (ابو هريرة) ی گێڕاوەتەوە.

*(ما مِنْ ثَلاثةٍ في قَرْيَةٍ ولا بَدْوٍ لا تُقامُ فيهم الصَّلاةُ الا قَدْ اسْتَحْوَذَ عَلَيهِمُ الشَّيْطانُ فَعَلَيكُمْ بِالجَماعَةِ، فَإنَّما يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القاصِيَةَ) رواه ابو داود باسناد حسن. واتە: هەرسێ کەسێك لە ئاوەدانییەك یان لە دەشت و سارا دا نوێژیان لەنێودا بەرپا نەکرێ - مەبەست نوێژی بەکۆمەڵە - ئەوە بێگومان شەیطان دەیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، جا کۆمەڵ بگرن، چونکە گورگ تەنیا مەڕی لە ڕان دابڕاو دەخوات.

شایانی باسیشە کە هەم ئەوانەی نوێژی بەکۆمەڵ بە فەرزی کیفایە دەزانن و هەم ئەوانەش کە بە فەرزی عەینی دەزانن، جگە لە (داود الظاهري) هیچیان ناڵێن کە بە کۆمەڵ کردنی پێنج نوێژەکان مەرجی دامەزران و وەرگیرانیانە، بەڵکو بەس دەڵێن: بابای نوێژکەری تەنیا - بەبێ عوزر-گوناهبارە لەسەر چواندنی ئەو فەرزە کە بریتیە لە بەکۆمەڵ کردنی نوێژەکەی.

لە بارەی ئافرەتانیشەوە کە بچنە مزگەوت و بەشداری نوێژی بەکۆمەڵ بکەن ئەوە بێگومان بۆیان دروست و ڕەوایە، بەڵام دەبێ خۆ بپارێزن لە هەر شتێك کە مایەی فیتنە و وروژاندنی ئارەزووی پیاوان بێ، وەك پۆشینی بەرگ و پۆشاکی زرق و بەرق و سەرنج ڕاکێش و خۆ بۆ نخۆش کردن و زرینگە و خرینگە و لەنجەولارکردن، ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:

*(لا تَمْنَعوا النِّساءَ أنْ يَخْرُجْنَ الىٰ المَساجِدِ و بُيوتُهُنَّ خَيرٌ لَهُنَّ) رواه احمد و ابو داود. واتە: ڕێ لە ئافرەتان مەگرن کە بچنە مزگەوتان، هەرچەندە ماڵەکانی خۆیان بۆیان چاکترن.

*(أيُّما إمرأةٍ أصابَتْ بَخوراً فلا يَشْهَدْ مَعَنا العِشاءَ الآخِرَةَ) رواه مسلم و ابو داود والنسائي. واتە: هەر ئافرەتێك بخووری لە خۆیدابێ بابەشداری نوێژی خەوتنانمان لەگەڵ نەکات.

تێبینی: سوننەتە بابای نوێژکەر بە ئارامی بەرەو مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ بچێ و ڕاکە ڕاک و پەلەپەل نەکات، (ابو قتادة) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە کاتێك دا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد غەڵبەغەڵبی چەند پیاوێکی بیست، فەرمووی: ئەوە چیتانە! گوتیان: پەلەمان کرد بۆ نوێژکردن، فەرمووی: (فلا تفعلُوا ... إذا أتيتُم الصَّلاةَ فعليكُمْ السَّكينة فما أدْركتُمْ فَصلوا وما فاتكُمْ فَأتِمّوا) متفق عليه، واتە: وا مەکەن .. ئەگەر هاتن بۆ نوێژ چەندەی پێڕاگەیشتن بیکەن و چەندەشتان لەدەست چوو بوو دوایی تەواوی بکەن.

## دوو: چۆنیەتی نوێژی بەکۆمەڵ و پێش نوێژیکردن:

لەم چەند برگەیەی خوارێدا هەوڵ دەدەین زۆر بە گوشراوی چۆنیەتی نوێژکردنی بەکۆمەڵ و پێش نوێژی کردن ڕوون بکەینەوە:

١)نوێژی بەکۆمەڵ بە دوو کەسان پێك دێ یەکیان ئیمام و ئەوی دیکە (مأموم) بێت، چەندان فەرموودەی (صحیح) بەڵگەی ئەو ڕایەن بۆ وێنە:

*(ابن عباس) دەگێڕێتەوە کە شەو لەلای (میمونة) ی پووری ماوەتەوە و کاتێك پێغەمبەر ﷺ بۆ شەونوێژ هەڵساوەئەویش لەگەڵی هەڵساوە و لەلای چەپیەوە ڕاوەستاوە، پێغەمبەریش ﷺ سەری گرتوە و هێناویەتە لای ڕاستی، (بخاري و مسلم) هێناویانە.

*(ابو سعید) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتۆتە مزگەوت، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە هاوەڵانی کردوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ يتصدقُ على ذا فيصلِّي معَهُ؟) ئینجا پیاوێك لەو کۆمەڵە هەستاوە و نوێژی لەگەڵ کردوە. ئەم فەرموودەیە (احمد و ابو داود و ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

٢)شوێن کەوتنی ئیمام فەرزە و حەرامە (مأموم) پێشی بکەوێتەوە، فەرموودەش لەو بارەوە زۆرن بۆ وێنە:

*(إنما جُعِلَ الأمامُ لِيُؤتَمّ بِهِ فلا تختلِفوا عليهِ، فإذا كَبَّر فكبّروا و إذا ركَع فاركَعوا..) رواه بخاري ومسلم عن ابي هريرة،

واتە: ئیمام بەس بۆئەوە دانراوە کەپەیرەوی لێبکرێ جا پێچەوانەی وی مەجوڵێنەوە هەرکات (الله اکبر)ی کرد ئێوەش بیکەن، وەهەرکات چووە ڕکوع ئێوەش ڕکووع بەرن.

* (يا أَيُّها الناسُ إِنِّي إِمامُكُمْ فَلا تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ ولا بِالسُّجُودِ ولا بِالقِيامِ ولا بِـالقُعُودِ ولا بِالأِنْصِرافِ) رواه احمد و مسلم، واته: ئەی خەڵکینە من ئیمامتانم، جا نە لە ڕکووع و نە لە سەجدە بردن و نە لە هەڵسانەوە و نە لە دانیشتن و نـە لـە تـە واوبوون – و سـەلام دانەوە – دا پێشم مەکەونەوە.

٣)سوننەتە ئیمام کاتێك پێش نوێژی بۆ خەڵك کرد ئاگای لێیان بێ و بەهۆی زۆر نوێـژ درێژکردنـەوەوە بێزاریـان نـەکات، چەندان فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ لـەو بـارەوە هەن، بۆ نموونە:

*(إذا صَلَّى أَحَدُكُمْ بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ والسَّقِيمَ والكَبِيرَ، فَإِذا صَلَّى لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ ماشاءَ) رواه البخاري و مسلم عن ابي هريرة، واته: ئەگەر یەکێکتان نوێژی بۆ خەڵك کرد با بەکورتی بیکـات چونکـە بێگومـان بابـای لاواز و نـەخۆش و بەسـاڵداچوویان تێدایە، بەڵام کە بۆ خۆی بەتەنیا نوێژی کرد با چەندی حەز دەکات درێژی بکاتەوە.

**ئاگاداری:** بێگومان مەبەست لە کورت کردنەوە (تخفیف) ئەوە نیە کـە فەرز و سوننەتەکانی نوێـژ جێبەجێ نـەکات چونکـە لـە چەندان فەرموودەدا هـاتوە – بەتایبەت فەرموودەی: (المُسِيءِ صَلاتُهُ) کە پێشتر باسمان کرد – کە نوێژکەر دەبێ پایە و فەرز و سوننەتەکانی نوێژەکەی جێبەجێ بکات، بەڵکو مەبەست ڕەچاوکردنی حاڵ و باڵی نوێژکەرەکانە و لەبەرچاوگرتنی ئەوانەیانە کە پیرو کەنەفت و نەخۆش و لاوازن.

٤)خێراییکردن لە شوێن کەوتنی ئیمام دا و ئەوەی بە ڕکووع ڕانـەگات و تێیـدا ئارام نەگرێ ئەو ڕکاتەی بۆ حساب ناکرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا جِئْتُمْ الى الصَّلاةِ و نَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا ولا تَعُدُّها شَيْئًا ومَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَـدْ أَدْرَكَ الصَّلاةَ) رواه ابو داود و ابن خزيمة في صحيحه و صححه الحاكم: واته: هەرکات بۆ نوێـژ هـاتن و ئێمـە لە سەجدەدا بووین سەجدەبەرن بەڵام ئەو ڕکاتـە حیسـاب مەکەن، وە هەرکەسێك بە ڕکووع ڕابگات ئەوە بەو– ڕکاتەی – نوێژەکە ڕاگەیشتووە.

٥)کـێ شایسـتەترە بـۆ بوونـە ئیمـام؟ پێغەمبـەری پیشـەوامان ﷺ لـەو بـارەوە فەرموویەتی:

*( يَؤُمُّ القَومَ أقرَؤُهُم لِكتاب الله، فَانْ كانوا في القراءَةِ سَواءً فأعلمهُمْ بالسنة، فَانْ كانوا في السُّنةِ سَواءً فأقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فانْ كانوا في الهِجْرَة سَواءً فأقْدَمُهُمْ سِنّاً ولا يَؤُمَنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ في سُلْطانِه، ولا يَقْعُدْ في بَيْتِه علىٰ تَكْرِمَتِه إلاّ بِإذْنِه) رواه احمد و ملسم، واته شارەزاتری کۆمەڵێك بە کتێبی خوا دەبێتە ئیمامیان، جا ئەگەر لە شارەزایی قورئان دا یەکسان بوون، ئەوە زاناترین بە سوونەت – دەبێتە ئیمامیان – وە ئەگەر لە سوونەتیش دا یەکسان بوون ئەوەیان کە پێشتر کۆچی کردوە، وە ئەگەر لە کۆچکردنیش دا وەك یەك بوون بە تەمەنترینیان، وە نابێ هیچ پیاوێك لە شوێنی قەڵەمڕەو و دەسەڵاتی پیاوێکی دیکەدا ببێتە ئیمامی، هەروەها نابێ بەبێ مۆڵەتی وی لە ماڵی خۆیدا لەسەر شوێنە تایبەتی‌یەکەی دابنیشێ.

٦- کێ و کێ دروستە پێش نوێژی بکەن؟! زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون کە پێش نوێژی منداڵی خاوەن تەمییز و کوێر دروستە، وە دروستە کە ڕاوەستاو لە پشت دانیشتووە وە و بەپێچەوانەوەش نوێژ بکەن، هەروەها ئەوەی فەرز دەکات لە پشت ئەوەوە کە سوننەت دەکات و بەپێچەوانەوەش، وە بابای خاوەن دەست نوێژ لە پشت تەیەممومکەرو بەپێچەوانەشەوە، وە ڕێبوار لە پشت نیشتەجێ (مقیم) و بەپێچەوانەشەوە، وە چاکتر لە پشت چاك (أفْضَل وراءَ المَفْضول) هەموو ئەو شتانە لە سوننەت دا بەڵگەیان هەیە[٢٥٢].

<u>تێبینی</u>: بەڵام هەرکاتێك ڕێبوار (مسافر) لە پشت نیشتەجێوە نوێژی کرد پێویستە کە نوێژەکەی تەواو بکات، لەوبارەشەوە پرسیار لە (ابن عباس) کراوە گوتوویەتی: (تِلْكَ سُنَّةُ أبي القاسم ﷺ) رواه احمد.

٧-نوێژ لە دوای بابای فاسق و خاوەن بیدعەت (مُبْتَدِعْ) ەوە ناپەسند (مَكْروه)ە، ئەمە ڕای زۆربە و جەماوەری زانایان و پێشەوایانی پێشین و پاشین و لەوبارەوە بنچینەیەکی گشتی‌یان داناوە و گوتویانە: (كُلُّ مَنْ صَحَّتْ صَلاتُهُ لِنَفْسِه صَحَّتْ صَلاتُهُ لِغَيْرِه) واتە: هەکەسێك نوێژەکەی بۆخۆی بەربکەوێ و تەواوبێ بۆ خەڵکیش دروست و ڕەوایە، چونکە لە (صحيح البخاري) دا هاتوە کە (ابن عمر) رضى الله عنهما لە پشت

---

[٢٥٢] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٢١٦ تا ٢٤٩، باب (صفة الأئمة)، وە بڕوانە : (نيل الأوطار) ج٣ ص ١٩٢ تا ٢١٨ (ابواب الأمامة وصفة الأئمة)، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) ج٢ ص ١٧٢ تا ٢٥٨.

(حَجّاج)ەوە نوێژی کردوە، وە لە (صحیح) ی مسلم دا هاتوە کە (ابو سعید الخدري) رضي الله عنه لە دوای (مَروان بن الحَکَم) ەوە نوێژی کردوە کە شەڕاب خۆر بووە.

بەڵام بێگومان نوێژکردن لە دوای (فاسِق) و (مُبْتَدِعْ) ەوە شتێکی پەسند و باش نیە و ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش کە نوێژیان لەدوای ئەو جۆرە کەسانەوە کردوە دیارە ناچار بوون و لە زیان و خراپەی گەورەتر ترساون و بەپێی یاسای (إحْتِمالُ أَخَفِّ الضَّرَرَيْن) و (اختيارُ أَهْوَن الشَّرَّيْن) رەفتاریان کردوە، بەڵگەی ناپەسند بوونی نوێژکردنیش لە پشت ئەو جۆرە کەسانەوە جگە لە دەقە گشتییەکانی قورئان و سوننەت، ئەم فەرموودەیەشە: (عن السائب بن خلاد أَنَّ رَجُلاً أَمَّ قَوْماً فَبَصَقَ في القِبْلَةِ ورَسولُ الله ﷺ يَنْظُرُ إِلَيْه، فقالَ رَسولُ الله ﷺ " لا يُصَلِّي لَكُمْ" ...) رواه ابو داود و ابن حبان، واتە: پیاوێك پێش نوێژی بۆ خەڵكێك دەكرد و تفی بەرەو قیبلە ڕۆكرد و پێغەمبەریش ﷺ چاوی لێ بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "با نوێژتان بۆ نەکات.. [253]

٨-زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە دروستە ئینسان لە پشت ئیمامێکەوە نوێژ بکات کە فەرز و پایەیەکی چواندوە بەڵام پێی نەزانیوە، وەك ئەوەی لەشی پیس بووبێ، وە سەنگی مەحەکی تەواوی ىنوێژەکەش مەزهەبی ئیمامە نەك (مأموم)، گەلێك دەقی سوننەتیش لەو بارەوە هەن، کە جەماوەری زانایان ئەو ڕاو هەڵوێستەی خۆیانیان لێ هەڵهێنجاون [254] بۆ وێنە:

*( عن أبي هريرة أن النبيَّ ﷺ قال: يُصَلُّونَ بِكُمْ فَإِنْ أصابُوا فلكُمْ و لَهُمْ،وإِنْ أَخْطَاوا فلكُمْ و عَلَيهِمْ) رواه احمد والبخاري، واتە: نوێژتان پێدەکەن جا ئەگەر نوێژەکە تەواو بوو ئەوە پاداشتەکەی بۆ ئێوە و ئەوانیشە، بەڵام ئەگەر هەڵەیان کرد، ئەوە ئێوە پاداشت تان هەر هەیە و ئۆباڵەکەی بە ئەستۆی خۆیانە.

*(عن سهل رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ رسولَ الله ﷺ يَقولُ: الأمامُ ضامِنٌ فَإِنْ أَحْسَنَ فَلَهُ و لَهُمْ، وإنْ أساءَ فَعَلَيْهِ) رواه ابن ماجة، واتە: ئیمام ئۆباڵدارە جا ئەگەر چاکی کرد ئەوە – خێرەکە – بۆ خۆی و بۆ ئەوانیشە، بەڵام ئەگەر هەڵەی کرد ئەوە – تاوان – بەس لەسەر خۆیەتی.

---

[253] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٢٢١ ، ٢٢٢، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ١٩٩ تا ٢٠٢ (امامة الفاسق).

[254] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٢٢ تا ٢٢٦، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٢٣٦.

دیاره هەندێك لە زانایانیش ڕایان جیاوازە، بەڵام بێگومان ڕای جەماوەری زانایان بەهێزتر و بەڵگەدارترە و ڕایەکەی دیکەش زیاتر لە ئەنجامی دەمارگیری مەزهەبی (التَعَصُّب المَذْهَبِي) یەوە سەری هەڵداوە هەربۆیەش لەنێو زانایانی سێ سەدە پەسند کراوەکان دا ئەگەر هەشبووبێ زۆر دەگمەن بووە و پاش بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکان و ئیددیعای داخرانی دەرگای ئیجتیهاد ئەو جۆرە بیروڕایە پەیدابوو، کە جگە لە نەگونجانی و پێچەوانە بوونی لەگەڵ دەقەکانی سوننەت دا، زیانێکی یەکجار گەورەشی لە یەکریزی مسوڵمانان داوە و زۆر کێشە و گیروگرفتی لابەلای بۆ دروست کردووە[255].

٩-هەرکاتێك ئیمام گیروگرفتێکی بۆ دروست بوو، وەك ئەوەی بیری کەوتەوە کە بێدەست نوێژە، یان دەست نوێژی شکا، یان لووتی ڕژا و خوێنی ڕاسا... هتد ئەوە بۆی هەیە یەکێك لە (مأموم) ەکان لەجێی خۆی دابنێ بۆئەوەی نوێژەکەیان پێ تەواو بکات، بەڵگەی ئەم مەسەلەیەش چەند دەقێکی سوننەتە، بۆ وێنە:

*(عمرو بن میمون) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەو بەیانی‌یەی کە عومەر - رضي الله عنه - پێکرا من ڕاوەستابووم و تەنیا (عبدالله بن عباس) مان لەنێوان دابوو، پاش (الله اکبر) کردن زۆری پێنەچوو بیستم گوتی: ئەو سەگە کوشتمی یان خواردمی کاتێ: - ابو لؤلؤة- زەبرەکەی لێدا، پاشان عومەر خوا لێی ڕازی‌بێ (عبدالرحمن بن عوف) ی پێش خست و ئەویش نوێژێکی سووکی پێکردن، (بخاري) گێڕاویەتەوە.

*(ابن رزین) دەڵێ: ڕۆژێکیان (علي) خوا لێی ڕازی‌بێ نوێژی دەکرد لووتی ڕژا، یەکسەر دەستی پیاوێکی گرت و پێشی خست و خۆی ڕۆیشت. (سعید بن منصور) ئەم دەقەی گێڕاوەتەوە.

١٠-زۆربەی[256] هەرەزۆری زانایان ڕایان وایە کە لەگەڵ هەبوونی دیوار و پەردە و نێوانیش دا لەنێوان ئیمام و شوێن کەوتووانی دا دروستە لەدوایەوە نوێژ بکەن بەمەرجێك ئاگاداری نوێژی ئیمام و هەستان و دانیشتن و جم و جۆڵەکانی بن جا چ

---

[255] بڕوانە: (المغني والشرح الکبیر) کە لەو بارەوە دەڵێ: (فَأَمَّا المخالِفون في الفُروع كَأَصْحاب أَبِي حنیفة و مالك والشافعي فالصلاةُ خَلْفَهُم صَحیحةٌ غیرُ مَكْرُوهَةٍ نَصَّ عَلَیه أَحمدُ، لان الصحابة والتابعین و مَنْ بَعْدَهُم لَمْ یَزَلْ بَعْضُهُمْ یأْتَمُّ بِبَعْضٍ مَعَ اخْتلافِهِمْ في الفُروعِ فَكَانَ ذلك إجْماعاً...) ج٢ ص ٢٧، وەك دەبینین (ابن قدامة) پێی وایە کە نەك هەر ڕای زۆربەی زانایان، بەڵکو ڕای تێکڕاو سەرجەمیانە.

[256] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٢٥٩ تا ٢٥٦ ، وە بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٣ ص ٢٣٩، ٢٤٠. وە بڕوانە: ((الفقه الأسلامي و ادلته) ج٢ ص ٢٢٨ تا ٢٣٤.

چاویان لێی بێ چ دەنگی ببیستن، چ دەنگی گەیەنەر (مُبَلِّغ) ببیستن، وە چ بەهۆی پێکەوە پەیوەست بوونی ڕیزەکانەوە ئاگاداربن، وە زانایان ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە دێننەوە:

*(عن عائشة رضي الله عنهما قالت: كَانَ لَنا حَصِيرَةٌ نَبْسطُها بالنَّهارِ و نَحْتَجِرُ بِها بالليل فَصَلَّى فيها رَسُولُ الله ﷺ ذاتَ لَيلةٍ فَسَمِعَ المسلمون قِرَآتَهُ فَصلُّوا بِصَلاتِهِ، فَلَمَّا كانَت الليلةُ الثانيةُ كَثُروا فَاطَّلَعَ عَلَيهِمْ، فقال: أُكْلِفُوا مِنَ الأعْمالِ ما تُطيقون فإنَّ الله لا يَمَلُّ حتى تَمَلُّوا) رواه احمد واخرجه ابن جرير في تفسيره، واتە: حەسیرێکمان هەبوو بە ڕۆژ ڕامان دەخست و بە شەو دەمان کردە پاردە، شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تێداکرد، مسوڵمانان کە گوێ بیستی قوڕئان خوێندنی بوون نوێژیان بە نوێژی ئەو کرد، بۆ شەوی دووەم کە زۆر بوون پێغەمبەر ﷺ - بۆی ڕوانین و فەرمووی: هەرئەوەندە کردەوان بکەنە پیشە کە پێتان بکرێ، چونکە بێگومان ئێوە لە ئەنجام دانی کردەوەی باش - بێزار و ماندو دەبن، بەڵام خوا - لە پاداشت دانەوەتان دا - بێزار و ماندوو نابێ.

١١-چۆنیەتی ڕیزبوونی نوێژکەران و شوێنی ڕاوەستانی منداڵان و ئافرەتان:

ا-ئەگەر نوێژکەر (مأموم) یەکێك بوو لەلای ڕاستی ئیمام و ئەگەر دووان و زیاتر بوون لە پشت ئیمامەوە دەوەستن، وەك (مسلم وابو داود) لە (جابر)ەوە دەگێڕنەوە.

ب-سوننەتە ئەو کەسانەی زیاتر خاوەنی عەقڵ و شارەزایین لە ئیمامەوە نزیکتربن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لِيَلِيَنِي مِنكُمْ أُولوا الأَحْلامِ والنُّهى ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ..) رواه احمد و مسلم وابو داود والترمذي، واتە: با خاوەن عەقڵ و هۆشەکانتان لێمەوە نزیك بن دوایی ئەوانەی دوای وان ئنجا ئەوانەی دوای وان..

ج- دەبێ پیاوان لە ڕیزەکانی پێشەوە و دوای ئەوان منداڵان و دوای ئەوانیش ئافرەتان بوەستن: چونکە: (كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَجْعَلُ الرِّجالَ قُدَّامَ الغِلْمانِ والنِّساءَ خَلْفَ الغِلْمانِ) رواه احمد وابوداود.

١٢-نوێژی کەسێك بەتەنیا لە پشت ڕیزەکانە وە دەوەستێ دروستە یان نا؟!

زۆربەی زانایان نوێژەکەی بە دروست دادەنێن، بەڵام دەڵێن کارێکی ناپەسند (مكروه) ی ئەنجام داوە، هەندێکیشیان دەڵێن نوێژەکەی بەتاڵە و بەرناکەوێ. جا ئەوانەی کە دەڵێن نوێژەکەی بەرناکەوێ چەند فەرموودەیەك بە بەڵگە دێننەوە کە یەکێکیان ئەمەیە:

*(عن وابصة أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ رأيْ رَجُلاً يصلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وحْدَه فـأمرهُ أنْ يعيـدَ الصَّـلاة) رواه الخمسة الا النسائي، واتـه: پێغەمبـەری خوا ﷺ پیاوێکی دی کـە لـە پشـت ڕیـزەوە بەتـەنیا نوێژی دەکرد، فـەرمانی پـێکرد کە نوێژەکـەی دووبـارە بکاتـەوە.. زۆربـەی زانایانیش چەند فەرمودەیەك بە بەڵگە دێننەوە کە یەکێکیان ئەمەیە:

*(ابوبکرة) دەگێڕێتـەوە کە کاتێك بـە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیشتووە - لە نوێژدا _ لـە ڕکووع دا بووە ئەویش بەرلەوەی بگاتە ڕیز چۆتە ڕکووع، پاشان ئەوەی بۆ پێغەمبـەر ﷺ باس کردوە ئەویش فەرموویەتی: (زادَكَ اللهُ حِرْصـاً ولا تَعُـدْ) رواه احمد والبخاري وابن المنذر والنسائي، واته: خوا سووربوونت - لەسەر خواپەرستی - تێدا زیاتر بکات بەڵام جارێکی تر وامەکە. جا دیارە ئەگەر نوێژەکەی بەتاڵ بووایە پـێ دەفەرموو: دووبارە بیکـەوە، وە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: فەرموودەکـەی (وابصـة)ش پێغەمبـەر ﷺ وەك سوننەت و چاکتر پـێی فەرمووە دووبارە بیکاتەوە، بۆئـەوەی خـێری زیـاتر دەسـت بکەوێ و نوێژەکەی تەواوتر بێت[257].

١٣-پێویستە ئیمام ڕیزەکان ڕێك بخات و کەلێن و بۆشاییەکان پڕبکاتەوە: نوێـژ بەتایبەت نوێژی بەکۆمەڵ گەورەترین و گرنگترین قوتابخانەی ئیمانی و عیبادییە بۆ پـەروەردەکردنی تـاك و کۆمـەڵ لەسـەر ڕێـك و پێکـی و یاسـا و پابـەندیی، بۆیـە پێغەمبـەری خوا ﷺ لە چەندان فەرموودەیدا فەرمانی بە ئۆممەتەکەی کردوە کە لـە نوێژیدا ڕیزەکانیان ڕاست و ڕێك و پێك بکـەن و جوان پـاڵ بەیەکەوە بدەن و پـاش و پێش و جیاوازی و کەلێن و بۆشایی لە ڕیزەکانیان دا نەبێ، بۆ وێنە:

*(عن أنس أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يُقبلُ علينا بِوَجْهِهِ قَبْلَ أنْ يكبِّرَ فيقول: تَراصُّوا واعْتَدِلُوا) رواه البخاري و مسلم، واته: پێغەمبەر ﷺ بەرلەوەی (الله أكبر) بکات و نوێژ دابـبەستێ - ڕووی تێدەکردین و دەیفەرموو: ڕیز ببەستن و ڕێك بوەستن.

*(عن أنس أنَّ النبيَّ ﷺ قال: سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فإنَّ تَسْوِيَةَ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلاةِ) متفق عليه، واته: ڕیزەکانتان ڕێك بخەن چونکە ڕاست کردن و ڕێك کردنی ڕیز مایەی تەواویی نوێژە.

*(نعمان بن بشیر) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەری خوا ﷺ عـادەتی وابوو لە ڕیزەکان دا ڕێکی دەکردین وەك چۆن "تیر" ڕاست دەکرێ، هـەتا کـاتێك کە

---

[257] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٦٥.

زانی ئەو مەسەلەیەمان لێ وەرگرت و لێی تێگەیشتین، ڕۆژێکیان ڕووی تێکردین بینی پیاوێك سینگی دەرچوو بوو - لە ڕیز - فەرمووی: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَو لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ) رواه مسلم و النسائي وابو داود و ابن ماجة والترمذي و صححه، واته: یان دەبێ ڕیزەکانتان ڕێك بکەن یان خوا ڕووەکانتان لە یەك وەردەگێڕێ.

**ئـاگـاداری**: پێویستە بزانرێ کە ڕێك و پێك کردنی ڕیزەکان و ڕاست ڕاوەستان و پاڵ بە یەکترەوەدان سوننەتێکە بە سەرجەم نوێژکەرەکان ئەنجام دەدرێ و پێویستی بە هاوکاری هەموویان هەیە و بە یـەکێك و دووان نایەتـەدی، هەربۆیـەش لەسەر ئیمام فەرزە یان لانی کەم سوننەتە کە سەرپەرشتی ئەو مەسەلەیە بکـات و ڕیزەکان ڕاست و ڕێك بکات، هەروەها پێویستە ئەوەش بزانرێ کە زیادەڕۆیی کردن لەم مەسەلەیەش دا و سەغڵەت و بێزارکردنی خەڵکی بەهۆی زۆر پاڵ لێدانیـان و زۆر لینگ لـە یەك فەڕاح کردن و پاڵە پاڵ لەگەڵ کردنیان، سەرباری بیدعەت بوون و لـە سنووری سوونەت دەرچوونی دەبێتە مایەی بێزاریی و ناڕەحەت کردنی خەڵکیش و، ئـەو مەبەسـتەی کـە شـەرعیش ڕەچـاوی کـردوە، کـە ڕێـك و پێـك وەسـتان و پـاڵ بەیەکەوەدانە هەر نایەتەدی، چونکە بێگومان ئامانجە شەرعی‌یەکان بە ڕێگاو شێوازە پەسند و شەرعی‌یەکان نەبێ مەیسەر نابن.

١٤- خێرو پاداشتی ڕیزەکانی پێشەوەو بەتایبەت ڕیزی یەکەم سەرجەم زانایـان لەسەری یەکدەنگن و چەندان فەرموودەش لەو بارەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراونـەوە بۆ وێنە:

*(تَقَدَّمُوا فَأْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ وَرَاءَكُمْ، وَلاَ يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللهُ عَزَّ وَ جَلَّ) رواه مسلم والنسائي وابوداود و ابن ماجة، واتـە: وەرنە پێش و لـە پشت منەوە نوێژ دابەستن، وە بـا ئەوانـەی پشتەوەشتان لـە دوای ئێوەوە نوێژ دابەستن، وە کۆمـەڵێك بەردەوام دوادەکەون هەتا خوای باڵادەست و پایەبەرز دوایان دەخات.

*(عن ابي أمامة أن النبي ﷺ قال: إن الله و ملائكته يصلـون علـى الصـف الأول، قـالوا يـا رسول الله وعلى الثاني"؟ قال: ان الله و ملائكة يصلون على الصف الأول، قـالوا يـا رسـول الله و علـى الثـاني؟ قـال: و علـى الثـاني) رواه احمد و الطبراني بسند صحيح. کەواتـە: خـێرو

پاداشتی ڕیزی یەکەم دوو هێندەی ڕیزی دووەمە. ئینجا لای ڕاستی ئیمامیش لە لای چەپی خێری زیاترە. چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

*(إن الله و ملائِكَته يصلُّون علىٰ الَّذين يُصلُّون علىٰ مَيامِنِ الصُّفوفِ) رواه ابو داود وابن‌ماجة عن عائشة رضي الله عنها وأرضاها.

١٥-شتێکی ناپەسندە ئینسان ببێتە ئیمامی خەڵکێك کە لەبەر هۆیەکی شەرعی گلەیی‌یان لێیەتی و لێی ناڕازین، ئەمە ڕای[258] زۆربەی زانایانە، بەڵام هەندێکیان[259] بە حەرامی دەزانن کابرا ببێتە ئیمامی کۆمەڵێك کە هەموویان یان زۆربەیان لەبەر هۆیەکی شەرعی لێی ناڕازی بن، ئاشکرایە کە ناپەسندی یان گوناح و خراپەکەش تایبەتە بە بابای ئیمامەوە و زیانی بۆ نوێژی نوێژکەرەکان نیە، ئەو فەرموودانەش کە زانایان بۆ ناپەسندی ئە جۆرە پێش نوێژی‌یە یان حەرامێتی بەبەڵگەیان دێننەوە گرنگترینیان ئەمانەن.

*(ثلاثةٌ لا يَقبلُ اللهُ مِنهم صَلاةً: مَنْ تَقدَّمَ قوماً وهُمْ لهُ كارِهُونَ..) رواه ابو داود و ابن ماجة، واتە: سێ جۆرە کەس خوا نوێژیان لێ وەرناگرێ: یەکەمیان - کەسێك پێش کۆمەڵێك بکەوێ کە خۆشیان ناوێ - و حەز لە چارەی ناکەن.

*(عن ابن عباس عن رسول الله ﷺ قال: ثلاثةٌ لا تَرتفِعُ صلاتُهم فوقَ رؤسِهِمْ شِبْراً: رَجُلٌ أمَّ قَوْماً وهُمْ لهُ كارِهُونَ، وامرأةٌ باتَتْ وزوجُها عليها ساخِطٌ، وأخَوانِ مُتصارِمانِ) رواه ابن ماجة و قال العراقي اسناده حسن. واتە: سێ جۆرەکەس نوێژەکانیان بستێك لەسەرسەریان بەرزنابێتەوە: پیاوێك پێش نوێژی خەڵکێك بکات کە لێی ناڕازی‌بن، وە ژنێك شەو بکاتەوە و مێردەکەی لێی تووڕە بێت،وە دوو برای پێکەوە ناکۆك و لێك دابڕاو.

## سێ: عوزرەکانی دواکەوتن لە نوێژی بەکۆمەڵ:

نوێژی بەکۆمەڵ چ بە فەرزی عەینی یان بە فەرزی کیفایە دابنرێ، وە چ بە سوننەت دابنرێ بەپێی دەقەکانی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە چەند حاڵەتێك دا بابای نوێژکەر مۆڵەتی پێدراوە نەیکات و نوێژەکەی بەتەنیا بکات، ئەو حاڵەتانەش:

---

[258] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٢٣٩ ، ٢٤٠.

[259] بۆ وێنە: (شو[illegible] (نيل الأوطار ج٣ ص٢١٦ - ٢١٨ باب: من أمَّ قوماً وهم له يكرهونه).

١)له كاتی سەرما و باران و قوڕو چڵپا و و بای توند و تاریكی و گەرمای زۆردا.

*عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النبي ﷺ أنَّه كانَ يأمر المُناديَ فينادي بـالصلاةِ يُنـادي: صَلّوا في رِحالِكُمْ في اللّيلـةِ البـارِدَةِ المطـيرَةِ في السَّفر) رواه الشيخان. واتـه: پێغەمبـەر ﷺ فەرمانی بە بانگ بێژ دەكرد كە بانگی نوێـژ بدات و بانگ بكات بڵێ: لە مەنزڵەكانی خۆتان – لە شەوی ساردی باراناوی لە سەفەرێدا – نوێژ بكەن.

*(عن جابر رضي الله عنه قال: خَرَجْنا مَعَ رسولِ الله ﷺ في سَفَرٍ فمطِرْنا فقـال: لِيُصَـلِّ مَـنْ شاءَ منكُمْ في رَحْله) رواه احمد و مسلم وابو داود والترمذي.

*جارێكیـان (ابن عبـاس) خـوا لێیـان ڕازی بـێ لـە ڕۆژێكـی باراناویدا بـە بـانگ بێژەكەی خۆی گوت: ئەگەر گوتت: (أشـهد ان محمـداً رسـول الله) مـەڵێ (حَـيَّ علـىٰ الصلاة) بەڵكو بڵێ: (صَلّوا في بُيوتِكُمْ). لە ماڵەكانی خۆتان دا نوێـژ بكەن، ئنجا وەك بڵێی خەڵكی ئەوەیان پێ شـتێكی سـەیر و نـامۆ بـوو، بۆیـە گوتـی: ئایـا ئـەوەتان پێ‌سەیرە! كەسێك ئەوەی كردوە كە لە من چاكترە: پێغەمبـەر ﷺ، بێگومـان نوێـژی بەكۆمەڵ كارێكی گەورەیە، بەڵام من حەزم نەكرد كە بتانهێنمـە دەرێ و بەنێو قوڕو چڵپاودا بڕۆن، ئەم فەرموودەیە (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

*(ابن بطال) گوتوویەتی: (أجْمَعَ العُلَماءُ علىٰ أنَّ التخلّفَ عَنِ الجَماعَةِ في شِدةِ المَطرِ والظّلمةِ والرِّيحِ و ماأشْبَه ذلِكَ مُباحٌ)[٢٦٠]

*(نووي) یش گوتوویەتی: (البَرْدُ الشديدُ عذْرٌ في الليلِ والنهارِ، وشدةُ الحَرِّ عُذْرٌ في الظهرِ، والثَّلْجُ عذْرٌ إنْ بَلَّ الثَّوْبَ ، والرِّيْحُ البارِدَةُ عُذْرٌ في اللَّيْلِ دُونَ النَّهارِ..)[٢٦١]

٢- لە كاتی نەخۆشی یان هەبوونی مەترسی گیان و سـامان دا: چونكە خـوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿وما جَعَلَ عليكُمْ في الدِّينِ مِنْ حَـــرَجٍ﴾ الحج -٧٨- واتـە: وە لە ئایین دا سەغڵەتكردنتان لەسەر دانەنراوە، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: (مَـنْ سَمِعَ النِّداءَ فَلَمْ يُجبْهُ فلا صَلاةَ له إلاّ مِنْ عُذْرٍ، قالوا: يا رسولَ اللهِ ومـا العُـذْرُ؟! قـال: خَـوْفٌ أو مَرَضٌ) رواه ابو داود باسناد صحيح، واتە: هەركەسێك بانگی بیست و بەدەمیەوە نەچوو

---

[٢٦٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٥٥، واتە: زانایان لەسەرئەوە یەكدەنگن كە دواكەوتن لە نوێژی بەكۆمەڵ بەهۆی بارانی توند و تاریكی و باو بڕ و ئەو جۆرە شتانەوە دروست و موباحە.

[٢٦١] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ١٧٦. واتە: سەرمای زۆر لە شەو و ڕۆژدا عوزرە، وە گەرمای توند لە نیوەڕۆیەدا عوزرە، [illegible] عوزرە.

نوێژەکەی وەرناگیرێ مەگەر عوزری هەبێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا عوزرەکەی چییە؟! فەرمووی: ترسان یان نەخۆشی.

ئنجا هەروەك چۆن ئەگەر ئینسان بە شەخسی نەخۆش بێ عوزری هەیە بۆ نەکردنی نوێژی بەکۆمەڵ، بە هەمان شێوەش ئەگەر سەرپەرشتی نەخۆشێك بکات کە بەهۆی لا چۆڵ کردنی مەترسی فەوتانی لێبکرێ، یان لە سۆنگەی ئەوەوە نارەحەت و دڵتەنگ بێت،خاوەنی (المُهَذّب) لەو بارەوە گوتوویەتی: ( و مِنْها أَنْ يكونَ قَيِّمـاً لمريْض يُخافُ ضِياعُهُ، لأنَّ حِفْظَ الآدَميّ أفضلُ مِنْ حِفظِ الجَماعَـةِ، و مِنْها أَنْ يكـونَ لَـهُ قَرِيْـبٌ مَرِيـضٌ يُخافُ مَوتُه، لِأنّه يَتألّم بِذلِكَ أكْثَر مِمّا يَتألَّمُ بِذَهابِ المال)[٢٦٢].

٣- لە کاتی نان خواردن دا کە ئامادەکرابێ و چاوی لە دووی بێ یان برسی بێ: پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (إذا كانَ أَحَدُكُمْ علىٰ الطّعامِ فَـلا يَعْجَـلْ حتّىٰ يَقْضِيَ حاجَتَهُ مِنْهُ وإنْ أُقيمَتِ الصّلاة) رواه البخاري ، واتـە: هەرکات یەکێکتان لەسەر نان خواردن بوو ئەگەر نوێژەکەش بەرپاکرابوو - دەست پێکرابوو - با هەتا پێویستی خۆی لێ جێبەجێ دەکات پەلەنەکات.

٤- لە حاڵەتی تەنگاویدا: چونکە پێغەمبەری کارزان ﷺ فەرموویەتی: _ لا صلاة بِحضْرَةِ الطّعام، ولا وَهُوَ يُدافِعُ الأ خْبَثَيْنِ) رواه أحمد و مسلم وابو داود، واتـە: نوێژ نابێ لەکاتی ئامادەکردنی خواردن دا یان لە کاتی تەنگاوی بەهۆی میزو پیسایییەوە بکرێ.

٥- لە کاتی خواردنی شتێکی بۆن ناخۆش دا، ئەگەر نەیتوانی بۆنەکەی لابەرێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ أكَـلَ ثُوْمـاً أو بَصَـلاً فَلْيَعْتَزِلْنـا، و لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنا و لْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ) متفق عليه، واتە: هەرکەسێك سیر و پیازی خوارد، با کەنارمان لێبگرێ، وە با لە مزگەوتەکەمان دووربێ و با لە ماڵی خۆی دابنیشێ.

(ابوالدرداء)یش خوا لێی ڕازیبێ لەو بارەوە قسەیەکی حەکیمانەی گوتوە: (مِنْ فِقْهِ الرجل إقْبالُهُ علىٰ حاجَتِهِ، حَتّىٰ يُقْبِلَ علـىٰ صَلاتِـهِ و قَلْبُـهُ فـارِغٌ) رواه البخاري، واتـە: لە شارەزایی و تێگەیشتنی پیاو ئەوەیە کە کار و پێویستی خۆی ڕاپەڕێنێ، تاکو بە دڵێکی خاڵی و ئامادەوە ڕووبکاتە نوێژەکەی.

---

[٢٦٢] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٤ ص ١٧٧، وە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاترلەبارەی عوزرەکانی نەچوونە نوێژی بەکۆمەڵ سەرنجی: (المجموع) ج ٤ ص ١٧٥ تا ١٧٨ ، وە (نيل الأوطار) ج٣ ص ١٨٩ تا ١٩٢، وە (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٦٩ تا ١٧٢، بدە.

## ٨- نوێژ گێڕانەوە (قضاء الصلاة):

شتێكی ئاشكرایە كە پێنج نوێژەكان - وەك لە پێشەوە باسمان كرد - هەركامێكیان كاتێكی تایبەتی بۆ دیاریكراوە كە تێیدا جێبەجێ بكرێ وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَوْقُوتاً﴾ النساء -١٠٣- بەلام ئایا ئەگەر چوێنرا و فەوتێنرا چارەسەر چییە؟! جارێ ئەگەر بەهۆیەكی شەرعییەوە فەوتینرابێ، وەك خەوتن و لەبیرچوونەوە، ئەوە تێكڕای زانایان دەڵێن پێویستە لە زووترین كات دا كە دەرەخسێ بكرێ، بەلام ئەگەر بە ئانقەست فەوتێنرابێ ئەوە زانایان ڕایان جیایە، هەرچی زۆربەی هەرە زۆریانن[٢٦٣] دەڵێن: دیسان هەر پێویستە بگێڕرێتەوە، بەلام هەندێكیان كە (داود الظاهري) و (ابن حزم الأندلسي)، پێشەوایانن و (ابن تيمية) و ( ابن القيم) یشیان لەنێودان، ڕایان وایە كە هەر نوێژێك بە ئانقەست بچوێنرێ قەت خاوەنەكەی بۆی ناگێڕرێتەوە و دروست نیە بیگێڕرێتەوە، بەڵكو لەجیاتی ئەوە دەبێ تۆبە بكات و داوای لێبوردن لە خوا بكات و نوێژی سوننەت بكات، بەشكم خوا بۆی قەرەبوو بكاتەوە.

ئەو فەرموودانەش كە زانایان لەو بارەوە بە بەڵگەیان دێننەوە ئەمانەن:

*(مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا لا كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ) رواه البخاري و مسلم عن انس بن مالك. واتە: هەركەسێك نوێژێكی لەبیرچوو با هەر كاتێك هاتەوە یادی بیكات، كەففارەتی تەنیا ئەوەیە.

*(إِذَا رَقَدَ أَحَدُكُمْ عَنِ الصَّلاةِ أَوْ غَفَلَ عَنْهَا فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا..) رواه مسلم ، واتە: ئەگەر یەكێكتان لە كاتی نوێژێك دا خەوتبوو یان لێی بێئاگابوو، با هەركاتێك هاتەوە یادی بیكات.

شایەنی باسیشە كە هەم جەماوەری زانایان - كە دەڵێن پێویستە نوێژی بەئانقەست چوێنرا و بگێڕرێتەوە - و هەم ئەوانەش كە دەڵێن دروست نیە بگێڕرێتەوە، ئەم فەرموودانەی سەرەوە و هاو وێنەكانیشیان بەبەڵگە دێننەوە. هەرچی

---

[٢٦٣] بڕوانە: (المجموع) ج٣ ص ٧٧، وە (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص ٢٠٩٦، وە (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٢ ٢٦٩، ٢٧٠، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٢ ص ٢ تا ٤ (باب قضاء الفوائت)، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص ، بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٢٩ (المبحث الثاني: قضاء الفوائت) ... بڕوانە: (الأدلة ...) ص ...

جەماوەرن دەڵێن: ئەگەر بابای خەوتوو و لەبیرچوو لە سەریان پێویست بێ نوێژەکانیان بگێڕنەوە، دیارە بابای تەنبەڵ و بەئانقەست نوێژچوێنەر حەو جار حەوجار و (بطريق الأولىٰ) لەسەری پێویستە بیگێڕێتەوە! ئەوانی دیکەش دەڵێن. مادام پێغەمبەر ﷺ تەنیا باسی (خەوتن) و (لەبیرچوونەوە) ی کردوە بۆ نوێژگێڕانەوە، کەواتە ئەوەی بە ئەنقەستی چواندبێتی بۆی نیە و مافی گێڕانەوەی نیە![264]

**جا خوێنەری بەڕێز:** ئەوەی بەندە پاش موتالاو سەرنج دانی زۆر پێی گەیشتووم ئەوەیە کە ڕای جەماوەر و زۆربەی زانایان بەهێزتر و جێی متمانە ترە، چونکە وێڕای ئەو بەڵگەیەی سەرێ چەند بەڵگەی دیکەشیان هن:

*فەرموودەی: (... **فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى**) رواه البخاري والنسائي عن ابن عباس، **واتە:** دە جا قەرزی خوا شایستە ترە و پێویست ترە کە بدرێتەوە - کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی حەج فەرموویەتی و نوێژ و حەجیش هەردووکیان دوو جۆرە عیبادەتی جەستەیین-.

*(**عن أبي هريرة رضي الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ أَمَرَ المُجامِعَ في نَهارِ رَمَضانَ أَنْ يَصومَ يَوْماً مَعَ الكَفّارَةِ: أَيْ بَدَلَ اليَوْمِ الّذي أَفْسَدَهُ بِالجِماعِ عَمْداً**) رواه البيهقي باسناد جيد و روى ابو داود نحوه، **واتە:** پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەو کەسە کردوە کە بە ڕۆژ لە ڕەمەزان دا لەگەڵ خێزانی جوت بووە، کە ڕۆژێك بگرێتەوە و (کَفّارَة) یش بدات، **واتە:** لەجیاتی ئەو ڕۆژەی کە بەهۆی جیماعەوە بە ئانقەست بەتاڵی کردۆتەوە.

*ئنجا ئەوە کە ئەوانی دیکە دەڵێن: ئەگەر بابای بە ئانقەست نوێژ چوێنەریش وەك نووستوو و لە بیرچوو بۆی هەبووایە نوێژەکەی بگێڕێتەوە، ئەوە لەگەڵ ئەوان دا یەکسان دەبوو!! وەك(ابن حجر العسقلاني)گوتوویەتی ڕاست نیە چونکە: بابای نوێژ چوێنەر ئەگەر نوێژەکەشی بگێڕێتەوە هەرچەندە گوناحی نەکردنی نوێژەکەی لەسەر

---

[264] بڕوانە: (مجموع الفتاوىٰ) ج٢٢ ص ٦٤، وە بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ ص٢٩٧ تا ٣٠٠، وە بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ ص ٢٠٠ (باب قضاء الفوائت)، هەمووشیان لەژێر کاریگەری قسەکانی (ابن حزم) دان، بڕوانە (المُحلّى شرح المُجلّى) ج٢ ص١٤٨ ، بەلاّم (ابن تيميّة) لەگەڵ ڕای جەماوەری زانایان دایە کە ئەهلی هەر چوار مەزەبەکانیشیان لەنێودان، بڕوانە: (مجموعة الفتاوىٰ) ج٢٢ ص ١٥، بەڵگەش بەوە دەهێننەوە کە ئەگەر لە دوای تێپەڕبوونی کات (وقت) نوێژ نەکرابایە ئەوە کەسێك کە هەر نایکات و کەسێك کە دەیکات بەلاّم دەیچوێنێ یەکسان دەبوون! بەلاّم بێگومان. کەسێك کە نوێژەکە [illegible] کاتەکەی [illegible] لەوەی کە [illegible] نەیکات.

لادەچێ، بەڵام گوناحی چواندن و دواخستنەکەی و لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا نەکردنی هەر لە ئەستۆیە، بەپێچەوانەوەی بابای نوستوو و لەبیرچووەوە کە بەهۆی کردنی نوێژەکانیان دوای بێداربوونەوە و وەبیرهاتنەوە هیچیان لەسەر نامێنێ، هەروەك چۆن کەسێك ڕۆژووی بە ئانقەست چواندبێ پێویستە بیگێڕێتەوە، هەرچەندە دوای گێڕانەوەشی گوناحی ڕۆژوو خواردنەکەی هەر لە سەرە[٢٦٥].

## ٩- بەتاڵ کەرەوەکانی نوێژ (مُبْطِلاتُ الصَّلاة)

وەك لە باسەکانی ڕابردوودا زانیمان نوێژ – چ فەرز بێ چ سوننەت – لە چەند قسەو کردەوەیەکی تایبەت پێك دێ و دروست نییە هیچ شتێکی دیکەی تێکەڵ بکرێ. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي) رواه البخاري. جا چەند قسەو ڕەفتارێك هەن هەرکاتێك تێکەڵ بە نوێژ کران دەبنە هۆی تێکدان و بەتاڵ کردنەوەی.

هەرچەندە زانایان زۆر بە تێرو تەسەلی باسی ئەم مەسەلەیەیان کردوە[٢٦٦]، بەڵام ئێمە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە و هەر بە کورتی چەند بەتاڵکەرەوەیەکی سەرەکی نوێژ دەخەینە ڕوو و خوێنەری بەڕێزیش حەواڵەی کتێب و سەرچاوەکانی زانا و پێشەوایانمان دەکەین، ئەگەر ویستی زیاتر و چاکتر لەو بارەوە شارەزابێت:

**یەك:** قسەکردنی بە ئانقەست: چونکە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی هاوەڵانیدا خوا لێیان ڕازیبێ کە عەرزیان کرد ئایا سەلامت لێ بکەین لە نوێژدا و وەڵاممان بدەیەوە فەرمووی: (إِنَّ فِي الصَّلاةِ لَشُغْلاً) رواه البخاري و مسلم عن ابن مسعود رضي الله عنه، واتە: لە نوێژدا سەرقاڵییەکی وا هەیە کە ڕێی قسەکردن نەدات.

هەروەها (زيد بن ارقم) رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێشتر لە نوێژدا قسەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد بەڵام کە – فەرمانی خوا – ﴿و قُومُوا للهِ قَانِتِينَ﴾ هاتە خوارێ،

---

[٢٦٥] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٢ ص ٢٦٩، ٢٧٠ چاپی ١٩٩٦.

[٢٦٦] بڕوانە: (فقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٥ تا ٣٨، کە (٦٨) بەتاڵکەرەوەی نوێژی لە مەزهەبی حەنەفیدا و دەوری (٣٠) لە مەزهەبی مالیکیداو (٢٧) لە مەزهەبی شافیعی دا و (٣٦) لە مەزهەبی حەنبەلیدا خستۆتەڕوو کە لە زۆربەیان دا یەکدەنگن و لە هەندێك شتیش دا ڕایان جیاجیایە.

فەرمانمان پێکرا کە بێدەنگ بین و قسەکردنمان لێ قەدەغەکرا، ئەم فەرموودەیەش (بخاري و مسلم و ابو داود والنسائي و ترمذي وأحمد) گێڕاویانەتەوە.

**دوو: جم و جوڵی زۆری بە ئانقەست:** کە زانایان لەسەر ئەسڵی مەسەلەکە یەکدەنگن بەڵام دەربارەی سنوور و ئەندازەی کردەوە و جم و جوڵی زۆر رایان جیاجیایە و پێم وایە باشترین سنووریش ئەوەیە: کە جم و جوڵەکە بەئەندازەیەك بێ هەرکەسێك ببینێ دڵنیابێ کە نوێژ ناکات[٢٦٧].

**سێ: نەکردنی فەرزێك لە فەرزەکانی نوێژ:** چونکە وەك پێشتر لە فەرمودەی: (المسيء صلاته) دا کە (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوەو هاتوە، پێغەمبەر ﷺ بەو کابرایەی فەرموو: (اِرْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ) واتە: بگەڕێوە نوێژ بکە چونکە نوێژت نەکردوە.

**چوار: نەبوونی یان لە میانە (خِلالْ) ی نوێژەکەدا نەمانی یەکێك لە مەرجەکانی نوێژ:** کە وەك دواتر باسیان دەکەین پاکی بەدەن و خاوێنی بەرگ و پۆشاك و شوێنی و هاتنی کاتی ئەو نوێژەو رووکردنە قیبلەن، کەواتە هەرکام لە بێدەست نوێژ بوون و عەورەتی خۆ دەرخستن و پیس بوونی جەستە و بەرگ و شوێن و روو لە قیبلە وەرگێران و نەهاتنی کاتی نوێژەکە دەبنە هۆی بەتاڵ کردنەوەی نوێژ.

**پێنج: پێکەنین بە دەنگی بەرز و قاقا:** (ابن المنذر) گوتوویەتی: زانایان یەکدەنگن لەسەرئەوە کە پێکەنینی بە قاقا نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، (نووي) یش گوتوویەتی: زۆربەی زانایان دەڵێن: زەردەخەنە زیانی نیە و ئەگەر پێکەنینیش زۆری بۆ هێناو پێی نەگەڕایەوە ئەگەر کەم بێ نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر زۆر بێ بەتاڵی دەکاتەوە. بۆ ئەندازەی کەمی و زۆریش جگە لە عورف پێوەرێکی دیکەمان نیە[٢٦٨].

---

[٢٦٧] بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج٢ ص (١٥)، هەروەها بڕوانە (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٥.

[٢٦٨] سەرچاوەی پێشوو ج١ ص [illegible]

**شەش: خواردن و خواردنەوە:** (ابن المنذر) گوتوویەتی: زانایان تێکڕا لەسەرئەوە یەکدەنگن کە هەر کەسێك بە ئانقەست لە نوێژی فەرزدا بخوات و بخواتەوە نوێژەکەی بەتاڵەو دەبێ دووبارەی بکاتەوە، هەروەها بەپێی ڕای جەماوەری زانایان نوێژی سوننەتیش بە هەمان شێوە..[٢٦٩] بەڵام هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە خواردنەوە بۆ نوێژی سوننەت زیانی نیە، بۆ وێنە لە (سعید بن جبیر) و (عبدالله بن الزبیر) ەوە گێڕراوەتەوە کە لە نوێژی سووونەت دا شتیان خواردۆتەوە[٢٧٠]، هەروەها(طاوس) و (اسحاق) ڕایان وابووە کە شت خواردنەوە لە نوێژدا زیانی نیە چونکە کرادرێکە کەمە.[٢٧١]

**حەوت: پێشکەوتنەوەی ئیمام بە ئانقەست بە ئەندازەی یەکێك لە پایەکانی نوێژ:** ئەمەش سەرجەم زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون، بەڵام بێگومان ئەگەر بە ئانقەست نەبێ و بەهۆی لەبیرچوونەوە و لێ تێکچوونەوە بێت نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە[٢٧٢].

**هەشت: سەلام دانەوە پێش تەواوکردنی نوێژەکە:** چونکە سەلام دوایین پایەی نوێژە کە بابای نوێژکەر ئەنجامی دەدات و پێی لە نوێژەکەی دەچێتە دەرێ، جا هەرکاتێك بە ئانقەست سەلامی دایەوە ئەوە لە نوێژەکەی چۆتە دەرێ جا ئەگەر تەواوی کردبێ باشە، ئەگەرنا بە ناتەووای لێی چۆتە دەرێ و بەتاڵی کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر بە هەڵە سەلامی دایەوە و قسەو کردەوەی زۆری بەدوادا نەهاتبوو بەتاڵ نابێتەوە[٢٧٣] و پێویستە دەستبەجێ بچێتەوە نێو نوێژەکەی و تەواوی بکات.

---

[٢٦٩] سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٢٩٤.

[٢٧٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٤.

[٢٧١] سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٢٩٤، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ١٤.

[٢٧٢] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٢٢.

[٢٧٣] سەرچاوەی پێشوو ج٢ ص ٢٤

## ١٠- ئەو شتانەی کە لە نوێژدا ناپەسەندن (مكروهات الصلاة):

دوای ئەوەی زانیمان چ شتێك لە نوێژدا حەرامە و دەبێتە هۆی بەتاڵ کردنەوەی و تێکدانی، خوا یاربێ لەم کورتە باسەدا گرنگترینی ئەو هەڵس و کەوتانەی کە لە نوێژدا ناپەسندن دەخەینە ڕوو:

**یەك:** دەست تێوەردان و دەست لێکوتانی بەرگ و پۆشاك و بەدەن و جێگای نوێژ: ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەو بارەوە:

*(مُعَيقِبْ) خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی دەست بە چەوداهێنان لە نوێژدا فەرمووی: (تَمْسَحُ الحَصَى وأنْتَ تُصَلّي! فَإنْ كُنْتَ لابُدَّ فاعِلاً فَواحِدَةً: تَسْوِيَةُ الحَصَى) رواه البخاري و مسلم. واتە: نوێژدەکەی و دەستیش بە چەودا دێنی؟! ئەگەر هەر ناچار بووی بیکەی یەك جار، چەوەکە ڕێك بخە!

*هەروەها فەرموویەتی: (أُسْكُنُوا في الصَّلاةِ) رواه مسلم: واتە: لە نوێژیدا ئارام و بێ جووڵە جووڵ بن.

**دوو:** سەربەرزکردنەوە بۆ ئاسمان: پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصارَهُمْ الىٰ السَّماءِ في الصَّلاةِ أو لَتُخْطَفَنَّ أَبْصارُهُمْ) رواه احمد و مسلم والنسائي. واتە کەسانێك کە لە نوێژدا چاویان بەرەو ئاسمان هەڵدێنن یان دەبێ واز بێنن یان چاوەکانیان دەرفێنرێن. (واتە: تۆڵە و سزایەکی هێندەی چاو کوێربوونیان بۆ تەرخان دەکرێ).

**سێ:** ئاوڕدانەوە لە نوێژدا: پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (هو اخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشيطانُ مِنْ صَلاةِ العَبْدِ) رواه البخاري، واتە: ئەوە دزییەکە کە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێ.

**چوار:** دەست دەکەلەکە گرتن:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه نَهَىٰ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِراً) رواه مسلم واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قەدەغەکردوە کە کابرا لە نوێژدا دەست بە کەلەکەیەوە بگرێ.

**پێنج:** لە کاتی خواردن دانران و تەنگاویدا: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُصَلّوا بِحَضْرَةِ الطَّعامِ، و لا وهُوَ يُدافِعُهُ الأَخْبَثانِ) متفق عليه. ، (پێشتر لێکدراوەتەوە).

**شەش:** نوێژکردن بە خەواڵوویی: پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (اذا نَعَسَ أحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ حتّىٰ يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فانَّهُ إذا صَلّىٰ وهُوَ ناعِسٌ لعله يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ) رواه البخاري و مسلم، واتە: ئەگەر یەکێکتان - لە نوێژیدا - وەنەوزی هات با بچێ

بخەویٚ هەتا خەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەگەر بە خەواڵوویی نوێژی بکات دەبینی دەیەویٚ داوای لێبوردن بکات کەچی قسە بەخۆی دەڵێ!!

**حەوت:** زار داپۆشین و پۆشاك بەسەرخۆدا بەردانەوە:

*( عن أبي هريرة رضى الله عنه قال: نَهىٰ رسول اللهِ ﷺ عَنِ السَّدْلِ[٢٧٤] في الصَّلاةِ وأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فاهُ) رواه مسلم وابوداود والنسائي والترمذي، **واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگ و پۆشاك بەسەرخۆدا شۆڕکردنەوەی لە نوێژدا قەدەغەکردوە، هەروەها ئەوە کە کابرا زاری خۆی داپۆشێ.

**هەشت:** دیاریکردنی شوێنێکی تایبەت لە مزگەوتیٚدا بۆ نوێژ تێداکردن، بێجگە لە ئیمام: *(عن عبدالرحمن بن شبل قالَ: نَهىٰ رَسولُ اللهِ ﷺ عَنْ نَقْرَةِ الغُرابِ، وإفتِراشِ السَّبعِ، وأنْ يُوَطِّدَ الرَّجُلُ المَكانَ في المَسْجدِ كَما يُوَطِّنُ البَعيْرُ) رواه احمد وابن خزيمة وابن حبان والحاكم وصححه، **واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ کڕنووش بردنی وەك دەندووك لە زەویدانی قەلەڕەشەو، - دەست ڕاخستن وەك - دەست ڕاخستنی دڕندەی قەدەغەکردوە، هەروەها ئەوەشی قەدەغەکردوە کە کابرا شوێنێك لە مزگەوتیٚ بۆ خۆی تەرخان بکات، وەك چۆن حوشتر شوێنێکی تایبەت دەکاتە مۆڵگەی خۆی.

**نۆ:** تەماشاکردنی شتێك کە مایەی خافڵاندن بێت: وەك (عائشە) خوا لێی ڕازیبیٚ دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە بەرگێکدا نوێژی دەکرد کە نەخش و نیگاری تێدابوون، وە فەرمووی: (شَغَلَتْني أعلام هٰذهِ إذهَبُوا بِها الىٰ أبـي جَهْم وأْتُوني بِأنْبَجانِيَتِهِ) رواه البخاري و مسلم، واتە: نەخش و نیگاری ئەم - پۆشاکە - ە خافڵاندمی، ئەمە بۆ (ابو جهم) ببەن و ئەنبەجانی یەکەیم بۆ بێنن[٢٧٥].

**دە:** چاو نووقاندن: کە هەندێك لە زانایان بە ناپەسەندیان داناوە و هەندێکیشیان بە دروستیان زانیوە، (ابن القيم) یش گوتوویەتی: ڕاست ئەوەیە کە ئەگەر چاو کردنەوە نەبێتە هۆی نەمانی گەردن کەچیو دڵ بێداری (الخشوع) ئەوە بێگومان چاکترە، بەڵام بەهۆی ئەگەر زرق و برق و نەخش و نیگارەوە چاو کردنەوە بووبەهۆی داڵغەو خولیا و خافڵاندن ئەوە نەك هەر چاو قوچووچاندن ناپەسند نیە بگرە ڕێی تیٚدەچیٚ و نزیکە کە سوننەتیش بێت[٢٧٦].

---

[٢٧٤] (سَدْل) بریتیە لە شۆڕکردنەوەی بەرگ و پۆشاك بە جۆرێك کە لە زەوی بخشیٚ، هەندێکیش دەڵێن: بە سەرشان دادان و دەست لە قۆڵ هەڵنەهێنانە.

[٢٧٥] أنبَجانية: بەرگێکی ئەستوورو زبرو بیٚنەخش و وێنەیە.

[٢٧٦] بڕوانە: (فقه السنة ج١ ص٢٩٤)

## ١١- ئەو شتانەی کە لە نوێژدا دروست و ڕەوا و ڕێ پێدراون:

خوێنەری بەڕێز: دوای ئەوەی زانیمان چ شتێك نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە و چ شتێکیش خراپ و ناپەسندە و خێری کەم دەکاتەوە، جێی خۆیەتی بشزانین چی و چی لە نوێژدا موباح و دروستن و بابای نوێژکەر بۆی هەیە و مۆڵەتی پێدراوە کە لە کاتی پێویست و ناچاریدا بیانکات بێئەوەی نوێژەکەی هیچ جۆرە زیانێکی لەو سۆنگەیەوە پێ بگات:

**یەك: گریان و ناڵاندن چ لە ترسی خوا بێت چ لەبەر ئازار و نارەحەتی و خەفەت:**

*ئەمەش چەند دەقێك لەو بارەوە:*

*خوای بەرز و مەزن دەربارەی کۆمەڵێك لە بەندە هەڵبژاردەکانی خۆی فەرموویەتی: ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَٰنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ مريم - - واتە: کاتێك ئایەتەکانی خوای خاوەن بەزەیی یان بەسەردا بخوێندرێتەوە لە پەو ڕوو دەکەونە سەرزەوی و بە گریانەوە کڕنووش دەبەن.

*(عن عبدالله بن الشِّخِّير رضي الله عنه قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ و في صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ المِرْجَلِ مِنَ البُكَاءِ) رواه احمد وابوداود والنسائي والترمذي و صححه، واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لەبەر گریان دڵی قوڵپی دەدا وەك قوڵپی مەنجەڵ.

*وە بەیانییەك عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازیبێ نوێژی بەیانی کرد و سوورەتی (یوسف) ی خوێند هەتا گەیشتە: (إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللهِ) دەنگی گریانی بڵندی - عومەر - بیسترا. (بخاري و سعيد بن منصور وابن المنذر) گێڕاویانەتەوە.

**دوو: ئاوڕدانەوە لە کاتی پێویستیدا:** دیارە پێشتر گوتمان کە بەبێ پێویستی ئاوڕدانەوە شتێکی ناپەسندە، بەڵام لە کاتی پێویستیدا دروستە وەك (أبو داود) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا ئاوڕی بەلای شیوەکەدا دەدایەوە، (ابو داود) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوارێکی ناردبووە لای ئەو شیوە کە بە شەو ئێشکە بگرێ.

بەڵام بێگومان نابێ ئاوڕدانەوەکەش لە مل سووڕاندن زیاتر بێ، چونکە وەرچەرخانی یەکجاری لە قیبلە دەبێتە هۆی نوێژ بەتاڵ کردنەوە.

**سێ: کوشتنی مار و دووپشك و زەرگەتە و هەر زیندەوەرێکی دیکەی زیانبەخش:** چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عن ابي هريرة أنّ النبيّ ﷺ قال: **اقتلوا الأسودين في الصلاة: الحية والعقرب**) رواه احمد واصحاب السنن. **واتە**: دوو شتە ڕەشەکان لە نوێژدا بکوژن: مار و دووپشك.

**چوار: ڕۆیشتنێکی کەم لەبەر پێویستی:** چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە وەك (عائشة) خوا لێی ڕازیبێ بۆمان دەگێڕێتەوە:

*(**كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي في البَيْتِ والبابُ عليهِ مُغلقٌ فجِئْتُ فاستفتحتُ فمشَى ففتحَ لي ثم رَجَعَ الى مُصَلّاهُ ووصفَتْ أنّ البابَ في القِبْلَةِ**) رواه احمد وابوداود والنسائي والترمذي و حسنه، **واتە**: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەوە نوێژی دەکرد و دەرگاکەشی داخرابوو، منیش هاتم و داوای کردنەوەیم کرد ئەویش هات بۆی کردمەوە پاشان گەڕایەوە شوێنی نوێژەکەی، بەڵام دەرگاکە لەلای قیبلەوە بوو. کەواتە ئەگەر دەرگاکە وابوو کە نوێژکەر ناچار نەبێ پشت بکاتە قیبلە بۆ کردنەوەی ئەوە دروستە ئەگەرنا وا پێدەچێ دروست نەبێ، وەك لەم فەرموودەیەش دا دەردەکەوێ:

*(**كانَ ﷺ يُصَلِّي فإذا استَفْتَحَ انسانٌ البابَ فَتَحَ البابَ ما كانَ في القِبْلَةِ أو عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ يَسارِهِ ولا يَسْتَدْبِرُ القِبْلَةَ**) رواه الدارقطني.

**پێنج: هەڵگرتن و لەباوەش گرتنی منداڵ لە کاتی پێویستیدا:** چونکە لە فەرموودەیەك دا کە (احمد و نسائی) لە (ابي قتادة) ی دەگێڕنەوە، هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردوە و (أُمامَة) ی کچی زەینەبی کچی خۆی ﷺ لەسەر ئەستۆی بووە، جا کاتێك کە چۆتە ڕکوع داینـاوە و دوای ئەوەی کە لە سەجدە هەڵساوەتەوە دووبارە هەڵیگرتوە و لەسەر ملی خۆیدا دایناوەتەوە.

هەروەها (احمد و نسائي و حاكم) لە (عبدالله بن شداد عن ابيه) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺلە یەکێك لە دوو نوێژەکانی دوای نیوەڕۆ (نیوەڕۆ یان عەصر) دا (حسن) یان (حسين) ی هەڵگرتوە و لە نوێژەکەی سەجدەیەکی درێژی بردوە. پاشان کە لەو بارەوە لێیان پرسیوە فەرموویەتی: (**إنّ ابْنِي هذا ارْتَحَلَنِي فَكَرِهْتُ أنْ أُعْجِلَهُ حتّى يَقْضِيَ حاجَتَهُ**) واتە: ئەم کوڕەم چوو بووە سەر پشتم و حەزم نەکرد پەلەی لێبکەم هەتا خۆی دێتە خوارێ.

(نووي) لەو بارەو گوتوویەتی: (هذا يدلُّ لِمذهَب الشافعي رَحِمَهُ اللهُ تعالىٰ ومَنْ وافقه أنَّهُ يَجوزُ حَمْلُ الصَّبيِّ والصَّبيَّةِ و غَيْرِهما مِنَ الحَيْوانِ الطَّاهِرِ في صَلاةِ الفَرْضِ، و صَلاةِ النَّفْلِ، و يَجوزُ ذلِكَ لِلْإمامِ و المأموم.. [277])

**واتە:** ئەم – فەرموودانە – بەڵگەن بۆ ڕای شافیعی خوالێی خۆش بێ و ئەوانەی ڕایان وەك ویە كە دروستە منداڵی كوڕ و كچ و هەر گیاندارێكی دیكەی پاك لە نوێژی فەرز و سوننەت دا هەڵبگیرێ وە ئەوە بۆ ئیمام و نوێژكەر دروستە..

**شەش:** سەلام كردن لە نوێژكەرو وەڵامدانەوەی بە ئیشارە: (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێك دا كە دەچوو بەرەولای (بني المصطلق) ڕەوانەی كردم، جا كاتێك گەڕامەوە لای لەسەر حوشترەكەی لە نوێژیدابوو، منیش قسەم لەگەڵ كرد ئەویش بەدەستی ئاماژەی كرد، پاشان دووبارە قسەم لەگەڵ كرد ئەویش دیسان بەدەستی ئاوا ئاماژەی كرد، وە من گوێم لێبوو قورئانی دەخوێند و بە سەری ئیشارەی – بۆ ڕكووع و سەجدەكان – دەكرد. جا كاتێك لێبۆوە فەرمووی: (ما فَعَلْتَ في الَّذي أرْسَلْتُكَ؟ فَاِنَّهُ لَمْ يَمنَعني مِنْ أنْ أرُدَّ عليكَ إلاَّ أنـّي كُنْتُ أُصَلّي) رواه احمد و مسلم، **واتە:** بۆ ئەو كارەی كە ناردبوومی چیت كرد؟! ئەوەی ڕێی لێگرتم وەڵامت بدەمەوە هەر ئەوەبوو كە لە نوێژیدابووم.

هەروەها (عبدالله بن عمر) لە (صهيب) خوا لێیان ڕازیبێ دەگێڕێتەوە كە گوتوویەتی: بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕەت بووم نوێژی دەكرد، منیش سەلامم لێكرد كەچی بە ئاماژە وەڵامی دامەوە.. (احمد و ترمذي) گێڕاویانەتەوە و (ترمذي) بە ( صحيح) ی داناوە.

دیسان (عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ دەڵێ بە (بلال) م گوت: ئایا پێغەمبەر ﷺ كاتێك كە لە نوێژدا سەلامیان لێدەكرد چۆنی وەڵام دەدانەوە؟! گوتی: بەدەستی ئاماژەی بۆ دەكردن،(احمد و ابو داود و نسائي و ترمذي و ابن ماجه) گێڕاویانەتەوە.

تێبینی: هەڵبەتە سەلام كردن لە بابای نوێژكەر هەرچەندە دروستە، بەڵام سوننەت نیە، ئینجا ئەگەر هات و سەلامی لێكرا وا باشە بە ئاماژەی دەست یان پەنجەكانی وەڵام بداتەوە و، دروست نیە بە دەم و بە قسەكردن وەڵام بداتەوە و پاش تەواوكردنی نوێژەكەی با وەڵامی بداتەوە [278].

---

[277] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص ١٨١٨ ، ١٨١٩.

[278] بڕوانە: (الـ[illegible]) ج[illegible] ص [illegible]

**حەوت:** <u>(سُبْحانَ اللهِ) گوتنی پیاوان و چەپڵەلێدانی ئافرەتان:</u> دروستە لە کاتێك دا پێویست بێ ئیمام ئاگادار بکرێتەوە لە هەڵەیەك، یان کوێرێك ڕێنمایی بکرێ، یان مۆڵەتی یەکێك بدرێ بۆ هاتنە ژوورەوە و وێنەی ئەمانە، پیاوان (سبحان الله) بڵێن و ئافرەتانیش چەپڵە لێبدەن:

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: **(مَنْ نابَهُ شَيءٌ في صَلاتِهِ فليَقُلْ: سُبْحَانَ اللهِ، إنَّما التَّصْفِيقُ للنِّساءِ والتَّسْبِيحُ للرِّجالِ)** رواه احمد و ابوداود والنسائي. **واتە:** هەرکەسێك لە نوێژەکەیدا شتێکی پێشهات با بڵێ: (سبحان الله) چونکە بێگومان چەپڵەکوتان بۆ ئافرەتانە و (سبحان الله) کردن بۆ پیاوان.

<u>**تێبینی:**</u> زانایان گوتوویانە: شێوەی چەپڵەلێدانی ئافرەتان ئەوەیە کە بە لەپی دەستی ڕاستیان لە پشتی دەستی چەپیان بدەن بە جۆرێك کە ببێتە هۆی ئاگادرکردنەوە و ورياکردنەوە.

**هەشت:** <u>هاوکاریکردنی ئیمام و بیرخستنەوەی:</u> هەرکاتێك ئیمام ئایەتێکی لەبیرچوو بیخوێنێ، یان قورئان خوێندنەکەی لێ تێکچوو دروستە و بگرە سوننەتە کە بابای نوێژکەر یارمەتی بدات و بیخاتەوە یادی، ئەمەش فەرموودەیەك لەو بارەوە:

* **(عن ابن عمر رضى الله عنهما أن النبي ﷺ صلَّى صلاةً فقرأ منْها فالْتَبسَ عَلَيهِ فلمـا فَرَغَ قال لِأُبَي: أَشَهِدْتَ مَعَنا؟! قال: نَعَمْ، قال. فَمـا مَنَعَكَ أَنْ تَفْتَحَ عَلَيَّ؟)** رواه ابو داود و غيره و رجاله ثقات، **واتە:** پێغەمبەر ﷺ نوێژێکی کرد قورئانی تێدا خوێند و لێی تێکەڵ بوو، کاتێك تەواوبوو بە بابمی[279] فەرموو: تۆش لەگەڵمان بووی؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: چ شتێك ڕێ گرت بوو کە بیرم بخەیەوە؟!

<u>**نۆ:** ستایشی خوا کردن لە کاتی پژمین و پەیدابوونی نیعمەتێك دا:</u> دروستە بابای نوێژکەر لە کاتی پژمین دا بڵێ: (الحمد لله) هەروەها لە کاتی ڕوودانی نیعمەتێك یان لاچوونی بەڵایەك دا، وە دروستە (سبحان الله) و هەر جۆرە زیکرێکی دیکەی گونجاو بکرێ، ئەمە ڕای زۆربە و جەماوەری زانایانە و ئەم فەرموودەیە و هاووێنەکانیشی بە بەڵگە دێننەوە:

---

[279] واتە بە عومەری کوڕی خەتتابی فەرموو چونکە ڕاوی ئەم فەرموودەیە عەبدوڵڵای کوڕیەتی خوا لێیان ڕازیبێت.

(رفاعة بن رافع) خوا لێی ڕازی‌بێ گوتوویەتی: ( لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژم دەکرد پژمیم و گوتم: (الحَمْدُ لِلهِ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ كَما يُحِبُّ رَبُّنا ويَرْضَى) [280] جا کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژکەی کرد. فەرمووی: کێ‌بوو لە نوێژدا قسەی کرد؟ هیچ کەس قسەی نەکرد. دووبارە فەرموویەوە، کەس قسەی نەکرد، پاشان بۆ جاری سێیەم فەرموویەوە! (رفاعة) گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە سی‌و هێندە فریشتەیە پێشبڕکەیان کرد داخوا کامیان - بەرەو لای خوا- بەرزی دەکاتەوە). (نسائي و ترمذي) و (بخاري) یش بەجۆرێکی دیکە گێڕاویانەتەوە.

تێبینی:

ا-وەك گوتمان ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە کە دروستە لە غەیری ڕکووع و سەجدەدا زیکرو ستایشی خوا بکرێ، بەڵام هەندێکیان بە دروستی نازانن [281].

ب-لە فەرموودەی (صحیح) دا هاتوە کە خوا پژمینی خۆش دەوێ و ڕقی لە باوێشکە (إِنَّ اللهَ يُحِبُّ العُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثاؤُبَ) جا دەربارەی باوێشك دان لە نوێژدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا تَثاءَبَ أحَدُكُمْ في الصَّلاةِ فَلْيَكْظِمْ ما اسْتَطاعَ ولا يَقُلْ "ها" فَإِنَّ ذلِكُمْ مِنَ الشَّيْطانِ يَضْحَكُ مِنْهُ) رواه البخاري عن ابي هريرة، واتە: ئەگەر یەکێکتان لە نوێژیدا باوێشکی هاتێ با چەندی پێی دەکرێ کپی بکاتەوە وە - زاری قژ نەکات - و نەڵێ: ها، چونکە ئەوە لە شەیطانەوەیە و بەوە پێ‌دەکەنێ.

٥٥: دروستە نوێژکەر لەسەر بەشێکی پۆشاکەکەی سەجدە بەرێ لە کاتی پێویستدا: ئەم دەقەی خوارەوەش بەڵگەی ئەم مەسەلەیەیە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أَنَّ النبيَّ ﷺ صلّى في ثَوْبٍ واحِدٍ يَتَقِي بِفضولِهِ حَرَّ الأرضِ و بَرْدَها) رواه احمد بسند صحيح، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە یەك پۆشاك دا نوێژی دەکرد و بە بەشێکی خۆی لە گەرمی و ساردی زەوی دەپاراست. (دیارە ئەگەر لەبەر خۆپاراستن - بەتایبەت نێوچاوان - لە ساردی و گەرمی زەوی نەبێ یان نادروست یان لانی کەم ناپەسندە).

---

[280] واتە: ستایش بۆ خوا ستایشێکی زۆری پاك و چاکی بەپیت و پیز وەك پەروەردگارمان پێی خۆشە و ڕازی دەبێ.

[281] بروانە: (المجموع) ج٤ ص٩٩.

**یازده: قورئان خوێندن لە نوێژدا لە قورئان (مصحف) دا:** ئەمە ڕای زۆربەی[282] زانایانە کە دروستە - بۆ کەسێك قورئانی لەبەربێ یان نا - کە قورئان خوێندنی نوێژەکەی لەبەر قورئانێ بێ و بەدەستیش لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە، هەندێکیشیان دەڵێن: ئەوە نوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام بێگومان ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە (ذكْوان) - کۆیلەی ئازادکراوی عائیشە - لە ڕەمەزانێ پێش نوێژی بۆ عائیشە - خوا لێی ڕازیبێ - دەکرد و لە قورئانێدا دەیخوێند[283].

**دوازدە: دروستە بە پێڵاو یان بە نەعلەوە نوێژ بکرێ:** *ئەمەش چەند دەقێك لەبارەوە:* *(عن ابو مسلمة سعيد بن يزيد الأزدي قال: سَأَلْتُ أَنَسَ بنِ مالِكٍ: أَكَانَ النبيُّ ﷺ يُصَلِّي في نَعْلَيْهِ؟ قال: نَعَمْ) رواه البخاري، **واتە:** لە (انس بن مالك) م پرسی: ئایا پێغەمبەر ﷺ بە نەعلەکانی‌یەوە نوێژی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ.

*هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (خالِفوا اليَهُودَ فإنَّهُمْ لا يُصَلُّونَ في نِعالِهِمْ ولا خِفافِهِمْ) رواه الحاكم وابوداود عن شداد بن اوس، **واتە:** پێچەوانەی جوولەکە ڕەفتار بکەن چونکە ئەوان بە نەعلەکانیان و خوففەکانیانەوە نوێژناکەن.

*(ابو سعيد الخدري) رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد نەعلەکانی دانا، خەڵکەکەش نەعلەکانیان داکەند، جا کاتێك لێبۆوە پێی فەرموون: بۆچی نەعلەکانتان داکەند؟! گوتیان: چونکە بینیمان تۆ نەعلەکانت دانا ئێمەش داماننان! فەرمووی: (إنَّ جِبْرِيلَ أتاني فَأَخْبَرَني أَنَّ بِهِما خَبَثاً، فَإِذا جاءَ أَحَدُكُمْ المَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَهُ ولْيَنْظُرْ فِيهِما فإنْ رأى خَبَثاً فَلْيَمْسَحْهُ بالأَرْضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِما) رواه احمد وابوداود، **واتە:** ئەوە جوبرائیل هاتە لام و پێی ڕاگەیاندم کە پیسی‌یەکیان پێوەیە، جا هەرکات یەکێکتان هاتە مزگەوتێ با نەعلەکانی هەڵگێڕێتەوە و تەماشایان بکات، ئەگەر پیسی پێوە بینین با بە زەوی بیسڕێتەوە و دوایی نوێژیان پێوە بکات[284].

---

[282] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ١٠٥ ، ١٠٦، کە دەڵێ: (و هذا الذي ذكرناهُ مِنْ أنّ القراءةَ في المُصْحَفِ لا تُبْطِلُ الصلاةَ مذْهبُنا ومذهبُ مالك وابي يوسف و محمد و احمد. و قال ابو حنيفة تُبْطِلُ..)

[283] بڕوانە: (كتاب الموطأ) ج١ ص ٩٦، وە بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ ص ٢٨٩.

[284] بڕوانە: (فتح الباري بشرح صحيح البخاري) ج٢ ص ٥٠، (باب: الصلاة في النعال)و وە بڕوانە (نيل الأوطار) ج١ [illegible] ٥٥٠)، [illegible] ١٢١ [illegible].

تێبینی: هەرچەندە لە فەرموودەکان دا بەس ناوی (نەعل) هاتوە بەڵام حوکمەکە گشتییە و هەموو جۆرە پێڵاوێك دەگرێتەوە و پێڵاوی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیش زیاتر هەر نەعل بووە.

شایانی باسیشە کە زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەبەر تیشکی ئەو فەرموودانەدا ڕایان وایە کە شتێکی ڕەوا و دروستە بە پێڵاو و نەعلەوە - مادام پاك بن - نوێژ بکرێ و هەرکام لە (أوزاعي)و(ابو حنيفة)و(ابو يوسف) و(ابو ثور) و (اسحاق) و (ظاهرية) و (احمد و شافعي) یەکی لە ڕایەکیان دا بە دروستیان زانیوە[285].

## ١٢- مەرجەکانی نوێژ (شروط الصلاة):

مەرجەکانی ئەنجام دان و بەرپاکردنی نوێژ چ پێنج فەرزەکان و چ هەر نوێژێکی دیکەی فەرز. یان سوننەت دوو جۆرن؛

أ-مەرجەکانی پێویست بوونی نوێژ.

ب-مەرجەکانی وەبەرکەوتن (صحة) ی نوێژ.

### *أ- مەرجەکانی پێویست بوونی نوێژ (شروط وجوب الصلاة):*

یەك: مسوڵمانەتی، چونکە بێگومان بابای کافر بەرلەوەی داوای نوێژ و ئەرکەکانی دیکەی ئیسلامەتی لێبکرێ، پێویستە ئیمان و عەقیدەی هەبێ، زانایان لەو بارەوە گوتوویانە: هەرکەسێك بڕوای بە بنچینەکانی ئایین نەبێ داوای لێناکرێ کە لق و پۆپەکانی جێبەجێ بکات.

دوو: عاقڵ بوون، چونکە بەبێ عەقڵ و هۆش بەندایەتی بۆ خوا ناکرێ و ئەرکەکانی دینداری بەڕێوە نابرێن، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عن النَّائِمِ حتَّى يَسْتَيقِظَ، و عَنِ الصَّبِيِّ حتَّى يَحْتَلِمَ، و عَنِ المَجْنُونِ حتَّى يَعْقِلَ) رواه ابوداود والحاكم و صححه و رواه احمد بالفاظ مختلفة: واتە: قەڵەم - ی گوناح نووسین - لەسەر سێ جۆرە کەسان هەڵگیراوە: خەوتوو تا بێداردەبێتەوە، منداڵ هەتا باڵغ دەبێ، شێت هەتا هۆشی دێتەوە سەر.

---

[285] بڕوانە: (نیل [illegible] ج [illegible] ص ٤ [illegible]

سێ: باڵغ بوون، وەك چەندان دەقی قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەكەن، مەرجی تەكلیفە، وە ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردووین كە بە حەوت ساڵی منداڵەكانمان فێرە نوێژ بكەین بۆ ڕاهێنان و بار پێوەگرتن و پەروەردەبوونە ئەگەرنا لەسەریان پێویست نیە، وەك فەرموویەتی: (مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ اذا بَلَغُوا سَبْعاً..) رواه الترمذي و حسنه.

### ب- مەرجەكانی وەبەركەوتنی نوێژ (شروط صحة الصلاة):

كە ئەم پێنج مەرجەی خوارەوەن:

یەك: پاكی لە بێدەست نوێژی گەورە و گچكە (الطهارة من الحدثين الأكبر والأصغر)، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ) رواه مسلم، واتە: خوا هیچ نوێژێك بەبێ دەست نوێژ و لەش پاكی وەرناگرێ.

دوو: خاوێنی جەستەو پۆشاك و شوێن، كە ئەمە ڕای جەماوەر و زۆربەی زانایانە و هەندێكیشیان خاوێنی ئەو سێیانە (جەستەو پۆشاك و شوێن) بە فەرز و هەندێكیشیان بە سوننەتی دەزانن[286]، دیارە دەقیش لە قورئان و سوننەت دا لەسەر مەرج بوون و فەرزبوونی خاوێنی ئەو سێیانە زۆرن، بۆ وێنە:

*(عن أنس أن النبي ﷺ قال: تَنَزَّهُوا مِنَ الْبَوْلِ فَإِنَّ عامَّةَ عَذابِ الْقَبْرِ مِنْهُ) رواه الدارقطني و حسنه: واتە: خۆتان لە میز پاك بكەنەوە چونكە زۆربەی ئەشكەنجەی گۆڕ لەوەوەیە.

*خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَثِيابَكَ فَطَهِّرْ﴾ المدثر - ٤ - واتە: وە پۆشاكت خاوێن بكەوە، وە (جابر بن سمرة) خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ گوێم لە پیاوێك بوو لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئایا لەو بەرگەدا نوێژ بكەم كە پێی دەچمە لای هاوسەركەم؟! فەرمووی: (نَعَمْ إلاّ أَنْ تَرَىٰ فيهِ شَيْئاً فَتَغْسِلَهُ) رواه احمد وابن ماجة بسند رجاله ثقات، واتە: بەڵێ، مەگەر شتێكی پێوە ببینی و بیشۆیەوە.

*( عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قامَ أَعْرابِيٌّ فَبالَ في المَسْجِدِ فَقامَ إِلَيهِ النّاسُ لِيَقَعُوا بِهِ، فَقالَ النَّبيُّ ﷺ: دَعُوهُ وَأَرِيقُوا عَلىٰ بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ..) رواه البخاري واصحاب السنن،

---

[286] بڕوانە: (الروضة الندية ج١ ص١٢٧، ١٢٨).

واته: ئەعرابییەك هەستاو لە مزگەوت - ی پێغەمبەر ﷺ میزی كرد، خەڵكیش بۆی هەستان كە لێی بدەن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی گەڕێن - با میزەكەی تەواو بكات - دوایی دۆڵچەیەك ئاو بەسەر شوێنی میزەكی دا بكەن.

سێ: داپۆشینی عەورەت: ئەمیش زۆربەی هەرە زۆری زانایان بە مەرج و هەندێكیشیان بە فەرزی دادەنێن، دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن بۆ وێنە:

*خوای كاربەجێ فەرموویەتی: (يا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ) الأعراف -٣١- ، واتە: ئەی وەچەی ئادەم لە لای هەموو مزگەوتێك خۆتان برازێننەوە. چونكە لە "طاوس" و "مجاهد"ەوە هاتوە كە مەبەست لە (زينة) لێرەدا پۆشاك (ثياب)ە[287]، هەروەها (ابن حزم) نەقڵی كردوە كە زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە مەبەست لێرە داپۆشینی عەورەتە[288].

*(عن عمر بن أبي سلمة أنه رأى رَسولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي في ثَوْبٍ واحِدٍ مُشْتَمِلاً بِهِ في بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ واضِعاً طَرَفَيْهِ عَلَى عاتِقِهِ) رواه البخاري و مالك في موطاه[289]. واتە: لە (عمر بن ابي سلمة)ەوە هاتوە كە پێغەمبەری خوای ﷺ لە ژووری (ام سلمة) بینیوە لە یەك تاكە پۆشاك دا نوێژی كردوە لە خۆی وەگرتبوو و ئەولاولای هەڵدابوونە سەر ملی.

*(عن محمد بن زيد بن قنفذ عن أُمِّهِ أَنَّها سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ زوجِ النَّبِيِّ ﷺ ماذا تُصَلِّي فيهِ المَرْأَةُ مِنَ الثِّيابِ؟ فقالَتْ: تُصَلِّي في الخِمارِ والدِّرْعِ السّابِغِ إذا غَيَّبَ ظُهورَ قَدَمَيْها) رواه ابوداود مرفوعاً واخرجه مالك في موطاه موقوفاً[290]، واتە: دایكی (محمد بن زيد قنفذ) لە (ام سلمة) خوا لێی ڕازی‌بێ هاوسەری پێغەمبەری ﷺ پرسیوە كە ئایا ئەو بەرگەی ئافرەت نوێژی پێوەدەكات چۆنە؟! گوتوویەتی: نوێژ بە سەرپۆش و كراسێكی تێرو تەواوە دەكات كە پشتی پێیەكانی داپۆشێ.

---

[287] بروانە: (فتح الباري بشرح صحيح البخاري) ج٢ ص١٢.

[288] بروانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە.

[289] بروانە: (فتح الباري..) ج٢ ص ١٧، وە بروانە: (كتاب الموطأ) ی مالك ج١ ص ١١٦.

[290] بروانە: (الموطأ) ج١ ص ١١٧.

## دوو تێبینی:

١)زانایان دەربارەی سنووری عەورەتی پیاو و ئافرەت زۆر قسەیان کردوە و، ئەوەی زۆربەیان لە سەری ڕێك کەوتوون ئەوەیە کە سنووری عەورەتی پیاو بریتیە لە نێوانی نێوك و ئەژنۆی (مابَيْنَ سُرَّتِهِ و رُكْبَتِهِ)، وە عەورەتی ئافرەتیش هەموو جەستەیەتی بێجگە لە هەردووك دەستی تا مەچەکیو، دەم و چاوی (بَدَنُ المَرْأةِ كلّهُ عَوْرَةٌ سِوىٰ وَجْهِها و كَفَّيْها)[٢٩١]،

٢)(ابن عساكر) لە (ابن عباس) ی گێڕاوەتەوە کە جاری وا هەبووە پێغەمبەر ﷺ کڵاوەکەی داناوە و لەپێش خۆیەوە کردوویەتە (سُتْرَة)[٢٩٢]، وە دەربارەی چاکتربوونی سەرداپۆشین بۆ پیاوان لە نوێژدا هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحيح) نەهاتوە، مەگەر فەرموودەی (صَلُّوا كَما رَأَيْتُمُوني أُصَلّي) بکرێتە بەڵگە، کە بێگومان ئەوەش جێی سەرنجە چونکە وەك لە سیاقی فەرموودەکە دەردەکەوێ مەبەستی پێغەمبەر ﷺ پایەو فەرز و سوننەتەکانی نوێژبووە.

**چوار: ڕووکردنە قیبلە:** ئەمیش سەرجەمی زانایان بە مەرج یان لانی کەم بە فەرز یان زانیوە، چونکە خوای زانا فەرموویەتی: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ المَسْجِدِ الحَرامِ و حَيْثُما كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ البقرة - ١٤٤ - ، واتە: جا ڕووت بکە لای مزگەوتی حەرام، وە لە هەر جێیەك بوون ڕووتان بکەنە لای - مزگەوتی حەرام -.

(براء)یش خوا لێی ڕازیبێ گوتوویەتی: ماوەی (١٦) مانگ یان (١٧) مانگ - لەمەدینە - بەرەو (بيت المقدس) نوێژمان کرد، پاشان بەرەو کەعبە وەرسووڕێنراین، وەك (مسلم) گێڕاویەتەوە.

بەڵام کەسێك بەهۆی تاریکی شەو یان هەور و تەم و مژ یان هەر شتێکی دیکەوە نەیزانی قیبلە لە کام لایە ئەوە پێویستە بپرسێ و ئەگەر کەسی دەست نەکەوت بە قیبلە بزانێ، بۆخۆی ئیجتیهاد دەکات و نوێژەکەی دەکات و ئەگەر دوایی بۆشی

---

[٢٩١] بڕوانە: (المحلى) ج٣ ١٢٦ تا ١٣٤، مسالة (٣٤٩) هەرچەندە (ابن حزم) تەنیا پاش و پێش (دُبُرو ذَكَر) ی پیاو بە عەورەت دەزانێ و ڕان (فَخِذ) بە عەورەت نازانێ، بەڵام ڕای جەماوەری زانیان ئەوەیە کە نێوان نێوك و ئەژنۆی عەورەتە.

[٢٩٢] بڕوانە: (فقه السنه) ج١ ص١٤٢.

دەرکەوت کە بە هەڵەدا چووە زیانی نیە و نوێژەکەی ناگێڕێتەوە چونکە چی پێی کراوە کردوویەتی و خوای میهرەبانیش فەرموویەتی: ﴿لا یُکَلِّفُ اللهُ نَفْساً إلاّ وُسْعَها﴾ البقرة -٢٨٦ -، هەروەها فەرموویەتی: ﴿فاتقوا اللهَ ما استطعتم﴾ التغابن - ١٦ -.

**لە چەند حاڵەتێکیش دا ڕووکردنە قیبلە فەرز نامێنێ:**

**یەکەم:** لە کاتی نوێژکردنی سوننەت دا بۆ بابای سوار (راکب)، چونکە (احمد و مسلم و ترمذي) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە لە مەککەوە بەرەو مەدینە دەگەڕایەوە لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد ڕووی لە هەر لایەک بووایە.

**دووەم:** لە کاتی ترس دا وەك پێشتر باسمان کرد، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجالاً أَوْ رُكْباناً﴾ البقرة - ٢٣٩ -، (ابن عمر) خوا لێی ڕازی‌بێ وەك (بخاري) لێی گێڕاوەتەوە گوتوویەتی: ﴿مُسْتَقْبِلي القِبْلَةِ و غَيرَ مُسْتَقْبِلِيها﴾ واتە: ڕووتان کردبێتە قیبلە یان ڕووتان تێ‌نەکردبێ.

**سێیەم:** لە کاتی نەخۆشی‌دا، مادام لە توانای‌دا نەبێ و خواش سبحانە و تعالی لە توانا بەدەر لە بەندەکانی داوا ناکات.

**چوارەم:** لە کاتی نەهێڵران و ڕێ‌لێ‌گیران و و زۆرلێ‌کران دا.

**پێنج: زانیاری هەبوون بە هاتنی کاتی نوێژ (العِلْمُ بِدُخولِ وَقْتِ الصَّلاةِ):** چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ان الصلاة كانت على المؤمنين كتاباً موقوتاً﴾ النساء - ١٠٣ - واتە: بێگومان لەسەر بڕواداران پێویست کراوە لە کاتی دیاری‌کراودا.

دیارە وەك زانایانیش فەرموویانە پەیدابوونی یەقین و دڵنیایی مەرج نیە، بەڵکو تەنیا گومانی بەهێز (الظنّ الراجِحْ) بەسە، جا ئەو زانیاری یان گومانە بەهێزە بەهۆی هەوڵدانی باوەڕپێکراوێك یان بانگ دان یان ئیجیهادی تایبەتی‌یەوە بێ هەر دروستە و گونجاوە[٢٩٣].

---

[٢٩٣] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ١٣٦، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج١ ص ٧٢٨، ٧٢٩ وە بڕوانە: (المفصل في احكام المراة والبيت المسلم) د. عبدالكريم زيدان، ج١ ص ١٨٨

## ١٣- نوێژکردن لەسەر مردوو (الصلاة على الميت)

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست! ئینسان لەلای خوای پەروەردگار و لە بەرنامە ڕاست و تەواوەکەی‌دا بەتایبەت ئەگەر مسوڵمان بێ خاوەن ڕێز و حورمەتێکی زۆرە چ زیندوو بێ چ مردوو. هەربۆیەش لە حوکمی بەرنامەی خوادا مردووی مسوڵمان شۆردن و کفن کردنی و نوێژلەسەرکردنی و ناشتنی لەسەر مسوڵمانان فەرزی کیفایەیە و بە چەندان دەقی قورئان و سوننەت و بە یەکدەنگی (اجماع)ی زانایان ئەوە ئیسپات بووە[٢٩٤].

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ لە چەند بڕگەیەك دا بەکورتی باسی نوێژی مردوو دەکەین:

**یەك:** حوکمی نوێژی مردوو: تێکڕای زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە نوێژکردن لەسەر مردوو فەرزی کیفایەیە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووە و مسوڵمانانیش پشتاوپشت ئەوەیان جێبەجێکردوە، (بخاري و مسلم) لە (ابو هريرة) خوا لێی‌ڕازی‌بێ دەگێڕنەوە کە جاری وا دەبوو جەنازەی پیاوێکیان دێنایە لای پێغەمبەر ﷺ کە قەرزداربووایە، دەیپرسی ئایا هێندەی ماڵ لێ‌بەجێماوە کە قەرزەکەی پێ بدرێتەوە؟ جا ئەگەر گوترابا بەشی قەرزدانەوەکەی بەجێ‌هێشتوە نوێژی لەسەردەکرد، ئەگەرنا بە مسوڵمانانی دەفەرموو: (صَلُّوا عَلَىٰ صاحِبِكُمْ) نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن.

**دوو:** خێرو پاداشتی نوێژی مردوو: پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (مَنْ شَهِدَ الجنازةَ حتّى يُصَلّى عليها فَلَهُ قيراطٌ و مَنْ شَهِدَها حَتّى تُدفَنَ فَلَهُ قيراطانِ، قيلَ وما القيراطانِ؟! قال: مِثْلُ الجَبلَيْنِ العَظيمَيْنِ) متفق عليه، واته: هەرکەسێك ئامادەی جەنازەیەك بێ هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ ئەوە پاداشتی (قیراط) ێکە، وەهەرکەسێك لەگەڵی‌بێ هەتا دەنێژرێ پاداشتی دوو قیراطە، گوترا: دوو قیراط چەندن؟ فەرمووی، هێندەی دوو چیای گەورەن.

**سێ:** مەرجەکانی: سەرجەم زانایان لەسەر ئەوەش ڕێك کەوتوون کە مەرجەکانی نوێژی جەنازەش هەمان مەرجەکانی پێنج نوێژە فەرزەکانە و باقی نوێژەکانی دیکەن لە خاوێنی جەستەو پۆشاك و شوێن و، پاکی لە بێ‌دەست نوێژی گەورە و گچکە و ،

---

[٢٩٤] بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) د. وهبة الزحيلي ج٢ ص ٤٨١.

خۆداپۆشین و ڕووکردنە قیبلە، سەبارەت بە کات (وقت) یش لە هەموو کاتێك دا دروستە بەتایبەت کە پێویست بە پەلەکردن بکات لەبەر گۆڕان و بۆنکردنی[295].

## چوار : پایەو فەڕزەکانی[296]:

١)نیەت هێنان، چونکە نیاز و مەبەست هەبوون مەرجی قبوول کرانی هەموو کردەوە چاکەکانە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ..) رواه البخاري.

٢)بەپێوە وەستان بۆ کەسێك بتوانێ، کە ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە و هەندێکیش بە پایە و بگرە بە فەڕزیشی نازانن، بەڵام ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترە و ڕەفتاریش هەر بەو ڕایە کراوە[297].

٣) گوتنی چوار (الله اكبر) چونکە (بخاري و مسلم) لە (جابر بن عبدالله) خوا لێیڕازیبێ دەگێڕنەوە کە : (أَنَّ النبيَّ ﷺ صَلَّى عَلىٰ النَّجاشيِّ فَكَبَّرَ أَرْبَعاً) واتە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی - پادشای حەبەشە - کرد چوار جار (الله اكبر) ی کرد، دیارە ئەمەش ڕای زۆربەی نزیك بە ئیجماعی زانایانە هەندێکیش ڕایان وایە سێ جار (الله اكبر) گوتن بەسەو هەشیانە ڕای وایە پێنج یان شەش .. هەتا نۆ (الله اكبر) کردنیش سوننەت یان لانی کەم دروستە[298]، بەڵام بێگومان وەك (ترمذي) یش گوتوویەتی ڕای زۆربە ڕاست و تەواوە کە زۆربەی هاوەڵان و هەرکام لە (سيفان الثوري) و (ابن المبارك) و (شافعي) و (أحمد) و (اسحاق) یان لەنێودان.

٤)خوێندنی سوورەتی (فاتيحه) دوای (الله اكبر) ی یەکەم بەپەنهان و لەبەرخۆوە.

٥)صەڵەوات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ بە پەنهانی و دەنگی نزم، ئەمەش چەند دەقێك بۆ ئیسپاتی فەڕز بوونی خوێنرانی فاتیحە و صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ:

---

[295] بڕوانە: (فقه السنه) ج١ ص ٣٩١.

[296] بۆیە گوتوومانە (پایەو فەڕزەکانی) چونکە زانایان هەردووك وشەی (ركن، فرض) بە یەك واتا بەکاردێنن.

[297] بڕوانە: (المغني) ج٢ ص ٣٥٠، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٩٢.

[298] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٩٨ تا ١٠١ (باب عدد تكبير صلاة الجنائز)

*(عن أبي أمامة بن سهل أنه أخبره رجل منْ أصحاب النبي ﷺ أن السنة في الصلاة على الجنازة أنْ يكبرّ الأمامُ ثم يقرأ بفاتِحَةِ الكِتاب بعْدَ التكْبيرَة الأوليٰ سرّاً في نفْسِه ثم يُصَلّي على النبي ﷺ و يُخْلِصَ الدُّعاءَ للجَنازةِ في التكبيراتِ ولا يَقْرأُ في شَيءٍ مِنْهنَّ ثم يُسَلِّمَ سرّاً في نفْسِه)
رواه الشافعي في مسنده (ابن حجر العسقلاني) له (فتح الباري) دا گوتوويەتی: (اسناده صحيح)[٢٩٩].

واته: (ابو امامه بن سهل) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە کە سوننەت[٣٠٠] لە نوێژی سەر جەنازەدا ئەوەیە کە ئیمام (الله اكبر) بکات پاشان دوای (الله اكبر) ی یەکەم بە پەنهانی و لەبەرخۆیەوە فاتیحەی قورئان بخوێنێ، دوایی پاش (الله اكبر) ی دووەم صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، وە لە نوێژی جەنازەدا بە دڵ دووعا بۆ مردوو بکات دوای (الله اكبر) گوتنەکان - ی سێیەم و چوارەم -، وە نابێ هیچ قورئانیان تێدا بخوێنێ، پاشان لەبەرخۆیەوە سەلام دەداتەوە.

*(عن ابن عباسٍ - رضي الله عنهما - أنه صلّى على جَنازةٍ فَقَرأَ بفاتِحَةِ الكِتابِ و قال: لِتعلموا أنه منْ السنةِ) رواه البخاري و ابوداود و والترمذي و صححه.

*(عن فضالة بن ابي أمية قال: قَرَأَ الذي صلّى على أبي بكرٍ و عُمَرَ بِفاتِحَةِ الكِتابِ) رواه البخاري في تاريخه، واته ئەو کەسەی کە نوێژی لەسەر ئەبووبەکر و عومەر - خوا لێیان ڕازیبێ - کرد سوورەتی فاتیحەی خوێند.

بەڵگەیەکی دیکەی ئەوانە کە خوێندنی فاتیحە لە نوێژی مردوودا بە فەرز دەزانن ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلّوا علىٰ صاحِبِكُمْ) ئینجا لە فەرمووەی دیکەش دا فەرموویەتی: (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرأْ بِأُمِّ القُرآنِ) کەواتە خوێندنی (فاتیحە) بۆ دروست بوونی هەر نوێژێك مەرجە.

---

[٢٩٩] بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٥٦٤، بەڵام (ابن حجر) بەم جۆرە هێناویەتی: (السنة في الصلاة على الجنازة أنْ يكبرّ ثم يقرأ بأمِّ القرآن ثم يصلّي على النبيِّ ﷺ ثم يُخْلِصَ الدعاءَ للميِّتِ ولا يقرأ الا في الأولىٰ) رواه عبدالرزاق والنسائي، اسناده صحيح، ئەو ڕیوایەتەی دیکەشمان لە (فقه السنة) ج١ ص ٣٩٣، نەقل کردوە، کە لە نێوەڕۆك دا هەر یەکن و جیاوازیەکی وایان نیە.

[٣٠٠] لێرەدا وشەی (سنة) بەپێی چەمك و زاراوەی فەرموودەناسان (محدثين) بەکارهاتوە کە لە ئەسڵی زمانیش دا ماناکەی هەرئەوەیە، واتە: (ڕێبازی پێغەمبەر) بە فەرز و سوننەتەوە، دیارە وشەی (سنة) لەلای شەرعزانان (فقهاء) ماناکەی جیایە و ئەوەیە کە بەرانبەری فەرزە.

## چوار تێبینی:

**یەکەم**: بە مەرج گیران و فەرزبوونی خوێندرانی فاتیحە لە نوێژی مردوودا ڕای بەشێك لە زانایانە، بۆ وێنە: (شافعي وأحمد واسحاق)، هەندێکشیان وەك (ثوري) ڕایان وایە کە نوێژی جەنازە نابێ قورئانی تێدا بخوێنرێ، بەڵکو بەس مەدح و ثەنای خوای پەروەردگار و صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ و پاڕانەوەیە بۆ مردوو.

**دووەم**: جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە نوێژی مردوو شەو بێ یان ڕۆژ دەبێ هەر بەپەنهان بخوێنرێ و دەنگی تێدا بەرزنەکرێتەوە، بەڵام هەندێك لە هاوەڵانی شافیعی دەڵێن ئەگەر بەشەو بوو وەك باقی نوێژەکانی شەو دەنگی تێدا بەرزدەکرێتەوە.

**سێیەم**: صەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ بەهەر شێوەیەك بێ هەر دروستە بەڵام پەسەندو سوننەت وایە کە بەیەکێك لەو (صیغة)انە بێ کە لە فەرمایشتە (صحیح)ە کانی پێغەمبەردا هاتوون، کە پێشتر خستمانەڕوو.

**چوارەم**: ئەوە کە دەبێ فاتیحە پاش (الله اکبر) ی یەکەم بێ دەقی سوونەتی لەسەرە، بەڵام بۆ صەڵات و سەلام کە بکەوێتە دوای (الله اکبر) ی دووەمەوە هەرچەندە بەڵگەیەکی تایبەت نیە لەو بارەوە بەڵام سەرجەم زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون و دیارە ئەوانیش لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ خوالێیان ڕازیبێ و ئەوانیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ یان وەرگرتوە[٣٠١].

٦- پاڕانەوە بۆ مردوو کە ئەمە بە یەکدەنگی زانایان پایەیەکی گرنگی نوێژی مردوویە بەتایبەت پاش (الله اکبر) ی سێیەم، بەڵام دوای (الله اکبر) ی چوارەم ئایا سوننەتە بپاڕێتەوە بۆ مردوو یان نا، زۆربە ڕایان وایە کە سوننەتە و بەڵگەشیان فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ کە دواتر دەیخەینەڕوو، ئێستاش با چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی دووعاکردنەوە بۆ مردوو بخەینەڕوو:

***عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ رسولَ الله ﷺ قال: اذا صلّيتُمْ علىٰ المَيِّتِ فَأَخْلِصوا لَهُ الدُّعاءَ)** رواه ابو داود و ابن ماجة والبيهقي وابن حبان و صححه. **واتە**: هەرکات نوێژتان لەسەر مردوو کرد بەدڵ دووعای بۆ بکەن.

---

[٣٠١] بۆ هەرکام لەو چوار تێبینیانە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٢ تا ٢٩٣، وە بڕوانە: (فقه الاسلامي). ج٢ [illegible]

شێوەی ئەو پاڕانەوەیەش بۆ مردوو بەهەر صیغەیەك بێ دێتەدی بەڵام پەسند و سوننەت وایە یەکێك لەمانەی خوارەوەبێ:

*(قال ابوهريرة رضي الله عنه دعا رسولُ الله ﷺ في الصلاةِ علىٰ الجنازة فقال: اللّٰهُمَّ أنْتَ ربُّها، وأنْتَ خَلَقْتَها وأنْتَ رزَقْتَها ،أنْتَ هَدَيْتَها لِلأسلامِ و أنْتَ قَبَضْتَ روحَها، وأنْتَ أعْلَمُ بِسِرِّها و عَلانِيَتِها، جِئْنا شُفعاءَ لَهُ فاغْفِرْ لَهُ ذَنْبَهُ) رواه احمد وابو داود. واتە: ئەی خوایە هەرتۆ پەروەردگار وی و بەس تۆ دورستت کردووە و تۆ ڕۆزیت داوە و تەنیا تۆ ڕێڕوو نیت کردووە بۆ ئیسلام و تۆش گیانیت کێشاوە و هەرتۆش بە نهێنی و ئاشکرای زاناتری، ئێمە هاتووین تکای بۆ دەکەین دەجا لە گوناحی ببووڕە.

*(عن عوف بن مالك قال سمعتُ رسولَ الله ﷺ وقد صلّى علىٰ جَنازةٍ يقولُ، أللهم اغْفِرْ لَهُ وارحمه، واعفُ عنهُ و عافِهِ، وأكْرِمْ نُزُلَهُ، ووسِّعْ مُدْخَلَهُ، واغْسِلْهُ بِماءٍ و ثَلْجٍ و بَرَدٍ، ونَقِّهِ مِنَ الخَطايا كما يُنَقَّى الثَّوبُ الأبيضُ مِنَ الدَنَسِ، و أبْدِلْهُ داراً خيراً مِنْ دارِهِ، وأهلاً خيراً مِنْ أهْلِهِ، و زَوْجاً خيراً مِنْ زَوْجِهِ، وقِهِ فِتْنَةَ القَبْرِ و عَذابَ النارِ) رواه مسلم. واتە: ئەی خوایە لێی ببوورە و بەزەییت پێدابێ، وە لێی خۆش بە و سەلامەتی بکە، وە وەك میوانێك ڕێزی بگرە، وە جێگا و ڕێگای بۆ فراوان بکە، وە بە ئاو و بەفر و تەرزە بیشۆ، وە لە گوناهەکانی پاکی بکەوە وەك چۆن بەرگی سپی لە چڵکێ خاوێن دەبێتەوەو خانووبەرەیەکی باشتر لەوەی خۆی بدەیەو، کەس و کارێکی چاکتر لەوەی خۆی و، هاوسەرێکی چاکتر لەوەی خۆی پێببەخشە، وە لە ئەشکەنجەی گۆڕ و ئازاری ئاگری - دۆزەخ - چەپاڵەی بدە.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: صلّىٰ رسولُ الله ﷺ علىٰ جنازةٍ فقال: اللهم اغْفِرْ لِحَيِّنا و مَيِّتِنا و صَغيرِنا كَبيرِنا، و ذَكَرِنا وانثانا، و شاهِدِنا و غائِبِنا اللهمَّ مَنْ أحْيَيْتَهُ مِنّا فأحْيِهِ علىٰ الأسْلامِ و مَنْ توفَّيْتَهُ مِنّا فتوفّهُ علىٰ الإيْمانِ، أللهم لا تَحْرِمْنا أجْرَهُ و لا تُضِلَّنا بَعْدَهُ) رواه احمد واصحاب السنن. واتە: ئەی خوایە لە زیندوو و مردوومان ببووڕە، وە لە گچکە و گەورەمان و، لە نێر و مێمان و، لە ئامادەبوو و ئامادەنەبوومان، ئەی خوایە هەرکەسێکمانت ژیاند لەسەر ئیسلام بیژێنەو، هەرکەسێکمانت مراند لەسەرئیمان بیمرێنە، ئەی خوایە لە پاداشتی بێ بەشمان مەکە و لە دوای وی سەرگەردانمان مەکە.

**تێبینی:**

**یەکەم:** ئەگەر مردووەکە منداڵ بوو وا باشە نوێژکەر لە دووعایەکانیدا بڵێ: **(اَللهم اجْعَلْه لَنا سَلَفاً و فَرَطاً و ذُخْراً)** رواه البخاري والبيهقي من كلام الحسن البصري،

واتە: ئەی خوایە بۆمان بگێڕە بە پێشین - ی چاك - و پێش دەست و پاشەکەوت.

**دووەم:** زۆربەی زانایان دەڵێن لە پاش (الله اكبر)ی چوارەم و کۆتاییش وا باشە بۆ مردوو بپاڕێتەوە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە:

***عن عبدالله بن أبي أوفى أَنَّهُ ماتَتْ اِبنةٌ لَهُ فَكَبرَ عليها أَرْبَعاً ثم قامَ بَعْدَ الرابعَةِ قَدْرَ مـابَيْنَ التَكبيرَتَينِ يَدْعو، ثم قال: كانَ رسولُ الله ﷺ يَصْنَعُ في الجَنازَةِ هكذا)** رواه احمد وابن ماجه بمعناه.

ئنجا ئایا لە دووعا دوای (الله اكبر) ی چوارەم دا چ دەگوترێ؟ هەندێکیان وەك شافیعی رایان وایە **(اَللـهُمَ لا تَحْرِمْنـا أَجْرَهُ ولا تَفْتِنّـا بَعْـدَهُ)** بگوترێ، (ابو علي بن ابي هريرة)ش گوتوویەتی: پێشووەکان لەدوای (الله اكبر) ی چوارەم دەیانگوت: **(اَللهُمَ رَبَّنـا آتِنا في الدُّنيا حَسَنةً وفي الآخِرَةِ حَسَنةً وقِنا عَذابَ النّار)**[٣٠٢].

**سێیەم:** دەربارەی دەست بەرزکردنەوە لەکاتی (الله اكبر) گوتنەکان دا زانایان رایان جیاجیایە، جارێ سەبارەت بە هی یەکەمیان هەموویان یەکدەنگن کە سوونەتە هەردووك دەستەکانی لەگەڵ بەرزبکرێنەوە وەك هەر نوێژ دابەستنێکی دیکە، بەڵام بۆ ئەوانی دیکە هەندێکیان وەك (شافیعی اوزاعي و أحمد و اسحاق) رایان وایە کە هەر سوونەتە دەستیان لەگەڵ بەرزبکرێتەوە بەڵام (ابو حنيفة و ثوري و مالك - لە ریوایەتێکیدا- و شوكاني) رایان وایە کە سوونەت نیە دەستیان تێدا بەرزبکرێتەوە. واش پێدەچێ هەردووك رایەکان لە هێزو پێزدا وەك یەك بن هەرچەندە (شوكاني) رای دووەمی پێ بەهێزترە[٣٠٣].

٧- سەلام دانەوە: تێکرای زانایان بە پێویستی دەزانن، جا هەرچی زۆربەو جەماوەریانن بۆ وێنە: مالیکی و شافیعی و حەنبەلیەکان بەپایەی دادەنێن[٣٠٤]، بەڵام

---

[٣٠٢] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ١٠٨.

[٣٠٣] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ١٠٤ ، ١٠٥.

[٣٠٤] بڕوانە: (الفقه [illegible]

حەنەفیەکان دەڵێن: پایە نیە بەڵکو بەس (واجب) ە[٢٠٥]، وە هەردووك سەلام دانەوەی لای ڕاست و چەپیش بە (واجب) دادەنێن و مالیکی و حەنبەلیەکانیش بە سوننەتیشی دانانێن و دەڵێن سەلام دانەوەش تەنیا یەکێکە[٢٠٦].

**پێنج: چۆنیەتی کردنی نوێژی مردوو:** بەپێی ئەو دەقانەی کە دەربارەی نوێژی مردوو و فەرز و پایەکانی هاتوون و هەندێکیانمان خستنەڕوو، نوێژی مردوو ئاوا دەکرێ:

بابای نوێژکەر چ ئیمام بێ چ تەنیابێ ڕووە و قیبلە ڕادەوەستێ و پاش نیەت (الله اکبر) ی یەکەم دەکات و دەستی ڕاست دەخاتە سەرئی چەپ و یەکسەر دوای (إِسْتِعاذَة) فاتیحە دەخوێنێ، پاشان (الله اکبر) ی دووەم دەکات و صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدات، دوایی (الله اکبر) ی سێیەم دەکات و، بە دڵێکی ساغ و بەکوڵ بۆ مردوو دەپاڕێتەوە، ئینجا (الله اکبر) ی چوارەمیش دەکات هەندێك دووعای دیکە دەکات و سەلام دەداتەوە[٢٠٧].

**شەش: چەند وردە بابەتێك دەربارەی نوێژی مردوو:**

١)نوێژکەر لسەر جەنازە لە چ ئاستێکی دەوەستێ؟! سوننەتە بابای نوێژکەر لە ئاقار سەری جەنازەی پیاو و نێوەڕاستی جەنازەی ئافرەت بوەستێ، چونکە لە (انس بن مالك) خوا لێی ڕازیبێ گێڕراوەتەوە کە جارێك نوێژی لەسەر جەنازەی پیاوێك کرد لەلای سەرییەوە وەستا، پاشان ئەو لابراو جەنازەی ئافرەتێکیان هێنا ئەویش نوێژی لەسەر کردو لەلای نێوەڕاستییەوە ڕاوەستا، جا لەو بارەوە پرسیاری لێکراو پێی گوترا، ئایا پێغەمبەری خواش ﷺ لەو ئاستەی پیاو کە ڕاوەستای و لەو ئاستەی ئافرەت کە وەستابووی ڕادەوەستا - بۆ نوێژ - ؟! گوتی: بەڵێ، ئەم دەقە هەرکام لە (احمد و ابوداود و ترمذي و ابن ماجة) گێڕاویانەتەوە.

---

[٢٠٥] سەرجەمِ زانایان (واجب) و (فرض) بە یەك شت دادەنێن، بەڵام حەنەفیەکان دەڵێن: هەرشتێك بە بەڵگەی (قَطْعي) پێویست بووبێ ئەوە (فَرْض) ە و ئەگەر بە بەڵگەی (ظَنيٍّ) پێویست بووبێ ئەوە (واجب)ە ، بڕوانە: (الوجيز في اصول الفقه) عبدالكريم زيدان ص ٣١ ، ٣٢.

[٢٠٦] بڕوانە: (افقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٤٩٠، وە (الفقه السنه) ج١ ص ٣٩٦.

[٢٠٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٣٩٦ وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) ج٢ ص ٤٩٤ تا ٤٩٦. ط٢

٢)نوێژکردن لەسەر مردووێك زیاتر: هەرکات زیاتر لە مردووێك کۆبوونەوە بۆ نوێژ لەسەرکران جا چ هەموویان پیاوبن، چ ئافرەت بن، چ پیاوو ئافرەت بن و چ گەورە بن چ گچکە،دەبێ هەموویان ڕیزبکرێن، و بخرێنە نێوان ئیمام و قیبلەوە، واتە ڕیزەکان بەرەو قیبلە درێژبکرێتەوە، هەروەك دەشگونجێ بەجیا نوێژ لەسەر پیاوەکان و پاشان ئافرەتەکان بکات، بەڵام ئەگەر پێکەوە نوێژی لەسەرکردن وا باشە پیاوان بخرێنە نزیك ئیمام و منداڵان دوای ئەوان و ئافرەتانیش دواتر، واتە ئافرەتان لە قیبلە نزیکتر و لە ئیمام دوورتر بن، لەو بارەشەوە چەند دەقێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ گێڕراونەوە[٣٠٨].

٣)ڕیزبوونی نوێژکەران لە سێ ڕیزدا: سوننەتە ئەو نوێژکەرانەی نوێژ لەسەر مردوو دەکەن بە سێ ڕیز بوەستن و ڕیزەکانیان ڕێك بن، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (ما مِنْ مُؤْمِنٍ يَموتُ فيُصَلّي عَلَيهِ أُمةٌ مِنَ المُسْلِمينَ يَبْلُغُونَ أنْ يكونوا ثَلاثَةَ صُفُوفٍ إلاّ غُفِرَ لَهُ) رواه احمد وابو داود و ابن ماجة والترمذي و حسنه والحاكم وصححه)، واتە: هەر بڕوادارێك بمرێ و کۆمەڵێك لەمسوڵمانان کە بگەنە سێ ڕیز نوێژی لەسەر بکەن حەتمەن لێی دەبوردرێ.

وە وا باشە بەپێی توانا نوێژکەرانی سەر جەنازە زۆربن چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ما مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يموتُ فيَقومُ على جَنازَتِهِ أربَعُونَ رَجُلاً لايُشْرِكُونَ باللهِ شَيْئاً إلاّ شَفَّعَهُم اللهُ فيهِ) رواه احمد ومسلم وابوداود، واتە: هەر پیاوێکی مسوڵمان بمرێ و چل پیاو کە هیچ شتێك ناکەنە هاوبەشی خوا لەسەر جەنازەکەی بوەستن - و نوێژ بکەن و بۆی بپاڕێنەوە - مسۆگەر خوا تکایان لە بارەیەوە وەردەگرێ.

٤)ئەوانەی نوێژیان لەسەر دەکرێ و ئەوانەی لەسەریان ناکرێ: زاناو پێشەوایان سەرجەم لەسەرئەوە یەکدەنگن کە هەموو مسوڵمانێکی نێرو مێ گەورەبێ یان گچکە نوێژی لەسەر دەکرێ، (ابن المنذر) گوتوویەتی: أجْمَعَ أهْلُ العِلْمِ على أنَّ الطِّفْلَ إذا عُرِفَتْ حَياتُهُ وٱسْتَهلَ يُصَلّى عَلَيهِ)[٣٠٩] واتە: ئەوانەی خاوەنی زانیاری شەرعیین سەرجەم لەسەرئەوە ڕێك کەوتوون کە منداڵ مادام بە زیندوویی بینرابێ و دەنگی

---

[٣٠٨] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ١١٠، و بڕوانە (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٧.

[٣٠٩] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٩٨.

لێوەهاتبێ نوێژی لەسەر دەکرێ، جا دیارە ئەو یەکدەنگی یەی زانایانش لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی سوننەت دا پەیدابووە، بۆ وێنە:

*(الرّاكِبُ خَلْفَ الجَنازَةِ والماشي حَيْثُ شاءَمِنْها والطِّفْلُ يُصلّى عَلَيْه) رواه احمد والنسائي والترمذي و صححه، واتە: بابای سوار لە پشت جەنازەوە - دەڕوات و پیادە لە هەر لایەکەوە حەزبکات، وە منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێ.

*(الرّاكِبُ خَلْفَ الجَنازَة، والماشي أمامَها قَريباً مِنْها عَنْ يَمينِها أو عَنْ يَسارِها، والسّقْطُ يُصلّى عَلَيهِ ويُدْعى لِوالِدَيْهِ بِالمَغْفِرَةِ والرَّحْمَة) رواه احمد وابو داود عن المغيرة بن شعبة. واتە: سوار لە پشت جەنازەوە دەبێ و پیادە لە پێشەوە لە نزیکیەوە لەلای ڕاستی یان لەلای چەپی یەوە، وە منداڵی لەبەرچوو نوێژی لەسەر دەکرێ و داوای لێبوردن و بەزەیی بۆ باب و دایکی دەکرێ.

## سێ تێبینی:

**یەکەم**: تێکڕای زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە منداڵی لەبەرچوو ئەگەر نەگەیشتبێتە چوارمانگ ئەوە ناشۆرێ و نوێژی لەسەر ناکرێ، بەڵکو لە قوماشێکەوە دەپێچرێ و دەنێژرێ، هەروەها لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە ئەگەر چوارمانگ یان زیاتر بوو وە لەکاتی بوونیدا نیشانەی زیندووێتی لێ‌دەرکەوت وەك چریکە و پژمین و دەست و پەل جوڵاندن ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام لەوەدا جیاوازی‌یان هەیە کە منداڵی لەبارچوو چوار مانگ و زیاتر بێت و هیچ دەنگ و نیشانەی زیندووێتی لێ نەزانرابێ ئایا نوێژی لەسەر دەکرێ یان نا؟!

هەرچی حەنەفی‌یەکان و (مالك) و (اوزاعي) ین دەڵێن نوێژ لەسەرکردنی ناوێ بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە: (عن جابر رضي الله عنه أَنّ النبيَّ ﷺ قال: اذا اسْتَهلَّ السّقْطُ صُلِّيَ عَلَيهِ وَوَرِثَ) رواه النسائي والترمذي وابن ماجة والبيهقي. واتە: منداڵی لەبەرچوو ئەگەر دەنگی هات - پێش مردنی - نوێژی لەسەر دەکرێ و میراتیش دەگرێ.

وەك دەبینین زیندووبوونی منالی لەبارچوو مەرجە بۆ نوێژ لەسەرکرانی.

بەڵام (شافیعي واحمد وسعید و ابن سیرین و اسحاق) دەڵێن مادام چوار مانگی تەواوکردبێ هەرچەندە بە زیندوویش نەبینرابێ نوێژ لەسەرکردنی هەر پێویستە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە دوای چوار مانگ ڕووحی بەبەردا

دەکرێ وەك (بخاري و مسلم) لە ( ابن مسعود) ەوە گێڕاویانەتەوە، بەڵام وا پێدەچێ بەڵگەی ئەوانەی نوێژ لەسەرکردنی بە پێویست نازانن بەهێزتربێ، وەك فەرموودەی (استهلال) دەیگەیەنێ، چونکە بەپێی ئەو فەرموودەیە زیندوویێتی منداڵ و کۆرپە پاش جیابوونەوەی لە دایکی بە مەرج گیراوە بۆ نوێژ لەسەرکرانی و تەنیا زیندووبوونی لە زگی دایکیدا بەس نیە بۆ بەزیندوو لەقەڵەم درانی و نوێژ لەسەرکرانی[٣١٠].

**دووەم**: دەربارەی نوێژکردن لەسەر شەهید زانایان بە گشتی سێ رایان هەن:

ا-بەشێکیان دەڵێن نابێ نوێژی لەسەر بکرێ، کە (مالك و شافعي و اسحاق و احمد) لە یەکێك لە دوو ڕیوایەتەکانیدا خاوەنی ئەم ڕایەن و بەڵگەشیان چەند دەقێکی سوننەتە، بۆ نموونە: (عن جابر أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِدَفْنِ شُهداءِ أُحُدٍ في دِمائِهِمْ وَلَمْ يَغْسِلْهُمْ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ) رواه البخاري، و روى احمد وابوداود والترمذي عن انس مثله، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ناشتنی شەهیدانی ئوحود بە خوێنی خۆیانەوە و نەیشۆردن و نوێژی لەسەریان نەکرد.

ب-بەشێکیشیان دەڵێن پێویستە وەك مردوانی دیکە نوێژیان لەسەر بکرێ، کە (ابو حنيفة و ثوري و حسن و ابن المسيب) خاوەنی ئەو ڕایەن چەند دەقێك بە بەڵگە دێننەوە بۆ نموونە: (عن عقبة بن عامر أن النبي ﷺ خَرَجَ يَوْماً فَصَلَّى على أَهْلِ أُحُدٍ صَلاتَهُ على المَيِّتِ بَعْدَ ثَمانِ سِنِينَ كَالْمُوَدِّعِ لِلأَحْياءِ والأَمْواتِ) رواه البخاري: واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان چووە دەرێ و نوێژی مردووی لەسەر خەڵکی جەنگی ئوحود کرد پاش هەشت ساڵان وەك خواحافیزی لە زیندووان و مردووان.

ج- هەندێکیشیان ڕایان وایە کەهەردووك لا - نوێژکردن و نەکردن - دروستن و هەر لایەکیان بکات هەر باشە و بەپێی سوننەتە بۆ وێنە (ابن حزم الأندلسي) و (ابن القيم الجوزية) ئەم ڕایەیان پەسند کردوە[٣١١]، بەڵام واپێدەچێ ڕای یەکەم لە هەموویان بەهێزتربێت.

---

[٣١٠] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٨٤.

[٣١١] بڕوانە: (فقه [illegible]) ج١ ص[illegible]

**سێیەم**: زۆربەی هەر زۆری بگرە تێکڕای زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە مسوڵمانانی گوناحبار وەك ڕەجم کراو لەسەر زینا و بابای خۆکوژ و ڕێگر و یاخی و .... هتد نەك هەر دروستە بەڵکو پێویستە نوێژیان لەسەر بکرێ مادام بە مسوڵمان و بە ئەهلی قیبلە حیساب بکرێن، ئنجا ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر بابای قەرزدار نەکردوە مادام بایی قەرزدرانەوەکەی لە دوای خۆی بەجێ نەهیشتبێ[٣١٢]، ئەوە زیاتر بۆ تەمبێکردن و ئامۆژگاری و بێدارکردنەوەی مسوڵمانان بووە، چونکە لە هەمان کات دا فەرمووشیەتی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن : (صَلُّوا عَلَىٰ صاحِبِكُمْ) وە بێگومان ئەگەر دروست بایە یان پێویست نەبووایە نوێژی لەسەر بکرێ، فەرمانی نەدەکرد بە نوێژ لەسەرکردنی![٣١٣]

(ابن حزم) لەو بارەوە گوتویەتی: (نوێژ لەسەر هەموو مسوڵمانێك دەکرێ، چاکەکار یان خراپەکار، بە سزایەکی شەرعی کوژرابێ یان لە ڕێگری دا یان لە کاتی یاخیبوون دا، ئیمام و غەیری ئەویش نوێژی لەسەر دەکەن، هەروەها بابای بیدعەتچی مادام بیدعەتەکەی نەگەیبێتە ڕاددەی کوفر نوێژی لەسەر دەکرێ. دیسان ئەو کەسەی خۆی کوشتووە یان غەیری خۆی کوشتوە، تەنانەت ئەگەر خراپترین کەسی سەرزەویش بێ، مادام بە مسوڵمانەتی مردبێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە گشتی فەرموویەتی : (صلوا على صاحبكم) جار دیارە مسوڵمانیش هاوەڵمانە، وە خوای بەرز فەموویەتی: (إنما المؤمنون إِخْوَةٌ) الحجرات -١٠-، وە فەرموویەتی:(والمؤمنون والمؤمناتُ بَعْضُهُمْ أَولياءُ بَعْضٍ) البقرة ٠٧١ وە بێگومان کەسێك نوێژکردن لەسەر مسوڵمانێك قەدەغە بکات، قسەیەکی - خراپی - گەورەی کردوەی؛ چونکە بابای گوناحبار زیاتر پێویستی بە دووعای برایانی بڕواداری هەیە لە چاکەکارێکی ڕەحم پێکراو!)[٣١٤]

بەڵام ئەوەی کە بە یەکدەنگی سەرجەم زانایان نەك پێویست نیە بگرە هەر دروستیش نیە نوێژی لەسەر بکرێ بابای کافرە، وەك خوای پەروەردگار و دادگەر فەموویەتی: ﴿ولا تُصَلِّ علىٰ أَحَدٍ مِنْهُمْ ماتَ أَبداً ولا تَقُمْ علىٰ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَروا بِاللهِ و رَسُولِهِ..﴾ التوبة - ٢ -

---

[٣١٢] هەروەها لەسەر بابای خۆکوژ و دزیکەر لە غەنیمەتیشی نەکردووە وەك لە فەرموودەی (صحيح) دا. هاتووە، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٨٤.

[٣١٣] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٨٤ ، ٨٥ .

[٣١٤] بڕوانە: (المُحَلّى شرح المُجَلّى) ج٥ ص١١٦ تا ١١٨ مسألة (٦١١).

واتە: وە هەرگیز لەسەر هیچ کامێکیان کە مرد نوێژیٚ مەکە و لەسەر گۆڕکەیشی مەوەستە، چونکە ئەوانە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی نەبووە..

٥- نوێژکردن لەسەر مردوویەکی نادیار و لەسەر گۆڕ: زۆربەو جەماوەری زانایان کە لەنێویان دا (شافعیی و احمد) هەن نوێژکردن لەسەر مردوویێک کە لە شوێنێکی دوور مردووە و نوێژکردن لەسەر گۆڕی مردوو دوای بە خاك سپێررانی بە ڕەوا و دروست دەزانن، بەڵام (ابو حنیفة و مالك) نوێژکردن لەسەر هیچ کامیان بە دروست نازانن[٣١٥]، ئەوندە هەیە سەرجەم زانایان ڕایان وایە، کەسێك پێش نێژرانی نوێژی لەسەر نەکرابێ پێویستە لە گۆڕەکەیدا هەر لەسەری بکرێ[٣١٦].

هەندێك لە زانایانیش وەك (ابن تیمیة) ڕایان وایە تەنیا کاتێك نوێژکردن لەسەر مردووی نادیار (المَيِّت الغائِبْ) دروستە کە لە وڵات و شوێنێك مردبێ کەسی لێ نەبێ نوێژی لەسەر بکات[٣١٧]. سەبارەت بە ماوەی شیانی نوێژکردن لەسەر گۆڕی مردووش زانایان ڕایان جیاجیایە، هەندێکیان دەڵێن ماوەیەکی دیاریکراوی نیە و بۆ هەمیشە دەگونجێ، هەندێکیشیان دەڵێن بەمەرجێك دروستە کە لە مانگێك پتر نەبێ، هەندێکیش دەڵێن سێ ڕۆژ و، هەندێکیش دەڵێن مادام نەڕزیبێ[٣١٨].

دیارە ڕای جەماوەری زانایانیش بەهێزترە و چەندان دەق بە بەڵگە دێننەوە، بۆ وێنە:

*(عن جابر رضي الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ صلَّى علىٰ أَصْحَمَةَ النجَّاشي فَكَبَّرَ عَلَيه أَرْبَعَاً) متفق عليه.

*( عن ابن عباس رضى الله عنهما قال: إِنْتَهَىٰ رسولُ اللهِ ﷺ الىٰ قَبْرٍ رَطْبٍ فصلَّى عَلَيهِ و صفوا خَلْفَهُ و كَبَّرَ أَرْبَعَاً) متفق عليه، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لای گۆڕێکی تازە نوێژی لەسەر کرد، لە دوایەوە ڕیزبوون و چوار (الله اكبر) ی لەسەرکردن.

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي ﷺ صلَّى علىٰ قَبْرٍ بَعْدَ شَهْرٍ) رواه الدارقطني واتە: پێغەمبەر ﷺ پاش مانگێك نوێژی لەسەر گۆڕێك کرد.

---

[٣١٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٨٧ تا ٩٢.
[٣١٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٥٠٢.
[٣١٧] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٨٨.
[٣١٨] سەرچاوەی پێشوو ج٤ ص ٩٠.

٦- نوێژکردن لەسەر مردوو لە مزگەوتیدا: زۆربە و جەماوەری زانایان کە لە نێویان دا (شافعي و أحمد و اسحاق و مالك) لە ڕیوایەتێکیدا هەن ڕایان وایە کە سوننەتە و دروستە لە مزگەوتیدا نوێژ لەسەر مردوو بکرێ، هەندێکیشیان کە (ابو حنیفة و مالك) لە ڕوایەتێکیدا لەنێویان دان بە شتێکی ناپەسەند(مکره)ی دەزانن، لە سۆنگەی ئەوە کە مردوویان پێ پیسە[319]!

بەڵام بێگومان ڕای جەماوەر بەهێزترە ئەگەر نەڵێین هەر ئەو ڕایە بەهێزە! چونکە چەندان دەقی سوننەتیان بەدەستەوە هەن، بۆ وێنە:

*لە (عائشة) خوا لێی ڕازیبێ گێڕراوەتەوە کە کاتێك (سعد بن ابي وقاص) وەفاتی کرد گوتوویەتی: بیهێننە ژوور مزگەوت تاکو نوێژی لەسەر بکەم، - خەڵکیش - لەو بارەوە ڕەخنەیان لێگرت، ئەویش گوتی: (والله لَقَدْ صَلَّى رسولُ الله ﷺ علىٰ ابْنَيْ بَيْضاءَ في المَسْجِدِ سُهَيلٍ وأَخيه) رواه مسلم، واتە: بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتێ نوێژی لەسەر دوو کوڕەکەی (بیضاء) سوهەیل و برایەکەی کرد.

*وە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ لە مزگەوتێ نوێژیان لەسەر (ابوبکر) و (عمر) خوا لێیان ڕازی بێ کردووە و هیچ کەسیش هیچی نەگوتوە[320].

*بەڵام ئاشکرایە کە ئەگەر حاڵەتی جەنازەکە وابوو ببێتە هۆی پیس کردنی مزگەوت ئەوە دروست نیە ببرێتە مزگەوتێ.

تێبینی: تێکڕای زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە ئافرەتانیش وەك پیاوان بۆیان هەیە نوێژ لەسەر مردوو بکەن، بەڵام دەربارەی ئەوە کە ئایا بۆیان هەیە بەکۆمەڵ بیکەن یان تاك تاك ڕایان جیایە، زۆربەو جەماوەریان وەك حەنەفییەکان و شافیعییەکان و ئەحمەد و (سفیان الثوري) دەڵێن سوننەتە بەکۆمەڵ بیکەن، بەڵام (مالك) دەڵێ دەبێ تەنیا تەنیا بیکەن[321].

---

[319] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٤ ص ١١٢.

[320] سەرچاوەی پێشوو ج٤ ص ١١١.

[321] بڕوانە: (فقه السنة [illegible] ٤٠٢.

٧- هەڵسـان بـۆ جـەنازە: دەربارەی هەڵسان بۆ جەنازە لـە کـاتی تێپـەڕبوونیدا زانایان سێ ڕایان هەن، هەندێکیان دەڵێن سوننەتە کە ئەمە ڕای (احمد و اسحاق و ابن حبیب و ابن الماجشون و ابن حزم و نووي و شیرازـي - خاوەنی (المهذب)ە،[٣٢٢] ئەم زانایانەش چەند دەقێکی سوننەت بەبەڵگە دێننەوە بۆ وێنە:

*(عن ابن عمر عن عامر بن ربيعة رضي الله عنهم عن النبي ﷺ قـال: اذا رأيتم الجنـازة فقوموا لها حتـى تخلفكـم أوتوضع) متفق عليه، واتـە: هـەرکاتێك جەنازەتان دی لەبـەری هەڵسن هەتا بەجێتان دەهێڵێ یان دادەنرێ.

*(عن سهل بن حنيف وقيس ابن سعد .. فقالا: أنّ رسولَ الله ﷺ مرتْ به جَنازةٌ فقامَ، فَقيلَ لَـهُ: إنّها جَنـازةُ يهوديٍّ! فقـال: أليسَتْ نفسـاً؟!) متفـق عليـه ، واتــە: جەنازەیـەك بـەلای پێغەمبـەردا ﷺ ڕەد بـوو ئەویـش لـە بـەری هەڵسـا، پـێی گوتـرا: ئـەوە جـەنازەی جوولەکەیەکە! فەرمووی: ئەدی هەر نەفس - ی ئینسان - نیە؟!

هـەندێکیش لە زانایـان دەڵێن: هەڵسان لەبەر جەنازە دروست نیـە چونکـە کـاتی خۆی بووە بەڵام دوایی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە و نەسخ بۆتەوە، کە هـەرکام لـە (ابو حنيفة و مالك و شافعي) لەسەر ئەم ڕایەن و ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە:

*عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: كانَ رسولُ الله ﷺ أمَرَنا بالقيامِ في الجَنازةِ ثم جَلَسَ بَعْدَ ذلِكَ وأمَرنا بالجلوسِ) رواه احمد و ابو داود و وابن ماجة بنحوه، واتـە: پێغەمبـەری خوا ﷺ فـەرمانی پـێکردین کـە لەبـەر جەنازە هەستین، پاشان دوای ئـەوە دانیشـت و فەرمانیشـی پـێکردین کـە دابنیشـین هەندێکیشـیان دەڵێـن هـەردووك لا - هەڵسـان و هەڵنەستان - دروستن و ئەم دەقەش دەکەنە بەڵگە:

*( عن ابن سيرين أنّ جَنازةً مَرّتْ بالحَسَنِ وابن عباسٍ فقامَ الحَسَنُ ولَمْ يَقُمْ ابنُ عباسٍ فقال الحَسَنُ لأبْن عباسٍ أما قامَ لَها رسـولُ الله ﷺ؟ فقـال: قـامَ و قَعَدَ) رواه احمد والنسائي. واتـە: جەنازەیـەك بەلای حەسـەن - کـوڕی عـەلی کـوڕی ئـەبووطالیب - و عـەبدوڵڵای کـوڕی عـەبباس دا ڕەد بـوو، حەسـەن هەڵسـاو عـەبدوڵڵا هەڵنەسـتا، حەسـەن بە عەبدوڵڵا ی گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری هەڵنەستاوە؟! عەبدوڵڵا -گوتی: هەڵساوە و دانیشتوە؛ بەڵام بە ئاشکرا دیارە کە ڕای یەکەم بەڵگەی بەهێزترە و لـە ڕاستییەوە نزیکترە و لەگەڵ ڕووحی گشتی ئیسلامیش دا - کە ئەوپەڕی حورمـەتی ئینسانی گرتوە - گونجاو ترە.

---

[٣٢٢] بڕوانە: (نيل الأوطار ج٤ ص٢٢)

**تێبینی:** لە چەند دەقێك دا لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە حیکمەتی هەڵسان لەبەر جەنازە ڕێزگرتنە لەو فریشتانەی کە لە گەڵی‌دان و بە گەورەگرتنی فەرمانی خوایە هەربۆیەش جیاوازی نەخراوەتە نێوان جەنازەی مسوڵمان و کافرەوە[٣٢٣].

## ١٤-نوێژە سوننەتەکان (الصَّلَوَاتُ المَسْنُونَات)

**خوێنەری بەڕێز!** نوێژە سوننەتەکان زۆر و جۆراوجۆرن و خوا یاربێ ئێمە هەوڵ دەدەین بە ڕیز ئاماژەیان پێبکەین، بەڵام بێگومان توێژینەوەی تێرو تەسەل لەبارەی هەرکامێکیانەوە لە حەوسەڵەی ئێرەدا نیە و پێویستە لە سەرچاوەکانی سوننەت و کتێبە فیقهی‌یەکان دا ئەو مەدارە ساز بکرێ، هەرچەندە هەوڵ دەدەین باس و مەسەلە گرنگەکانیان بە گوشراوی هەر بخەینەڕوو.

جا ئێمە بەرلەوەی بێینە سەر سەرژمێری نوێژە سوننەتەکان بەپەسندی دەزانم پێنج ئاگاداری گشتی‌یان لەبارەوە بخەینەڕوو:

**یەکەم:** سەرجەمی نوێژە سوننەتەکان - مەگەر بە دەگمەن - بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی نوێژە فەرزەکان و تەواوکردنیانن، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسی‌دا فەرموویەتی کە (ابوداود) لە (ابو هریرة) وە خوا لێی ڕازی‌بێ گێڕاویەتەوە.

**دووەم:** وا پەسەندە کە نوێژە سوننەتەکان - بێجگە لەوانەی کە بەکۆمەڵ دەکرێن - لە ماڵەوە بکرێن، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (اذا صَلَّى أَحَدُكُمُ الصَّلاةَ في مَسْجِدِهِ فليجعلْ لِبَيْتِهِ نَصِيباً مِنْ صَلاتِهِ فَإِنَّ الله عز وجل جاعِلٌ في بَيْتِهِ مِنْ صَلاتِهِ خَيْراً) رواه احمد و مسلم عن جابر، **واتە:** ئەگەر یەکێکتان نوێژی لە مزگەوتەکەی خۆی‌دا کرد با بەشێك لە نوێژەکانیشی - کەمەبەست نوێژی سوننەتە - بخاتە ماڵەکەی چونکە خوای باڵادەست و پایەبەرز بەهۆی نوێژەکەیەوە خێر دەخاتە ماڵەکەیەوە.

هەروەها فەرموویەتی: (صَلاةُ المَرْءِ في بَيْتِهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاتِهِ في مَسْجِدي هذا، إلا المَكْتُوبَةَ) رواه ابوداود باسناد صحيح عن زيد بن ثابت.

---

[٣٢٣] بڕوانە: (نيل الأوطار ج٤ ص ١٢١) کە چەند دەقێکی لەبارەوە هێناوە.

**سێیەم:** نوێژە سوننەتەکان دروستە بە دانیشتنەوەش بکرێن هەرچەندە بەپێوە خێرو پاداشتیان زیاترە، چەند دەقێك بەڵگەی دروست بوونی نوێژی سوننەتن بە دانشتنەوە، بۆ وێنە: ئەو فەرموودەیەی کە (علقمة) لە (عائِشَةَ) خوالێی ڕازی‌بێ دەیگێڕێتەوە دەربارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە بە دانیشتنەوە کردوویەتی و (مسلم) گێڕاویەتەوە، هەروەها (احمد و اصحاب السنن) یش فەرموودەیەکی لەو بابەتەیان لە (عائِشَةَ) وە گێڕاوەتەوە.

**چوارەم:** هەرکام لە وشەکانی: (تَطَوّع، مُسْتَحَبّ، سُنَّة، مَنْدوب، نَفْل) کە شەرعزانان بەکاریان هێناون، ناون بۆ نوێژی سوننەت و زیادە لە فەرزەکان، جا ئەو نوێژە سوننەتانە بە گشتی دابەش دەبن بۆ دووجۆری سەرەکی موتڵەق و مەرجدار (المُطْلَقْ والمُقَيَّد) مەبەستیش لە سوونەتی موتڵەق ئەوەیە کە هیچ مەرج و ناوونیشانێکی تایبەتی لەسەر نیەو بە هیچ کات و شوێن و بۆنە (مناسبة) و ڕووداوێکەوە نەبەستراوەتەوە بەڵکو بابای نوێژکەر ئازادە لە کات و شوێن و ئەندازەی ئەنجام دانی‌دا بەمەرجێك لەو کات و شوێنە تایبەتی‌یانەدا نەبێ کە نوێژیان تێدا قەدەغەکراوە، مەبەستیش لە نوێژی سوننەتی مەرجدار ئەو جۆرە نوێژانەن کە پەیوەستن بە کات و شوێنی تایبەت و بۆنە و ڕووداو و حاڵەتە تایبەتەکانەوە، بۆ وێنە: سوننەتی (رَواتِبْ) و (وَتْر) و (ضُحىٰ) ..

**پێنجەم:** ئینجا دیسان نوێژە سوننەتە مەرجدارەکانیش دوو جۆرن: (مُؤَكَّد) و (غير مؤكد) کە مەبەست لە (مؤكد) ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگی پێ‌داوە و داکۆکی لەسەر ئەنجام دانی کردوە و دەوامی لەسەر کردوە، (غير مؤكد) یش ئەوەیە کە ئەوەندە گرنگی‌یەی پێ‌نەدراوە و هێندە جەخت و دەوامی لەسەر نەکراوە.

ئێستاش با بە ڕیز بەسەرژمێری نوێژە سوننەتەکان دا بچین:

**یەك:** سوننەتەکانی لەگەڵ نوێژە فەرزەکان (الرواتب): کە بەم جۆرەن:

١)دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، کە پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیانەوە فەرموویەتی: (**رَكْعَتا الفَجْرِ خيرٌ مِنَ الدنيا و ما فيها**) رواه احمد و مسلم والترمذي والنسائي.

وە سوننەتە کە لەدوای فاتیحە هەردوو سوورەتی (قل يا أيها الكافرون) و (قل هو الله أحد) یەکەمیان لە ڕکاتی یەکەم و دووەمیان لە دووەم دا بخوێنێ، وەك (احمد) و (ابن ماجة) دەگێڕنەوە،یان (قولوا امنا بالله وما انزل الينا..) البقرة –١٣٦ – و(تعالوا الى كلمة سواء بيننا و بينكم..) ال عمران – ٦٤ – بخوێنێ، وەك (مسلم) گێڕاویەتەوە[٣٢٤].

---

[٣٢٤] دیارە مەبەست خوێندنی ئەو دوو ئایەتەیە بەتەواوی، کە ئەمە دەقەکەیانە؟

٢)دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ و دوو ڕکاتیش لەدوای، وەك (بخاري) لە (ابن عمر) خوا لێی ڕازی‌بێ دەگێڕێتەوە، یان چوار ڕکات لە پێشی و دووڕکات لەدوای وەك (احمد و مسلم) لە (عبدالله بن شقیق) ئەویش لە (عائشة) وە گێڕاویانەتەوە، یان چوار ڕکات لە پێشی و چواریش لەدوای وەك (احمد و اصحاب السنن) لە (ام حبیبة) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە.

٣)دوو ڕکات یان چوار ڕکات پێش ئێوارە (عصر) وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَحِمَ الله امْرأً صَلَّى قَبْلَ العَصْرِ أَرْبَعَاً) رواه احمد و ابوداود والترمذي و حسنه وابن حبان و صححه، بەڵگەی دوو ڕکاتیش پێش عەصر ئەم فەرموودەیە: (بَيْنَ كُلِّ أذانَيْنِ صَلاةٌ) متفق علیه، کە مەبەست لە (أذانین) بانگ و قامەتە، هەروەها ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم و نسائي) لە (عائشة) ی دەگێڕنەوە، وە (نسائي) لە (ام سلمة) ی دەگێڕێتەوە کە هەردووکیان بە ڕاشکاوی دەڵێن پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی پێش عەصر کردوون.

٤)دوو ڕکات دوای شێوان وەك (بخاري) لە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازی‌بێ گێڕاویەتەوە وە واباشە کە (قل یا أیها الكافرون) و (قل هو الله أحد) یان تێدا بخوێنێ، وەك دوو ڕکاتی پێش بەیانی (ابن ماجة و ترمذي) ئەمەیان لە (ابن مسعود) ەوە گێڕاوەتەوە خوا لێی‌ڕازی‌بێ. هەروەها دوو ڕکاتیش پێش نوێژی شێوان سوننەتن چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: صَلُّوا قَبْلَ المَغْرِب...) رواه البخاري عن عبدالله بن المغفل.

٥–دوو ڕکات دوای نوێژی خەوتنان، وەك لەو فەرموودەیەدا دەبینرێ کە (بخاري) لە (ابن عمر) خوا لەخۆی و بابی ڕازی‌بێ دەیگێڕێتەوە.

هەروەها بەپێی فەرموودەی: (بَيْنَ كُلِّ أذانَيْنِ صَلاةٌ) لەنێوان هەردوو بانگ دا نوێژێك – ی سوننەت – هەیە، دوو ڕکاتیش لە پێش نوێژی خەوتنان هەن، هەروەها بەپێی فەرموودەی: (ما مِنْ صَلاةٍ مَفروضَةٍ اِلاّ و بَيْنَ يَدَيْها رَكْعَتانِ) رواه ابن حبان عن ابن زبیر رضی الله عنهما، واتە: هەموو نوێژێکی فەرز – لە پێنج فەرزەکان – دوو ڕکاتی لەپێشەوەهەن.

---

١)(قولوا امنا بالله وما انزل الينا وما انزل الى ابراهيم واسماعيل واسحاق ويعقوب و الأسباط، و ما أوتي موسى و عيسى وما أوتي النبيون من ربهم لانفرق بين أحد منهم ونحن مسلمون).

٢)(قل يا أهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا و بينكم الا نعبد الا الله و لا نشرك به شيئاً ولا يتخذ بعضنا بعضاً ارباباً من دون الله فان تولوا فقولوا اشهدوا بانا مسلمون).

**ئـــاگاداری**: لــه چــهند فهرمووده‌یــه‌ك دا ده‌رده‌كــه‌وێ كــه ئــه‌و نوێــژه سوننه‌تانه‌ی له‌گه‌ڵ پێنج نوێژه فه‌رزه‌كانن كه به (سنن الرواتب) ناسراون، ته‌نیا ده (١٠) ڕكاتیان یان دوازده (١٢) یان به داكۆكی‌له‌سه‌ركراو (المؤكد) داده‌نرێن و ئه‌وانی دیكه بـه داكۆكـی له‌سـه‌رنه‌كراو داده‌نرێـن، جـا بـه‌پێی ئـه‌و فه‌رموودانـه كـه دوایـی ئاماژه‌شیان پێ‌ده‌كه‌ین، سوننه‌ته‌كانی داكۆكی له‌سه‌ركراو ئه‌گه‌ر ده (١٠) ڕكات بن ئه‌مانه‌ن:

دوو ڕكات پێش به‌یانی، دوو ڕكات پێش نیوه‌ڕۆ و دوو ڕكات له دوای، دوو ڕكات دوای شێوان، دوو ڕكات دوای خه‌وتنان.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر دوازده (١٢) ڕكات بـن ئـه‌وه لـه‌جیاتی دوو ڕكـات چـوار ڕكـات پێـش نیوه‌ڕۆیه و ئه‌وانی دیكه‌ش وه‌ك خۆیانن، یان پێش نیـوه‌ڕۆ هـه‌ر دوو ڕكات و پێـش عه‌سـریش دووان. ئه‌و فه‌رموودانه‌ش كه ئـه‌و ئه‌نجامگیری‌یـه‌یان لـێ‌ده‌فامرێته‌وه كـه گوتمان ئه‌مانه‌ن:

*(عن ابن عمر قال: حَفِظْتُ مِنَ النَبِيِّ ﷺ عَشْـرَ رَكَعـاتٍ" ركعتـين قَبْـلَ الظُـهْرِ و ركعتـين بَعْدَها، و ركعتين بَعْدَ المغربِ في بَيْتِه، و ركعتين بَعْـدَ العِشـاءِ في بَيْتِـه، و ركعتـين قَبْـلَ صَـلاةِ الصُبح) رواه البخاري.

*(عن أم حبيبة بت أبي سفيان أن النبي ﷺ قال: مَنْ صلَّى في يَومٍ و لَيلَـةٍ إثْنَـتَيْ عَشْـرَةَ ركعةً بُنِيَ لَهُ بَيتٌ في الجنةِ: أَرْبَعاً قَبْلَ الظهرِ، و ركعتين بَعدَها و ركعتين بعد المغربِ، و ركعتين بعد العشاءِ، و ركعتين قَبْلَ صَلاةِ الفَجْرِ) رواه الترمذي و قال : حسن صحيح، و رواه مسلم مختصراً وهذا لفظه:

*(مَنْ صلى في يومٍ و ليلةٍ ثِنتَيْ عَشْرَةَ سَجْدَةً سِوى المكتوبةِ بُنِيَ لَـهُ بَيـتٌ في الجَنَـةِ) رواه الجماعة الا البخاري، واته: هه‌ركه‌سێك له شـه‌وڕۆژێك دا بێجگـه لـه نوێـژی فـه‌رز، دوازده ڕكات بكات ماڵێكی له به‌هه‌شت بۆ دروست ده‌كرێ.

دوو: شه‌ونوێژ و وه‌تر (صلاة الليل و الوتر) و ته‌راویح: بۆیه شه‌ونوێژ و وه‌ترم پێكه‌وه هێنان چونكه مه‌گه‌ر چۆن ده‌نا هه‌م پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هـه‌ر پێكـه‌وه كردوونـی و هـه‌م لـه ده‌قـه‌كانی سوننه‌تیش پێكـه‌وه باس كراون وه لـه ڕاسـتی‌دا دوو شـتی زۆر پێكه‌وه تێكهه‌ڵكێشن.

جا دیاره هەم شەونوێژ و هەم وەتریش پاش نوێژی خەوتنان دەکرێن و چاکتریش وایە کە وەتر بخرێتە کۆتایی نوێژەکانی شەوگارەوە چونکە پێغەمبەر ﷺ بەزۆری وای کردوە و جاری واش بووە کە وەتری پێش خستوە - واتە پێش خەوتن کردوویەتی - وەك لە چەندان دەقی سوننەت دا دەردەکەوێ بۆ وێنە:

*(عن عائشة قالت: مِنْ كُلِّ اللَّيل قَدْ أَوْتَر النبيُّ ﷺ مِنْ أولِ الليـلِ وأَوْسَطِهِ وآخِـرِهِ فانْتَهى وِتْـرُهُ الى السَّحَرِ) متفق علیه، واتـە: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکانی شەویدا نوێـژی وەتری کردوە لە سەرەتای شەوەوە و لە نێوەڕاستیدا و لە کۆتاییـیەوە، وە دواجار وەتری خستە پێش بەرەبەیان.

دەربارەی ئەندازە و ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژ و وەتریـش ئـەوەی لـە سـەرجەم دەقەکانی سوننەت دەردەکەوێ ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە شـەو نوێـژو وەتـرەوە بە زۆری یازدە (١١) ڕکات و جاری واش بووە سێزدە (١٣) ڕکاتی کردوون، کە دیارە هەشت (٨) ڕکات لەو یازدە ڕکاتە یان سێزدە ڕکاتە شەونوێژ بوون و باقییەکەی کە سێ ڕکات یان پێنج ڕکات بووە وەتر بوون، کەواتـە ئـەو دەقانەی کە باسی حـەوت ڕکات وەتر یان نۆ یان زیاتر دەکەن، ئەوە مەبەستیان شەونوێژ و وەترە بەیەکەوە، چونکە پێغەمبـەر ﷺ عادەتی وابووە - بەتایبەت لە دوایی ی تەمەنیدا - کـە وەتـری خستۆتە کۆتایی شەونوێژەوە، ئەمەش چەند دەقێك لەبارەی شەونوێژ و وەترەوە کە ڕاستیی ئەو قسەیەی سەرێ دەسەلمێنن:

*عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ ما كان يَزيدُ في رمضانَ ولا في غَيْرِهِ علـى إِحْدى عَشْرَةَ رَكْعةً) متفق علیه، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزان و غەیری ئەویش دا لە یازدە ڕکات زیاتر- شەونوێژ و وەتر - ی نەکردوە.

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كانَ رسولُ الله ﷺ يصلّي مِنَ الليلِ ثلاثَ عَشْرَةَ ركعةً يُوتِرُ مِنْ ذلِكَ بِخَمْسٍ لا يَجْلِسُ إِلّا في آخِرِهِنَّ) متفق علیه، واتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ شـەوانە سێزدە ڕکاتی دەکردن پێنجیـان لەوانـە وەتـر بـوون تـەنیا لـە ڕکـاتی کۆتاییـیـان دا دادەنیشت - بۆ تەحییات خوێندن-.

لەم دەقەدا دایکی بڕواداران (عائِشَة) خوا لێی ڕازیبێ بە ڕاشکاوی دەری دەخات کە شەونوێژ (صَلاةُ التَهجُّد) هەشت (٨) ڕکاتە.

ئنجا شایانی باسه كه (تەڕاویح) یش هەر شەونوێژە ئەوەندە هەیە بەكۆمەڵ كرانی تێدا سوننەتە، بەڵگەشمان چەند دەقێكە یەكێكیان ئەو فەرموودەیەی (عائشة) یە كە پێشتر باسمان كرد: (ماكان يزيد في رمضانَ ولا في غيره عَنْ إِحْدَى عشرة ركعة). دەقێكی دیكەش ئەوەیە كە (جابر) خوا لێیڕازیبێ دەربارەی تەڕاویحی ڕەمەزان لە پێغەمبەری ﷺ دەگێڕێتەوە:

*(أَنَّه ﷺ صلَّى بِهِمْ ثَمانِيَ رَكْعَاتٍ والوَتْرَ) اخرجه ابن خزيمة وابن حبان في صحيحيهما.

هەندێك لە زانایانیش ڕایان وایە كە شەونوێژ و تەڕاویح ژمارەیەكی دیاریكراوی نیە و ئینسان هەرچەندی توانی با بیكات گرنگ ئەوەیە كۆتاییەكەی بە وەتر بێنێ، چەند دەقێكیش بەبەڵگە دێننەوە یەكێكیان ئەمەیە:

*(عن سمرة بن جندب رضي الله عنه قال: أَمَرَنا رسولُ الله ﷺ أَنْ نُصَلِّيَ مِنَ اللَّيلِ ما قلَّ أو كَثُرَ و نَجْعَلَ آخِرَ ذٰلِكَ وَتْراً) رواه الطبراني والبزار. هەربۆیەش زۆربەی زانایان دەڵێن سوننەتە تەڕاویح بیست (٢٠) ڕكات بێت، وە ئەمە ڕای هەركام لە حەنەفییەكان و شافیعییەكان و حەنبەلییەكان و داودی ظاهری و ثوري و ابن المبارك) یشە، (مالك) یش ڕای وایە كە (٣٦) ڕكات بێت.

كەواتە: هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی بە شەونوێژ و وەترەوە - لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان دا - سێزدە یان یازدە ڕكاتی كردوون، بەڵام نەیفەرمووە كە لەم ئەندازەیە زیاتر یان كەمتر نابێ بكرێ. هەرچەندە بێگومان وەك پێغەمبەر ﷺ كردن چاكتر و پەسند ترە، بەڵام ئەگەر كەسێكیش شێوەكانی دیكەشی هەڵبژاردن بۆمان نیە گلەیی لێبكەین و ڕەخنەی لێبگرین.

## چوار ئاگاداری:

**یەكەم:** زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە كە هەم شەونوێژ و هەم وەتریش دروستە دوو ڕكات دوو ڕكات بكرێن و دروستیشە چوار ڕكات چوار ڕكات و بگرە سەرجەم ڕكاتەكان پێكەوە بلكێنرێن و لەكۆتاییەكەیان دا سەلام بدرێتەوە، چەندان دەقی سوننەتیش لەو بارەوە هەن، بۆ وێنە ئەو فەرموودەیەی كە (سعيد بن هشام) لە (عائشة) ەوە دەیگێڕێتەوە كە دەربارەی وەتری پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكردوە[٣٢٥].

---

[٣٢٥] بڕوانە: (نیل الأوطار: ج٣، ل٧٠) كە فەرموودەی ناوبراوی بەدرێژی هێناوە.

**دووەم:** سوننەتە لە سێ ڕکاتی کۆتایی وەتردا - کە وادیارە پێغەمبەری خوا ﷺ بە زۆری وەتری بە سێ ڕکات کردوە - لە ڕکاتی یەکەم دا دوای فاتیحە سوورەتی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) و لە ڕکاتی دووەمیش دا سوورەتی (قــل یــا ایــها الكــافرون) و لە سێیەمیش دا سوورەتی (قل هو الله أحــد)یان ئەمیش و هەردوو سوورەتی (الفلق) و (الناس)یش بخوێنێ، وەك (احمد و ابوداود و ترمذي) لە (عائشة) وە (رضي الله عنها) گێڕاویانەتەوە.

**سێیەم:** فەرموودەی زۆرو زەوەند هەن دەربارەی گەورەیی پلەوپایە و خێرو پاداشتی هەرکام لە شەونوێژ و وەتر و تەراویح، بۆ نموونە:

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: سُئِلَ رَسولُ اللهِ ﷺ أيُّ الصَّلاةِ أَفْضَلُ بعْدَ المكتوبَةِ؟ قال: الصَّلاةُ في جَوفِ اللَّيلِ..) رواه مسلم وابوداود والنسائي و الترمذي، واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا پاش نوێژی فەرز چ نوێژێك چاکتر و گەورەترە؟ فەرمووی: نوێژ لە نیوەشەوێدا.

*(قال علي رضی الله عنه: إنَّ الوتر ليس بحتم كصلاتكم المكتوبة ولكنْ رسولُ الله ﷺ أَوتر ثم قال: يا أهلَ القرآنِ أوتروا فانَّ الله وتر يحبُّ الوترَ) رواه احمد و اصحاب السنن و حسنه الترمذي و صححه الحاكم، واتە: بێگومان وەتر وەك نوێژە فەرزەکانتان پێویست نیە، بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ وەتری کردوە ئینجا فەرموویەتی: ئەی شوێن کەوتوانی قورئان نوێژی وەتر بکەن چونکە خوا تاکە و نوێژی تاکی خۆش دەوێ.

*(عن أبي هريرة رضی الله عنه قال: كان رسولُ الله ﷺ يُرغِّبُ في قيام رمَضانَ منْ غيرِ أنْ يأمرَ فيه بعزيمةٍ فيقولُ: مَنْ قامَ رمضانَ إيماناً واحْتِساباً غُفِرَ لهُ ما تقدَّمَ مِنْ ذَنْبِه) متفق عليه، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمانانی هان دەدا بۆ نوێژکردن لە - شەوانی - مانگی ڕەمەزان دا بێئەوەی وەك فەرز فەرمانیان پێبکات، دەیفەرموو: هەرکەسێك شەوانی ڕەمەزان شەنوێژ بکات بە ئیمان و ئیخلاصەوە هەموو گوناحە پێشووەکانی دەبوردرێن.

**چوارەم:** دەربارەی خوێندنی دووعای قونووت لە ڕکاتی کۆتایی نوێژی وەتردا زانایان ڕایان جیاجیایە بەشێکیان دەڵێن: سوننەتە بەدرێژایی ساڵ دووعای قونووت بخوێنرێ، کە ئەم ڕایە وەك (نووي) گوتوویەتی لە (ابن مسعود) و (الحسن البصري) و (النخعي) و (اسحاق) و (ابوثور)، نەقڵ کراوە ئەمە ڕای حەنەفی‌یەکان و هەندێك لە شافیعی‌یەکان و ڕیوایەتێکی (احمد) یشە[٣٢٦]، وە بەشێکیان دەڵێن تەنیا لە نیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزان دا سوننەتە بخوێنرێ کە ئەمە ڕای باوی مەزەبی شافیعی و ڕای مالیك و ئەحمەدە[٣٢٧]، هەنێکشیان دەڵێن: تەنیا لە مانگی ڕەمەزان دا - هەمووی - سوونەتە بخوێنرێ[٣٢٨]. دیارە پێشتریش دەقی ئەو دوعایەمان نووسیوە کە پێغەمبەر ﷺ فێری (حَسَن بن علي) - خوا لە خوێ و بابی ڕازی بێ - کردوە کە لە دووعای قونووتی ڕکاتی کۆتایی وەتردا! بیخوێنێ، بەلاَم لێرەش دووبارەی دەکەینەوە.

*(عَنْ الحَسن بن علي رضى الله عنهما قال: عَلَّمني رسولُ اللهِ ﷺ كَلِماتٍ أَقُولهُنَّ في الوَتْر: اللهم اَهدني فيمَنْ هَدَيْتَ، و عافِني فِيمَنْ عافيتَ، وَتَوَلَّني فيمَنْ تولّيت، وَ بارِكْ لي فيما أَعْطَيت، و قِني شَرَّ ما قَضَيْتَ، فانكَ تَقضْي ولا يُقضّىٰ عَليْكَ، وانه لا يذِلُّ مَنْ واليْتَ، ولا يعِزُّ مَنْ عادَيْتَ، تَبارَكْتَ رَبَّنا وَ تَعالَيْتَ، وَصَلّى الله علىٰ النبيِّ محمدٍ) رواه احمد واصحاب السنن، و قال الترمذي: هذا حديث حسن.

**سێ:** نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان (صلاة عيدي الفِطْر والأَضْحىٰ): زۆربەی زانایان هەردووك نوێژی جەژنی ڕەمەزان کە لە یەکەمین ڕۆژی مانگی شەووال دایە و جەژنی قوربان کە لە دەیەمین ڕۆژی مانگی (ذو الحجة) دایە بە سوننەت دەزانن[٣٢٩]، وە دەڵێن چاکتر وایە بەکۆمەڵ بکرێ بەلاَم بە تەنیاش دروستە[٣٣٠]، وە هەرکامێکیان دوو

---

[٣٢٦] بروانە: (المجموع شرح المهذب) ج٤ ص ٣١.

[٣٢٧] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەرە.

[٣٢٨] بروانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٥٣ ، ٥٤.

[٣٢٩] مالیکی‌یەکان و شافیعی‌یەکان بە سوننەتی دەزانن و حەنەفی‌یەکان بە فەرزی عەین و حەنبەلی‌یەکانیش بە فەرزی کیفایە. بروانە: (الفقة الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٣٦٣، ٣٦٤.

[٣٣٠] ئەمەش ڕای بەشێکی زانایانە و بەشێکیشیان دەڵێن بەکۆمەڵ کرانی مەرجە، بروانە سەرچاوەی پێشوو.

ڕکاتە و سوننەتە لە ڕکاتی یەکەم دا دوای دوعای (استفتاح) حەوت جار (الله اکبر) بکرێ و لە ڕکاتی دووەمیش دا بێجگە لە (الله اکبر) ی هەڵسانەوە پێش خوێندنی فاتیحە پێنج جار (الله اکبر) بکرێ، ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە لە هاوەڵانی بەڕێز رضي الله عنهم وە شوێن کەوتوان (التابعين) و پێشەوا سەرمەزەبەکانی وەك : (مالك و اوزاعي و شافيعي و احمد و اسحاق)[٣٣١]، بەڵگەشیان چەند فەرموودەیەکە کە ئەمە یەکێکیانە:

*(عن عمر بن شعيب عن أَبِيه عن جَدِّه أَنَّ النبيَّ ﷺ كَبَّر في عِيْدٍ ثِنْتَيْ عشرةَ تكبيرةً سَبْعاً في الأُولى و خَمْساً في الآخرة ولَمْ يُصَلِّ قبلَها ولا بعدَها ) رواه احمد و ابن ماجة، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە - نوێژی - جەژنێك دا دوازدەجار (الله اکبر) ی کرد حەوتیان لە ڕکاتی یەکەم دا و پێنجیان لەئی دووەم دا، وە نە لە پێش نوێژی جەژن و نە لە دوایەوە نوێژی دیکەی نەکرد. وە ئەمەش فەرموودەیەکی دیکەیانە:

*(عن عمر بن عوف المزني رضي الله عنه أن النبي ﷺ كَبَّر في العِيدَيْن في الأولى سَبْعاً قَبلَ القِراءَة و في الثانية خَمْساً قَبْلَ القِراءَة) رواه الترمذي و قال: هو احسن شيء في هذا الباب عن النبي ﷺ، وە (ترمذي) لە کتێبی (العلل المفردة) دا گوتوویەتی: لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە پرسیارم لە (محمد بن اسماعيل ) واتە - بوخاري- کرد گوتی: (لەو بارەوە لەم فەرموودەیە ڕاست تر نیە و منیش هەر ئەوە ڕامە)[٣٣٢].



[٣٣١] بڕوانە : (نيل الأوطار) ج٣ ص ٣٦٧ ، ٣٦٨،

[٣٣٢] سەرچاوەی پێشو ج٣ ص ٣٦٦.

# چەند ئاگادارییەك لە بارەی نوێژی دوو جەژنەکانەوە

١)سوننەتە لە ڕکاتی یەکەمیاندا پاش فاتیحە سوورەتی (سبح اسم ربك الأعلى) و لە دووەمیاندا سوورەتی: ( هل أتاك حديث الغاشية) بخوێنرێن، وەك (احمد) لە (سمرة) و (ابن ماجة) لە (ابن عباس) ەوە گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە.

یان لەجیاتی ئەو دوو سوورەتە لە ڕکاتی یەکەمیاندا (ق والقرآن المجيد) و لەهی دووەمیان (اقتربت الساعة) بخوێنێ وەك (بخاري و أصحاب السنن) گێڕاویانەتەوە، دیارە لە نوێژی جەژندا ئیمام دەنگی بەرز دەکاتەوە هەم بۆ قورئان خوێندن و هەم بۆ (الله اكبر)ەکانیش.

٢)گوتنی (الله اكبر) ەکانی نوێژەکانی هەردووك جەژنی ڕەمەزان و قوربان بە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان سوننەتە و هەندێکیشیان دەڵێن فەرزە، بەڵام ڕای زۆربە بەهێزترە[٣٣٣]، وە لەنێوان (الله اكبر)ەکان زیکرێکی دیاریکراو نیە بۆیە بەشێك لە زانایان وك (مالك و ابوحنيفة و اوزاعي) دەڵێن دەبێ (الله اكبر)ەکان بەدوای یەك دا بڵێت و هیچیان لەنێوان دا نەڵێ، هەندێکیشیان دەڵێن وا باشە زیکرێکیان لەنێوان دا بکات و لەوبارەوە چەند زیکرێکیان پێشنیار کردوون[٣٣٤] بۆ وێنە:

(سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر) یان (لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير) یان (الله اكبر كبيراً والحمد لله كثيراً و سبحان الله بكرة واصيلاً) کە ئەم زیکرانەش لەلایەن شافیعییەکانەوە پێشنیار کراون، واش پێدەچێ زیکرکردن و بێدەنگ بوون هەردووکیان وەك یەك بن و هەرکامیان بکرێ ئاساییبێ[٣٣٥].

٣)نوێژی جەژنەکان لە مزگەوت و لە دەرەوەی مزگەوتیشدا دروستە، جا هەرچی جەماوەری زانایانن دەڵێن سوننەتە لە دەرەوەی مزگەوت بکرێن، بەڵام شافیعییەکان دەڵێن سوننەتە لە مزگەوت دا بێ، بەڵام واپێدەچێ ڕای جەماوەر بەهێزترو بەڵگەدارتربێ[٣٣٦].

---

[٣٣٣] بڕوانە: (الروضة الندية شرح الدور البهية) ج١ ص ٢٧١.

[٣٣٤] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٣٧٠.

[٣٣٥] نووي گوتوویەتی (مەزەبی شافیعیو احمد) و (ابن المنذر) ڕایان وایە زیکر بخوێنرێ، بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٢٦.

[٣٣٦] سەرچاوەی پێشوو ج٣ ص ٣٥٩، ٣٦٠، وە بڕوانە (الفقه الإسلامي) ج٢ ص ٣٦٩.

٤)زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە سوننەتە ئافرەتیش بە گشتی - بە کچ و ژن و پیرو گەنجەوە - لە ماڵ دەربچن بۆ نوێژی جەژنەکان و ئەگەر بێنوێژیش بوون هەر بچن، بەڵام لە گۆشەو کەنارێکەوە بن و گوێبگرن و زیکری خوا بکەن، بەڵگەشیان چەند فەرموودەیەکە کە ئەمە یەکێکیانە:

*(عن أم عطية رضي الله عنها قالت: أَمَرَنا رسولُ الله ﷺ أَنْ نُخْرِجَهُنَّ في الفِطْرِ والأَضْحَى: العَواتِقَ والحُيَّضَ و ذَواتِ الخُدُورِ فَأَمّا الحُيَّضُ فَيعتزِلْنَ الصَّلاةَ) رواه البخاري و مسلم واصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە لە جەژنی ڕەمەزان و قورباندا کچۆڵەکان و ئافرەتانی حەیزدار و ئافرەتانی پەردەدار بەرینە دەرێ - بۆ نوێژ - جا هەرچی حەیزدارەکانن بەشداری نوێژ ناکەن و کەنار دەگرن.

٥)دیارە نوێژی جەژنەکانیش بانگ و قامەتیان تێدا نین، وەك (بخاري و مسلم) لە(ابن عباس)یان گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يومَ الفِطْرِ ولا يَوْمَ الأَضْحَى) واتە: نە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان نە ڕۆژی جەژنی قوربان بانگ نەدەدرا[٣٣٧].

٦)سوننەتە لە بەرەبەیانی جەژنی ڕەمەزان دا بەر لە ماڵ دەرچوون شتێك بخورێ، بەڵام لە جەژنی قوربان دا نا، چەند دەقێك لەو بارەوە هەن بۆ وێنە: (كانَ رسولُ الله ﷺ لا يَغْدُو يومَ الفِطْرِ حتّى يأكُلَ ولا يأكُلُ يومَ الأَضْحَى حتّى يَرْجِعَ) رواه احمد و الترمذي وابن ماجة وابن حبان والبيهقي وغيرهم عن (بريدة).

٧) وە سوننەتە ئینسان ئەو ڕێیەی لێیەوە دەچێ بۆ نوێژ بۆ گەڕانەوەی بۆ ماڵ بیگۆڕێ و لە ڕێیەکی دیکەوە بگەڕێتەوە لەو بارەشەوە چەندان فەرموودە هەن بۆ وێنە: (كانَ النبيُّ ﷺ إذا كانَ يومُ العيدِ خالَفَ الطَّرِيقَ) رواه البخاري.

٨) دیارە کاتی نوێژی دوو جەژنەکایش دەکەوێتە نێوان خۆربەرزبونەوە بەئەندازەی ڕمێك هەتا خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لادەدات، ئەم مەسەلەیەش چەند دەقێکی لەسەرن و هەرچەندە زۆریش بەهێزنین بەڵام سەربارەش یەکدەنگی (اجماع) ی زانایانی لەسەرە[٣٣٨].

---

[٣٣٧] (نووي) گوتوویەتی: (لا يُؤَذَّنُ للعيدِ ولا يقام و بهذا قال جمهور العلماء من الصحابة والتابعين و مَنْ بَعْدَهُمْ و عليهِ عمل الناسِ في الأَمصار..) المجموع ج٥ ص ١٩.

[٣٣٨] بڕوانە: (الروضة الندية شرح الدرر البهية) ج١ ص ٢٢.

٩)زۆربەی هەرەزۆری[٣٣٩] زانایان ڕایان وایە کە لەگەڵ (الله اکبر) ە زیادەکانی نوێژی جەژن دا سوننەتە هەردووك دەست وەك کاتی نوێژ دابەستن بەرزبکرێنەوە، هەندێکیشیان وەك (مالك و ثوري و ابن ابي ليلى و أبو يوسف) دەڵێن سوننەت نیە[٣٤٠]

١٠)تێکڕای زانایان دوای نوێژی جەژنەکان وتاردان (خطبة) بە سوونەت دەزانن[٣٤١]، جا بەشێکیان دەڵێن: سوننەتە دوو وتاریش وەك هی جومعە و لەنێوانیان دا دابنیشێ. بەشێکیشیان دەڵێن وتاری جەژن بەس یەك وتارە، بەڵام واپێدەچێ ڕای دووەم بەهێزتربێ، چونکە هیچ دەقێکی ڕاست و بێ پێچ و پەنا (صحيح و صريح) بەدەست ئەهلی ڕای یەکەمەوە نیە - هەرچەندە زۆربەو جەماوەری[٣٤٢] چوار مەزەبەکانن - کە ئیسپاتی ئەوەی پێبکەن پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنەکانیشدا وەك ڕۆژانی جومعە دوو وتاری دابن و لەنێوانیاندا دانیشت بێ[٣٤٣].

هەندێك لە زانایانیش دەڵێن وا پەسندە کە وتاری جەژن بە (الله اکبر) کردن دەست پێبکات جا ئەوانەی دوو وتار بە سوننەت دەزانن، بۆ وێنە شافیعیەکان دەڵێن وا باشە بەر لە دەست پێکردنی وتاری یەکەم نۆ (٩) جار (الله اکبر) بکات و لە پێش هی دووەمیش دا حەوت (٧) جار، بەڵام ڕاستیەکەی ئەو زانا بەرێزانە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەدەستەوە نیە کە ئیسپاتی ئەو ڕایەیانی پێبکەن و پەسند و چاك وایە کە وتاری جەژنەکانیش وەك وتاری جومعە بە سوپاس و ستایشی خوا دەست پێبکرێ[٣٤٤].

١١)تێکڕای زانایان (الله اکبر) کردن بەدەنگی بەرز و نزم لە ڕۆژانی جەژنەکان دا بە سوننەت و دروشمێکی ئیسلام دەزانن، خوای پەروەردگاریش ئاماژەی بە (الله اکبر) کردن لە هەردووکیاندا کردوە بۆ جەژنی ڕەمەزان: (.. و لِتُكْمِلوا العِدَّةَ ولِتُكَبِّرُوا الله علىٰ ماهَدَاكُمْ و لعلكُمْ تَشْكُرون) البقرة ١٨٥ - بۆ جەژنی قوربانیش: (كذلكَ سَخَّرها لكُمْ لتكبّروا الله علىٰ مَاهَدَاكُمْ) الحج - ٣٧ - ، وە زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە سەرەتای

---

[٣٣٩] (نووي) گوتوویەتی: ئەوە وێڕای مەزەبی شافیعی ڕای (عطاء و اوزاعي و ابو حنيفة و محمد و احمد و داود و ابن المنذر) یشە بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٢٦.

[٣٤٠] بڕوانە (المجموع) ج٥ص٢٦.

[٣٤١] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٣٧٧.

[٣٤٢] بڕوانە: (الفقه الاسلامي..) ج٢ ص ٣٧٨ تا ٣٨٠.

[٣٤٣] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص٣٧٦.

[٣٤٤] سەرچاوەی پێشوو [illegible]

دەست پێکردنی (الله اکبر) کردن لە جەژنی ڕەمەزاندا لەو کاتەوەیە کە ئیمام دەچێ بۆ نوێژی جەژن و هەتا دەست پێکردنی وتار دەخایەنێ، هەندێکیشیان دەڵێن لە شەوی جەژنەوە دوای دیتنی مانگ دەست پێدەکات و هەتا ئیمام دەچێ بۆ نوێژگە (مُصَلّى) دەخایەنێ[٣٤٥].

(الله اکبر) کردنی جەژنی قوربانیش بەڕای زۆربەی زانایان کە (ابن المنذر و شافعي و أحمد و ابو یوسف و محمد) یان لەنێودان لە بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە دەست پێدەکات و هەتا ئێوارە - عصر - ی دوایین ڕۆژی (أیام التشریق) کە یازدەو دوازدە و سێزدەی مانگی (ذوالحجة)ن دەخایەنێ[٣٤٦].

بۆچۆنیەتی (الله اکبر) کردنیش (صیغة) یەکی تایبەت دیاری‌نەکراوە، بۆیە زانایان چەند (صیغة) یەکی جۆراوجۆریان پێشنیار کردون کە ئەوانیش لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویاننەوە، بۆ وێنە[٣٤٧]:

١)(الله اکبر،الله اکبر،الله اکبر) نووي گوتوویەتی:ئەمە ڕای مەزەبی شافیعیو ڕای (مالك)ە.

٢)(الله اکبر الله اکبر، لا الا اله الله، والله اکبر الله اکبر، ولله الحمد) نووي گوتوویەتی: ئەمەش ڕای (ثوري و ابو حنیفة و محمد بن الحسن، و أحمد و اسحاق) ە، لە (عمر و ابن مسعود) ەوە.

٣)(الله اکبر الله اکبر لا اله الا الله وحده لا شریك له، له الملك وله الحمد وهو علی کل شيء قدیر) لە (ابن عمر) ەوە خوا لێیان ڕازیبێ.

شایانی باسە کە زۆربەی زانایان ئەو (الله اکبر) کردنە لەدوای نوێژە فەڕزەکانەوە بە سوننەت دەزانن، هەندێکیشیان ڕایان وایە کە ئەو (الله اکبر) کردنە هەروەك چۆن صیغەکە دیاری‌کراو نیە و هەرچۆن بێ هەر دروستە، کاتێکی دیاری‌کراویشی نیە وەك دوای نوێژە فەڕزەکان وەك زۆربەیان دەڵێن و دوای نوێژە سوننەتەکانیش وەك شافیعی‌یەکان دەڵێن[٣٤٨]، بەڵکو هەم دوای نوێژەکان بە فەڕز و سوونەتەوە و هەم

---

[٣٤٥] بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ ص ٣٥٢ ، ٣٥٣.

[٣٤٦] سەرچاوەی پێشوو.

[٣٤٧] بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٤٥ ، ٤٦.

[٣٤٨] (نووي) گوتوویەتی: (قد ذَكَرْنَا أَنَّ مَذْهَبَنَا اسْتِحْبَابُهُ - أَيِ التكبيرِ خَلْفَ النَّوَافِلِ -، و قال: ابو حنیفة و مالك و الثوري [illegible] و اسحاق [illegible] (المجموع) [illegible] ٤.

کاتەکانی دیکەش هەر سوونەتە و دروشمێکی ئیسلامە[٣٤٩]، واش پێدەچی ئەم ڕایەی دوایی تەواوتر بێ، هەرچەندە بێگومان لەپاش نوێژەکان زیکری خواکردن گونجاوترە، بەڵام مادام دەقێك نەبێ تایبەتی بکات بەو کاتانەوە وا باشترە هەر بە موتڵەقی بهێڵرێتەوە.

## چوار: نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران (صلاة الكسوف والخسوف):

تێکڕای زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە سوننەتە لە کاتی گیرانی خۆر و مانگ دا دوو ڕکات نوێژ بکرێن، دیارە هۆی خۆرگیرانیش ئەوەیە کە مانگ دەکەوێتە نێوان ڕۆژ و زەوییەوە و بە سێبەری مانگ تیشك و ڕۆشنایی ڕۆژ لە زەوی دەگرێتەوە و تاریك دادێ، وە مانگ گیرانیش لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە دەکەوێتە بەر سێبەری زەوی و زەوی تیشك و ڕووناکی ڕۆژی لێدەگرێتەوە و لەئەنجامی ئەوەدا مانگ تاریك دەبێ و شەوق و ڕووناکی نامێنێ.

چۆنیەتی نوێژی خۆرگیران و مانگ گیرانیش لە دەقەکانی سوننەت دا زۆر جوان ڕوون کراوەتەوە کە ئێمە چەند وێنەیەکیان لێدێنینەوە:

*(عن عائشة رضي الله عنها أَن الشَّمْسَ خَسَفَتْ علىٰ عَهْدِ رَسولِ الله ﷺ فَبَعَثَ مُنادياً يُنادي: الصَّلاةَ جامِعَةً، فاجْتمعوا و تَقَدَّم فَكَبَّرَ و صلّى أَربَعَ رَكْعاتٍ في رَكْعَتَيْنِ وأَرْبَعِ سَجْداتٍ) متفق عليه: واتە: لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژگیرا ئەویش بانگ وێژێکی نارد کە بانگ بکات (الصلاة جامعة – نوێژی بەکۆمەڵ) جا خەڵك هاتن و کۆبوونەوە و ئەویش پێش کەوت و (الله كبر) ی – نوێژدابەستنی – کردو دوو ڕکاتی کردن کە چوار ڕکووع و چوار کڕنووشیان تێدابوون.

*هەروەها عائیشە خوا لێی ڕازیبێ هەر لەوبارەوە ئەم دەقەشی لێوە نەقڵ کراوە – لەلایەن (بخاري و مسلم و مالك و أحمد و أبوداود و نسائي و ترمذي و ابن ماجة)[٣٥٠] ەوە کە ڕوونتر چۆنیەتی نوێژی خۆرگیرانمان بۆدەخاتەڕوو، گوتوویەتی:

---

[٣٤٩] بڕوانە: (الروضة الندية شرح الدرر البيهية) ج١ ص ٢٢٠.

[٣٥٠] بڕوانە: (العُدَّة على إحكام الأَحْكام شرح العمدة) ج٢ ص ١٥

{لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژگیرا و پێغەمبەری خـوا ﷺ نوێـژی بـە خـەڵکی کرد، - دوای نوێژ دابەستن - بـەپێوە زۆر مایـەوە ئینجـا ڕکووعـی بـرد و ڕکووعەکـەی درێژکردەوە، پاشان هەستایەوە و زۆرمایەوە، بـەڵام لـە بەپێوەمانـەوەی یەکـەمجار کـەمتر بوو، پاشان ڕکووعی برد و لە ڕکووع دا مایەوە، بەڵام لە ڕکووعـی یەکـەم کـەمتر بـوو، ئینجا کڕنووشی برد و سەجدەکەی درێژکردەوە - واتە هـەردووک سـەجدەکان -، پاشـان ڕکاتی یەکەمی چۆن کردبـوو بـەوجۆرەش هـی دووەمـی کـرد، دوایـی لـە نوێـژ بـۆوە و ڕۆژیش دەرکەوتبۆوە، ئینجا وتاری بۆ خەڵکەکە دا، ستایشی خوای کرد و مەدحی کـرد پاشان فـەرمووی: بێگومـان ڕۆژ و مـانگ دوو نیشـانەن لـە نیشـانەکانی خوا، نـە بـۆ مردنی کەس دەگیرێن و نە بۆ ژیانیی، جا هەرکات شتی واتان بینی لە خـوا بپاڕێنـەوە و (الله أكبر) بکەن، وە نوێژ بکەن و مـاڵ ببەخشن..}

*(عن الحَسَن البَصْرِي قال: خَسَفَ القَمَرُ، وابن عباس أَميرٌ علىٰ البَصْرةِ. فَخَرَج فصلّـى بِنـا رَكعَتينِ في كُلِّ رَكْعةٍ رَكعَتينِ، ثم رَكِبَ و قال: إنّمـا صَلّيـتُ كمـا رَأيـتُ النـبيَّ ﷺ يُصَلّـي) رواه الشافعي في مسنده[٣٥١].

واتە: لە کاتێکدا کە (ابن عباس) خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ ئەمیری بەسرا بوو مانگ گیرا، جا - عەبدوڵلا - چووە دەرێ و دوو ڕکات نوێژی پێکردین کە هەر ڕکاتێك دوو ڕکووعی تێدابوون، پاشـان سـواربوو و گوتـی: بێگومـان تـەنیا بـەو جـۆرەی کـە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی - مانگ گیرانی - پێکردووین، نوێژم پێکردن.



[٣٥١] بڕوانە: (فقه ال[illegible] ١/ص ٢٣٤.

# چەند ئاگادارییەك دەربارەی نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران

١)زۆربەی زانایان دەڵێن نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران دوو ڕکاتە و لە هەر ڕکاتێك دوو ڕکووع و دووجار فاتیحە خوێندن و قورئانی دوای فاتیحە هەیە و هەر ڕکاتێك دوو سەجدەی تێدان، ئەمە ڕای (شافعي و مالك و أحمد و اسحاق و ابو ثور و داود) ە، بەڵام (نخعي و ثوري و ابو حنيفة) دەڵێن: دوو ڕکاتە وەك نوێژی جومعە و نوێژی بەیانی[٣٥٢]. شایانی باسیشە کە لە دەقەکانی سوننەت دا زیاتر لە دوو ڕکووعیش لە ڕکاتێك داهاتوە واتە: سێ ڕکووع[٣٥٣]، چوار[٣٥٤] ڕکووع، هەتا پێنج[٣٥٥] ڕکووع..

٢)هەرچەندە سوننەتە نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران بەکۆمەڵ بکرێ، بەڵام بەکۆمەڵ کرانی مەرج نیە و دەکرێ بەتەنیاش بکرێ[٣٥٦]، وە هەرچەندە کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت کردوویەتی، بەڵام لە غەیری مزگەوتیش دا دروستە بکرێ[٣٥٧].

٣)لە دەقەکانی سوننەتدا هەرکام لە دەنگ بەرزکردنەوە و دەنگ بەرز نەکردنەوەش لە نوێژی خۆر و مانگ گیران دا هاتوون، بەڵام دەقەکانی دەنگ بەرزکردنەوە زیاتر و بەهێزتریشن[٣٥٨]، بۆیە زۆربەی زانایانیش ئەوەیان هەڵبژاردووەو، هەشیانە هەردووك لای بە دروست داناون وەك[٣٥٩] (طبري) کە پێم وایە ڕایەکی پەسندو چاکە.

٤)سەرجەم زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە وتاردان (خطبة) مەرجی کردنی نوێژی خۆر و مانگ گیران نیە، بەڵام بەشێکیان دەڵێن سوونەتە وتاریشی لەگەڵ بێت و لەدوای نوێژەکە بدرێ و بەشێکیش دەڵێن سوننەت نیەو، ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا دوای نوێژەکە وتاری داوە بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژی گومان و بانگەشەیەکی هەڵەبووە، ئەویش ئەوەبووە کە لەو ڕۆژەدا (ابراهيم) کوڕی پێغەمبەر ﷺ

---

[٣٥٢] بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٦٤.

[٣٥٣] وەك (مسلم) لە (جابر) ی گێڕاوەتەوە.

[٣٥٤] وەك (مسلم) لە (ابن عباس) ی گێڕاوتەوە.

[٣٥٥] وەك (أبو داود) لە (ابي بن كعب) گێڕاویەتەوە بەڵام بەهێزنیە.

[٣٥٦] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٢٤.

[٣٥٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ ص ٤٠٧.

[٣٥٨] بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٥٦ ، وە : (نيل الأوطار) ج٤ ص ٢٢.

[٣٥٩] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ ص ٢٢.

مردوه و هەندێك كەس وایان زانیوه لەبەرمردنی ئەو ڕۆژ گیراوه! وەك لە (صحیح البخاري) دا هاتوه[٣٦٠].

واش پێدەچێ ڕای دووەم ڕاستتر بێت[٣٦١] و هەرچۆنیش بێ هیچ بەڵگەیەك لەسەر (دوو وتار) نیه، وەك شافیعی‌یەكان دەڵێن[٣٦٢].

٥) هەرچەنده لە دەقەكانی سوننەتدا هیچ سوورەتێكی تایبەتی دیاری‌نەكراوه كه لە نوێژەكانی ڕۆژگیران و مانگ گیران دا بخوێنرێ. بەڵام لە زۆربەی دەقەكان دا ڕاگەیەنراوه كه پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری قورئان تێدا خوێندوون بەئەندازەیەك كه لە هیچ نوێژێكی دیكەدا هێندەی نەخوێندوه، ئنجا بێگومان ڕكووع و سەجدەكانیش هەروا بوون و لەقەدەر زۆر وەستانەكان بوون، بۆ وێنه (بخاري و مسلم) له (ابو موسى خوا لێی ڕازی‌بێ گێڕاویانەتەوه كە دەربارەی نوێژی ڕۆژگیرانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: (حتى أَتَى المَسْجِدَ، فقامَ، فَصلَّى بِأطْوَلِ قيامٍ و رُكوعٍ و سُجودٍ، ما رَأيْتُهُ يَفعلُه في صَلاتِهِ قَطُّ..) واته: هەتا - پێغەمبەر ﷺ - هاته مزگەوت، جا هەستا نوێژی كرد بەدرێژترین ڕاوەستان - قورئان خوێندن - و ڕكووع و سەجده، كه هەرگیز نەم دیبوو لە نوێژەكەی‌دا ئاوا بكات.

٦)سەرجەم زانایان لەبەر تیشكی دەقه ڕاست و بێ پێچ و پەنایەكانی سوننەت دا یەكدەنگ بوون كە سوننەته لە كاتی خۆرگیران و مانگ گیران دا مسوڵمانان سەرگەرمی زیكری خواو پاڕانەوه و نوێژ و خێركردن بن، چونكه بێگومان لەكاتی بەڵاو گرفتاری‌یەكان دا دڵ و دەروونی ئینسان نەرمی و ئامادەیی زیاتر دەبێ بۆ بەندایەتی ولەخوا نزیك كەوتنەوه، وه گەڕانەوه لای خواو زیكر و طاعەتیش مایەی داباراینی ڕەحمەتی خواو لاچوونی بەڵاو گرفتاری‌یەكانە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(فاذا رَأَيْتُمْ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ فافْزَعوا الى ذِكْرِ اللهِ و دُعائِهِ و اَسْتِغْفارِهِ) رواه البخاري و مسلم عن ابي موسى الأشعري رضى الله عنه، واته: جا هەركاتێك شتێكتان لەو بابەته بینی هانا بۆ لای یادی خواو لێ‌پاڕانەوەی و داوای لێبوردن لێ‌كردنی بەرن.

---

[٣٦٠] بڕوانه: (العدة على احكام الأحكام شرح العمدة) ج٣ ص ١١.

[٣٦١] كەڕای زۆربەی زانایانه وەك : (مالك و ابو حنيفه و ابو يوسف و احمد) بڕوانه: (المجموع) ج٥ ص ٥٧.

[٣٦٢] بەڵكو ئەوپەڕی ئەوه لەو دەقانه وەردەگیرێ كه پێغەمبەر ﷺ وتاری‌داوه، كه وتارێكی داوەو وەك (مالیكی‌یەكان) دەڵێن. ئەویش ئامۆژگاری مسوڵمانان و ستایشی خوایه، بڕوانه (الفقه الأسلامي) ج٢ ص ٤٠٦.

ئنجا شایانی باسە کە ئەم پەنا بۆ زیکرو دووعاو طاعەت بردنە یاسایەکی گشتییەو تایبەت نیە بە کاتی خۆر و مانگ گیرانەوە، بەڵکو لە کاتی ڕوودانی هەر بەڵاو کێشە و گرفتارییەك دا هەروایە.

## پێنج: نوێژی داواکردنی باران بارین (صَلاةُ الأِسْتِسْقاء):

تێکڕای زانایان بێجگە لە (ابو حنیفە) نوێژی داواکردنی باران بارین لەخوای پەروەردگار بە سوننەت دەزانن، نوێژی ناوبراویش کتومت وەك نوێژی دوو جەژنەکان وایە لە هەمووشتێکیدا ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی نوێژی ناوبراوەوە:

*(عن عبدالله بن زيد بن عاصم المازني رضي الله عنه قال: خَرَجَ النبيُّ ﷺ يَسْتَسْقي فَتَوجَّهَ الىٰ القِبْلَةِ يَدْعو، وحَوَّلَ رِداءَهُ، ثم صَلّىٰ رَكْعَتَيْنِ جَهَر فيهما بالقِراءَة) متفق عيله[٣٦٣]، ولكن (مسلم) لم يذكر الجهر بالقراءة.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرێ داوای باران بارینی - لە خوا - کرد، ڕووی کردە قیبلەو پاڕایەوە، وە پۆشاکەکەی ئاوەژوو کردەوە - یان سەرەو بنی کرد -، پاشان دوو ڕکاتی کردن کە بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا خوێندن.

*(عن ابي هريرة رضي اله عنه قال: خرج نبي الله ﷺ يوماً يستسقي فصلّى بنا رَكْعَتَيْنِ بِلا أذانٍ ولا إقامَةٍ ثم خَطَبَنا و دَعا اللهَ عزَّ و جلَّ و حَوَّلَ وَجْهَهُ نَحْوَ القِبْلَةِ رافِعاً يَدَيْهِ ثم قَلَّبَ رِداءَهُ فَجَعَلَ الأَيْمَنَ علىٰ الأَيْسَرِ والأَيْسَرَ علىٰ الأَيْمَنِ) رواه احمد وابن ماجة.

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو بۆ داوای باران بارین کردن جا دوو ڕکات نوێژی پێکردین بەبێ بانگ و قامەت، پاشان وتاری بۆدایین و لەخوای زاڵ و پایەدار پاڕایەوە، وە ڕووی‌کردە قیبلە - لە کاتی پاڕانەوەدا - هەردووك دەستی بەرزکردبوونەوە دوایی پۆشاکەکەی[٣٦٤] خۆی هەڵگێڕایەوە و لای ڕاستەی بردە لای چەپی و لای چەپی بردە لای ڕاستی خۆی.

---

[٣٦٣] بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٢٠٧ : ژمارە ١٠٢٤، وە (نيل الأوطار) ج٤ ص ٢٩ شایانی باسە کە خاوەنی (العدة على احكام الأحكام شرح العمدة) لە بەرگی (٣) لە لاپەڕە (٢٨) دا و لە پەراوێزی ژمارە (٣) دا گوتوویەتی کە ڕستەی: (جهر فيهما بالقراءة) لە (صحيح البخاري) دا نیە و تەنیا لە (صحيح مسلم) دایە!! بەڵام لە ڕاستیدا بەپێچەوانەوەیە و هەرکام لە (نووي) لە (المجموع) ج٥ ص ٦٧ و، (شوكاني) لە (نيل الأوطار) ج٤ ص ٢٩ ڕاستەکەیان گوتوە.

[٣٦٤] بۆیە (رداء) م بە پۆشاك تەرجەمەکردوە کە (عەبا) ی پێ‌دەڵێن تاکو لە (عەبا) ی ئافرەتان جیابێتەوە.

*(عن ابن عباس رضي الله عنها و سُئل عن الصَّلاة في الأستسْقاء؟ فقال: خَرَجَ رَسولُ الله ﷺ مُتَواضِعاً مُتَبَذِّلاً مُتَخَشِّعاً مُتَضَرِّعاً فصلَّى رَكْعَتَيْن كما يُصَلّي في العِيـدِ لَمْ يَخْطُـبْ خُطبَتكُـمْ هـٰذِه) رواه أحمد والنسائي وابن ماجة، و رواه أبو داود و الترمذي برواية اخرى و صححه.

واته: پرسیار له (ابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ کرا دەربارەی نوێژی باران بارین داواکردن؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخۆ بە کەمگرتن و بەرگێکی ساکار و گەردن کەچی و لالانەوەوە چووە دەرێ و دوو ڕکاتی کردن وەك چۆن لەجەژن دا نوێژی دەکرد، بەڵام وەك وتاری ئێستاتان وتاری نەدا. (وادیارە مەبەستی ئەوەیە کە وتاری پێغەمبەر ﷺ زیاتر پاڕانەوە و زیکر و ستایشی خوا و داوای لێبوردن کردن و لالانەوە بووە).

## چەند ئاگاداری‌یەك دەربارەی نوێژی داواکردنی باران بارین

١)لە فەرموودەکان دا وادەردەکەوێ کە وتاری گەڵ نوێژی داواکردنی باران بارین یەك وتارە نەك دووان و وتارەکەش نێواخن دەکرێ بە پاڕانەوە و لالانەوە لەبەرخواو تۆبەکردن و پەشێمان بوونەوە و داوای لێبوردن لەخوا کردن و ... هتد[٢٦٥]، وە لە ڕاستی‌دا وێڕای پشکنینی زۆر هیچ بەڵگە و دەقێکی سوننەتم نەبینی بۆ پشتگیری ڕای شافیعی خوا لێی‌خۆش بێ کە لە کتێبی (الأم) دا گوتوویەتی[٢٦٦]: ( و يَخْطُبُ الامامُ في الأستِسْقاءِ خُطْبَتَيْنِ، كما يَخْطُبُ في صَلاةِ العيدَيْن..)

٢)وتاری نوێژی داوای باران بارین کردن وا باشترە کە پاش نوێژەکەی بێت، بەڵام ئەگەر لە پێشیشیەوە بێ هەر دروستە و هەندێك دەقی سوننەتی لەسەرن، یەکێکیان ئەو فەرموودەیەیە کە (عبدالله بن زید) هێناویەتی و (بخاري و مسلم) لێیان گێڕاوەتەوە و پێشتر خستمانە ڕوو.

٣)پاڕانەوە و داوای باران بارین لەخواکردن بە مەرج نەگیراوە کە حەتمەن نوێژی تایبەتی لەگەڵ بێت، بەڵکو دەگونجێ لەکاتی نوێژی جومعەش دا بێت[٢٦٧]، یان هەرکاتێکی دیکەی گونجاو[٢٦٨].

---

[٢٦٥] خاوەنی : (الروضة الندية) لەوبارەوە گوتوویەتی: (روح هذه الصلاة وأساسُها و عمادُها الذي لا تقومُ بِدونِهِ هو الاستِكْثارُ مِنَ الأستِغفار قَبْلَها و بَعْدَها. و إخْلاصِ التوبةِ مِنَ الذُنوبِ..) ج١ ص ٢٣٩

[٢٦٦] بڕوانە: (المجموع) ج٥ ص ٨٠.

[٢٦٧] وەك: (بخاري و مسلم) [illegible] (أنس بن مالك) [illegible] بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٢٠١.

٤)سوننەتە نوێژی ناوبراو لە بیابان و دەشت بکرێ[٣٦٩]، مەگەر لە مەککە و مەدینە و قودس کە نوێژ لە مزگەوتی حەرام و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و مزگەوتی ئەقصا بەچەندان پلە خێرو پاداشتیان زیاترە، بۆ کاتیش تایبەت نیە بە کاتێکی دیاریکراوەوە وەك کاتی نوێژی جومعە و جەژنەکان و خۆر و مانگ گیران، بەڵکو - بێجگە لەو کاتانەی کە نوێژیان تێدا قەدەغەکراوە - هەرکاتێك بێ هەر گونجاوە[٣٧٠].

٥)سوننەتە ئیمام[٣٧١] زۆر بە زەلیلانەو گەردن کەچانە هەردووك دەستەکانی بەرزبکاتەوە[٣٧٢] و بە دڵ و بە کوڵ لە خوای بەبەزەیی بپارێتەوە، بۆ وێنە بڵێ:- بەلاّم پاش سوپاس و ستایشی خوا کردن و داوای لێبوردن لێکردن و صەلاّت و سەلام ناردن بۆسەر پێغەمبەر ﷺ (اَللّهم اَسْقِنا غَيْثاً مُغِيْثاً مَرِيئاً مُرِيْعاً طَبَقاً غَدَقاً عاجِلاً غَيْرَ رائِثٍ) رواه ابن ماجة و غيره. واتە: ئەی خوایە! ئاودێرمان بکە بە بارانێکی قوتارکەر، شیرین و زوڵاڵ و لەوەڕ ڕوێن، گشتگیر و بەخورزەم و دڵۆپە زل، خێرا بێت نەك بە کاوەخۆو سست.

ئاشکراشە کە نە ئەم دووعایە و نە هیچ دووعایەکی دیکەش بەمەرج نەگیراوە و هەرچۆن مەبەستی پێبێتەدی و لە سنووری شەرع دەرنەچێ هەر دروست و ڕەوایە.

## شەش: نوێژی چێشتەنگاو (صلاة الضحى)

زۆربەی هەرەزۆری زانایان نوێژی چێشتەنگاویش بە یەکێك لە نوێژە سوننەتە مەزنەکان دادەنێن، ئەویش لای کەمی دوو ڕکاتە و، هەشتیش، هەندێکیش دەڵێن دوازدەش لای زۆرەکەیەتی، کاتەکەیشی پاش ڕۆژهەڵهاتن و بەرزبوونەوەیەتی بە ئەندازەی ڕمبێك هەتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ، بەلاّم چاکترین کاتی ئەو دەمەیە کە بە تیشکی خۆر دنیا گەرم دەبێ، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت دەربارەی گەورەیی نوێژی چێشتەنگاو و خێرو پاداشتی و ژمارەی ڕکاتەکانی و کاتی کردنی:

---

[٣٦٨] وەك (ابن ماجة) لە (ابن عباس) و (ابو داود) لە (جابر) گێڕاویانەتەوە. (نيل الأوطار) ج٤ ص ٣٥ ، ٣٦.

[٣٦٩] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ ص ٤١٦.

[٣٧٠] بڕوانە: (الفقه الاسلامي وادلته) ج٢ ص ٤١٦.

[٣٧١] هەروەها (مأموم) ەکانیش، وەك لە (صحيح البخاري) دا هاتوە: فَرَفَعَ رسولُ الله ﷺ يَدَيْهِ يَدْعُو ، و رَفَعَ النّاسُ أيْدِيَهُمْ مَعَهُ يَدْعُونَ..) بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٢١٠.

[٣٧٢] (انس) گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی بەرزکردنەوە و هەتا سپێتی بن هەنگڵیم بینی، بڕوانە: (فتح الباري) ج٣ ص ٢١٠.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: أوصاني خليلي بثلاث: بصيام ثلاثة أيام في كل شهر و ركعتي الضحى وأن أوتر قبل أن أنام) متفق عليه. واته: خۆشەویستەکەم سێ شتی پێ ڕاسپاردووم - کە ئەنجامیان بدەم -: لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوبم، وە دوو ڕکاتی چێشتەنگاو بکەم، وە کە وەتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

*(عن ابي ذر رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يصبح على كل سلامى من أحدكم صدقة فكل تسبيحة صدقة، وكل تحميدة صدقة، و كل تهليلة صدقة، و كل تكبيرة صدقة، وأمر بالمعروف صدقة، و نهي عن المنكر صدقة، و يجزئ من ذلك ركعتان يركعهما من الضحى) رواه احمد و مسلم و ابوداود. واته: لەسەر هەر جومگەیەکی هەرکامێکتان پێویستە لە ڕۆژێدا چاکەیەك بکات، جا هەر (سبحان الله) گوتنێك چاکەیەکە، وە هەر (الحمد لله) گوتنێك چاکەیەکە وە هەر (لا الـه الا الله) گوتنێك چاکەیەکە وەهەر (الله اکبر) کردنێك چاکەیەکە، وە فەرمان بە چاکە چاکەیەکە، وە ڕێگری لە خراپە چاکەیەکە، وە دوو ڕکات نوێژ کە کاتی چێشتەنگاو بیانکات وەبری ئەمانە هەمووی دەکەوێ.

*(عن زيد بن أرقم رضي الله عنه قال: خرج النبي ﷺ على أهل قباء وهم يصلون الضحى فقال: صلاة الأوابين إذا رمضت الفصال من الضحى) رواه احمد و مسلم والترمذي ،واته: پێغەمبەر ﷺ بەلای خەڵکی قوبادا ڕەت بوو کە نوێژی چێشتەنگاویان دەکرد فەرمووی: نوێژی بۆ لای خوا گەڕاوان کاتێکە کە بەچکە حوشتر بە تینی گەرمای ڕۆژ داغ ببێ.

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان النبي ﷺ يصلي الضحى أربع ركعات و يزيد ماشاء الله) رواه احمد و مسلم و ابن ماجة. واته: پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی بە چوار ڕکات دەکرد و جاری واش هەبوو - ئەوەندەی خوا بیەوێ لێ ی زیاد دەکرد.

*(عن أم هانيء أنه لما كان عام الفتح أتت رسول الله ﷺ و هو بأعلى مكة فقام رسول الله ﷺ الى غسله فسترت عليه فاطمة، ثم أخذ ثوبه فالتحف به، ثم صلى ثماني ركعات سبحة الضحى) متفق عليه. واته: (أم هانيء) دەگێڕێتەوە کە ساڵی ئازادکردنی مەککە لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژووروی مەککە بووە چۆتە خزمەتی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساوە بۆ خۆشۆردن، فاطمە - ی کچی - خوالێی ڕازی بێ - بە

پەردەیەك دایپۆشیوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ بەرگەكەی خۆی وەرگرتوە و لەخۆیەوە پێچاوە، دوایی هەشت ڕكات نوێژی سوونەتی چێشتەنگاوی كردوە.

*خوێنەری بەڕێز!* وەك لەو فەرموودانەوە كە ڕابردن دەردەكەوێ ژمارەی ڕكاتەكانی نوێژی چێشتەنگاو لە دوو ڕكاتەوەیە هەتا هەشت، جا هەرچەندە هەندێك لە زانایان – وەك لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان كرد – دەڵێن لای زۆرەكەی دوازدە [٢٧٣] ڕكاتە و بگرە (طبري)[٢٧٤] ڕای وایە كە لای زۆرەكەی سنوورێكی دیاریكراوی نییە، بەڵام بێگومان ڕای ڕاست و ڕەواو بێگرێو گۆڵ هەرئەوەیە كە زۆربەی زانایان لەسەری ڕێك كەوتوون چونكە دەقە ڕاست و بێ پێچ و پەنایەكانی سوونەت وا پێویست دەكەن.

## حەوت: نوێژی سڵاوكردن لە مزگەوت (تَحِيَّةُ المَسْجِد)

یەكی دیكە لە نوێژە سوونەتەكان ئەوەیە كە ئینسان هەركاتێك چووە مزگەوت بەرلەوەی دابنیشێ دوو ڕكات بكات، جا زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەو دوو ڕكاتە، كە ناویان لێناوە (تحية المسجد) – بە سوونەت دەزانن، بەڵام ظاهرییەكان بە فەرزی دەزانن، دیارە هەقیش بە زۆربەو جەماوەری زانایانە و زۆر چاكیش وەڵامی ئەو بەڵگانەیان داوەتەوە كە ظاهرییەكان هێناویاننەوە[٢٧٥].

دەقی سوونەتیش لەو بارەوە زۆرن كە ئەمە یەكێكیانە:

*(عن أبي قتادة رضي الله عنه قال: قال رسولُ الله ﷺ: اذا دَخَلَ أَحَدُكُمْ المَسْجِدَ فلا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ) رواه اصحاب الكتب الستة. واتە: هەركات یەكێكتان چووە مزگەوت با هەتا دوو ڕكات نوێژ نەكات دانەنیشێ.

---

[٢٧٣] عن أبي الدرداء مرفوعاً (... و مَنْ صَلَّى اثْنَتي عَشْرَةَ بَنَىٰ اللهُ لَه بَيْتاً في الجَنَّةِ) رواه الطبراني وهو ضعيف كما قال الحافظ والنووي.

[٢٧٤] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٧٦.

[٢٧٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٨٤.

## دوو ئاگاداری:

١)زانایان لەو بارەوە کە ئایا ئینسان هەر کاتێك چووە ژووری مزگەت - تەنانەت ئەو کاتانەش کە نوێژکردنیان تێدا ناپەسەندە - هەر سوننەتە ئەو نوێژە بکات یان نا؟ رایان جیاوازە هەندێکیان وەك شافیعییەکان دەڵێن هەر سوننەتە بکرێ، بەڵام هەندێکی دیکەیان وەك (ابو حنیفة، اوزاعي، لَیْث) دەڵێن لەوکاتانەدا ناپەسەندە[٢٧٦]، بەڵام پێم وایە بە سەرنج دانی سەرجەم ئەو دەقانەی لەوبارەوە هاتوون، بۆ وێنە[٢٧٧]: ئەو هاوەڵەی کە لە دەمی وتاردانی جومعەدا هات و یەکسەر دانیشت و پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد کە هەستێ و دوو رکات بکات! لەگەڵ ئەوەش دا کە گوێگرتن بۆ وتاری جومعە فەرزە، بەڵێ بە سەرنج دانی تێکرای دەقەکانی سوننەت دەردەکەوێ کە رای یەکەم بەهێزتر و بەڵگەدارترە،[٢٧٨] وە وەك زانایان گوتوویانە نەهی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژکردن لەو کاتانەدا کە دیاریکردوون تایبەتە بەو نوێژەوە کە هۆیەکی تایبەتی نەبێ و بە زاراوەی زانایان (ذاتُ السَّبَبْ) نەبێ[٢٧٩].

٢) بەرای تێکرا یان زۆربەی هەرەزۆری زانایان لە چەند حاڵەتێك دا نوێژی سڵاوی مزگەوت ناکرێ:

*ا-لە کاتی چوونە مزگەوتی حەرام بۆ تەواف کردن[٢٨٠]، چونکە تەوافەکە دەبێتە (تحیة المسجد).*

*ب-لە پێش نوێژی[٢٨١] جەژندا کە پێشتریش باس کرا.*

*ج- لەکاتی قامەت کرانی بۆ نوێژی فەرز و بەرپاکرانیدا[٢٨٢].*

*د- وە بۆ ئیمام لە رۆژی جومعەدا کە سوننەتە لە دەمی بانگ دا بچێ و یەکسەر بچێتە سەر مینبەر و سەلام لە خەڵکەکە بکات،وەك لە باسی نوێژی جومعەدا خستمانە روو.*

---

[٢٧٦] بروانە: (صحیح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص ١٦٣.

[٢٧٧] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەرە.

[٢٧٨] هەمان سەرچاوە، بەرگ و لاپەرە.

[٢٧٩] هەمان سەرچاوە، هەروەها بروانە: (المجموع) ج٤ ص ٥٦.

[٢٨٠] بەڵام ئەگەر بۆ طەواف کردن نەچوو هەر سوونەتە بیکات.

[٢٨١] (.. ولَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا ولا بَعْدَهَا) رواه احمد و ابن ماجة.

[٢٨٢] وەك دواتر باسی دەکەین.

## هەشت: نوێژی دەست نوێژ:

سەرجەم زانایان لەسەر سوننەت بوونی دوو ڕکات نوێژی ڕاستەوخۆ پاش دەست نوێژگرتن یەکدەنگن، چونکە لەو بارەوە دەقی ڕاست و ڕاشکاو (صحیح) زۆرن، بۆ وێنە:

*(عن حُمْرانَ مولىٰ عثمانَ بن عفّان أنه رأىٰ عثمانَ دعا بِوَضُوءٍ فَأَفْرَغَ علىٰ يَدَيْهِ مِنْ إنائِهِ فَغَسَلَهُما ثلاثَ مرّاتٍ، ثم أَدْخَلَ يَمِينَهُ في الوَضُوءِ، ثم تَمَضْمَضَ واسْتَنْشَقَ واسْتَنْثَرَ، ثم غَسَلَ وَجْهَهُ ثلاثاً، ويَدَيْهِ الىٰ المِرْفَقَيْنِ ثَلاثاً، ثم مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثم غَسَلَ كُلَّ رِجْلٍ ثَلاثاً. ثم قال أَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتوضأ نَحْوَ وضُوئي هذا، و قال: مَنْ تَوَضّأَ نَحْوَ وضُوئي هذا، ثم صلّىٰ رَكْعَتَيْنِ لا يُحَدِّثُ فيهما نَفْسَهُ غَفَرَ اللهُ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رواه البخاري و مسلم و غيرهما[٢٨٣].

واتە: حومران کە کۆیلەی ئازادکراوی (عثمان بن عفان) بووە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە عوسمانی بینیوە داوای ئاوی دەست نوێژی کردوە، جا لە قاپی ئاوەکەی ئاوی بەهەردووك دەستی خۆیدا کردووە و سێ جاران شۆردوونی، پاشان دەستی ڕاستی خستۆتە نێو ئاوەکەوە، ئینجا لە زاری وەرداوە و ئاوی لە لووتی وەرداوەو لووتی پاك کردۆتەوە، پاشان دەم و چاوی سێ‌جار شۆریوە، هەروەها هەردووك دەستی هەتا هەردووك ئانیشکی، ئنجا دەستی تەڕی بەسەریدا هێناوە، پاشان هەردووك لاقی سێ‌جار شۆردوون، ئەوجار گوتوویەتی: پێغەمبەرم ﷺ دی ئاوا وەك ئەوەی من دەستوێژی گرت، وە فەرمووی: هەرکەسێك وەك ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرت، دوایی دوو ڕکات نوێژی کرد کە هیچ دالغە و خولیای تێدا بەدڵ دا نەیەت، خوا لە گوناهی پێشووی دەبوورێ.

*(عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: قال رسولُ الله ﷺ: ما أَحَدٌ يَتوضأ فَيُحْسِنُ الوُضُوءَ و يُصَلّي رَكْعَتَيْنِ يُقْبِلُ بِقَلْبِهِ ووجهِهِ عَلَيْهِما إلّا وَجَبَتْ لَهُ الجَنّةُ) رواه مسلم وابو داود و ابن ماجة و ابن خزيمة في صحيحه، واتە: هەرکەسێك دەست نوێژ بگرێ و دەست نوێژەکەی چاك بگرێ وە دوو ڕکات نوێژ بکات کە دڵ و ڕووی خۆییان بداتێ بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ.

---

[٢٨٣] بۆ زانین: خاوەنی (فقه السنة) ئەو فەرموودەیەی لە بەرگی (١) لاپەڕە (٥٧) دا هێناوە بەڵام تەنیا هەتا (... ثم وجه ثلاثاً) نووسیوەتی کە بێگومان هەڵەیە، وە چەند جیاوازیەکی دیکەش هەیە کە ڕەنگە جیاوازی (روایات) بن، بەڵام بە تەئکید ناوی (حمران) کە (خمران) نووسراوە هەڵەیە، هەرچەندە ڕەنگە هەڵەی چاپ بێت.

## نۆ: نوێژی (استخارة)[٣٨٤]

ئەمیش تێکڕای زانایان لەسەری ڕێک کەوتوون[٣٨٥] کە یەکێکە لە نوێژە سوننەتەکان، بۆ کەسێك کە بیەوێ کارێك ئەنجام بدات بەڵام دڵنیا نەبێ کە خێرو بەرژەوەندی دنیاو قیامەتی لە کردنی ئەو کارەدا هەیە یان بەپێچەوانەوە نەکردنی چاکە!

لەبارەی ئەو نوێژەشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە کەزانایان کردوویانە بەبەڵگەی شەرعی بوون و سوننەت بوونی نوێژ و دووعای ئیستیخارە:

*(عن جابر رضي الله عنه: قال: كانَ رسولُ الله ﷺ يُعَلِّمُنا الأسْتِخارَةَ في الأُمورِ كُلِّها كَما يُعَلِّمُنا السورَةَ مِنَ القرآنِ يَقولُ: اذا هَمَّ أَحَدُكُم بالأَمْرِ فلْيركَعْ رَكعتين منْ غيرِ الفريضةِ ثم ليقل: أَللهم إني أَسْتَخيرُكَ بعلمِكَ، و أَسْتَقدِرُكَ بقُدْرتِكَ، و أَسْألُكَ منْ فَضْلِكَ العَظيْمِ، فَانَّكَ تَقدِرُ ولا أَقْدِرُ، و تَعْلَمُ ولا أَعْلَمُ، وأَنْتَ عَلامُ الغيوبِ، أَللهم انْ كُنْتَ تعلَمُ أَنَّ هَذا الأَمرَ خَيرٌ لي في ديني و مَعاشي و عاقبَةِ أَمْري – أو قال: عاجِلِ أَمْري و آجِلِه – فَاقْدُرْهُ لي و يَسِّرْهُ لي، ثم بارِكْ لي فيه، أَللهمَّ وانْ كُنْتَ تعلم أَنَّ هذا الأَمْرَ شرٌ لي في ديني و مَعاشي و عاقبَةِ أَمْري – أو قال: عاجِلِ أَمري و آجِله – فاصْرِفْني عَنهُ واصْرِفْهُ عَنّي، واقْدرْ لِيَ الخَيْرَ حَيْثُ كانَ ثمَّ أَرْضِني بِهِ، و يُسَمِّي حاجَتَهُ) رواه البخاري و أصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن سوورەتێکی قورئانی فێردەکردین ئاواش ئیستیخارەی لە هەموو کاروبارێکمان دا فێر دەکردین، دەیفەرموو:

هەرکات یەکێکتان ویستی کارێك بکات (دیارە مەبەست کارێکە کە قازانج و زیانی دیار نەبێ و نەزانرێ سەرەنجامی چۆن دەبێ) با دوو ڕکات جیا لە نوێژی فەرز بکات، پاشان بڵێ: ئەی خوایە: بە زانیاری خۆت داوای چاکە – یان هەڵبژاردن – ت لێدەکەم، وە بە دەستەڵاتی خۆت داوای توانات لێدەکەم، وە لە بەخششی گەورەت داوات لێدەکەم، چونکە بێگومان تۆ دەتوانی و من ناتوانم، وە دەزانی و من نازانم، هەرتۆی زانای پەنهانییەکان!

ئەی خوایە! ئەگەر دەزانی ئەم کارە (لێرەدا ناوی کارەکەی دێنێ) بۆ دینم و ژینم و سەرەنجامی کاروبارەم یان گوتی: بۆ دنیاو دواڕۆژم خێرو قازانجی تێدایە توانای

---

[٣٨٤] وشەی (استخارة) ناوە بە مانای داواکردنی خێرو قازانج لە شتێك دا، بڕوانە : (المعجم الوسيط) ج١ ص ٢٦٤، وە دەشگونجێ بە مانای داوکردنی بۆ هەڵبژاردن بێ، واتە: داوا لە خواکردن کە چی چاکە بۆی هەڵبژێرێ، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٨٩.

[٣٨٥] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٥٨، وە : (نيل الأوطار) ج٣ ص٩٠.

کردنیم بدەیە و بۆم ئاسان بکە، پاشان پیت و پیرۆزم بۆ تێی بخە، وە ئەی خوایە! ئەگەر دەزانی ئەم کارە بۆ دین و ژین و سەرەنجامی کارم یان گوتی: دنیاو دواڕۆژم - بۆم خراپ و زیانبەخشە، ئەوە من لەوو ئەویش لە من لادە، وە خێر و قازانجم لە هەرشتێك دایە تواناداریم بکە لەسەری و پاشان ڕازیشم بکە پێی، وە ناوی کارەکەی دێنێ (لەو شوێنەدا کە دەڵێ: ئەم کارە "هذا الأمر").

## پێنج ئاگاداری:

١)هەرچەندە (نـووي)[٢٨٦] و هـەندێك لـە شـەرعزانانی دیکـەش[٢٨٧] گوتوویانـە: سوننەتە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی ئیتسخارەدا پاش فاتیحە سوورەتی: (قل یا ایها الکـافرون) و لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (قـل هــو الله أحـد) بخوێنـێ، بـەلام هیچ بەلگەیەکیان نەهێناوەتەوە و سوننەت بوونیش بەبێ بەلگەی سوننەت ئیسپات نابێ!

٢)دووبارەکردنەوەی نوێژ و دووعای (استخارة) هەندێك لە زانایان بە پەسندیان زانیوە و ئەم دەقەش بەبەلگە دێننەوە: (اذا هَمَمْتَ بِأَمْرٍ فَاسْتَخِرْهُ رَبَّكَ فِيهِ سَبْعَ مَرَّاتٍ ثُمَّ انْظُرْ الىٰ الَّذي يَسْبِقُ الىٰ قَلْبِكَ فَإِنَّ الخَيْرَ فِيهِ) رواه ابن السني عن انس مرفوعاً، بـەلام فەرموودەناسان تێبینی‌یان لەسەر ئەم دەقە هەیە، بۆ وێنە: (نووي) لەبارەیەوە لـە کتێبی: (الأذكار) دا گوتوویەتی: (إِسْنادُهُ غَريبٌ فيهِ مَنْ لا أَعْرِفُهُم)[٢٨٨].

دیارە دووبارەکردنـەوەش ئەگـەر سـوننەتیش نـەبێ - کـە بـەلای کەمـەوە جـێی گومانە- ئەوە هـەر دروستە، بێگومان بۆ حالەتێکیشە کە ئینسان بە جارێك نەگاتە دلنیایی و بەرچاوڕوونی.

٣)پێویستە بابای ئیستیخارەکەر بەر لە دەست پێکردنی نوێژ و دووعایەکەی دل و دەروونی خۆی لە هەر نیاز و بڕیارێك خالی بکات و ڕاست و ڕەوانانە ڕووی دلی بکاتە خواو چاوەڕوانی ئەوەبێ کە چی دەخاتە دلەوە ئەوە بکاتە بڕیاری هەلبژاردنی خۆی، ئەگەرنا نوێژ و دووعایەکەی بە (ئیستیخارە) دانانرێ.

---

[٢٨٦] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٥٩.

[٢٨٧] بڕوانە (الفقه الأسلامي..) ج٢ ص ٤٨.

[٢٨٨] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٣ ص ٩.

٤)چاوەڕێکردنی خەون (رؤيا) نەك پێویست بگرە سوننەتیش نیە، بەلام بێگومان دروستە، هەرچەندە شوێن کەوتنی سوننەت سەرچاوەی هەموو خێرو بەختەوەرییەکە، دیارە، خەونیش هەرچەندە ئەگەر ڕاست و چاك (صادقة و صالحة) بێ بەشێکە لە چل و شەش بەشی وەحی و پێغەمبەراتی: (الرؤيا الصالحة[٣٨٩] جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وأَربَعينَ جُزءاً مِنَ النبوّةِ) رواه البخاري عن ابي سعيد الخدري ، بەلام بەڕای تێکڕای زانایان بەبەلگەی شەرعی دانانرێ، چونکە وەك چۆن خەونی ڕاست و چاك هەیە، خەونی تێکەل و پێکەل (أَضْغاثُ أَحْلام) یش هەیە، ئەوەندە هەیە خەونی ڕاست و چاك دەگونجێ بکرێتە مایەی بەرچاو ڕوونی زیاتر و دل دامەزران و دلنیایی چاکتر[٣٩٠].

٥)دیارە سوننەتە پێش پاڕانەوە و دووعای (استخارة)ش وەك هەر پاڕانەوەیکی دیکە سوپاس و ستاییشی خوای پەروەردگار و بەخشەرو صەلات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری بەرێز و سەروەر ﷺ هەبن، وەك لە فەرموودەی دیکەدا بە گشتی فەرمانیان پێکراوە کە پێش پاڕانەوە بخرێن، وەك (فضالة بن عبيد) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو ، کە لە کاتی پاڕانەوەدا داوای لەخوا دەکرد بەلام ستاییش و پایە بلندی خوای بەرزی ڕانەگەیاندبوو وە صەلاتی بۆ پێغەمبەر ﷺ نەناردبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە پەلەی کرد، پاشان بەو یان بە غەیری وی فەرموو: (اذا صلّى أحدكُمْ فَلْيَبدأْ بِتَحميدِ رَبِّهِ سُبْحانَهُ والثَّناءِ عَلَيهِ ثُمَّ يُصَلّي على النبيِّ ﷺ ثمَّ يَدْعو بَعْدُ بِما شاءَ) رواه ابو داود والترمذي وقال : حديث صحيح:

واتە: ئەگەر یەکێکتان پاڕایەوە با بە ستایش کردنی پەروەردگاری پاك و بێگەردی و مەدح و سەنای دەست پێبکات، پاشان صەلەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، ئنجا دوایی چی ویست با لە خوا داوای بکات.

## دە: نوێژی گەڕانەوە لە سەفەرێ:

سوننەتە هەرکاتێك ئینسان لە سەفەرێ گەڕایەوە بەرلە هەرشتێك بچێتە مزگەوتێ و دوو ڕکات نوێژ بکات، لەو بارەوە (كعب بن مالك) خوا لێی ڕازیبێ ئەم فەرموودەیەی هێناوە: (كانَ رسولُ الله ﷺ اذا قَدِمَ مِنْ سَفرٍ بَدَأَ بِالمَسْجِدِ فَرَكَعَ فيهِ ركْعَتَينِ) رواه البخاري و مسلم واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە لە سەفەرێك دەهاتەوە سەرەتا دەچووە مزگەوت و دوو ڕکاتی تێدا دەکردن.

---

[٣٨٩] وشەی : (الصادقة) و (الحسنة) هاتوون، ، (فتح الباري) ج١٤ ص ٣٩٤ ، ٣٩٩.

[٣٩٠] بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج١٤ ص ٤١٧ ، ٤١٨، طبعة سنة ١٩٩٥، هەروەها ،بڕوانە: (نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة) د. راجح عبدالحميد الكردي ص ٦٩٢ ، ٦٩٣.

## بازدە: نوێژی ئیحرام و طەواف:

لای زۆربەی زانایان سوننەتە - هەندێکیشیان[٣٩١] بە سوننەتی نازانن کە پێش ئیحرام بەستن بە حەج دوو ڕکات نوێژ بکرێن وەك (بخاري و مسلم) لە (عبدالله بن عمر) خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ گێڕاویانەتەوە: (كَانَ رسولُ الله ﷺ يَرْكَعُ بِذي الحُلَيْفَة رَكْعَتَيْنِ، ثم اذا اسْتَوتْ بِهِ النَاقَةُ قائِمةً عِنْدَ مَسْجِدِ الحُلَيْفَة أَهَلَّ بِهُؤلاءِ الكَلِماتِ)[٣٩٢] وە (نووي) دەربارەی ئەو دوو ڕکاتە گوتوویەتی: (لەم فەرموودەیەدا سوننەت بوونی دوو ڕکاتە لە کاتی ویستنی ئیحرام بەستن دا،وە لە پێش ئیحرام دا دەیانکات و سوننەتیشن، ئەمە ڕای مەزەبی ئێمەو سەرجەم زانایانە...)[٣٩٣] هەروەها زۆربەی زانایان دوو ڕکاتیش دوای طەواف کردنی کەعبە بە سوننەت[٣٩٤] دادەنێن وَ هەندێکیشیان بە فەڕزی دەزانن، چونکە (عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەیویست طەواف بکات لە حەج و عومرەدا، یەکەمجار کە دەگەیشتە مەککە، سێجار بە خێرایی - گورگە لۆقە - طەوافی کەعبەی دەکرد، پاشان چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی طەوافی دەکرد. ئەوجار دوو ڕکاتی دەکردن، پاشان لەنێوان صەفاو مەڕوەدا دەهات و دەچوو)[٣٩٥].

شایانی باسیشە کە (نَوَوي) خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی: سوننەتە لەو دوو ڕکاتەدا دوو سوورەتی: (قُلْ يا أَيُّهاالكافرون) و (قُلْ هو الله أَحَد) بخوێنێ و چەند بەڵگەیەکی لە سوننەت هێناوەتەوە[٣٩٦]، هەروەها گوتوویەتی: کە سوننەتە ئەو دوو ڕکاتە لە پشت مەقامی ئیبراهیمەوە (علیه الصلاة والسلام) بیانکات، کە پێم وایە ئەمە سەرجەم زانایان تێیدا یەکدەنگن و فەرمانی: (واتَّخِذوا مِنْ مَقامِ ابراهيم مُصَلّى) البقرة -١٢٥- ئاماژەی پێکردوە و (بیهقي) یش لە (جابر بن عبدالله) وە فەرموودەیەکی لەو بارەوە گێڕاوەتەوە[٣٩٧].

---

[٣٩١] بڕوانە : (مجموعة الفتاوى) ج ٢٦ ص٦١.

[٣٩٢] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ ص ٢١٨٨. مەبەست لە (أَهَلَّ بِهؤُلاءِ الكلمات) دەنگ هەڵبڕینە بە (لبيك اللهم لبيك. لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك والملك، لا شريك لك).

[٣٩٣] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ج٥ ص ٢١٩٥.

[٣٩٤] بڕوانە: (المجموع) ج٨ ص ٥٥، هەروەها بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ ص ١١٥.

[٣٩٥] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ ص ٢٤٥٠.

[٣٩٦] بڕوانە : (المجموع) ج٨ ص٥٥.

[٣٩٧] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

## دوازدە: نوێژی پێش کوژران

ئەمیش بۆ کەسێك سوننەتە کە لە کاتی تۆڵە (قصاص) یان حەددێکی شەرعی یان هەر حاڵەتێکی دیکەی لەو جۆرەدا دەکوژرێ، ئینجا وەك (بخاري و مسلم) لە (ابو هريرة) خوا لێی ڕازیبێ دەگێڕنەوە، یەکەمین کەسیش کە ئەو سوننەتە باشەی داهێنا (خُبَيْب بن عَدِي) هاوەڵ بوو خوا لێی ڕازیبێ کە کافرەکان گرتبوویان و بردیانە دەرێ بۆ کوشتن لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ ئەویش پێی گوتن: (دَعُوني أُصَلِّـي رَكْعَتَيْن) لێم گەڕێن با دوو ڕکات نوێژ بکەم[٣٩٨].

*خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!* ئەو نوێژانەی لەو دوازدە خاڵەدا خستمانە ڕوو سەرجەم ئەو نوێژە سوننەتانە بوون کە دەقە ڕاستەکانی سوننەت (نصوص السنة الصحيحة) باسیان کردوون، دیارە چەند جۆرە نوێژێکی دیکەش لە دەقەکانی سوننەت دا کەم و زۆر باس کراون بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە زانایانی فەرموودەناس قسەیان لەسەر ئەو دەقانە کردووە کە باسی ئەو جۆرە نوێژانە دەکەن بەپێویست و بگرە پەسندیشم نەزانی کە لە ڕیزی ئەوانەدا کە ڕابردن باسیان بکەم. بەڵام ئەوە لێرەدا بەخێرایی ئاماژەیان پێدەکەم:

### ١)نوێژی ئەووابین (صلاة الأوابين):[٣٩٩]

کە بریتیە لە چوار ڕکات یان شەش ڕکات یان زیاتر و لەنێوان شێوان و خەوتنان دا دەکرێ، دیارە ئەوە کە بە نوێژی (أَوّابين)یش ناوبراوە و نوێژی چێشتەنگاویش، هەمان ناوی لێنراوە هیچ ئیشکالێك نیە، چونکە ناکۆکیەك لەنێوان نوێژی چێشتەنگاو و ئەم جۆرە نوێژەدا نیە کە هەردووکیان هی ئەو کەسانە بن کە بە (اوابين) پێناسە کراون، چەند فەرموودەیەکیش لەبارەی ئەم جۆرە نوێژەوە هەن کە وەك پێشتر گوتم لە مەحەکی فەرموودەناسان وەك پێویست دەرنەچوون. یەکێکیان ئەمەیە:

* (عن حذيفة رضي الله عنه قال: صَلَّيْتُ مَعَ النبيِّ ﷺ المَغْرِبَ، فَلَمّا قضىٰ الصَّلاةَ قامَ يُصَلِّـي فلَمْ يَزَلْ يُصَلِّي حتّى صَلَّى العِشاءَ ثُمّ خَرَجَ) رواه احمد والترمذي،

---

[٣٩٨] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ٥٨.

[٣٩٩] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٦٥ تا ٦٧.

واته: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی شێوانم کرد. جا کاتێك نوێژی تەواوکرد هەستا دەستی بە نوێژکردن کرد و لەسەر نوێژکردن بەردەوام بوو هەتا نوێژی خەوتنانی کرد پاشان چووە دەرێ.

## ٢)نوێژی تەسبیحات (صلاة التسبیح)

چۆنیەتی ئەم نوێژەش وەك لەو دەقەدا دەبینرێ کە (ابن عباس) گێڕاویەتەوە ئەوەیە کە بابای نوێژکەر چوار ڕکات نوێژ بکات بەسەریەکەوە یان دوو دوو، وە لە هەر ڕکاتێکدا پاش خوێندنی فاتیحە و قوڕئان خوێندنی دوای فاتیحە پازدە (١٥) جار بڵێ: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر)، لە ڕکوعیشدا دە جار (١٠) ئەو زیکرانە بڵێ و کە لە ڕکووعیش هەستایەوە دە جاری دیکە و لە سەجدەی یەکەمیش دا دە جارو لەنێوان سەجدەکانیش دا دە جاری دیکە و لە سەجدەی دوەمیش دا دە جار و پاش سەربەرزکردنەوە لە سەجدەی دووەم و پێش هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم دە جار، کە دەکاتە حەفتاو پێنج (٧٥) جار پاشان ڕکاتەکانی دیکەش بە هەمان شێوە بکات. کە سەرجەم زیکرەکان دەکەنە سێ سەد (٣٠٠)، وە ئینسان ئەگەر توانی لە هەر ڕۆژێك دا جارێك ئەگەرنا لە هەفتەدا، ئەگەر نەیتوانی لە مانگێك یان لە ساڵێك دا، یان بەلای کەمەوە لە تەمەنیدا جارێك ئەم نوێژە بکات، چونکە لە دەقەکەدا هاتووە کە هەرکەسێك ئەو نوێژە بکات دە جۆرە گوناحی لێدەسڕێتەوە: گوناحە پێشووەکان و دواییەکان، کۆن و تازە، هەڵەو ئانقەست، گچکە و گەورەو پەنهان و ئاشکرا!

ئەو فەرموودەیەش کە (ابن عباس) خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ دەیگێڕێتەوە (ابو داود و ابن ماجة و ابن خزیمة و ترمذي لە (ابو رافع) گێڕاویانەتەوە، بەڵام زانایانی فەرموودەناس ئەم فەرموودەیەیان بە لاواز (ضعیف) لەقەڵەم داوە[400]، بەڵام (الحافظ ابن حجر العسقلاني) لەبارەیەوە گوتوویەتی: (ئەم فەرموودەیە لە زۆر ڕێیانەوە و لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە گێڕراوەتەوە، وە کۆمەڵێك لە زانایان بە ڕاست (صحیح) یان داناوە. وەك : (الحافظ ابو بکر الآجري) و (ابو محمد عبدالرحیم المصري) و (الحافظ أبو الحسن المقدسي) وە (ابن المبارك) گوتوویەتی: نوێژی تەسبیحات پەسندکراوە و سوننەتە بکرێتە عادەت و بەین بەین بکرێ و فەرامۆش نەکرێ)[401].

---

[400] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٤ ص ٥٩.

[401] بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ ص ٣٣٢.

## ٣)نوێژی گەڕانەوە لای خوا (صلاة التوبة)[402]

کە چەند فەرموودەیکی لەبارەوە هەن یەکێکیان ئەمەیە:

*(عن أبي بكر رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ رسولَ اللهِ ﷺ يقولُ: ما مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْباً ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطهرُ ثم يُصَلِّي ثم يَسْتَغْفِرُ اللهَ الاّ غُفِرَ لَهُ، ثم قَرَأَ هذه الاية: ﴿والذين اذا فعلوا فاحِشَةً أو ظَلَموا أَنْفُسَهُمْ ذَكروا الله فاسْتَغفروا لِذُنوبهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ الاّ اللهُ؟ ولم يُصِرُّوا علىٰ ما فَعلُوا وهُمْ يعلَمون، أولئِكَ جَزاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ و جَنّاتٍ تَجْري مِنْ تَحْتِها الأَنْهارُ خالدِينَ فِيـها...﴾) رواه ابو داود والنسائي وابن ماجة والبيهقي والترمذي و قال: حديث حسن ، والطبراني بسند آخر.

واتـە: ئەبووبەكر – خوا لێی ڕازی‌بێ – گوتوویەتی گوێم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو دەیفەرموو: هەر پیاوێك – مەبەست ئینسانی موسوڵمانە چ نێر و چ مێ – گوناحێك بكات، پاشان هەستێ خۆی پاك بكاتەوە (مەبەست خۆشۆردن یان دەست نوێژ گرتنە) ئنجا نوێژ (مەبەست دوو ڕكاتە وەك لە ڕیوایەتی (ابن حبان و بيهقي و ابن خزيمة) دا هاتوە) بكات، دوایی داوای لێبوردن لە خوا بكات، حەتمەن خوا لێی‌دەبووریّو پاشان ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە : وە ئەوانەی كاتێك خراپەیەكی ناقۆڵا دەكەن یان ستەم لە خۆیان دەكەن، خوایان دێتەوە بیر و یەكسەر داوای لێبوردن بۆ گوناحەكانیان لە خوا دەكەن، وە كێ هەیە لە گوناحان ببورێ بێجگە لە خوا ؟!، وە لەسەر ئەوەی كردوویانە سوورنابن لە حاڵێك دا دەزانن – كە خوا پێی ناخۆشە و تاوانە –. ئەوانە پاداشتیان لێبوردنێكی تایبەتی لە پەروەردگاریانەوە، وە چەند باغێك كە چەندان ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە.

## ٤)نوێژی داواكردنی پێویستی‌یەك (صلاة الحاجة)[403]

لەبارەی ئەم نوێژەشەوە چەند دەقێك گێڕراونەوە كە ئەمە یەكێكیانە:

*(عن أبي االدرداء رضي الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ قال: مَنْ تَوضّأَ فَأَسْبَغَ الوُضُوءَ ثم صلّى رَكْعَتين يُتِمهما أعطاه اللهُ ما سَأَلَ مُعَجّلاً أَوْ مُؤَخَّراً) رواه احمد بسند صحيح. واتـە: هەركەسێك دەستنوێژێكی تێرو تەسەل بگرێ، پاشان دوو ڕكات نوێژی تێرو تەواو بكات، هەرچی داوای بكات زوو یان درەنگ خوا پێی دەبەخشێ.

---

[402] بڕوانە: (الفقه السنة) ج٢ ص٢٣٢.

[403] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص٢٣٢.

*(نووي) یش فەرموودەیەکی لەو بارەوە لە (ابن ابي أَوفیٰ) وە هێناوە کە (ترمذي و حاکم و ابن ماجة) گێڕاویانەتەوە، بەلاَم (ترمذي) بە لاواز (ضعیف) ی داناوە[٤٠٤].

## ٥)نوێژی زاواو بووك (صلاة العریس والعروس)

دیارە لەبارەی ئەم نوێژەوە کە دوو ڕکاتە و یەکەم شەو کە زاوا و بووك بەیەك دەگەن دەیکەن، هیچ دەقێك ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەهاتوە، بەلاَم لە هاوەلاَنی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ و ڕازیشیان بکات ئەم دوو دەقە گێڕراونەتەوە:

أ- (ابو سعید مَوْلیٰ أبَي أُسَیْد) گوتوویەتی: لە حالێك دا کە کۆیلەبووم ژنم مارەکرد، جا ژمارەیەك لە هاوەلاَنی پێغەمبەرم ﷺ دەعوەت کرد کە (عبدالله بن مسعود و ابوذر و حذیفة) خوا لێیان ڕازی بێ لەنێوانیاندا هەبوون، جا کاتێك قامەت کرا بۆ نوێژ (ابو ذر) هەستا پێش بکەوێ، کەچی پێیان گوت: ڕاوەستە! گوتی: ئاوایە؟ گوتیان: بەلێ - دەلێ - ئەوجار لەحالێکدا کە من کۆیلەیەك بووم پێشیان کەوتم ئەوجار چۆنیەتی چوونە لای هاوسەرەکەمیان - فێرکردم و گوتیان: (إِذَا دَخَلَ عَلَیْكَ أَهلك، فَصَلِّ رَكعَتَیْنِ ثم سَلِ اللهَ مِنْ خَیْرِ ما دَخَلَ عَلَیْكَ، و تَعَوَّذْ بِهِ مِنْ شَرِّهِ، ثم شَأنَكَ و شَأنَ أَهْلِكَ) أخرجه ابو بكر بن ابي شيبة، و عبدالرزاق، و سنده صحيح الى ابي سعيد[٤٠٥].

واتە: کاتێك خێزانەکەت لێت وەژوورکەوت، دووڕکات نوێژ بکە، پاشان چاکە و خێری ئەوەی هاتۆتە لات لە خوا داوابکە، وە لە خراپەی پەنا بەخوا بگرە، پاشان لەگەلَ خێزانەکەت چی دەکەن بیکەن!

ب- (شقیق) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك کە ناوی (حەرین) بوو هات، گوتی: کچێکی گەنجم مارەکردوەو دەترسم کە بم بوغزێنێ، جا (عبدالله بن مسعود) خوا لێی ڕازیبێ گوتی: (انَّ الإِلْفَ مِنَ اللهِ والفِرْكَ مِنَ الشَّيْطَانِ يُرِيدُ أَنْ يُكَرِّهَ اِلَيكُمْ ما أَحَلَّ الله لَكُمْ، فاذا أتتك فأمُرْها أَنْ تُصَلِّيَ وَراءَكَ رَكْعَتَيْنِ، - زاد في رواية أخرىٰ - و قُلْ اَللهم بارِكْ لي في أَهْلي، و بارِكْ لَهُمْ فِيَّ، اَللهم اجْمعْ بيننا ما جمعتَ بِخَيْرٍ، و فَرِّقْ بيننا اذا فَرَّقْتَ اِلىٰ خَيْرٍ) اخرجه ابوبكر بن ابي شيبة و كذا عبدالرزاق و سنده صحيح و اخرجه الطبراني بسندين صحيحين.[٤٠٦]

---

[٤٠٤] بڕوانەك (الموجموع شرح المهذب) ج٤ ص ٦٩).

[٤٠٥] بڕوانة (آداب الزفاف في السنة المطهرة) محمد ناصرالدين الالباني، ص٩٣.

[٤٠٦] بڕوانە: (اداب الزفاف في السنة المطهرة) ص ٩٥، ٩٦، وە بڕوانە: (تحفة العروس) ص ١٢١. محمد مهدي الأستانبولي.

واته: بێگومان خۆشەویستی و بەین خۆشی لەخواوەیەو بوغزو نێوان ناخۆشی لە شەیطانەوەیە دەیەوێ ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لە لاتان ناپەسەند بکات، جا هەر کات، هاوسەرەکەت هاتە لات پێی بڵێ: با دوو ڕکات نوێژت لە پشتەوە بکات. (لە ڕێیەکی دیکەوە ئەمەش زیادکراوە) وە بڵێ: ئەی خوایە! بەرەکەتم بۆ بخە خێزانم، وە منیش بۆوی بەرەکەت دار بکە، ئەی خوایە! هەتا پێکەوەمان دەهێڵی با لەسەر خێر بێ‌و، هەرکات لە یەکتریشت جیاکردینەوە با بەرەو خێر بێت.

خوێنەری بەڕێز! سوپاس بۆ خوا لێرەدا توێژینەوە دەربارەی نوێژە سوننەتەکان تەواوبوو، بەڵام وەك چۆن لە سەرەتاوە پێنج ئاگاداریمان لەبارەی نوێژە سوننەتەکانەوە بە گشتی خستەڕوو بەپێویستی دەزانم لە کۆتاییش دا پێنج ئاگاداری دیکە بخەمەڕوو:

١)نوێژە سوننەتەکانی شەو و ڕۆژ وا پەسەندە دوو دوو بکرێن هەرچەندە سوننەتەکانی ڕۆژ بە چوار ڕکات و ئەوانەی شەو بە زیاتریش دروستە بکرێن، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی پەسەندتر بوونی کردنی نوێژە سوننەتەکان بە دوو ڕکات دوو ڕکات فەرموویەتی: "صَلاةُ اللّيْلِ والنَّهارِ مَثْنىٰ مَثْنىٰ" رواه الخمسة.

٢)سەرجەم نوێژە سوننەتەکان ئەگەر بەکۆمەڵ کرانیان تێدا سوننەتیش نەبێ تێیان دا دروستە، وە وەك (شوکاني) گوتوویەتی: (ئەوەی کە بە دروستی نەزانیوە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە)[٤٠٧]، لەوبارەشەوە- کە دروستە نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ بکرێ - فەرموودە زۆرن، بۆ وێنە ئەو فەرموودانەی کە (بخاری) لە هەرکام لە (ابن عباس) و (انس) و (عتبان بن مالك) خوالێیان ڕازیبی دەیانگێڕێتەوە کە نوێژی سوننەتیان بەکۆمەڵ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ کردوە.[٤٠٨]

٣)هەرکات قامەت خوێنرا بۆ نوێژی فەرز یان بەرپاکرا نوێژی سوننەت پەسەند یان دروست نیە، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: (اذا أُقيمتِ الصَّلاةُ فَلا صَلاةَ اِلاّ المَكْتُوبَةُ) رواه مسلم و اصحاب السنن عن ابي مريرة، واتە: هەرکاتێك نوێژ - ی فەرز - بەرپاکرا (یان قامەتی بۆ کرا) دروست نیە(یان پەسەند نیە)هیچ نوێژێك بکرێ بێجگە لە نوێژی فەرز.

---

[٤٠٧] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ٩٥.

[٤٠٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

جا زانایان دەربارەی لق و پۆپەکان (تفصیلات) ی ئەو مەسەلەیە بیروڕای جیا جیایان هەن، بەڵام سەرجەم لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە بەلای کەمەوە هەر کاتێك دەست بە نوێژی فەڕز کرا یان قامەتی بۆ خوێنرا سوننەت کردن - تەنانەت ئەگەر دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانیش بێت - شتێکی ناپەسەند (مکروه)ە ئەمە ڕای (سفیان الثوري و ابن المبارك و شافیعي و أحمد و اسحاق و ابو ثور و محمد بن جریر)ە، هەندێکیشیان وەك ظاهرییەکان بە حەڕامی دەزانن و تەنانەت دەڵێن ئەگەر لە کاتی قامەت خوێنران یان دەست پێکرانی نوێژی فەڕزدا کابرا لە نوێژی سوننەتیش دابێ نوێژەکەی بەتاڵە و دانامەزرێ، بەڵام بێگومان ئەم ڕایەیان زیادەڕۆیی (افراط) ە[409]، هەروەك چۆن ڕای ئەوانەش کە دوای قامەت خوێنران و دەست کران بە فەڕز دەڵێن کردنی سوننەت ئیشکالی تێدا نیە بەزایەدان (تفریط) ە!

٤) زۆربەی زانایان نوێژی سوننەت کردن لە پێنج کاتان دا بە ناپەسەند (مکروه) و هەندێکیشیان بە موباحی دەزانن[410]، دوای کردنی نوێژی بەیانی، وە لە کاتی هەڵهاتنی خۆردا هەتا هێندەی ڕمبێك بەرزدەبێتەوە، وە کاتێك خۆر دەگاتە نێوەڕاستی ئاسمان هەتا تۆزێك لادەدات، وە دوای نوێژی ئێوارە (عصر) هەتا خۆرئاوادەبێ، وە لە کاتی ئاوابوونیدا هەتا بەتەواوی ون دەبێ[411]، ئەو فەرموودانەش کە نوێژکردنیان لەوکاتەدا قەدەغەکردوە زۆرن بۆ وێنە: (عن أبي سعيد أَنَّ النبيَّ ﷺ قال: لا صَلاةَ بَعْدَ صَلاةِ العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، ولا صَلاةَ بَعْدَ صَلاةِ الفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ) متفق عليه. ئەمە بۆ دوو کاتی پاش نوێژکردنی بەیانی و پاش نوێژی ئێوارە (عصر).

ئەو فەرموودەیەش کە (أحمد و مسلم) لە (عمرو بن عَبَسة) خوا لێی ڕازی‌بێ دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا سێ کاتەکانی دیکەش دیاری‌دەکات، کە بریتین لە کاتی هەڵهاتنی ڕۆژ هەتا هێندەی ڕمبێك بەرزدەبێتەوە، و دەمی چەقی نیوەڕۆ هەتا خۆر تۆزێك بەلای ڕۆژئاوادا لادەدات، وە دەمی ئاوابوونی هەتا بەتەواوی ئاوا دەبێ[412].

---

[409] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص ١٠٣، ١٠٤.

[410] هەمان سەرچاوە ج٣ ص ١٠٧، ١٠٨، ئەوانیش زیاتر (ظاهري) یەکانن کە پێیان وایە ئەو فەرموودانەی نەهی‌یان تێدایە نەسخ کراونەتەوە، بەڵام ڕایەکەیان بێ‌هێزە.

[411] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص ١٥٠ تا ١٥٦.

[412] دیارە ئەو نەهی‌یە بە ڕای تێکڕای زانایان گێڕرانەوە نوێژی فەڕزو، وە بەڕای هەندێکیان نوێژێك کە هۆیەکی تایبەتی هەبێ وەك: سڵاوی مزگەوت و جەژن و جەنازە .. ناگرێتەوە، بڕوانە: (فتح الباري) ج٢ ص ٢٥.

٥) ئەو شوێنانەی کە نوێژکردنیان تێدا ناپەسند[٤١٣] یان حەرامە:

١-لەسەر گۆڕستان یان گۆڕ: دەقی سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن بۆ وێنە: ( عن عائشة رضي الله عنها أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قال: لَعَنَ اللهُ اليَهُودَ والنَّصارىٰ اتَّخَذوا قُبُـورَ أَنْبِيائِـهِمْ مَسـاجِدَ) متفق عليه.

واتە: لەعنەتی خوا لە جوولەکە و نەصرانییەکان، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت. وکاتێك (ام سلمة) خوا لێی ڕازیبێ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد کە لە وڵاتی حەبەشە کڵێسایەکی دیوە پێی گوتراوە (ماریّة) وە باسی کرد کە وێنە و پەیکەری تێدا دیون، فەرمووی: (أُولَئِكَ قَوْمٌ اذا ماتَ فِيهِمُ العَبْدُ الصّـالِحُ أَو الرَّجُـلُ الصّـالِحُ بَنَوْا علىٰ قَبْرِهِ مَسْجِداً و صَوَّروا فيهِ تِلْكَ الصُّوَر أُولَئِكَ شِرارُ الخَلْـقِ عِنْـدَ اللهِ) متفق عليه، واتـە: ئەوانە خـەڵکێکن هـەرکات بەندەیـەکی چـاك یـان پیـاوێکی چاکیـان لـەنێودا مردبایـە پەرستگایان لەسەر گۆڕەکە دروست دەکرد، وە ئەو وێنانەیان تێدا دەکێشان، ئەوانە خراپترین کەسن لەلای خوا[٤١٤].

٢-لـە کڵێسـا و کەنیشـتە (في الكنيسـة والبيعـة) ی دیـان و جووان دا: (البخـاري) لـە (أَسْلَم، مولىٰ عمر) دەگێڕێتەوە کە کاتێك (عمر) خوا لێی ڕازیبێ چووە شام پیـاوێکی نەصرانی کـە لـە گـەورەپیاوانیان بـوو خواردنـی بـۆ دروسـت کـرد، وە پـێی گـوت: حەزدەکەم بێی بۆ لام و ڕێزم بگری، عومەریش پێی گوت: (اِنّا لا نَدْخُلُ كَنائِسَـكُمْ مِـنْ أَجْلِ الصُّوَرِ الَّتي فِيها، يَعْني التَّماثِيلَ) واتە: ئێمە لەبەر ئەو وێنانە، یان پەیکەرانەی کە لە کڵێساکانتان دا هەن نایەینە نێویـان[٤١٥]، هەروەها (البخـاري) گوتوویـەتی: (كـان ابن عبـاس يُصَلِّي فِي البِيْعَةِ اِلاّ بِيْعَةً فِيـها تَمـاثِيلُ)[٤١٦]، واتـە: (ابن عبـاس) لـە کەنیشـتەدا نوێژی دەکرد، مەگەر کەنیشتەیەك کە پەیکەری[٤١٧] تێدا هەبان.

---

[٤١٣] بەشێك لە زانایان نوێژکردن لەو شوێنانەدا بە حەرام دەزانن وەك حەنبەلییەکان و حەنەفییەکان، هەندێکیشیان وەك شافیعییەکان دەڵێن تەنیا ناپەسەندە (مكروه) ە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج١ ص ٧٨٨.

[٤١٤] دیارە نوێژی سەر جەنازەیەك کە خراوەتە گۆڕەوە لەو حوکمە هەڵاوێرراوە، بڕوانە: (العدة..) ج٢ ص ٨٥.

[٤١٥] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٢ ص ٩٨.

[٤١٦] هەمان سەرچاوە.

[٤١٧] وشەی (صُورَة) و (تِمْثال) هەردووکیان هەم وێنە و هەم پەیکەریش دەگرنەوە، بەڵام (صورة) زیاتر بۆ وێنە و (تِمْثال) [illegible] بۆ پەیکەر [illegible] (المعجم [illegible]) ج[illegible] ص ٨٥٤.

دیاره سەرجەم زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە لە کاتی ناچاریدا دروستە لە پەرستگای نەصرانی و جوولەکان دا نوێژ بکرێ[٤١٨]، ئەگەر ناچاریش نەبێ بەشێکیان دەڵێن مادام وێنەو پەیکەریان تێدا نەبن و پاك و خاوێن بن دروستەو، بەشێکیشیان دەڵێن هەرچۆن بێ هەر دروست نیە یان بەلای کەمەوەناپەسەندە[٤١٩].

٣-لەسەر زبڵدان و لە قەصابخانەدا و لەسەر ڕێگا و لە ئاغەڵی حوشتردا و لە گەرماودا و لە سەربانی کەعبە: چونکە هیچ کام لەم شوێنانە لەوە ناوەشێنەوە کە بکرێنە پەرستگا و شوێنی ڕکووع و سەجدە تێدا بۆ خوابردن، چونکە وەك پێشتر لە مەرجەکانی نوێژدا ڕوونمان کردەوە یەکێك لە مەرجەکانی نوێژکردن: پاك و خاوێنی جەستە و بەرگ و پۆشاك و شوێنی نوێژ تێداکردنە، وە لەو بارەشەوە ئەم دەقە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراوەتەوە: (عن ابن عمر رضي الله عنهما أن النبي ﷺ نَهَى أَنْ يُصَلَّى في سَبْعَةِ مَواطِنَ: في المَزْبَلَةِ والمَجْزَرَةِ والمَقْبَرَةِ و قارِعَةِ الطَّرِيقِ و في الحَمّامِ و في أَعْطانِ الأبلِ و فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ اللهِ) رواه ابن ماجة والترمذي و قال: اسناده ليس بالقوي. واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە نوێژ لە حەوت شوێنان دا بکرێ: لە زبڵدان و قەسابخانە و گۆڕستان و سەر ڕێگا و گەرماو و ئاغەڵی حوشتردا و لەسەر پشتی ماڵی خوا.

شایانی باسە کە بێجگە لە (سەربانی کەعبە) کە جگە لە حەنەفی‌یەکان سەرجەم زانایانی دیکە نوێژکردن لەوێ بە بەتاڵ و نادروست دەزانن، شوێنەکانی دیکە بەڕای زۆربە نوێژ تێداکردنیان ناپەسەندە و هەندێکیش دەڵێن نادروستەو حەرامە وەك (احمد) و ظاهریی‌یەکان[٤٢٠].

تێبینی: بۆیە ئەو کاتانەی نوێژکردنیان تێدا ناپەسەند یان حەرامە و، ئەو شوێنانەی کە نوێژیان تێدا ناپەسەند یان حەرام و بەتاڵە لێرەدا خستماننە ڕوو، چونکە ئەو نوێژانەی کە لەو کاتانە و لەو شوێنانەدا دەکرێن بەزۆری نوێژە سوننەتەکانن، بۆیە خستماننە گەڵ باسی نوێژە سوننەتەکان.

لێرەش دا کۆتایی بە باسی (نوێژە سوننەتەکان دێنین و دەچینە سەر باس و توێژینەوەی کورتە باسی پازدەهەم .

---

[٤١٨] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٢ ص ٩٩، هەروەها بڕوانە: (الفقة الاسلامي وادلته) د. وهبة الزجيلي، ج١ ص ٧٩١.

[٤١٩] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٧٦، حەنبەلی‌یەکانیش دەڵێن: مادام ئەو پەرستگایانە خاوێن بن ئەگەر وێنەو پەیکەریشیان تێدابن هەر دروستە نوێژیان تێدا بکرێ، بڕوانە، (الفقه الأسلامي وادلته) ج١ ص ٧٩١، ٧٩٢.

[٤٢٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص [illegible]

## ١٥) سوترەی[٤٢١] بەردەمی نوێژکەر (سُتْرَةُ المُصَلِّيّ)

**یەك:** تێکڕای زانایان هەبوونی سوترە لە کاتی مەترسی ڕەدبوونی شتێك بە بەردەم نوێژکەردا بە سوننەت دەزانن[٤٢٢] و، زۆربەشیان بە موتڵەقی بە سوننەتی دەزانن، واتە لەکاتی هەبوونی مەترسی و لە کاتی نەبوونیشیدا، بەڵام هەندێکیان دەڵێن ئەگەر مەترسی تێپەڕبوون نەبوو سوننەت نیە[٤٢٣]، واش پێدەچێ ئەو ڕایە بەهێزتر بێ کە بەموتڵەقی بە سوننەتی داناوە، چونکە دەقەکانی سوننەت زیاتر ئەوەیان لێدەفامرێتەوە.

ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی سوننەت و پەسەند بوونی دانانی سوترە:

*(عن موسى بن طلحة عن أَبِيه قال: كُنَّا نُصَلِّي والدَّوابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينا فذَكَرْنا ذلِكَ لِرَسولِ اللهِ ﷺ فقال: مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ تَكونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، ثم لا يَضُرُّهُ ما مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ) رواه مسلم و ابوداود والترمذي وابن ماجة. واتە: ئێمە نوێژمان دەکرد ئاژەڵ بە پێشمان دا تێدەپەڕین، جا ئەوەمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: شتێکی بەئەندازە تەختەداری[٤٢٤] ی دواوەی کورتان لەبەردەم یەکێکتان هەبێ، دوای ئەوە هەر شتێك لەپێشیەوە ڕەدبێ زیانی پێناگەیەنێ.

* (عن ابي سعيد أن رسول الله ﷺ قال: إِذا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيصلِّ إِلىٰ سُتْرَةٍ ولْيدْنُ مِنْها) رواه ابوداود وابن ماجة، واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با سوترەیەکی لەپێش بێت، وە با لێی نزیك بکەوێتەوە.*(عن ابنِ عبّاس أَنَّ النبيَّ ﷺ صَلَّى في فَضاءٍ ولَيْسَ بَيْنَ يَدَيْهِ شَيئٌ) رواه احمد وابوداود والبيهقي، واتە:پێغەمبەر ﷺ لە دەشتێك نوێژی کرد و هیچ شتێکی لەبەردەم نەبوو. (مەبەست سوترەیە).

---

[٤٢١] وشەی (سترة) یانی: پۆشەر، پەردە. بڕوانە : (المعجم الوسيط) ص ٤١٦.

[٤٢٢] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج١ ص ٧٥٢، بەڵام (شوكاني) دەڵێ: فەرزە، بڕوانە (نيل الأوطار) ج٣ ص ٦، بەڵام بەڵگەیەکی ئەوتۆی نەهێناوەتەوە بایی سەلماندنی دەعوایەکەی بکات.

[٤٢٣] بۆ وێنە مالیکییەکان و حەنەفییەکان. بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ص ٢٧٧، وة (الفقه الأسلامي) ج١ ص ٧٥٣١.

[٤٢٤] (مُؤْخِرَة)، یان (مُؤَخِّرَة) یان (آخِرَة) تەختەدارێکە هێندەی ئێسقانی باسك دەست درێژە، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) للنووي ج٤ ص ٢١٦.

دوو: وە ئەو سوننەتە بەهەر شتێك دێتەدی کەبابای نوێژکەر لەپێش خۆی دایبنێ و سنووری جێگای نوێژ تێداکردنەکەی خۆی جیابکاتەوە. جا ئەو شتە گۆچان بێ، نێزەبێ، تەختەداربێ، بەردبێ.. هتد چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اذا صَلَّى أحدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ وَلَوْ بِسَهْمٍ) رواه احمد والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم. واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با سوترەی هەبێ تەنانەت ئەگەر (تیر) ێکیش بێ. بەڵام ئایا بە کێشانی هێڵ (خط) ێك دێتەدی؟ زانایان لەوەدا رایان جیاوازە، بەشێکیان کە شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانیان لەنێودان[٤٢٥]، دەڵێن: ئەگەر هیچی دەست نەکەوت لەپێش خۆی بیچەقێنێ دروستە هێڵێك لەبەردەم خۆیەوە بە باری پانی‌دا بکێشێ، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە: (اذا صَلَّى أحدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ شَيْئاً، فَإنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَنْصِبْ عَصاً، فَإنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ عَصاً فَلْيَخُطَّ خَطّاً ولا يَضُرُّ ما مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ) رواه احمد و ابوداود وابن حبان و صححه، واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با لەپێش خۆیەوە شتێك دابنێ، ئەگەر چنگی نەکەوت با گۆچانێك بچەقێنێ، ئەگەر گۆچانیشی پێنەبوو با هێڵێك بکێشێ ئەوکاتە هەر شتێك لەبەردەمیەوە تێپەڕی زیانی نابێ.

دەربارەی ئینسانیش چ پیاو چ ئافرەت کە ئایا دروستە بۆ نوێژکەر ببێتە سوترە یان نا؟ زۆربەیان کە (حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان) یان لەنێودان دەڵێن[٤٢٦]: بەڵێ، ئەوەندە هەیە حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان دەڵێن: بەمەرجێك پشتی لە بابای نوێژکەر بێت، بەڵام حەنبەلی‌یەکان دەڵێن هەرچۆن بێ دروستە، هەندێکیشیان وەك شافیعی‌یەکان[٤٢٧] رایان وایە هەرگیز دروست نیە ئینسان ببێتە سوترە، بەڵام بێگومان رای یەکەم بەهێزترە و ئەو فەرمودانەش کە عائیشەی دایکی بڕواداران خوا لێی رازی‌بێ لەوبارەوە دەیانگێڕێتەوە، چاکترین بەڵگەن، بۆ وێنە[٤٢٨]: (عن عائشة رضي الله عنها أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيلِ و أنا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ و بَيْنَ القِبْلَةِ كَاعْتِراضِ الجَنَازَةِ) رواه مسلم و ابن ماجة، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە شەوی‌دا نوێژی دەکرد لە حاڵێك دا کە من لەنێوان ئەو و قیبلەدا وەك جەنازە ڕاکشابووم.

---

[٤٢٥] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص ١٧٣٣، وە : (الفقه الأسلامي وادلته) ج١ ص ٧٥٥.

[٤٢٦] بڕوانە: (الفقه الاسلامي..) ج١ ص ٧٥٦.

[٤٢٧] هەمان سەرچاوەو بەرگ .

[٤٢٨] بڕوانە (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص ١٠٥[illegible]

**سێ:** زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەسەر ئەوەن کە سوترەی ئیمام وەبری نوێژکەرەکانیش دەکەوێ و بۆئەوان سوترە سوننەت نیە، (بخاري و مسلم) لەوبارەوە ئەم دەقە لە (ابن عباس) دەگێڕنەوە: (ڕۆژێك کە سەرو حەدی باڵغ بوونم بوو بە سواری ماکەرێك هاتم، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا نوێژی بە خەڵك دەکرد، منیش بە بەردەم ڕیزەکەدا تێپەڕیم و دابەزیم، ئنجا ماکەرەکەم بەرهەڵدا بلەوەڕێ و بۆ خۆشم چوومە ڕیزەوە و هیچ کەس ڕەخنەی لێنەگرتم لەو بارەوە.[429]) زانایان لەم فەرموودەیە ئەوەیان وەرگرتوە کە دروستە بە بەردەم نوێژکەری پشت ئیمام (مأموم) دا ڕەد ببیو، سوترە تەنیا بۆ ئیمام و بۆ کەسێك بەتەنیا نوێژبکات سوننەتە[430].

**چوار:** سوننەتە بابای نوێژکەر لە سوترەکەی نزیك بکەوێتەوە، بەڵام وا پەسەندە ڕاست ڕووی تێنەکات و مەیلەو بیخاتە لای ڕاست یان لای چەپی، ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

(عن البلال رضي الله عنه أنَّه ﷺ صلى و بينَه و بيْنَ الجدارِ نَحْوُ مِنْ ثَلاثَةِ أذْرعٍ) رواه احمد و والنسائي و معناه للبخاري واتە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد و لەنێوان ئەوو دیوارەکەدا (کە سوترەی بووە) ئەندازەی سێ باسکان دەبوو.

*(عن سهل بن سعيد قال: كانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسولِ اللهِ ﷺ وبَيْنَ الجِـدارِ مَمَرُّ الشَّـاةِ) رواه البخاري، واتە ئەندازەی نێوان شوێن نوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلمو دیوار، هێندە بوو کە مەڕی پێدا بڕوات.

*(عن المقداد بن الأسود رضي اللـه عنه انه قال: مارأيْتُ رسولَ اللـه صلى اللـه عليه وسلم صَلَّى الىٰ عُودٍ ولا عَمُودٍ ولا شَجَرَةٍ الاّ جعلَهُ علىٰ حاجِبِهِ الأَيْسَرِ أَوِ الأَيْمَنِ ولا يَصْمُدُ لَـهُ صَمْـدا). رواه احمد وابو داود، واتە پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە کە بەرەو داروچکەیەك وەکۆڵەکەیەك وەدرەختێك نوێژی کردبێ، مەگەر خستبێیەتە لای برۆی چەپی یان ڕاستی، وەڕێكو ڕاست ڕووی تێ نەدەکرد.

---

[429] هەمان سەرچاوە و بەرگ، ص ١٧٣١، لەبەر کورتکردنەوە دەقە عەرەبییەکەم نەنوسی.

[430] (ابن عبدالبر) گوتوویەتی: (فأما المأموم فلا يضره من مر بين يديه لحديث ابن عباس هذا، .. و هذاكله لا خلاف فيه بين العلماء) بەڵام دوایی (الحافظ ابن حجر) بەڵگە دێنێتەوە کە ئەم مەسەلەیە ڕای دیکەشی تێدا هەیە و یەکدەنگی (اتفاق) ی زانایانی لەسەر نیە. بڕوانە (فتح الباري) ج٢ ص ١٥٢.

**پێنج:** سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە حەرامەو لەگوناحە زلەکانە کە بەپێش نوێژکەرێکدا ڕەد بێ کە سوترەی داناوە،[٤٣١] وەهەمووشیان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە بابای نوێژکەر بۆی ڕەوایە ئەو کەسەی بەپێش نوێژەکەی‌دا ڕەد دەبێ نەیهێڵێ و بیگێڕێتەوە، وە زۆربەی هەرە زۆریشیان لەسەر ئەو ڕایەن کە هیچ شتێك بەهۆی تێپەڕینی بە بەردەم نوێژکەردا نوێژەکەی نابڕێ، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت بۆ ئیسپاتی هەرکام لەو سێ مەسەلەیە:

* (عن بسر بن سعيد قال: قال رسولُ الله ﷺ: لَوْ يَعْلَمُ المارُّ بَيْنَ يَدَي المُصَلّي ماذا عليه، لَكانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعينَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ) متفق عليه.

واتە: بابای ڕەد بوو بە بەردەم نوێژکەردا ئەگەر دەیزانی چ گوناحێکی لەسەرە، بۆی دەردەکەوت کە ئەگەر چل ڕۆژ یان مانگ یان ساڵ چاوەڕێی کردبایە بۆی باشتر بوو لەو ڕەد بوونە بەبەردەم نوێژکەردا.

* (عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إذا كانَ أَحَدُكُمْ يُصَلّي فلا يَدَعْ أَحَداً يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، وليَدْرَأْهُ ماسْتَطاعَ، فانْ أَبى فَلْيُقاتِلْهُ فانَّما هُوَ شَيْطانٌ). رواه مسلم وابوداود والنسائي وابن ماجة.

واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد بالێ نەگەڕێ هیچ کەس بەبەردەمی نوێژەکەی‌دا بڕوات، وەبا بەپێی توانای بیگێڕێتەوە، جا ئەگەر هەر ملی نەدا بالەگەڵی بجەنگێ چونکە بێگومان ئەوە شەیتانە، (واتە شەیتانی لەگەڵە یان ڕەفتاری شەیطان دەکات)[٤٣٢]

## دوو تێبینی:

١) دیارە ئەو نەهێشتن و پاڵ پێوەنانە سوننەتەو فەرز نیە، وەمەرجیش نیە چەکی بۆ بەکار بهێنێ، یان کارێك بکات بیکوژێ![٤٣٣] بەڵام ئەگەر بەشێوەیەك کە دورستە پاڵی پێوەناو مرد، حوکمی چیە؟!

---

[٤٣١] دیارە موتڵەقی ڕەد بوون بەبەردەم نوێژکەردا خراپە، بەڵام ئەگەر سوترەی نەبێ حەرام نیە چونکە کەمتەرخەمی لەبابای نوێژکەریشەوە هەیە، بڕوانە (فتح الباري) ج٢ ص١٦٥.

[٤٣٢] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص١٧٤٢.

[٤٣٣] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ ص١٧٤١.

(قاضی عیاض) گوتوویەتی: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە تۆڵە (قصاص)ی ناکەوێتە سەر بەڵام ئایا خوێنی دەکەوێتە سەر، یان بە بەلاش دەڕوات، زانایان دوو ڕایان هەن.[٤٣٤] پێویستە ئەوەش بگوترێ کە سەرجەم زانایان لەسەر ئەوەش پێکهاتوون کە ئەو مافی پاڵ پێوەنانو نەهێشتنو جەنگ کردنە لەگەڵ بابای تێپەڕدا تەنیا بۆ کەسێکە کە بەهۆی دانەنانی سوترەوە کەمتەرخەمی نەکردبێ.[٤٣٥] ئەگەر نا مادام خۆی کەمتەرخەم بووبێ، بەتایبەت ئەگەر نوێژەکەی لەشوێنێك بکات قەڵەباڵغو سەرەڕێ بێ ئەوە ئەگەر سوترەشی دانابێ حوکمەکەی دەگۆڕێ، چ جای سوترەکەشی نەبێ.

٢) سەرجەم شەرعزانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لەمزگەوتی حەرامدا لەکاتی طەواف کردندا بابای نوێژکەر ئەگەر سوترەشی هەبێ دروستە بە بەردەمیدا بڕۆی، هەرچەندە بێگومان خۆپاراستن چاکترە.[٤٣٦]

دەربارەی ئەوەش ئایا بەهۆی تێپەڕینی ئینسانێك یان گیاندارێکەوە بەپێش نوێژی نوێژکەرێکدا کە سوترەی دانەناوە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە یان نا؟! زانایان کێشەو مشتومڕی زۆریان کردوە لەوبارەوە هەندێکیان دەڵێن نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان ئەو ڕایە بەپەسەند نازانن و دەڵێن: ڕەد بوونو تێپەڕبوونی هیچ شتێك نوێژ نابڕێ، بەڵکو بابای نوێژکەر بەهۆی کەمتەرخەمی کردنی لەدانانی سوترەدا خێرو پاداشتی نوێژەکەی کەم دەبێتەوە، ئەمە ڕای هەر چوار پێشەواو سەرمەزهەبەکانەو ڕای جەماوەری زانایانی پێشینو پاشانیشە،[٤٣٧] چەند بەڵگەیەکیش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ڕایەکەیان دێننەوە:

١- چەند فەرموودەیەك کە لە (عائشة)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕراونەوە کە ڕەخنەی لەو جۆرە دەقانە گرتوە، کە ئافرەتی لەگەڵ کەرو سەگدا باس کردووە، بۆ وێنە:

---

[٤٣٤] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

[٤٣٥] هەمان سەرچاوە.

[٤٣٦] بڕوانە: (الفقه الاسلامی..) ج١ ص٧٦١.

[٤٣٧] بڕوانە: (الفقه الاس[illegible]وادلته) ج٣ ص[illegible].

* (شَبَّهتُمُونا بالحُمُرِ والكِلابِ! لَقَدْ رَأَيْتُ النبيَّ ﷺ يُصَلِّي وأَنَا علىٰ السَّـرِيرِ بَيْنَـهُ وبَيْنَ القِبْلَـةِ مُضْطَجِعَةً) متفق عليه، واتە: ئايا بەكەران‌و سەگانتان چواندووین! بەتەئكید پێغەمبەرم ﷺ دەبینی نوێژی دەكردو لەسەر جێگا لەنێوانی ئەوو قیبلەدا ڕاكشابووم. (كەواتە ڕاست نیەو ڕەد بوونی ئافرەت بەپێش نوێژدا نوێژ نابڕێ).

٢- ئەو دەقـەی كـە پێشـتر لـە (ابـن عبـاس)ەوە گێڕامانـەوە، وەئـەم دەقـەش كـە (فضل)ی برای گێڕاویەتەوە:

* (عن الفضل ابن عباس رضي الله عنهما قـال: أَتَانـا رسـولُ الله ﷺ ونَحْـنُ في باديـةٍ لَنـا، فَصَلَّى في صَحْراءَ لَيسَ بَيْنَ يَدَيهِ سُترَةٌ، وحِمارَةٌ لَنا وكَلبَةٌ تَعبَثانِ بَيْنَ يَدَيـهِ، فَمـا بـالىٰ ذٰلِـكَ) رواه ابو داود باسناد حسن، واتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان‌و ئێمەش لەهەوارێكی خۆمـان بووین، جا پێغەمبەر ﷺ لەدەشتێك نوێـژی كـردو هیـچ سوترەشـی لەبـەردەم نەبوو، وەماكەرێك‌و دێڵە سەگێكمان هەبوون لەپێشەوەی دەهاتن‌و دەچوون، كەچی هیچ ئەمیەتی بەوە نەدا، (واتە: هیچ حیسابی بۆ ئەو كەرو سەگە نەكرد كە بفەرموێ نوێژەكەمانیان بڕیوە).

٣- وەڵامـی ئـەو فەرموودانـەش كە كۆمـەڵی یەكـەم بـە بەڵگـەیان هێناونـەوە بـەوە دەدەنەوە كە (شافعي‌و خطّابي) گووتویانە، كە مەبەست لەبڕین (قطع) بڕینـی گـەردن كەچی‌و یادی خوایە بەهۆی سەرگەرم بوون‌و ئاوڕدانەوە لە ئەنجامی هاتن‌و چوون‌و ڕەد بوونیان، نەك بڕینی نوێژەكەو بەتاڵ بوونەوەی بەیەكجاری.[٤٣٨] ئاشكراشە كەڕای دووەم كەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانەو دەبێتە هۆی كۆكردنەوەو پێكەوە گونجانی ، . هەموو دەقەكانیش بـەهێزو پـێزترو بەڵگـەدارترەو لەڕەحمـەت‌و لوتـف‌و كـەرەمی پەروەردەگایش نزیكترە.

---

[٤٣٨] بڕوانە: (المجموع [illegible] ٣ ص ٢٣٢، ٢٣٣) و بڕوانە (فقه السنة) [illegible]

## ١٦ - كڕنووشى لەبيرچوون و هەڵەكردن[٤٣٩] (سجدة السهو)

لەسۆنگەى ئەوەوە كە لەبيرچوونەوە (نسيان) يەكێكە لەخاڵە لاوازەكانى ئینسان بەگشتى، شتێكى سروشتىیە كە ئینسان لەنوێژدا تووشى هەڵەو بێ ئاگايى ببێ، ئەوەتا پێغەمبەرى خوا ﷺ كە بێگومان لەهەموو ڕوویێكەوە سەرقافڵەو سەرۆرى مرۆڤايەتىیە تووشى لەبيرچوونەوەو بێ ئاگايى بووە، وەك فەرموويەتى: (.. إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَىٰ كما تَنْسَوْنَ...). رواه مسلم، واتە: منيش وەك ئێوە ئینسانم وەك چۆن ئێوە لەبيرتان دەچێ منيش لەبيرم دەچێ.

جا بۆ قەرەبووكردنەوەو سڕينەوەى ئەو كەمو كوڕىیە كە نوێژكەر بەهۆى لەبيرچوونەوەو بێ ئاگايىيەوە تووشى دەبێ پێغەمبەرى پێشەوامان ﷺ سەجدە بردنى هەڵەكردن (سجدة السهو)ى بۆ داناوين كە ئەوە لەخوارەوە لەچەند بڕگەيەكدا تيشكى دەخەينە سەر:

**يەك:** زۆربەى زانايان سەجدەى سەهوو بەسووننەت دەزانن و هەندێكيشان بەموتڵەقى يان لەهەندێك حاڵەتدا بەفەرزى دەزانن،[٤٤٠] بەلام واپێ دەچێ ڕاى بەسوننەت دانانى بەهێزتر بێ.

**دوو:** سەجدەى هەڵەكردن و لەبيرچوونەوەش ئەوەيە كە نوێژكەر بەر لە سەلام دانەوە يان دواى سەلام دانەوە دوو جار سەجدە بەرێ، كت و مت وەك سەجدەكانى نوێژ، ئینجا لەدەقەكانى سوننەتدا هاتووە كە ئەو سەجدە بردنە پێش سەلام دانەوەو دواى سەلام دانەوەش هەيە، بۆ وێنە: لەو فەرموودەيەدا كە (مسلم و ابو داود و نسائي و ابن ماجه) لە (ابو سعيد الخدري) خوا لێى ڕازى بێ دەيگێڕنەوە هاتووە كە پێش سەلام دانەوە بێ،[٤٤١] بەلام لەو فەرموودەيەدا كە (بخارى و مسلم و ابو داود) لە (ابو هريرة) خوا لێى ڕازى بێ گێڕاويانەتەوە، هاتووە كە پاش سەلام دانەوە بووە.[٤٤٢]

---

[٤٣٩] بۆيە وشەى (سهو)م بە (لەبيرچوون و هەڵەكردن) لێك داوەتەوە چونكە لەفەرهەنگەكانى زماندا گوتراوە: (سها عنه: غفل عنه، وسهى فيه، تركه عن غير علم، سهى في الصلاة نَسِيَ شيئاً منها) بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٤٥٩.

[٤٤٠] شافيعىيەكان و مالیكىيەكان و هەندێك لە حەنەفىيەكان بەسوننەتى دەزانن، زۆربەى حەنەفىيەكان و حەنبەلىيەكانيش لەهەندێ حاڵەتدا بەفەرزى دادەنێن، بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج١ ص٨٧ تا٩١

[٤٤١] بڕوانە/ (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص١٨٦٠.

[٤٤٢] بڕوانە: (فتح ال[illegible]) ج[illegible] ص[illegible]، بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص١٨٦٥.

ئنجا زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە سەجدەی ناوبراو پێش و پاش سەلام دانەوەش هەر دروستەو بەردەکەوێ،[٤٤٣] لەسەر ئەوە جیاوازی و مشت و مڕی زۆریان هەیە کە ئایا چۆن چۆنی خێرترو چاکترە!

هەندێکیان ڕایان وایە کە واپەسەندە هەر پێش سەلام دانەوە بێ،[٤٤٤] بەڵام واپێ دەچێ پەسەندتر ئەوەبێ کە سەرنجی دەقەکانی سوننەت و چۆنیەتی سەجدە بردنەکانی پێغەمبەر ﷺ بدرێ و لەو شتانەدا کە پێغەمبەر ﷺ، بەر لەسەلام دانەوە سەجدەی بردبێ پێش سەلام بخرێ و لەو شتانەشدا کە ئەو سەجدەی سەهووی تێدا دواخستوون بۆ دوای سەلام، دوا بخرێ، وەلەو شتانەی دیکەشدا کە لە سوننەتدا نەهاتوون بابای نوێژکەر سەرپشك بکرێ، کە ئەمەش ڕای ژمارەیەك لەزانایانی لێکۆڵەرەوەیە.[٤٤٥] هەندێك لەزانایانیش دەڵێن لەهەموو حاڵاندا بابای نوێژکەر سەرپشکە کە ئەو سەجدەبردنە پێش سەلام بخات یان دوای بخات و هەردووك لا یەکسانن،[٤٤٦] بەڵام وەك گوتمان وادێتە بەرچاو کەڕای سێیەم لەهەموو ڕایەکانی دیکە چاکتر بێ و دوای وی ئەم ڕای چوارەمە.

**سێ:** ئەو حاڵەتانەی کە سەجدەی سەهوویان تێدا دەبردرێ بەگشتی چوار جۆرە حاڵەتەن:

١-ئەگەر نوێژکەر پێش تەواوکردنی نوێژەکەی سەلام بداتەوە، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە باسی (ذو اليَدَيْن)ی تێدایەو پێغەمبەر ﷺ لەنوێژێکی چوار ڕکاتیدا دوای دوو ڕکات سەلام دەداتەوە؛ پاشان کە ئاگادار دەکرێتەوە، هەڵدەستێ دوو ڕکاتی دیکە دەکات و سەلام دەداتەوە، ئینجا سەجدەی سەهوو دەبات.[٤٤٧]

---

[٤٤٣] بڕوانە (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص١٨٦٩.

[٤٤٤] ئەمە ڕای شافیعیەکانە، بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص١٤٤.

[٤٤٥] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٣ ص١٣٧.

[٤٤٦] ئەمە ڕای حەنبەلیەکانە، بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج٢ ص١٠٥.

[٤٤٧] ئەو فەرموودەیە وەك پێشتر گوتمان (بخاری و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

٢–ئەگەر ڕکاتێك یان زیاتر بکات لەنوێژەکەی، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە (بخاریو مسلمو اصحاب السنن) لە (ابن مسعود)[٤٤٨]یان گێڕاوەتەوە: (أن النبي ﷺ صَلَّى خَمْساً، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ في الصَّلاةِ؟! فقالَ: وما ذلِكَ؟ فقالوا: صَلَّيْتَ خَمْساً، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، بَعْدَ ماسَلَّمَ) واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك پێنج ڕکات نوێژیکرد، پێی گوترا: ئایا نوێژ لێی زیادکراوە؟! فەرمووی: بۆ چی بووە؟ گوتیان: پێنج ڕکاتت کرد، ئینجا دوای ئەوە کە سەلامی دابۆوە دوو سەجدەی بردن.

٣–لەکاتی لەبیرچوونی تەحییاتی یەکەم یان هەر سوننەتێکی دیکەی نوێژ، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە (بخاریو مسلمو اصحاب السنن) لە (ابن بُحَيْنَةَ)[٤٤٩]ەوە گێڕاویانەتەوە: (صلّى لنا رَسولُ الله ﷺ رَكْعَتَيْنِ مِنْ بَعْضِ الصَّلواتِ، ثم قامَ فَلَمْ يَجْلِسْ، فَقامَ الناسُ مَعَهُ، فلما قَضَى صَلاتَهُ ونَظَرْنا تَسْلِيمَهُ، كَبَّر، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وهو جالِسٌ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، ثُمَّ سَلَّمَ) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەکێك لە نوێژەکاندا دوو ڕکاتی بۆ کردینو پاشان هەستایەوەو دانەنیشت –بۆ تەحیاتی یەکەم– جا خەڵکیش لەگەڵی هەستانەوە، پاشان کە لەنوێژەکەی بۆوەو ئێمە چاوەڕوانی سەلام دانەوەی بووین، (أَلله أكبر)ی کردو دوو سەجدەی بردن بەدانیشتنەوە بەر لەوەی سەلام بداتەوە، دوایی سەلامیدایەوە.

## دوو تێبینی:

أ–لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ کە چوواندنی سوننەت وەك فەڕز نیە کە پێویست بێ بگەڕێتەوە بۆ کردنی، بەڵکو بەس سەجدەی سەهوو بۆی دەبێتە قەرەبوو کەرەوە، کەواتە سەجدەی سەهوو کەلێنی سوننەت پڕ دەکاتەوە، بەڵام کەلێنی فەڕزی پێ پڕ ناکرێتەوەو حەتمەن دەبێ هەر بگەڕێتەوە بۆ کردنی پاشان سەجدەی سەهوو بەرێ.[٤٥٠]

ب–لەو فەرموودەیەدا کە (احمدو ابو داودو ابن ماجة) لە (مغيرة بن شعبة)وە گێڕاویانەتەوە دەردەکەوێ کە بابای نوێژکەر کە بەهەڵە تەحیاتی یەکەمی لەبیر

---

[٤٤٨] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٣ ص١٨٦١.

[٤٤٩] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٨٥٩.

[٤٥٠] بڕوانە: (العِدَّة على إحكام الأَحْكام شرح العُمْدَة) ج٢ ص٣٢٦-٣٢٧.

دەچێو هەڵدەستێتەوە بۆ ڕکاتی سێیەمو چوارەم، ئەگەر لەکاتی بیرکەوتنەوە یان ئاگادارکردنەوەیدا تەواو هەستابۆوە نابێ بگەڕێتەوە بۆ خوێندنی، بەڵام ئەگەر تەواو ڕاست نەبووبۆوە دەتوانێ بۆی بگەڕێتەوە.[451]

٤-لەکاتی کەوتنە گومانەوە لە ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژدا، وەك (ابو سعيد الخدري) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: (إذا شَكَّ أحدُكُم في صَلاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى؟! ثَلاثاً أَمْ أَرْبَعاً؟ فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ على ما اسْتَيْقَنَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أنْ يُسَلِّمَ، فَإنْ كانَ صَلَّى خَمْساً شَفَعْنَ لَهُ صَلاتَهُ وإنْ كانَ صَلَّى إتْماماً لِأرْبَعٍ، كانَتا تَرْغِيماً لِلشَّيْطانِ) رواه احمد ومسلم[452] وابو داود والنسائي.

واتە: هەرکات یەکێکتان لە نوێژەکەیدا کەوتە گومانەوە نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە؟ سێ ڕکات یان چوار؟ ئەوە باگومان لابەرێو لەسەر ئەو ئەندازەیەی کە دڵنیایە حیساب بکات (واتە لای کەمی بگرێ)، پاشان دوو سەجدە ببات بەر لەوەی سەلام بداتەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبێ ئەو دوو سەجدەیە ڕکاتەکانی نوێژەکەی دەکەنە جووت، وەئەگەر چوار ڕکاتی تەواوی کردبێ ئەوە دەبنە مایەی سەرشۆڕی شەیطان.

دیارە ئەو فەرموودانەی دیکەش کە بە تەعبیری دیکە[453] هاتوون هەمان مەبەستی ئەم فەرموودەیەیان هەیە، واتە: نوێژکەر لای کەمی بگرێ چونکە یەقینی هەیە کە ئەو ئەندازەیەی کردووە، وەدوایی لەچەند ڕکاتدا دڵنیایی بۆ دروست نەبووە بیانکاتو خۆی دڵنیا بکات. ئەمەش ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، وەك (نـەوَوِي) گوتوویەتی.[454]

---

[451] بڕوانە (فقه السنه) ج١ ص ٢٤٧.

[452] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٢ ص١٨٦٠.

[453] بۆ وێنە: (وإذا شَكَّ أحدُكُمْ في صَلاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوابَ فَلْيُتِمَّ عليه، ثُمَّ لِيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ) متفق عليه، بڕوانە (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٢ ص ١٨٦١.

[454] بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٢ ص ١٨٦٢.

## چوار وردە ئاگاداری

١-وەك پێشتریش گوتمان سەجدەكانی سەهوو ڕێك وەك سەجدەكانی نوێژ وان بۆ[٤٥٥] جیاوازی وە ئەوە كە هەندێك[٤٥٦] لەزانایان گوتویانە زیكری (سُبْحانَ مَنْ لايَنامُ ولايَسْهو) لە سەجدەكانی سەهوودا دەگوترێ، هیچ بەڵگەیەكی سوننەتی لەسەر نیەو ڕەتكراوەیە.

٢-بۆ چوونە سەجدەی سەهووش وەك سەجدەكانی دیكە (الله اكبر) دەكرێ.[٤٥٧]

٣-لەدوای سەجدەكانیش سەلام دانەوە هەیە.[٤٥٨]

٤-هەندێك لە زانایان دەڵێن:[٤٥٩] دوای دوو سەجدەكانی سەهوو سوننەتە تەحییات بخوێنێ ئەوجار سەلام بداتەوە، بەڵام پێم وایە قسەی (نَوَوي) ڕاستو بەجێیە كە گوتوویەتی: (وفي التَشَهُّد وَجْهانِ، أَصَحُّهُا لايَتَشَهَّدُ، لِأَنَّهُ لَمْ يَصِحَّ فيهِ عَنِ النبيِّ ﷺ شَيءٌ)[٤٦٠] واتە: هیچ شتێكی ڕاست دەربارەی تەحییاتی سەجدەی سەهوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەگێڕراوەتەوە. كەواتە: ڕای ڕاست تر ئەوەیە كە سەجدەی سەهوو تەحییاتی ناوێ.

## ١٦- كڕنووشی قوڕئان خوێندن (سجدة التلاوة)

**یەك:** لەلای زۆربەی هەرە زۆری زانایان سوننەتە كە بابای قوڕئانخوێن لەنوێژو غەیری نوێژیشدا هەروەها ئەو كەسانەی كە لەدوایەوە نوێژ دەكەن ئەگەر ئیمام بوو، یان گوێی لێ دەگرن ئەگەر لەغەیری نوێژدا بوو، لەكاتیخوێندنی یەكێك لەو ئایەتانەدا كە بە ئایەتی سەجدە ناسراون سەجدە بەرێ[٤٦١]. هەندێكیشیان ئەو

---

[٤٥٥] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص١٤٧.

[٤٥٦] بڕوانە (الفقه الاسلامي) ج٢ ص١٠٧.

[٤٥٧] وەك لە فەرموودەكان هاتووە: (..ثم كبرو سجد) متفق عليه، وەبڕوانە: (العدە) ج٢ ص٣٢٢.

[٤٥٨] وەك لە دەقی فەرموودەكاندا هاتووە: (..ثم سلم) متفق عليه.

[٤٥٩] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٣ ص١٤٩، ١٥٠.

[٤٦٠] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص١٤٦.

[٤٦١] (نووی) گوتوویەتی: ئەمە ڕای (مالك واوزاعیو شافعیو احمدو اسحاقو ابو ثورو داودو غەیری ئەوانیشە) بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص[illegible]

کڕنووش بردنە کە بە سەجدەی قورئان خوێندن ناسراوە بەفەرز دەزانن،[٤٦٢] (عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە: (أن النبي كان يقرأ القرآن، فيقرأ سورةً فيها سَجْدَةٌ، فيسجُدُ ونسجُدُ معهُ، حتى مايَجِدُ بعضُنا مَوْضِعاً لِمَكانِ سَجْدَتِهِ) متفق عليه[٤٦٣]، واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك قورئانی دەخوێند، جاری وابوو سوورەتێکی دەخوێند کە سەجدەی تێدا بوو، جا ئەو سەجدەی دەبردو ئێمەش سەجدەمان لەگەڵ دەبرد، هەتا جاری وابوو هەندێکمان شوێنی سەجدە لەسەر بردنمان دەست نەدەکەوت.

دیارە ڕای جەماوەریش بەهێزترە کە سەجدەی قورئان خوێندن بەسوننەت دەزانن چونکە چەند دەقێکی سوننەت هەن ئەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە:

ا-(زيد بن ثابت) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە سوورەتی (والنَّجْمِ إذا هَوَى) ی بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ خوێندووەو سەجدەی نەبردووە، وەك(بخاريو مسلمو ابو داودو نسائيو ترمذي) گێڕاویانەتەوە[٤٦٤].

ب-هەروەها (بخاري) گێڕاویەتەوە کە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ لەڕۆژێکی جومعەدا سوورەتی (النحل)ی لەسەر مینبەر خوێندووە هەتا گەیشتۆتە شوێنی سەجدە ئەوجار دابەزیوەو سەجدەی بردووەو خەڵکیش سەجدەیان لەگەڵ بردووە، بەڵام بۆ جومعەی داهاتوو هەمان سوورەتی خوێندووەو لەشوێنی سەجدەش سەجدەی نەبردووە، ئەوجار بەخەڵکەکەی گوتووە: (ياأَيُّها النّاسُ إنّا لَمْ نُؤمَرْ بِالسُّجودِ، فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ) واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە فەرمانمان پێ نەکراوە سەجدەی قورئان خوێندن بەرین، جا هەرکەس سەجدەی بردووە پێکاویەتی، ئەو کەسەش کە سەجدەی نەبردووە گوناحی ناگاتێ.

**دوو:** دیارە ئەو سەجدە بردنەش پلەو پایەو پاداشتێکی بەرزی هەیە، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: * (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسولُ الله ﷺ : أذا قَرَأَ ابنُ آدَمَ، السَّجْدَةَ فَسَجَدَ إعتزلَ الشيطانُ يَبْكي يقولُ: يا وَيْلَهُ: أُمِرَ ابنُ آدمَ بِالسُّجودِ فَسَجَدَ فلهُ الجَنّةُ، وأُمِرْتُ بِالسجودِ فأبَيْتُ فَلِيَ النّارُ) رواه مسلم واحمد وابن ماجة وغيرهم.

---

[٤٦٢] ئەمە ڕای (ابو حنيفه)یە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگو لاپەڕە.

[٤٦٣] بڕوانە (صحيح مسلم بشرح النووى) ج٣ ص١٨٩٢.

[٤٦٤] هەمان سەرچاوەو بەرگ لاپەڕە: ١٨٩٣.

واتە: کاتێك ئادەمیزاد – ئایەتی – سەجدە دەخوێنێ‌و سەجدە دەبات، شەیطان کەنار دەگرێ‌و دەگریەت، دەڵێ: داخ‌و خەفەت بۆ من ئادەمیزاد فەرمانی پێ کرا سەجدە بەرێ‌و سەجدەی بردو بەهەشتی پێ دەبڕێ، منیش فەرمانم پێ کرا سەجدە بەرم‌و سەرپێچیم کردو ئاگر – ی دۆزەخ –م پێ برا .

<u>سێ</u>: چۆنیەتی ئەو سەجدەیەش ئاوایە: دیارە یەك سەجدەیەو لەنوێژو غەیری نوێژیشدا پاش (الله اكبر) کردن دەبردرێ، وەبەپێی رای زۆربەی زانایان ئەگەر لەغەیری نوێژدا بێ هەردووك دەستیشی لەگەڵ (الله اكبر) کردنەکەدا بەرز دەکاتەوە[٤٦٥]،بۆ سەلام دانەوەش بەشێکیان بەپێویست یان سوننەتی دەزانن‌و، بەشێکیشیان دەڵێن: نەك فەرز سوننەتیش نیە[٤٦٦].

ئەمەش چەند دەقێك دەربارەی چۆنیەتی ئەو جۆرە سەجدە بردنە:

*(عن ابن عمر قال: كانَ رسولُ الله ﷺ يَقْرَأُ عَلَيْنا القُرآنَ فاذا بِالسَّجْدَةِ كَبَّرَ وَسَجَدَ وسَجَدْنا مَعَهُ) رواه ابو داود والبيهقي والحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين.

* (عن عائشة رضي الله عنها أَنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يَقولُ في سُجودِ القرآنِ باللَّيل: سَجَدَ وَجْهي لِلَّذي خَلَقَهُ وَصَوَرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبارَكَ اللهُ أَحْسَنَ الخالِقينَ).
رواه ابو داود والترمذي والنسائي وصححه الترمذي و(تبارك الله أحسن الخالقين) من رواية الحاكم والبيهقي وقال الحاكم هذه الزيادة على شرط الشيخين.[٤٦٧]

واتە: پێغەمبەر ﷺ لەکڕنووش بردنی شەوێدا دەیفەرموو: رووم سەجدەی برد بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردووەو نیگاری کێشاوە، وە بەهێزو توانای خۆی بیستن‌و دیتنی تێدا پەیدا کردووە، جا بەرزو پایەدارە خوای چاکترین بەدیهێنەر.

---

[٤٦٥] ئەمە رای (احمدو شافعی)و ژمارەیەکی زۆر لەزانایانە، بڕوانە: (المغنی والشرح الكبیر) ج١ ص٦٥١. وە(المجموع) ج٤ ص٧٢، ٧٣.

[٤٦٦] (شافعی) بەفەرزو (احمد) بەسوننەتی دەزانن، بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٧٥، وەبڕوانە (المغنی) ج١ ص٦٥١، ٦٥٢، بەلام (ابو حنیفەو مالك) دەڵێن: سوننەت نیە، بڕوانە: (الفقه الاسلامی) ج٢ ص١١٧.

[٤٦٧] بڕوانە: (المجموع ج٤ ص٧٣).

**چوار:** ئەو ئایەتو شوێنانەش لە قورئاندا کە سوجدەیان تێدا دەبردرێ بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە (عمرو بن العاص) دەیگێڕێتەوە پازدە (١٥)ن، جا ئێمە سەرەتا دەقی فەرموودەکەو پاشان شوێنەکانی سەجدە تێدا بردن بەڕیز دەنووسین، دواییش ڕاو بۆچوونی زانایان لەو بارەوە دەخەینە ڕوو:(عن عمرو بن العاص أَنَّ رسولَ الله ﷺ أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجْدَةً في القُرآن، مِنها ثلاثٌ في المُفَصَّلِ وفي الحَجِّ سَجْدتانِ) رواه ابو داود وابن ماجة والحاكم، والدارقطني وحسنه المنذري والنووي، **واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ پازدە (١٥) ئایەتی سەجدەی لەقورئانی بەسەردا خوێندۆتەوە، لەوانە سێ لە سوورەتە کورتەکانو دوو سەجدەش لەسوورەتی حەجدا.

**ئەو پازدە (١٥) شوێنەش ئەمانەن:**

١-(إن الذين عند ربك لايستكبرون عن عبادته ويسبحونه وله يسجدون) الاعراف/٢٠٦.

٢-(ولله يسجد من في السموات والارض طوعاً وكرها وظلالهم بالغدو والاصال) الرعد/١٥.

٣-(ولله يسجد مافي السموات ومافي الارض من دابة والملائكة وهم لايستكبرون) النحل/٤٩.

٤-(قل آمنوا به أولا تؤمنوا إن الذين أوتوا العلم من قبله اذا يتلى عليهم يخرون للاذقان سجداً) الاسراء/١٠٧.

٥-(اذا تتلى عليهم آيات الرحمن خروا سجداً وبكياً) مريم/٥٨.

٦-(الم تر أن الله يسجد له من في السموات ومن في الارض والشمس والقمر والنجوم والجبال والشجر والدواب وكثير من الناس وكثير حق عليه العذاب ومن يهن الله فماله من مكرم ان الله يفعل مايشاء) الحج/١٨.

٧-(ياأيها الذين آمنوا اركعوا واسجدوا واعبدوا ربكم وأفعلوا الخير لعلكم تفلحون) الحج/٧٧.

٨-(واذا قيل لهم اسجدوا للرحمن قالوا وما الرحمن أنسجد لما تأمرنا وزادهم نفورا) الفرقان/٦٠.

٩-(ألا يسجدوا لله الذي يخرج الخبء في السموات والارض ويعلم ماتخفون وما تعلنون) النمل/٢٥.

١٠-(إنما يؤمن بآياتنا الذين اذا ذكروا بها خَرُّوا سجداً وسبحوا بحمد ربهم وهم لايستكبرون) السجدة/١٥.

١١-(وظن داود أنما فتناه فآستغفر ربه وخر راكعاً وأناب). ص/٢٤.

١٢-(ومن آياته الليل والنهار والشمس والقمر لاتسجدوا للشمس ولا للقمر واسجدوا لله الذي خلقهن إن كنتم اياه تعبدون) فصلت/٣٧.

١٣-(فاسجدو لله وأعبدوا) النجم/٦٢.

١٤-(واذا قرئ عليهم القرآن لايسجدون) الانشقاق/ ٢١.

١٥-(واسجد وأقترب) العلق/١٩.

ئەمانە سەرجەم ئەو شوێنانەن کە زانایان دەڵێن سەجدەیان تێدا دەبردرێ لەکاتی خوێندنیاندا.

بیروڕای زانایانیش لەبارەی ئەو شوێنانەوە بەم شێوەیەیە کە لە خوارەوە دەینوسین:

ا) بەشێکیان دەڵێن پازدە (١٥)ن بەو جۆرەی کە نووسیومانن.[٤٦٨]

ب) بەشێکیشیان دەڵێن چواردە (١٤)ن کە ئەمە ڕای زۆربەیانە، بەڵام لەسەر ئەو چواردە (١٤) شوێنە ڕایان جیا جیایە.[٤٦٩]

ج) هەندێکیشیان دەڵێن یازدە (١١)ن، کە ئەمە بێ هێزترین ڕایانە.[٤٧٠]

ئنجا ئەو دوو شوێنەی کە زیاتر جێی ڕاجیاجیایی زانایانن سەجدەی دووەمی سووڕەتی (الحج) -٧٧-و ئەو سەجدەیەیە کە لە سووڕەتی (ص) -٢٤- دایە، کە زۆربەیان سەجدەی دووەمی سورەتی حەج حیساب دەکەن[٤٧١]، بەڵام بۆ سەجدەکەی سورەتی (ص) زۆربەیان بەسەجدەی سوپاسگوزاری (سجده الشكر)ی دادەنێن[٤٧٢].

کەواتە لەنێوان ئەو دوو ڕایەدا کەباسی چواردەو پازدە دەکەن جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ نیە، چونکە جیاوازی‌یەکە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ حیساب کران و نەکرانی سەجدەکەی سورەتی (ص)، جا ئەوانەش کە حیسابیان نەکردووە گوتوویانە سەجدەی سوپاسگوزاری‌یە نەك قورئان خوێندن، ئەوانەیش کە حیسابیان کردووە گوتوویانە مادام دەق (نص) هەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو سەجدەیەی بردووە واچاکە ببرێ[٤٧٣]،واتە لەنوێژدا ئەگەر نا لەغەیری نوێژدا زانایان لەسەری یەکدەنگن.

دیارە ئەو ڕایەش کە دەڵێ یازدە (١١)ن، هیچ کام لەسەجدەی (ص)و سەجدەکانی (النجم)و (الأنشقاق)و (العَلَق)ی حیساب نەکردوون، بەڵام بێگومان ئەو ڕایە زۆر بێ هێزەو ڕیزپەڕ (شاذ)یشە[٤٧٤]، چونکە وەك (نووی) گوتوویەتی: ئەو دەقەی کە (ابن عباس) لەو بارەوە هێناویەتی کە دەڵێ: **(أَنَّ النبيَّ ﷺ لَمْ يَسْجُدْ في شَيءٍ من المُفَصَّل مُنْذُ تَحَوَّلَ الىٰ المَدينَةِ)** رواه ابو داود، بەڵێ ئەم دەقە (سند)ەکەی بێ هێز (ضعیف)ەو (بیهقي)و غەیری ویش بەبێ هێزیان داناوە[٤٧٥].

---

[٤٦٨] ئەمە ڕای (اسحاق و احمد)ە لەریوایەتێکیدا، بڕوانە، (المغني) ج١ ص٦٨٤، وەڕای هەندێك لەشافعی‌یەکان و هەندێك لەزانایانی دیکەشە، بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٧٠، وە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج٢ ص١٩٠٣.

[٤٦٩] زۆربەی شافیعی‌یەکان سەجدەی (ص) حیساب ناکەن، بەڵام (ابو حنيفه) ئەوی دووەمی حەج حساب ناکات و ئەوەی (ص) حیساب دەکات.

[٤٧٠] ئەمەش ڕای باوی (مالك)و کۆن (قدیم)ی شافیعی‌یە، بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٧٠.

[٤٧١] بۆ وێنە: (مالك و شافعي و احمد و اسحاق و ابو ثور و داود) بڕوانە (المجموع) ج٤ ص٧٠.

[٤٧٢] بڕوانە: (المغني) ج١ ص ٦٤٨، ٦٤٩، وە (المجموع) ج٤ ص٧٠.

[٤٧٣] ئەمە ڕای حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکانە بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج٢ ص١٢٠.

[٤٧٤] بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ج٣ ص١٩٠٣، وە (المغني) ج١ ص ٦٤٨.

[٤٧٥] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٦٧.

وەبێگومـان ئـەو فـەرمووده ڕاسـت (صحيـح)انـەی کـە (ابـو هريـرة) لـەو بـارەوە دەیانگێڕنەوە ناگونجێ بەدەقێکی ئاوا بخرێنە دواوەو نادیدە بگیرێن، لەحاڵێك کە لەزاتی خۆیاندا بەهێزترن‌و یاسای: ئیسپاتکەر پێش نەفی کەر دەخرێ[476] (المثبت مقدم على النافي) پشتگیریانە، یەکێك لەو فەرموودانەش کە (ابو هريرة)یە خوا لێی ڕازی بێ‌و ڕازیشی‌بکات لەو بارەوە گێڕاونیەوە ئەم فەرمودەیەیە:

* **(عن أبي هريرة أنه قال: سَجَدَ رسولُ اللهِ ﷺ في "إذا السماء انْشَقَّتْ" و "إقرأْ بِاسمِ رَبِّكَ")** رواه مسلم.

ئنجـا پێویسـتە ئـەوەش بگوتـرێ کـە بـەندە ئـەو ڕایـەی شـافیعی‌یەکان[477] و حەنبەلی‌یەکان[478] کە دەڵێ: "سەجدەی سوورەتی (ص) سەجدەی سوپاسگوزاری‌یەو سوننەتە لەدەرەوەی نوێژ ببرێ" هەتا ئێرە بەپەسەند دەزانم، بەڵام کە دوایی دەڵێ: (تحرم في الصلاة على الاصح وتبطلها) واتـە: لـەنوێژدا بـەپێی قسـەی ڕاسـت تـر قەدەغەیەو پێی بەتاڵ دەبێتەوە!! زۆرم پێ ڕایەکی سەیرو بێ هێزیشە، چونکە مادام لە فەرموودەی پێغەمبـەردا ﷺ هـاتووە کـە ئـەو سـەجدەیەی لـەنوێژدا بـردوە. ئەگـەر گریمان سوننەتیش نـەبێ دیـارە هـەر دروسـتەو زۆر لـەوە دوورە نوێـژی پـێ بـەتاڵ ببێتەوە.

ئەو دەقانەش کە ئەوە دەگەیەنن کە بەلای کەمەوە سەجدە بردن لەکاتی خوێندنی سورەتی (ص)دا لەنوێژو دەرەوەی نوێژدا دروست (جائز)ە، ئەمانەن:

* **(عَنْ ابن عبـاس أنَّ النـبيَّ ﷺ سَـجَدَ في (ص) وقـال: سَـجَدَها داود تَوْبَـةً وَنَحْـنُ نَسْجُدُها شُكْراً)** رواه النسائي، **واته:** پێغەمبەر ﷺ لەخوێندنی سورەتی (ص)دا سەجدەی بـردو فـەرمووی. داوود وەك تۆبـەکردن ئـەو سـەجدەیەی بـردووەو ئێمـەش وەك سوپاسگوزاری دەیبەین.

---

[476] چونکە (اثبات) بەڵگەی زانیاری هەبوونەو (نفی) بەپیچەوانەوەیە.

[477] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٦٨، هەرچەندە ڕایەکی دووەمیشیان هەیە کە نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

[478] بڕوانە: (الفقه الاسلامی) ج٢ ص١٢٠، وەبڕوانە: (المغنی) ج١ ص٦٥٥، کە ئەوانیش دوو ڕایان لەو بارەوە هەن.

* (عن ابن عبّاسٍ قال: ﷺ لَيْسَتْ مِنْ عَزائِمِ السُّجودِ وَقَدْ رأَيتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْجُدُ فيها) رواه البخاري.

* ئەو فەرموودەیەی کە پێشتر هێنامان کە (عمرو بن العاص) گوتوویەتی پێغەمبەر ﷺ پازدە سەجدەی لەقورئانێ فێرکردم.

ئاشکراشە کە هیچ کام لەم دەقانە سەجدە بردنی سورەتی (ص)یان تایبەت نەکردووە بەغەیری نوێژەوە، کەواتە وەك باقی سەجدەکان گشتی‌یە بۆ هەموو حاڵەتەکان.

**پێنج**: زۆربەی[479] هەرە زۆری زانایان دەڵێن مەرجەکانی سەجدەی قورئان خوێندنیش هەمان مەرجەکانی نوێژن بێ کەم و زیاد، هەندێکیشیان رایان وایە کە ئەو سەجدەیە پێویستی بەدەست نوێژ ناکات، بەڵام رایەکەیان بێ هێزەو بەڵگەیەکی وایان بەدەستەوە نیە ئیسپاتی ئەو دەعوایەی پێ بکرێ.[480]

## ١٨- سەجدەی سوپاسگوزاری (سجدة الشكر)

زۆربەی زانایان سەجدەی سوپاسگوزاری بەسوننەت دەزانن، ئەویش بریتی‌یە لەیەك سەجدە بردن بۆ خوای پەروەردگار لەکاتی پەیدابوونی چاکەو نیعمەتو خێرو خۆشی‌یەك یان لاچوونی گرفتو بەڵاو تەنگانەیەکدا، دیارە هەندێکیشیان بەموباح یان تەنانەت بە ناپەسەند (مکروە)یشی دەزانن![481]

وە زۆربەی زانایان دەڵێن مەرجەکانی ئەو سەجدەیەش و چۆنیەتی‌یەکەی هەمان مەرج و چۆنیەتی سەجدەکانی قورئان خوێندنە،[482] هەندێکیشیان دەڵێن ئەو مەرجانەی ناوێن[483].

---

[479] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص٦٥٠، کە گوتوویەتی: (ولا نَعْلَمْ فيهِ خِلافاً إلاّ ماروي عن عثمان رضي الله عنه في الحائِضِ تَسْمَعُ السَّجدَةَ تُومِيء بِرأسِها).

[480] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٣ ص١٢٧.

[481] (نووي) گوتوویەتی: سەجدەی شوکر - جگە لە شافیعي - مەزهەبو ڕای (اسحاق و ابو ثورو ليث و احمدو مالك و داود) ە هەروەها (مالك) لە ریوایەتێکدا. (بڕوانە: المجموع ج٤ص٧٨) بەڵام (ابوحنيفة و مالك) لەڕای باو (مشهور)ی‌دا بەموباح یان ناپەسەند دەزانن، بڕوانە (المجموع) ج٤ ص٧٨.

[482] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص[illegible]

ئاشکراشە کە ڕای زۆربە ڕاستو پەسەندە، چونکە کۆمەڵێك دەقی ڕاستو ڕاشکاو (صحيح وصريح)ی سوننەتیان بەدەستەوە هەنو بێگومان هیچ جۆرە خواپەرستییەکیش بەبێ دەقێکی شەرعی ڕێكو ڕەوان ئیسپاتی شەرعی بوونی خۆی ناگات.

دیارە زۆربەی زانایانیش دەڵێن سەجدەی سوپاسگوزاری دەبێ هەر لەدەرەوەی نوێژ بێت، تەنانەت بەشێکیان دەڵێن ئەگەر لەنوێژدا سەجدەی ناوبراوی برد، مەگەر بەهۆی نەزانینو لەبیرچوونەوەوە بێت ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە[٤٨٤]، بەڵام دەڵێن: سەجدەی سووڕەتی (ص) لەو حوکمە هەڵاوێرراوە چونکە لە قورئاندایەو دەشوبهێتە سەجدەکانی قورئان خوێندن.[٤٨٥]

ئەمەش چەند دەقێك لەبارەی شەرعی بوونو سوننەت بوونی سەجدەی ناوبراوەوە:

* (**عن أبي بكرة رضي الله عنه أَنَّ النبيَّ ﷺ كان إذا أَتاهُ أَمْرٌ يَسُرُّه أَوْ بُشِّرَ بِهِ خَرَّ ساجِداً شُكْراً للهِ تَعالَى**) رواه ابو داود وابن ماجة والترمذي وحسنه، ورواه احمد بلفظ آخر.

**واتە:** کاتێك هەواڵێکی دڵخۆشکەر بەپێغەمبەر ﷺ دەگەیشت یان موژدەی شتێکی دڵخۆشکەری پێ دەگەیشت لەپەڕوو بەسەجدەدا دەکەوت وەك سوپاسگوزاری بۆ خوای بەرز.

* (عبدالرحمن بن عوف) خوا لێی ڕازی بێ کە جارێکیان لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دا بووەو پێغەمبەر ﷺ لەنێو باخێکی خورمادا سەجدەیەکی دوورو درێژی بردووە، پاشان وەك ڕوونکردنەوەی هۆی سەجدە بردنەکەی فەرموویەتی: (**إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلامُ قالَ لِي: أَلا أُبَشِّرُكَ؟! إِنَّ اللهَ عَزَّوَجَلَّ يَقُولُ لَكَ: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ صَلَّيْتُ عَلَيْهِ، وَمَنْ سَلَّمَ عَلَيْكَ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَسَجَدْتُ للهِ عَزَّوَجَلَّ شُكْراً**) رواه احمد والحاكم وقال صحيح على شرط الشيخين.

---

[٤٨٣] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٣ ص١٢٩.

[٤٨٤] بڕوانە: (المجموع) ج٤ ص٧٧، وە: (المغني...) ج١ ص٦٥٥.

[٤٨٥] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج١ ص٦٥٥.

واتە: جوبرائیل پێی گوتم: ئایا موژدەت بدەمێ؟ بێگومان خوای زاڵو پایەبەرز پێت دەفەرموێ: هەرکەسێك صەڵەواتت لێ بدا صەڵەواتی بۆ دەنێرم، وەهەرکەسێك سەلامت لێ بکات سەلامی لێ دەکەم، جامنیش سەجدەم بۆ خوای زاڵو پایەبەرز برد لەڕووی سوپاسگوزاری‌یەوە.

* هەروەها سەجدەی سوپاسگوزاری بردن لەژمارەیەك لەهاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خواوە ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ گێڕراوەتەوە بۆ وێنە[٤٨٦]:

ا) (سعید بن منصور) گێڕاویەتەوە کە (أبوبکر) خوا لێی ڕازی بێ کاتێك هەواڵی کوژرانی (مُسَیلِمَةَ الکذّاب)ی بۆ هات سەجدەی برد.

ب) (احمدو مسلمو ابو داود) گێڕاویانەتەوە کە کاتێك (عليٍ) خوا لێی ڕازی بێ زانی کە (ذو الثدية) لەنێو کوژراوەکانی نەهرەوان دایە سەجدەی برد.

ج) (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە کە (کَعْب بنِ مالِك) کاتێك هەواڵی تۆبە وەرگیرانی پێ گەیشت سەجدەی برد.



[٤٨٦] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٣ ص١٢٩، ١٣٠، هەروەها بڕوانە: (المغني والشرح الکبیر) ج١ ص٦٥٥.

# خاڵی هەشتەم: بەرهەمی نوێژ بەرپاکردن

خوێنەری بەرێزو خۆشەویست! خوا یاربێ لەم خاڵەدا کە خاڵی کۆتاییەو بەم خاڵە کۆتایی بەتوێژینەوەمان دەربارەی یەکەمین و گەورەترین دروشمەکانی خواپەرستیی (عبادة) دێنین هەوڵ دەدەین کە لەچەند برگەیەکی کورت و پوختدا گرنگترین بەرهەمەکانی نوێژ بخەینە ڕوو، هەرچەندە لەباسی گرنگیی و پلەو پایەی نوێژیشدا شتێکمان لەو بارەوە باس کرد بەڵام بێگومان نوێژ زۆر لەوە گەورەترە کە لە باسێك و دووانێدا بگونجێ خێرو بێرو بەرهەمە هەمەجۆرە ماددیی و مەعنەوی و دنیایی و قیامەتییەکانی بخەینە ڕوو.

١- پەیمان نوێ کردنەوە: بابای نوێژکەر کە لە هەموو ڕکاتێکی نوێژەکەیدا ڕوو لەخوای پەروەردگارو بەخشندەی دەکات و دەڵێ: بەس تۆ دەپەرستین و یارمەتیش تەنیا لەتۆ دەخوازین (إياك نعبد وإياك نستعين) ئەوە لەڕاستیدا پەیمان و بەڵێنی بەندایەتی لەگەڵدا نوێ دەکاتەوە کە جگە لەخوای تاك و پاك و بێ وێنە هیچ پەرستراوێك و هیچ پشت پێ بەستراوو هانا وەبەر براوێکی نەبێ، هەروەها کۆمەڵی مسوڵمان کە ئەو ڕستە بەرزو پیرۆزە ڕوو بەخوای خۆیان دەڵێن بڕیار تازە دەکەنەوە لەسەر ئەوە کە غەیری خوا بە پەروەردگارو فەرمانڕەواو سەروەرو غەیری ڕێبازەکەی بەبەرنامەی ژیان و گوزەران و غەیری پێغەمبەرەکەی و جێنشین و میراتگرە ڕاست و ڕەسەنەکانی بەڕابەرو چاوساغ و پێشەوا، نەزانن و نەزانن!

٢- دڵ و دەروون ڕوون بوونەوەو گەش بوونەوە: لەسۆنگەی ئەوەوە کە یادی خواو خواپەرستیی خۆراك و بژێوی دڵ و گیانی ئینسانەو، دڵ و دەروونێك خۆری خواپەرستی تێدا هەڵنەهاتبێ زیندان و تاریکستانە، وە لەسۆنگەی ئەوەوە کە یادی خوا مایەی ئۆخژنی ئارامیی و دەروون و دڵدامرکانە: (أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) الرعد/٢٨، وەنوێژیش گەورەترین و بەرزترین جۆری بەندایەتی و یادی خواکردنە: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) طه/١٤، بۆیە بابای نوێژکەر هەمیشە دڵ و دەروونی وەك ئاوێنەی مشت وماڵ کراو سپی و ڕوونەو، وەك باخی تەڕو پاراو گەش و جوانە. بەتایبەت لەگەرمەی خواپەرستیی و نوێژو طاعەتدا بەیەکجاری شوعلەوەر دەبێ و دەبێتە

چراخان، یەکێك لە حیکمەتەکانی نوێژی بەکۆمەڵیش ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵە نوێژکەرە دڵـەکانیان وەك کۆمەڵـە چرایـەکی بەشـۆق ڕۆشـنایی و تیشـکێکی زۆر پـەیدا دەکـەن لەئەنجامی کۆبوونەوەو عەکس کردنەوەی ڕووناکی‌یان بۆ یەکتر، کە ئەمەش دەبێتە داباریـنی ڕەحمەت و بەرەکەتی خواو دابەزینی فریشتەکان.

٣- ئـیرادەو عـەزمو هەڵبڕانـەوەو تیژبوونـەوە: بێگومـان بابایـەك خـۆی بەبەندەو فەرمانبەری خوا بزانێ و تەنیا خوا بەپەرستراوو گەورەو سەروەری موتڵـەق و پشتیوانی خۆی دابنێ، هەمیشەو دایم بەبڕشت و چوست و چالاك دەبێ، وەئەگەر جار جاریش لەژێر کاریگەری تین و تەوژمی ئێش و ئازارو دەردەسەری‌دا تیغی ئـیرادەی کول و عەزمی شل بێ، بەهۆی نوێژکردنـەوە وەك تیغـی تـازە دەمـەزەرد کـراو تیـژ دەبێتەوەو هەڵدەبڕێتەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات تووشی ناڕەحەتی و سەغڵەتی ببوایە بـەهۆی گرفتـاری و ئێـش و ژان و موعاناتـەکانی ڕێی دینداری‌یـەوە پەنای دەبردە بەر نوێژو طاعەت: (عن حذيفة رضي الله عنـه قـال: كـانَ ﷺ إذا حَزَبَـهُ أَمْـرٌ صَلّى) رواه أحمد وابو داود.

٤- بـیرو زەیـن کۆبوونـەوە: زاناو شارەزایانی دەروونناسـی نوێ (علم النفس الجديـد) دەڵێن: هـەبوونی توانا لەسـەر بیر چەسپاندن (تركيز الذهن) بنـەڕەتی‌ترین هۆی سەرکەوتن و بەرەوپێش چوونی ئینسانە لەژیانی‌دا. وە دەڵێن: گـەورەترین هـۆی هەڵکەوتنی بلیمەتـەکان توانا هەبوونیانە لەسـەر بـیر کۆکردنـەوەو چەسـپاندنی زەیـن لەسەر ئەو مەبەستەی بیانەوێ[٤٨٧]، دیارە تاقە هۆیـەکیش کـە دەبێتـە مایـەی زەیـن کۆبوونـەوەی ئینسـان ئەوەیە کە مەیل و ئـارەزوو بـۆ خۆشەویسـتی و بایـەخ پێدانـی لەدڵدا هـەبێ بەرانبـەر بـەئامانج و مەبەسـتێکی دیـاری کـراو[٤٨٨]، جـا بێگومـان بابـای نوێژکەر بەهۆی نوێـژو خواپەرستی‌یەکەیەوە هـەموو ئەو هـۆو پێداویسـتی‌یانەی بـۆ دابین کراون. بەتایبـەتی کەسانێك کە نوێژەکانیان بـەو جـۆرو چۆنیەتی‌یـە شـەرعی‌یە ئـەنجام دەدەن کـە خـوا فـەرمانی پـێ کـردوە لەسـایەی ئـەو جـۆرە نوێژکـردن و خواپەرستی‌یەیانەوە دەگەنە لووتکەی هەرە بڵندی زەین کۆکردنەوەو بیر چەسپاندن.

---

[٤٨٧] بڕوانە: (یادی خودا) ب١ لاپەڕە ١٦٩، لە: (روح الصلاة) ص٣١ عفيف عبدالفتاح.

[٤٨٨] سەرچاوەی پێشوو [illegible] ١٦٦، [illegible] (أصول علم النفس) ص[illegible] د. أحمد عزت راجح.

٥- لەتاوان پاك بوونەوە: خوێنەری خۆشەویست! ئەگەر لەبیرت مابێ لەبەشی یەکەم، باسی سێیەم (شوێنەوارو بەرهەمە گرنگەکانی خواپەرستی) لەخاڵی سێیەمدا (خواپەرستی دەروونی مرۆڤ دەشواو چڵكو چەپەری گوناحو خراپە لادەبات). ئەو فەرموودەیەمان هێنایەوە کە (بخاري‌و مسلم) لەپێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویانەتەوەو نێوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە هەر کەسێك پێنج نوێژە فەرزەکان - بەشێوەیەکی شەرعی‌یانەی ڕێكو پێك - بکات، وەك ئەوە وایە ڕۆژێ پێنج کەرەتان خۆی بەئاوێ بشوات، دیارە هەم بابای نوێژکەرو هەم بابای خۆشۆریش هیچ کامیان چڵکیان پێوە نامێنێ. ئەمیان چڵکی ماددی‌و ئەویان چڵکی مەعنەوی تاوان‌و خراپەکان.

٦- لەکۆڵ بەدکاری بوونەوە: خوای کاربەجێ‌و زانا دەربارەی نوێژی ڕاستەقینە فەرموویەتی: (أُتْلُ ماأُوحِيَ اليكَ مِنَ الكِتابِ وأَقِمِ الصَّلاةَ إنَّ الصَّلاةَ تَنْهىٰ عَنِ الفَحْشاءِ والمُنكَرِ...) العنكبوت/٤٥.

واتە: ئەوە بخوێنە کە لەکتێب - ی خوا - پێت ڕاگەیەنراوە، وەنوێژ بەرپا بکە، بێگومان نوێژ ڕێگری لەهەر قسەو ڕەفتارێکی ناقۆڵاو[٤٨٩] ناپەسەند دەکات.

ئنجا ئەگەر کەسێکیش لێرەدا وەدەنگ بێت‌و بڵێ: ئەوە ڕاست نیە چونکە من سەدان نوێژکەرت بۆ دەژمێرم کە لە قسەو کرداری بەدو ناقۆڵا ناپرینگێنەوە! لەوەڵامی‌دا دەگوترێ: بێگومان خوای شارەزاو پەنهان بین مەبەستی لە (نوێژ) نوێژی ڕاستەقینەیە کەخاوەنەکەی هەموو مەرجە ڕواڵەتی‌و دەروونی‌یەکانی تێدا هێنابێتە دی وەك لە قورئان‌و سوننەتدا ڕوون کراونەوە، وە لە ڕاستی‌دا هەر نوێژێك بەئەندازەی تێدا نەمانی ئەو مەرجە شەرعی‌یانەی کە بۆی دانراون لەنوێژ دەشۆرێ.

٧- گرەو لەشەیطان بردنەوە: خوێنەری بەڕێز! لەیەکێك لە باسەکانی‌بابەتی یەکەم‌دا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە شەیطان بەهەرەشەو گورەشەوە دەربارەی ئادەم‌و نەوەکانی گوتوویەتی: (لەپێشیانەوەو لەدوایانەوەو لەلای ڕاست‌و چەپیانەوە بۆیان (واتە بۆ ئادەم‌و نەوەکانی) دەچم‌و هەوڵی سەرلێ تێکدان‌و لەخشتەبردنیان دەدەم‌و وایان لێ دەکەم زۆربەیان سپڵەو ناسوپاس بن).

---

[٤٨٩] هەر کام لە: (مفردات الفاظ القرآن)ی (راغب الاصفهاني) ص٦٢٦ و ص٨٢٣، وە: (المعجم الوسيط) ص (٦٧٤، ٩٥٢) گوتوویانە: (فاحشة، فُحْش) هەر قسەو کردارێکە کە لەخراپی‌دا ئەوپەڕی گرتبێ، (منکر)یش هەر قسەو ڕەفتارێکە کە عەقڵ‌و شەرع پێیان ناپەسەند بێ.

دیاره لەحاڵێکی ئاواشدا ئادەمو وەچەکەی لەبەردەم هێرش و پەلاماری ئیبلیس و سەربازەکانی‌دا تەنیا هەردووك لای (سەرێ)و (خوارێ)یان بەدەستەوە ماون کە سەنگەری بەرگری لەخۆکردنیان تێدا لێ بدەن. ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە نوێژ هەرکام لە سەجدەو پارانەوەی زۆر بەخەست و خۆڵی تێدان، مانای وایە ئێمەی ئادەمیزاد بەهۆی نوێژکردنەوە دەتوانین بەرهەڵستی پیلان و فێڵ و تەڵەکەی شەیطان بکەین و لەوەدا کە گوتوویەتی: لەخشتەیان دەبەم و گیرۆدەی ناسوپاسی‌یان دەکەم! وەدرۆی بخەینەوەو گرەوی لێ ببەینەوە.

٨- وەرزش و ساغ بوونەوە: زاناو شارەزاو پسپۆرانی بوارە جیاجیاکانی پزیشکی و جەستەناسی دەڵێن: وەرزش و جووڵان شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ جەستەی ئینسان، وەهەر جەستەیەك بۆ ماوەیەکی زۆر نەجووڵێ و کارو چالاکی نەبێ هێدی هێدی ماسوولکەکانی دەپووکێنەوەو دەمارەکانی خاو دەبنەوەو سەرجەم ئەندامەکانی بەرەو لاوازی و بێ تینی دەچن، وەدەڵێن: چاکترین جۆرە وەرزشیش ئەوەیە کە ژمارەیەکی زیاتر لەماسوولکەو جومگەو دەمارەکانی جەستەی تێدا بجووڵێن!

جا هەڵبەتە وەك ڕوون و بەرچاویشە بابای نوێژکەر بەهۆی نوێژەکەیەوە - بەمەرجێك بەشێوەی شەرعی خۆی ئەنجامی بدات - چاکترین وەرزش دەکات چونکە تاقە یەك ماسوولکەو جومگەو دەماریش لەلەشدا نامێنێ کە نەجووڵێ، هەر لەجومگەکانی گەردن و بڕبڕەی پشت و دەست و لاقەوە بیگرە هەتا جومگە وردیلەکانی پەنجەکانی دەست و پێ! وەهەر لە ماسوولکەکانی مل و شان و قۆڵ و پیلانەوە بگرە هەتا ماسوولکەکانی لەپی دەست و پێیەکانیش!

٩- ڕازانەوەو پاکبوونەوە: ئاشکرایە کە یەکێك لەمەرجە پێویست و بنەڕەتییەکانی نوێژکردن - وەك پێشتر باسمان کرد - پاك و خاوێنی‌یە هەم لەجەستەو[490] هەم جل و بەرگ و هەم لەشوێن و جێگای نوێژ تێداکردنیشدا! ئاشکراشە کە پاکی دەروون و خاوێنی ڕواڵەت دوو شتی پێکەوە گرێ دراوو پەیوەستن، هەر

---

[490] لەپیسی حوکمی کە بێ دەست نوێژی گچکەو گەورەیە، وەلەپیسی عەینی کە هەر شتێکە بەپیس (نَجِسْ) دابنرێ و [illegible] پێوە ببێ

بۆیەش خوای کاربەجێ پەشیمان بوونەوەو خاوێن بوونەوەی پێکەوە باس کردوون: (ان الله يحِبُّ التوّابين ويحبُّ المتطهّرين) البقرة/٢٢٢، واتە: بەڕاستی خوا تۆبەکەران و خۆپاککەرەوانی خۆش دەوێن.

دەربارەی ڕازاندنەوەش بۆ کاتی نوێژو شوێنی نوێژ فەرموویەتی: (يابني آدم خُذوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ...) الاعراف/٣١. کە زۆر لەتوێژەرەوانی قورئان وشەی (مسجد)یان لێرەدا بەنوێژ (صلاة) تەفسیر کردووە[491].

بەڵێ لەڕاستیدا نوێژ مایەی پاکبوونەوەو ڕازاندنەوەی دەرو دەروونی ئینسانە، هەروەك مایەی خاوێن بوونەوەو جوانیو ڕەونەقی ڕواڵەتو پەنهانی کۆمەڵگای مسوڵمانیشە.

١٠- پێکەوە جۆشدرانو ساغ بوونەوە: بەحوکمی ئەوەی کە نوێژی بەکۆمەڵ بەبیستو پێنج یان بیستو حەوت پلە لەنوێژی تەنیا چاکترو بەرزترە، وەئەگەر فەرزی عەینیش نەبێ بەلای زۆر لە زانایانەوە فەرزی کیفایەیە وەك پێشتر خستمانە ڕوو، ئەنجام درانی پێنج نوێژە فەرزەکان دەبێتە هۆی پێکەوە کۆبوونەوەی خەڵکی هەر گەڕەكو دێیەك لەهەر شەوو ڕۆژێکدا پێنج کەڕەتان، کە بێگومان ئەو پێنج جار کۆبوونەوەو یەکتر دیتنەش دەورێکی گەورەو گرنگی هەیە لەپێکەوە جۆشدانی مسوڵمانانو ئاگاداریو ئاشنابوونیان بەدەردو ئێشو ژانو موعاناتی یەکتر، کە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی وەك ئەندامەکانی جەستەیەك بن بۆ یەکتر، ئاشکراشە کە کۆمەڵگای ئاوا هیچ درزو کەلێنێکی تێ نابێو هیچ دوژمنو ناحەزێك زەفەری پێ نابات.

١١- درەوشانەوەی برایەتیو یەکسانی: ڕێچکەو بیرۆزە جۆراوجۆرەکان بەڕاست یان بەدرۆ زۆر بانگەشە بۆ یەکسانیو نەبوونی فەرقو جیاوازیو بەرزیو نزمی لەنێوان ئینسانەکاندا دەکەن، بەڵام ئەو درووشمە بریقەدارانەیان زیاتر هەر بەگوتراویو نوسراوی دەمێننەوەو لەسەر ئەرزی واقیع نابینرێن، بەڵام ئیسلام لەزۆر بوارانددا بەشێوەیەکی کردەییو بەرچاوو واقعییانە ئەو یەکسانیو وەك یەك بوونی

[491] بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) القرطبي، ج٤ ص١٢٧، ١٢٨، وەبڕوانە (الأساس في التفسير) ج٤ ص١٨٨٧.

بەندەکان بەرجەستە دەکات بۆ وێنە: ڕۆژووی ڕەمەزان، حەجی ماڵی خوا - بەتایبەتی لەکاتی پۆشینی بەرگی ئیحرام دا - وەنوێژی بەکۆمەڵ.. کە دەبینین لەنوێژی بەکۆمەڵدا سەرجەم مسوڵمانان بەهەموو ڕەنگو زمانو چینو توێژو ئاستەکانیانەوە لەپادشاوە هەتا گەداو لە سەرکردەوە هەتا سەربازو لەزاناوە هەتا نەخوێندەوارو لەپیرەوە هەتا منداڵ.. تێکڕا شان بەشانی یەکتر ڕادەوەستنو پاڵ وێك دەدەنو ڕوو لە یەك قیبلە دەکەنو مل بۆ فەرمانی پێشەوا (إمام)ێك کەچ دەکەنو سەجدەو ڕکووع بۆ یەك تاقە پەرستراو دەبەن!! کە بێگومان برایەتیو یەکسانیو بێ فەرقو جیایی بەجوانترینو واقیعی ترین شێوەی لەنێو کۆمەڵگای مسوڵماناندا تەجەللا دەکات.

١٢- ڕاهاتن بەڕێكو پێکییەوە: یەکێك لەو شتانە کە لەنوێژی بەکۆمەڵدا پێویستن، ڕێكو پێك ڕاوەستانو پاڵ لێکدانی نوێژکەرانە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ) متفق علیە، واتە: بێگومان ئەگەر ڕیزەکانتان ڕێكو ڕاست نەکەن خوا ڕووەکانتان لەیەك وەردەگێڕێ.

ئاشکراشە ئەو ڕێكو پێك ڕاوەستانو پاڵ بەیەکترەوە دانەی نوێژکەران دەبێتە مایەی ڕاهاتنیانو بارگرتنیان بەیاساو ڕێكو پێکییەوەو دوور کەوتنەوە لەئاڵۆزیو پەشێویو بێ سەرو بەری.

١٣- خووگرتن بەفەرمانبەرییەوە: بەدوای پێشەوا (امام)دا جمو جوڵ کردنو لێ پێش نەکەوتنەوەی لەکاتی ڕکووعو سەجدەو هەستانو دانیشتندا یەکێکی دیکەیە لەمەرجە گرنگەکانی نوێژی بەکۆمەڵ، وە تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەڕەشە توندە لەوانە دەکات کە پێش ئیمام دەکەونەوە: (أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ..؟!) متفق علیە، واتە: ئایا یەکێکتان کە بەر لە ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە لەوە ناترسێ خوا سەری بگێڕێ بەسەری کەر؟!

ئاشکراشە کە ئیسلام کاتێك ڕازی نەبێ مسوڵمانان لەنوێژەکەیاندا ناڕێكو پێك بنو بێ یاسایی بکەنو، بۆ نوێژەکەیان پێشەواو سەرکردەیان لەسەر پێویست بکاتو، فەرمانیشیان پێ بکات کە نابێ لەفەرمانی لابدەن، بۆ غەیری نوێژیشیان چاکترو زیاتر ڕێكو پێکیو پێشەواو سەرکردە هەبوونو لەفەرمان دەرنەچوونییان لەسەر پێویست دەکات!

*لەكۆتاييشدا دەڵێم:* لە ڕاستی‌دا نوێـژ قوتابخانەیەكـە ئینسـانی مسـوڵمان‌و كۆمەڵی مسوڵمان تێیدا فێری زۆر شت دەبێ‌و گەلێك بەرهەم‌و خێرو بێری دەستگیر دەبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەو جۆرو چۆنیەتی‌یە ئەنجام بدرێ‌و بەرپا بكرێ كە خوای پـەروەردگارو كاربـەجێ فـەرمانی پـێ كـردوەو پێغەمبـەری سـەروەرمان ﷺ پێشـانی داوین‌و ڕەنگی بۆ ڕشتووە.

جا خوا بەلوتف‌و كەڕەمی بێ سنووری خۆی بمانگێڕێ بەو بەندە ڕەسەنانەی كە نوێژی ڕاستەقینە بەرپا دەكەن‌و لەسۆنگەی ئەو جۆرە نوێژكردنەشەوە خۆیان پاك‌و چاك دەكـەن‌و سـەرەنجام لـە ووردو درشـتی ژیـان‌و گوزەرانـی تـاكی‌و كۆمـەڵی‌یاندا فەرمانبەرلى خوای تاك دەكەن.

بەم خاڵی هەشتەمەش لەتوێژینـەوەی دروشمی یەكەم‌و بنـەڕەتی خواپەرسـتیی دەبینەوەو دەچینە سەر باس‌و توێژینەوەی دروشمی دووەم كە ماڵ بەخشینە.

**تێ بینی:**

**وەك لە (ڕێ خۆشكردن)ی ئەم بەرگەدا ئاماژەم پێ كرد، بەرگی دووەم چوار درووشمەكانی دیكەی خوا پەرستی (ماڵ بەخشین، ڕۆژوو، حەج‌و عومرە، زیكـری خوا) دەگرێتە خۆی‌و خوا پشتیوان بـێ یەكسـەر بـەدوای ئـەم بەرگـەدا چـاپ دەكرێ. إن شاء الله**

# پێـــڕســـت

## ئەم کتێبە

### خوێنەرە بەڕێزەکان :

ئەم کتێبەی بەردەستتان کە باسی خواپەرستیی (مسوڵمانی کامڵ) دەکات و بەهەردووك بەرگەکەیەوە هەزار (١٠٠٠) لاپەڕە زیاترە، بەرهەمی کردو کۆش و لێکۆڵینەوەو ڕامانی چەند ساڵێکە، هیوادارم بتوانێ تەواو بەرچاوتان ڕۆشن بکاتەوە و چەمك و واتای گشتی و ڕاستەقینەی خواپەرستیی و چۆنیەتی ئەنجام دانی پێنج درووشمە تایبەتییەکانی بەندایەتی و خواپەرستیتان جوان جوان بخاتە بەرچاو، ئێوەش تۆفیقی لێ حاڵی بوونی و هەزم کردنی و کار پێ کردنی و پاشان بڵاوکردنەوەو خەڵك و دەوربەر لەسەر پەروەردەکردنیتان پێ ببەخشرێ..

ژمارە سپاردنی (٣٤٨)ی ١٩٩٧ی دراوەتێ